سرشناسه : موسی پور، سیروان، ۱۳٦۰
عنوان و نام پدیدآور: کوردەکانی دەرەوەی ناوچە کوردنشینەکان : ئاوەردانەوەیەک لە ژیان و گوزرانی کوردەکانی ئیران( کوردەکانی دەرەوەی ناوچە کوردنشینەکان)، کورد لە کومارەکانی.../ نووسین و ئامادە کردنی سیروان مووساپوور.
مشخصات نشر : سنندج: مادیار، ۱۳۹۸
مشخصات ظاهری : ۷۵۲ ص.؛ ۱٤/٥×۲۱/٥ سم.
شابک : ٤-۰۸-٦٥۲٥-٦۲۲-۹۷۸
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع : کردان – تاریخ
موضوع : Kurds – History
موضوع : کردان – وضع اجتماعی
موضوع: Kurds – Social conditions
موضوع : کردان – زندگی فرهنگی
موضوع: Kurds – Intellectual life
رده بندی کنگره : ۴ک/ ۵۹ DS
رده بندی دیویی : ۹٥٦/۰۴۹۱۵۹۷
شماره کتابشناسی ملی : ۴۷۴۳۵٦۴




کتێب :کوردەکانی دەرەوەی کوردستان

نووسەر :سیروان مووساپوور

نۆرەی چاپ :یەکەم ١٣٩٩ - ٢٠٢٠

ناونیشان:سنە، چوارڕیانی شوهەدا، پاساژ عزەتی، وەشانخانەی مادیار: ٨٧٣٣١٢٤٤٤٥ (٠٠٩٨)

ئەژمار: ١٠٠٠ دانە

شابەک :٩٧٨-٦٢٢-٦٥٢٥-٠٨-٤

## پێڕست

## پێشەکی

کوردستان، وڵاتی کوردان، هەڵکەوتوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ ئەوەی لەباری سرووشتییەوە نیشتمانێکی یەکپارچەیە و بەشی زۆری دانیشتووانی لە نەتەوەی کورد پێك هاتووە، بەڵام لە دوو قۆناغی گرنگی مێژووییدا لەژێر کارتێکەریی فاکتەرە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان بەسەر چەند وڵاتدا، دابەش کراوە و هەر بەشەی خراوەتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکەوە. لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا و، لە ئاکامی شەڕ و دەستێوەردانی دوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی و پاش شەڕی چاڵدێران دوو بەش کرا و لەژێر ناوی کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران هەر بەشەی وەبەر یەکێك لەم دوو ئیمپراتۆرییە کەوت و، دوای چوارسەد ساڵ بۆ جارێکی دیکە و دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای لە پەلوپۆکەوتووی عوسمانی بەسەر چەند وڵاتی تازەدامەزراودا دابەش کران و بەم پێیە ئەو بەشەی کوردستانیش بەسەر سێ وڵاتی تازە دامەزراوی تورکیا و سووریا و ئێراقدا دابەش کرایەوە. بەم جۆرە لە چەند قۆناغی مێژووییدا کوردستان کرایە چەند پارچە و هەر بەشەی خرایە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکەوە.

بەڵام ئاخۆ کورد تەنیا لەو چوار بەشەدا هەیە؟ بە کورتی وەڵامەکە «نەخێر»ە و هەمووشمان ئەوە دەزانین!! بەڵام زۆربەی کاتەکان چ لە زمان خەڵکی سەرشەقام و چ لە ڕاگەیەنەکان و تەنانەت لە زمانی سیاسیەکانیشمانەوە گوێبیستی دەستەواژەی «کوردانی چوار پارچەی کوردستان» دەبین. تەنانەت لە کاتی سەردان و چاوپێکەوتنی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەگەڵ خەڵک، بە تایبەت لە کاتی بۆنە و ڕێوڕەسمە ئایینی و نەتەوەییەکاندا منداڵەکانیشمان فێری ئەوە بوون کە پیرۆزبایی لە کوردانی ناوچەی کوردنشینەکان بکەن یان پەیام و پێشنیارەکانیان ئاراستەی کوردانی ئەم چوار بەشە بکەن. وەك ئەوەی کورد تەنیا لەم چوار پارچەیەدا هەبێ و لە هیچ شوێنێکی تر نەبێ. لەحاڵێکدا ئەگەر تەنیا کوردەکانی خوراسان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران لەبەرچاو بگرین، بەقەدرا کوردی بەشێك لە چواربەشەکەی کوردستان (واتە کوردستانی سووریا) دەبن و ئاگامان لەوە نییە کە پیرەپیاوێکی کورد لە وڵاتێکی ئاسیای ناوەڕاست، لە کازاخستان و قرقیزستان، بە ئاواتی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی دایك فرمێسك لە چاوانی دەبارن یان کیژە کوردێکی ئۆردنی لەگەڵ ئەوەی لە کوردستان لەدایك نەبووە و لەوانەیە هەر چاویشی پێی نەکەوتبێ، بەڵام بە خۆشییەکانی کورد خۆشحاڵ و بۆ نەهامەتیەکانی نیگەران دەبێ.

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا، کوردستان بەسەر چوار وڵات (زۆر سەرچاوەش دەڵێن پێنج وڵات)دا دابەش کراوە و وەك «خاك» هەر بەشەی چۆتە ژێر دەستی دەوڵەتێکەوە بەڵام وەك «خەڵك و نەتەوە» تەنیا لەنێو ئەم چەند بەشەدا ناژی و کوردەکان لە ناوچە جیاجیاکانی دنیادا ژیان بەسەردەبەن، جا ئەمە چ بەهۆی سیاسەتی ڕاگواستن و دوورخستنەوەی وڵاتان بووبێ و چ بەهۆی کۆچکردنی خودی کوردەکانەوە بووبێ (بە هۆکاری سیاسی، ئابووری و...) یان هەر هۆکارێکی دیکە.

کوردەکان لە کوێن؟ کوردەکان لەنێو کوردستان و لە دەرەوەی کوردستانن. بەشێکیان لەو ناوچانە نیشتەجێن کە لەژێر ناوی «کوردستان»دا زۆرجار گوێبیستی دەبین و بەشێکیشیان ئەو کوردانەن کە لە دەرەوەی ناوچەکە دەژین و لەژێر ناوی «کوردەکانی دەرەوەی کوردستان» گەرەکمانە لەم بەرهەمەدا ئاوڕ لە ژیان و بەسەرهاتیان بدەینەوە.

لەم پەرتووکەدا ئاوڕ لە ژیان و گوزەرانی ژمارەیەکی زۆر لە هاونەتەوەییەکانمان لە شوێن و ناوچەی وڵاتە جۆراوجۆرەکان دەدرێتەوە و لە میانەیدا سەردەم و هۆکاری کۆچکردن و ڕاگواستنیان و، ڕەوشی ژیانی ئێستایان و بە دەیان بابەتی پێوەندیداری دیکە بڵاو دەکرێتەوە.

سەبارەت بە ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەش دەتوانم بڵێم دوو هۆکاری سەرەکی لە پشت نووسین و ئامادەکردنییەوە بوون:

یەکەم: هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا، زۆربەی کاتەکان چ لە زمان خەڵکی سەرشەقام و چ لە ڕاگەیەنەکان و تەنانەت چ لە زمانی سیاسیەکانیشمانەوە گوێبیستی دەستەواژەی «کوردانی چوار پارچەی کوردستان» دەبین.

دووەم: ئەگەرچی لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا، ژمارەیەك وتار و نامیلکە و کتێب بە شێوەی جۆراوجۆر لەسەر کوردی شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیا نووسراون، بەڵام نووسراوەکان یان زۆر کورتن یان تەنیا تایبەت بە کوردی شوێنێك یان ناوچەیەکن.

بۆیە بە پێویستم زانی بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك، وەك هەنگاوێکی سەرەتایی لانیکەم لە ئێستادا باسی ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی چەند ناوچە و وڵاتێك لە دووتوێی کتێبێکدا بکەم بۆ ئەوەی خوێنەران بتوانن چەند زانیارییەکی سەرەتاییان لەسەر ئەو کوردانە هەبێ.

ئامانج لە ئامادەکردنی وەها کتێبێکیش لەلایەك خستنەڕووی ڕەوشی ژیان

و گوزەرانی بەشێك لە هاونەتەوەییەکانمان لە دەرەوەی ناوچەکە و باسکردنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی ئەو کوردانەیە لە شوێنەکانی ئێستایان، بۆ ئەوەی نەوەکانی ئێستا و داهاتوو زانیارییان لەسەر ئەو بەشە لە هاونەتەوەییەکانمان هەبێ و، لەلایەکی دیکە ئاگاداربوون لەوەی کە ئەم هەموو کۆچکردن و ڕاگواستنە لە قۆناغە جۆراوجۆرە مێژووییەکاندا تا چەند توانیویەتی کاریگەریی لەسەر دابونەریت و زمان و کولتوور و بەگشتی لەسەر کوردبوونی ئەوان دابنێ. واتە داخوا ئەم جێگۆڕکێیانە تەنیا لە ڕواڵەتدا گۆڕانکاری بەسەر ئەم هاونەتەوەییانەماندا هێناوە، یان ئەوەکە بە تەواوی لەگەڵ کوردبوونی خۆشیان نامۆ و بێگانە بوون و ئیتر هیچ ئینتیمایەکیان بۆ زێدی باووباپیرانیان نەماوە یان بەپێچەوانەوە تا ئێستاش توانیویانە کوردبوونیان بپارێزن و پێش بە توانەوە و ئاسیمیلەبوونی خۆیان بگرن؟

لە ماوەی نووسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا، ڕووبەڕووی کۆمەڵێك کێشە و ئاستەنگ بوومەوە کە گرنگترینیان بریتی بوون لە:

● ١ـ کەمیی توێژینەوەی پێشوو بە تایبەت بە زمانی کوردی.

● ٢ـ دەست ڕانەگەیشتن بە کۆمەڵگەی پێوەندیدار بە نووسینەکە. دیارە کۆمەڵگەی جێگەی باس هەموو ئەو ناوچانەن کە کوردیان لێ دەژی و لە دەرەوەی سنووری هەرێمی کوردستانن. بێگومان بارودۆخی تایبەتی ژیانی ئێمە دەرفەت و توانای ئەوەی پێنەدام سەردانی تەنانەت ژمارەیەکی کەمی ئەو ناوچانەش بکەم.

● ٣ـ بێجگە لەو دوو گرفتەی پێشوو، گرفتێکی سەرەکی نەزانینی زمانە بیانییەکانە. بەداخەوە بەهۆی نەزانینی زمانە بیانییەکان نەمتوانی کەڵك لە هەموو ئەو سەرچاوانە وەرگرم کە بەو زمانانە نووسراون کە ئەمەش هەم گرفتێکی سەرەکی بوو بۆ من و، هەم کەموکوڕییەکیشە بە نووسینەکەوە دیارە کە بێ شك بە

سوودوەرگرتن لە سەرچاوە بیانییەکان، زۆر لەوە دەوڵەمەندتر و بەسوودتر دەبوو.

سەبارەت بە خاڵی دووەم دەبێ ئەوە بڵێم: بێ گومان بۆ ئامادەکردنی وەها بەرهەمێك، پێویستە ئامادەکار یان توێژەر سەردانی مەیدانیی هەموو ئەو شوێن و ناوچانە بکات کە کوردیان تێدا دەژی، بەڵام بەداخەوە هەلومەرجی ژیانی ئێمە، ئەو دەرفەتەی لانیکەم لە ئێستادا بۆ نەڕەخساندووین بەڵام ئەوەی تا رادەیەك توانیویەتی قەرەبووی ئەم کەموکوڕییە بکاتەوە ئەوەیە زۆربەی ئەو بابەتانەی بۆ ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە کەڵکیان لێوەرگیراوە، لەلایەن ئەو کەسانەوە نووسراون کە یان خۆیان لە کوردەکانی ئەو شوێنانەن. یان لە نزیکەوە ئاگاداری ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردانی ئەو بەشانەن و لە نزیکەوە سەردانیان کردوون. بۆ نموونە:

سەبارەت بە کوردەکانی خوراسان لە ئێران کەڵکم لە سەرچاوەگەلێك وەرگرتووە کە یان لەلایەن نووسەرە کوردەکانی ئەوێ وەك بەڕێزان کەلیموللا تەوەحودی، عەلیرەزا سپاهی لایین، شیرین دەوڵەتپوور (دەرگەز) و ... نووسراون یان هی کەسانێکن کە زانیارییان لەسەر کوردەکانی ئەو ناوچەیە هەبووە.

یان سەبارەت بە کوردەکانی ئۆردن کەڵکم لە کتێب و بەرهەمەکانی بەڕێز محەمەدعەلی سویرکی وەرگرتووە کە خۆی یەکێك لە نووسەرە کوردەکانی ئۆردنە.

سەبارەت بە کوردەکانی لوبنان سەرچاوەی سەرەکیم کتێبەکەی «سەلاح عیسام ئەبووشەقرا» بە ناوی «کورد گەلی مەینەتییەکان» بووە کە خۆی خوێندکارێکی کوردی لوبنان بووە و توێژینەوەکەی (کوردەکان لە لوبنان) نامەیەکی زانکۆییە لە کۆلێژی ئاداب و زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی لوبنان بۆ بەدەستهێنانی ماستەر لە جوگرافیا کە پاش گفتوگۆ لە ١٩٩٧/٧/٢٦ بە پلەی «زۆرباش» وەرگیراوە و ...

ئەم کتێبە پێشەکیەك و سێ بەش لەخۆ دەگرێ:

**بەشی یەکەم:** ئەم بەشە لە دوو باسی سەرەکی پێك هاتووە: لە باسی یەکەمدا چەند زانیارییەکی گشتی لەبارەی کوردستان دەخرێنەڕوو و تێیدا زۆر بە کورتی باس لە ناو، هەڵکەوت، ژمارەی دانیشتووان، سنوور و ڕووبەری کوردستان کراوە. لە باسی دووەمیشدا بەجیا چەند زانیارییەکی کورت و سەرەتایی سەبارەت بە کوردەکانی هەرکام لە چوار پارچەکەی کوردستان پێشکەش کراوە. ئامانج لە نووسینی ئەم بەشە ئەوەیە کە خوێنەر *پێش ئەوەی بیهەوێ لە شوێنی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی دەرەوەی ناوچەکە ئاگادار بێ، چەند زانیارییەکی سەرەتایی سەبارەت بە کوردەکانی ناوچەکە هەبێ* بۆ ئەوەی بە بەرچاوڕوونییەکی زیاترەوە بتوانێ ئاگاداری ڕەوشی کوردەکانی دەرەوەی ناوچەکە بێ.

**بەشی دووەم:** ئەم بەشە تەرخان کراوە بۆ کوردەکانی دەرەوەی ناوچەکە. لە هەشت باس و کۆمەڵێك بابەتی جۆراوجۆر پێك هاتووە:

لە باسی یەکەمدا ئاوڕ لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کوردەکانی ئێران (کوردەکانی دەرەوەی کوردستانی ئێران) دراوەتەوە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە تەنیا باسی ژیانی کوردەکانی چەند پارێزگا و شارێکی دەرەوەی ڕۆژهەڵات کراوە ئەگینا کورد لە زۆر ناوچەی دیکەی ئێران هەبوون و هەن کە توانای کۆکردنەوەی زانیاریم لەسەریان نەبوو.

لە باسی دووەمی بەشی دووەمدا باسی کورد لە کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو و کوردستانی پشت قەفقاز کراوە. لەم باسەدا دوای ئەوەی بە کورتی ئاوڕ لە ڕەوشی کوردەکان لە ئیمپراتۆریی ڕووسیا و دواتر لە یەکێتیی سۆڤیەت دراوەتەوە، باس لە ژیان و گوزەرانی کوردەکان لە هەرکام لە کۆمارەکانی دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت دەکرێ و هەوڵ دراوە چەند

زانیارییەك لەبارەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کوردەکانی نێو ئەو کۆمارانە بخرێتەڕوو. دووبارە دەبێ ئاماژە بە خاڵێك بدەم، ئەویش ئەوەیە کوردەکان لە زۆر ناوچەی تری سۆڤیەتی پێشوودا ژیان بەسەر دەبەن کە زانیاریی لەسەریان زۆر کەمە و جاری وایە تەنیا بە چەند وشەیەك ئاماژەیان پێکراوە و تەنانەت زۆرجار تەنیا ئاماژە بە ناویان کراوە.

لە باسی سێیەمی بەشی دووەمدا باسی کوردەکانی ئۆردن کراوە و ئاوڕ لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانیان دراوەتەوە. باسی چوارەمی بەشی دووەم تایبەتە بە کوردەکانی پاکستان و لە باسی پێنجەمیشدا باس لە کوردانی ئیسرائیل کراوە و باسی شەشەمی ئەو بەشە بۆ کوردەکانی لوبنان تەرخان کراوە.

**بەشی سێیەم:** تایبەتە بە ئەنجام و پێشنیار و ڕاسپاردەکانی توێژینەوەکە. سەرەتا زۆر بە کورتی باس لە چەند ئەنجامێکی بەدەستهاتوو لەم توێژینەوەیە دەکرێ و دواتر بەپێویست زانراوە چەند پێشنیار و ڕاسپاردەیەکی پێوەندیدار بە توێژینەوەکە بخرێنەڕوو.

سەبارەت بە سەرچاوەکانی ئەم کتێبە دەبێ بڵێم لەڕاستیدا دوو جۆرن: جۆری یەکەم کتێب و نامیلەکەن کە بەشێکیان ئەو بەرهەمانەن بۆ وەرگرتنی زانیاریی گشتی کەڵکیان لێ وەرگیراوە و بەشەکەی تریشیان ئەو کتێب و نامیلکانەن کە یان بە کورتی و زۆرجار پچڕپچڕ باسی کوردی شوێنە جیاجیاکانیان کردووە یان لەلایەن کەسانی ناوخۆ و دەرەوە بە تایبەتیی لەسەر کوردەکانی شوێنێکی دیاریکراو نووسراون بۆ نموونە کوردەکانی ئۆردن لەلایەن بەڕێز محەمەدعەلی سویرکی کە خۆی نووسەرێکی کوردی ئۆردنە و ...

سەرچاوەیەکی دیکەی ئەم کتێبە ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکانن کە لەڕاستیدا بەشێکی بەرچاو لە زانیارییەکان لەوان وەرگیراون. ئەوەی گرینگە لێرەدا ئاماژەی پێبکرێ ئەوەیە زۆربەی ئەو بابەت و وتار و وێنانەی لە ماڵپەڕ و

وارگە ئەلیکترۆنییەکان وەرگیراون، لەڕاستیدا لە چەند کتێب و سەرچاوەیەکی بەنرخ هەڵێنجراون. زۆر وتار خۆیان لاپەڕەیەك یان چەند لاپەڕەیەکن بەڵام نووسەرەکانیان سوودیان لە چەندین کتێب و سەرچاوە وەرگرتووە.

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی بچووکم بە هاونەتەوەیی و هاونیشتمانییەکانم کردبێ و چاوەڕوانییشم لە کەسانی شارەزاتر و بەتواناتر هەیە خزمەتی گەورەتر پێشکەش بە خەڵك و خاکی خۆیان بکەن و بە هەمووان هەوڵ بۆ هێنانەدیی نیشتمانێکی ئازاد و ئاوەدان بدەین. سەرکەوتن بۆ کورد و ئاوەدانی بۆ کوردستان لە چوار پارچەکەی، ژیانێکی پڕ لە خۆشیی و کامەرانی بۆ کوردەکانی دەرەوەی ناوچە کە بە ئاوات دەخوازم.

سیروان مووساپوور

هاوینی ٢٧١٤ی کوردی

# بەشی یەکەم ١
## چەند زانیارییەک لەسەر کوردستان

**باسی یەکەم:** چەند زانیارییەکی گشتی لەبارەی کوردستان
ناوی کوردستان
هەڵکەوتی کوردستان
سنووری کوردستان
ڕووبەری کوردستان
ژمارەی دانیشتووانی کوردستان

**باسی دووەم:** چەند زانیارییەکی گشتی لەسەر ناوچەکە
• **یەکەم: کوردستانی تورکیا**
١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی تورکیا
٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی تورکیا بەپێی سەرچاوەکان
٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی تورکیا
• **دووەم: کوردستانی ئێران**
١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات
٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی ئێران بەپێی سەرچاوەکان
٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی ڕۆژهەڵات
• **سێیەم: کوردستانی ئێراق**
١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئێراق
٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی ئێراق بەپێی سەرچاوەکان
٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی باشوور
• **چوارەم: کوردستانی سووریا**
١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی ڕۆژئاوای کوردستان
٢ـ ژمارەی کوردەکانی ڕۆژئاوا بەپێی سەرچاوەکان
٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی سووریا

سەرچاوەکانی ئەم بەشە

## باسی یەکەم:
## چەند زانیارییەکی گشتی لەبارەی کوردستان

کاتێــك مەبەســتمان بــێ چەنــد زانیارییەکــی گشــتی لەبــارەی کوردســتان بخەینــە بەرچــاو، دەبــێ ئــاوڕ لــە زۆر بابەتــی گرنــگ بدەینــەوە و زۆر بــە وردی باســیان بکەیــن. بابەتگەلێکــی وەك جوگرافیــای سروشــتی، جوگرافیــای دانیشــتووان، جوگرافیــای ئابــووری و لەنێــو ئەوانیشــدا دەیــان بابەتــی وەك تۆپۆگرافیـای کوردسـتان، ئاووهـەوا، پێکهاتـەی دانیشـتووان، ڕەوکـردن و چـڕی دانیشـتووان، سـامانە ژێــرزەوی و ســەرزەوییەکانی کوردســتان و دەیــان بابەتــی دیکــە جێگــەی باســکردن و بایــەخ پێدانــن و پێویســتە زۆر بــە وردیــش باســیان بکــرێ، بــەڵام لەبــەر ئــەوەی لەلایــەك مەبەســتمان زیاتــر ناســاندنی کوردەکانــی دەرەوەی ناوچــەی کورنشــینەکان و لەلایەکــی دیکەشــەوە باســکردنی هەمــوو ئــەو بابەتانــەی ئاماژەیــان پــێدرا هــەم پێشــتر کاریــان لەســەر کــراوە و هەمیــش ئەگــەر لێــرەدا دووپــات بکرێنــەوە، باســەکە زۆر فــراوان دەبــێ و زۆر لەبەرێــك دەکشــێتەوە و وەك دەڵێــن «هەویرێکــە و ئــاو زۆر هەڵدەگــرێ»، هــەر بۆیــە بەپێویســتم زانــی کــە لــە خســتنەڕووی چەنــد زانیارییەکــی گشــتیی لەبــارەی کوردســتانەوە زیاتــر جەخــت لەســەر ئــەو بابەتانــە بکــەم کــە بینــە ســنوورێك بــۆ لێکجیاکردنــەوەی کوردەکانــی نێــو ناوچــە کــە لەگــەڵ کوردەکانــی دەرەوەی

ئەو چوار بەشە، واتە خوێنەر پێش ئەوەی بچێتەسەر باسی کوردەکانی دەرەوەی ناوچە کە، تا ڕادەیەکی کەم بزانێ کە مەبەستمان چییە و دەمانەوێ باسی چی بکەین.

بەڵام سەبارەت بە خستنەڕووی ئەم چەند دێڕە زانیارییەش «ئاشکرایە هەر توێژەرێك باس لە جوگرافیای کوردستان یان بەشێك لە بەشەکانی بکات، ئەستەمە ڕووبەڕووی مەسەلەی نەبوونی زانیارییەکی ورد و دژبەیەکی سەرچاوە جیاوازەکان، بەتایبەتی سەبارەت بە دیاریکردنی سنوورەکەی و ڕووپێوی خاکەکەی و ژمارەی دانیشتووانەکەی نەبێتەوە. ئەمەش زیاتر بۆ دوو هۆی سەرەکیی دەگەڕێتەوە، یەکەمیان پارچەپارچەکردنی کوردستان لەنێوان چەند دەوڵەتی جیاواز کە بە گشتیی نە دان بە بوونی خاکی کوردستاندا دەنێن و نە بە فەرمیی سنوورێکیان بۆ دەستنیشان کردوە و نە بڕواشیان پێیەتی، بەڵکو کوردستان بە بەشێك لە خاکی خۆیان و نەتەوەی کوردیش بە بەشێك لە نەتەوەکەی خۆیان دادەنێن و، نە خۆیان و نە ڕێگەشیان داوە بە کەسانی بێلایەن بەشێوەیەکی زانستیی و بابەتیانە ئیش لە مەسەلەکەدا بکەن. دووەمیان ئەو گۆڕانەی بەدرێژایی مێژوو بەسەر ناوچە کوردنشینەکاندا هاتووە لە ئەنجامی هێرش و پەلاماری حکومەتە ناوەندییەکانی دەوروبەری و سیاسەتی فراوانخوازی و فشار خستنە سەر دانیشتووانی کورد و پاڵپێوەنانیان بەرەو چیاکان و قووتدانی ناوچەکانیان. بەجۆرێك زۆر ناوچە کە پێشتر دانیشتووانی کورد بوون، ئێستا تاك و تەرا کوردی تێدا دەبینرێت.[1]

بەهەرحاڵ، بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك، لە خوارەوە هێندێك زانیاریی گشتی لەمەڕ کوردستان دەخەمە پێش چاوی خوێنەری ئازیز.

### ناوی کوردستان

کوردستان واتە وڵاتی کوردان، بە وڵاتێك دەڵێن کە کوردی تێدا دەژی. ئەم ناوە کەی پەیدا بووە و سەرەتا لەلایەن چ کەسێکەوە بەکار هاتووە؟ واتە کێ یەکەم جار ناوی ناوە و چ کەسێکیش یەکەم جار لە نووسراوەکاندا بەکاری هێناوە؟ بۆ وەڵامی پرسیاری یەکەم واسیلی نیکیتین لە «کورد و کوردستان»دا دەڵێ:

«ناوی کوردستان، یانی خاکی کوردان، ناوی وڵاتێکی سەربەخۆ و خاوەنی سنوورێکی دیاریکراوی سیاسی نیە و نیشتیمانی خەڵکێکە ئەگەر نەشڵێین هەموویان، زۆربەیان خوێن و ڕەگەز و بنەچەکە و ڕەنگیان هەر یەکە. لەگەڵ ئەوەش دەبێ بشزانین کە ئەو ناوە هەتا سەدەی دوازدەی زایینی خەبەری نەبوو، لە زەمانی پادشایەتی «سوڵتان سەنجەر» پادشای گەورەی سلجووقیدا بوو کە ئەم مەڵبەندەی بەوجود هێنا و قەڵای بەهاری کردە ناوەندی وێ کە کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای هەمەدان.»[٢]

بەڵێ! «مێژووناسان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ناوی کوردستان لەباری گەلناسی و جوگرافیاییەوە بۆ جاری یەکەم لە سەردەمی سەلجووقیەکانەوە هاتۆتە ئاراوە. سوڵتان سەنجەر کە ساڵی ١١٥٧ی زایینی مردووە، ناوچەیەکی کوردی بریتی لە هەمەدان، دیناوەر، کرماشان، سنە، ڕۆژهەڵاتی زاگرۆس، ڕۆژئاوای چۆمی زاپ، ناوچەکانی شارەزوور و سنجار پێکهێنابوو. پێتەختی ئەو ناوچە کوردییە شاری بەهار بوو و لە باکووری هەمەدان هەڵکەوتبوو.»[٣]

سەبارەت بە پرسیاری دووهەمیش کە کێ یەکەم جار لە نووسراوەکاندا بەکاری هێناوە؟ زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە حەمدوڵڵای

مستەوفی (١٢٨١ ـ ١٣٤٩ی.ز) بۆ یەکەم جار ساڵی ١٣٤٤ لە کتێبی (نزهة القلوب)دا ناوی کوردستانی هێناوە و سنوورەکەشی دیاری کردووە، بەڵام لەڕاستیدا زۆر پێش ناوبراو ناوی کوردستان لە نووسراوەکاندا ئاماژەی پێ کراوە. بۆ نموونە:

«لە سەرچاوە ئەرمەنیەکاندا لە (١١٣٨ ـ ١١٤٤ی.ز) ناوی هێنراوە، کە ئەوە نزیکی زیاتر لە دووسەد ساڵ پێش مستەوفیە. هەروەها مارکۆپۆلۆ (١٢٥٤ـ ١٣٢٤ی.ز) هەر دیسان پێش حەمدوڵای مستەوفی، وەك یەکەم ئەوروپی ئاماژەی پێ کردووە. مارکۆپۆلۆ تەنها ناوی کوردستان دەهێنێت و زانیاری سەبارەت بە وڵاتەکەی نادات. لە شوێنێکدا دەڵێت: پیاوێکی نارد بۆ دیمەشق و ئەوی تریان بۆ کوردستان...»[٤]

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا باس لەوە دەکرێ کە پێش مستەوفی ناوی کوردستان هێنراوە. بۆ نموونە:

«... وشەی کوردستان لە نووسراوەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتی کۆچی/ سێزدەی زایینی، چەندین جار هاتووە و هەندێ لە مێژوونووس و گەریدەکان بە دەیان ساڵ پێش (قەزوینی / حمداللە مستوفی) کەوتوون لە بەکارهێنان و تۆمارکردنی وشەی کوردستان لە کتێبەکانیان. ئەوەتا گەڕیدەی ئیتالی (مارکۆ پۆلۆ) کە لە (٧٢٣ك/ ١٣٢٣ز) مردووە کە دەستی کردبوو بە گەشتێك بۆ هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات ساڵی ١٢١٧ی زایینی، لە گەشتەکەیدا باسی لە وشەی کوردستان کردووە، هەروەها مێژوونووسی مەغۆل (ڕەشیدەدین فەزلوڵلای هەمەدانی) (مردوو لە ٧١٨ك/ ١٣١٨ی.ز) لە کتێبەکەی خۆیدا (تأريخ المغول) زیاتر لە جارێك وشەی کوردستانی بەکارهێناوە. واش دەردەکەوێت کە ئاماژەی مێژوونووسان و شارناسان بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدات کە وشەی کوردستان، ئەوساکە لەنێو

کوردانــدا هەبــووە و بــەکار هێــنراوە. ئەمــەش ناوێکــی نەتەوەییــە، مەبەســت لێــی وڵاتــی کــوردە...[٥]

## هەڵکەوتی کوردستان

کوردســتان «لــە ئاقــاری پڕحەســتەمی ڕۆژهەڵاتــی نێوەڕاســتدا، کــە دەکەوێتــە نێــوان وڵاتانــی تورکیــا و ســوریا و عێــراق و ئێــران و هەرمەنســتان، هەڵکەوتــووە. پردەبازێکــە ســێ قــاڕەی ئاسیا، ئورووپــا و ئەفریقــا پێکــەوە وەســڵ دەکا. ئەمــەش هەڵکەوتێکــی ئیســتراتیژیکی تایبــەت بــە کوردســتانە، چونکــە هیــچ وڵاتێکــی دیکــە لــەو تایبەتمەندییــەدا بەقــەرا کوردســتان بەهێــز و پڕنێــوەڕۆك نیــە.

کوردســتان لــە ســەرێکی دیکەشــەوە، هەڵکەوتێکــی تایبەتــی هەیــە. خاکەکــەی لەنێــوان دەریــای خــەزەر، دەریــای ڕەش و کەنــداوی فــارس تــا لێــواری کەنــداوی ئەســکەندەروون لــە بەرێــك کشــاوەتەوە. بەمــەش لەنــاو مەوقعیەتێکــی ئیســتراتیژیکی و ژێئۆپۆلیتیکــی ئــەو مەڵبەنــدەدا جێــی گرتــووە و تــا ڕادەیــەك بۆشــایی ســەیتەرەپەیداکردنی بەســەر دەریــای ئــازاددا قەرەبــوو کردۆتــەوە.

کوردســتان هەڵکەوتێکــی شــازی ژێئۆپۆلیتیکیشــی هەیــە: یەکەمیــان، کوردســتان بــە ڕێــگای ماشــێن و ئاســندا دوو قــاڕەی ئاســیا و ئورووپــا وێــك دەخاتــەوە... دووهەمیــان نەوتــە... ســێهەمیان ئــاوە، لــە ئاســیای بچــووك و ڕۆژهەڵاتــی نێوەڕاســتدا هیــچ وڵاتێــك بەقــەرا کوردســتان خاوەنــی ئــاو نیــە..»[٦]

ئەگــەر «چاوێــك بــە نەخشــەدا بگێڕیــن ئەبینیــن هەمــوو ئــەو ڕێیانــەی لــە ئاسیای بچــووك تێدەپــەڕن و بــۆ گۆڕینــەوەی شــتومەك لــە ڕۆژئــاواوە دێــن بــۆ ڕۆژهــەڵات، چ ئــەو ڕێیانــەی لــە بانوەکانــی ئەرمەنســتانەوە بــۆلای ئازەربایجــان و ئەودیــوی قەفقــاز دەچــن و چ ئــەو جادانــەی کــە بەنــاو کێوەکانــی

بەینونەهرێـن (میزوپۆتامـی) و ئێرانـدا دەڕۆن هەموویـان بـە ناوەڕاسـتی کوردسـتاندا تێدەپـەڕن.[٧]

« جێـگای کوردسـتان لەبـاری جوغرافییـەوە گرینگیەکـی تایبەتـی هەیـە لەبـەر ئـەوەی لـە ناوەنـدی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت واتـە شـوێنی لەدایکبوونـی شارسـتانیەت هەڵکەوتـووە. ... شـوێنێك بەبوونـی چیـا و دەشـتی فـرە و پـان و بەریـن، بەفـر و بارانێکـی زۆرەوە، هەلـی بـۆ کـورد ڕەخساندووە کـە یەکـەم جـار سـەرەڕای کشـتوکاڵ، گەلێـك شـار و گوندیشـی دروسـت کـردووە. کوردسـتان لـە ڕوانگـەی جوگرافـی و کولتوورییـەوە لەنێـوان سـێ شارسـتانییەتی مەزنـی وەك میسـۆپۆتامیا، ڕۆژهـەڵات (ئاناتۆلـی) و ئیرانـدا هەڵکەوتـووە. ئـەوەش لەبەرچـی، چوونکـە بەشـی ڕۆژئـاوای لـە ئاناتۆلیـا، ڕۆژهەڵاتـی لـە ئێـران و باکووریشـی لـە میسـۆپۆتامیا هەڵکەوتـوون.» [٨]

کوردسـتان لـەڕووی جوگرافییـەوە کەوتۆتـە یەکێـك لـە گرنگتریـن ناوچەکانـی جیهـان، کـە بـە خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت و ئەویـش بـە دڵـی جیهـان نـاسراوە. ئـەم پێگەیـەش لـەڕووی سـامانی سـەرزەوی و ژێرزەوییـەوە گەلێـك دەوڵەمەنـدە. لـەڕووی سـنوورە واقیعییەکەیـەوە دەڕوانێتـە سـەر هـەر دوو دەریـای ناوەڕاسـت و کەنـداوی عـەرەب. هـەر لـە ڕووی سنووریشـەوە لـە شـێوەی کەوانەیـەك و لەنێـو دڵـی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا ئۆقـرەی گرتـووە. ئـەم ڕوویـەرە خاکـەش لـە باشـووردا پانتایـی کەمـە و لـە باکـووردا پانتاییەکـەی زیـاد دەکات، کـە بـە درێژایـی لـە باکـوورەوە بـۆ باشـوور ١٠٠٠ کیلۆمەتـرە. تێکـڕای پانتایـی باشـووری ٢٠٠ کـم و لـە باکـووردا دەبێتـە ٧٥٠ کـم. بەپێـی بازنەکانـی پانـی و هێڵەکانـی درێژیـش دەکەوێتـە نێـوان هێڵەکانـی درێـژی (٣٦ ـ ٥٠)ی خۆرهـەڵات و بازنەکانـی پانـی (٣٠ ـ ٤٠)ی باکـوور، واتـە دەکەوێتـە بەشـی نیۆگـۆی باکـووری زەوی... [٩]

## سنووری کوردستان

دەربارەی سنووری کوردستان هەر یەکێك لە زانایان بەجۆرێك باسی دەکەن و جوگرافیای تایبەتی خۆیان هەیە. هەرچەندە لە سەردەمە مێژووییە جیاجیاکاندا ئەم سنوورانە لە ئەنجامی چەند هۆکارێکدا کە گرنگترینیان دروست نەبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆیە، گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە و زیاد و کەم کراون. جگە لەمەش شێواندنی سنووری کوردستان لەلایەن کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە و داگیریان کردووە. ئەمەش بە ڕاگواستنی کوردەکان و نیشتەجێکردنی ڕەگەزی خۆیان، زۆر هەوڵیان داوە سنووری کوردستان بچووك بکەنەوە، ئەوەش بە بڵاوکردنەوەی لیکۆڵینەوەیەکی شۆڤێنی دوور لە بنەمای زانستی لەسەر مێژوو و سنووری کوردستان.[١٠]

هەربۆیە « دیاریکردنی سنووری کوردستان بە دژوارترین و گەورەترین کێشەی سەردەم دادەنرێ. لەبەر ئەوەی بۆچوونی زۆر جیاواز لەم بارەیەوە هەیە. ئەم بۆچوونانەش تەنیا لەلایەن، لێکۆڵەرەوان و توێژەران و شارەزایان و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان و دەزگا ڕەسمییەکان و هێزە ڕامیارییەکانەوە نییە، بەڵکوو لە هەمان کاتدا، لە نێو تاکەکانی خەڵکی کوردستانیش، جیاوازیی و ناکۆکییەکی گەورە هەیە. بێگومان ئەمەش زیاتر بۆ نەبوونی سەربەخۆیی ڕامیاریی و دانەمەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی یەکگرتووی کوردستانی دەگەڕێتەوە. بۆیە سنووری کوردستان، چ لە کۆندا و چ لە مێژووی تازەیدا، چەندین جار گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڕادەیەك کە باسی نێوچەیەکی جوگرافی کوردستان دەکرێ، خەڵکی پێش ئەوەی بۆ مێژووەکەی بگەڕێنەوە بە گومانەوە گوێ لەو باسە دەگرن

یـا بـە زەردەخەنـە و سەرسـوڕماوییەوە لێـی دەڕوانـن.[١١]

بەهەرحـاڵ ئێمـە لێـرەدا هـەوڵ دەدەیـن بـە کەڵـك وەرگرتـن لـە چەنـد سـەرچاوەیەکی بیانـی و ناوخۆیـی تـا ئـەو جێگەیـەی دەکـرێ باسـی سـنووری کوردسـتان بکەیـن، هەرچەنـد جیاوازیشـیان پێکـەوە هەیـە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بەرچاوڕوونییەکـە بـۆ خوێنـەر بـۆ ئـەوەی ڕوونـتر شـوێنی نیشـتەجێبوونی کوردەکانـی دەرەوەی ئـەو سـنوورانەی بـۆ دەرکـەوێ.

ڕۆژهەڵاتناسـی فەرەنسـی «تۆمـا بـوا» دەڵـێ: کوردسـتان ئـەو وڵاتـە بێ‌سـنوورەیە کـە کـوردی تیـا دەژی و بەتەواوەتـی دەکەوێتـە نـاو جەرگـەی ئاسـیای بچووکـەوە، بریتییـە لـە بڕیـنەی پشـتی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتەوە، لەلایەکـەوە بەشـی زۆری ناوچـەی شـاخاوی نێـوان دەریـای ڕەش و بـەری «نێـوان دوو ڕووبـار»و، لەلایەکـی دیکەشـەوە «ئەنتـی تـۆرۆس» و بەرزاییەکانـی ئێـران دەگرێتـەوە. ئـەم ناوچەیـە بەخەیـاڵ لـە مانـگ یـان داس دەچێـت، ڕووبەرەکـەی ئەوەنـدەی نزیکـەی فەڕەنسـایە و دەچێتـە نـاو بەشـێکی زۆر لـە خاکـی تورکیـا و ئێـران و عێـراق.

گەڕیـدەی تـورك ئەولیـا چەلەبـی سـنووری کوردسـتانی بـەم شـێوەیە بـاس کـردووە: سـنووری کوردسـتان لە باکـوورەوە لـە ئەرزڕۆمەوە دەسـت پـێ‌دەکات و لـە بـەسرە کۆتایـی دێـت. وان و هەکاریـی و جزیـرە و ئامێـدی لەنـاو ئـەم سـنوورەدان.

دکتـۆر شـاکر خەسـباك کـە مێژوونووسـێکی عەرەبـە دەڵێـت: ئەگـەر لـوڕەکان کـورد بـن، وەك زۆر لـە بەڵگەنامەکـە مێژوویـی و زمانەوانییـەکان کوردبوونیـان دەردەخـەن، ئـەوا سـنووری کوردسـتان بەدرێژایـی زنجیـرە چیاکانـی زاگـرۆس تـا سـەر کەنـداوی فـارس درێـژ دەبێتـەوە، هـەر لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: کوردسـتان سـنووری سروشـتیی هەیـە و دانیشـتووانەکەی ڕەگەزێکـی

تایبەتیـان هەیـە، هەرچەنـدە سـنووری دەوڵەتیـان نییـە. [١٢]

لـە سـەرچاوەیەکی دیکـەدا گوتراوە:«هەرێمـی کوردسـتان سـنورێکی جێگیـری نییـەو لەنێـوان ڕێکخـراو و گـرووپ و تاکەکانـدا بـە جیاوازییـەوە باسـی لێـوە دەکـەن و بـە دیدێکـی سیاسـییانەوە ڕەچـاو دەکرێـت. سـەرەڕای ئـەوەش، کوردسـتان ناوچەیەکـی جیـا و دانپێدانـراوە و بڕبـڕەی پشـتی ئەمـەش بـە زنجیـرە چیاکانـی زاگـرۆس و تۆرۆسـەوە بەسـتراوەتەوە، کـە بـەرەو باشـوور درێـژ دەبێتـەوە بـۆ دەشـتەکانی مسـۆپۆتامیا و بـەرەو باکووریـش بـۆ ئـەو ناوچانـەی کـە کاتـی خـۆی ئەنادۆلیـای ئەرمینیـا بـوون.» [١٣]

بـا بزانیـن نووسـەر و مێژوونووسـە کوردەکانـی خۆمـان لـەو پێوەندییـەدا دەڵێـن چـی و چ بۆچوونێکیـان هەیـە:

شـەرەفخانی بدلیسـی وەك کۆنتریـن مێژوونووسـی کـورد لـە لاپـەڕە (٢١)ی چاپـی سـێهەمی شـەرەفنامەدا دەڵـێ: سـنوور و کەوشـەنی وڵاتـی کـوردان ـ کـە نـاوی کوردسـتانە ـ لەسـەر لێواری دەریـای هورمزەوە ـ کـە لەسـەر کەنـاری دەریـای هینـد هەڵکەوتـووە ـ دەسـت پـێ دەکا و لەوێـوە بـە خەتێکـی ڕاسـت دەکشـێ و دێـت هەتـا لـە مەڵبەنـدی مەلاتیـە و مەرعـش دەبڕێتـەوە. وڵاتـی فـارس و عێراقـی عەجـەم و ئازەربایجـان و ئەرمەنسـتانی چکۆلـە و ئەرمەنسـتانی گـەورە، دەکەونـە لای باکـووری ئـەو خەتـەوە. عێراقـی عـەرەب و مووسـڵ و دیاربەکـر دەبنـە باشـووری ئـەو سـنوورە. [١٤]

لـە یەکێکـی تـر لـە سـەرچاوەکاندا گوتـراوە «بـە لێکدانـەوەی ئـەو مەڵبەندانـەی کوردیـان تێـدا نیشـتەجێیە و لەبـاری مێژوویـی و هەڵکەوتـەوە بـە یـەك وڵات دەژمێردرێـن، دەتوانیـن سـنووری کوردسـتان بـەم جـۆرە دیـاری بکەیـن:

لـە شـیمالی ڕۆژهەڵاتـی لوتکـەی ئاراراتـەوە خەتێکـی ڕاسـت دەسـت

پێدەکا، بەرەو جنووب بۆ بەشی جنوبی زاگرۆس و پشتکۆ دێتە خوارێ، لەوێرا خەتێکی ڕاست بۆ لای ڕۆژئاوا دەکێشین هەتا دەگاتە شاری مووسڵ لە عێراق، لەوێوە خەتێکی ڕاست بۆلای ڕۆژئاوا کە لە مووسڵەوە دەگاتە بەشی تورك نشینی ویلایەتی ئەسکەندەروون و لەو نوختەوە خەتێك بۆلای شیمالی ڕۆژهەڵات ڕادەکشێ تا دەگاتە ئەرزەڕۆم لە تورکیا، پاشان لە ئەرزەڕۆمەوە خەتێك بەرەو ڕۆژهەڵات دێ تا دەگاتە لوتکەی ئارارات.»[١٥]

نووسەر فوئاد حەمە خورشید دەڵێت: کوردستان دەکەوێتە نێوان هێڵی (٢٩ ـ ٥٠) پلە، لە خۆرهەڵاتەوە، سێگۆشەیەکی شاخاوی پێکدێنێ کە سەرەکانی بەندە بە یەکێتی سۆڤیەت لە باکوورەوە، کەنداوی عەرەب لە باشوورەوە و دەریای ناوەڕاست لە ڕۆژئاواوە، ڕووبەری کوردستان (٥٠٠ هەزار) کیلۆمەتری دووجایە.[١٦]

بەڕێز عەبدوڵڵا غەفوور لە لاپەڕە ١٥ی چاپی چوارەمی «جوگرافیای کوردستان» باس لەوە دەکات کە: «کوردستان دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیاوە. سنوورەکەی لە باکوورەوە لەگەڵ ئازەربایجان، ئەرمینیا و تورکیا دایە. لە باشوورەوە ئێران و کەنداوی (فارسی ـ عەرەبی)، لەڕۆژهەڵاتەوە ئێرانە. لە ڕۆژئاواشەوە عێراق و سووریایە» هەر لەو کتێبە و لە لاپەڕە ٢٥٠ دا دەڵێت: « کوردستان لە باکوورەوە لەگەڵ تورکیا و لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ئێران و لە باشوورەوە لەگەڵ عێراق و لە ڕۆژئاواشەوە لەگەڵ سووریادا هاوسنوورە. بەڵام سنووری لەگەڵ ئەم دەوڵەتانەدا بە شێوەیەکی ڕەسمی دەستنیشان نەکراوە و ئەم چوار دەوڵەتە، نە دان بە بوونی خاکی کوردستاندا دەنێن و نە بڕواش بەو سنوورانە دەکەن، بەڵکوو کوردستان بە بەشێك لە خاك و نەتەوەی کوردیش بە بەشێك لە

نەتەوەکـەی خۆیـان دادەنێـن.[١٧]

هـەروەك ڕێـزدار عەبدوڵـڵا غەفـوور باسـی کـردووە، سـنووری کوردسـتان لەلایـەن چەندیـن نووسـەری دیکـەی وەك مینۆرسـکی، محەمـەد ئەمیـن زەکـی بـەگ، نیکیتیـن، لازاریـف و زۆر کەسـی دیکـەی باسـی کـراوە. بـەڵام لـە کۆتاییـدا بـە هێنانـەوەی بۆچوونـی دوکتـۆر ئـازاد نەقشـبەندی کۆتایـی بـە باسـەکە دێنیـن کـە هـەروەك ڕێـزدار مەلاعەلـی قەرەداغـی دەڵێـت: لـە ئەنجامـی خسـتنەڕووی بەشـێك لـەو بۆچوونـە جیاوازانـەی دەربـارەی سـنووری جوگرافیـای کوردسـتان دەربـڕاوە، دەتوانیـن بڵێیـن: دکتـۆر ئـازاد نەقشـبەندی بەو پێیـەی کـە پسـپۆڕێکی ئـەم بوارەیـە، بۆچوونەکانـی بنەمـای زانسـتیی هەیـە و زیاتـر گونجـاوە، زانسـتیانەترە کـە بخرێتـە پێـش چـاو و گرنگیـان پێبدرێـت.

دوکتـۆر ئـازاد نەقشـبەندی نووسـیویەتی: کوردسـتان لـە شـێوەی سێگۆشـەیەکی وەسـتاوی نارێـك دایـە، کەنـداوی ئەسـکەندەروونە و شـاری لێنیـکان و کەنـداوی فـارس هـەر سـێ سـووچی ئـەم سێگۆشـەیە پێکدەهێنـن. کوردسـتان دەکەوێتـە ڕۆژئـاوای کیشـوەری ئاسـیاوە لەنێـوان هێڵـی پانـی (٣٠ ـ ٤١) پلـەی باکـوور و هێڵـی درێژیـی (٣٦ ـ ٥١) پلـەی ڕۆژهـەڵات و بەسـەر تورکیـا و عێـراق و ئێـران و سـووریا و ئەرمەنسـتاندا دابـەش کـراوە. ئـەم شـوێن و ناوچانـە دەگرێتـەوە:-

١ـ ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا.

٢ـ هەموو ڕۆژئاوای ئێران، جگە لە خوزستان.

٣ـ باکوور و باکووری خۆرهەڵاتی عێراق.

٤ـ سووچەکانی باکووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژئاوای سووریا.

٥ـ ڕۆژهەڵاتی ڕووباری ئاچووریان لە ئەرمەنستان. (١٨)

## ڕووبەری کوردستان

بێگومان دیاریکردنی ڕووبەر و پانتایی خاکی کوردستان کارێکی ئێجگار دژوارە. لەبەر ئەوەی تا ئێستاش سەرچاوە جۆراوجۆرەکان بەشێوەی جیاواز باسی سنوورەکانی کوردستانیان کردووە و دەکەن. سروشتییە ڕووبەر و پانتایی خاکی هەر وڵاتێکیش بەپێی چوارچێوەی سنوورەکانی دیاری دەکرێ.

لەلایەکی دیکەشەوە «دانەمەزرانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە کوردستان و دابەشبوونی کوردستان و شێواندن و دەستکاریکردنی سنووری نیشتمانیی پارچەکانی کوردستان، ڕێمان پێنادا بەشێوەیەکی ورد ئەو وڵاتە لە عەرز و گەز بدەین، ناچارین قەناعەت بە حوکمێکی گشتی و پێوانەیەکی نیوەچڵی بێنین. لەڕووی ئەو ئوستان و ویلایەت و پارێزگایانەی هەر لە کۆنەوە بە کوردستان ناسراون و کوردیان تێدا دەژی، سنوور و ڕووبەرەکەی دیاری بکەین و لەمە زیاتر خۆمان لە قەرەی نەدەین. ئەوەش ئەو مەعنایە ناگەیەنێ کە لەناو کوردستاندا نەتەوەی دیکە نییە، لەسەر خاکی خۆیان بژین، یان پێمان وابێ خاکی کوردستان لەو حەددەی زیاتر تێناپەڕێنێت. زۆربەی نووسەران و توێژەرانی ئەم عەسرە، هەوڵیان داوە بەپێی دانیشتوانی کورد لە ناوچە و مەڵبەندەکان سنوور و کەوشەنی کوردستان دیاری بکەن»... بێ کوردستانی سووریە، سەرجەمی پان و بەرینایی کوردستان دەگاتە ٤٠١٣١١ کیلۆمیتری چوارگۆشە. هەر ئەو ڕەقەمە دەری دەخا کە کوردستان بە یەکێك لە وڵاتانی گەورە و پان و بەرینی ئەم جیهانە دەژمێردرێ.[١٩]

بەپێی زانیارییەکانی ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلامی، سەرجەمی پانتایی کوردستان ٣٩٢,٠٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە. ئەو پانتاییە بە شێوەی خوارەوە

دابــەش دەکرێــت: ١٩٠،٠٠٠ ك.م.چ لــە تورکیــە، ١٢٥،٠٠٠ ك.م.چ لــە ئێــران، ٦٥،٠٠٠ ك.م.چ لە عێـراق و ١٢،٠٠٠ ك.م.چ لـە سـوریە. دیـارە پانتایـی کوردسـتان لـەوە زێدەتـرە. لـە ئەنسـیکلۆپیدیادا ناوچەکانـی ئانتێـپ، مەرعـەش و سـیواس بـە خاکـی کوردسـتان ناژمێـردرێ و هەرچەنـد دانیشـتووانی کـورد لـەو شـوێنانە لەزۆرایەتیــدان.

بــە بــاوەڕی L.Rambout، کوردســتان وڵاتێکــی گــەورە و ســەرجەمی پانتاییەکــەی ٥٣٠،٠٠٠ کیلۆمیــتری چوارگۆشــەیە[20]

لـە «قامـوس الاعـلام» چاپـی ئەسـتەمبوڵ سـاڵی (١٨٩٦)ی زایینـی کـە تەنهـا سـەرچاوەیەکی سـەردەمی ئیمپراتۆریـی عوسـمانییە، دەستنیشـانی وڵاتـی کوردستانی کـردووە. درێـژی خاکـی کوردسـتان بـە ٩٠٠ کیلۆمەتـر و پانییەکـەی لەنێـوان ١٠٠ تـا ٢٠٠ کیلۆمەتـر دانـاوە. ئێسـتا پێوانـەی کوردسـتان لـە وڵاتـی تورکیـا ١٩٠٠٠٠ کیلۆمەتـری چوارگۆشـە، لـە ئێـران ١٢٥٠٠٠ کیلۆمەتـری چوارگۆشـەیە و لـە عێـراق ٦٥٠٠٠ کیلۆمەتـری چوارگۆشـەیە، کـە تێکـڕا پێوانەکـەی دەکاتـە نزیکـەی ٣٩٢٠٠٠ کیلۆمەتـری چوارگۆشـە.[21]

فوئـاد حەمـە خورشـید لـەم بـارەوە دەڵێـت: کوردسـتان دەکەوێتـە نـاو جەرگـەی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتەوە، بەهـۆی ئـەو شـوێنە جوگرافیەشـییەوە گرنگییەکـی سـتراتیژی مەزنـی هەیـە، ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی سێگۆشـەیەکی شـاخاوی پێکدێنـێ کـە سـەرەکانی بەنـدە بـە یەکێتـی سـۆڤیەت لـە باکـوورەوە، کەنـداوی عـەرەب لـە باشـوورەوە و دەریـای ناوەڕاسـت لـە ڕۆژئـاواوە. ڕووبـەری کوردسـتان (٥٠٠ هـەزار) کیلۆمەتـری دووجایـە و لـە ڕووبـەری (کوبـا، سـیلان، سـویسرا، بەلجیـکا، هۆڵەنـدە، پورتـوگال و سـیرالیۆن پێکـەوە) گەورەتـرە...[22]

هەروەهـا د.کەیـوان ئـازاد ئەنـوەر دەڵـێ: ڕووبـەری کوردسـتان نزیکـەی ٥٤٦٢٦٤ کیلۆمیـتری چوارگۆشـەیە. ئـەو خاکەشـی لـەدوای جەنگـی جیهانـی

یەکەم بەم شێوازە دابەش کرا:

-بەشی باکووری خرایە سەردەوڵەتی تورکیای نوێ، کە ڕووبەرەکەی ٢١٩٤٩٢ کم٢ و ٣٠٪ی ڕووبەری خاکی تورکیای گرتۆتەوە. لە گرنگترین پارێزگاکانیشی مەلاتیە، سوعرەت، غازی عەنتاب، ئامەد، ئەرزەڕووم، قارس، ئەرزنجان، وان، بدلیسە.

- بەشی خۆرهەڵاتی خرایە سەر دەوڵەتی ئێران، کە ڕووبەرەکەی ٢١٥٨٩٢ کم٢ە و ١٣٪ی کۆی ڕووبەری خاکی ئێرانی گرتۆتەوە. لە گرنگترین پارێزگاکانیشی (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، کوردستان، کرمانشا، ئیلام)ن.

-بەشی باشووری خرایەسەر دەوڵەتی تازەی ئێراق، کە ڕووبەرەکەی ٨٧١١٧ کم٢ە و ١٧٪ی کۆی ڕووبەری خاکی ئێراقی گرتۆتەوە. گرنگترین پارێزگاکانیشی کەرکوك، هەولێر، سلێمانی و دهۆکن.

-بەشی خۆرئاوای خرایە سەر دەوڵەتی سوریا، کە ڕووبەرەکەی ١٨٣٠٠ کم٢ و ١٠٪ی کۆی ڕووبەری خاکی سوریای گرتۆتەوە. لە گرنگترین پارێزگاکانیشی حەلەب و حەسەکەیە.

- بەشی باکووری خۆرهەڵاتیش هەر لە ساڵی ١٨٢٨ی زایینی دوای شکستی دەوڵەتی قاجاری لە شەڕی گەنجە لە بەرامبەر دەوڵەتی ڕووسیای قەیسەری خرایەسەر ڕووسیا و ڕووبەرەکەی ٥٤٦٣ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.(٢٣)

لە کۆتاییدا ئاماژە بە بۆچوونی دوکتۆر قاسملوو لەو پێوەندییەدا دەکەین. دوکتۆر قاسملوو لە لاپەڕە ١٤ی «کوردستان و کورد»دا باس لەوە دەکا کە: «پێوانەی کوردستان بە تێکڕایی دەگاتە نیزیکەی ٤٠٩٦٥٠ کیلۆمیتری چوارگۆشە یانی بە تەنیا لە خاکی بریتانیا و هولەند (هۆڵەندا) و بێلژیك(بەلجیکا) و سویس و دانمارك بەرینترە. خاکی کوردستان ١٩٤٤٠٠

کیلۆمیــتری کەوتۆتــە بــەر تورکیــا، ١٢٤٩٥٠ کیلۆمیــتری بــەر ئێــران، ٧٢٠٠٠ کیلۆمیــتری بــەر عیــراق و ١٨٣٠٠ کیلۆمیــتری لــە ســوریایە.» [٢٤]

## ژمارەی دانیشتووانی کوردستان

دیاریکردنــی ژمــارەی دانیشــتووانی کوردســتان هــەروەك دیاریکردنــی سـنوورەکەی کارێکــی دژوارە. ئەمــەش لەبــەر کۆمەڵــە هۆکارێــك کــە لێــرەدا بــە کورتــی باســیان دەکەیــن:

«دیاریکردنــی نفووســی کوردســتان کارێکــی زێــدە دژوارە، چونکــە خاوەنــی کیانێکــی سیاســی نیــە، تەنیــا ڕێــگای مومکیــن ئەوەیــە پــاڵ بــەو ســەرژمێریانەوە بدەیــن کــە حکوومەتەکانــی تورکیــا و ئێــران و عێــراق و ســووریا بەپێــی تەقســیماتی کیشــوەریی وڵاتەکانیــان بەڕێوەیــان بــردووە. خــودی ســەرژمێرییەکانیش کەموکوڕییەکــی زۆریــان هەیــە، بــۆ وێنــە ســاڵی ســەرژمێرییەکان لەگــەڵ یــەك جیاوازیــان هەیــە، وردەکاریــان تێــدا بــە کەمــی وەبەرچــاو گیــراوە. ئامارگــەران بــۆ هاســانکردنی کارەکەیــان کەمــتر خۆیــان لــە ناوچــە شــاخاوییەکان داوە، زۆرجــار لــەو شــوێنانە دەســتیان داوەتــە گۆتــرەکاری.

ئــەوە ڕاســتە کوردەکانیــش زۆرجــار بــۆ خۆدزینــەوە لــە ســەربازی خۆیــان لــە ســەرژمێری بــواردووە. لــە ناوچــە پڕحەســتەمەکانیش زۆربــەی خەڵــك لــە ترســی دواڕۆژ و وەدەســت هێنانــی کار و ڕاگرتنــی ســەری خۆیــان، ناچــار بــوون حاشــا لــە میللییەتــی خۆیــان بکــەن و بــە تــورك و عــەرەب و فــارس خۆیــان لەقەڵــەم بــدەن.

کۆچــی وەرزیــی کۆمەڵانــی زەحمەتکێشــی کوردســتان بــۆ دۆزینــەوەی کار لــە بەشــی خشــت بــڕی و خانــوو دروســت کــردن و ڕێگالێــدان و بازرگانــی

سەرپێیی، لەناو بازارەکانی دەرەوەی کوردستان و پاکتاوکردنی مەڵبەندە ئیستراتیژییەکان لە دانیشتووانی کورد و قەلاچۆکردن و هەڵقەندنی خەڵك لەسەر مڵك وماڵیان و ڕادانیان بۆ دەرەوە و، نەبوونی ئازادیی سیاسی و سەرکوتی بێڕەحمانەی خەڵکی کوردستان و، داسەپاندنی ستەمی نەتەوایەتی و هەڵگیرساندنی شۆڕشی ڕزگاریخوازی و زاڵبوونی حاڵەتی نائاسایی بەسەر وڵاتدا و دەس پێکرانی کۆڕەوە سیاسییەکان و... بوونەتە هۆی ئەوە کە ئاماری ڕێك و دروستمان لەسەر دانیشتووانی کوردستان کە بێپسانەوە لە گۆڕاندا بووە، نەیەتە دەست. ئامارە سەرژمێرییەکان گشتیان لە میزانی خۆیان ترازاون و ژمارەی دروستی دانیشتووانی کوردستانمان بۆ دەرناخەن...»(٢٥)

خاڵێکی دیکە کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین ئەوەیەکە بۆ دیاریکردنی ژمارەی دانیشتووانی کوردستان سێ جۆرە سەرچاوە لەبەردەستدان کە هەرکامێکیان ژمارەیەکی جیاواز لەوانی دیکەمان نیشان دەدەن، ئەو سەرچاوانەش بریتین لە:

یەکەم: سەرچاوە ڕەسمییەکانی هەرکام لەو دەوڵەتانەن کە یان لەجێدا دان بە بوونی نەتەوەی کورد دا نانێن، یان هەوڵ دەدەن ئەوەندەی بۆیان بکرێ ژمارەکەی کەم نیشان بدەن.

... کۆمەڵە سەرچاوەی دووهەم ئەو گۆترەکارییانەیە کە ڕێکخراوە زانستییەکان و گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکانی وڵاتان کردوویانە... کۆمەڵە سەرچاوەی سێهەم کتێبە کوردییە ڕەسەکانن و پێویستە بڵێین هێندێکیان ژمارەی نەوتۆیان باس کردووە کە چەشنە زیاد پێوەنانێکی تێدایە. هۆیەکەشی نارەزایی نووسەرەکان لە هەڵوێستی کاربەدەستانی تورکیا و ئێرانە. لەگەڵ ئەوەش لە سەرچاوەکانی دیکە ڕاسترن.(٢٦)

بەھەرحاڵ، لێرەدا بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك باس لە نفووس و ژمارەی دانیشتووانی کوردستان دەکەین:

لە کتێبی (ئاغا، شێخ و دەوڵەت)دا سەرجەمی دانیشتووانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥دا، بە ١٣,٧ تا ١٤,٢ ملوێن کەس خەمڵێنراوە.[٢٧]

یەکەم سەرژمێریی ڕەسمی، دوای جەنگی یەکەمی جیھانی لە ساڵی ١٩٢٧ دا لە کوردستانی تورکیا و عێراق بەرێوە چووە. کوردستانی ئێران ساڵی ١٩٥٦ و لە سووریا ساڵی ١٩٦٠ سەرژمێرییەکانیان دەستی پێکردووە و دواتریش نیوەنیوە هەر بە چەند ساڵ و دە ساڵ جارێك سەرژمێرییەکانیان درێژە پێداوە.

کوردستان، بە ٢٩/٥ میلیۆن و، چڕیی ٧٣/٥ کەس لە هەر کیلۆمیتری چوارگۆشەدا بە یەکێك لە وڵاتە پڕجەمعییەتەکانی دنیا دەناسرێ. لەناو ١٩٤ وڵاتی دونیادا لە ڕیزی سیهەمین وڵات دایە. یەك جێ بەقەرا نفووسی ٧ وڵاتی وەکو سووریە، لوبنان، ئیسرائیل، ئۆردۆن، ئەماراتی عەرەبی، کووەیت و دوبەی لە مەڵبەندی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی تێدەبێ. کورد لەباری نفووسەوە لە ناوچەکەدا هاوتای نەتەوەکانی تورك و عەرەب و فارسە. لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بە چوارەمین نەتەوەی سەرەکیی دادەنرێ.[٢٨]

ژمارەی دانیشتووانی کوردستان لە ٧٥ ساڵی ڕابردوودا (١٩٢٥ ـ ٢٠٠٠) نزیکەی ٢٧ میلیۆن کەسی زیاد کردووە. دوو لەسەر سێی ئەم زیادکردنە، لە ئەنجامی زیادکردنێکی سروشتیدا بووە، کە لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٠,٠٢٧ بووە. بەشێکی دیکەشی لە دەرەوە بۆ کوردستان کۆچیان کردووە. تێکڕای زیادبوونی سەدیی ساڵانە دانیشتووانی کوردستان لەنێوان ساڵانی ١٩٢٥ ـ ١٩٧٥دا، ٢,٦ بوو. ئەم ژمارەیە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٥ ـ ١٩٩٥ بۆ ٢,٩ بەرز

بۆتەوە.[٢٩]

دەتوانین بڵێین: «ئەمڕۆ حەشیمەتی کوردەکان زۆرتر لە ٣٩ ملیۆن کەسە کە ٢٢ ملیۆن ـیان هێشتا لەناو کوردستان دەژین و زۆربەی دانیشتووانی ئەم نیشتمانە پێك دێنن. کەوابوو کورد لەدوای عەرەب و تورك سێیەمین نەتەوەی پڕ حەشیمەتی ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیان. ئێستا حەشیمەتی دوو لە سێی ئەو وڵاتانەی کە ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانن، لە حەشیمەتی کوردستان کەمترە و کوردیش باش ئاگایان لەم ڕاستییە هەیە.»[٣٠]

## باسی دووەم:
## چەند زانیارییەکی گشتی لەسەر ناوچەکە

کوردستان، نیشتمانی کوردان، هەڵکەوتوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ ئەوەیکە لەباری سرووشتییەوە نیشتمانێکی یەکپارچەیە و بەشی زۆری دانیشتووانەکەی لە نەتەوەی کورد پێک هاتووە، بەڵام لە دوو قۆناغی گرنگی مێژووییدا لەژێر کارتێکەریی فاکتەرە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان بەسەر چەند بەشدا، دابەش کراوە و هەر بەشەی خراوەتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکەوە. لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا و لە ئاکامی شەڕ و دەستێوەردانی دوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی و پاش شەڕی چاڵدێران دوو بەش کرا و لەژێر ناوی کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران هەر بەشەی وەبەر یەکێک لەم دوو ئیمپراتۆریە کەوت و، دوای چوار سەد ساڵ بۆ جارێکی دیکە و دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای لە پەلوپۆکەوتووی عوسمانی بەسەر چەند وڵاتی تازەدامەزراودا دابەش کران و بەم پێیەش ئەم بەشەی کوردستانیش بەسەر سێ وڵاتی تازە دامەزراوی تورکیا و سووریا و عێراقدا دابەش کرایەوە.

لێرەدا بە پشت بەستن بە هێندێک لە سەرچاوەکان بە شێوەیەکی ڕوونتر و زیاتر باس لەم دابەشبوونەی نیشتمان و وڵاتی کوردان دەکەین:

«دوابەدوای شەڕی چالدێران، کە لە سەدەی ١٦ دا لەنێوان هەر دوو ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێراندا ڕوویدا، ناوچەکە لەنێوان ئەو دوو ئیمپراتۆرییەدا دابەش کرا.» بۆ جاری دووەم « ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای لە پەلوپۆکەوتووی عوسمانی بەسەر هێزە ئیمپریالیستەکانی ئەوکاتەدا و لەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم دابەش کرا.»[٣١]

لە لاپەڕە١٠و ١١ی بەرگی یەکەمی کتێبی «کوردستان و ئیستراتیژیی دەوڵەتان» یش بەم شێوەیە باسی کوردستانی دابەشکراو کراوە. «هەرچەندە خاکی کوردستان لەڕووی سروشتییەوە یەکدەست و یەکپارچەیە، بەڵام لەبەر دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی دوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی لە سەرەتای سەدەی ١٦ی زایینیدا دووبەش کرا: «کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران»ی لێ کەوتەوە. دوای چوارسەد ساڵ بۆ جارێکی دیکەش، پاش شەڕی یەکەمی جیهانی، ئیستیعماری ئینگلیس و فەرانسە لەباتی تەمبێکردنی تورکەکان، لە ڕێککەوتننانەی سێڤر و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی پاشگەز بوونەوە و کەوتنە جەستەی «کوردستانی عوسمانی»، لەت و کوتیان کرد و بەسەر سێ وڵاتی تازە دامەزراوی تورکیا و سووریا و عێراقدا، دایان بەشیەوە. ڕێککەوتننامەی لۆزان (لە ساڵی ١٩٢٣) ئاکامی ڕێکەوتنێک بوو کە دەوڵەتانی ئیستیعمارگەر بۆ ڕەسمییەت پێدانی دابەشکرانی نەتەوەی کورد و خاکی کوردستان لەسەری ڕێك کەوتن. لە ئەساسدا مەوافەقەتنامەی لۆزان بۆ کورد و وڵاتانی تازە دامەزراو، دوو مانای لێك جیاوازیان هەبوو: بۆ وڵاتانی تازە دامەزراوی تورکیا و عێراق و سووریە بە تایبەتی، دامەزراندنی سێ دەوڵەتی سەربەخۆ و بە ڕەسمی ناسینی حاکمییەتی سەربەخۆی ئەو سێ دەوڵەتە لەلایەن «جامعە ملل»ەوە بوو. بۆ کوردەکانیش، دابەشکردنێکی ڕەزیلانە و بەزۆر لکاندنی کوردستانی عوسمانی بە سێ وڵاتی تازە دامەزراو بوو.

بەم جۆرە کوردستانی یەکپارچە لە دوو قۆناغی جیاوازدا، بوو بە چوار پارچە. ناوی «کوردستانی تورکیا، کوردستانی ئێران، کوردستانی عێراق و کوردستانی سووریا»یان بەسەردا بڕی[٣٢]

## یەکەم: کوردستانی سەر بە تورکیا

● ١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی تورکیا

کوردستانی تورکیا لە دابەشکاریی نێوخۆیی تورکیادا لە ڕابردوو لە ١١ پارێزگا پێك هاتبوو و دواتر بەهۆی دابەشکاریی نوێوە بەسەر ١٧ پارێزگادا دابەش کرا. سەرەنجام لە سەرەتای دەیەی ٩٠ی زایینی بەهۆی دابەشکاریی نوێوە، بوو بە ٢١ پارێزگا. واتە باکووری کوردستان ئێستا لە ٢١ پارێزگا پێك هاتووە کە بریتین لە: دیاربەکر، وان، بینگۆڵ، ئادیامان، ئەلازیغ، باتمان، تونجەلی، ماردین، هەکاری، ئاگری، سعەرد، مووش، بتلیس، ئەرزنجان، ئەرزڕۆم، قارس، مەلاتیە، ئورفە، شرناخ، ئیغدیر و ئەردەهان.[٣٣]

یەکێك لە سەرچاوەکان بە شێوەی خوارەوە ئاماژەی بە ناوچەکانی نیشتەجێبوونی کورد داوە : «دۆرتیۆڵ، قارس، تۆزوولووجە، کاغەزمان، ساری قامیش، خۆڕاسان، پاسینلەر، ئەرزەڕووم، ئاشقەلا، تەرجان، چای یەرلی، ئەرزەنجان، پوولووموور، کەماخ، ڕەفاعیە، عومەروەتلی، زارا، سیواس، یلیچ، دیڤرکی، کەمالیە، حەکیمخان، ئارگوڤان، عارەبگیر، ئاغان، کەبان، دارەندە، ئاغین، چەمشگەزەك، خۆززات، پەرتەك، ئۆڤاچیق، دەرسیم، مازگرت، نازمیە، پالوو، قەرەقۆچان، بێنگۆڵ، کیغی، گەنج، سوڵحان، کارلۆڤا، چات، تەکمان، خنس، ڤارتۆ، قەرەیازی، ئەلەشکیرد، تووقاق، خاموور، قەرەکۆشە، تاشلی

چای، دیادین، ئیغدیر، ئەرالیك، دۆغۆبایەزید، چالدیران، موورادیە، ئەرجیش، پاتنۆس، مەلازگەرد، بوولانیك، ئادیلجەواز، ئاخلات، بەدلیس، تاتوان، مووش، ساسۆن، قوڵپ، لیچە، هانی، دیجلە، مەعدەن، مۆتکی، ئەلازیغ، سیڤریچە، باسقیل، جونگووش، چەرمیك، ئەرغانی، مەڵاتیە، یەشیل یۆرت، ئەقچەداغ، ئەلبیسان، دۆغان شەهیر، چەلیکخان، کەحاتە، ئادیەمەن، سەمسان، بەسنی، گوڵ باشی، عارەبان، یاوزئەلی، پازارچیك، مەرعەش، نیزیپ، ئۆغزەلی، کیلیس، تورك ئۆغلوو، باخچە، ئیسلاحیە، عوسمانییە، ڕیحانە، ئەسکەندەروون، خالفەتی، بیرەجیك، سوورووچ، نوورفە، دیاربەکر، شرباخ، ماردین، سلوپی، باتمان، گەرجووش، شەمدینلی، چوقورچا و... [٣٤]

خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژمارەی پارێزگا و شارەکانی باکووری کوردستان، دەتوانن سەردانی لاپەڕەکانی ٦٢ تا ٧٠ی چاپی چوارەمی کتێبی «جوگرافیای کوردستان» لە نووسینی بەڕێز عەبدوڵڵا غەفوور بکەن.

● ٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی تورکیا بەپێی سەرچاوەکان

گەر پشت بە سەرژمێرییەکەی ١٩٧٠ ببەستین و لە ویلایەت بەرەو خوار بڕوانین و ڕێژەی کورد لە هەر نێوچەیەکدا حسێب بکەین، دەتوانین بێژین ژمارەی کورد لەساڵی ١٩٧٠ لە کوردستانی تورکیادا، خۆی لە نێزیکەی ٥,٧ ملوێنێك داوە. گەر مرۆ ڕێژەی زۆربوونی ژمارەی سەرجەم دانیشتووان وەرگرێت، کە ١٣٪یە، ئەوا لە ساڵی ١٩٧٥ دەگاتە ٦,٥ ملوێنێك. لێرەدا دەبێت ژمارەی ئەو کوردانەشی بخەینەسەر کە لە نێوچەکانی دیکەی تورکیادا دەژین. ڤانلی (مەبەست بەڕێز دوکتۆر عیسمەت شەریف ڤانلی یە) ژمارەیان لە ١٩٦٥ دا بە ملوێن و نیوێك دەخەملێنێت کە بۆ ١٩٧٥ دەگاتە ٢,٢ ملوێن... پێدەچێت قەبڵاندنی ژمارەی کورد بۆ ساڵی ١٩٧٥ لە تورکیادا بە ٧,٥ ملوێن، نەك هەر

زێدەڕۆیی نەبێت، بەڵکە کەمیش گوترابێت.[٣٥]

سەرەتای سەرژمێریی گشتی دانیشتووان لە هەرێمی باکووردا، بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. لەم هەرێمەدا، لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، دوو سەرژمێریی کراوە. یەکەمیان لە ساڵی ١٨٣١ و دووەمیشیان لە ساڵی ١٨٧٦دا بووە، لەدواییشدا درێژە بەو کارە دراوە. یەکەم سەرژمێری گشتیی لە چوارچێوەی کۆماری تورکیای نوێدا، لە ساڵی ١٩٢٧ دا کرا. لە پاشان هەر پێنج ساڵ جارێک ئەم کارە لەلایەن دامودەزگاکانی ئامارییەوە دووبارە کراوەتەوە. ئاکامی سەرژمێرەکان لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتدا، پیشان دەدەن کە زیادبوونی دانیشتووان لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٦ ـ ١٩٨٥دا، ٥ ملیۆن و ٦٣٧ هەزار کەس زیادی کردووە...[٣٦]

بەگوێرەی هەڵسەنگاندنەکانی دەوڵەتی تورکیا لە ساڵی ١٩٩٢، نزیکەی ١٥ ملیۆن کەس لە حەشیمەتی ٥٩ ملیۆنی گشتیی تورکیا، کوردن. بە واتایەکی تر کورد ٢٥,٤٣٪ی حەشیمەتی وڵاتی تورکیا پێکدەهێنن. سەرچاوە کوردییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ژمارەی ئەو کوردانەی لە تورکیا دەژین، ١٨ یان ٢٠ ملیۆن کەسە. ڕێژەی گەشەی لەدایکبوون لە ناوچە کوردنشینەکان، دوو قاتی نێوەنجی ڕێژەی گەشەی لەدایکبوونە لە وڵاتی تورکیا بەگشتی...

بەهۆی بارودۆخی شەڕاوی کوردستان و دواکەوتوویی ئابووری ـ کە بەهۆی شەڕ زۆرتر بووە ـ دەبینین کە کوردەکانی تورکیا بە شێوازێکی بەرفراوان بەرەو ڕۆژئاوای وڵات ( کە بارودۆخی ئابووری و سیاسی باشترە) کۆچ دەکەن. سەرژمێری خەزەڵوەری ١٩٩٠ پێشان دەدات حەشیمەتی ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا کە دەوڵەتی تورکیا ناوی ناوە ئاناتۆلی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات، ٩/٧٠٤/٤٨٨ کەسە کە لەسەدا ٥١ی، لە گونددا دەژین. لە هەمان ڕێکەوتدا حەشیمەتی کوردەکانی ئیستانبوڵ ٢/٥ ملیۆن کەس بەراورد کراوە،

کەوابوو ئیستانبووڵ بووە بە گەورەترین شاری کوردنشینی جیهان. لەم چەند ساڵەی دواییدا (بەهۆی کۆچی بەرفراوانی کوردەکان) بەرەو ڕۆژئاوای وڵات (بەتایبەت لەدوای ساڵی ١٩٩١ەوە) ئێستا شارە تورکنشینەکان وەك ئیزمیر، ئەدەنە و میرسین بوونەتە کوردنشین.[٣٧]

بەپێی بەراوردی ساڵی ٢٠١٢ی دامەزراوەی تورك ئیستات، حەشیمەتی کوردەکانی تورکیە بە زیاتر لە ٢٢ ملیۆن کەس خەمڵێنراوە.[٣٨]

● ٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی تورکیا

عەبدوڕڕەحمان قاسملوو پێوانەی ڕووبەری ئەم بەشەی خاکی کوردستان بە ١٩٤٤٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشە دیاری دەکات. واتە «خاکی کوردستان ١٩٤٤٠٠ کیلۆمیتری کەوتۆتە بەر تورکیا.»[٣٩]

بەڕێز کەندال لە کتێبی «گەلێکی پەژموردە و نیشتمانێکی پەرت» لەم پێوەندییەدا گوتوویەتی: «کوردستانی تورکیا لەنێو هەرێمە کوردییەکاندا پان و بەرینتریانە و دانیشتووانی پترن. بەندەری ئەسکەندەروونە و شاخەکانی تورس سنووری ڕۆژئاوای پێکدێنن و یەکێتی سۆڤیەت «ئەرمینیا» و ئێران سنووری ڕۆژهەڵاتن و زنجیرە شاخەکانی بونتیك سنووری باکوورن و سنووری باشووریش هێڵە سنوورییەکەی نێوان تورکیا و سووریا و عێراقە. بەکۆی ڕووبەری ٢٣٠٠٠٠ کم٢ (دەکاتە ٣٠٪ی کۆی ڕووبەری تورکیا)و هەژدە پارێزگا (ویلایەت) لەڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵی تورکی لێ پێکهاتووە.»[٤٠]

دیارە لە بەینی ئەم ١٩٠ هەزار و ئەم ٢٣٠ هەزارەدا ژمارەی تر لەلایەن نووسەرانی تر خراونەتەڕوو کە پێویست ناکات لێرەدا ئاماژە بە هەموویان بکرێ چونکە زۆربەیان هەر لە دەوری ئەم ژمارانە دەسووڕێنەوە.

## ◄ دووەم: کوردستانی سەر بە ئێران

### ● ١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئێران

دیارە بۆ دیاریکردنی شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئێران هەروەك زۆر بابەتی دیکە، ڕای جیاواز هەیە و سەرچاوەکان بەشێوەی جۆراوجۆر باسیان لێوەدەکەن. زۆر لە سەرچاوەکان تەنیا ئەو چوار پارێزگایە وەك بەشی کوردستانی ئێران ئەژمار دەکەن کە لە هێندێك لە نەخشەکانی کوردستاندا دیاری کراون. بەلام لە ژمارەیەکی دیکە لە سەرچاوەکاندا سنوورەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاتیان زۆر بەرەو خوارتر بردووە و لوڕستان و بەشێك لە هەمەدان و زۆر ناوچەی خوارتریشیان لەگەڵ حیساب کردووە.

بە سەرنجدان بە مێژووی کۆنی کوردستان بە تایبەت لەم بەشەی خاکی کوردان و هەروەها سیاسەتی بەرتەسك کردنەوەی خاکی کوردستان لەلایەن دەسەلاتدارە جۆراوجۆرەکانی حاکم بەسەر ئەو خاکەدا، بە ڕوونی دەردەکەوێ کە ناوچە کوردستانیی و کوردنشینەکانی ئەم بەشە لە کوردستان زۆر لەوە فراوانتر و بەربلاوترن کە لە چوارچێوەی چوار پارێزگادا کۆ بکرێنەوە.

لە یەکێك لەو سەرچاوانەدا هاتووە: «ئەو پارچەیەی کوردستان ئەو ناوچانە دەگرێتەوە: ماکۆ، خۆ، سەلماس، ورمێ، شنۆ، نەغەدە، مەهاباد، میاندواو، پیرانشار، سەردەشت، بانە، سەقز، بۆکان، سایینقەلا، بیجاڕ، مەریوان، سنە، دیواندەرە، قوروە، سونقوڕ، کەنگاوەر، پاوە، نەوسود، کرماشان، سەرپێلی زەهاو، قەسری شیرین، ئیسلام ئاباد (شاە ئاباد)، گیلانی غەرب، ئیلام، هەروەها بەشی زۆر بەختیاری و لوڕستان و کۆهگیلویە و بۆیرئەحمەدی، کە لە نەخشەکانی بلاوکراوە لەسەر کوردستان نەهاتوونە ئەژمار.(٤١)

لە کتێبی «کوردستان و کورد لە ڕوانگەی نەخشەوانیەوە»، کە سەرچاوەکەی

چاپی پێنجەمی «جوگرافیای کوردستان»ی بەڕێز عەبدوڵڵا غەفووره، شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتی بە شێوەی خوارەوە باسیان کراوە:

***پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا:***

١ـ ورمێ. ناحیەکانی: سەنتەر (ورمێ)، سۆما و برادۆست (کەنگەچین)، سیلوانە، ئینزل (قوشچی)

٢ـ مهاباد. ناحیەکانی: سەنتەر.

٣ـ بۆکان. ناحیەکانی: سەنتەر.

٤ـ خۆی. ناحیەکانی: سەنتەر، چای پارە (قەرەزیادین).

٤ـ ماکۆ. ناحیەکانی: سەنتەر، سیاچەشمە، پلودەشت (شائاباد).

٥ـمیاندواب. ناحیەکانی: سەنتەر.

٦ـ سایین قەڵا. ناحیەکانی: سەنتەر.

٧ـ تەکاب. ناحیەکانی: سەنتەر.

٨ـ سەلماس. ناحیەکانی: سەنتەر.

٩ـ نەغەدە. ناحیەکانی: سەنتەر.

١٠. شنۆ. ناحیەکانی: سەنتەر.

١١. سەردەشت. ناحیەکانی: سەنتەر.

١٢. پیرانشەهر. ناحیەکانی: سەنتەر.

***پارێزگای کرماشان:***

١ـ کرماشان. ناحیەکانی: سەنتەر.

٢ـ سەحنە. ناحیەکانی: سەنتەر.

٣ـ هەرسین. ناحیەکانی: سەنتەر.

٤ـ قەسری شیرین. ناحیەکانی: سەنتەر، سۆمار.

٥ـ پاوە. ناحیەکانی: سەنتەر، نۆدشە، نەوسوو، باینگان.

٦ـ جوانرۆ: ناحیەکانی: سەنتەر.

٧ـ سەلاسی باباجانی: ناحیەکانی: سەنتەر.

٨ـ ڕوانسەر. ناحیەکانی: سەنتەر، شاهۆ.

٩ـ ئیسلام ئاباد. ناحیەکانی: سەنتەر.

١٠ـ داڵەهۆ. ناحیەکانی: سەنتەر، کەرەند.

١١ـ سونقوڕ. ناحیەکانی: سەنتەر.

١٢ـ کەنگاوەر. ناحیەکانی: سەنتەر.

١٣ـ سەرپێڵی زەهاب. ناحیەکانی: سەنتەر.

١٤. گیلانی غەرب. ناحیەکانی: سەنتەر.

***پارێزگای کوردستان:***

١ـ سنەر. ناحیەکانی: سەنتەر.

٢ـ دیواندەرە.

٣ـ کامیاران.

٤ـ مەریوان. ناحیەکانی: سەنتەر، خاومیر ئاباد (خاو)، کەلەتەرزان (تیژتیژ)، سەرشیو.

٥ـ سەروئاباد.

٦ـ سەقز. ناحیەکانی سەنتەر.

٧ـ بانە. ناحیەکانی: سەنتەر، نەنور، ئالوت، نەمەشیر.

٨ـ بیجار: ناحیەکانی: سەنتەر.

٩ـ دێگوڵان.

**پارێزگای ئیلام:**

١ـ ئیلام. ناحیەکانی: سەنتەر، چوار.

٢ـ ئەیوان. ناحیەکانی: سەنتەر.

٣ـ دێهلۆران. ناحیەکانی: سەنتەر، موسیان، زەرین ئاباد (میمە).

٤ـ میهران. ناحیەکانی: سەنتەر، سالح ئاباد، ئەرکەوازی (قەلادەرە).

٥ـ بەدرە. ناحیەکانی: سەنتەر (دەرەشەهر)، بەدرە (ئەبهەری بالا).

٦ـ ئابدانان. ناحیەکانی: سەنتەر

٧ـ شیروان و چرداول. ناحیەکانی: سەنتەر (لومار).(٤٢)

بەڵام لە چاپەکانی پێشووتری «جوگرافیای کوردستان (بۆ نموونە چاپی چوارەم) بێجگە لەم چەند پارێزگا و قەزایە باس لە چەند قەزای پارێزگاکانی چەهارموحال و بەختیاری ، لوڕستان، کۆهگیلویە و بوێرئەحمەد و تەنانەت هێندێك شاری پارێزگاکانی خوزستان و فارسیش کراوە و ناویان هاتووە.

بەڕێز مامۆستا کەریم زەند پێی وایە: «دەتوانرێت کوردستانی ئێران لە باکوورەوە بۆ باشوور بەسەر پێنج هەرێمدا دابەش بکرێت کە هەریەکەیان چەند شار و ناوچەی جیاواز دەگرێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ـ هەرێمی ورمێ: ورمێ، ماکو، خۆی، سلماس، دیلمان، قتوور، سۆما، پۆلدەشت، تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ و برادۆست و چەند ناوچەی دی دەگرێتەوە.

٢ـ هەرێمی موکریان: سابڵاغ (مەهابادی ئێستا)، شنۆ، میاندواو، بۆکان، لاجان، نەغەدە، هەوشار، سلدوس، سەردەشت، تیکانتەپە و هەندێك شوێنی دی دەگرێتەوە.

٣ـ هەرێمی ئەردەڵان: سنە، سەقز، بانە، سەرشیو، تیلەکۆ، خورخوڕە، حەسەن ئاوا، مەریوان و هەورامانی لهۆن دەگرێتەوە.

٤ـ هەرێمی کرماشان: کرماشان، کنگاوەر، هەرسین، سەحنە، کەرەند، بێلوار، قەسری شیرین، بایروەند، جوانڕۆ، ڕەوانسەر، ماهی دەشت، گەیلان، نەفت شاه و کامیاران دەگرێتەوە.

٥ـ ناوچەی لوڕستان و چوارمەحاڵی بەختیاری: سەمەرە، بروجەرد، خورەم ئاوا، مەلایەر، نەهاوەند و تویسرکان دەگرێتەوە و بەرەو باشوور شۆڕ دەبێتەوە تا کۆتایی چیای زاگرۆس و زێدی عەشیرەتەکانی لەك و زەند و لوڕی بچوك.[٤٣]

● ٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی ئێران بەپێی سەرچاوەکان

لە سەرژمێرەکانی ١٩٥٦ و ١٩٦٦دا، کورد بە جودا نەژمێردراون، وەلێ وەك موسوڵمانی سوونی، بە ١٠٪ی دانیشتووان دانراون. لەمەوە دیارە کورد بڕێك لە ١٠٪ی دانیشتوان پتر پێك دەهێنێت. لەپاڵ کورددا، تەنها ژمارەیەکی کەم تورکمان و هەندەك کەمە نەتەوەیی گچکەی دیکەی خۆرهەڵاتی ئێران، سوننین. بەڵام ژمارەیەکی فرە لە کوردەکانی ئوستانی کرماشان و خۆراسان شیعەن. قرساندنی ژمارەی کورد بە ٣,٥ ملوێن لەلایەن ساڵنامەی نیوەڕەسمیی ئێرانەوە لە سەرەتای حەفتاکاندا، یاخود گەر ڕێژەی زێدبوونی دانیشتووان حسێب بکەین، پێدەچێت لایەنی کەم ٣,٥ ملوێن بۆ ساڵی ١٩٧٥، جێگەی باوەڕ بێت. ڕەنگە ژمارەی ڕاستەقینەیان لەوەش زێتر بێت.[٤٤]

لە «جوگرافیای کوردستان»دا باس لەوە کراوە کە: یەکەم سەرژمێریی گشتیی لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتدا، لە ساڵی ١٩٥٦ دا کرا. لەدواییدا هەر دە ساڵ جارێ ئەم کارە ئامارییە دووبارە کراوەتەوە...

ئاکامی سەرژمێرەکان لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتدا، پیشان دەدەن کە زیادبوونی دانیشتوان لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٦ ـ ١٩٨٥دا، ٥ ملیۆن و ٦٣٧ هەزار کەس زیادی کردووە...[٤٥]

لە سەرچاوەیەکی تردا گوتراوە کە ٨ ملیۆن لە حەشیمەتی ٥٧ ملیۆنی گشتی ئێران، کوردن. واتا کورد لە سەدا ١٤ی حەشیمەتی ئێران پێکدەهێنن.[٤٦]

دیارە ئەم ژمارەیە هی ئەو کاتەیە کە حەشیمەتی گشتیی ئێران ٥٧ ملیۆن کەس بووە. ئەگەر هەروەك ئەم سەرچاوەیە ئاماژەی پێکردووە، کورد لە سەدا ١٤ی حەشیمەتی ئێران پێك بێنن، ئەوا ڕێژەی کورد بەو حیسابەی کە ئێستا حەشیمەتی ئێران زیاتر لە ٧٥ ملیۆن کەسە، دەبێتە زیاتر لە دە ملیۆن کەس.

● ٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی ڕۆژهەڵات

عەبدولڕەحمان قاسملوو پێوانەی ڕووبەری ئەم بەشەی خاکی کوردستان بە ١٢٤٩٥٠ کیلۆمیتری چوارگۆشە دیاری دەکات. واتە « خاکی کوردستان ١٢٤٩٥٠ کیلۆمیتری کەوتۆتە بەر ئێران.»[٤٧]

دوکتۆر قاسملوو لە کتێبی « گەلێکی پەژموردە و نیشتمانێکی پەرت»دا جارێکی دیکە سەبارەت بە ڕووبەری کوردستانی ئێران وتوویەتی: « ڕووبەری کوردستانی ئێران خۆ دەدات لە ١٢٥٠٠٠ کم٢. درێژی ئەو هەرێمە بە درێژایی شاخی ئارارات تا باشووری زنجیرە شاخی زاگرۆسە. مەرزەکانی نێوان تورکیا و ئێران، عێراق و ئێران لەلای ڕۆژئاواوە بوونەتە سنوور لەنێوان کوردستانی ئێران و کوردستانی تورکیا و هەروەها کوردستانی عێراق. لە ڕۆژهەڵاتەوە دەلکێت بە گۆلی (ورمێ)وە. ناوچەیەکی شاخاوییە و شارەکانی لە بەرزی (نزیکەی هەزارمەتر)دا جێگیر بوون.»[٤٨]

بەڵام بەڕێز «فوئاد حەمە خورشید» ڕووبەری ئەم بەشەی کوردستانی بە ١٨٩,٣٩٤ کیلۆمەتری چوار گۆشە داناوە.[٤٩] هەروەها «د.کەیوان ئازاد ئەنوەر»یش ڕووبەری ئەم بەشە لە خاکی کوردستانی بە ٢١٥٨٩٢ کیلۆمەتری چوارگۆشە داناوە کە ١٣٪ی کۆی ڕووبەری خاکی ئێران دەگرێتەوە.[٥٠]

خاڵێکـی گرنـگ کـە دەبـێ ئامـاژە پێبکـرێ ئەوەیـە هـەم بـۆ ڕووبـەری کوردسـتانی ئیـران و هـەم بـۆ ڕووبـەری بەشـەکانی دیکـەی کوردسـتان بەپێـی ئـەو شـار و ناوچانـەی دەکەونـە نێـو سـنوورەکانی ئـەو بەشـەوە، ڕووبەرەکـەش گۆڕانـی بەسـەردا دێ. کەواتـە شـتێکی سرووشـتییە کـە ژمـارەی جیـاواز بـۆ ڕووبەرەکـەی بوتـرێ هـەروەك چـۆن لەسـەر مەسـەلەی سـنووری هـەرکام لـەو بەشـانەش ڕای جیـاواز هەیـە.

## ◄ سێیەم: کوردستانی سەر بە ئێراق

### ● ١ـ *شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئێراق*

هەرێمـی کوردسـتانی عێـراق بریتییـە لـەو بەشـە کوردسـتانەی کـە دەکەوێتـە نێوان سـنووری دەوڵەتی عێراقەوە کە دوابەدوای شـەڕی جیهانـی لە ١٦ی کانوونی یەکەمـی ١٩٢٥ دا بـە عێراقـەوە لکێـنراوە. هەرێمـی کوردسـتان لـەڕووی بـەرزی و نزمییـەوە خاکەکـەی لـە بەرزاییەکانـی حەمریـن ٢٠٠ مەتـر لـە سـەرووی دەریـاوە دەسـت پێـدەکات تاکـوو بەرزاییەکانـی چیـای حەسارۆسـت لوتکـەی هەڵگـورد کـە ٣٦٠٠ مەتـر لـەڕووی دەریـاوە لـە هەرێمەکانـی تـر جیـا دەکرێتـەوە. ئـەم هەرێمـە کـە بەشـی هـەرە زۆری دانیشـتووانەکەی کـوردن، کەواتـە: لـە ناوەڕاسـتی عێراقـەوە لـە باشـووری ڕۆژهەڵاتـی شـارۆچکەی بـەدرە لـە پارێـزگای واسـت دەسـت پێـدەکات، بـەرەو باکـوور تاکـوو پردی نـەوت لـە ڕۆژئاوای شـارۆچکەی مەندەلـی هەڵدەکشـێ، بـە تەنیشـت بەرزاییەکانـی حەمرینـەوە تـا فەتحـە دەڕوا و شـان بـە شـانی ڕووبـاری دیجلـە سـەر دەکـەوێ و لـە باکـووری شـاری مووسـڵ بـەرەو باشـووری ڕۆژئـاوا بادەداتـەوە بـە ئاراسـتەی شـارۆچکەی حـەزەر پاشـان

بەرەو ڕۆژئاوا بە ئاراستەی سنووری عێراق ـ سووریا لە باکووری شارۆچکەی بەعاج[٥١]

لە یەکێك لەو سەرچاوانەدا هاتووە: «ئەو پارچەی کوردستان ئەو ناوچانە دەگرێتەوە: زێبار، ئاکرێ، چۆمان، دیانان، ڕەواندز، زاخۆ، دهۆك، شێخان، ئامێدی، مووسڵ، قەرەقووش، تەلەعفەر، تەلکێف، شەنگار، مەخموور، دوبز، کەرکووك، چەمچەماڵ، حەویجە، هەولێر، شەقڵاوە، قەڵادزێ، ڕانیە، کۆیە، دووکان، سلێمانی، چوارتا، پێنجوێن، دەربەندیخان، تووزخورماتوو، کفری کەلار، خانەقین، مەندەلی، بەدرە.[٥٢]

لە لاپەڕە ٢٨٦ ـ ٢٨٨ی چاپی چوارەمی «جوگرافیای کوردستان»دا بەم شێوەیە پارێزگا و قەزاکانی کوردستانی ئێراق ئاماژەیان پێکراوە:

***پارێزگای دهۆك:***

١ـ سەنتەر. ناحیەکانی: سەنتەر، سێمێل، دۆسکی (مانگیش)، زاویتە.

٢ـ ئامێدی. ناحیەکانی: سەنتەر، سەرسەنگ، نیروەوڕێکان (بیبۆ)، بەرواری باڵا (کانی ماسی).

٣ـ زاخۆ. ناحییەکانی: سەنتەر (شرانش)، کولی (باتوقە)، ڕزگاری (بریام خەلیل)، سلیڤانی (عاسی).

***پارێزگای سلێمانی:***

١ـ سەنتەر. ناحیەکانی: سەنتەر، تانجەڕۆ (عەربەت)، بازیان (تەیناڵ)، سەرچنار، قەرەداغ.

٢ـ هەڵەبجە. ناحیەکانی: سەنتەر، سیروان (کێلەسپی)، خورماڵ، بیارە، شارەزوور (سەیدسادق).

٣ـ پێنجوێن. ناحیەکانی: سەنتەر، گەرمك.

٤ـ شارباژێڕ. ناحیەکانی: سەنتەر (چوارتا)، سیوەیل (باسنێ)، سروچك (بەرزنجە)، ماوەت.

٥ـ پشدەر. ناحیەکانی: سەنتەر (قەڵادزێ)، هێرۆ، ناودەشت (سەنگەسەر).

٦ـ ڕانیە. ناحیەکانی: سەنتەر، ڕانیە، چوارقوڕنە، بێتواتە، مەرگە (بنگرد).

٧ـ دوکان. ناحیەکانی: سەنتەر، سورداش، چناران (خەلەکان).

٨ـ دەربەندیخان. ناحیەکانی: سەنتەر

٩ـ چەمچەماڵ. ناحیەکانی: سەنتەر، ئەغجەلەر، سەنگاو (گۆك تەپە).

١٠ـ کەلار. ناحیەکانی: سەنتەر، بێباز (باوەنور)، تیلەکۆ.

### پارێزگای هەولێر:

١ـ هەولێر. ناحیەکانی: سەنتەر، عەینکاوە، قوشتەپە، خەبات (هەنجیرۆك).

٢ـ مەخموور. ناحیەکانی: سەنتەر، گوێڕ، قەراج (باقرتە)، کەندیناوە (دیبەگە).

٣ـ کۆیە. ناحیەکانی: سەنتەر، تەقتەق، شۆڕش (دێگەڵە).

٤ـ ڕواندز. ناحیەکانی: سەنتەر، دیانا، خەلیفان، برادۆست (سیدەکان).

٥ـ زێبار. ناحیەکانی: سەنتەر (مێرگەسۆر)، بارزان، مزوری باڵا (شێروان مازن).

٦ـ شەقڵاوە. ناحیەکانی: سەنتەر، هەریر، سەلاحەدین، خۆشناو (هیران).

٧ـ چۆمان. ناحیەکانی: سەنتەر، باڵەك (گەڵاڵە)، حاجی ئۆمەران.

### پارێزگای کەرکووك:

١ـ سەنتەر. ناحیەکانی: سەنتەر، تازەخورماتوو، داقوق، یایجی، قەرە حەسەن (لەیلان)، شوان (ڕێدار).

٢ـ حەویجە. ناحیەکانی: سەنتەر، عەباسی (جبور)، ڕیاز.

٣ـدوبز. ناحیەکانی: سەنتەر، ئاڵتور کۆپری.

***پارێزگای نەینەوا:***

**١ـمووسڵ. ناحیەکانی: سەنتەر، بەعشیقە، زاب (شەك).**

**٢ـ حەمدانیـە. ناحیەکانـی: سـەنتەر (قەرەقـوش)، نەمـرود (خـزر)، بەرتەڵلـە، کەڵـەك (ئاسـکی کەڵـەك).**

٣ـتلکێف. ناحیەکانی: سەنتەر، ئەلقوش. وانە.

**٤ـشەنگار. ناحیەکانی: سەنتەر، شیمال (سنونی).**

**٥ـتەلەعفەر. ناحیەکانی: سەنتەر، زومار، عیازیە (ئاڤەگەنی)، ڕەبیعە.**

**٦ـشێخان. ناحیەکانی: سەنتەر (عەین سفنی)، مریبە، مزووری (ئەتروش).**

**٧ـعەقـرە. ناحیەکانـی: سـەنتەر، نەهلە (دینارتە)، عەشـایەر سـەبعە (بـەردەڕەش)، سـورچی (بجێل)، گروەسێن.**

**••**

**١ـخانەقین. ناحیەکانی: سەنتەر، جەلەولا، سەعدیە، مەیدان، قۆرەتو.**

**٢ـمەندەلی. ناحیەکانی: سەنتەر، بەلەدروز، قەزانیە.**

**٣ـ کفری. ناحیەکانی: سەنتەر، قەرەتەپە، کۆکس، سەرقەڵا، جەبارە.**

**••**

**١ـمیقدادییە. ناحیەکانی: سەنتەر، مەنسوورییە.**

**••**

**١ـ توزخورماتـوو. ناحیەکانـی: سـەنتەر، ئامیرلـی، سـلێمان بـەگ، نەوجـۆل، قادرکـەرەم.**

**••**

**١ـبەدرە. ناحیەکانی: سەنتەر، جەسان، زڕباتییە.** [٥٣]

**● ٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی ئێراق بەپێی سەرچاوەکان**

یەکەم سەرژمێری لە هەرێمی باشووردا، لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینیدا بوو. لەو کاتەوە تاکوو ئەمڕۆ، شەش جاری دیکە سەرژمێری گشتی کراوە. بڕیاریش دراوە کە هەر دە ساڵ جارێ، دووبارە بکرێتەوە. بڕیارەکەش بەشێوەیەکی گشتیی پەیڕەو کراوە، جگە لە سەرژمێریی گشتیی پێنجەم نەبێ کە دەبووایە ساڵی ١٩٦٧ بە ئەنجام بگەیەنرێت بەڵام لەبەر هەندێ هۆی ڕامیاریی، سەربازیی بەتایبەتی بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ١١ی سپتەمبەری ساڵی ١٩٦١ و دامەزراندنی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە، نەتوانراوە بە تەواویی ژمارەی دانیشتووانی هەرێمەکە دیاری بکرێ، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووان دەسنیشان بکرێ، لەبەر ئەوەی سەرژمێرییەکەیان دوو ساڵ پێش خست واتە ساڵی ١٩٦٥ ئەنجامیان دا.

ژمارەی دانیشتووانی هەرێمی باشووری کوردستان لە شەست ساڵی ڕابردوودا (١٩٢٧ـ١٩٨٧)، ٣ ملیۆن و ٦١٥ هەزار کەسی زیاد کردووە... [٥٤]

لە سەرژمێرییەکانی ساڵانی ١٩٢٢ تا ١٩٢٤ و ١٩٣٥ دا، ئەوەدەمی کە پێدەچێت ژمارەی کورد هێشتا بێ دەستێوەردان ئاشکرا کرابێت، دەگاتە ٢٣٪ی سەرجەمی دانیشتووانی عێراق... ساڵی ١٩٧٥ سەرجەمی ژمارەی دانیشتووانی عێراق خۆی لە ١١ ملوێنێك دەدا. بەوپێیە ژمارەی کورد لایەنی کەم بە ٢ تا ٢,٥ ملوێنێك دەخەملێنرێت. [٥٥]

ئەگەرچی سەرژمێرییەکی فەرمی لە ڕادەی حەشیمەتی ئەم بەشە لە کوردستان لەدەستدا نیە، بەڵام دوایین بەراوردەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، حەشیمەتی ئەم ناوچەیەی بە نزیکەی ٥ ملیۆن و دووسەد هەزار کەس خەملاندووە.

### ● ٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی باشوور

لەسەر ڕووبەری کوردستانی باشوور، زانایان ڕای جیاوازیان هەیە، لەبەر ئەوەی خاکی کوردستان دابەش کراوە بەسەر چەند دەوڵەتێکدا و هەریەکێك لەم دەوڵەتانە ڕێگەیان نەداوە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ڕووپێو بکرێت، بەڵام زۆربەی جوگرافیزانەکان یەکدەنگن لەسەر ڕووبەری هەرێمی کوردستانی ئێراق کە دەکاتە ٨٧١١٧ کیلۆمەتری چوارگۆشە کە دەکاتە زیاتر لە ١٩,٦٢٪ی سەرجەمی ڕووبەری عێراق کە ٤٤٦٧١٣ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و هەروەها ١٦٪ی هەموو ڕووبەری کوردستان پێکدێنێت. ڕووبەری هەرێم لە بەشێك لە سەرچاوەکاندا بەم شێوەیە:ـ

ـ شاکر خەسباك بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕووبەری کوردستانی باشووری کە ئەو بە العراق الشمالي ناوی بردووە بە (٩٢٠٩٩) کم٢.

ـ کەریم زەند، جوگرافیای کوردستان،چاپی دووەم ٢٠٠٥، ڕووبەری هەرێمی کوردستانی بە (٨٧٠٠٠) کم٢ دیاری کردووە.

ـ مینە قادر مینە لە کتێبی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان ڕووبەری (٨٦٠٠٠) کم٢ دیاری کردووە.

ـ عەبدوڵڵا قەرەداغی لە کتێبی ڕاگوێزانی کورد لە مێژوودا، چاپی دووەم، ٢٠٠٤، ڕووبەری بە (٨٦٠٠٠) کم٢ دیاری کردووە.

ـ دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو، کوردستان و کورد، چاپی دووەم، ٢٠٠٦، وەرگێڕانی عبداللە حسن زادە، ڕووبەری هەرێمی بە (٧٢٠٠٠) کم٢ دیاری کردووە.

ـ د. سلیمان عبداللە لە سەنتەری برایەتی ژمارە ١١٢ی ساڵی ١٩٩٩ ڕووبەری بە ٨٦٠٠٠ کم٢ دیاری کردووە.[٥٦]

## ◄ چوارەم: کوردستانی سەر بە سووریا

### ● ١ـ شار و ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی سووریا

سەرچاوەکان بە شێوەی جۆراوجۆر باسیان لە شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد لەم بەشە لە کوردستان کردووە. بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك باس لەو شار و ناوچانە دەکەین کە کوردەکانی کوردستانی سووریا ی لێ نیشتەجێن:

ئەو پارچەیەی کوردستان ئەو ناوچانە دەگرێتەوە: بالوونە، قامیشلی، حەساویەفەقانی، حەسەکە، تەلتەمەر.(٥٧)

کورد لە سوریا لە سێ ناوچەی بنچینەیی دەژین، ئەوانەش «کورد داغ» کە شارێکە و دەکەوێتە سەرگردێکی هەڵەتاوی لە باکووری ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژهەڵاتی حەلەب. «جەزیرە» ئەم ناوچەیەش دەکەوێتە نێوان هەر دوو ڕووباری دیجلە و فورات و درێژ دەبێتەوە لە دەوروبەری جەرابلووس و «عین العرب» لە بەرامبەری سنووری تورکیا، سێیەمیان دەکەوێتە گەورەترین کۆمەڵگە لە باکووری جەزیرە لەدەوروبەری قامیشلی..

***پارێزگای جەزیرە:*** هەرێمی جەزیرە کە مەڵبەندەکەی حەسەکەیە، ٧٠٠ گوندی کوردی و دەوری پێنج شاری کوردی لێیە، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا ئەمانەن: دێریك، قامیشلی (گەورەترین شاری کوردییە)، ئامووودێ، دەرباسییە، سەرێ کانی.

جەزیرە لە بنچینە و کۆندا هەموو زەوییە درێژ بووەکانی نێوان دیجلە و فوراتی دەگرتەوە، جەزیرە واتەی دورگە دەگەیەنێ، چونکە کەوتۆتە نێوان دیجلە و فوراتەوە، بەڵام ئێستا و لە دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتیدا لە سووریا واتەی پارێزگای حەسەکە دەگەیەنێ و دەگرێتەوە.

**حەسەکە:** شارێکە دەکەوێتە بەشی خوارووی جەزیرە و پایتەختەکەشیەتی ـ مەڵبەندەکەیەتی ـ بەشی زۆر کوردانی ئەم شارە ئێزیدین و لە ناوچەی گۆمی خاتوون دەژین، ئەو ئێزیدییانە لەهەمان ڕەگەزی چیای شەنگارن لە کوردستانی عێراق. ئەم شارە لە شێوەی گوندێکی گەورەیە بەوە کە لەلایەنی چاودێری کردن و پەرەپێدان گرنگیی پێنەدراوە، هەروەکو لەلایەنی پیشەسازی و کارگەسازیدا هەژار و گوێ پێنەدراوە.

*قامیشلی:* شاری قامیشلی دەکەوێتە دەشتە فراوانەکەی جەزیرە و گەورەترین شاری کوردییە لە جەزیرە. شارەکە مۆرکێکی لادێیی بەسەردا زاڵە، زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن لەگەڵ ئەوەش هەندێ هۆزی عەرەبی لە باشووری بیابانی «ناوچەی ڕەد» چوونەتە ناویەوە، هەروەها هەندێ مەسیحی و جوولەکەشی تێدایە. زۆر شوێنگەی شوێنەوار و کۆنینەی تیا دۆزراوەتەوە.

*کورداغ:* دەڤەرێکە لە کوردستانی سووریا لەڕووی نەخشەی دەوڵەتەکەدا دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا لە دوو لاوە، هەروەکوو دەڤەری کۆتاییە لە باکووری ڕۆژئاوای سووریا بەرامبەر بە دەڤەری ئەسکەندەروونە و عەنتاب لە تورکیا. ناوچەیەکی شاخاوییە دەکەوێتە بەشی باکووری ڕۆژئاوای حەلەب... دانیشتووانی کورداغ دابەش دەبن بەسەر ٣٦٠ گوندی ئاوەدان و هەرێمی شاخاوی ڕۆژئاوای کوردستان پێك دەهێنن لەناو سووریا، ئەم قەزایە زۆر فراوانە و پڕە لە تەپۆلکە و بێشەی چڕ و دالیای مێو و زەیتون و میوەی تر. زۆربەی دانیشتوانەکەی بە ڕەسەن کوردن. بنکەی ئەم قەزایە عەفرینە کە بریتییە لە شارێکی تازە دروستبووی قەشەنگ.

*سەرێ کانیێ «رأس العین»:* شارێکە دەکەوێتە نزیك سنووری تورکیا لەگەڵ سوریا. لە کوردستانی سووریا ناوچەیەکی دەشتایی و بەپیتە، درێژەی دەشتەکانی شەنگارە لە کوردستانی عێراق و نسێبین و حەڕان لە کوردستانی

تورکیا. ئەم شارە لە سەردەمی میتانیەکان پێی وتراوە «سێ کانی» و لە تەوراتیشدا بە «غوزانا» ناوی هاتووە و عەرەبیش پێیان وتووە «رأس العين».

***کۆبانی (عەرەب پینار، عين العرب):*** ناوچەیەکە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری حەلەب و ڕۆژهەڵاتی ئەو پارچەیە کە ڕووباری فوراتی تێدا دەڕژێتە ناوخاکی سوریا، ناوچەکە بە گشتی کوردییە و ١٢٠ گوندی تێدایە کە دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا ـ سوریا لە باکوور و سەر بە پارێزگای حەلەبیشە.

**دەرباسیە:** شار و ناوچەیەکی کوردنشینە، سەر بە پارێزگای حەسەکەیە.[٥٨]

بە سەرنجدان بەم سەرچاوانە و چەند سەرچاوەیەکی تر و هەروەها ئەو نەخشە(خەریتە)یەی کوردستان کە بڵاو بۆتەوە، دەتوانین بڵێین کوردەکانی ڕۆژئاوای کوردستان لە شارەکانی قامیشلی، بەلونە، حەسەکە، حساویەفەقانی، تەلتەمەر، تەلئەبیەز، کوبانی (عەینولعەرەب) و عەفرین و هەروەها گوندەکانی سەر بەم شارانە نیشتەجێن و بێجگە لەوانەش لە هێندێك لە شار و ناوچەکانی ناو سووریا وەك گەڕەکی کوردان (حی الاكراد) لە دیمەشق و «جرە اللجە» لە قەزای ئەسکەندەروونە و زۆر شوێنی دیکەش نیشتەجێن، بۆ نموونە وەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن دوو لە سێی بەشی کوردی پایتەخت لە گەڕەکی کوردان دەژین و بەشی سێهەمیش بە گەڕەکەکانی تری دیمەشق بڵاو بوونەتەوە.

### ● ٢ـ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی سووریا بەپێی سەرچاوەکان

بێگومان دیاریکردنی ژمارەی دانیشتووانی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی یان هەر بەشە و بەجیا کارێکی زەحمەتە، چونکە تا ئێستاش کورد خاوەنی کیانێکی سیاسیی تایبەت بەخۆی نیە (بێجگە لە هەرێمی کوردستان) و هەموو ئەو سەرژمێریانەی کراون، یان حکومەتەکانی تورکیا و سوریا و عێراق و ئێران ئەنجامیان داون یان لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە هێندێك جار لەڕێی

لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و هەندێك جاریش بەپێی مەزەندە دیاری کراوە. ئەم جۆرە سەرژمێرییانەش بەدەر لە کەموکوڕی نین بەڵام لێرەدا بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك ژمارەی کوردەکانی کوردستانی سووریا دەخەینە بەرچاو:

کوردی سوریا بەشێکن لە نەتەوەی کورد و ناوچە کوردییەکانی باکووری سووریاش بەشێکی ڕووبەری جیۆگرافی کوردستان پێکدەهێنن. کوردەکانی سوریا هەمان نەریتی کولتووری و ئایینی کوردەکانی بەشەکانی تری کوردستان پەیڕەو دەکەن. هەرچەند ژمارەیان ٢ـ٣ ملیۆن کەس دەخەملێنرێن. بە شێوەیەکی بەرچاو بچووکترین بەشە کوردیەکەی سوریا و بە بەرهەمترین بەشی سووریایە، بەو پێیەی لەڕووی بەرهەمی کشتوکاڵی و کانزایی و سامانی ئاوەوە زۆر دەوڵەمەندە. لەگەڵ ئەوەی کورد لە سووریا ١٠٪ی ١٨ ملیۆن دانیشتوانەکەی پێکدەهێنێت، بەڵام ... [٥٩]

بە گوێرەی سەرژمێرییەك کە ساڵی ١٩٢٣ ئەنجام دراوە و ئەوکات ئەم بەشەی کوردستان لەژێر ئینتیدابی فەرنسیدا بووە، ژمارەی کوردەکانی بە ٢٠٠ هەزار کەس داناوە. لە ساڵی ١٩٢٥دا ژمارەی کوردەکانی سوریا بە ٣٠٠ هەزار کەس دانراوە و هەروەها توێژەر د.نالیراڤۆکارۆ لە سەرەتای چلەکاندا ژمارەی کوردی سوریا بە ٢٠٠ـ٢١٠ هەزار کەس داناوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٠ ژمارەی کورد لە ٦٠٠ هەزار و لە ساڵی ١٩٧٠ بە ٩٠٠ هەزار کەس دانراوە. بەپێی سەرژمێری کۆماری سووریاش لە ساڵی ١٩٧٦ ئەنجام دراوە ڕێژەی کوردی بە ٨٢٥ هەزار کەس داناوە. لە سەرژمێریی ساڵی ١٩٨٧ دا ژمارەی کوردی سوریا بە ١,٢٧٥,٨٢٠ دانراوە کە ڕێژەی ١٣٪ی سەرجەم دانیشتوانی سوریا پێك دێنێ. هەندێکی تر پێیان وایە ژمارەی کوردەکان یەك ملیۆن کەسە و بەپێی دوایین ئاماریش دەربارەی ژمارەی کورد لە سوریادا بە یەك ملیۆن و نیو لەقەڵەم دراوە. [٦٠]

لە سوریا، کوردەکان لە ناوچەکانی جەزیرە و عەینولعەرەب دەژین. حەشیمەتی کەمینەی کورد لەم ناوچانە ـ کە لە تەنیشت کوردستانی تورکیا دایە ـ ١/٥ ملیۆن کەسە. زێدەباری ئەم ناوچانە، هەندێك کۆچبەری کورد لە دیمەشق و حەلەب دەژین.(٦١)

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا باس لەوە دەکرێ کە ژمارەی دانیشتوانی کورد لە سوریا نزیکەی یەك و نیو ملیۆنە و بە بەراورد لەگەڵ کوردەکانی ناوچەکانی تری کوردستان دانیشتوانی کورد لەو وڵاتە بە شێوەیەکی بەرچاو کەمترە. بە گوێرەی خەمڵاندنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە جولای ٢٠٠٣ دا دانیشتوانی سوریا ١٨,٢ ملیۆن کەس بوون و نۆ لە سەدی هەموو دانیشتووانی سوریا کورد بوون. هەر دوو پوختەی بارودۆخی وڵاتان لە وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا و کتێبی سی ئای ئێی سەبارەت بە ڕاستییەکانی جیهان لەگەڵ ئەو خەمڵاندنە دەگونجێن...

ئەنجوومەنی مافەکانی مرۆڤی سوریا دەخەمڵێنێت کە ١,٥ ملیۆن کورد لە سوریا دەژین و ٨,٥ تا ١٠ لە سەدی دانیشتوانی سوریا پێکدەهێنن. کەوابوو وادیارە جێی مەترسی نییە کە بڵێین لە سوریا کوردەکان بە مەزەندە ٨,٥تا ١٠ لە سەدی هەموو دانیشتوان پێکدەهێنن و نزیکەی ١,٥ تا ٢ ملیۆن کەس دەبن.(٦٤)

بە سەرنجدان بەم سەرچاوانە و زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە لەم دواییانەدا لەسەر کوردستان بەگشتی یان لەسەر ئەم بەشە لە خاکی کوردستان بە تایبەتی نووسراون، دەتوانین بڵێین کە ژمارەی دانیشتووانی کورد کە ڕۆژئاوای کوردستان بە نزیکەی ١,٥ تا دوو ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێن.

## ● ٣ـ ڕووبەری خاکی کوردستانی سووریا

ئەوانەی ڕووبەری ئەم بەشەی خاکی کوردستانیان دیاری کردووە، جیاوازیان هەیە و ئەم جیاوازییەش هۆکاری خۆی هەیە کە هەر یەکیان بەجۆرێك باسی

لێوە کردووە. ئەم دانان و خەمڵاندنانەی لەبەر دەستمانن، دەکەونە نێوان دوو ژمارەی جیا و دوور لەیەك، کە ئەوانیش «١٥,٠٠٠ کم٢» بچووکەکەیان و «٢٣,٠٠٠کم٢» گەورەکەیانە، هەروەك چەند ژمارەیەکی تریش لەنێو ئەم دوو ژمارەیەدا بەدی دەکرێت.

ئازاد مستەفا و مەکتەبی دیراسات و تۆژینەوەی سەر بە پارتی دێموکراتی کوردستان/ عێراق، ڕووبەری کوردستانی سوریا بە«١٥,٠٠٠ کم٢» دادەنێن، کەچی سەلاح بەدرەدین ڕووبەری ئەم پارچەیەی خاکی کوردستان بە«١٦,٠٠٠ کم٢» دادەنێ. کەریم زەند پێوانەی ڕووبەری ئەم بەشەی کوردستانی بە «١٧,٠٠٠ کم٢» دادەنێ کەچی لە هەمان کات لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا ڕێژەیەکی تر بۆ هەمان مەبەست پێشان دەدات کە ئەویش «١٨,٠٠٠ کم٢»یە. عەبدولڕەحمان قاسملو پێوانەی ڕووبەری ئەم بەشەی خاکی کوردستان بە «١٨,٣٠٠ کم٢» دیاری دەکات. هەروەك بۆچوونێکی تریش هەیە کە زۆر لەم ژمارانەی سەرەوە دوورە و ئەویش هی ملا.ع. کوردی یە کە ڕووبەرەکەی ئەم بەشە بە «٢٣,٠٠٠ کم٢» دەخەمڵێنێت. بەڵام بەڕای ئێمە «١٥,٠٠٠ کم٢»یە کە لە ڕاستییەوە نزیکترە، یاخود ئەوەی لە دەوروبەری «١٨,٠٠٠ کم٢» دایە. بەهۆی ئەوەی ئەوانەی ئەم ژمارەیان خستووەتە بەردەست، کەسانی شارەزا و پسپۆڕ و نزیك لەم بەشە خاکەوەن کە ئەمەش وادەکات بۆچوونەکانیان نزیك بێ لە ڕاستییەوە، بەڵام ڕاکەی ملا.ع. کوردی لەوانەیە زێدەڕۆییەکی پێوە دیار بێ.[٣٣]

## ● سەرچاوەکانی بەشی یەکەم:

١ . سەردەشتی، د.یاسین، کوردستانی ئێران، چاپی دووەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی ٢٠١١، ل ٢٧.

٢ . نیکیتین، واسیلی، کورد و کوردوستان، وەرگێڕانی: خالیدی حیسامی (هێدی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر،١٩٩٧. ل١١١.

٣ . بورکای، کەمال، کورد و کوردستان، وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە، عەلی فەتحی، چاپی یەکەم، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ١٨.

٤ . حەمەڕەش، سۆران، کورد کێیە؟ چاپی یەکەم، لەندەن، ٢٠١٣. ل٣٣٧.

٥ . محەمەد، د.نیشتمان بەشیر، کورد و سەلجوقییەکان، وەرگێڕانی: ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٦. ل٣٤.

٦ . مەدەنی، حوسێن، کوردستان و ئیستراتیژیی دەوڵەتان، چاپی یەکەم، ١٣٧٩ی هەتاوی. بەرگی یەکەم.، ل ٥ ـ ٧.

٧ . نیکیتین، واسیلی، س.پ. ل ٤٣.

٨ . بورکای، کەمال، س.پ. ل ٤٨.

٩ . ئەنوەر، د.کەیوان ئازاد، چەردەیەك لە مێژووی کورد، چاپی حەوتەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ١٦.

١٠ . قەرەداغی، عەبدوڵڵا (مەلاعەلی)، کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، چاپی یەکەم، چاپەمەنی کارۆخ، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٣٧.

١١ . غەفوور، عەبدوڵڵا، جوگرافیای کوردستان، چاپی چوارەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٢٥١.

١٢ . قەرەداغی، عەبدوڵڵا (مەلاعەلی)، س.پ. ل ٣٨.

١٣ . مۆنتگومری، هێریەت، کوردی سوریا بوونێکی نکوڵی لێکراو، وەرگێڕانی: مینە و

پێشەوا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٩، ل١٥.
١٤. بدلیسی، میرشەرەفخان، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٢١.
١٥. قاسملوو، عبدالرحمن، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦. ل١٣ـ ١٤.
١٦. قەرەداغی، عەبدوڵڵا (مەلاعەلی)، س.پ. ل ٣٩.
١٧. غەفوور، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٥ و ٢٥٠.
١٨. قەرەداغی، س.پ. ل ٤٠.
١٩. مەدەنی، حوسێن، س.پ. ل١٤ـ ١٥.
٢٠. بورکای، کەمال، س.پ. ل ٢٣.
٢١. قەرەداغی، عەبدوڵڵا (مەلاعەلی)، س.پ. ل١٨٧.
٢٢. خورشید، فوئاد حەمە، کورد (کورتە لێکۆڵینەوەیەکی زانستییە)، وەرگێڕانی: ساڵح سەعید دەلۆیی، چاپی یەکەم، ئۆفسێتی تیشک، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١١ ـ ١٢.
٢٣. ئەنوەر، د.کەیوان ئازاد، س.پ. ل ١٦ ـ ١٧.
٢٤. قاسملوو، عبدالرحمن، س.پ. ل ١٤.
٢٥. مەدەنی، حوسێن، س.پ. ل ١٧ ـ ١٨.
٢٦. قاسملوو، عبدالرحمن، س.پ. ل٢٠ ـ ٢٣.
٢٧. برونەسن، مارتین فان، ئاغا، شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: کوردۆ، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، بەرگی یەکەم، ل ٣٥ ـ ٤٠.
٢٨. مەدەنی، حوسێن، س.پ. ل ١٨ ـ ١٩.
٢٩. غەفوور، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٥١.
٣٠. فیلیپ کرینبروك و کریستیەن ئاڵیسۆن، کولتور و ناسنامەی کورد، وەرگێرانی

وریـا ڕەحمانی، چاپـی یەکـەم، دەزگای توێژینـەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانـی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ١٨.

٣١. مۆنتگومری، هێریەت، س.پ. ل١٥.

٣٢. مەدەنی، حوسێن، س.پ. ل ١٠ ـ ١١.

٣٣. ویکیپیدیای فارسی.

٣٤. ئیبراهیمـی، عەبدوڵـڵا، لێکۆڵینـەوە و ڕوونکردنـەوەی مێژوویـی لەسـەر کـورد و کوردسـتان، چاپـی یەکـەم، دەزگای چـاپ و بڵاوکردنـەوەی ئـاراس، هەولێـر، ٢٠١٢، ل ١٣٢.

٣٥. برونەسن، مارتین فان، س.پ. ل ٣٥.

٣٦. غەفوور، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٥٢.

٣٧. فیلیپ کرینبروك و کریستیەن ئاڵیسۆن، س.پ. ل ١٥ ـ ١٦.

٣٨. ویکیپیدیای فارسی.

٣٩. قاسملوو، عبدالرحمن، س.پ. ل ١٤.

٤٠. کۆمەڵێـك نوسـەر، گەلێکـی پەژموردە و نیشـتمانی پـەرت، وەرگێڕانـی لە عەرەبی و فارسـیەوە: م. گۆمەیی، سـوێد، ٢٠٠٠، ل ١١٣.

٤١. ئیبراهیمی، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٢٩.

٤٢. ڕەحمانـی، وریـا، کوردسـتان و کـورد لـە ڕوانگـەی نەخشـەوانیەوە، چاپـی یەکەم، چاپخانـەی ڕۆژهـەڵات، هەولێـر، ٢٠٠٩، ل ٧٢ ـ ٧٤.

٤٣. زەنـد، کەریـم، کورتـە جوگرافیـای کوردسـتان، چاپخانـەی ئەزمـەڕ، سـلێمانی ٢٠٠٠، ل ١٩ ـ ٢٠.

٤٤. برونەسن، مارتین فان، س.پ. ل ٣٥ ـ ٤٠.

٤٥. غەفوور، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٥٥.

٤٦. فیلیپ کرینبروك و کریستیەن ئاڵیسۆن، س.پ. ل ١٥.

٤٧ . قاسملوو، عبدالرحمن، س.پ. ل ١٤ .
٤٨ . کۆمەڵێـك نووسـەر، گەلێکـی پەژموردە و نیشـتمانی پـەرت، وەرگێرانـی لە عەرەبی و فارسـییەوە: م. گۆمەیی، سـوێد، ٢٠٠٠، ل ١٩٧ .
٤٩ . خورشید، فوئاد حەمە، س.پ. ل ١١ ـ ١٢ .
٥٠ . ئەنوەر، د.کەیوان ئازاد، س.پ. ل ١٧ .
٥١ . سـاڵح، عومەر هەمزە، راگواسـتن، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٢١ ـ ٢٢ .
٥٢ . ئیبراهیمی، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٣١ .
٥٣ . غەفوور، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ٢٨٦ ـ ٢٨٨ .
٥٤ . غەفوور، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٥٦ .
٥٥ . برونەسن، مارتین فان، س.پ. ل ٣٥ ـ ٤٠ .
٥٦ . ساڵح، عومەر هەمزە، س.پ. ل٢٣ .
٥٧ . ئیبراهیمی، عەبدوڵڵا، س.پ. ل ١٣١ .
٥٨ . سـمایل، عوسـمان عەبدولڕەحمان، کورد لـە سـوریا ١٩٢٠ـ١٩٤٦، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینـەوە و بڵاوکردنـەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٤٥ ـ ٥٢ .
٥٩ . مۆنتگومری، هێریەت، س.پ. ل ٢٣ .
٦٠ . ئەحمـەد، بـژار عوسـمان، بارودۆخـی سیاسـی کوردسـتانی سـوریا لـە مـاوەی سـاڵانی ١٩٢٠ـ١٩٧٠، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی زانکـۆی سـەلاحەدین،هەولێر ٢٠١٢، ل ١١ .
٦١ . فیلیپ کرینبروك و کریستیەن ئاڵیسۆن، س.پ. ل ١٧ .
٦٢ . یەڵـدز، کەریـم، کـورد لـە سـوریا گەلێکـی لەبیرکـراو، وەرگێرانـی شـاهۆ قـادر خانـزادە، چاپـی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشـی سـەردەم ، سـلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٥٥ .
٦٣ . سمایل، عوسمان عەبدولڕەحمان، س.پ. ل ٣٨ ـ ٣٩ .

# بەشی دووەم ٢

کوردەکانی دەرەوەی کوردستان

## ١. باسی یەکەم: کوردەکانی ئێران (کوردەکانی دەرەوەی کوردستانی ئێران)

### • یەکەم: کوردەکانی خوراسان

چەند زانیارییەك لەبارەی خوراسان
سەردەم و هۆکاری کۆچکردن و ڕاگواستنی کوردان بۆ خوراسان
شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە خوراسان
ژمارەی کوردەکانی خوراسان
عێل و عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان
چالاکیە ڕۆشنبیریی و سیاسیەکان
زمان، ئایین و داب‌ونەریتی کوردەکانی خوراسان
ژیان و بەسەرهاتی جافەرقولی زەنگەلی (زەنگۆلی)
سەرچاوەکان

### • دووەم: کوردەکانی قەزوین

چەند زانیارییەك لەبارەی «قەزوین»ـەوە
سەردەم و هۆکاری ڕاگواستنی کورد بۆ قەزوین
شوێنی ژیانی پێشوویان (پێش کۆچ پێکردنیان)
شوێنی ژیانی ئێستایان
هۆزە کوردەکانی نیشتەجێی قەزوین و دەوروبەری
ئینتمای نەتەوەیی و هەستی کوردایەتی لای کوردەکانی قەزوین
سەرچاوەکان

### سێیەم: کوردەکانی قوم

چەند زانیارییەك لەبارەی پارێزگای قوم
عێل و تایفە کوردەکانی قوم و دەوروبەری
سەرچاوەکان

## باسی یەکەم
## کوردەکانی ئێران ( کوردەکانی دەرەوەی کوردستانی ئێران)

کوردەکان لە سەرانسەری ئێران، لە پارێزگاکانی ئیلام، کرماشان، کوردستان، ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، خوراسان، قەزوین، قوم، مازەندەران، گیلان، فارس، کرمان، هەمەدان، لورستان، بەلوچستان و دەیان شار و ناوچە لە پارێزگاکانی دیکەی ئێران نیشتەجێن و ژیان بەسەر دەبەن. ئەوەی ئەمڕۆ لە چوارچێوەی سنوورەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا دیارە و باسی دەکرێ، کوردەکانی چوار پارێزگای ئیلام، کرماشان، کوردستان ، ئازەربایجانی ڕۆژئاوایە کە لە باسەکانی پێشتردا بە کورتی باسیان کرا. بەڵام ئەو کوردانەی کە لە پارێزگا و شارەکانی دەرەوەی سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ئێراندا ژیان بەسەر دەبەن، ئەوا لێرەدا بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهاتیان دەکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەدان بە خاڵێکی گرنگ لێرەدا پێویستە: کورد کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و بە دەیان سەدە لەنێو سنوورەکانی ئێراندا ژیاوە و تەنانەت زۆرجار لە زۆر شوێنی دەرەوەی سنوورەکانی کوردستان دەسەڵاتداریتیی کردووە یان بە پێچەوانەوە زۆرجار لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانی بۆ پارێزگاری کردن لە سنوورە دوورەکان یان بە قسەی خۆیان بۆ دامرکاندنی شۆڕشی کوردەکان دوور خراونەوە، خۆ ناکرێ تەنیا لەم شوێن و ناوچانە هەبن کە ئەمن لێرەدا باسیان دەکەم. هەر بۆیە پێویستە لە داهاتووشدا زیاتر بەدواداچوون بۆ شوێنی ژیان و گوزەرانی کوردانی

دەرەوەی سنوورەکانی کوردستانی ئیران بکرێ و لە هەمان کاتدا ئەو کوردانەی کە لەم نووسراوەیەدا کەمیان لەسەر نووسراوە یان زانیاریی هەڵەیان لەسەر بڵاو کراوەتەوە، ئەوا زیاتریان لەسەر بنووسرێ و باشتر ئاوڕیان لێ بدرێتەوە. بێگومان ئەو کارەش لەلایەن هەر کەسێکەوە بکرێت، کارێکی پیرۆزە و خزمەتێکە بە کوردەکانی ئەو ناوچانە.

لە خوارەوە بە کورتی و بە کوردی باسی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی دەرەوەی کوردستانی ئیران دەکەم. ئەگەر کوردەکانی شوێنێك زۆریان لەسەر نووسراوە و بەپێچەوانەوە هی شوێنێك لە چەند دێڕ و لاپەڕەیەکدا باسیان کراوە، ئەوا تەنیا بۆ زۆریی و کەمیی سەرچاوەکان دەگەڕێتەوە و هیچی تر.

## یەکەم

## ◄ کوردەکانی خوراسان

- چەند زانیارییەك لەبارەی خوراسان
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردن و ڕاگواستنی کوردان بۆ خوراسان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە خوراسان
- ژمارەی کوردەکانی خوراسان
- عێل و عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان
- چالاکییە ڕۆشنبیریی و سیاسییەکان
- زمان، ئایین و داب‌ونەریتی کوردەکانی خوراسان
- ژیان و بەسەرهاتی جافەرقولی زەنگەلی (زەنگۆلی)
- سەرچاوەکان

## • چەند زانیارییەك لەبارەی خوراسان

پارێـزگای خوراسـان پێشـتر یەكێـك لـە پارێزگاكانـی ئێـران بـوو كـە لە سـاڵی ١٣٨٣ی هەتـاوی (٢٠٠٤ی زایینی)یـەوە بـۆ سـێ پارێـزگا دابـەش كـرا. هەربۆیـە بەجیـا و زۆر بـە كورتـی باسـی هەریەكێكیـان دەكەیـن:

• پارێزگای خوراسانی شیمالی (باكوور) كە ناوەندەكەی شاری بجنوردە.
• پارێزگای خوراسانی ڕەزەوی كە ناوەندەكەی شاری مەشهەدە.
• پارێزگای خوراسانی جنوبی (باشوور) كە ناوەندەكەی شاری بیرجەندە.

***خوراسـانی شـیمالی (باكووری خوراسـان):*** پارێزگای خوراسانی شیمالی بە ناوەندێتیـی شـاری بجنـوورد یەكێـك لـە پارێزگاكانـی وڵاتـی ئێرانـە. ڕووبەرەكەی ٢٨٤٣٤ كیلۆمەتـری چوارگۆشـەیە كـە لـەم بـارەوە پازدەهەمیـن پارێـزگای ئێـران و حەشیمەتەكەشـی لـە سـاڵی ١٣٩٠دا ٨٦٧,٧٢٧ كـەس بـووە.

بەپێی سـەرژمێری سـاڵی ١٣٨٥ی ناوەندی ئاماری ئێران، ڕێـژەی خوێندەواری لـەم پارێزگایـەدا ٧٩,١٣٪، ڕێـژەی شارنشـینی ٤٨,٣٦٪، ڕێـژەی بێـكاری ٥,٩٪ و ڕێـژەی بەشـداریی ئابـووری ٤٠,٧٪ بـووە.

هەڵكەوتـی جوگرافیایـی: پارێزگای خوراسـانی باكـووری بە ڕووبـەری ٢٨٤٣٤ كیلۆمەتـری چوارگۆشـە لـە ٨ شارسـتان، ١٦ شـار و ١٦ بەخـش، ٤٠ دەهێسـتان (میـرەدێ) و ٨٦٢ گونـد پێـك هاتووە. شارسـتانەكانی بریتین لە بجنـوورد (ناوەندی پارێزگا)، شـیروان، ئیسـفرایین، مانە و سـەملقان، ڕاز و جەرگلان، جاجەرم، فاروج و گەرمـە. ئـەم پارێزگایـە لەبـاری هەڵكەوتـی جوگرافی، لە باكـوورەوە لەگـەڵ وڵاتـی

تورکمانستان، لە ڕۆژهەڵات و باشوورەوە لەگەڵ پارێزگای خوراسانی ڕەزەوی، لە باشووری ڕۆژئاواوە لەگەڵ پارێزگای سمنان و لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ پارێزگای گوڵستان هاوسنوورە.

قەوم و زمانەکانی ئەم پارێزگایە: قەومەکانی نیشتەجێی ئەم پارێزگایە بریتین لە فارس، کورد، تورك، تورکمەن. بە شێوەیەکی گشتی کوردەکان ٣٧٪ی پێکهاتەی حەشیمەتیی ئەم پارێزگایە پێك دێنن. فارسەکان ٢٩٪، تورکەکان ٢٧٪ و تورکمەنەکان ٥٪ و قەومەکانی وەك عەرەب و بەلووچ و لوریش لەم پارێزگایەدا نیشتەجێن.

قسەکردن لەسەر بارودۆخی سروشتی، پیشەسازی، پەروەردە و فێرکردن و خوێندنی باڵا، ئاوڕدانەوە لە شوێنە کۆنە و مێژووییەکانی ئەم پارێزگایە و دەیان بابەتی تر، پێویستن باسیان بکرێ و لەسەریان بنووسرێ، بەڵام لێرەدا لەبەر ئەوەی مەبەستەکە شتێکی دیکەیە، تەنیا چەند زانیارییەکی زۆر کەم دەخرێتە بەرچاوی خوێنەرانی خۆشەویست. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ئەم پارێزگایە دەتوانن سەردانی ماڵپەڕی ویکیپیدیا و چەندین ماڵپەڕی تری پێوەندیدار بە پارێزگای خوراسان و ناوچەکانی بکەن.[1]

***خوراسانی ڕەزەوی:*** پارێزگای خوراسانی ڕەزەوی بە ناوەندێتیی شاری مەشهەد یەکێك لە پارێزگاکانی وڵاتی ئێرانە. لەباری هەڵکەوتی جوگرافی، لە باکوورەوە لەگەڵ وڵاتی تورکمانستان و پارێزگای خوراسانی باکووری، لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ پارێزگای سمنان، لەباشوور و باشووری ڕۆژئاواوەوە لەگەڵ خوراسانی باشووری و لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ وڵاتی ئەفغانستان هاوسنوورە.

وشەی ڕەزەوی لە ناوی ئەم پارێزگایەدا ئاماژە بە مەرقەدی عەلی ئیبنی موسا ڕەزا لە ناوەندی ئەم پارێزگایەیە. ڕووبەری ئەم پارێزگایە ١١٨،٨٥٤ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە کە لەم بارەوە پێنجەمین پارێزگای گەورەی وڵاتە. ئەم پارێزگایە

لـە ٢٥ شارسـتان و ٦٥ بەخـش پێـك هاتووە و ژمارەی گشـتیی حەشـیمەتی پارێزگا بەپێـی ئامـاری سـەرژمێریی گشـتی سـاڵی ١٣٩٠ی هەتـاوی، ٥,٩٩٤,٤٠٢ کـەس بـووە کـە لـەم ڕێژەیە ٢,٩٩٩,٥٢٩ کەسـیان پیـاو و ٢,٩٩٤,٨٧٣ کەسـیان ژن بـووە.[٢]

***خوراسـانی باشـوور (جنوبـی):*** پارێـزگای خوراسانی باشـووری یەکێـك لـە پارێزگاکانـی ئێرانـە. ئـەم پارێزگایـە لـە ڕۆژهەڵاتـی ئێـران هەڵکەوتـووە و ناوەندەکـەی شـاری بیرجەنـدە. ئـەم پارێزگایـەش دوای دابەشـبوونی پارێـزگای خوراسـان لـە سـاڵی ١٣٨٣ی هەتـاوی، پێـك هاتـووە.

ڕووبـەری ئـەم پارێزگایـە ١٥١,١٩٣ کیلۆمەتـری چوارگۆشـەیە کـە لـەم بـارەوە سـێهەمین پارێـزگای ئێرانـە. بەپێـی شـەرژمێریی سـاڵی ١٣٩٠، حەشـیمەتی ئـەم پارێزگایـە ٧٣٢,١٩٣ کـەس بـووە و لەم بارەوە بیسـت و هەشـتەمین پارێزگای وڵاتە.

***هەڵکەوتـی جوگرافـی:*** ئـەم پارێزگایـە لـە باکوورەوە لەگـەڵ خوراسـانی ڕەزەوی، لـە ڕۆژئـاواوە لەگـەڵ پارێزگاکانـی یـەزد، ئیسـفەهان و سـمنان، لـە ڕۆژهەڵاتـەوە لەگـەڵ وڵاتـی ئەفغانسـتان و لـە باشـوورەوە لەگـەل پارێزگاکانـی سیسـتان و بەلووچسـتان و کرمـان هاوسـنوورە.

پارێـزگای خوراسـانی باشـووری لـە ١١ شارسـتان، ٢٨ شـار، ٢٥ بەخـش و ٦١ دەهێسـتان پێـك هاتووە.

شارسـتانەکانی ئـەم پارێزگایـە بریتیـن لـە: بیرجنـد، فـردوس، تەبـەس، قائینات، نهبنـدان، سربیشـە، درمیـان، سرایـان، بشرویـە، زیرکوە، خوسـف.[٣]

پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بکەیـن دوای چەندیـن سـاڵ ژیـان و پێکەوەبـوون لـە باکـووری خوراسـان سـاڵی ١٣٨٣ی هەتـاوی و لـە سـەردەمی سـەرۆك کۆماریـی محەمـەدی خاتەمـی ئـەم پارێزگایـە بـۆ سـێ بەشـی باکـووری، ڕەزەوەی و باشـووری دابـەش کـرا کـە ئـەم دابەشـکردانەش بـە نـۆرەی خـۆی بـوو بەهـۆی دابەشـبوونی کوردانـی خوراسـان. دوای ئـەم دابەشـکارییە کوردەکانـی

خوڕاسـان بەسـەر دوو پارێـزگای: خوڕاسـانی باکـووری و چەنـد بەشـێك لـە خوڕاسـانی ڕەزەوی دا دابـەش بـوون.

## ● سەردەم و هۆکاری کۆچکردن و ڕاگواستنی کوردان بۆ خوڕاسان

خەڵکی بە ڕەچەڵەك کوردی ناوچەی خوڕاسـان بەپێی سـەرچاوە مێژووییەکان لـە نەوەکانی ئـەو کوردانـەن کە لە سـەردەمی شـا عەبباس لـە ناوچـەی ڕۆژهەڵاتی زەریاچـەی ورمێـوە بـۆ ئـەم ناوچانـە بـە مەبەسـتی پاراسـتنی سـنوورەکانی ئێـران ڕاگوێـزران و بەپێـی گێڕانەوەیەکـی دیکـە شـا عەبباس بـۆ لاوازکردنی سەرکێشـی ئاغـا و خانـە کرمانجـەکان و بەکارهێنانیـان لـە بەرامبـەر هێرشـە بێنەمانەکانـی ئۆزبەکـەکان بۆ خوڕاسـانی گـەورە گواسـتنیەوە.(٤)

دوکتۆر ئەفراسـیاب شـکوفتە لـە وتووێژێـك لەگەڵ ڕادیـۆ کوردانە بەم شـێوەیە بـاس لـە هـۆکاری ڕەوکـردن و ڕاگوێزانـی کـورد بـۆ خوڕاسـان دەکات: «لـە سـاڵی ١٥٣٥ شـا تەهماسـب فەرمانـی لەنێوبردنـی شـار و زەوییـە کشـتوکاڵییەکانی ناوچـە کوردییەکانـی دا هەتـا پێـش ئەوەی بکەونە دەسـت عوسـمانییەکان، وێـران بوون. لەڕاسـتیدا یەکەمیـن جێگۆڕکێـی نێوخۆیـی کـوردەکان لـەم کاتەوە دەسـتی پێکرد و بـەداوی ئەمـەدا ئـەوان بـۆ ناوچـەی قەوقاز (قەفقـاز) واتـە ئازەربایجـان و قەرەباغ کـە ئـەوکات بەشـێك لـە ئێـران بـوون، ڕاگوێـزران. بـەڵام جێگۆڕکێـی کۆتایـی کـوردەکان لـە قەفقازەوە بۆ خوڕاسـان لەسـەردەمی شـا عەبباسـی سـەفەوی ئەنجام درا. شـا عەبباسـی سـەفەوی کـە ڕووبـەڕووی کێشـە و گرفتـی زۆری نێوخۆیـی (داخوازییـە ڕەواکانـی خەڵکـی ئێـران) و دەرەکـی (هێرشـی ئۆزبەکـەکان) ببـۆوە، وەك هـەر دیکتاتۆرێکـی دیکـە بـە ناچـاری بڕیـاری دا مەیدانـی خەڵکـی خـۆی بەرتەسـك بکاتـەوە و لەلایـەك ژمارەیـەك لـە کوردەکانـی وەك سـپەری بـەڵا بـۆ باکـووری خوراسـان ڕاگواسـت و لەلایەکـی دیکەشـەوە ئەمیرخانـی برادۆسـت

(خانی لەپ زێڕین، ١٦١٠ی زایینی) دەسەڵاتداری ناوچەی برادۆست (ورمێ، ماکۆ، سلماس، خۆی) بەناوەندێتیی قەڵای دمدم (لە ١٥ کیلۆمەتری ورمێ) بە شێوەیەکی ناجوامێرانە لەنێو برد و فەرمانی کوشتاری خەڵکی ناوچەی برادۆست و موکریانی دەرکرد. کەواتە کوردەکانی خوراسان لە سەردەمی زنجیرەی دەسەڵاتدارێتیی سەفەوییەکان بۆ خوراسان ڕاگوێزران.»[٥]

هەروەها بەڕێز عەلیرەزا سپاهی لایین لە کتێبی (تاریخ کرد در جغرافیای خراسان) بە دوور و درێژی باسی ئەم بابەتە و چەندین بابەتی پێوەندیداری دیکەی کردووە و لە بابەتێکدا لەژێر سەردێڕی (دەوڵەتی سەفەوی و بەهێزکردنی سنوورەکانی ئێران، ڕوانینێکی جوغرافیایی بۆ ئامانجێکی مێژوویی) کە لەگەڵ کتێبەکە لەسەر ماڵپەڕی (-http://up.toca.ir/images/bw8j3kgd7lbzt 17m38ud.pdf)یش بڵاو بۆتەوە، بەم شێوەیە باس لە سەردەم و هۆکار و تەنانەت ڕاگواستن و کۆچ پێکردنی کوردەکان بۆ خوراسان دەکات:

*« وەك دەزانین لە سەردەمی سەفەوییەدا سنوورەکانی خوراسان بەردەوام لەژێر هەڕەشە و دەستدرێژیی ئۆزبەکەکاندا بوو و زۆرجار ئەم دەستدرێژیی و هێرشانە هەتا ناوچەکانی ناوەندی ئێرانیش دەچوونە پێش. ئۆزبەکەکان جەماعەتێك لە پاشماوەکانی مەغۆلەکان بوون کە لە دەوروبەری ساڵی ٩٠٤ی کۆچیی مانگی دەسەڵاتدارێتیی (ماورا النهر)یان لە چنگ نەوەکانی تەیموور دەرهێنابوو و توانیبوویان دەوڵەتێکی تێدا پێك بێنن. ئەوان خۆیان بۆ سەر یەکێك لە کوڕەکانی جوجی (کوڕی چەنگیز) دەگەڕاندەوە.*

*لە سەردەمی سەفەوییەدا شیبەك خان پاشایان بوو و دوژمنایەتیی نێوان شا سمایلی سەفەوی و شیبەك خان لەوێوە سەرچاوەی دەگرت کە ئۆزبەکەکان بەردەوام دەستدرێژییان دەکردە سەر خوراسان. شیبەك خان دوای داگیرکردنی*

خوراسان لە ساڵی ٩١٣ مانگیی کۆچی (١٥٠٧ی زایینی) بە نیازی داگیرکردنی ناوچەکانی دیکەی ئێرانیش بوو و هێرشی کردە سەر کرمان بەڵام سوپای سەفەوی دوای تێکهەڵچوون و کێشەوبەرەی زۆر سەرکەوت.

هێرشی ئۆزبەکەکان لە سەردەمی شا عەبباسیش بەردەوام بوو. ناوبراو کاتێك بە دەسەڵات گەیشت کە دەوڵەتی عوسمانی لەلای ڕۆژئاوا و ئۆزبەکەکان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە هێرشیان دەکردە سەر ئێران و لەنێوخۆی ئێرانیش سەرکردەکانی قزڵباش خەریکی گێرەوکێشە لەسەر دەسەڵات بوون. هەربۆیە شا عەبباس بە پێویستی زانی لەگەڵ عوسمانییەکان ئاشتی بکا و تەنانەت بەشێك لە ئازەربایجان و ناوچەکانی ڕۆژئاوا و تەنانەت تەورێزیش لە ئیختیار ئەوان بنێ و خەریکی وەدەرنانی ئۆزبەکەکان و ڕێکخستنەوەی نێوخۆی ئێران بێ. ئۆزبەکەکان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە، چەندین جار شاری مەشهەدیان داگیر کردبوو و دەسدرێژییان کردبۆ سەر زۆربەی شارەکانی خوراسان. شا عەبباس دوای دڵنیابوون لە بارودۆخی نێوخۆ و لەنێوبردنی سەرکردەکانی قزڵباش تەواوی هەوڵ و کۆششی خۆی بۆ لای ڕۆژهەڵات تەرخان کرد و لە ماوەی چەندین ساڵدا توانی ئۆزبەکان وەدەرنێ. هەر لەو ساڵانەدا بوو کە بە پێڕەوی کردن لە پێشینیانی خۆی، بڕیاری ڕاگواستنی گرووپێك لە کوردەکانی بۆ خوراسان دا و لەسەر سنوورەکان جێگیری کردن. بە سەرنجدان بەوەی پێش شا عەبباسیش، شا ئیسماعیلی سەفەوییش لە هەنگاوێکی هاوشێوەدا گرووپێك لە عێڵە کوردەکانی لە خوراسان بە تایبەت لە دەرگەز نیشتەجێ کردبوو. وا دێتە بەرچاو کە کاری ڕاگواستنی عێل و تایفە کوردەکان بۆ خوراسان ڕەوتێکی بەرەبەرەیی بووە و دوای ئەوەیکە کۆچبەرە کوردەکان گەیشتنە ناوچەکانی قووچان هەتا بجنوورد، بە زاڵبوون بەسەر تایفەی گرانیلی کە پێشتر لەو ناوچانە جێگیر بوون، ئەوانیان پرش وبڵاو کردن و خۆیان لەو ناوچانە جێگیر و نیشتەجێ بوون.»

ناوبراو لە درێژەی وتارەکەدا و بە ئاماژەدان بە چەند کتێبێکی وەك «عالم ئارای عەبباسی»، پێوەندییەکانی سەفەوییە و ئۆزبەکەکان یان مێژووی عێل و عەشیرەتەکانی ئێران، چەند هۆکارێکی وەك هۆکارە سەرەکییەکانی ڕاگواستنی کوردەکان لە ڕۆژئاوای ئێران بۆ خوراسان خستوونە بەرچاو کە لێرەدا بۆ خۆپاراستن لە درێژبوونەوەی نووسینەکە، خۆمان لە هێنانی هەموو ئەو هۆکارانە دەبوێرین. بەڵام ناوبراو بەرگریی لە سنوورەکان و بەهێزکردنی سنوورەکانی خوراسان بە هۆکاری سەرەکی ڕاگواستن و کۆچ پێکردنی عێل و تایفە کوردەکان دەزانێ. هەروەها لە درێژەدا باس لە ژمارەی کوردە ڕاگوێزراوەکانیش دەکا و دەڵێ:

*«لەبارەی ئەوە کە لە ڕاگواستنی کوردەکان بۆ خوراسان ژمارەی بنەماڵە کۆچ پێکراوەکان چەند بوون، باوترین داتا و ئامار چل (٤٠) هەزار خێزانە. بێجگە لەمەش لە فەرهەنگی (ایران زمین)دا ئامارێك خراوەتەڕوو کە جێگەی لێ وردبوونەوەیە. بەپێی ئەو ئامارە ژمارەی کۆچ پێکراوەکان بریتییە لە: تایفەکانی زەعفەرانلوو سەد و هەشتا هەزار خێزان، سەعدانلوو یازدە لەك ( هەر لەکێك سەد هەزار کەس)، تایفەکانی کەیوانلوو چوار لەك و دوانلوو دوو لەك. بە سەرنجدان بەوەکە گێڕانەوە و باسێکی ڕاستەوخۆ لەپێوەندیی لەگەڵ ژمارەی کۆچبەرانی کورد بۆ خوراسان لەبەردەستدا نیە، زۆربەی نووسینەکان بە پێڕەوی لە ئیعتیمادولسەڵتەنە ئاماژەی بە ٤٠ هەزار کەسە کردووە. ئەوەیکە ئاشکرایە ئەوەیە کۆچ پێکرانی ئەم چل هەزار کوردە بۆ خوراسان ڕەوت و پرۆسەیەکی بەرەبەرەیی و هەنگاو بە هەنگاو بووە و وا نەبووە کە شا عەبباس یان کەسانی هاوشێوەی، بە شێوەیەکی یەکجێ ئەم کارەیان ئەنجام دابێ. بێشك خۆڕاگریی سەرکردە کوردەکان لەم کۆچ پێکرانەدا کاریگەری هەبووە و ڕازی کردنیان بە تایبەت لە قۆناغەکانی سەرەتادا بۆ سەفەوییە کێشەیەکی سەرەکی بووە....»*

ئیوانۆف، زانا و کۆمەڵناسی بەناوبانگی سۆڤیەتی پێشوو لە توێژینەوەیەکی لەژێر ناوی «نەژادناسیی خوراسان» بەم شێوەیە باس لە سەردەم و هۆکاری ڕاگواستنی کورد بۆ خوراسان دەکات: کاتێك کە لە سەردەمی پاشایەتیی زنجیرەی سەفەویدا ئەم فکرە پەیدا بوو لە بەرامبەر هێرش و دەستدرێژییەکانی قەومەکانی ئۆزبەك و تورکمەن پارێزگاری لە سنووره باکورییەکانی خوراسان بکرێ، لەبەر ئەوەی پێداویستییە ناوچەیی و خۆجێییەکان بۆ پێشگرتن و بەرگری بە ڕادەی پێویست و لەو ئاستەدا نەبوو، هەربۆیە شای ئێران بڕیاری دا هەروەك چۆن ڕووسەکان لە بەرامبەر قەومی قەزاقدا کاریان کردبوو، لەئێرانیش بە هەمان شێوە چەند ڕێوشوێنێك بگرێنە بەر، چونکە ڕووسەکان قەومە شەڕکەرەکانیان لە سنوورەکانی خۆیاندا جێگیر کردبوو. بەم پێیە لە نیوەی سەدەی شازدەدا چەند عەشیرەتێك لە کوردەکانی کوردستانیان بۆ سنوورەکانی باکوور گواستەوە و لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەیەمیش گرووپێکی تری ئەم کوردانەیان کۆچ پێ کردن. هەندێکی دیکەش لەم عەشیرەتانەی وەک عمارلوو لە سەدەی هەژدە لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی نادرشادا کۆچیان پێ کرا و گەیشتنە خوراسان.[٦]

لێرەدا بە کورتی ڕاوبۆچوونی چەند زانایەك لەمەڕ هۆکار و سەردەمی کۆچی کوردان بۆ خوراسان دەخەینە بەرچاو:

بەڕێز کەلیموڵڵا تەوەحودی، نووسەری ناودار و لە کوردەکانی خوراسان چەندین کتێبی بەنرخی لەسەر کوردەکانی خوراسان و دابونەریتەکانیان نووسیوە کە یەکێك لە بەناوبانگترینی ئەو بەرهەمانە کتێبێکی چەند بەرگی لەژێر ناوی «کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان»ە کە لەم ڕێگەیەوە خزمەتێکی بەرچاوی بە ناساندنی خەڵك و خاك و دابونەریتەکانی ئەو کوردانە کردووە. ناوبراو لە بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە بەنرخەیدا دەڵێ:

«شا عەبباس کە پاشایەکی وشیار و سیاسەتمەدار بوو بە سەرنجدان بە فەلسەفەی ئیبن عەمید کە گوتبووی: دەبێ کوردەکان بکرێنە سپەری بەڵا، دەستی بە ڕاگواستنی کوردەکان بۆ خوراسان کرد بۆ ئەوەی بە تیرێك دوو ئامانج بپێکێ.... نزیکەی پەنجاهەزار بنەماڵە، کۆچی گەورە و مێژوویی خۆیان لە ئازەربایجانەوە بەرەو خاکی ڕەی دەست پێکرد. ئەم کۆچە کە لە دەوروبەری ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی مانگی بەڕێوەچوو، بوو بە هۆی ئەوەی کوردەکان بۆ ماوەی دوو ساڵ لە دەشتەکانی تاران و خوار (خار) و وەرامین بارگە و بنەیان بخەن و بمێننەوە.»[٧]

جاناتان ڕەندێل لەبابەت کۆچکردنی کوردەکان بۆ خوراسان دەنووسێ:

«شا عەبباسی یەکەم خێرایی بەم ڕەوتە (کۆچکردنی کوردەکان) بەخشی. ئەو کوردانەی کە لە زێدی خۆیان هەڵکەنران بۆ ڕۆژهەڵات نێردران، سەرەتا بۆ ئەوبەری سنووری ئازەربایجان، دواتر بۆ خوراسان لە بەرامبەر تورکەمەنەکان کە ئێستاکەش لەوێ ماونەوە ــ واتە هەزار مایل دوور لە زێدی خۆیان ــ بەم شێوەیە سەفەوییە هۆزە سەرکێشە کوردەکانی لە سنوورەکانی ڕۆژئاوا هەڵکەند و سەیرە ئەوانیان بۆ پارێزگاری لە سنوورە ئاڵۆزەکانی دیکەی وڵات نارد و هۆزە کوردەکانی دیکەشیان بۆ زۆر ناوچەی دوورتر ڕەوانە کرد، بۆ هیندوکەش لە ئەفغانستان و بەلوچستانی ئەمڕۆ.»[٨]

پرۆفیسۆر ئیسماعیل حوسێن زادە بوانلوو مامۆستای زانکۆ لە ئەمریکا لەبارەی کۆچی کوردەکان بۆ خوراسان نووسیویەتی:

«کۆچی کوردەکان بۆ خوراسان بە گشتی لە سەردەمی حکومەتی پاشایانی سەفەوی و بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی ئۆزبەك و مەغۆل و تورکەمەنەکان بۆ سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران بەڕێوە چووە. ئەم کۆچکردنە کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی دەیەمی کۆچی

*مانگی واتە لە سەردەمی شا ئیسماعیل و شا تەهماسبدا دەست پێکرا و لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیە و سەرەتاکانی سەدەی یازدەیەم واتە لەسەردەمی حکوومەتی شا عەبباسدا بەوپەڕی خۆی گەیشت، لەو سەردەمەدا بوو کە ئۆزبەکەکان نە تەنیا شاری مەشهەدیان داگیر کردبوو و ڕمبازێنیان لە خوڕاساندا دەکرد، بەڵکوو ناوچەکانی شاهرود، دامغان، سمنان، وەرامین، کاشان و ئەراکیشیان خستبۆ ژێر پێی خۆیان. کۆچکردن و بەرەنگاریی کوردەکان لەو کاتەدا، بە تایبەت بەربەرەکانیە کانی شەڕکەرانی ئازای دوو عێلی گەورە و بەناوبانگی زەعفەرانلوو و شادیلوو پێشی بە پێشڕەویی ئۆزبەکەکان گرت و پاش بەربەرەکانی و خۆڕاگریی سەخت و خوێناوی، سەرەنجام ئەوانیان لە ئێران وەدەرنا.»*[٩]

تا ئێرە بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك و ئاماژەدان بە ڕاوبۆچوونی چەند زانا و مێژوونووسێك بە وردی باسمان لە سەردەم و هۆکارەکانی کۆچی کوردان بۆ خوڕاسان کرد و وەك دیتمان زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن کە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا ژمارەیەك لە کوردەکانیان بۆ خوڕاسان ڕاگواستووە و بێگومان لە میانەی بۆچوونەکانیان باسیان لە هۆکاری ئەم کۆچ پێکردنە کردووە. بەڵام لەوانەیە زۆر کەسیش پرسیار بکەن،: ئایا کوردەکان پێش ڕاگواستن و کۆچ پێکرانی سەردەمی سەفەوییەش لە خوڕاساندا ژیاون یان نا؟

هەندێك کەس دەڵێن: بەڵی. بۆ پشتڕاستکردنەوەی وڵامەکەشیان دەڵێن: «کوردەکان پێش سەردەمی سەفەوییە لە خوڕاساندا ژیاون. کوردبوونی ئەبوموسلیمی خوڕاسانی، بیرەوەرییەکانی «دعبل خزاعی» لە کاتی تێپەڕین و گەیشتنی بە مەرو و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ کوردە عەلەوییەکان، بیرەوەرییەکانی تەیموور لە کتێبی «منم تیمور جهانگشا» کە لە ڕێگەی قوچاندا تووشی گرووپێك دەبێ کە دەڵێن: ئێمە کوردین، هەروەها هاوکات لەگەڵ

سەردەمی تەیموور ، «کلاویخۆ»ش لە سەفەرنامەی خۆیدا ئاماژە بە هەبوونی کوردان لە خوراسان دەکا. هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کوردەکان پێش سەردەمی سەفەوییە لە خوراسان هەبوون.

یەکێك لەو کەسانە بەڕێز (عەلیڕەزا سپاهی لایین)ـە کە لە کتێبێکدا لەژێر ناوی مێژووی کورد لە جوگرافیای خوراسان (تاریخ کرد در جغرافیای خراسان) باسی ئەم بابەتەی کردووە و هەڵبژاردەیەکیشی لە لاپەڕە ٤٦-٤٧ی ژمارە ١٣٨ی گۆڤاری «مەهاباد» داناوە. لێرەدا سەرنجی خوێنەرانی خۆشەویست بۆ بەشێك لەم نووسراوەیە ڕادەکێشین:

*«... ئەوەی کەم و زۆر تا ئەمڕۆکە لە گێڕانەوە و ڕاپۆرتە زانستییەکان لەمەڕ مێژووی کۆچی کوردەکان بۆ خوراسان بەدەست هاتووە، بە گشتی ئەمەیە کە کوردانی خوراسان وەك قەومێکی ئێرانی لە چەند قۆناغێکی مێژوویی حکومەتی سەفەوییە بەسەر ئێراندا، لە سنوورەکانی باکووری ڕۆژئاواوە بۆ سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران کۆچێنراون. گرنگترین هۆکاری ئەم کۆچە مێژووییەش پێویستیی زیادکردنی ئیمکانی بەرگریی لە سنوورەکان زانراوە کە لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی بەردەوام لەلایەن قەومەکانی ئۆزبەك و تورکەمەن هێرشیان دەکرایەسەر و حکومەتە ناوەندییەکانی ئێرانیش بە هەر هۆکارێك توانای کۆکردنەوەی هێزیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەوان نەبوو. ڕێگەچارەیان لە جێگۆڕکێی بەربڵاوی هەزاران خێزانی کورد (وەك قەومێکی ئازا و جەنگاوەر) بۆ سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەڵات بینی. بێجگە لەوەش گوتراوە کە خڕبوونەوەی کوردەکان لە تاقە شوێن و جوگرافیایەکدا (چەند بەشێك لە سنووره هاوبەشەکانی ئێراق و ئێران و تورکیە و سوریە) دەیتوانی بۆ حکومەتە ناوەندییەکانی ئەم چوار وڵاتە مەترسیدار بێ و لەو بارودۆخەدا مەیلی ئەم هێزە بۆ لای هەر وڵاتێك دەیتوانی لە هاوسەنگیی دەسەڵاتدا*

*ڕۆڵێکـی دیاریکـەری هەبێ. لـە ڕێکەوتنە نهێنی و ئاشـکراکانی نێـوان دوو وڵاتی ئێـران و عوسـمانی، بابەتـی کۆچی زۆرەملێی کـوردەکان بۆ هێندێك لـە وڵاتەکانی وەك ئازەبایجـان، ئەرمەنسـتان و ... گرنگیـی پێـدرا و بە هەمان شـێوە کە حکومەتی عوسـمانی هـەزاران بنەماڵـەی کـوردی بـە شـێوەیەکی بەکۆمـەڵ بـۆ ئاسـیای ناوەڕاسـت دوور خسـتەوە، حکومەتـی ناوەندیـی ئێرانیـش نزیـك بـە پەنجاهـەزار خێزانـی کـوردی (لـە چەنـد قۆناغـدا) بـۆ سـنوورەکانی باکـوور و ڕۆژهەڵاتـی خوراسـان ڕاگواسـت...»*

ناوبـراو لـە درێـژەی وتارەکـەدا بـۆ سـەلماندنی ئـەوە کـە کـوردەکان پێـش سـەردەمی سـەفەوییەش لـە خوراسـان هەبـوون، ئامـاژە بـە چەنـد سـەرچاوەیەکی مێژوویـی دەکات:

«... ئیبـن خەلـەکان لـە «وفیـات العیـان»دا سـەرنجی ئێمـە بـۆلای تایفەگەلێکی زۆر لـە کوردانـی خوراسـان لـە سـەدەی دووەمـی کۆچـی ڕادەکێشـێ کە بـە وتەی ئـەو، ئەبوموسـلیمی خوراسـانی یەکێـك لـەو کوردانـە بـووە و لەنێـو کـوردان ڕاپەڕیـوە.

... لـە سـەفەرنامەی کلاویخـۆ (لاپـەڕە ١٨٨) کـە باسـی سـەفەرەکەی بـۆ چاوپێکەوتـن لەگـەڵ ئەمیـر تەیمـووری گورکانـی لـە کۆتاییەکانـی سـەدەی هەشـتەمی کۆچـی نووسـیوە، دەخوێنینـەوە: نزیکـەی فرسـەخێك مابـوو بگەینـە نیشـابوور، ئۆردوگایەکـی گەورەمـان دی، پێکهاتوو لە نزیکەی چوارسـەد خێوەت ... لـەم چادرانـەدا هۆزێـك بـە نـاوی ئەلـواری (کـە کـوردن) دەژین و هیـچ خانوو و سـەرپەنایەکیان نیـە بێجگـە لـەم چادرانـە و هەرگیزیـش لـە شـار یـان ئاواییـەك نیشـتەجێ نابـن. بەڵکـوو زسـتان و هاویـن لـە هـەوای ئـازاددا بەسـەر دەبـەن و خەریکـی مـەڕ لەوەڕاندنـن.

هەروەهـا لـە مێـژووی سیسـتانیش باسـی کوردانـی ئـەو سـەردەمە کـراوە و

بێجگە لەوەش لە ڕۆمانی مێژوویی خەیاڵیی «منم تەیموور جەهانگوشا» بیستوومانە کاتێك لشکری تەیموور گەیشتنە دەورووبەری خەبووشان (قووچان)، گرووپێکیان بینی کە لەسەر بەرزاییەکان ئاگریان کردبۆوە. سوڵتان چەند کەسێکی ناردن تا بیانهێنن. کاتێك هاتن چەند پیاوێکیان دیتن لەوپەڕی بەهێزی و شایانی شەڕکردن. بەڵام کاتێك لە ناو و نیشانیان پرسین و قسەیان لە پێویستیی پەیوەست بوون بە لشکری تەیموور لەگەڵ کردن، ئەوان دژایەتیان کرد و گوتیان ئێمە ئەم ئازادیی و سەربەرزییە بە هیچ نرخێك لەدەست نادەین ئەگەر ئاوامان کردبوایە ناچار نەبووین بە ژیان لەسەر بەرزایی چیاکان بەسەر بەرین.

بەپێی وتەی ئیبن خەلەکان کە ڕەشیدی یاسەمیش باسی کردووە، کوردەکان تەنانەت پێش گەیشتنی ئیسلام یان هاوکات لەگەڵ گەیشتنی ئیسلام بە ئێران لە ناوچەکانی مەرو (خوراسان) نیشتەجێ بوون.»

لە کۆتاییدا ناوبراو پاش هێنانەوەی چەند بەڵگەیەکی تری مێژوویی و ئاماژەکردن بە چەند سەرچاوەیەکی دیکە، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کوردەکان پێش سەفەوییەکان لە خوراسان نیشتەجێ بوون و دەڵێ:

*«... ئەوەی لە کۆبەندی ئەم بەشە لە نووسراو و بەڵگە مێژووییەکانی پێشوو دەتوانرێ بگوترێ ئەوەیە: بە لێبڕاویی و دڵنیاییەوە لە خوراسان پێش سەردەمی سەفەویی، وەك هێندێك لە ناوچە ناوەندییەکانی ئێران، کوردەکان بە شێوەیەکی هەستپێکراو هەبوون، بەڵام وا دێتە بەرچاو ئەم گرووپە لە کوردان نە لەباری ژمارەوە و نە لە ڕوانگەی ئامانجەکانەوە لە خوراسان، بەو ڕادەیە نەبوون کە بکرێ هەبوونیان لەو ناوچانە بە کۆچێکی بەرنامەبۆداڕێژراو و بەربڵاو لەقەڵەم بدرێ. وادیارە زۆربەی ئەو کوردانەی هەتا سەردەمی سەفەوی کۆچیان بۆ خوراسان کردووە، یان لە پاشماوەکانی مادە کۆچەرەکانی سەرەتاییەکانن کە*

*گەیشتوونە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران، یان ئەو گرووپە شەڕکەر و لەشکر و هۆزە مەڕدارانەن کە لە سەدەکانی دوای ئیسلام بە شێوەی کاتیی گەیشتوونە خوراسان و دواتر هەندێکیان بە هۆکارگەلێک ناچار بوون لەوێ بمێننەوە و درێژە بە ژیان بدەن...»*[١٠]

بەهەرحاڵ، ئەو کوردانە چ لە پێش سەردەمی سەفەوییەکاندا لە خوراسان نیشتەجێ ببن هەروەک بەشێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن و، چ لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی ئەم زنجیرەیەدا بۆ ئەو ناوچەیە ڕاگوێزرابن هەروەک زۆربەی سەرچاوەکان باسی دەکەن، ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین هەبوونی نزیک بە دوو ملوێن کوردە کە لە شار و ناوچە جیاجیاکانی خوراساندا درێژە بە ژیان دەدەن و سەرەڕای بوونی هێندێک جیاوازیی، خاوەن شوناس و ناسنامەیەکی هاوشێوەی سەرجەم کوردەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستانن. بێگومان لێکۆڵینەوە لە وەها بابەتێکی گرنگ پێویستیی بە دەرفەتی زیاتر و دۆزینەوەی سەرچاوەی زۆرتر و ماندووبوونی فرەتر هەیە کە پێویستە خوێندەوارانی دڵسۆزی کورد هەم لە کوردانی خوراسان و هەم لە کوردانی بەشەکانی دیکەی کوردستان بە بایەخەوە لێی بڕوانن.

### • شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە خوراسان

ئەم ناوچەیە لە باکووری خوراسان لە ئێران هەڵکەوتووە و دانیشتووانەکەی زیاتر هۆزە کوردەکانن. ئەم هۆزانە نزیکەی ٢٢ هۆز یان تایفەی گرنگی کوردن. ئێستا کە ئەم ناوچەیە بە سەرنجدان بە دابەشکاریی سیاسیی ئێران بەشێک لە پارێزگاکانی خوراسانی باکوور، خوراسانی ڕەزەوی و گوڵستان دێتە ئەژمار. شارەکانی ئیسفراین، بجنوورد، شیروان، قووچان، دەرگەز، چناران، باجگیران، ئاشخانە و فاروج خاوەنی زۆرینەی خەڵکی کورد و شارەکانی مەشهەد و

نیشـابوور و سـەبزەوار خاوەنـی کەمینـەی کـوردن.

زۆربەی گوندەکانی شارستانی شیروان بۆ نموونە بڵغان، گەرماب، سەرچەشمە، حەسار گلیان، مەلاباقر، رەزمقان، ورگ، تنسوان، کەلاتە زمان، سەرداب، سەرائی، کاکلی،پیر شەهید و... کوردنشینن. شێخ ئەمیرانلوو،میلانلوو،سیرسپرانلوو،ئامانلوو، قالتمانلوو، تەخت، چیرمە، پالکانلوو لە جیریستان، پەهلەوانلوو، بەرەدەر، قرچقە، شەمخاڵ لە باجگیران، توپکانلوو، تیتکانلوو، هەمزەلوو، ریشوانلوو، رووودکانلوو لەبادام،زیدانلوو،و ئاوایی یەدەك (ئیگ) لە قووچان و بجنورد و دەرگەز. سیوکانلوو لە ئەوغازی نوێ، کەم کیلانلوو لە باجگیران،شەهرانلوو،دەوڵەت خانی و شیخکانلوو لە ئەوغاز و چناران و قاسملوو لە ئیسفراین، تایفەی گەورەی مبلانلوو لە دەرگەز، تایفەکانی شیخوانلوو، باچلوانلوو، قەراچوورلوو، زیدانلوو، مادانلوو (بادانلوو)، کیکانلوو،پالکانلوو،کیوانلوو،زەنگەنە،توورانلوو،دولە شانلوو،ئەرتکانلوو،بریوان لوو،چەگینی،سوفیانلوو،بادلوو،کپکانلوو،گوشانلوو گیلانلوو[١١]

دوکتۆر ئەفراسیاب شـکوفتە لـە وتووێژێـك لەگەڵ ڕادیـۆ کوردانە بەم شـێوەیە بـاس لـە شـوێنەکانی نێشـتەجێبوونی کـورد لـە خوراسـان دەکات: « هەنووکـە کوردەکانـی ناوچـەی خوراسـان لە شـار و گوندەکانـی باکـووری ڕۆژهەڵاتی ئێران واتـە لـە ناوچەی مـزدوران لـە ڕۆژهەڵاتی شارسـتانی سـەرەخس هەتـا مراوەتەپە لە پارێـزگای گوڵسـتان ژیـان بەسـەر دەبـەن. بۆ وێنە ئـەو شـارانەی کـوردەکان تێیاندا نیشـتەجێن وەك: قووچـان، شـیروان، ئیسـفراین، ڕادکان، ئاشـخانە، ڕاز، کـەلات، سـەرەخس، بجنـوورد، چنـاران، فـاروج، باجگیـران، ناوچـەی سـەرویلایەتی نیشـابوور، ناوچـەی مشـکانی سـەبزەوار، مراوەتەپـە (دیـارە ئـەم ناوچەیـە ئێسـتا کەوتۆتـە نێـو پارێـزگای گوڵسـتانەوە) و، نزیکـەی لەسـەدا پـازدە (١٥٪)ی حەشـیمەتی شـاری مەشـهەد پێـك دێنـن. »[١٢]

گرنگترین شـارەکانی ناوچە کوردنشـینەکانی خوراسـان کە بەسـەر پارێزگاکانی

خوراسانی باکووری و خوراسانی ڕەزەویدا دابەش کراون، بریتین لە: شیروان، بجنورد، قوچان، ئیسفرایین، فاروج، مانە و سەملقان، جاجروم، چناران، باجگیران، ئاشخانە، دەرگەز، لاتین، کەلات، ڕاز و رادکان. کە نزیك بە تەواوی گوندەکانی سەر بەم شارانەش کوردنشینن.[١٣]

خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زیاتر ئاشنابوون بە شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردانی خوراسان لە ئێستادا لە بابەتی (عێل و عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان) یشدا چاوتان بە ناوی گەلێك ناوچە و ئاوایی کوردنشینی ناوچەی خوراسان دەکەوێت کە بۆ خۆپاراستن لە دووپاتکردنەوەی بابەتەکان بە پێویست نەزانرا لێرەشدا دابنرێن. هەروەها هەر لەو بابەتەشدا لە زۆر شوێندا باسی کاروباری ئەو عیلانە و تەنانەت لە هەندێك جێگەدا باسی سەرۆك عێل و کەسایەتیە بەناوبانگەکانیشیان کراوە.

## • ژمارەی کوردەکانی خوراسان

لەمەڕ ژمارەی کوردەکانی خوراسان سەرچاوەکان بە شێوەی جۆراوجۆر باسیان کردووە و هەریەکەیان بە چەشنێك ژمارەی کوردەکانی ئەم ناوچەیەی دیاری کردووە. بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نزیکەی یەك ملوێن و نیو هەتا دوو ملوێن کەس لە کوردەکان لەم ناوچەیە ژیان بەسەر دەبەن.

ویکیپیدیای فارسی لە بابەتی کوردەکانی خوراساندا ئاماژە بەوە دەکا کە حەشیمەتیان زیاتر لە ١,٧٠٠,٠٠٠ هەزار کەسە. پارێزگای خوراسانی باکووری (خراسان شمالی) ٨١١ هەزار کەسی حەشیمەت هەیە کە نزیکەی لەسەدا ٣٧ی ئەم ڕێژەیە لە کوردەکان پێك هاتووە و کوردەکان گەورەترین گرووپی ئیتنیکی ئەم پارێزگایەن.[١٤]

دوکتۆر ئەفراسیاب شکوفتە لە وتووێژێك لەگەڵ ڕادیۆ کوردانە بەم شێوەیە باس لە ژمارەی کوردەکان لە خوڕاسان دەکات: «بە سەرنجدان بەو بابەتانەی بۆ هەمووان ئاشکران، هیچکام لە نەتەوە و قەومەکانی نیشتەجێی ئێران بە جیا سەرژمێری نەکراون و ژمارەی حەشیمەتیان بە شێوەیەکی ورد لەبەردەستدا نیە، بەڵام هەندێك لە کارناسانی ئەم بوارە بە شێوەی نافەرمی، حەشیمەتی کوردەکانی خوڕاسان بە نزیکەی دوو ملیۆن کەس مەزەندە دەکەن.»[١٥]

بەپێی سەرچاوەیەکی دیکە لە ئێستادا نزیکەی ١/٧ ملیۆن کورد لە خوڕاسان ژیان بەسەر دەبەن کە نزیکەی ٦٠٪ی ئەوان لە گوندەکان، ٣٥٪ لە شارەکان و ٥٪ یش بە شێوەی عەشیرەتی کۆچەر، گەرمێن و کوێستان دەکەن.[١٦]

سەبارەت بە حەشیمەت و ئاماری کوردەکان لە خوڕاسان، هەروەك بەشەکانی دیکەی ئێران بابەتێکە ناتوانرێت بە تەواوی ئامارێکی ڕاستی بۆ دەستنیشان بکەین، چونکە لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە بەردەوام پێش لە بڵاوبوونەوەی ئامارەکان لەو هەرێمانە دەگیردرێت و ئەوە وەك مەترسییەك بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئێران ڕەچاو دەکرێت، سەرەڕای ئەمە کاربەدەستانی حکوومەتی هێندێکجار دەبێ ئامارێك لەگوێرِ سیاسەتەکانی خۆیان بڵاو بکەنەوە، بەپێی هەندێك لەو ئامارانە، کوردەکانی خوراسانی باکوور لە ئێستادا زیاتر لە دوو میلیۆن کەس دەبن. جگە لەوە نزیکەی ٤٠٠ هەزار کورد لە مەشهەد دەژین.[١٧]

### • عێل و عەشیرەتە کوردەکانی خوڕاسان

عێل و عەشیرەتە کوردەکانی خوڕاسان زۆرن و لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکانیشدا بە شێوازی جۆراوجۆر باسیان کراوە. لێرەدا هەوڵ دەدەین بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك وێڕای ئاماژە بە ناوی هەندێك لەم عەشیرەت و تایفە کوردانە، بە کورتیش باسیان بکەین:

ئیوانۆف، زانا و کۆمەڵناسی بەناوبانگی سۆڤیەتی پێشوو لە توێژینەوەیەکی لەژێر ناوی «نەژادناسیی خوراسان» بە شێوەی خوارەوە باس لە ٢١ عەشیرەتی کورد و شوێنی جێگەی ژیانیان دەکات:

١ـ میلانلوو لە قوشخانە، لە ناوچەکانی باکووری ئیسفراین، جوین و ...

٢ـ باجگیرانلوو: عەشیرەتێکی بچووك کە لە نزیك باجگیران نیشتەجێن.

٣ـ ئوقازلوو: لە نزیك ئوقاج (ئوقاز) بە درێژایی سنووری ئێران و ڕووسیا.

٤ـ هولانلوو (هیوە دانلوو): نزیك قوچان و دەرگەز.

٥ـ قاسمانلوو: نزیك نووخ و دیزوان.

٦ـ شادلوو: لە بجنوورد و دەوروبەری و زۆربەیان بە تورکی قسە دەکەن.

٧ـ زەعفەرانلوو: لە شیروان. (مەردوخ لە لاپەڕەی ٩٣ی مێژووەکەیدا دەڵێ: زەفرانلی یان زەفرانلوو کە زەعفەرانلووشیان پێ دەڵێن تیرەیەکی هۆزی حەسنانلوون کە شا عەبباس ئەوانی بۆ خوراسان ڕاگواستووە).

٨ـ کورانلوو: لە باکووری قوچان (گوندی کوران نیوەی تورك و نیوەی کوردن).

٩ـ مشکانلوو: نزیك مشکان و لە دەوروبەری قوچان.

١٠ـ بۆرجی: نزیك ڕادکان.

١١ـ کەیوانلوو: لە جوین و لە ناوچەکانی باکووری نیشابوور.

١٢ـ مەردکانلوو (مەرداکانلوو): لە ناوچەکانی باکووری نیشابوور و دەوروبەری قوچان.

لە گشت ئەم عەشیرەتانە لە حاڵەتێکی نێوان گوندنشینی و چادرنشینیدا ژیان بەسەر دەبەن. زۆربەیان یان لە نیوەی زیاتر بە شێوەی چادرنشینی دەژین. بۆ وێنە هاوینان خەرکی وەرزێرین و لە زستانیشدا خەریکی مەڕدارین و بەرەو ناوچە گەرمێنەکان کۆچ دەکەن. لە بنەڕەتدا گۆڕانی ژیان لە چادرنشینییەوە بۆ

گوندنشینی پرۆسەیەکی بەرەبەرەیی و تەدریجییە و لە تەواوی عەشیرەتەکاندا ئەم پرۆسەیە بەڕێوە دەچێ.

ئەم تایفانەی خوارەوەش بە شێوەی چادرنشینی ژیان بەسەر دەبەن:

١٣ـ ریشوانلوو: لە خاکستەر، لایین و نزیك کاخەك (کەلات).

١٤ـ بروانلوو: نزیك کاخەك و لە هاویندا لە کەلات.

١٥ـ هوفشانلوو: لە زستاندا لە دەرگەز و لە هاویندا لە دۆڵە خۆش ناووهەواکانی فوچان.

١٦ـ بدوانلوو: لە زستاندا لە دەرگەز و لە هاویندا لە خڕ و دۆڵە خۆشەکانی قوچان.

١٧ـ جاوکانلوو: لە زستاندا لە چەمخالە و لە هاویندا بەرەو کێودەوڵەت کۆچ دەکەن.

١٨ـ قارەمانلوو: لە ناوچە باکورییەکانی نیشابوور و دەوروبەری.

١٩ـ ورانلوو: تایفەیەکی بچووکن کە لە دەوروبەری نیشابور دەژین.

٢٠ـ توپکانلوو: لە ناوچەکانی جووین و لە بەشێك لە نیشابور و لە زستاندا بەرەو دەوروبەرەکانی دەشتی تەقی دەچن.

٢١ـ عمارلوو: لە باکووری ڕۆژئاوای نیشابوور و لە دەوروبەرەکانی گوندی ماروك کە «ماروش»یشی پێدەڵێن، نیشتەجێ دەبن.[١٨]

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەی خوارەوە ناوی ژمارەیەك لە عێل و عەشیرەتە کوردەکان هاتووە:

قەراچورلوو / کیکانلوو / سیوکانلوو / بیچرانلوو / قارەمانلوو / میلانلوو / توپکانلوو / هودانلوو / بادلانلوو / زیدانلوو / سۆفیانلوو / توروسانلوو / زەنگەلانلوو / باچیانلوو / رودکانلوو / ڕیشوانلوو / حەمزکانلوو / شێخ ئەمیرانلوو / جەلالی / سیاەمەنسوور /

جەهـان بیگلی / مادانلـوو / قەرباشـلوو و ... [١٩]

بـەڵام لـە بەشـی چوارەمـی کتێبـی (ایـل هـا و طایفەهـای عشـایری کـرد ایران) لـە نووسـینی بەڕێـز (سـید علـی میرنیـا) بـە دوور و درێژی باسـی عێل و عەشـیرەتە کوردەکانی خوراسـان و شـوێنی نیشـتەجێبوونیان و هێندێك لە کەسـایەتییە ناسراو و بەناوبانگەکانیـان و ... کـراوە بـۆ زیاتـر دەوڵەمەندکردنـی باسـەکەمان بـە کورتـی باس لە ناو و شـوێنی نیشـتەجێبوون و ... ئەو عێل و عەشـیرەتانە دەکەین. پێویسـت بـە ئاماژەکردنـە کـە هـەر لە میانەی باسـکردنی ئـەم عێڵاتـەدا باس لـە بابەتگەلێکی گرنگـی وەك زمـان، باری گوزەران و کاروبارییان و زۆر شـتی دیکەش دەکرێ. هەر بۆیـە هەرچەنـد بابەتەکـە کەمێـك دووورودرێـژە، بـەڵام لەبەر ئـەوەی چەنـد بابەتی دیکەشـی تێـدا بـاس کـراوە و ئاماژە بـە زۆر بابەتی گرنـگ دراوە، بە پێویسـت زانرا دابنرێ هەرچەنـد هەوڵـیش دراوە کـورت بکرێتەوە. ئێسـتاش نـاو و ناوبانگی ئەو عێلاتـە بەپێـی ئـەو سـەرچاوە بەنرخە:

ـــ *عێلـی عمارلـو لـە خوراسـان:* هێـنری فیلـد سـەبارەت بـە کـوردە ئـازا و بەتواناکانـی عمارلـوی ناوچـەی ماروسـکی نیشـابوور باسـی ئـەوەی کـردووە کـە عمارلـوو لـە پێنجسـەد بنەماڵـە پێك هاتـووە کە لە دەشـتی (مـەروش) لـە باکووری ڕۆژئـاوای نیشـابوور ژیـان بەسـەر دەبـن. شـیعەن و زمانـی خۆیـان پاراسـتووە.

تایفـە کوردەکانـی عمارلـوو لـە نیشـابوور بریتیـن لـە تایفـەی بەگـی ئارلـو، تایفـەی ئۆرتکانلـوو، تایفـەی عزلـو، تایفـەی پائـی و تایفـەی حەفتـا و دوو میللـەت. ئـەم تایفانـەی لـەم گوندانـەی شارسـتانی نیشـابووردا نیشـتەجێن: زەرەنـدی، شـیدقولی، کەلاتـەی مەمـەش خـان، مەرجـان، مـاروس، کارچـی (قارچـی)، کەلاتـەی ئیسـماعیل، تەنگـی خـواروو، تەنگـی سـەروو، کەلاتـەی مـەلا، بـورج، کەلاتـەی مـەلا جەعفـەر عەلـی، قـەڵای مسـتەوفی، کەلاتـەی شـامی، سـینە ئەسـپ بـالا، خـون ئـاورد.

... بە شێوەیەکی گشتی لە ناوچەی نیشابوور حەفتا گوندی کوردنشین هەیە. ئاژەڵدارانی عمارلوو بۆ کویستانان دەچنە کێوەکانی باکووری قوچان و شیروان و بۆ گەرمێنیش بۆ لای مراوە تەپە دادەگەڕێن.

ــ ***عێلی ئیزانلوو لە شیروان:*** ناوی ئەو عێلە لەلایەن مێژوونووسان و جوگرافی نووسان بە شێوەی جۆراوجۆری وەك ئوستانلوو، ئوسانلوو و واسانلوو نووسراوە. ئەمڕۆکە بە شێوەی ئیزانلوو باوە. ژمارەیەکی زۆر لە بنەماڵەکانی ئەم عێلە لە قۆناغەکانی سەرەتایی کۆچی مێژوویی کورد بۆ خوراسان لە دەوروبەرەکانی خوار و وەرامیس بەجێمان کە بەڕێز مەسعوود کەیهان لە کتێبی (جغرافیای مفصل ایران) دا ژمارەی ئەوانی بە هەزار و دووسەد خێزان داناوە.

بەشێکی گرنگی ئەم عێلە کە گەیشتنە خوراسان، لە ناوچەکانی قوچان و بە تایبەت شیروان لە گوندەکانی باداملوو، قزڵ حەسار، شورك، زۆوێرام، کەلاتە، ئودە وە (عەبدول ئاوا) نیشتەجێ بوون. زمانیان کوردییە و بە تورکی و فارسیش قسە دەکەن و خەریکی کاری وەرزێری و ئاژەڵدارییین.

ــ ***عێلی شێخ ئەمیرانلوو لە شیروان:*** هۆی ناولێنانی ئەم عێلە ئەوەیە کە گەورەترین سەرۆك عێلەکانی زەعفەرانلوو وەك شوجاعولدەولەکان، دەسەڵاتدارانی قوچان و فەرەجوڵلاخانی زەغیمی حاکمی شیروان و ڕەوشەنییەکان خانەکانی ئیسفرایین لەم عێلە هەڵکەوتوون... خەڵکەکەی تری شێخ ئەمیرانلوو لە باکووری شارستانی ئیسفرایین نیشتەجێن و خەریکی وەرزێری و باغدارین. ئەم عێلە ڕۆشنبیری زۆری لێ هەڵکەوتوون بە تایبەتی لە بواری پزیشکیشدا کەسانی بە توانای لێ هەڵکەوتوون کە خزمەت بە خەڵکی خوراسان دەکەن.

ــ ***تایفەی سویدانلوو لە شیروان:*** ئەم تایفەیە لە عێلی گەورەی زەعفەرانلوو و لە ئاوایی ڕەزمقانی سەر بە شارستانی شیرواندا نیشتەجێن و خەریکی

ئاژەڵداری و وەرزێرین. زمانیان کوردییە و بە زمانەکانی تورکی و فارسییش قسە دەکەن و پێڕەوی مەزهەبی شیعەی دوازدەئیمامین.

ـــ *عێلی بیچرانلوو لە شیروان:* عێلی بیچرانلوو کە خاوەن کەسانی ئازا و نەترسە لە ناوچەی دێهستانی بیچرانلوو لەنێو کوێستانە سنوورییەکان و دۆڵە تەنگ و قووڵەکانی زنجیرە کێوی بەناوبانگی (گولیل یان گلۆیل) نیشتەجێن و بە کاری وەرزێری و ئاژەڵدارییەوە خەریکن. ژمارەیەکیان لە گوندی (هونامە) و شاری شیروان نیشتەجێن. ناوەندی سەرەکی عێلی بیچرانلوو لە هاویندا (قەڵا حەسەن) و لە زستاندا گوندی (هونامە)یە. هەتا پێش هاتنی (حەسەنخانی عاشق) لە سوریە و پەیوەستبوونی بە کوردانی بیچرانلوو، سەرۆکایەتی ئەم عێلە بە خانەکانی (سیفکانلوو) بووە.

ـــ *تایفەی کوردی شاملوو لە شیروان:* بیچرانلووەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە کوردە جەنگاوەرەکانی سووریەن، چونکە لە ناوچەی باکووری سوریەی ئێستا بەرەو خوراسان کۆچیان کردووە و بە شامی یان (شاملوو)ش بەناوبانگن. کوردەکانی ئەم عێلە لە بێڕەحمی و دڵرەقی و خوێنڕشتندا بەناوبانگن و لەسەر زار و زمانانن. لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتدارییەتی محەمەدشای قاجار حەسەن ناوێك لە خەڵکی بیچرانلوو بە هۆی ئەو ئاڵۆزییانەی لە سوریە هێنابونیە پێش و ناچار بە کۆچکردن و جێهێشتنی وڵات ببوو، لە ڕێگە لەگەڵ کۆچی کوردان بۆ خوراسان دەکەوێ و بە عێلی خۆی پەیوەست دەبێ. ئەم کەسە کە گوایە پێشتر عشاق (مۆزیك ژەن) بووە و دواتر بە هۆی لێهاتوویی و ئازایەتییەوە ڕێبەرایەتیی عێلی بیچرانلوو بەدەستەوە دەگرێ و سەرۆکایەتیی ئەو عێلە لە دەست (سەعادەتقولی خان) یەکەم سەرۆك عێلی (سیفکانلوو) دەردێنێ و سەربەخۆیی بەو عێلە دەبەخشێ. خانەکانی دواتری بیچرانلوو کە لە نەوەکانی ئەم حەسەنخانەن، بریتین لە: مصرخان، کریمخان، فرج اللە خان، علیخان.

خەڵکی ئەم عێلە بێجگە لە دێهستان بیچرانلوو لە ئاواییەکانی گدوکانلوو، بیوارە (بێبەهرە)، هونامە، کەلاتەی سەروو، دەربەند، قولان، لوجەلی سەر بە شیروان نیشتە جێن.

ـ **_عێلی بادلانلوو (بەهادرانلوو) لە قووچان:_** ئەم عێلە لە قوچان و لە ئاواییەکانی علاقە جنبان، کەلاتە گوڵ نیشتەجێن. سەرکردەکانی ئەم عێلە هەمیشە خاوەن دەسەڵات و دەسترۆیشتوو بوون و خۆیان پێ لە سەرکردەکانی زەعفەرانلوو کەمتر نەبووە. لە سەردەمی نادرشادا حکومەتی ناوچەگەلێکی گرنگی وەك فارس، نیسفەهان لە ئەستۆی ئەمیرەکانی بادلانلوو بووە و تایفەی شیرزەنلوو لە ئاوایی شیرزەنلوو و تایفەی شارە رەکی لە گوندی شاە رەك و، کەرگرلوو لە مشکانلوو و کورانلوو لە ئاوایی شیرزانلوو لە دەوروبەری قوچان ژیاون.

ـ **_عێلی بالکانلوو لە جیرستان:_** ئەم عێلە لە دەوروبەری سنووری ئێران و سۆڤیەت لە ناوچەی جیرستانی قوچان نیشەجێن و خەریکی کاروباری وەرزێری و ئاژەڵدارین. زمانیان کوردییە و بە تورکی و فارسییش قسە دەکەن. تایفە کوردەکانی دیکەی جیرستان بریتین لە: سەرکانلوو و کالتمانلوو.

ـ **_عێلی پەهلەوانلوو (پاڵەوانلوو) لە باجگیران:_** ئەم عێلە لە عێلە بەناوبانگەکانی زەعفەرانلوویە کە تووشی پرش و بڵاویی و لێك هەڵوەشان بووە. ژمارەیەکیان لە بجنوورد و هەندێکیان لە شیروان و ئەوانی دیکەش لە ئاواییەکانی دور بادام و بەرەدەر لە نزیك باجگیران نیشتەجێن و خەریکی کاری مەڕداری و وەرزێریین و ژمارەیەك لە خوێندەوارانی ئەم عێلە پلەی مامۆستایەتیی زانکۆکانیان بەدەست هێناوە.

ـ **_عێلی تویکانلوو لە قووچان:_** لە سەرانسەری ناوچەکانی باکووری خوراسان بە تایبەت قووچان، شیروان، گیسفەرایین و باکووری نیشابوور بە کاری

وەرزێـری و ئاژەڵدارییـەوە خەریکـن. ژمارەیەکیـان گەرمێـن و کوێـستان دەکـەن و هاوینـان دەچنـە ناوچـەی ئەخلومـەد و کێوی کلیدەری باشـووری قووچـان و لە زستانیشـدا بە تێپەڕین لە دەشـتی کەشـف ڕوود لە ناوچەی سەرەخسی دەوروبەری مـزدوران درێـژە بـە ژیانـی پـڕ زەحمـەت و چەرمەسـەریی خۆیـان دەدەن...

**ـــ *عێلـی تیتکانلـوو لـە قووچـان:*** تیتکانلـووەکان لـە گوندێـك هـەر بـەم ناوە لـە بیسـت و پێنـج کیلۆمیـتری باکـووری ڕۆژئـاوای قووچـان نیشـتەجێن و لـە دێرزەمانـەوە بـە کاری وەرزێریـی و باغدارییـەوە خەریکـن. باشـترین جـۆری ترییـی قووچـان بەرهەمـی کار و زەحمەتـی خـاوەن باغەکانـی تیتکانلوویـە. زمانیان کوردیـی کرمانجییـە و بـە تورکـی و فارسـیش دەپەیڤـن.

**ـــ *عێلـی هەمزەکانلـوو لـە قووچـان و بجنـوورد:*** بەشـی زۆری ئـەم عێلـە لـە کوردسـتانی تورکیـە بەجێـماوە و ئەوانـی تـر لـە ئاوایـی هەمزەکانلـووی سـەرێ و خـوارێ لـە باکووری قووچان و ئاواییەك هەر بەم ناوە لە بجنوورد و ژمارەیەکیشـیان لـە ئاواییەکانی (گوڵمەکان)ی نزیك مەشـهەد و دەوروبەری نیشـتەجێن. زۆربەیان خەریکـی مـەڕداری و باغـداری و وەرزێرییـن. زمانیـان کوردیـی کرمانجییـە و بـە زمانەکانـی تورکی و فارسـیش قسـە دەکەن.

**ـــ *عێلی ڕشـوانلوو لـە قووچـان و بجنوورد:*** لە دێهسـتانی قوشـخانەی سـەر بـە قووچـان و باکـووری ڕۆژهەڵاتـی بجنـوورد نیشـتەجێن. و بەشـێکی زۆریـان بۆ شـیروان کۆچیان کردووە. بەشـێکیان لە دێهسـتانی (مایوان)ی قووچان نیشـتەجێن و ژمارەیـەك لـە ڕۆڵەکانیـان بـە هـۆی زیرەکییـان لـە خوێنـدن پلـەی ئەندازیارییـان وەدەسـت هێنـاوە و خەریکـی خزمـەت کردنـن. زمانیـان کوردیـی کرمانجییـە و بە ئاژەڵداریـی و وەرزێرییـەوە خەریکـن.

**ـــ *عێلـی ڕوودکانلوو لە قوچان:*** بەشـێك لەم عێلە لە ئاواییەکانـی دەوروبەری قووچان نیشـتەجێ بوون. بەشـەکەی تـری خەریکی گەرمێن و کوێسـتانن و...

ــ ***عێلی زیدانلوو لە قووچان و دەرگەز:*** کوردانی زیدانلوو خەڵکێکی ئازا و زەحمەتکێش و خۆڕاگرن و زۆربەیان لە ئاوایەکانی زیدانلوو لە دوازدە کیلۆمەتری باکووری ڕۆژئاوای قووچان و دەروبەری و، لە دەرگەز لە دۆڵی دەرونگەر نیشتەجێن و خەریکی باغداریی و وەرزێریی و مەڕدارییـن. زمانیان کوردیی کرمانجییە و فارسی و تورکییش دەزانن.

ــ ***عێلی سیفکانلوو لە ئەوغازی قووچان:*** عێلی سیفکانلوو و عێلی بیچرانلوو لە کاتی گەیشتنیان بە خوراسان و نیشتەجێبوونیان لە ناوچەکانی بجنوورد سەر بە عێلی گەورەی کیکانلوو بوون. ناوەندی عێلی سیفکانلوو ئاوایی ئەوغاز سەر بە بەخشی باجگیرانی قووچانە و شوێنی نیشتەجێبوونی عێلەکەش دێهستانی سنووریی ئەوغاز و ئاوایەکانی ئیمامقولی، شرکانلوو، دووربادامی قووچان و هەروەها لە باکووری ڕۆژئاوای شیروان، ئاوایەکانی زەینەڵ بەگ، قزل قان، چاربورج، قەلعە جوقن. تایفەکانی تری ئەوغاز بریتین لە: تایفەکانی روتکانلوو، مشکانلوو، خوراسکانلوو، کافی مشکان و ئەولاشلوو.

ــ ***تایفەی کەم کیلانلوو لە باجگیران:*** گەورەترین تایفەی عێلی سیفکانلوو تایفەی (کەم کیلانلوو)یە کە ناوەندی سەرەکییەکەی ئاوایی (چپانلوو)یە. ئەم تایفەیە دامەزرێنەرانی سەرەکیی باجگیرانن و بەشێکیشیان لە ئاواییەکانی قەلعە سەفا، قوش قەلعە و هەروەها قوچان و شیروان و مەشهەد نیشتەجێن.

تایفەکانی دیکەی عێلی سیفکانلوو بریتین لە: بوانلوو، ئولاشلوو، شوکرانلوو، زورتانلوو، کافی مشکان (کالمشکان)، قزل قابلوو، شرکانلوو و سفکانلوو. زمانی سەرەکیی ئەم عێلە و تایفەکانی کوردیی کرمانجییە و بە تورکی و فارسییش قسە دەکەن و بە کاری وەرزێریی و ئاژەڵدارییەوە خەریکن.

ــ ***عێلی سیل سپرانلوو لە جیرستانی قووچان:*** خەڵکی ئەم عێلە کە لە دوو گوند هەر بەم ناوە لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران و سۆڤیەتی پێشوو لە

دێهستانی جیرستان نیشتەجێن، زۆر ئازا و ڕەشیدن. هۆی ناولێنانی ئەم عێلە هەروەك لە کتێبی (تاریخ عالم ئارای عەبباسی)دا باس کراوە: لە یەکێك لە شەڕەکانی شا عەبباس لەگەڵ ڕۆمییەکان خەڵکی ئەم عێلە بە تەنیایی داخوازی لەناوبردنی سوپای ڕۆم بوون و بە هێرشی خێرا و گورجکبڕی خۆیان ئاگرێکیان خستە خەرمانی گیانی دوژمن کە ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بەشێکی زۆریشیان لێ بەدیل گرتن و ئەوانی تریشیان ڕەتاندن. شاعەبباس کە لەسەر تەپۆلکەیەك ڕا سەیری مەیدانی شەڕەکەی دەکرد، بە (سیل سپورانلوو) بانگی کردن کە تورکییە. واتە (وەك سێڵاو دوژمنیان ڕامالی). سەرکردەکانی ئەم عێلە لە سەردەمی سەفەوییە و نادرشا و تەنانەت تا سەردەمی شارۆخی نابینا، خزمەتی زۆریان پێکردوون و سەردەمانێك حکومەتی مەشهەدیان بەدەستەوە بووە. زمانیان کوردیی کرمانجییە.

ـ ***عێلی شرانلوو لە دەوڵەتخانەی قووچان:*** ناوەندی ئەم عێلە لە کەلاتەی شا محەمەد لە دێهستانی دەوڵەتخانەی قووچانە. ئەم عێلە ژن و پیاوی زۆر ئازا و بەهێزی لێ هەڵکەوتوون. ئەم عێلە کەلەپوور و کولتووری خۆیان پاراستووە و لە نێوان قووچان و مراوەتەپە خەریکی مەڕدارین. زمانیان کرمانجیی و تورکییە.

ـ ***عێلی شیخکانلوو لە ئەوغاز و چناران:*** عێلی شیخکانلوو یان شیخوانلووی خەلکێکی ئازا و جەنگاوەر و بێباکن. شاهوەردیخانی شیخوانلوو لە دژبەرە سەرسەختەکانی نادرشا، یەکێك لە پیاوە هەڵکەوتوو و بەناوبانگەکانی ئەم عێلەیە. شوکربەگ خانی شیخوانلوو و سلێمان بەگیش لە پیاوە ئازاکانی شێخکانلوو بوون... لە ڕۆژگاری قاجاردا سەرکردە جەنگاوەرەکانی شیخوانلوو لە ناوچەی چناران و ڕادکانی سەر بە مەشهەد ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو. ئەم عێلە کەسانی زۆر بە توانا و ئازای لێ هەڵکەوتوون کە هەندێکیان بریتین لە: قوجەخانی شیخوانلوو، ئیبراهیم خان و ... محەمەدڕەزاخانی کوڕی ئیبراهیم

خـان حاکمـی عێلەکانـی کیوانلـوو و کاوانلـوو و شـیخوانلووی ناوچـەی رادکان و چناران لـە سـەردەمی ناسرەددیـن شـادا بـووە.

ئـەم عێلـە لـە ئاواییەکانـی سـەر بـە قوچـان و ڕادکان و چنـاران و لـە گونـدی شـیخوانلوو دەرگـەز بڵاو بوونەوە و خەریکـی ئاژەڵداری و وەرزێریـن. ژمارەیەکی زۆریشـیان لـە شـاری مەشـهەد نیشـتەجێن.

ــ ***عێلـی قاچکانلـوو لـە قووچـان:*** ئـەم عێلـە لـە دەوروبەرەکانـی قوچـان بـە تایبـەت لـە فەتـح ئابـاد و لـە ئاوایـی قاچکانلـوو و لـە گوندەکانـی دێهسـتانی ئاچوانلووی دەرگەز نیشـتەجێن. بـە مەڕداریی و وەرزێرییـەوە خەریکن و گەرمێن و کوێسـتانیش دەکـەن.

ــ ***عێلـی قاسـمانلوو لـە ئیسـفەراین:*** ئـەم عێلـە یەکێك لـە گرنگتریـن عێلە کوردەکانـی زەعفەرانلوویـە کـە لـە داوێنـی کێـوی (شـاه جەهـان) لـە نێـوان ئیسـفەراین و شـیروان لـە کەلاتـەی (قاسـمانلوو) نیشـتەجێن و خەریکـی کاری وەرزێریـی و ئاژەڵداریـن... بەشـێك لـەم عێلـە لـە ئاوایـی (دیـز ئابـاد)ی قووچـان نیشـتەجێن و بـە ئاژەڵدارییـەوە خەریکـن...

ــ ***عێلـی قەرامانلـوو لـە قووچـان:*** عێلـی قەرامانلـوو کـە ئەمڕۆکـە بـە (قارەمانلـوو / قەهرەمانلـوو) بەناوبانگـە، یەکێـك لـە گرنگتریـن عێلەکانـی کـوردی زەعفەرانلوویـە. سـەرۆك و دەسـەڵاتدارانی ئـەم عێلـە لـە سـەرەتاکانی پێکهاتنـی دەوڵەتـی سـەفەوییەوە کاروبـاری گرنگیـان بەدەسـتەوە بـووە. بەیـرام بەگـی قەرامانـی یەکێـك لـە گەورەتریـن سـەرکردەکانی شـا ئیسـماعیلی سـەفەوی دوای وەدەرنانـی ئۆزبەکـەکان لـە خوڕاسـان بـە فەرمانـی شـا ئیسـماعیل کـرا بـە حاکمی هیـرات. فەرهادخانـی قەرامانلوو لە سـەردەمی شـا عەبباسـدا کرا بە سوپاسـالار و ...

عێلەکانـی قارەمانلـوو و سـیفکانلوو و بادالنلـوو لـەو عێلـە گرنگانـەن کـە زووتر شـارەزای خوێنـدن و پـەروەردەی نـوێ بـوون و زۆر کەسـی بەتوانـا و خـاوەن

پلـەی بـەرزی خوێندەوارییـان لـێ هەڵکەوتـوون. تایفـەی شـەرانلوو سـەر بـەم عێلـەن کـە لـە باکـووری قووچـان ژیـان بەسـەر دەبـەن. مەڕدارانـی قارەمانلـوو هاوینـان لـە کێـوی ئارموتلـی و لـە زستانیشـدا لـە باکـووری مـراوە تەپـە و دۆڵـی قاقـلان بارگـە و بنەیـان دەخـەن

ـــ ***عێلـی کاوانلـوو لـە چنـاران و ڕادکان:*** کاوانلـوو لـە گەورەتریـن عێلەکانی زەعفەرانلوویـە کـە لـە ناوچەکانـی چنـاران، ڕادکان، بەخشـەکانی مەشـهەد و هەروەهـا لـە دۆڵـی دەروونگـەری دەرگـەز و کەلات نیشـتەجێ بـوون و خەریکی کاری ئاژەڵـداری و وەرزێریـن. بەشـێکیان یەکجێنشـین و بەشـێکیان گەرمێـن و کوێسـتان دەکەن. زمانیان کوردیی کرمانجییە و بە تورکی و فارسـیش قسـە دەکەن.

ـــ ***عێلـی گـوران لـە قوچـان و شـیروان:*** ئـەم عێلـە زیاتر لـە هەمـوو عێلەکان کاریگەریـی کولتـووری تورکـی بەسـەرەوەیە چونکـە هـەم لـە ناوچـەی گونـدی (گـوران)ی قووچـان و هـەم لـە ناوچـەی (فیـروزە)ی شـیروان دراوسـێی هـۆزە تورکـەکان بـوون و هـەن. کوردانـی فیـروزە شـانازی بـە قارەمانانـی وەك سـەردار عەوێـز و سـەردار ئـاراز و شـێرەژنانێکی وەك توحفەگـوڵ دەکات. بـۆ سـەر پێنـج تاییفـە دابـەش دەبـن: گـوران، بـەگان (بەگـەکان)، جـەلالان (جەلالیـەکان)، کـوم بەلـەکان، قـورکان.

ـــ ***عێلـی کیکانلـوو لـە قوچـان و بجنـوورد:*** لـە گەورەتریـن عێلەکانـی زەعفەرانلوویـە کـە لـە ئێسـتادا بۆ سـێ عێـل دابـەش دەبـن: بیچرانلوو، سـیفکانلوو و کیکانلـوو. عێلەکانـی بیچرانلـوو و سـیفکانلوو لـە ناوچە سـنوورییەکانی قووچان و کیکانلـوو لـە بەخشـی مانـە سـەملقانی بجنـوورد نیشـتەجێن. بەشێکیشـی لـە باکـووری قووچـان لـە (ئینچـە کیکانلـوو) نیشـتەجێن و بـە کاری ئاژەڵـداری و وەرزێـری خەریکـن.

ـــ ***عێلـی کەیوانلـوو لـە ڕادکانـی چنـاران:*** خەڵکـی ئـەم عێلـە گەورەیـە لـە

ناوچەی قووچان، ڕادکان و چناران نیشتەجێن. ئەم عێلە وازیان لە مەڕداری و چادرنشینی هێناوە و بە باغداری و وەرزێرییەوە خەریکن...

ــ *عێلی میانلوو لە چناران و ڕادکان:* میانلوو لە گەورەترین عێلە کوردەکانی زەعفەرانلوویە... تەواوی کوردانی میانلوو لە ناوچەی چناران و رادکان نیشتەجێ بوون و خەریکی وەرزێری و باغدارین. زمانیان کوردیی کرمانجییە و بە تورکی و فارسیش قسە دەکەن.

ــ *عێلی موژدگانلوو لە نیشابوور:* هەروەك عێلی عمارلوو لە ئاواییەکانی دەشتی ماروسکی نیشابوور کە حەفتا و دوو گوندی کوردنشینی لێیە، ژیان بەسەر دەبەن. حەسەنخانی کوردی موژدگانلوو یەکێك لە سەرداره ناودارەکانی نادرشای ئەفشار سەر بەم عیلە بوو. خەڵکی ئەم عێلە خەڵکێکی زەحمەتکێش و چالاك و بەغیرەتن و خەریکی وەرزێری و ئاژەڵدارین. زمانیان کوردیی کرمانجیە و بە تورکی و فارسییش دەپەیڤن. تایفە کوردەکانی تری نیشابوور کەیوانلوو، قارەمانلوو، وەرانلوو و توپکانلون کە لە ناوچەکانی باکوور ژیان بەسەر دەبەن.

ــ *عێلی میلانلوو لە قووچان و ئیسفەرایین:* میلان و زیلان دوو عێلی بەناوبانگی کورد بوون. عێلی میلان یەکێك لە عێلە پڕحەشیمەتەکان بووە کە لە خوراسانی باکوور نیشتەجێ بوون بەڵام زانیارییەك لەبارەی عێلی زیلان لەبەردەست نیە. بەڵام کوردەکان دوای جێگیربوون لە ناوچە سنوورییەکان، ناوی زیلانیان لەسەر یەکێك لە کێوە بەرز و هەڵەمووتەکانی نیوان ئەوغاز و باجگیران دانا. بەشێکی لە خەڵکی سەر بەم عێلە لە دێهستانی سنووریی جیرستان و دوو ئاوایی بەم ناوە نیشتەجێن. زۆربەی ئەم عێلە کە نزیکەی بیست و چوار تیرەن، لە ناوچەی کوێستانییەکانی نێوان شارستانەکانی شیروان و ئیسفەرایین نیشتەجێ بوون و خەریکی ئاژەڵداری و باغداری و وەرزێریین. ژمارەیەك لە

تیرەکانی ئەم عێلە، لە ئاوایییەکانی ئیسفەرایین و داوێنی کێوی شاە جەهان وەك دەوڵەت ئاباد، قاسم ئاباد، پرتان، عەباس ئاباد، نوشیروان، ئوردغان، بیدواز سەر بە شارستانی ئیسفەراین نیشتەجێن و خەریکی وەرزێریی و ئاژەڵدارین. زمانیان کرمانجی و تورکی و فارسییە و ...

ـــ ***عێلی نامانلوو لە جیرستان:*** نامانلووەکان خەڵکێکی زۆر ئازا و بەهێز و زەحمەتکێش و جەنگاوەرن کە لە دێهستانی جیرستان لە هێلی سنووریی نێوان ئێران و سۆڤیەتی پێشوو نیشتەجێن و خەریکی کاری ئاژەڵداری و وەرزێریین زمانیان کوردیی کرمانجییە و بە تورکی و فارسییش قسە دەکەن.

ـــ ***عێلی وەرانلوو لە دوغائی:*** وەرانلوو یەکێك لە گەورەترین عێلەکانی زەعفەرانلوویە کە لە ئێستادا (مەبەست کاتی نووسینی کتێبەکەیە) هەزار بنەماڵە دەبێ. زیاتر لە پێنجسەد بنەماڵەی لە دێهستانی دوغائی قووچان لە ئاوایییەکانی شەفیع، ئیبراهیم ئاباد، ڕەزا ئاباد و ... نیشتەجێن و بە کاری وەرزێری خەریکن و بەشێکیشیان گەرمێن و کوێستان دەکەن و ...

ـــ ***عێلی هودانلوو لە دوغائی:*** زۆربەی خەڵکی ئەم عێلە دەستیان لە چادرنشینی و ژیانی کۆچەریی هەڵگرتووە و نیشتەجێ بوون و زۆربەیان لە دێهستانی دووغائی جێگیرن. ژمارەیەکیان بۆ شارەکانی قووچان و مەشهەد کۆچیان کردووە. تاقمێکیشیان هاوینان دەچنە کوێستانەکانی نێوان قووچان و نیشابوور و زستانان بۆلای ناوچەکانی سەرەخس دادەگەڕێن. حەبیبوڵڵاخانی ناسر لەشگری قووچانی لەگەورەپیاوانی ئەم عێلە بووە....

ـــ ***عێل و عەشیرەتە کوردەکان لە بجنوورد:*** عێلە کوردە بەناوبانگەکانی شارستانی بجنوورد بریتین لە:

شادلوو، زەعفەرانلوو، قەراچورلوو، کیکانلوو، گوران، حەمزەکانلوو، دوانلوو، ریشوانلوو، زیدانلوو و تایفەکانی.

ئـەم عێلانـە لـە عێلـی گـەورەی چەمشـگەزەکن کـە لـە سـاڵی ١٠١١ی کۆچـی بـە فەرمانـی شـا عەبباسـی گـەورە لـە دەشـتی وەرامیـن بـۆ ناوچەکانـی باکـووری خوراسـان راگوێـزراون. ناوەندیی سـەرەکی ئـەم عێلانە لە نزیـك دەریاچەی ورمێ بـووە و عێلـی شـادلوو لە باشـووری قەفقـازەوە بۆ ئازەربایجـان و لەوێوە بـۆ خوار و وەرامیـن و لەوێشـەوە بۆ خوراسـان ڕاگوێـزراون...

ــ *تایفـە کوردەکانی دەرگەز:* عێـل و تایفە کوردەکانی دەرگـەز وەك عێلەکانی قووچـان و شـیروان و بجنـوورد و ... لـە سـەردەمی شـا ئیسـماعیلی یەکەم لە سـاڵی ٩١٦ی کۆچـی ڕاگوێـزراون... بەشـێکی دیکەی عێلە کوردەکان لـە عێلی گەورەی چەمشـگەزەك لـە سـەردەمی دەسـەڵاتدارییەتی شـا عەبباسـی گـەورە لـە سـاڵی ١٠١١ی کۆچـی بـۆ ناوچـە سـنوورییەکانی دەرگـەز ڕاگوێـزراون... و بەرەبـەرە هێندێـك گونـد و ئاواییـان بـۆ نیشـتەجێبوون دروسـت کـردن و هـەر گوندێکیـان بـە نـاوی عێلـی خۆیان نـاو نا وەك شـیخوانلوو لـە ئاوایـی شـیخوانلوو، باچوانلوو لە دێهسـتانی باچوانلـوو، قەراچورلـوو لـە دێهسـتانی باچوانلـوو، زیدانلـوو و مادانلوو لـە زیندانلـوو، کیکانلـوو لـە دەرونگـەر، کەیوانلـوو لـە زەنگەلانلـوو، پالکانلـوو لـە دێهسـتانی باچوانلـوو، قەراجورلـوو و شـادلوو لـە میانکێـوی چاپشـلوو، زەنگەنـە لـە نۆخنـدان، توزانلـوو لـە باچوانلـوو و دولەشـانلوو لـە باچوانلـوون ئۆرتکانلـوو لـە ئۆرتیـان، زەعفەرانلـوو لـە دوتانلـوو، بەریوانلـوو لـە پەسـاکوە، چەگەنـی یـان چەگەنەلـوو لە نۆخندان، سـۆفیانلوو لـە دەرونگەر، تورانلـوو، خاخیانلوو، خەلائلوو یـان خەلکانلـوو، مامیانلـوو، شـانلوو و...

ــ *تایفـە کوردەکانـی کـەلات:* تایفـەی بەریوانلـوو، ئـەردەلان، شـادلوو، بورانلوو، گوە شـانلوو، ترسـانلوو کە هەریەکێکیان لە شـوێنێکی سـەر بـەم ناوچەیە نیشـتەجێن.[٢٠]

خوێنەرانـی بەڕێـز دەتوانـن بـۆ زیاتـر شـارەزابوون لەسـەر عێـل و عەشـیرەتە

کوردەکانی خوراسان لاپەڕەکانی ٤٩ هەتا ١٠١ی کتێبی «ایل ها و طایفەهای عشایری کرد ایران» بخوێننەوە کە بە دوور و درێژی باسی هەموو ئەو عێلانەی کردووە بە تایبەت عێل و تایفە کوردەکانی دەرگەز کە لێرەدا تەنیا ئاماژە بە ناوەکانیان کراوە، لەوێدا بە تێروتەسەلی زۆر بابەتی تری وەك ئاماری چادرنشینەکان و ئاماری ئاژەڵەکانیان و لەوەڕگە و زۆر بابەتی دیکە باسیان کراوە کە لێرەدا ناکرێ ئاوا بە بەربڵاویی باسیان بکرێ.

**• چالاکییە ڕۆشنبیریی و سیاسییەکان**

بۆ ئاگاداربوون لە ڕەوشی سیاسیی و کولتووری کوردەکانی خوراسان لەم بەشەدا بە باشی دەزانین چەند بەشێك لە وتووێژی ڕادیۆ کوردانە لەگەڵ ڕێزدار دوکتۆر ئەفراسیاب شکوفتە دابنێین.

**پرسیار:** بارودۆخی سیاسی، ئابووریی و کولتووری خەڵکی کوردی کرمانج لە ماوەی ژیانیان لە خوراسان بە چ شێوەیەك بووە؟

**وەڵام:** کوردەکانی ناوچەی باکووری خوراسانیش وەك قەوم و نەتەوەکانی تری ئێران لەباری سیاسی، ئابووری و کولتووری هەمیشە سەرکوت کراون و ئەم ڕەوتە هەروا بەردەوامە. بەرپرسەکانی ئاستی سەرەوە دەبێ لە خەڵکی غەیری خەڵکی خۆجێیی بن یان...!!

کوردەکانی خوراسان کە هەمیشە سپەری بەڵا و پارێزەرانی ئێران لەو ناوچەیە بوون، پاداشتیان بێجگە لە هەژاری، چارەڕەشی و سووکایەتیی پێکران شتێکی دیکە نەبووە. دەسەڵاتدارە سەرەڕۆکان لەم ناوچەیە بە چاوی ناوچەیەکی داگیرکراو سەیری دەکەن و کوردەکانی خوراسانیان لە پشکداربوون لە مافی دەسەڵاتداریتیی بێبەش کردووە. کوردەکانی خوراسان هیچ جۆرە ئیمکاناتی ڕاگەیاندنی دەنگی و وێنەییان بە زمانی

زگماکـی نیـە. هیـچ چەشـنە پێداویسـتیەکی ڕۆژنامـەی ناوچەیـی و گۆڤـار و تەلەویزیۆنیـان بـە زمانـی دایکیـی خۆیـان نیـە. ئـەو کوردانـە وەك شـارۆمەندی پلـە چەنـدەم سـەیر دەکرێـن و ڕێـزی زمانـی زگماکیـان ناگیـردرێ. تەمـی هـەژاری و خـۆ بەکـەم زانـی و متمانەبەخۆنەبـوون بـە سـەر لاوانـی کـوردی باکـووری خوراسـاندا بـە تـەواوی دەبینـرێ.

**پرسـیار:** ئایـا دوورکەوتنـەوە لـە نیشـتمانی خۆیـان کاریگەریـی لەسـەر کولتـووری هونـەری و سیاسـیی ئـەوان دانـاوە؟

**وەڵام:** هەتـا ۲۰ ـ ۱۵ سـاڵ لـەوە پێش بـە ئێمەیـان دەگـووت ئێـوە کـورد نیـن بەڵکـوو ئێـوە کرمانجـن و کرمانجـەکان کـورد نیـن. ئێمـە هیـچ شـارەزاییەکمان لە مێـژووی نەتەوایەتیـی خۆمـان نەبـوو. بـەڵام دوای پێشـکەوتنی تەکنۆلۆژیـای ڕاگەیانـدن و بـە هـەوڵ و هیممەتـی خـودی لاوان و خوێنـدکاران، سـەرەنجام تێگەیشـتین چ تاوانێکیـان دەرحـەق بـە ئێمـە و زمانـی زگماکـی و کولتـووری ڕەسـەنی کوردیـمان کـردووە. ئـەم ڕەوتـە ئێسـتاکەش بـە شـێوازی جۆراوجـۆر بەڕێوەدەچـێ. بۆ نموونـە بـە دایـکان و باوکانـی ئێمـە دەڵێـن: «بـە فارسـی لەگەڵ منداڵەکانتـان بدوێـن بـۆ ئـەوەی لـە قوتابخانـە کێشـەیان نەبـێ»و ... کەواتـە دوورکەوتنـەوە لـە خوشـك و براکانمـان لـە نیشـتمانی خۆمـان، کوردسـتان، بـۆ ئێمـە کـەم تێچـوو نەبـووە. بـەڵام لەگـەڵ هەمـوو ئـەم گیروگرفتانەشـدا ئێمـە درێـژە بـە خۆڕاگریـمان لەپێنـاو پاراسـتنی کولتـوور و هونـەری ڕەسـەنی کوردیـی خۆمـان دەدەیـن. داوا لـە خوشـك و براکانمـان لـە کوردسـتان دەکەیـن ئێمـە لەبیـر نەکـەن و یارمەتیـی هاونەتەوەییەکانـی خۆیـان بـدەن.

**پرسـیار:** چ هۆکارێـك بـوو بـە هـۆی ئـەوەی کەمـتر قسـە لەسـەر کـوردی کرمانـج بکـرێ، ئایـا بێجگـە لـە حکوومـەت، ئێمـە و کوردەکانـی نیشـتەجێی کوردسـتانیش ڕۆڵیـان لـە بـاس نەکـران و نەخسـتنەڕووی مـاف و داواکانیـان و

نەگەیاندنی دەنگیان بە گوێی خەڵکی جیهان و دەوڵەتی ئێران نەبووە؟

**وەڵام:** دیارە وەڵامدانەوە بەم پرسیارە ئاسان نیە چونکە خوشك و برا خۆشەویستەکانیشمان لە کوردستان تووشی کێشە و گرفتی زۆرن کە لەم پێناوەدا تێچووی زۆریان داوە و لەم پێوەندییەدا ئێمەی کوردانی خوراسانیش خۆمان بە شەریکی خەم و کێشەکانیان دەزانین. بەڵام دەکرا لانیکەم لەڕێگەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن کە ئەوان هەیانە، سیلە چاوێکیشیان لە ئێمە با و ئاوڕێکیان لێ دابایەوە. بەو هیوایەی ئیمکاناتی ڕاگەیاندنی کوردەکان لە حالەتی پاوانخوازیی ڕێکخراوەکان بێنەدەر و بگەنە ئاستێکی نەتەوەیی.

داوام لە هاونیشتمانە کوردەکانم ئەوەیە کە کوردبوون، مافە نەتەوەییەکانی کورد و کوردایەتیی خۆیان فیدای ئایدۆلۆژییە ڕەنگاوڕەنگەکان نەکەن. ئەم بابەتە تا ئێستا بێجگە لە بەدبەختی و چارەڕەشی شتێکی دیکەی بۆ نەتەوەی کورد بە دیاری نەهێناوە و ....

**پرسیار:** چالاکییە هونەری و سیاسییەکان لە ناوچە کوردنشینەکانی خوراسان لەگەڵ چ کێشەگەلێك بەرەوروویە؟

**وەڵام:** وڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆ هەمووان لە ڕۆژ ئاشکراترە. چالاکییە هونەری و سیاسییەکان وەك ناوچەکانی دیکە بە چاوی ڕەشبینی و پیلان بە دژی دەسەڵات سەیر دەکرێن. ئەوانەی دەست بۆ ئەم چەشنە کارانە دەبەن، بە شێوازی جۆراوجۆر تووشی غەزەبی دەسەڵات دەبنەوە. لەگەڵ هەموو ئەم گرفتانەشدا مۆسیقای کوردی بە شێوەی نەریتی هەر هەیە. بەڵام چالاکییە هونەرییەکانی وەك سینەما، شانۆ و هەر چەشنە چالاکییەکی دیکە کە ببێتە هۆی بەرەوسەربردنی کولتوور و زمانی کورد، ئەنجام نادرێن. لەباری سیاسی و کۆمەڵایەتیش بە پاراستنی شوناسی کوردییەوە

کـەس ناتوانـێ چـالاك بـێ.

**پرســیار:** چ کەســانێك زۆرتریــن کاریگەریــان لــە پێوەندیــی لەگــەڵ پاراســتنی کولتــووری کــوردی لــە خوراســان هەبــووە؟

**وەڵام:** بـە سـەرنجدان بـەوەی زمانـی کـوردی وەك زمانـی فەرمیـی ناوچەیـی نەبووە و ئێستاش نیـە و لەبـاری فێرکاریـی و نووسـین و تەنانـەت گفتوگـۆش بـە تونـدی لەلایـەن دەسـەڵاتدارانەوە ڕێگـری لـێ دەکـرێ، پاراسـتنی کولتـووری کـوردی تـا ئێسـتاش قـەرزداری دایـکان و بـاوکان و پێـش قەرەوڵانـی هونـەری سـوونەتی ئـەم ناوچەیەیـە. بـەڵام لـەم دەیـەی دواییـدا توێـژی لاو و بـە تایبـەت خوێنـدەوار و خوێندکارەکانـی کـورد هاتوونەتـە مەیـدان کـە جێگـەی خۆشـحاڵی و شـانازییە.

**پرسـیار:** ژیانـی دوور لـە نیشـتمانی دایکیـی چ کاریگەرییەکـی ئەرێنـی و نەرێنـی لەسـەر کولتـووری کوردایەتیـی ئێـوەی کرمانـج هەبـووە؟

**وەڵام:** دیـارە کولتـووری ئـەو نەتـەوە جۆراوجۆرانـەی لـە ئێـران دەژیـن، هەمیشـە لەلایـەن دەسـەڵاتدارانەوە زوڵـم و ناحەقـی لێکـراوە. بـەڵام کوردانـی باکـووری خوراسـان لەڕاسـتیدا بێجگـە لـە دەردی دووریـی لـە نیشـتمانی خۆیان، زوڵـم و سـتەمی زۆریـان لـێ کـراوە و لەپاراسـتنی زمـان و کولتـووری کـوردی کێشـە و گرفتـی زۆریـان هەبـووە و تاڵـی و سـاردیی زۆریشـیان چەشـتووە.

**پرسـیار:** ئایـا بیرەوەرییەکـی تایبەتـی یـان بابەتێکـی تایبەتـان لـە ژیـان لـە خوراسـان هەیـە و دەتوانـی بۆمـان بـاس بکـەی؟

**وەڵام:** ئەمـن هـاوڕێ و هاوپۆلـی زۆرم لـە ناوچەکـەدا هـەن کـە هەمیشـە جێگـەی شـانازیی و هانـدەری من بـوون. ڕێوڕەسـمە کوردییەکان و شەوەشـێعری کـوردی کـە لەگـەڵ هاوڕێکانـم هەمانبـوون، یادگاریـی هەمیشـەیین کـە بـۆ هەمیشـە لەگـەڵ منـن. بـەو هیوایـەی بتوانـم بگەڕێمـە لایـان و لـە خزمـەت

کــوردە بەڕێزەکانــی خوراســان و خەڵکــی گــەورە و بەڕێــزی ئێرانــدا بــم.

**ـ ئەگەر بابەتێکی تایبەتتان هەیە بفەرموون؟**

**وەڵام:** زۆر سپاســتان دەکــەم. ئەرکــی ڕاگەیەنــە گشــتییەکان زۆر گرنگــە. بەڕێوەبەرانــی ئــەم پیشــە و بــە تایبــەت ڕادیــۆ کوردانــە لەڕاســتیدا دەنگــی خەڵکــی زوڵــم لێکــراو و زەحمەتکێشــن. ســەرکەوتوو بــن.[٢١]

(دوکتــۆر ئەفراســیاب شــکوفتە ســاڵی ١٩٦٦ی زایینــی لــە کێوەکانــی دەوروبــەری قوچــان و لــە داوێنــی سروشــتدا لــە بنەماڵەیەکــی مامناوەنــدی لــە عێلــی کاوانلوویــی لــە کوردەکانــی باکــووری خوراســان لەدایــك بــووە. بڕوانامــەی دیپلۆمــی لــە شــاری شــیروان و دوکتــۆرای لــە زانکــۆی تــاران بەدەســت هێنــاوە. ماوەیــەك لــە ئێــران کاری کــردووە. ســاڵی ١٩٩٩ ڕێگــەی هەندەرانــی گرتۆتەبــەر و لــە وڵاتــی ئینگلســتان (بریتانیــا) ـ لەنــدەن ـ نیشــتەجێ بــووە. لەوێــش خوێندنــی لــە زانســتی تاقیگــەی پزیشــکی (طبــی) درێــژە پێــداوە. لــە ســەردەمی خوێندکارییــەوە تێکــەڵاوی چالاکیــی کــوردی بــووە و یەکێــك لــە دامەزرێنەرانــی ڕێکخــراوی کرمانجــی خەڵکــی خوراســانە کــە بنکــەی ســەرەکی لــە شــاری لەنــدەی پایتەختــی بریتانیایــە).

خوێنەرانی خۆشەویست دەتوانن بۆ ئاگاداربوون لە هێندێك بابەتی پێوەندیدار بە ڕەوشی سیاسی و کولتووریی کوردەکانی خوراسان دیمانەیەکی ماڵپەڕی ڕووداو لەگەڵ ڕێزدار ئەفراسیاب شکوفتە لەژێر سەردێڕی «کوردی خوراسان ٤٠٠ ساڵە لە هەناوی فارسەکاندا نەگۆڕاون» لە ماڵپەڕی ڕووداو بخوێننەوە کە زۆر بابەتی بەپێزی لەم پێوەندییەدا لەخۆ گرتووە. ناونیشانی ئەم بابەتە لە ماڵپەڕی ڕووداو: (rudaw.net/sorani/kurdistan/190920131)

هــەر ســەبارەت بــە ڕەوشــی سیاســی و کۆمەڵایەتــی کوردەکانــی خوراســان

بەڕێز ئاریز ئەندەریاری، نووسەر و لێکۆڵەر کە خۆشی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی سیاسی و جوغرافی و مێژووییە لەسەر کوردەکانی خوراسان، لەم پێوەندییەدا بەم شێوەیە باسی کردووە:

«نەبوونی یەکڕیزیی سیاسی و ڕێکخستنێکی بەهێز و، نەبوونی پارت و پێکهاتە سیاسیە ڕێکخراوەکان، هۆکارێك بووە بۆ ئەوەی حەشیمەتی گەورەی کوردەکانی خوراسان، وەك خەڵکێکی بێپەنا و پشتیوان بمێننەوە و نەتوانن خواستە کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسییەکانیان دەستەبەر بکەن...

کوردەکانی خوراسان وەك کوردەکانی تر، هەر لە سەرەتای کۆچ پێکردنیان بۆ خوراسان، ئەگەرچی کەموکوڕیشی تێدا بووە، نارەزایەتی خۆیان لە بەرانبەر سیستەمی دەسەڵاتداری ناوەندی دەربڕیوە و داکۆکیان لەسەر مافەکانیان کردووە. هەربۆیە لێرەدا پێویستە ئاماژەیەك بە سەرهەڵدان و ململانێیەکانی کوردان لەو هەرێمە بکەین. کوردەکانی خوراسان لە سەدەی ١٩دا لە هەرێمی قوچان لەدژی فەتحعەلیشای قاجار دەستیان دایە شۆڕش. دواتر خەدوو سەردار یەکەمین هەنگاوی بۆ پێکهێنانی حکومەتی کۆمۆنیستی بۆ سەربەخۆیی کوردەکانی خوراسان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەڵهێناوە. لە ساڵی ١٩٤٨ دا فەرەجوڵلاخانی بیچرانلوو خانی عەشیرەتی بیچرانلوو، بە ڕاگەیاندنی خودموختاری لە هەرێمی سەرحەدی شیروان، هەوڵی دا بۆ ئەوەی کوردەکانی خوراسان خودموختار بن. بەڵام بەهۆی یارمەتی نەدانی هاوپەیمانانی، لە داگیرکردنی شاری مەشهەد و ناوەندی خوراسان، فەرەجوڵلاخان پاشەکشێی کرد و دووایی لەلایەن سیستەمی دەسەڵاتداری ناوەندی، ئەم سەرکردە کوردە دەرمان داو کرا و شۆڕشەکەی هەرەسی هێنا.

لە بەردەوامی خەباتی چەکدارانەی کوردەکانی خوراسان لە ساڵی ١٩٧٩دا، چریکەکانی ڕێکخراوی «ئەسپ تازان» بەسەرۆکایەتی نەسروڵلا بەهادورانی،

پاسگای ئامانلوویـان لە شـاری شـیروان داگیر کـرد بەڵام دیسـانەوە مێـژوو دووبارە بـووەوە و سـەرۆکی ئـەو جووڵانەوەیـە دەرمانـداو کـرا و ژیانی لەدەسـت دا.

سـەرەڕای ئـەوەی لـە سـەدەی ڕابـردوودا ژیانـی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت پێشـکەوتنێکی هەمەلایەنـەی بەخـۆوە بینیـوە بـەڵام لـەو ماوەیـەدا، دەسـەڵاتی ناوەنـدی بـە پەیڕەوکردنـی سیاسـەتی «دەوڵـەت ـ نەتـەوە» کاریگەرییەکـی نەرێنـی کردوەتـە سـەر کوردەکانـی خوراسـان. هەرچەنـدە لـە سـاڵی ١٩٥٩دا ڕادیـۆ کـوردی لـە مەشـهەد دامـەزرا، بـەڵام دەتوانیـن ڕاشـکاوانە بڵێیـن نەیـا کردنـەوەی ڕادیۆیـەك نـەس نەبـوو بـۆ ئـەوەی خواسـتە کۆمەڵایەتـی، کولتـووری و سیاسـییەکان بـەراود بـکات، بەڵکـو کردنـەوەی ئـەو ڕادیۆیـە بـە جۆرێـك بـۆ پێشخسـتنی سیاسـەتەکانی دەسـەڵاتی ناوەنـدی بـوو.

... سـەرەڕای هەمـووی ئەمانـە، کوردەکانـی خوراسـان دەسـتبەرداری شـوناس، کولتـوور و زمانـی خۆیـان نەبـوون، لـە دەیـەی ٩٠ی زایینـی بەمـلاوە بەهـۆی پێشـکەوتنەکان لـە بـواری ڕاگەیاندنـدا کوردەکانـی خوراسـان سـەرەڕای هەمـوو قەدەغەکارییـەکان و ئاستەنگییەکان دەستیان دایـە خەباتێکـی بەرفراوانی مەدەنی و لـەو چوارچێوەیـەدا چەندیـن ناوەنـد، ماڵپـەر، ڕێکخـراوی کۆمەڵایەتـی و مەدەنـی دامـەزران کـە کاریگەرییەکـی فراوانـی هەبـوو لـە بەرانبـەر ئـەو ڕەوتـی پاکتاوکردنیـان ...[٢٢]

## • زمان، ئایین و داب‌ونەریتی کوردەکانی خوراسان

کوردەکانـی خوراسـان بەشـێك لـە حەشـیمەتی کـوردی ئێرانـن کـە لـە ناوچـەی باکـووری خوراسـانی گـەورەدا بـڵاو بوونـەوە کـە ئـەم ناوچەیـە بـە کوردخانـە نـاسراوە. زمانـی خەڵکـی ئـەم ناوچەیـە کوردیـی کرمانجییـە. ئایینەکەیـان ئیسـلامە و کوردەکانـی خوراسـان موسـوڵمانی شـیعە مەزهەبـن.

ئەگەرچی لە ڕابردوودا سووننە مەزهەب بوون بەڵام بە تێپەڕینی ڕۆژگار و بە تایبەت لەژێر فشاری دەوڵەتی سەفەویدا، ڕوویان لە مەزهەبی شیعە کردووە. فەرهەنگی کوردەکانی خوراسان بە جیاوازیگەلێکی کەمەوە هاوشێوەی کولتووری کوردیی خەڵکی کوردستانە.[٢٣]

جلوبەرگی ژنی کرمانج هەندێك تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆی هەن کە جۆری قوماش، جوانکارییەکان، نێوەکان و شێوازی ڕەنگەکانی لەم تایبەتمەندییانەن. بەرگی ژنانی کرمانجی خوراسانی باکوور لە کەراس و شەڵوار و کۆڵە یان کۆڵوانە پێك هاتووە. کەراس و شەڵوارەکە دوو بەشی سەرەکی ئەم جلوبەرگە پێك دێنن. کەراسەکە پارچەیەکی سادەیە و یەخەی تایبەتی نیە، کۆڵوانە (عەباکەیان) لە قوماشێکی مەخمەر دروست دەکرێ کە لەسەر کەراسەکە دەبەری دەکەن. بۆ ئەمە لە قوماشێکی مەخمەری بە ڕەنگی توند و گەرمی وەك سوور و سەوز و بنەوشی کەڵك وەردەگرن. ئەم جلوبەرگە بە دراو دەڕازێنرێتەوە کە لە کاتی ڕێ ڕۆیشتندا دەنگێکی خۆشیان لێوە دێ...ژنی کرمانج بۆ داپۆشینی سەری لە لەچکە و شاڵێکی تایبەت کەڵك وەردەگرێ کە سەر و چاوی دادەپۆشێ.[٢٤]

وەك دەڵێن ئەم شێوازی بەرگ پۆشینە ڕەسەنە، ئەمڕۆکە تەنیا ژنە بەتەمەنەکان زیاتر کەڵکی لێ وەردەگرن یان لە کۆڕ و بۆنەی خۆشیی و ئاهەنگ گێڕاندا ئەم جلوبەرگە دەبەر دەکرێ.

عەلی خوراسانی لە وتووێژ لەگەڵ گۆڤاری «ئاواشین» چاپی ئەنستیتۆی کوردیی سوئێد « زەماوەندی نەریتی و مۆسیقای کوردی بە هۆکاری مانەوە و بەردەوامیی کولتووری کوردەکانی باکووری خوراسان دەزانێ. بێجگە لە پاراستنی زمان، هەندێك ڕەسەنایەتیی کولتوورییش پارێزراون و ئەم ڕەسەنایەتیی کوردییە کە ڕیشەی لە کۆنیی و هاوبەشیی بیروباوەڕەکاندا هەیە، لە زەماوەند و بوك گواستنەوەدا زیاتر دەردەکەوێ و لێرەدایە کە کوردەکان حەزیان لە زەماوەندە و ڕێزی لێ دەنێن و

زۆجار زەماوەندی کوردی سێ شەو و ڕۆژی خایاندووە کە ئەمڕۆکە بۆ ٢٤ کاتژمێر کەم بۆتەوە. لێرەدا بە کورتی باس لە داب‌ونەریتی کوردەکانی خوراسان لە کاتی زەماوەند و شیرینی خواردندا دەکەین:

## ● ڕێوڕەسمی خوازبێنی و شیرینی خواردن

ژیانی عێلایەتی و عەشیرەتی و سووڕانەوە لە داوێنی سروشت و هاوڕازی کێو و چۆم بوون چێژێکی تایبەتی بە ژیانی کوردەکانی ئەم مەڵبەندە بەخشیوە و بۆتە هۆی ئەوەی دوو لاوی کورد ئاشقانە یەکتریان خۆش بوێ. پێکهێنانی ژیانی هاوبەش زیاتر لەنێو عەشیرەت و هۆزدا بووە و لاوی کورد بە زمانی بێزمانی لە مووچە و مەزرا، لە پەنا ئاوهەڵدێر و سەرچاوەیەکی زوڵاڵ، لە ڕێگە خوار و خێچەکانی کوێستان، جاری وایە لە کاتی خێڵ بەرەوژووردا یان لە کاتی خێڵ بەرەوژێردا، بە بزەیەك یان پێکەنینێك و جاری وایە بە ڕوانینێك، گراوییەکەی لە عەشقی خۆی ئاگادار کردووە و لە دڵی شەیدای خۆی تێگەیاندووە، بەڵام حەیا و حورمەتی عێلایەتی لەوە زیاتر ڕێگەیان نەداوە. ئەوکات کە ژیانیشی دەست پێدەکرد، عەشق بە یاری وەك گرێکی بەنرخ لە دڵ و دەروونی خۆیدا ڕادەگرت. هەر لەبەر ئەم خۆشەویستییەیە کە لەنێو کوردەکانی خوراساندا کەمتر چاومان بە گۆرانی، پەند و ... دەکەوێ کە واتای تەڵاق و جیابوونەوە بەدەستەوە بدات.

### *ئا ـ خوازبێنی*

کیژ و کوڕ پێشتر یەکتریان بینیوە، بێ ئەوەی هیچ بڵێن ئاشقی یەکتر بوون، ئەوینێکی پاك و بێگەرد لە دڵی هەردووکیاندا گڕی گرتووە. لەوانەیە لێڕوانینێك یان بزەیەك چەشنێك بەڵێ بووبێ. کەوایە لاوەکە بۆخۆی، یان لەڕێگەی هاوڕێ و دۆستان یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی پەیامەکەی گەیاندووە. بنەماڵەش دوای وتوویژ و

ڕاوێژ ژنەکانیان بۆ لای ماڵی کیژەکە دەنێرن. ژنەکان لە نزیکانی داواکارەکە بوون، ئەگەر هەڵسوکەوت و جوانیی و چاکیی کچەکەیان پەسند کردبوایە، ئەوا بە هێما و ئاماژە و کینایە داواکارییەکەیان دەردەبڕن.

بنەماڵەی کچەکەش دوای باس و ڕاوێژ، ئەگەر ڕازی بن، ماڵی کوڕەکە ئاگادار دەکەنەوە. تا ئێستا ژنەکان ڕۆڵگێڕ بوون. ژنەکان بە ئاسانی دەتوانن لە قسەی مناڵەکانیان تێبگەن. ئێستا پیاوەکان وەك بڕیاردەری کۆتایی دێنە مەیدانەوە.

لە خوازبێنی فەرمیدا بنەماڵەی کچەکە ژەمە خواردنێك ڕێك دەخەن و هەندێك لە نزیکانی کچەکەش بانگهێشت دەکرێن. باوەگەورە، مام، خاڵ و ... لەپێشەوەن. دوای ئەمە لەلایەن کوڕەکەشەوە کەسوکاری نزیکی بانگ دەکرێن و قسە وباسی نێوان دوو لایەن دەست پێدەکا.

سەرەتا گەورەکان بابەتی خوازبێنی دێننە گۆڕێ و یەکێك لە گەورەکانی لایەنی کچەکەش وڵامی ئەرێنی دەداتەوە و دواتر باس لە وردەکارییەکان دەکرێ. کڕینی جیاز و کەلوپەلی پێویست لەو بابەتانەیە کە قسەی لەسەر دەکرێ. دوای دیاریکردنی مارەیی و ڕێکخستنی جۆری جیاز و بارگە و بنە، دوو لایەنەکە دەچنە شار و ئەگەر لە گوند یان لەنێو عێلەکە مەلای لێ نەبێ، هەر لە شار مارە دەکرێ.

لەلایەن زاواوەوە بۆ کەسانی نزیکی بووك وەك برا، خاڵ، خوشکەکانی و ... دیارییەك دەکرێ، ئەم دیارییە جووتە کەوشێکە یان لەچکەیەك یان کراسێك و ....

### ب ـ شیرینی خواردن

دوای ئەمە دەبێ بواری ڕێوڕەسمی شیرینی خواردنەوە ئامادە بکرێ دەبێ ئەم هەواڵە خۆشە بە گوێی هەمووان بگات. هەرچەند بە قەولی سۆهرابی سێپەهری « خونچەیەك دەپشکوێ خەڵکی دێ ئاگادارن». گەیاندنی هەواڵ بە خەڵکی

ئاواییەکانی تر کە زۆرجار پێوەندییەکیان پێکەوە هەیە، بە هەواڵنێرێك جێبەجێ دەکرێ. لە گوند یان لەنێو عێلیش لەنێو دەفرێك کە دەتوانرێ سینییەك یان دەفرێکی پڕ لە شیرینی بێ، قوماشێکی سووری بەسەردا دەدرێ.

بە دەنگی دەرگەی هەر ماڵێك ئەندامانی ئەو ماڵە بۆ بەشداریی لە ڕێوڕەسمێ شیرینی خواردن (شەکراو خواردنەوە) بانگهێشت دەکرێن. لەم ڕێوڕەسمەدا زیاتر خێزانی کچەکە خانەخوێی سەرەکین بەڵام کەسوکاریش دەچنە ماڵی زاوا. لەوێش گۆڤەند و دەهۆڵ و زوڕنا و هەڵپەڕکێ لەگۆڕێیە. دوای ئەوەی میوانانی زەماوەند گەیشتن و هەڵپەڕکێی جوانی کوردان دەستی پێکرد. بنەماڵەی زاوا لەگەڵ خزمەکانیان بەرەو ماڵی بووك وەڕێ دەکەون.

هەڵپەڕکێ لە ڕێگەدا تا گەیشتن بە ماڵی بووك لە پێش خەڵکدا بە گۆرانی گوتنی هونەرمەندان هەروا بەردەوام دەبێ. هونەرمەندانی خۆماڵی، چەپڵەلێدانی بەردەوام، ژنەکان جل‌وبەرگی ڕەسەنی کوردییان لەبەر دەکەن و شکۆ و جوانییەکی تایبەتی بە زەماوەند دەبەخشن. ژنەکان مەجومعە(سینی)یەکی گەورە لەسەر سەر دادەنێن کە کەللە قەند، برینج و ... لەسەر دادەنرێ و بە قوماشێکی سەوز و نارنجی و زەرد دەڕازێنرێتەوە. ژنەکان لە ڕیز و سەفی جوان و ڕێکوپێك دا بەرەو ماڵی بووك وەڕێ دەکەون.

کەسوکاری کچەکەش لەبەر ڕێزی میوانەکانیان بە پێشوازییانەوە دەچن. جاری وایە مەڕێکیشیان لەبەرپێدا دەکەنە قوربانی. ئەوجار هەموویان بەرەو ماڵی بووك وەرێدەکەون. ژنێك مەقەڵییەکی بەدەستەوە گرتووە و ئەسپەندەر دەسووتێنێ، ئەمە جوانییەکی تایبەتی بە ڕێوڕەسمەکە دەبەخشێ. میوانەکان بە پیرۆزبایی گوتن بە دایك و باوکی بووکەکە دەچنە ژووری ماڵی بووك. گۆرانیبێژانش بۆ ڕێزگرتن لە میوانەکانی زاوا بەپیریانەوە دێن و بەرزکردنەوەی دەنگی دەهۆڵ واتە میوانێکی تازە هات و پاداشتێکی لێ وەردەگرن. ئێستا هەموویان لە ماڵی بووك کۆ بوونەوە و بە چایی و

شیرینی پێشوازییان لێ دەکرێ. دوای ئەوە خۆشیی و هەڵپەڕکێ دەست پێدەکات. ژنەکان بە جلوبەرگی ئاڵووالای کوردی جاری وایە لەگەڵ پیاوەکان و جاری واشە بە جودا دەست تێکدەگرن و هەڵدەپەڕن. هەڵپەڕکێیەك کە تەنیا جووڵەی دەست و پێیە بەبێ هیچ جۆرە جووڵەیەکی ناپەسند و ناجوان.

### ***پ ـ شیربایی (قەلەند)***

قەلەند یان شیربایی پێشتر باو بوو و ئێستاکە زۆر بە دەگمەن هەیە. هەرچەند کەسانێك بە شتێکی ناجوان و ناپەسندی دەزانن. بەڵام ئەم ڕەسمە لە کولتووری ئەواندا پێشینەیەکی هەیە. «کریستین سێن» ئەم ڕەسمەی زۆر بە کۆن زانیوە و دەنووسێ: « (لە سەردەمی ساسانییەکان) لاوێك کە دەیویست هاوسەرگیریی بکا دەبووایە بڕێك پووڵ یان زێو یان شتێکی دیکە پێشکەشی دایك و باوکی بووك بکات.» پووڵێك کە وەك شیربایی وەردەگیرا، بۆ کڕینی جیاز و جلوبەرگی زاوایی خەرج دەکرا.

سەرەنجام لە شەوی شیرینی خواردنەوەدا ڕیش سپی و گەورەپیاوان، ئەو مەجومعەیەی پارچە سوورەکەی بەسەردا دراوە، پارچەکەی لەسەر لادەدرێ و دەسماڵی ئاوریشمییان دەکردەوە و ئەو بڕە پارەیەی وەك شیربایی بە بنەماڵەی کچەکە دراوە، دەیانژمارد و دواتر دەیاندایە باوکی بووك. باوکی بووکیش بڕێکی پێدەدانەوە بۆ ئەوەی چاکەیەکی لەگەڵ زاواکەی کردبێ.

دوکتۆر محەمەدحوسێن پاپلی لەم بارەوە دەنووسێ: «لە ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی لەنێو کۆچەرانی خوراساندا ئەو بڕەپارەیەی کە بۆ هاوسەرگیریی کچێك لە کوڕێك وەردەگیرا، ٤٥٠٠٠٠ قڕان بوو کە بێجگە لەمە، کوڕەکە دبووایە چەند سەر ئاژەڵیشی بە دیاری دابایە و خەرجی و تێچووی زەماوەندیشی لەسەرشان بووایە.»

لە گۆرانییەکانی کوردەکانی خوراسانیش ئاماژە بە بابەتی شیربایی کراوە:

**سەری مەیان دەکشینم/ خەوی لە خوە دەگەرینم/ قەلەندێ تە وەهەف گینم.**
**(واتە ئەوساری وشتران دەکێشم/ خەو لە چاوانم دەزڕێنم/ بۆ ئەوەی**
**شیربابیەکەت دابین بکەم).**

دوای ژماردنی شیربایی، دوو کەس لە گەورەپیاوانی لایەنی بووك و زاوا لە سەرەوەی خەڵك دادەنیشتن و دوای ناردنی سەڵەوات بۆ سەر محەمەد (د.خ) و یارانی، یەکێك لەوان کە بەتەمەنتر و بە ئەزموونتر بوو، دوو کەللە قەندی بەدەستەوە دەگرت و بە شیوەیەك لێکی دەدان کە دوو سەری کەللە قەند دەشکان و لە شوێنێکی گونجاو بەرامبەردا لێك جیا دەبوونەوە.

بە شکاندنی کەللە قەندەکان چەپڵەلێدان و شادیی و هەلهەلە درێژەی دەکێشا. یەکەمین کاری دوای ئەمە لەت لەتکردنی کەللە قەندەکان بوو کە لەتکە گەورەکانیان لەنێو میوانەکان دابەش دەکرد و لەتکە گەورەکەیان بە زاوا دەدا. سەری کەللە قەندەکانیشیان بە بنەماڵەی بووك و زاوا دەدا بۆ ئەوەی وەك یادگاریی هەڵیگرن و شیرینی و تامی ئەو شەوەیان هەمیشە لەیاد بێ.

***ت ـ خەنەبەندان***

یەکێك لە دیمەنە جوانەکانی شیرینی خواردن خەنەبەندانە. لەو کاتەدا خەنە زیاتر لە ماڵی زاوا ئامادە دەکرێ و لەگەڵ دیارییەکانی دیکە بۆ ماڵی بووك دەبردرێ. خزم و کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی بووك و زاوا لە دەوریان کۆ دەبنەوە. لە شەوی خەنەبەنداندا جموجۆڵی زۆر لە ماڵی بووك بەرچاو دەکەوێ. کیژان و ژنانی بەشدار لەم ڕێوڕەسمەدا بە شێوەی بازنەیی لە دەوری یەکتر هەڵدەسووڕێن و بە ئاواز و گۆرانی خۆشییەکی تایبەت بەو شەوە دەبەخشن. لەو شەوەدا خەنەی زۆر ئامادە دەکرێ و بەشێکی لە دەست و پێی بووك دەدەن

و ئـەوەی تـر لەنێـو میوانانـدا دابـەش دەکەن.

سـەرەنجام بـە ئیـزن وەرگرتـن لـە گـەورەکان، کاری خەنەبەندانـی دەسـتی بـووك و زاوا دەسـت پێـدەکا. زیاتر دەستەخوشـك دەسـتی بـووك و دەسـتەبرا یان براکـە، دەسـتی زاوا لـە خەنـە دەدەن. لـە هەندێـك ناوچـەدا دوای دەسـپێکردنی خەنەبەندان بووك دەسـتی ڕاسـتی خۆی لە حاڵێکدا کە شـاڵێکی سـووری بەسـەر سـەری داداوە، لەسـەر سـەر دادەنـێ و ئامادەبووان بـە تایبەت ژنانـی بنەماڵەی زاوا هەرکامیـان دیارییەکـی لەدەسـت دەنێـن. پێشـتر زیاتـر دراوی زێـر و زیـو بـووە.

لـە هەندێـك ناوچـەش بـووك دوو دەسـتی لەسـەر سـەری دادەنـا و دواتـر کەمێـك خەنـە کـە پێشـتر ئامادەکرابـوو، لـە نـاو لەپـی دەسـتی بـووك دادەنـرا و ئەرکـی دەسـتەبرای زاوا ئـەوە بـوو خەنەکـە لـە دەسـتی بـووك هەڵگـرێ و لەجێی ئـەوە پـارەی لەجـێ دابنـێ. ئـەم کارە سـێ جار دووپـات دەکرایـەوە. ئەگـەر براکە پـارەی لەنـاو دەسـتی بـووك دانەنابایـە، بـووك دەسـتەکانی توونـد پێکەوەدەنـا و نەیدەهێشـت براکـەی زاوا خەنەکـە هەڵبگـرێ.

ڕێوڕەسـم بـە گۆرانی گوتنـی ژنان درێژە دەکێشـێ و دوای ئەمە بـووك و زاوا بە فەرمـی مارەکـراوی یەکترن.

### د ـ قۆناغی دەزگیرانداری

ئێسـتا بـووك و زاوا بێ‌تـرس لـە عێـل و خەڵکـی ئاوایـی قسـە لەگـەڵ یەکـتر دەکـەن. دوای ئەمـە بنەماڵـەی زاوا بنەماڵـەی بـووك دەعـوەت دەکەن. بـووك وەك ڕێزدانانێـك دەموچـاوی خـۆی دادەپۆشـێ. چارشـێوێك کـە زیاتر ڕەنگی سـپییە و زاوا بـۆی کڕیـوە، تـا ئـەو جێگەیـە دایدەکێشـێ کە دەموچـاوی نەبیـنرێ. بووك تەنانـەت زۆرجـار هەتـا چەنـد مانـگ قسـە لەگـەڵ بـاوك و بـرا و تەنانـەت دایکی زاوا نـاکات و زۆر بـە کەمـی قسـە لەگـەڵ نزیکانـی ئـەو دەکات.

لە کۆندا هەرکات بووك، چاوی بە بنەماڵەی زاوا دەکەوت هەوڵی دەدا ڕووبەڕوویان نەبێتەوە و ئەگە پرسیارێکی لێ کرابایە تێدەکۆشا بە ئیما و ئیشارە وڵام بداتەوە. ئەم نەریتە بە چەشنێك ڕێزدانان لەقەڵەم دەدرا. باشیی کارەکە لەوەدا بوو کە تا ماوەیەك شەرەقسە, قسەهێنان و بردن و ... بە لانیکەمی خۆی دەگەیشت و بووك هەروا جێگەی ڕێز و حورمەت بوو.

ئەگەر بنەماڵە دەیانەویست کە بووك لەگەڵیان بکەوێتە قسە و باسەوە و ڕووی خۆیان لێ دانەپۆشێ, دەبووایە دیارییەکیان بە بووك دابایە. ئەم نەریتە ئەمڕۆ لە هەندێك لە گوندەکان باوە و بووك تەنانەت دوای ڕێوڕەسمی زەماوەند و چوون بۆ ماڵی مێرد، قسە لەگەڵ باوکی زاوا ناکات و دەموچاوی خۆی پێنیشان نادات.

•••

● ڕێوڕەسمی زەماوەند و بووك گواستنەوە

بە تێپەڕبوونی قۆناغی دەزگیرانداری، هەڵگرتنەوەی بەروبوم، گەڕانەوەی عێل لە گەرمێن و جاری وایە کوێستان، ئەغڵەب باشترین کات بۆ زەماوەندی کوردانە. پێش ئەوەی زەماوەندەکەی بە فەرمی دەست پێبکا، زاوا جیاز و بارگەوبنەی کڕیوە. بنەماڵەی کچەکەش بە دروستکردنی دۆشەك و جاجمە و فەرش و ... دیاری و جیازیان بۆ کچەکەیان ئامادە کردووە. هەتا بەڕێوەچوونی زەماوەند شتێکی ئەوتۆ نەماوە. لە ڕێوڕەسمێکی کورتدا کەسوکاری زاوا کۆ دەبنەوە و دوای خواردنی نانی شەو کارەکان دابەش دەکرێن و گرووپێك لە لاوان سبەی ئەو ڕۆژە بۆ هێنانی دار بۆ زەماوەند دەست بەکار دەبن.

هەر کەسە و هەر تاقمەی کارێك دەکا، خەبەرەکە دەگەیەنن،

کەلوپەلـی چێشـت لێنـان ئامـادە دەکـەن و ... زەماوەنـدە زۆربـەی کاتـەکان شـەو و ڕۆژێـك دەخایەنـێ لـە ئێـوارەوە دەسـت پێـدەکا و تـا ئێـوارەی ڕۆژی دوایـی درێـژە دەکێشـێ و بـەزم و ڕەزم هـەروا دڵـی خەڵـك خـۆش دەکا و غـەم بارگـە و بنـەی تێـك دەنـێ...

**ئێستا بەرنامەکانی زەماوەند:**

*- مۆسیقاژەنینی (مۆسیقاژەنەکان) ئاشقەکان*

دەنگـی زورنـا و دەهـۆڵ شـنەبایەکی دڵ بزوینـە کـە لـە دەشـتی پـان و بەرینـی دڵـی کوردەکانـدا دەشـنێتەوە. ئـاوازی زورنـا و دەهـۆڵ تێکـەڵاوی ترپـە و لێدانـی دڵـەکان دەبـێ. شـادی، پێکەنیـن، خۆشـحاڵی و .. واتـە وادیـارە زەماوەنـدە. بـە بیسـتنی دەنگـی مۆسـیقا ژن و پیـاو، پیـر و لاو کـۆ دەبنـەوە. میوانەکانـی ڕێگـەی دوور و نزیـك دەگەنەجـێ. خانەخوێیـەکان بەپیریانـەوە دەچـن. مۆسـیقاژەنەکانیش بـە دەهـۆڵ و زورنـاوە پێشـوازی لـە میوانـەکان دەکـەن. لـە هەمـوو لایەکـەوە بۆنـی ئەسـپەندەر دێـت. ئێسـتا خەڵـك کـۆ بوونەتـەوە، دەرزی هەڵاوێـی وەزەوی ناکەوێـت. ژنـان بـە جل‌ءبەرکـی ئـاڵ و واڵای کوردییـەوە، هـەر دەڵێـی بەهـار و گەڵاڕێزانـە. پیرپیـاوان خەریکـی خۆبـادان و هەڵپەڕینـن، هەڵپەڕکێیەکـی تایبـەت کـە بەڕاسـتی لێیـان جوانـە و ... دواتـر نـۆرە نـۆرەی لاوەکانـە، هەڵپەڕینەکـە ئەمجـارە توندتـر و خێراتـرە، گـوڕ و تینـی زیاتـری تێـدا بـەدی دەکرێـت. دواتـر هەڵپەڕکێی ژنـان، هەڵپەڕکێـی ئـەوان بەپێچەوانـەی هـی پیـاوەکان زۆر قورسـە.

جووڵـەی هاوئاهەنـگ و ڕێکوپێـك بـە جلوبەرگـی کوردییـەوە، شـکۆ و هەیبەتێکـی جـوان، بـە شـێوەی بازنەیـی، بەڕاسـتی هـەر خۆشـە لێـی بڕوانـی.

جاروباریــش ژن و پیــاو پێکــەو هەڵدەپــەڕن. تازەبووکــەکان ڕووپۆشــێکی ســوور بەســەر ســەر و ڕوخســاریان دادەدەن بــۆ ئــەوەی لاوە ســەڵتەکان بیانناسـن، و ئـەو سـەڵتانەش (لاوە بێژنـەکان) لەوانەیـە لـەو کچانـەی کـە لچـەك و پارچــەی ســپییان بەســەر داداوە، ئەوینــی خۆیــان بدۆزنــەوە.

**ـ ئامادەبوونی زاوا**

زاوا میوانـی «براکە»یـە. دوای خۆجوانکـردن جلوبەرگـی زاوایەتـی دەبـەر دەکات. ژمارەیـەك لـە لاوان بـەدوای زاوادا دەچـن. زاوا و براکـە لـە پەنـا یەکتر لەنێو خۆشـحاڵیی لاوەکان لە زەماوەندەکە نزیك دەبنەوە. مۆسـقاژەنەکان بەپیـر زاواوەوە دەچن. ئەویش دەبێ شاباشـیان پێبدا. ئێسـتا هەمـوو چاوەڕوانـی زاوان. زاوا دەگاتە مەیدانەکـە. چاکـی و چۆنـی لەگـەڵ میوانـەکان دەکات و ماچیـان دەکات. دوای ئەمـە یاڵـڵا بـۆ نێـو هەڵپەڕکـێ. هاوڕێانـی زاوا هەڵپەڕکـێ دەسـت پێدەکـەن. لـە هـەرلاوە شاباشـی بـۆ دەدەن کـە بەڕاسـتی شـەوێکە و لەبیـر ناکـرێ.

لـەم شـەوەدا دایـك و بـاوك و خوشـك و براکانـی زاوا پێکـەوە هەڵدەپـەڕن و هەرکەسـە و بـە جۆرێـك شـاباش دەدات. پیـاوان بـە جۆرێـك و ژنان بە شـێوەیەك.

سـەرەنجام دوای چەند ڕێوڕەسـمی دیکـەی وەك تورە و بردنـی جلوبەرگەکانی بـووك و خەنەبەنـدان و زۆرانبـازی و ... نـۆرە دەگاتـە بووك هێنان و گەیشـتنی بووك بە ماڵی زاوا.

جوانتریـن بەشـی زەماوەنـد لەوانەیـە ئـەم بەشـە بـێ واتـە هێنانـی بووك لـە ماڵی باوکـی ڕا بـۆ ماڵـی زاوا. زیاتـر لـە دەوروبـەری نیـوەڕۆ و دوای هەڵپەڕکـێ و زۆرانبـازی بـۆ بـووك هێنـان دەچـن. زاوا لەسـەر پشـتی ئەسـپ لەگـەل ژمارەیەك لە لاوان دەسـت بـە ڕمبازێن دەکەن. خەڵکیش بەرەو لای ماڵی بـووك وەڕێ دەکەون. لەلایـەك ڕەخسـین و خۆبادانـی ژن و پیـاوان لەپێـش میوانـان و لەلایەکیـش بەزم و

ڕەزمـی گۆرانیبێـژ و هونەرمەنـدان.

بـوك ڕازاوەتـەوە، جلوبەرگـی کوردی لەبەرە و تارایەکی سـووری لەسـەرە. دەبێ ماڵـی باوکـی جێبێڵـێ. لە کاتی بردنـی بووکدا ڕەسـم وایە کە هاوڕێیانی زاوا شـتێك لـە ماڵـی بـووك هەڵدەگـرن کـە لەوانەیـە لیـوان، کەوچـك و ... بـێ ( ئـەم نەریتـە لەهەندێـك ناوچـەی ئێـران بـۆ وێنـە لەنێـو خەڵکـی پارێـزگای فارسیشـدا بـاوە). پێـش بردنـی بـووك زۆرجـار باوك یـان براکە دەسـماڵێك کە نـان و پەنیـری تێنراوە، لـە کەمـەری بووکـی دەبەسـتن. عەبدوڵڵا مسـتەوفی پێی وایـە: لەبەر ئـەوەی بووك تـازە گەیشـتۆتەجێ و بـە کـون و کەلەبەرەکانـی مـاڵ نازانـێ کەوایـە باشـترە یەکـەم خواردنـی زاوای لـە ماڵـی خۆیـەوە پێبـێ بۆ ئەوەی سپاسـێکیش لـە زاوا کرابێ.

بێجگـە لـە لەمە سـەبارەت بە فەلسـەفەی نـان و پەنیر لـە کەمەر بەسـتن دەتوانرێ ئامـاژە بـە دوو بابـەت بکـرێ: یەکـەم ئەوەکـە بنەماڵـەی بـووك لەبـەر هـەژار و نەدار کچەکەیـان بـە مێـرد نـەداوە و دووەم ئەوەکـە دەربـڕی ئـەم واتایـە بـێ کـە بـووك لە ماڵـی باوکییـەوە بە پاروەنانێکی سـادە و پەنیـرەوە پێی ناوەتە ماڵـی زاوا و خۆبەزلزانی و زێدەخـوازی لـە خـۆی دوور کاتـەوە و ژیـان لە خـۆی و لە زاوا تـاڵ نەکا.

پێـش بردنـەدەری بووك دەبێ دیارییـەك بە خاڵی بدرێ هەتا ئیزنـی چوونەدەری پێبدا. ئەوجار بووك سـواری ئەسـپ دەکەن. لەسـەر پشـتی ئەسـپەکە منداڵێکی کوڕ لەپێـش بـووك سـوار دەکەن. ئەوان لەسـەر ئەو بـاوەڕەن بەم کارە یەکـەم منداڵی بووك و زاوا کـوڕ دەبـێ. ئەوجار زاوا بە سـواری ئەسـپ بە پێشـوازی بووکەوە دەچێ.

بـە چەپڵەلێدانـی خەڵـك و دەهـۆڵ و زوڕنـای گۆرانیبێـژان بـەرەو ماڵـی زاوا وەڕێ دەکـەون. ئێسـتا بـووك و زاوا سـواری دوو ئەسـپن و خەڵـك لـە دەوریـان کـۆ بوونەتـەوە. زۆرجـار پێـش گەیشـتن بـە ماڵـی زاوا لە شـوێنێکی پـان و بەرین و دەشـتایی زاوا لـە ئەسـپ دێتەخـوار و پـاش بەڕێوەبردنـی چەنـد نەریتێکـی دیکـە وەڕێ دەکەونـەوە.

ئێستا بووک گەیشتۆتە حەوشەی ماڵی زاوا. بۆنی ئەسپەندەر، خۆشحاڵیی خەڵك، چەپڵەلێدان و تلی لی، بووك لە ئەسپ دادەبەزێ. دەبێ سەرەتا باوکی زاوا دیارییەکی پێبدا. ئەم دیارییە لەوانەیە پارچە زەوییەك، باغێك، چەند سەر بزن و مەڕ یان مانگا و ... بێ. لەگەڵ ئەوەی بووك پێی نایە دەرکی حەوشەی ماڵی زاوا، تەشتێکی گەورە بە توندی بە عەرز دادەن و دەبێ بووك بەسەریدا تێپەڕ بێ. دوای ئەوەی بووك دەگاتە ژوورێ، دایك و باوکی زاوا بەخێرهاتنی دەکەن و دیارییەکی گەورەی پێدەبەخشن.

خەڵکیش دوای دابەزینی بووك لە شوێنێك دادەنیشن و پێش خواردنی نانی نیوەڕۆ دیارییەکانیان (پووڵ، زێڕ و ...) دەدەنە تازە زاوا. ناوی کەسەکان و بڕ و جۆری دیارییەکە لە لیستێکدا دەنووسرێ. ئەم کارە لانیکەمی یارمەتییەکە میوانەکان ، لە سەرەتای ژیانی هاوبەشیان بەم دوو لاوەی دەبەخشن.

سەرەتای شەو دوای زەماوەند، بنەماڵەی زاوا بنەماڵەی بووك دەعوەت دەکەن و میوانەکانی هەردوولا کۆ دەبنەوە و کەوگیرەکەیان دەدایە دەستی بووك کە ئەو شەوە بە شەوی «کەوگیر بەدەست» ناسراوە و بووك لە سبەینەکەیڕا تێکەڵاوی ژیانی ئاسایی و کاروباری ماڵ و ماڵداری دەبێ.

بەم شێوەیە کوردەکانی خوراسان ژیان لەلای خۆیان شیرین دەکەن، تاڵییەکان دەکەنە هەنگوین. کوردەکان بە هەڵپەڕکێ و شادومانی، بە داربازی و زۆرانبازی لە زەماوەنددا، لە هەمان کاتی خۆشیدا، مەشقی ئازایەتی و کارامەیی دەکەن. سروشت کتێبێکی پڕ لاپەڕەیە کە کوردەکان لەوانەیە زیاتر ئەم کتێبە بناسن و خوویان پێوە گرتووە. ئەم کتێبە فێری کردوون کە تێکەڵاوییان لەگەڵ ڕوناکیی ئەخلاق، سۆز و ژیان زیاتر بێ و کوردەکان بەم شێوەیە ئەزموونی دوێنێ و نەریتە ڕەسەکانیان بپارێزن کە بۆ هەمیشە بە نەمری دەمێننەوە. هەر

چاوێـك كـە لێـك دەنـرێ، دیدەیەكـی تـر سـڵاو لـە ژیـان دەكات و لێرەدایـە كـە كـوردەكان لـە جوغرافیای بێكەسیدا لە زۆربـوون دان. دەمێننەوە بۆ ئەوەی عەشـق و خۆشەویسـتی بـە غەریبـی نەمێنێتـەوە.[٢٥]

## • كولتووری خواردەمەنی لەنێو كوردەكانی خوراساندا

ئەگەرچی خواردەمەنی بۆ خەڵك، ئامرازێك بۆ زیندوومانەوە و درێژەدان بە ژیان بووە، بەڵام چەند نوخمبك لە شوناس و مێژووی نەتەوەیەكی لەنێو خۆیدا هەڵگرتووە و لە پەنا جلوبەرگ، خانوو، ئایین، مۆسیقا و زمان لە نیشانە و تایبەتمەندییەكانی شوناسی نەتەوەیەك دێنە ئەژمار. كولتووری خواردەمەنیی هەر نەتەوەیەك لە قووڵایی مێژوو و جوگرافیای ئەو نەتەوەیە سەری هەڵداوە كە شێوازی ژیان، جوگرافیا، زمان، قەومییەت، چین، باوەڕ، بۆچوون و ئایدیا ئایینی و مەزهەبییەكانی خەڵكێك بەدوای ڕادەكێشێ. لەڕاستیدا لەنێو خواردەمەنی نەتەوەیەكدا زۆر شت خۆی شاردۆتەوە كە تەنیا بە بابەتی خواردن و لێنان كۆتایی نایەت و بە وتەی پرۆفیسۆر فریبۆرزی هەمزەیی خەڵكناسی كورد، «لەنێو قاپێكدا، مێژوویەك خەوتووە.»

•••

كوردەكانی باكووری خوراسان سەرەڕای دووریی چوارسەد ساڵە لە نیشتمانی دایك و هاوڕەگەزەكانی خۆیان، میراتگری یەكێك لە كۆنترین كولتوورەكانی خۆراك و خواردەمەنین كە زۆربەیان تەنانەت لە ناوی خواردنەكە، شێوە و فەلسەفەی لێنان و ئامادەكردنی هاوشێوەی كوردستان و ناوچەكانی زاگرۆسە و لەگەڵ هەوراز و نشێوە مێژووییەكان، تایبەتمەندییە شوناسی ـ ڕەگەزیی خۆیان پاراستووە. ڕاستە ئەم خەڵكە لە ماوەی چەند سەدە و ژیان كۆچەرایەتی تا ڕادەیەك چوونەتە ژێر كاریگەریی كولتوورەكانی دیكە و بگرە و بەردەی كولتوورییان لەگەڵ نەتەوەكانی دراوسێ هەبووە، پابەندی زۆرترین و كۆنترینی ئەو دابونەریتانە بوون كە لە نیشتمانی

باوباپیرانیانەوە لەگەڵ خۆیان بردوویانە...

لە باکووری خوراسان، تا ئێستاکە کەمتر توێژەرێك حەزی لە باسکردنی بابەتی خواردەمەنییەکان کردووە، لەوانەیە لە ڕوانگەی توێژەرانی ئەم مەڵبەندەوە، خواردەمەنی جێگەیەکی کولتووریی تایبەتی نەبووە و بایەخی توێژینەوەی ئەوتۆی نیە. دیارە پێویست بە ئاماژەکردنە کە لەم بوارەدا وتارێك لەژێر ناوی «زنجیرەی شیرەمەنییەکان لەلای عەشیرەتە کوردەکانی خوراسان» لە ساڵی ١٣٦٩ لەلایەن ماموستا کەلیمولڵا تەوەحودی چاپ کراوە کە دەتوانرێ لە بیاڤی کولتوری خواردەمەنیدا پۆلێن بکرێ و لەوانەیە بە هۆی تێپەڕینی کاتێکی زۆرەوە پێویست بێ سەرلەنوێ چاپ بکرێتەوە بۆ ئەوەی لاوانی کورد لەگەڵ لاینە جۆراوجۆرەکانی کولتووری خۆیان ئاشنا بن.

کوردەکانی باکووری خوراسان بەهۆی شێوازی ژیانی ڕاوەستاو لەسەر ئاژەڵداری و مەڕومالاّت بەخێوکردن و ژیان لە سروشت و ناوچە کوێستانییەکان، خواردن و خورادەمەنییەکانیشیان کاریگەریی ئەم شێوەیە ژیانەیان بەسەرەوەیە. بە شێوەیەك کە خواردنی گۆشت، بەروبومە ئاژەڵییەکان و سەوزییە کێوییەکان هەمیشە لە ژیانی ئەواندا پڕڕەنگ بووە. لە خوارەوەدا باس لە ڕەسەنترین و کۆنترین خواردەمەنییەکان لەنێو کوردانی خوراسان دەکرێ کە وا دێتە بەرچاو زۆربەیان خاوەن بەهایەکی ئایینی بووبن:

**ـ کوڵۆر:** لە گرنگترینی ئەو داهێنانانەی کە لە مەیدانی دروستکردنی ناندا ئەنجام دراوە، داهێنان و دروستکردنی تەندوو لە وڵاتی ئێرانی کۆندا بووە. هەنووکەش نان و تەندوور لەنێو زەردەشتییەکانی ئێرانی بایەخی خۆی لەدەست نەداوە. هەروەها تەندوو و وەجاغ لەنێو کوردانی یارسان و عەلەوییەکانی تورکیە و کوردانی باکووری خوراسان خاوەن بایەخن ... لەنێو گرووپە جۆراوجۆرەکانی ئێرانیدا نان ڕێز و حورمەتی زۆری هەیە و سەرنجڕاکێش ئەوەیە هەنووکەش لە هەندێك ناوچەدا

سوێند بە نان دەخۆن و کاتێك لەتە نانێك لەسەر عەرز دەکەوێ هەڵیدەگرنەوە و دوای ماچکردنی، لەسەر شوێنێکی بەرزی دادەنێن تا نەوەکوو وەژێر پێ بکەوێ. دەبێ لە زۆر کۆنەوە نان یەکێك لە بەشە جیانەبۆوەکانی کولتووری خواردەمەنی ئایینیی ئێران بووبێ و برینج ناتوانێ وەها پێشینەیەکی کۆنی لەم ئایینەدا هەبێ.

کولۆر ناوی نانێکی خڕی ئەستووری ڕەنگ زەردە کە بە هەویر، ڕۆن و زەردەچێوە دروست دەکرێ و لەسەر سێڵ سوور دەبێتەوە. کولۆر لەنێو کوردەکانی خوراسان نانێکی نەزری و ئایینییە کە زیاتر لە ڕێوڕەسم و بۆنە ئایینییەکاندا وەك نەزرکردن دروست دەکرێ و لەنێو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە. (شایانی باشە لە ناوچە کوردنشینەکانی دیکەدا «کولێرە»ی پێدەڵێن).

ــ *فەتیر مەسکە یان فەتیر ڕوون:* کوردەکانی خوراسان کولۆر تازە و گەرم لەگەڵ کەرە یان ڕۆنی ئاژەڵ لەنێو دەفرێکی مسی تایبەت بە نێوی «لەنگەری» تێکەڵاو دەکەن و شەکری لەسەر ڕۆدەکەن و لە ڕێوڕەسمی تایبەتدا دەیخۆن کە «فەتیر مەسکە» یان «فەتیرڕوون»ی پێدەڵێن. سەرنجڕاکێش ئەوەیە ئەم خۆراکە لەنێو زەردەشتییەکانی یەزد، بە «سیروك» بەناوبانگە و وەك کوردەکانی خوراسان لە میوانداریی و ڕێوڕەسمەکاندا دەیخۆن. دیارە هەم لەنێو زەردەشتییەکانی یەزد و هەم لەنێو کوردانی خوراسان ڕەهەندێکی ئایینی پێدەدەن.

ــ *شیربرنج:* شیربرنج یەکێك لە چێشتە سوننەتییەکانی باکووری خوراسانە کە لە ڕێوڕەسمە تایبەتەکان بۆ وێنە لە کۆڕیادێك کە بۆ مردووەکان لە ڕەشەمە و ڕۆژەکانی کۆتایی ساڵ بەڕێوە دەچێ، دابەش دەکرێ و خەڵك دەیخۆن. ئەم ڕێوڕەسمە کە بە «ئەلەفە» بەنێوبانگە، هەروا لەنێو هەندێك لە کوردەکانی خوراساندا باوە و زیندووەیە. دیارە لە عەرەبی یان کوردیدا هەبوونی ئەم نێوە جێگەی گومانە، بەڵام ئەم ئایینە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام واتە سەردەمی میترائیزم و مەزدائیزم دەگەڕێتەوە و چێشت بەخشینەوە بۆ مردوو لە ڕۆژەکانی کۆتایی ساڵ و پێش دەسپێکی ساڵی نوێ،

هەمیشە نەریتێکی کۆن و لەمێژینەی زاگرۆش نشینەکان بووە. بەپێی ئەم نەریتە هەر بنەماڵەیەك لە ڕۆژەکانی نزیك لە ساڵی نوێ، خەڵکی ئاوایی کە زیاتر ڕیش سپی و گەورەپیاوانی ئاوایین، بانگهێشت دەکرێن و ئەوانیش بۆ مردووەکانی خاوەنی کوڕەکە، فاتیحە دەخوێنن و لە خوا دەپاڕێنەوە لە مردووەکانیان خۆش بێ. کۆنترین خوادنێك کە لەم ڕێوڕەسمەدا دەدرێ، «فروو» (فرۆ) بووە کە لە شیری مانگا(چێڵ)، مەڕ یان بزنێك کە تازە زاوە، دروست دەکرێ کە دواتر شیربرنج جێگەی فرۆی گرتوتەوە و لە ئێستادا شیربرنج جێگەی خۆی بە خواردنە ئەمڕۆییەکانی وەك مریشك، قیمە و ... داوە.

ـ **کەشکە:** کەشکە لە خواردنە کۆن و نەتەوەییەکانی کوردەکانی باکووری خوراسانە کە زیاتر لە زستان و لە نزیکەی جەژنی نەورۆز دروست دەکرێ. شێوازی دروشتکردنی بەم شێوەیەیە کە سەرەتا ئاو دەکوڵێنن و لە کاتی کوڵینی ئاو، بە ڕادەی پێویست ئاردی تێدەکەن و لەسەرەخۆ لێکی دەدەن بە شێوەیەك نەبێتە هەویر و باش توند بێ و بکشێ. دوای لێنانی، لە دەفرێکی تایبەت (لەنگەری)ی دەکەن و بە ڕادەی پێویست ڕۆنی ئاژەڵی پێوە زیاد دەکەن و لێکی دەدەن. لە کۆتاییدا شیلەی ترێ یان درووی بەسەردا دەکەن و دەیخۆن. ئەم خواردنە زۆر کۆنە و وا دێتە بەرچاو لەو خواردەمەنییانە بووە کە کوردانی باکووری خوراسان لە زێدی باووباپیرانیانەوە لەگەڵ خۆیان بردبێ.

ـ ***یارمە (گرمێ گەنم):*** بۆ دروستکردنی ئەم خواردنە سەرەتا گەنم دەکوتن و وەك ساواری لێ دەکەن. دوای ئەمە دانەوێڵەکان دەکوڵێنن و گەنمە وردکراوەکە یان ساوارەکەی پێوە زیاد دەکەن بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بکوڵێ و خەست بێتەوە. هاوکات بە ڕادەی پێویست خوێشی پێوە زیاد دەکەن. دوای کوڵینی گەنم و خەست بوونەوەی ئاشەکە، پیواز سوور دەکەنەوە و لەگەڵ بەهارات بە ئاشەکەی زیاد دەکەن. بۆ لێنانی ئەم خواردنە لەجێگەی ڕۆنی

ئاسایی، زیاتر کەڵك لە کەرە و ڕۆنی ئاژەڵ وەردەگرن. گرمێ گەنم یان یارمە زیاتر لە ڕۆژە تایبەتەکانی ساڵ بۆ وێنە ڕۆژ عاشوورا لێ دەنرێ و وادیارە لە خواردنە ئایینییەکانی کوردانی باکووری خوڕاسان بووبێ.

ـــ *دانوو:* دانوو کە لە کوردستان بە دانەکوڵانە بەناوبانگە، لە باکووری خوڕاسان زیاتر لە وەرزی کۆکردنەوەی گەنم و هەروەها لە کاتی هاتنەدەری ددانەکانی منداڵان لێدەنرێ. بەڵام لە هەندێك لە ناوچەکانی زاگرۆس بۆ وێنە کرماشان بێجگە لەو ڕێوڕەسمانە، ڕەهەندی ئایینیشی بەخۆوە گرتووە. بۆ لێنانی دانوو سەرەتا گەنم و دانەویڵە لە ئاودا دەحوسێنن بۆ ئەوەی نەرم ببەوە. پاشان تێکەڵاویان دەکەن و ئاوی گەرمیان پێوە زیاد دەکەن و لەسەر ئاگرێکی کەنی دادەنێن هەتا دەکوڵێ. جارجاریش دەبێ سەری لێبدەن بۆ ئەوەی ئاوەکەی کەم نەبێتەوە. چونکە زۆر درەنگ دەکوڵێ و ئاوەکەی زوو وشك دەبێتەوە. هەرکات ئاوەکەی لێ کەم بۆوە، دەبێ ئاوی گەرمی پێوە تێبکرێتەوە. دوای کوڵین و خەست بوونەوەی ئاوی دانوو، لە کۆتاییدا پیوازی بۆ سوور دەکەنەوە و لەگەڵ بەهارات و خوێ پێوەی زیاد دەکەن.

ـــ*دەۆکەلی:* دەۆکەلی نەریتیترین خواردن لەنێو کوردەکانی باکووری خوڕاسانە کە دەتوانرێ بگوترێ لەنێو هەموویاندا هاوبەشە. ماددە سەرەکییەکانی ئەم چێشتە دۆ و سوسرك (شیرین بەیان)ن کە پێوەندییەکی زۆری لەگەڵ شێوازی ژیان و گوزەرانی کوردان هەیە. بۆ لێنانی ئەم چێشتە، سەرەتا دۆیەکە ئامادە دەکەن و کەوچکێك شیرین بەیان و کەمێك نەحنا یان شویدی پێوە زیاد دەکەن. دواتر پیوازی بۆ سوور دەکەنەوە و دۆیەکەی تێدەکەن و بە ئارامی لێکی دەدەن تا ئاستێك کە دۆیەکە وەکوڵ دێت. دوای ئامادەبوونی، نان ورد دەکەن و پێی دادەکەن و دەیخۆن. کوردانی خوڕاسان لە سەر سفرە و لە کاتی خواردنی ئەم چێشتەدا، ڕۆنی ئاژەڵ یان کەرەی وەکوڵ هاتووی بەسەردا دەکەن کە لەم حاڵەتەدا «کەلەووش»ی پێدەڵێن.

ـ *شووروا:* شووروا لە خواردنە ئایینییەکانی کوردانی خوراسان لەقەڵەم دەدرێ و لە کۆنەوە تا ئێستا لە رێورەسمە گەورەکانی وەك سەرەخۆشی و زەماوەند لە سەر سفرەکان ئامادەیە. بە شێوەیەك کە ئێستاکەش لەو رێورەسمانەدا شووروا رەسەنایەتیی خۆی پاراستووە. شووروا بە گۆشتی وشك و خوێلێدراو لە گرنگترین خواردنەکانی کوردانی باکووری خوراسانە کە زیاتر لە وەرزی زستاندا لێدەنرێ. شێوازی لێنانی، وەك شووروای ئاساییە بەڵام گۆشتەکەی وشك و خوێلێدراوە. ئەم شێوازی راگرتن و پاراستنی گۆشت لە سەردەمە کۆنەکانەوە و لە کاتی نەبوونی یەخچاڵ (سەلاجە) لەنێو کوردانی باکووری خوراسان باو بووە. بەو شێوەیە کە گۆشتەکەیان لەت لەت کردووە و خوێیان لێداوە و بە بەنێکی قایمی وەدەکەن. لە شوێنێکی خاوێن و وشك و فێنك هەڵیداوەسن هەتا گۆشتەکە بە تەواوەتی وشك بێ. دوای وشك بوونی گۆشت، بەنەکە دەکەنەوە و گۆشتەکان لە کیسەیەك دەکەن و هەرکات پێویست بێ بۆ لێنانی شووروا کەڵکی لێ وەردەگرن. لەم شوورروایە(ئابگۆشت)ـەدا دەبێ خوێی کەم تێبکرێ چونکە تا رادەیەك خوێی هەیە.

بێجگە لەو خواردن و چێشتانەی باسیان کرا دەتوانرێ ئاماژە بە قێقانە، کووکی، یەخنی پەلاو، دووقورمە، سەرپێ، قاورمە، شکەنە، ئاولوونگ، لەنێو کوردانی باکووری خوراسان بکرێت کە لێرەدا تەنیا ئاماژە بە ناوەکانیان دەکرێت. سەرنجراکێش ئەوەیە زۆربەی ئەو خورادنانەی ناسێنران و ناویان هاتووە، ئەمرۆکە لە کوردستان باون و بەناوبانگن و تەنانەت ناوەکانیشیان هاوشێوەن. ( ئەم بابەتە لەلایەن شیرین دەوڵەت پوور ـ دەگەز ، لەژێر سەردێری «فرهنگ خوراك در میان کردهای شمال خراسان» ئامادە کراوە کە لە هەردوو ماڵپەڕی:

● (www.meisamroudaki.ir/food-culture-of-the-kurds-in-northern-khorasan)

● (http://darbandijhour.blogfa.com/post/29)

وچەندین وێب سایت و ماڵپەڕی دیکەشدا بڵاو کراوەتەوە.[٢٦]

هەروەك باس كرا زمانی خەڵكی ئەم ناوچەیە كوردیی كرمانجییە بەڵام ئەدەبیاتی زارەكی ئەم خەڵكە بەهۆی نەبوونی ڕێنووسی كرمانجیی خوراسان خەریكە تووشی زیانی گەورە دەبێتەوە. لەم بەشەدا سەرنجتان بۆ بابەتێكی گرنگ لەمەڕ خەسارناسیی زمانی زگماكیی لەنێو كوردەكانی باكووری خوراسان لەژێر سەردێڕی (مرگ خاموش) لە نووسینی بەڕێز (شیرین دولت پور - دەرگەز) ڕادەكێشم كە لە لاپەڕە ( ٤٨ - ٥٠ )ی ژمارە ١٣٨ی گۆڤاری مەهاباد دا بڵاو بۆتەوە و لەلایەن ئامادەكاری ئەم بەرهەمە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی كوردی و لە ڕۆژنامەی «كوردستان»دا بڵاو كراوەتەوە و لەبەر گرنگیی بابەتەكە لێرەشدا بڵاوی دەكەینەوە:

**• مەرگی بێدەنگ**

**(خەسارناسیی زمانی زگماكیی لەنێو كوردەكانی باكووری خوراسان)**

لە زستانی ساڵی ڕابردوو «ماری نیسمیت جۆنز» دوایین پاشماوەی خۆجێییەكانی «ئەیاك»ی ئالاسكا و تەنیا كەسێك كە توانای قسەكردن بە زمانی ئەم گرووپە لە سورپێستەكانی نیشتەجێی باكووری ڕۆژئاوای ئەمریكای هەبوو، لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا كۆچی دوایی كرد. بە مردنی ئەو كەسە، زمانێكی دیكەش لە زمانەكانی سەر ئەم جیهانە كەم بۆوە و لەنێو چوو. خاتوو جۆنز حەوت مناڵی لەپاش بەجێماوە بەڵام توانای پەیڤین و قسەكردن بە زمانی دایكیی خۆیان نییە، چونكە لە ئالاسكا زمانەكەیان قەدەغە كراوە و خەڵكی خۆجێیی ناچار كراون تەنیا بە ئینگلیزی قسە بكەن. لە زۆر ناوچەی جیهان، بێجگە لە سنووردارێتی و بەربەست دانانی حكومەتەكان لە پەروەردە و قسەكردن بە زمانی دایكیی، ئەم

زمانانـە لـە ماڵەکانـدا و لەلایـەن دایـك و باوکانـەوە تووشـی سـڕانەوە و لەنێوچوون دەبـن. بـە شـێوەیەك کە هەر لـەم پێوەندییـەدا ڕێکخـراوی یۆنیسـکۆ رایگەیاندووە کـە لـە شـەش هـەزار و حـەوت سـەد زمانـی دنیـا زیاتـر لـە نیوەیـان خەریکـی لەنێوچوونـن و بـە شـێوەی مامناونجـی لـە هـەر پـازدە ڕۆژدا، زمانێـك لـە جیهانـدا لەنێـو دەچێـت. ئـەم ڕێکخـراوە پێشـبینی ئـەوە دەکات کـە زیاتر لە چل لە سـەدی (٤٠٪) زمانەکانـی دنیـا چارەنووسـێکی هاوشـێوەی چارەنووسـی زمانـی خەڵکـە خۆجێییەکـەی «ئەیاك»یـان دەبێـت.

بـە هەسـتکردن بـەم نیگەرانییـە، ڕێکخـراوە فەرهەنگییەکانـی جیهـان بـە خسـتنەڕووی کۆنفانسـیۆن و ڕاگەیانـدراوی جیـاواز خوازیـاری پشـتیوانی و زینـدوو ڕاگرتنـی زمانـی دایکیـی نەتـەوە و قەومـە جۆراوجۆرەکانـی سەرانسـەری جیهانـن. ڕێکخـراوی یۆنیسـکۆ وەگ گرینگتریـن ڕێکخراوی فەرهەنگیـی دنیا بە دیاریکردنـی ٢١ی فەوریـە وەك ڕۆژی جیهانیـی زمانی دایکیی، ڕۆڵێکی گرینگ و بەرچـاوی لـەم بـوارەدا گێـڕاوە بۆ ئەوەی زمانی دایکیی بۆ هەمیشـە لـە ڕۆژژمێری فەرهەنگیـی وڵاتانـدا بـە زیندوویـی بمێنێتـەوە و بە ملیۆنـان مرۆڤـی دورکەوتوو لە زمانـی دایکیـی خۆیـان بتوانـن فێـری ببن.

بـە بـڕوای کۆمەڵناسـان، زمـان یەکێـك لـە نیشـانە کولتوورییـەکان و بەشـێك لە شوناسـی قـەوم و نەتەوەیـەك دێتـە ئەژمـار. بـە واتایەکـی دیکـە و لـە ڕوانگەیەکـی فراوانـتردا، دەبـێ زمـان لـە گشـت توخمـە کولتوورییەکانـی دیکـە بـە تەواوەتـی بە جیـا دابنرێـت چونکە لـە لایەك ئامـرازی دەربڕیـن، فێربـوون و گەشـەی کولتوورە و لـە لایەکـی دیکـەش کـەژاوەی گواسـتنەوەی کولتـوور لـە وەچەیـەك بـۆ وەچەیەکـی دیکەیـە. ئەوەیکـە کولتـوور و کەلەپـووری ڕابـردووەکان بـە وەچـەی ئێسـتا دەبەسـتێتەوە و جیلـی داهاتـووش لـە بەهـا و باوەڕەکانـی وەچـەی ئێسـتا ئـاگادار دەکاتـەوە، زمانـە. لـەم ڕووەوە مەرگـی زمانێـك تەنیـا لەنێوچـوون و نەمانی

ئامرازێکی پێوەندی گرتن نییە بەڵکوو مەرگی کولتوورێك بە هەموو رابردوو و پێشینەکەی و مەرگی نەتەوەیەك بە هەموو شوناسی ئێتنیکی، مێژوویی، کولتووری و ئایینییەتی.

بەڵام زمانی دایکیی چییە؟ زمانی دایکی بە زمانێك دەگوترێ کە زمانی ئێتنیکی، رەگەزی و سەرەکی دایکی منالە و منال قسەکردن بەم زمانە لە دایکی فێر دەبێت. زمانی دایکی زمانی یەکەم، خۆماڵی و بنەمایە کە منال لە کاتی لەدایکبوونەوە لە دایك و لە بنەماڵەی خۆی فێری دەبێ و دەتوانێ قسەی پێبکات. لە بەرامبەردا، زمانی دووەم زمانێکی جیاوازە کە تاك لەوانەیە لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبووندا یان لە رەوتی راهێناندا فێری ببێ. پرسیار ئەمەیە کە هۆکارەکانی مانەوە یان لەنێووچوونی زمانێك چن؟ بە شێوەیەکی گشتی، کۆمەڵێك لە هۆکارە کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و فەرهەنگییەکان شێوە و شێوازی روانینی تاکەکان بۆ زمانێك پێك دێنن و ئەم روانگە و روانینانە دەتوانن لە هەڵبژاردنی زمان و بەکارهێنانی لەلایەن قسەپێکەران و فێرکردنی بە منالەکان لە چوارچێوەی خێزاندا رۆڵی دیاریکەریان هەبێت. لەنێو زمان و شێوەزارەکاندا جۆرێکیان لە کۆمەڵگەدا شانسی زیاتریان بۆ مانەوە دەبێ کە خاوەن پێگە و ئیعتباری کۆمەڵایەتی و کولتووری بەرزتر بێ. بەهرەمەندبوون لە ئێعتبار و شوێنگەی کۆمەڵایەتیش پێویستیی بە بەهرەمەندبوون لە پشتیوانی و داکۆکیی سیاسی، ئابووری، زانستی، ئەدەبی و کولتووری هەیە. روانینە نەرێنییەکان تەنانەت دەتوانن ببنە لەمپەری پێشوازی کردنی بەکارهێنەرانی ئەو زمانە بە وێژە و ئەدەبیات و بە تایبەت بە شێعر و ئەمە خۆی دەتوانێ یەکێك لەو هۆکارانە بێ کە خێرایی بە رەوتی لەنێوچوونی زمانەکە بدەن.

لە درێژەی ئەم بابەتەدا، ئامانجی سەرەکی ئەمەیە کە بزانین هۆکارەکانی راکردن لە زمانی دایکیی لەنێو کرمانجەکانی باکووری خوراسان چین؟

لەحاڵێکدا کە بەڵگە و ئامـاژەکان ئـەوە دەردەخـەن کـە ئـەم شـێوەزارە لەبـەردەم مەترسـی دایـە و وردەوردە بـەرەو فەرامۆشـی دەڕوات، دەبـێ چ بکرێـت؟ لـەم دەرفەتـەدا مەبەسـتمانە لـە ڕەهەندێکـی کۆمەڵناسـانەوە تاوتوێـی ئـەم دیاردەیـە بکەیـن و هۆکارەکانـی لـە لایەنـی دەروونی، کۆمەڵایەتـی، کولتـووری و بەهایی و کولتوورییـەوە شـی بکەینـەوە.

کرمانجەکانـی باکـووری خوراسـان گرووپێـك لـە کوردەکانـن کـە دوای کۆچکـردن لـە کوردسـتانی تورکیـە بـۆ ناوچەکانـی باکـووری ڕۆژئـاوای ئێـران، لە سـەردەمی شائیسـماعیلی سـەفەویدا، بـۆ بەرگریکـردن لە سـنوورەکانی خوراسـان و پێشـگرتن لـە هێرشـەکانی تورکمـەن و ئۆزبەکـەکان، بـۆ هێڵـە سـنوورییەکانی باکـووری ڕۆژهەڵاتـی ئێـران کۆچیـان پێکـرا و نیشـتەجێ کـران. دواتـر جێگرەوەکانـی شائیسـماعیل، سیاسـەتی ڕاگواسـتنی ئەوانیـان بـۆ خوراسـان درێژە پێـدا و ئێلـی زیاتریـان بـۆ ئـەو ناوچەیە کۆچ پێکـردن. بە شـێوەیەك کە لە ئێسـتادا، حەشـیمەتیان زیاتـر لـە ملیۆنێـك کـەس مەزەنـدە دەکرێت.(دیـارە ئامارێکـی ورد لـەم بـارەوە لەبەردەسـتدانیە) کـە لـە دوو پارێـزگای خوراسـانی باکـوور و ڕەزەوی نیشـتەجێن. گرینگتریـن ناوچەکانـی جێـی نیشـتەجێبوونیان بریتیـن لـە شـارەکانی قوچـان، بجنـورد، ئیسـفراین، شـیروان، چنـاران، دەرگـەز، کـەلات، ئاشـخانە، مانـە، سـملقان، فـاروج، باجگیـران و بـە ڕێژەیەکـی کەمـتر لـە شـارەکانی وەك مەشـهەد، قوچـان، گـورگان، تـاران و کـەرەج. خەڵکی ئـەو ناوچەیە بە شـێوەزاری کرمانجـی کـە لقێـك لـە زمانی کوردییە، قسـە دەکـەن کە ئەمڕۆکـە ئەم شـێوەزارە و ئەدەبیاتـی زارەکییەکـەی بـە هـۆی گرینگـی پێنـەدان و نەبوونـی خەتی نووسـین و بەکارنەهێنانـی، لەبـەردەم خەسـار و مەترسـییەکی جیـددی دایە. بە شـێوەیەك کە لە سـاڵانی دوایی و بە پەرەسـەندنی کۆچکردن و دیاردەی شارنشـینی، قسـەکردن بەم شـێوەزارە وردەوردە لاواز بـوە و خەڵـك حـەز و هۆگرییەکی کەمـتر بە بەکارهێنانی

لـە ژیانـی ڕۆژانـە و هەروەهـا فێرکردن بـە منداڵەکانیـان نیشـان دەدەن. لە خـوارەوەدا هـەوڵ دەدرێـت بـاس لـە گرینگتریـن هۆکارەکانی ئـەم دیاردەیـە لـەم ناوچەیەدا و لەنێـو کوردانـی باکـووری خوراسـان بکرێـت.

***١ـ ڕەوتی خێرای پرۆسەی مۆدێرنیزم و شارنشینی***

زمانناسان هۆکارە سەرەکییەکانی گۆڕان و لەنێوچوونی زمانێك لە فاکتەرگەلێکی وەك کۆچکردن، ئاڵوگۆڕە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان دەزانن و پێیان وایە کاتێك کە کەمینەیەك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە کۆچ دەکات، بەرەبەرە زمانێك کە خاوەن هێز و بەربڵاویی زیاترە، جێگەی زمانی ئەوان دەگرێتەوە. زۆربەی کاتەکانیش ئەو زمانانە جێگەی زمانی سەرەکیی خەڵکەکە دەگرنەوە کە لە دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی زیاتر بەهرەمەندن. گەشەنەسەندنی ژێرینەماکانی وەرزێری و ئاژەڵداری لە ئێراندا کە دەبێتە هۆکاری دیاردەی نگریسی کۆچکردن لە گوندەکان بۆ شارەکان و ژیانی کۆچەری و ڕاوەستاو لەسەر ئاژەڵداری و وەرزێری بەرەو لەنێوچوون برد، لە هۆکارەکانی لەنێوچوون و لاوازیی شوناس و میراتی کولتووری کوردانی خوراسان دێتە ئەژمار. پێکهاتی عێلیی و گوندنشینی لەگەڵ نزمیی ئاستی خوێندەواری و شارەزایی و ئاگایی کولتووری و شوناسی لە کۆمەڵگەی ناوبراودا، بە خێرایی ئەم هۆکارانەی زیاد کرد. هەرچەند ئێل و ژیانی ئێلاتی و گوندنشینی لە نێوەڕۆکی ڕاستەقینەی خۆیاندا پایەگای ڕەسەنایەتی، ئایین، کولتوور، زمان و دابونەریتەکانی نەتەوەیەکە و هەر یەك لە ئێمە لە داوێنی ئەو کولتوورەدا بووە کە ئەمڕۆکە ئەم کەلەپوورەمان لە باوك و دایکی خۆمان وەرگرتووە و وەك میرات بۆمان بەجێماوە، بەڵام نەبوونی بەرێوەبەرێتی و ڕێنوێنیی درووستی ئەم کۆمەڵگە نائاگا و دەست لێنەدراوە لە ناسینی شوناس توانی بە هەمان ڕادە زیانبار بێت و خەساری گەورە بە میراتی کولتووریی کوردانی خوراسان بگەیەنێت. بە لەنێوچوونی ژیانی عێلاتی و گوندنشینی و کۆچکردن بەرەو شارەکان، ئەم گرووپە

ناشارەزاو نائاگایە لە کۆمەڵگەی نوێی شارنشینیدا کە بەداخەوە هیچ فرەچەشنی و فرەدەنگییەك قبووڵ ناکات و سەرکەوتن تەنیا لە یەکدەستی و یەك شێوەبووندا دەبینێ، بۆ ڕاکردن لەدەست ڕوانین و هەڵسوکەوتی تێکەڵ بە سووکایەتی کە گاڵتە بە هێما و ڕواڵەت و کولتووری ئێلی و گوندیی دەکات و بە چاوی سووك سەیری دەکات، دەستیان بە دووبارە پێناسەکردنەوەی شوناسی نوێی خۆیان کرد. ئەم گرووپە لەجێهەڵکەندراو لێك بڵاوانە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مۆدێرنیزم و شارنشینیدا تووشی سەلێشێواوی و دژوازیگەلێك بوونەوە و لە بۆشایی و نەبوونی ڕاگەیاندن، ئەنجومەن و گرووپە کولتووری ـ مەدەنییەکان و بژاردەکانی وریا و وریاکەرەوە، سەرەنجام قبووڵکران و وەرگرتنی خۆیان لە شوێنی نوێ، بە «گۆڕینی شوناس» و ڕاکردن و دوورکەوتنەوە لە شوناسی ڕاستەقینەی خۆیان و قبووڵکردنی هاوشێوەیی لەگەڵ کۆمەڵگەی نوێدا بینی. یەکێك لە گرینگترین نیشانەکانی ئەم گۆڕانکارییە شوناسییە، گۆڕانی زمانە کە بە خێرایی لەنێو ئەم کۆچبەرانەدا بڵاو بۆوە و بە ڕووکردنە زمانی فارسی، زمانی دایکیی وەلا نرا. بەم شێوەیە بوو کە پرۆسەی ڕاکردن لە زمانی دایکیی لە چەند دەیەی ڕابردووەوە لەنێو کوردانی باکووری خوراساندا دەستی پێکرد و لە ئێستادا بە قۆناغی جێکەوتەیی و جێگیربوونی خۆی گەیشتووە.

### ٢ـ بایەخ پێنەدانی خوێندەواران و بژاردەکانی کوردی باکووری خوراسان

زمانناسان پێیان وایە کاتێك زمان یان شێوەزارێك بە قۆناغی سڕانەوە و لەناوچوون دەگات کە ئەو منداڵانەی ئەمڕۆکە لەدایك دەبن، ئیتر بەو زمانە یان شێوەزارە نەپەیڤن. هەرچەند لەدایکبووانی ساڵانی پێشوو هەنووکەش دەتوانن بەو زمانە قسە بکەن، بەڵام بە جێگۆڕکێی وەچەکان، ئیتر کەمتر کەسێك دەست دەکەوێ کە بە زمانی ڕەسەنی دایك و باوکی قسە بکات. ئەمڕۆکە کرمانجی باکووری خوراسان پێی لەوەها کەشێك ناوە و بەرەبەرە لە ڕەسەنایەتی و لەمێژینەیی خۆی دوور دەکەوێتەوە.

لەم نێوەدا، یەکێك لە هۆکارە کاریگەرەکان لە لەنێوچوون یان زیندوویی زمانێك، بەکارهێنانی لە لایەن تاکەکان و کەسایەتییە بەنفووز و خاوەن پێگە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی ئەو کۆمەڵگەیەیە. ئەمە بژاردەکان و خوێندەوارانی کۆمەڵگەیەکن کە دەتوانن بەها و ئیعتبار بە زمانێك ببەخشن یان بێبەها و بێئیعتباری بکەن و لە برەوی بخەن. لە باکووری خوراسان، خوێندەواران و کۆمەڵگەی زانستی و فەرهەنگیی کورد لەو گرووپانە بوون کە تا رادەیەك زمانی دایکیی خۆیان لە بەها و ئیعتبار خستووە. ئەم کۆمەڵگەیە، ژمارەیەك لە نووسەران و چالاکانی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی لەنێو کوردانی خوراسان لەخۆ دەگرێت کە ئەمڕۆکە بە شێوەیەك وەك تریبوون و زمانحاڵی ئەم خەڵکەش دێنە ئەژمار. بەڵام دەبێ بگوترێ کە ژینۆسایدی زمانیی لە خوراسان تا رادەیەکی زۆر بەدەستی ئەوان دەستی پێکرد. کۆمەڵگەی گوندنشینیی کوردانی خوراسان لە چەند دەیەی رابردوودا، بەرەبەرە خوێندەوار و بژاردەگەلێکی دایە دەرەوە کە بە هاوسەرگیری و نیشتەجێبوون لە شاردا وردەوردە لە شوناشی کوردیی خۆیان دوور کەوتنەوە و بە قسەکردن لەگەڵ منداڵەکانیان بە زمانێکی جیا لە زمانی دایکیی خۆیان، بەم بۆچوونە هەڵەیە کە تاکێکی شارنشین تاکێکی فارس زمانە و هەروەها بۆ دیاریکردنی سنووری نێوان دێهاتی بوونی کەسانی دیکە و شارستانی بوونی خۆیان، بەرەبەرە فەرهەنگی « فارسی بێژی »یان و فارس بوونیان هەڵبژارد و لەگەڵ خۆیان بۆ نێو گوندەکانیشیان برد. هەتا ئەو جێگەیەی کە بۆ خەڵکی ئاساییش فارس بوون بوو بە جۆرێك پلەی کۆمەڵایەتی و هەنووکە ئەم دیاردەیە بچوکترین گوندەکانی ئەم ناوچەیەشی گرتۆتەوە.

ئەم گرووپە بە بیانووگەلی جۆراوجۆر و نالۆژیکی وەك فارسی بوونی زمانی پەروەردە لە قوتابخانەکان و ئەگەری لاوازبوونی منداڵان لە فێربوون و پەیوەندیگرتندا، پاساو بۆ رەفتاری هەڵەی خۆیان دێننەوە و ئەم پاساوهێنانەوە نادروست و نالۆژیکیەشیان بۆ نێو خەڵکی ئاسایی گواستۆتەوە هەتا ئەو جێیەی

که ئەم خەڵکە وردە وردە بوونە شوێنکەوتوویان و وەك تۆلگوو و نموونەیەکی فەرهەنگی سەرکەوتوو بۆ خۆیان سەیریان دەکەن. بێخەبەر لەوەکە ئەم گرووپە، خۆیان ساڵانێك پێشتر بە هۆی نەبوونی ئیمکانات و راگەیاندن، لە ئاوایی و ناوچە دوورکەوتووەکانی باکووری خوراسان چوونە نێو سیستەمی پەروەردەی فارسی و توانییان لە زانستگە و ناوەندەکانی خوێندنی باڵا بگەنە پلە و پایەی بەرزی خوێندن و ئەمڕۆکە نووسەر و ئەدیبگەلێیان لەم کەسانە بە شێوەیەك بەسەر شێعر و وێژەی فارسیدا زاڵ بوون کە لەم مەیدانە گرەوییان لەوانی دیکە بردۆتەوە و کەسانێکی دیار و بەناوبانگیان لێ دەرکەوتوون.

### ٣ـ فرەیی زمانی و تێکەڵاویی ئیتنیکی لە باکووری خوراسان

باکووری خوراسان لانکەی پێکەوە ژیانی ئاشتییانەی قەومەکانی تورك، کورد، تورکمەن و فارسە بێ ئەوەی هەڵسوکەوتی مەزنخوازانەی قەومی بێتە ئاراوە کە ئەم فەرهەنگە خۆی دەبێتە هۆی تێکەڵاویی نژادی و زمانی و پێکهێنانی ژن و ژنخوازیی لەنێو ئەم قەومانەدا. کوردەکانیش وەك یەکێك لە قەومەکانی ئەو ناوچەیە، بەدەر لەم دیاردەیە نەبوون. مەبەست لە باسکردنی ئەم خاڵە بەهادان بەم بابەتە نییە بەڵکوو ئاماژە بەم راستییەیە کە بەداخەوە هیچ یەك لەو دایك و باوکانەی سەر بەم قەومانە نەیانتوانیوە وێنا و سیمایەکی دروست لە کولتووری و شوناسی ئیتنیکی خۆیان بۆ منداڵەکانیان بخەنەڕوو و دایك و باوك بە پاککردنەوەی رووی بابەتەکە، هەردوکیان شوناسی ئیتنیکی و زمانیی خۆیان وەلا ناوە و شوناسێکی دیکەیان لەجێگە داناوە یان لە هەندێك بابەتدا زمانی باوك بە قازانجی زمانی دایك، پەراوێز خراوە و وەلا نراوە.

ئەمڕۆکە ئەم دایك و باوکانە لەو ناوچەیەدا، هاوسەرگیری و تێکەڵاویی قەومی بە هۆکارێك بۆ نەبوونی فێرکردنی زمانی دایکیی بە منداڵەکانیان دەزانن، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ناتوانرێ سەبارەت بەم منداڵە دوورەگانە نوسخەی شوناسی

بپێچرێتەوە یان شوناسێك بەسەر ئەوی دیکەیاندا زاڵ بکرێ و لەسەرتر دابنرێت. هەروەك کە هەر مرۆڤێکی ئاگادار لە مافەکانی مرۆڤ دەزانێ سەپاندنی ئیجباری و بەزۆرملێی زمان یان شوناسێك لە ناوەڕۆکی خۆیدا زەوتکردنی مافە مرۆییەکانی ئەو تاکەیە. ئەمە کە دایك و باوکان لە زمان و کولتووری جیاوازن، ئەمڕۆکە نە تەنیا خاڵێکی لاواز نییە بەڵکوو دەرفەتێکە. دەرفەتێك کە بتوانرێ لە ماڵدا دوو زمان فێری مناڵ بکرێن و بێجگە لە چوونەسەری هۆش، ژمارە و زانیاریی زمانیی ئەو کەسەش دەوڵەمەندتر دەکات کە ئەمڕۆکە لە سەردەمی پێوەندییەکاندا، زانینی زمانە جۆراوجۆرەکان، خۆی یەکێك لە گرینگترین پێوەرەکانی سەرکەوتن و دامەزراندنی پێوەندی و لێك تێگەیشتنە.

### ٤ ـ نەبوونی ئەلفوبێی نووسراوەیی

جیا لە نووسراوە ئەکادیمییەکانی وەك کتێب یان وتار، جاری وایە نووسینی نامە، پیرۆزبایی، دەعوەتنامە، پەیامێکی بچووك یان قسەیەکی خۆش بە زمانی زگماکیی لەنێو خەڵکدا دەتوانێ ئیعتبار و بایەخێکی کولتووری و کۆمەڵایەتی بەو زمانە ببەخشێ و پێشوازیی خەڵك لەو زمانە زیاتر بکات. بەڵام کوردی خوراسان هیچ وێنایەکی لە خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکیی خۆی نییە و چاوەڕوانی ئەوە ناکات کە زمانەکەی بتوانێ شیاوی فێرکردن و خاوەنی پێکهاتەی نووسراوەیی بێ. تەنیا لە چەند ساڵی دواییدا بە پەرەسەندنی پێوەندییەکان و لەژێر کاریگەریی ڕەوتە کولتوورییەکانی کوردستان، پێکهاتەکانی نوسراوەیی ئارامی و لاتین بە زمانی کوردی، ئەویش تەنیا لە بەینی بەشێکی کەم بۆتە باو و بڵاو بۆتەوە.

لەلایەکی دیکە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی کرمانجی تورکیا بێسەرنجدان بە جیاوازییە زاراوەییەکان و ڕوانینی خۆماڵییانە. لە بابەتە نوێیەکانی دیکەی ئەم ساڵانەی دوایی لەنێو کوردانی باکووری خوراسانە کە بە جۆرێك فێربوون، خوێندنەوە

و نووسینی کرمانجیی لەنێو توێژی ئاسایی ئەم کۆمەڵگەیە دژوار کردووە. زۆر لە نووسەران و چالاکانی فەرهەنگیی کورد لە خوراسان، یەکەمین شێوە بۆ خوێندنەوە و نووسین بە زمانی زگماکییان هەر لە هەنگاوی یەکەمەوە بەم شێوازە دەست پێکردووە و بەم کارە دەیانهەوێ رێگای سەد ساڵە بە شەوێك ببڕن، بێخەبەر لەوەکە ئەم کارە پێویستی بە بەستێن خوڵقێنی، ڕاهێنان و گەشەی وشیاری و زانیارییە. ئەوە کە زۆربەی سەرچاوە کرمانجییەکان بە ئەلفوبێی لاتین بووە و کوردەکان دەبێ بۆ کەڵك وەرگرتن لێی شارەزای ئەم ئەلفوبێیە بن و هەروەها بتوانن بەرهەم و نووسراوەکانی خۆیان بخەنە بەردەم کوردەکانی دیکەش، شیاوی سەرنجە بەڵام بە ئاگاداربوون لەوەکە پێکهاتەی زمانی فێرکاریی فارسی لەسەر بنەمای ئەلفوبێی ئارامییە، ڕێگەی باشتر ئەوەیە کە هەنگاوی یەکەم بۆفێربونی زمانی کوردی لەنێو کوردانی خوراسان، کەڵك وەرگرتن لە ئەلفوبێی ئارامی کوردییە و وادێتە بەرچاو کە ئەم شێوازە بۆ فێربوون سادەتر و بەسوودتر بێ و پێشوازییەکی زیاتریشی لێبکرێت. شایانی ئاماژەپێدانە کە لە چەند ساڵی دواییدا بە هەوڵی دامەزراوەی کرمانج لە قوچان نووسینی کارتی پیرۆزبایی و دەعوەتنامە بە زمانی کوردی و بە ئەلفوبێی ئارامی برەوی سەندووە و ئەمڕۆکە لە لایەن کرمانجەکانەوە پێشوازییەکی زیاتری لێکراوە بە شێوەیەك کە هەر کەسێکی ئاسایی دەتوانێ رستەکانی بە زمانی کوردی بخوێنێتەوە و لێیان تێبگات، شتێك کە لە دوو دەیەی رابردوودا لەوانەیە کەس فکریشی بۆی نەچوویا.

### ٥- لاوازیی ئەدەبیاتی منداڵان و بەرهەمە کولتوورییەکان لە بواری منداڵاندا

نەبوونی نووسراو و بەرهەمە فەرهەنگی و ئەدەبییەکان بە زمانی کوردی وەك کتێب، گۆڤار، فیلمی کارتۆن و (سی دی)یە فێرکارییەکان بۆ منداڵان یەکێك لە بۆشاییە بنەڕەتی و سەرەکییەکان لەنێو کوردانی خوراسان دایە. چیرۆکەکان، لایی لایی و داستانە شیرین و پڕ لە ئامۆژگارییەکان کە دایکانی کورد لە سەردەمی منداڵیدا

بۆ منالەكانیان دەگێڕایەوە هیچ یەكیان لە باكووری خوراسان تۆمار نەكراون و بە نەمانی هەر یەك لەم كەسە گەورانە، ئەو میرات و كەلەپووره زارەكییەشیان لەگەڵ مردووە و لەنێو چووه. كوردی خوراسان لە بواری منالاندا خاوەنی ئەدەبیاتێكی فۆلكلۆری دەوڵەمەندە، بەڵام كۆنەكردنەوە و نەگەیاندنیان بە ئێستا لە شكڵی بەرهەمی وێنەداری كولتووری بۆ منالان بۆتە هۆی ئەوەكە تەواوی تواناییەكانی ئەم زمانە لە بواری ئەدەبیاتی منالاندا بەبێدەنگی بمێنێتەوە.

ئەمڕۆكە زۆر لە چالاكە فەرهەنگییەكان لەم ناوچەیەدا هەم توانایی ماددی و هەم توانایی نووسەریی و ئەدەبییان هەیە كە ساڵانە چەند بەرهەمێك لە جۆرەكانی ئەدەبیاتی منالان بۆ منالانی كوردی خوراسان بنووسن و بیخەنەڕوو، بەڵام هیچكات بیریان لە پێویستبوونی وەها شتێك نەكردۆتەوە. ئەو پوڵ و سامانەی كە لە جەژن و زەماوەندەكاندا بە زیادەوە خەرج دەكرێ، ئەگەر لە پێناو ئەم جۆرە ئامانجە كولتوورییانەدا بەكار بهێنرێت تا رادەیەك دەتوانێ ئەم زمان و كولتووره لەم قەیرانی فەرامۆشی و لەبیركراوییە رزگار بكات.

### ٦ـ لاوازیی راگەیەنە گشتییەكان

رادیۆ و تەلەویزیۆنە ئوستانییەكان وەك راگەیەنێكی گونجاو و خاوەن لایەنگری زۆر، رێگەیەكی باشی بڵاوكردنەوە، پاراستن و گەشەپێدانی شێوەزارە خۆماڵییەكان دێنە ئەژمار و ئامانج لە دامەزراندن و وەكارخستنی كەناڵە ئوستانییەكانیش یارمەتیدانی پاراستنی كولتووری و ئەم شێوەزارە خۆماڵییانە بووە. لە باكووری خوراسان بە هۆكارگەلی جوغرافیایی و بڵاویی كوردەكان لە دوو پارێزگای خوراسانی باكوور و رەزەوی و كۆنەبوونەوەیان، دەرفەتی دامەزرانی وەها كەناڵێكی بەهێز و شوێندانەر لە خەڵكی كورد ئەستێنراوەتەوە. لە دوو پارێزگای خوراسانی باكووری و رەزەوی، بەشی خەڵكی كورد لە راگەیەنە لۆكاڵییەكان، تەنیا نیو كاتژمێر بەرنامەی رادیۆیی بە

زمانی زگماکییە کە ئەویش بە بڵاوکردنەوەی بەرنامەی دووپاتکراو و چەند پارچە مۆسیقایەك سەر و بنی وێك دێتەوە و تەواو دەبێت. جاری وایە فیلمە دیکۆمێنتی و بەرنامە تەلەویزیۆنییەکانیش کە لە ناوچە کوردنشینەکان بەرهەم دێن، بە زمانی فارسییە و خەڵك لەوانیشدا بە زمانی زگماکیی خۆیان ناپەیڤن. هەر بۆیە نە تەنیا هیچ کەڵکەڵە و پێویستییەك لە خەریکبوون بە زمانی زگماکیی لە لایەن کاربەدەستان و بەرنامەدانەرانی ئەم ناوچەیە هەست پێناکرێت، بەڵکوو هەوڵ دەدرێت ناوچەکە بە رەوتێکی ئارام ولەسەرخۆ بەرەو یەکدەستی و یەك شێوەیی بچێتە پێش. لەگەڵ هەموو ئەو قسانەی لەم بارەوە کران، بە سەرنجدان بەوە کە کوردانی خوراسان لە پارێزگایەکدا جێگیر نین و حەشیمەتێکی بەرفراوان و شیاوی گرینگی پێدان لەخۆ دەگرن، پێویستیی بە ڕاگەیاندنێکی ناوچەیەیی سەروو ئوستانی کە بتوانێ پێداویستییە کولتووری ـ کۆمەڵایەتییەکانی ئەم خەڵکە دابین بکات، بە توندی هەست پێدەکرێت.

### ٧ـ نەبوونی چاپ و بڵاوکراوەی کوردی

زمانناسان رۆڵی شێعر و بەرهەمە ئەدەبییەکان لە پاراستن و بەزیندوویی راگرتنی زمان بە رۆڵێکی دیار و یەکلاکەرەوە دەزانن. دوکتۆر حەقشناس زمانناسی ئێرانی دەڵێ: «ئەمن رازی مەرگی زمانەکان لە ڕاوەستان و نەزۆکیی شیعری ئەو زمانەدا دەبینم، هەر زمانێك ئەو کاتە دەمرێ کە دوایین شاعیری مردبێ». هەر بۆیە بەرهەمە ئەدەبیيە خۆماڵییەکان جیا لە بەنووسین دەرهێنانی فەرهەنگی گشتی و هێنانەسەرکاغەزی هەستی شاعیرانە، دەتوانێ بە بەها و زیندوویێتی شێوەزار و زمانەکانیش زیاد بکات. بەرهەمە ئەدەبییە کوردییەکان چەند ساڵێکە لە باکووری خوراسان برەویان سەندووە و شاعیر و ئەدیبگەلێك دەرکەوتوون کە بەم زمانە شێعر دەڵێن و دەنووسن. نموونەی دیار و بەرچاوی ئەم شتە هۆنراوەی جیکسای بە هەوڵی مامۆستا حەسەن ڕەوشانە

کە بەڕاستی بایەخی تەواوی پێداوە. هەرچەند لەم نێوەدا بەرهەمی سادە، نازانستی و ناکارناسانەش بەرچاو دەکەون کە جێی خۆیەتی رەخنەیان لێ بگیرێت. نموونەشیان کتێبی کەسێك بە ناوی محەمەد.م کە تێیدا، شێوەزاری کرمانجی بە لقێك لە زمانی فارسی زانیوە و هەتا ئاستی زاراوەیەك دایدەبەزێنێ! کە بەداخەوە ئەم کتێبە بە پێشەکی کەسانێك چاپ کراوە کە خۆیان لە نووسەران و چالاکە فەرهەنگییەکانی ئەم ناوچەیە دێنە ئەژمار. مەبەست لەم جۆرە رەخنانە، بێڕێزی بە کەس یان گرووپێکی تایبەت نیە. بەڵکوو مەبەست تەنیا بەکارهێنانی وردیی و دووربینیی زیاتر لە نووسین و لێکۆڵینەوە دایە. زۆر لە شاعیران، نووسەران و چالاکە فەرهەنگییەکانی کوردی باکووری خوراسان یا هەنووکەش لە نۆستالۆژیای رابردوو و خەونی گەڕانەوە بۆ ژیانی هۆزایەتی و عەشیرەتی و گەڕان لە پاکیی و ڕاستگۆیی ئەو سەردەمدا بەسەر دەبەن و یان نووسراوەکانیان باس لە بابەتگەلی مێژوویی و چەندپاتکراو دەکەن کە هیچ گرێیەك لە کێشە هەنوکەییەکانی ئێمە ناکەنەوە. لەحاڵێکدا کە ژیانی مۆدێرنی ئەمرۆ وەك کۆمەڵگەکانی دیکە، بابەت و کێشەی نوێی خستۆتە بەردەمی ئێمە کە ئەدەبیات و دیسکۆرسی تایبەت بەخۆی دەوێت. گرفتەکانی وەك قەیرانی شوناس، ژینگە، نەخوێندەواری، هەرەشە لە زمانی زگماکی، گیرۆدەیی، لێکهەڵوەشانی بنەماڵە، پیاوسالاری، مافەکانی ژن و ... کە ئەمڕۆکە کۆمەڵگەی کوردی خوراسانیش دەست و پەنجەیان لەگەڵ نەرم دەکات، ئەو بابەتانەن کە کەمتر باسیان لێدەکرێت. لە بیاڤی چاپەمەنی کوردیشدا ئەم ناوچەیە زۆر هەژارە و دەتوانرێ بگوترێ کە لە ئێستادا هیچ بڵاوکراوەیەکی تایبەت بە زمانی کوردی تێدا بڵاو نابێتەوە. بڵاوکراوەی وەك کرمانج و (هزار مسجد)یش کە تایبەت بە کوردەکانی باکووری خوراسان بوو و جاروبار باسی بابەتەکانی ئەو ناوچەیەیان دەکرد، ئیتر بڵاو نابنەوە.

### ٨ـ لاوازیی ڕێکخراو و ئەنجوومەنە فەرهەنگی ـ مەدەنییەکان

ئەنجوومەن و ڕێکخراوە مەدەنییەکان کە لە دەیەی ڕابردوو لەنێو کوردانی خوڕاسان شکڵیان گرتووە زیاتر لەژێر کاریگەریی کەشی سیاسی و بزاڤە خوێندکارییەکاندا بووە کە چالاکییەکەیان هێندە ڕێکوپێك، بەردەوام و بەهێز نەبووە و تەنیا سەرکەوتنیان زیندووکردنەوە و بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمەکانی زەماوەند، داب‌وڕەسمەکان، مۆسیقا، جل‌ءبەرگ و هەڵپەڕکێی کوردی بووە و گرینگییەکی ئەوتۆیان بە زمانی کوردی لەو ناوچەیە نەداوە. لە بواری ئەنجوومەن و ڕێکخراوە مەدەنییەکان دەبێ تەرکیز لەسەر دامەزراندنی ڕێکخراوگەلی خەڵکیی و بەهێز بکرێتەوە کە بتوانێ لە پێناو پاراستن و بردنەسەری لایەنە جیاوازەکانی کولتووری کوردی خوڕاسان هەنگاو هەڵێنێتەوە. بۆ نموونە پێکهێنانی ئەنجومەنی مۆسیقای کوردی باکووری خوڕاسان، ئەنجومەنی داکۆکی لە زمانی زگماکی، پاراستنی هەڵپەڕکێ و ڕێوڕەسمە کوردییەکان، پشتیوانی و زیندووڕاگرتنی شوێنەوار و پیشە دەستییە کوردییەکان، ئەنجومەنی توێژینەوەی کولتووریی گشتی و ... لەو دامەزراوە مەدەنیانەن کە نەبوون و بۆشاییان لە باکووری خوڕاسان لە تەواوەتی هەست پێدەکرێت. بێجگە لەمەش، زۆر لە کوردانی ئەم ناوچەیە بێجگە لە شارەکانی باکوری خوڕاسان، ئێستاکە لە شارە گەورەکانی وەك تاران، کەرەج، مەشهەد و گورگان نیشتەجێن و بڵاو بوونەتەوە و ئاگایان لە یەکتر نییە و ناوەندێکی پێوەندیی یان ئەنجومەنێکی فەرهەنگیی بەهێزیان پێك نەهێناوە کە جاروبار لە دەوی یەکتر کۆیان بکاتەوە و بە جۆرێك پێکەوەیان لێك نزیك بکاتەوە و یارمەتی گەشە و بردنەسەری شوناس و یەکگرتوویی کولتووری ئەوان بدات.

هەروەك ئاماژە پێکرا، کۆچکردن دەتوانێ ببێتە هۆی بەرهەمهێنانی دژەنۆرم و گرفتە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان لە کۆمەڵگەی نوێدا. یەکێك لە ڕێگەکانی بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم دواهاتە خراپانە، پێکهێنانی دامەزراوە و ئەنجومەنە مەدەنیەکان بۆ گرووپە کولتوورییە کۆچبەرەکان لە کۆمەڵگەدایە. بەم کارە کۆچبەران

لە شوێنی نوێ، بە پاراستنی بەها و تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی خۆیان، دەتوانن لە پێناو گەشەپێدانی فەرهەنگی کۆمەڵگەی نوێش هەنگاو هەڵێننەوە. بۆ نموونە کەمایەتیی ئەرمەنی کۆچبەر کە بەشێوەی کەمینەی کۆمەڵایەتی لە هەندێك لە شارەکانی ئێران ژیان بەسەر دەبەن، بێجگە لە پاراستنی شوناسی خۆیان توانیویانە خزمەتی کولتووریش پێشکەش بەم شارانە بکەن. یان گورجییەکانی ئیسفەهان کە نزیکەی ٤٠٠ ساڵ پێش بە فەرمانی شا عەبباسی یەکەم لە وڵاتی گورجستان بۆ ئێران کۆچیان پێکرا و نیشتەجێکران و ئەمڕۆکە توانیویانە تەنانەت بە تێپەڕینی ساڵانێکی زۆریش، زمانی زگماکیی خۆیان لە هەر چەشنە دەستکارییەك، بپارێزن و میراتی کولتووریی خۆیان گەشە و پەرە پێبدەن. یان دەتوانین وەك نموونە ئاماژە بە کۆمەڵگەی زەردەشتیان لە هیند یان کەمینەی کورد لە قەزاقستان و رووسیا بکەین.

لە پەنا ئەو هۆکارانەی باسیان کرا دەتوانرێ ئاماژە بە دووربوونی جوغرافیایی لە نیشتمانی سەرەکی و نەبوونی کارلێك و بێئاگایی لە ڕەوتە کولتوورییەکانی کوردستان، لاوازیی خوێندەواری لە ناوچە و سیستەمی فێرکاریی یەك زمانە بکرێت کە هەر یەکێکیان بە نۆبەی خۆی لە دیاردەی راکردن لە زمانی زگماکی لەنێو کوردانی باکووری خوڕاساندا کاریگەریی خۆیان هەبووە. بۆ هەمووومان ئاشکرایە کە گرینگترین فاکتەری شوناسیی هەر نەتەوەیەك، زمانەکەیەتی. لە ماوەی سەعاتێکدا دەکرێ جل‌وبەرگی کوردی لە جەژنەکاندا لەبەر بکرێ و دابنرێ، بەڵام هیچ کات لە سەعاتێکدا ناتوانرێ زمانی کوردی فێر بیی. پۆشینی جل‌وبەرگی کوردی و هەڵپەڕکێی گرووپی لە جەژنەکاندا زۆر دیمەنی جوانن، بەڵام جوانتر و گرینگتر لەوە قسەکردن بە زمانێکە کە ئەگەر نەسڵی ئێمە بڕیاری پاراستنی نەدا، بنچینەی مەسەلەی کوردبوونی ئێمە ڕەش دەبێتەوە و خۆمان لە مەرگی شوناسی خۆماندا زۆرترین دەور و رۆڵمان گێڕاوە. ئەویش مەرگێکی لەسەرخۆ و تەواو بێدەنگ.[٢٧]

## ● ژیان و بەسەرهاتی جافەرقولی زەنگەلی ( زەنگۆلی)

جافەر قولی شاعیری ناسراوی کوردی خۆراسان و تورکمانستان ئەوەندەی لای خەڵك بەناوبانگ و خۆشەویستە، ئەوەندە لە ژیان و بەرهەمە شێعرییەکانی نەکۆڵراوەتەوە. ئەو زانیارییەی لە ناوەوەیە لە بابەت ئەم شاعیرەوە بەشێکی لە ئەفسانە دەکا، لەگەڵ ئەوەش دا مێژووی ئەدەبی کوردی ڕەنگین دەکا، چونکە ئەفسانە ئەگەر بێ بنەمای راستیش بێ، هۆش و بیر دەجوولێنێ و خەیاڵ و چێژ دەبزوێنێ و هەندێ جار بەرەو دۆزینەوەی ڕاستی دەبێتەوە و هەندێ جاریش دەبێتە ڕەمزی سۆفیزم.

بەپێی سەرچاوەکان جافەر قولی کوڕی مەلا ڕەزا قولی گوکانی و لە ئێلی کوردی زەنگەلانلو بوو، ئێلێك کە ئەمڕۆکە «گوگان» لە ٣٥ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی قووچان شوێنی نیشتەجێبوونیەتی. هەرچەند زۆربەی سەچاوەکان باسی ساڵی لەدایکبوونیان نەکردووە بەڵام لە کتێبی کوردی تورکمانستاندا هاتووە کە لە دەوروبەری ساڵی ١٨١٤ لە گوندی شکافکۆی لە بنەماڵەیەکی ڕەنجبەری دێهاتی لەدایك بووە. ئەم گوندە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوایی قوچان.

لە تەمەنی منداڵیدا باوکی لەدەست داوە و مامی بەخێوی کردووە. دەڵێن بە مناڵی لە مەکتەب ڕای کردووە هەربۆیە نەیتوانیوە پلە زانستیەکان ببڕێ. بەڵام وانەی عەشق لە کوێستانەکانی باکووری خوراسان فێر بوو و سەیر ئەوەیە کە بە چوار زمانی کوردی، تورکی، فاسی و عەرەبی شێعری هۆنیوەتەوە. ناوبراو بە (ملك الشعرای) کرمانج ناسراوە، شاعیرێك کە بێجگە لە هونەری شاعیری، دووتاریشی لێداوە و شێعرەکانی بە ئاهەنگی دووتارەوە خوێندۆتەوە.

جافەر قولی (جەعفەر) بە جافەرقولی، جافەر قولی زەنگلی، جافەرقولی بێچارە، جافەر قولی عەندەلیب، جافەر قولی موختار ناسراوە. هەندێ لەم ناوانە خۆی بۆ خۆی دانابوون، لەناو خەڵکی بەم ناوانە ناسراوە.

لە تافی لاویەتی‌دا توشی حاڵەتی پرتەوی ( ئیشراق ) بووە و گرفتاری جوانی کچێك بووە، ناوی ملواری بووە، لەم لایەنەوە خۆی دەڵێ: «مەلە نینم، خود بەندەم، وە سی جزمێ قورئانێ». ( واتە مەلا نیم، شاعیرم، بە سی جزمی قورئان).

کوردی خۆراسان پێیان خۆشە لە بابەت جافەرقولییەوە بڵێن: ئەگەر مەولانا عەشقی شەمسی تەبریزی بێ، جافەر قولی عەشقی ملواری یە. ئەم شاعیرە بە دڵدار و هونەروەر و جیهانگەرد و موسیقار و دانای دەژمێرن، کە ناوی دەبەن « مەلیکولشوعەرای کرمانج »ی پێدەڵێن.

ئیسماعیل حوسێن پوور ماستەری زمان و ئەدەبیاتی فارسی دەڵێ: « جەعفەرقولی زەنگەلی، عارف و شاعیری ناوداری باکووری خوراسان لە سەردەمی ناسرەددین شادا ژیاوە.. بەچوار زمانی فارسی، عەرەبی، تورکی و کوردی شێعری گوتووە. ناوبراو قورئانی لەبەر بووە و تەفسیریشی کردووە، هەروەها مۆسیقازان، مێژووزان، جوگرافیازان و زانایەکی بەرز بووە کە بە هۆی گەڕانی بە دنیادا توێشووی فکریی زۆری کۆ کردۆتەوە و لە شێعرەکانی دا بە هەرمانی هێشتوویەتیەوە.

حوسێن پوور لە درێژەدا دەڵێ: « جافەرقولی لە دیوانی شێعرەکانیدا پشتی بە ٩٠٠ ئایەت، ٤٥٠ حەدیس و ١٥٠ پەند بەستووە کە ئەمە خۆی نیشاندەری هزری قوڵی ئەم شاعیرە بووە.»

هەروەك چۆن کاتی لەدایکبوونی بە تەواوەتی ڕوون نیە، مەرگ و گڵکۆکەشی نادیارە بەڵام هەندێك کەس پێیان وایە ئەو چۆتە حەج و ئیتر نەگەڕاوەتەوە. شێعرەکانی بە باشی ژیان و گوزەرانی ناوبراو نیشان دەدەن.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە دیوانی شێعرەکانی جافەرقولی بە هەوڵ و هیممەتی توێژەری ماندوویی نەناس و ناسراوی کوردی خوراسان، بەڕێز کەلیمولڵاتەوەحودی بە ناوی دیوانی جەعفەر قولی زەنگلی کۆ کراوەتەوە و بڵاو بۆتەوە.

خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زیاتر ئاشنابوون بە شێعر و بەرهەمەکانی جافەرقولی،

سەیری باسی تایبەت بە کوردەکانی تورکمانستان بکەن، لەوێدا بە تێروتەسەلی باسی کراوە.

چەند نموونەیەك لە شێعرەکانی جافەرقولی

**فارسی:** آرزو دارم بسی من عابدین را چاکرم بعد زین العابدین باقر بود تاج سرم صاحب تقصیرم و من خاك پای جعفرم

**کوردی:** وا دنیا سەرایە کە کاروان دەکە گوزار دیداری تە دەخازم مرم ژە ئینتزار تو دەریا و دەریاچە خەوا نا کە ئاری دل

**تورکی:** چوخ کیسمە لر، گلر، گیدەر زمانە فلك منی جدا سالدی یرو دیمدن غریب اولکاسندن اولدی جعفریمند دمبدم عشق أتشندن دین و ایمان یاندرور

**عەرەبی:** باصلات دائم و هم اکله خبز شعیر / قال رسول القریشی علی شیخ کبیر / اسدالله قاسم جناع عدن و السعیر (٢٨)

## • سەرچاوەکان:


۱. استان_خراسان_شمالی http://fa.wikipedia.org/wiki

۲. استان_خراسان_رضوی http://fa.wikipedia.org/wiki

۳. استان_خراسان_جنوبی http://fa.wikipedia.org/wiki

٤. کردهاي خراسان http://fa.wikipedia.org

5. www.vokradio.com/content/view/1274/69

6. www.kurmanj.blogfa.com/category/65

۷. توحدی، کلیم الله، حرکت تاریخی کرد به خراسان، جلد اول، چاپ دوم ل۲۸.

۸. رندل، جاناتان، با این رسوایی چه بخشایشی، نشر پانیذ، چ دوم، تهران ۱۳۸۰، ص ۳۱.

9. http://hiva50.blogfa.com/post-22.aspx

۱۰. سپاهی لایین، علیڕەزا، گۆڤاری مەهاباد، ساڵی دوازدەیەم، ژمارە ۱۳۸ی ساڵی ۱۳۹۱، مەهاباد ل ٤٦_٤٧.

۱۱. سەرچاوەی ژمارە٤.

۱۲. سەرچاوەی ژمارە٥.

۱۳. گۆڤاری هەژێن http://www.govarihejen.blogfa.com/post-26.aspx.

۱٤. سەرچاوەی ژمارە٤.

۱٥. سەرچاوەی ژمارە٥.

۱٦. سەرچاوەی ژمارە۱۲.

۱۷. ئەندەریاری، ئارێز، کوردانی خوراسان بەشێکن لە کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، وەرگیراو لە: (www.jamalnajari.wordpress.com/2013/12/29)

18. (www.kurmanj.blogfa.com/category/65)

19. (www.khanzadiz.blogfa.com/post-12.aspx)

٢٠. میرنیا، سیدعلی، ایل‌ها و طایفه‌های عشایری کرد ایران، موسسه انتشاراتی و آموزشی نسل دانش، چاپ اول، تهران ل ٤٩ـ٨٧.

21. www.vokradio.com/content/view/1274/69

٢٢. ئەندەریاری، ئاریێز، س.پ.

٢٣. سەرچاوەی ژمارە٤.

٢٤. سەرچاوەی ژمارە٤.

٢٥. حسین پور، اسماعیل و علي عاقلي، عروسي کردهاي مازندران، گۆڤاری مەهاباد، ساڵی شەشەم، ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی، ژماره ٦٥ ، ل ٥٧ـ٥٩ و ژماره ٦٦ ل ٦٢ـ٦٤.

26. (www.meisamroudaki.ir/food-culture-of-the-kurds-in-northern-khorasan.html) و (http://darbandijhour.blogfa.com/post/29)

٢٧. دولت پور، شیرین، گۆڤاری مەهاباد ، ساڵی دوازدەیەم، ژماره ١٣٨ي ساڵی ١٣٩١، مەهاباد ل ٤٨ـ ٥٠.

٢٨. کوردی تورکمانستان ( مێژوو، ئەتنۆگرافیا، ئەدەب)، دانانی: دوکتۆر مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کوردستان، هەولێر ٢٠٠٣، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر و ، http://www.hiva50.blogfa.com/post-50.aspx
http://hamshahrionline.ir/details/167626)

## دووەم
## کوردەکانی قەزوین

- چەند زانیارییەك لەبارەی پارێزگای قەزوین
- سەردەم و هۆکاری ڕاگواستنی کورد بۆ قەزوین
- شوێنی ژیانی پێشوویان (پێش کۆچ پێکردنیان)
- شوێنی ژیانی ئێستایان
- هۆزە کوردەکانی نیشتەجێی قەزوین و دەوروبەری
- ئینتمای نەتەوەیی و هەستی کوردایەتی لای کوردەکانی قەزوین

خەڵکی کوردی دوورخراوە بۆ قەزوین چەندین سەدە بوو لەپێش چاوی خەڵکی کوردستان نادیار بوون، هەربۆیە فەرامۆش کرابوون و هیچ کەس هەواڵی ژیانیانی نەدەزانی. هەرکات قسە لە کوردە دوورخراوە و ڕاگوێزراوەکان دەکرا، هەموو سەرنجەکان بۆ لای خوراسان بوون، بەداخەوە خەڵکی کوردستان یان بە تەواوەتی لە بوونی کوردەکانی قەزوین بێخەبەر بوون یان شتێکی ئەوتۆیان لەبارەوە نەدەزانین. کوردەکانی باکووری خوراسان ئێستا یان بە هۆی ئەو کتێبانەی لەبارەیانەوە نووسراوە یان ئەو چالاکییانەی خۆیان ئەنجامیان داون

یـان لـە ڕێگەی هێندێك ئامـرازی ڕاگەیانـدن و بڵاوکراوە کە لەبەردەسـتیان دابووە، توانیویانـە خۆیـان بناسـێنن، هەربۆیـە لە بیر و مێشـکی خەڵکدا ماونەتـەوە و کەس ناتوانێ لەبیریـان بـکات، بـەڵام کوردەکانـی قەزویـن بەداخـەوە ئـەم دەرفەتەیـان بـۆ نەرەخسـاوە هەربۆیـە تاڕادەیـەك لەبیـر کـراون. ئێسـتاکە دوای چەندیـن سـەدە دەیانـەوێ بڵێـن ئێمـەش هەین!!

کوردەکانـی قەزویـن دوای چەنـد سـەدە هەنووکـەش پێوەندیەکـی زۆر نزیکیـان پێکەوە هەبە. ئێسـتاش تـا ئاسـتێکی زۆر هاوسـەرگیرییەکان لەنێو خزم و کەسـوکاری یەکـتردا بەڕێـوە دەچـن و لەنێـو خـۆی کوردەکانـدا ئەنجـام دەدرێن. .. بەشـێك لـە حەشـیمەتی کوردەکانـی قەزویـن و بـە تایبـەت ناوچـەی تارەمـی خـواروو بـۆ کـەرەج و تـاران کۆچیان کـردووە بەڵام ئێسـتاکەش ئەگەر کەسـێکیان لـێ بمـرێ، زۆربـەی کاتـەکان هـەوڵ دەدەن تەرمەکـەی بـۆ شـوێنی لەدایکبوونـی بێننـەوە و لـە گۆرسـتانی تایبەتـی کوردەکان بـە خاکی بسـپێرن. واتە لە شـێوازگەلی تـەواو نەریتـی بـۆ پاراسـتنی شـوناس و پێوەندییەکانیـان کەڵـك وەردەگـرن و ...»[1]

- **چەند زانیارییەك لەبارەی پارێزگای قەزوین**

پارێـزگای قەزویـن یەکێـك لـە ٣١ پارێزگاکانـی ئێرانـە و لـە بەشـی باکـووری ڕۆژئـاوای ئـەم وڵاتـە هەڵکەوتـووە. ئـەم پارێزگایـە بـە هەبوونـی تەنیا لە سـەدا یەك (١٪) ی ڕووبـەری وڵات نزیکـەی لەسـەدا پێنـج لـە ئابـووری و بەرهەمەکانـی ئێرانـدا ڕۆڵـی هەیـە.

ناوچـەی قەزویـن هەتـا سـاڵی ١٣٧٣ی هەتـاوی بەشـێك لـە پارێـزگای زنجـان بـوو، لـەو سـاڵەدا لە پارێزگای زنجـان جیا بۆوە و خرایە سـەر پارێزگای تـاران کە لە ڕێکەوتـی ١٣٧٦/٣/٢٠ی هەتـاوی لـە پارێـزگای تـاران جیا بۆوە و لەگەڵ تاکسـتان لـە پارێـزگای زنجـان پارێزگایەکـی نـوێ بـە نـاوی پارێـزگای «قەزوین «یـان پێـك

هێنا و ناوەندەکەشی شاری قەزوینە. ڕووبەری ئەم پارێزگایە نزیکەی ١٥٨٢٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و دراوسێی پارێزگاکانی مازەندەران، گیلان، هەمەدان، زنجان، مەرکەزی و ئەلبورزە.

حەشیمەتی پارێزگای قەزوین بە پێی ئاماری ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی ملیۆنێك و دووسەد و یەك هەزار و پێنجسەد و شەست و پێنج کەس بووە. ئەم پارێزگایە یەکێك لە پارێزگا مێژووییەکانی ئێرانە و شوێنەواری کۆنی زۆری تێدایە بە شێوەیەك کە لە سەدا یازدەی شوێنەوارە مێژووییە تۆمارکراوەکانی وڵات لەم پارێزگایەدان.

پێشینەی ناوی قەزوین: نووسراوە کۆنەکانی یۆنان قەزوین بە ناوی «راژیا» دەناسێنن و دوای ئەوەش لە نووسراوە ئەورووپییەکاندا ئەم شارە بە ناوی شاری کۆنی «ئارساس» یان «ئارساسیا» ناسراوە. ئەشکانیەکان قەزوینیان بە ناوی دامەزرێنەرەکەی «ئۆردپا» ناوزەد دەکرد و ساسانیەکان ناوی ئەو شارەیان نابوو «کەشوین» واتە وڵاتێك کە نابێ لێی غافڵ بی. لە هێندێك دەقدا بە «قەسوین» (یانی شارێك کە خەڵکی خۆڕاگر و قایمی هەیە) ناوی هاتووە. بەهەرحاڵ مێژوونووسان و کەوناراناسانی هاوچەرخ قەزوین بە عەرەبی کراوی وشەی «کاسپین» دەزانن و لەسەر ئەم باوەڕەن کە قەومی کاسپییەکان کە لە لێوارەکانی دەریای خەزەر دەژیان و بە تێپەڕینی ڕۆژگار کۆچیان کرد و شاری «قەزوین»یان بنیات نا. بەم هۆیەوەیە کە لە دەقە کۆنەکانی عوسمانی و عەرەبیدا ناوی دەریای خەزەر بە «بحر القزوین» هاتووە.

باسکردن لە قۆناخە جیاجیاکانی مێژووی قەزوین، جوگرافیای سروشتی و هەروەها قسەکردن لەسەر جوگرافیای سیاسیی ئەم پارێزگایە، دابەشبوونی شار و گوندەکانی و حەشیمەتی هەریەکەیان، نووسینەوەی ژیان و بەسەرهاتی زانا و ناودارانی، باسکردنی باری ئابووری و پیشەسازیی ئەم پارێزگایە و

دەیان بابەت و باسی دیکەی پێوەندیدار بەم پارێزگایە، لەگەڵ ئەوەی لێرەدا پێویست بە باسکردن و شیکردنەوەیان ناکا. لە هەمان کاتدا کاری کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لە هەر یەك لەم بوارانەیە. ئەوەیکە لێرەشدا وەك چەند زانیارییەکی گشتی لەبارەی ئەم پارێزگایە خرایەڕوو، تەنیا بۆ ئەوەیە چونکە باسی کوردەکانی دانیشتووی ئەو شوێنە دەکرێ، بێشك پێویستە ئەگەر زۆر بە کورتیی و سەرەتاییش بێ، خوێنەری بەڕێز وێنەیەکی شوێنی ژیانی ژمارەیەك لە هاونەتەوەییەکانی نیشتەجێی ئەو ناوچەیەی بێتە پێش چاو. هەربۆیە لێرەدا بە باسکردنێکی کورتی بابەتێکی دیکەی پێوەندیدار بەم پارێزگایە واتە زمانی قەومەکانی دانیشتووی ئەم پارێزگایە کۆتایی بەم باسە دێنین و چونکە لەنێویاندا ئاماژە بە زمانی کوردیش کراوە کە ئەمە خۆی یەکێکی دیکە لە نیشانەکانی هەبوونی کورد لەم پارێزگایەیە:

زمانی دانیشتوانی قەزوین: ئەمڕۆکە زۆربەی خەڵکی پارێزگای قەزوین لە ناوەند و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەم پارێزگایە بە زمانی فارسی قسە دەکەن. بێجگە لە فارسی زمانەکانی دیکەی وەك تورکی ئازەربایجانی، تاتی، مەراغی، کوردی، لوڕی و رومانلویی قسەیان پێدەکرێ. بە شێوەیەك کە زمانی تاتی لە تاکستان و چەند بەشێکی ئەلەمووت، زمانی مەراغی لە گوندە مەراغی نشینەکان، زمانی کوردی لە تارم، قاقزان، دودانگە، ڕوودباری ئەلەموت، بەشاریات و پشگلدەرە و هەروەها زمانی تورکی لە ڕامەند، زەهرا، خرقان، ئەفشاریە و ناوچەکانی ڕۆژئاوا و باشووری قەزوین و زمانی رومانلوییش لە گوندە قەرەج نشینەکانی قەزویندا باون. لەم نێوەدا بێجگە لە زمانی مەراغی کە لە هەموو گوندە مەراغی نشینەکانی ئەم پارێزگایە بە یەك شێوە قسەی پێدەکرێ، زمانەکانی دیکە بەپێی بارودۆخی هەرێمی و هەروەها لەژێر کاریگەریی زمانە دراوسێکان شێوەزاری جۆراجۆریان هەیە. زاراوەی قەزوینی یەکێك لە زاراوەکانی زمانی فارسییە کە

لەلایەن خەڵکی شاری قەزوین قسەی پێدەکرێ. ئەم زاراوەیە لەو دەگمەن زاراوانەیە کە ڕێزمانی تایبەت بە خۆی هەیە و هەروەها ئەم زاراوەیە زۆر هاوشێوەی شێوەزارەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانە.[٢]

### ● سەردەم و هۆکاری ڕاگواستنی کورد بۆ قەزوین

سید محمدعلی لە کتێبی «مینودر یا باب الجنە قزوین» لەم بارەوە دەڵێ: دیار نیە کەی ئەم کوردانەیان بۆ ئەم سنوورە ڕاگواستوون. تەنانەت سەرۆك هۆزەکانیشیان نازانن لە چ سەردەمێك و بە چ هۆکارێك و لە چ ڕێکەوتێکدا بۆ ئەم ناوچەیەیان هێناون. هێندێکیان سەردەمی شا عەبباسی گەورە و ژمارەیەکیان سەردەمی نادرشای ئەفشار و گرووپێکیشیان سەردەمی چوونی خۆیان بۆ ئەو ناوچەیە بۆ سەردەمی ئاغا محەمەدخانی قاجار دەگەڕێننەوە. وا دیارە پێش سەردەمی قاجارەکان ڕاگوێزرابن کەوا گواستنەوەیان لە بیری کەسدا نەماوە، لە مێژوویەکیشدا ئاماژەی پێنەکراوە. لەحاڵێکدا ئەگەر لە سەردەمی ئاغامحەمەدخاندا بۆ ئەم ناوچەیەیان هێنابان، هەم لە بیرەوەری پیاوەکانیاندا دەمایەوە و هەم لە مێژووی قاجارەکاندا باسی دەکرا.[٣]

دوکتۆر وەرجاوەند لە پەرتووکی خۆیدا بە ناوی «خەڵکی قەزوین لە وڵاتی خۆیاندا» ئاوا دەڵێ: لەبەرئەوەی لەسەردەمی سەفەوییەکاندا کۆچ پێکردنی هۆزان بە شێوەیەکی بەرفراوان هەبوو، ڕەنگە کورد لەو سەردەمەدا بۆ قەزوین کۆچێنرابن. کورد لە سەردەمی شا عەبباسدا بۆ جاری یەکەمین بۆ قەزوین کۆچیان پێکراوە لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا ئۆزبەکەکان زۆرجار هێرشیان دەکردە سەر پایتەختی سەفەوییان.

کلیم اللە توحدی نووسەری کوردی خوراسانی لەم بارەوە دەڵێ: کوردەکانی قەزوین لە سێ سەردەمدا کۆچیان بۆو هەرێمە کردووە کە یەکەم جار ساڵی

١٥٨٨ی زایینی، لە سەردەمی شاعەبباس بوو کە ئۆزبەکەکان هێرشیان دەکردە سەر تاران، هەندێك لەو کوردانە بۆ وەرامین و هەندێکیان بۆ ئەلبورز و دەماوەند ڕاگوێزران و بەشێکیشیان لە قەزوین نیشتەجێ بوون.(٤)

ئەوەی زۆر باسی دەکرێ ئەوەیە کە «لە کتێبە مێژووییەکاندا زیاتر قسە لە دوو قۆناغ یان سەردەم دەکرێ، قۆناغێك لە سەردەمی شا عەبباسی سەفەوی کە شیمانەی ئەوەش دەکەن یەکەمین گرووپی کورد هەر لەو سەردەمەدا بۆ قەزوین ڕاگویزرابن و هۆکارەکەشی دروستکردنی قەڵخانێکی بەرگریی لە عێل و عەشیرەتە کوردەکان بوو لە بەرامبەر هێرش و دەسدرێژیی هێزە دەرەکییەکان و بە واتایەکی تر پاراستنی یەکپارچەیی خاك و بەردەوامیی دەسەڵاتداریێتیی شا عەبباسی سەفەوی بوو. لەلایەکی دیکەشەوە کۆچ پێکردنی کوردەکان دەبوو بە هۆی لاوازیی ئەوان لە ناوچە سنوورییەکان کە گوایە دەسەڵات و داخوازییەکانیان نیگەرانیی شا عەبباسی بەدوای خۆیدا هێنابوو. لە کتێبەکاندا باس لە ڕاگواستنی گرووپێکی دیکە لە کوردەکان بۆ قەزوین لە سەردەمی ڕەزاخاندا دەکرێ کە هۆکارەکەشی هەوڵی ڕەزاخان بوو بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی ناوەندگەرا (متمرکز) یان سیستەمێکی یەکدەست و یەك پێکهاتەیی کە دروست خاڵی بەرامبەری فیدرالیزمە. هێزە کوردەکانی جێگیر لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران بە چەشنێك هەڕەشە بۆ سەر حکومەتی ناوەندگەرای ڕەزاخان لەقەڵەم دەدران. بە لاوازکردنی هێزی کوردەکان لە ناوچە سنوورییەکان، ڕەزاخان هەوڵی دا ئاسایشی ئەو ناوچانە لەڕێگەی هێزەکانی ناوەندەوە دابین بکا.(٥)

وەك دەزانین «لە سەردەمی ڕەزاخاندا کوردی جەلالی هەرێمی ماکۆ لە کۆماری ئاراراتدا بەشداریان کردبوو. ڕەزاخان دووسەد و پەنجا بنەماڵەی ئەوانی بۆ ئەردەبیل و پاشان بۆ لای قەزوین دوور خستنەوە کە هێندێك لە

سەرچاوەكان دەڵێن ٥٠٠ بنەماڵە بوون و لە ساڵی ١٩٣٠دا دوای هەڵایسانی كۆماری ئارارات دوور خراونەوە. هێندێك لەو كوردانە لە ڕێگەدا ژیانیان لەدەست دابوو. پڕایی هۆزەكانی ئەو سەردەمە هۆزی جەلالی و ژێرهۆزەكانی خەلەكانلوو و جلیكانلوو و وەخكانلوو، شێخكانلوو، ساكان، گولیكانلوو، بروكیملان، قەغكانلوو، حیدرانلوو، قزلباش، خەلەجی، زیلانی بوون.

ڕەزاخان دوای كۆچ پێكردنی ئەو كوردانە هەر پێنج بنەماڵەی كوردی لە گوندێكی فارس و گوندێكی توركدا نیشتەجێ دەكردن هەتا بەم شێوەیە كوردایەتییان لەبیر بەرێتەوە. دوای بەرخۆدانی دژی دەولەتی لە ساڵی ١٣٢٠دا گەلێك لەو كوردە جەلالییانە گەڕانەوە كوردستان و هێندێك لەوانیش چوونە قەزوێن. ناوچەیەك لەناو شاری قەزوێندا شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو كوردە جەلالییانەیە. هێندێكیشان لە ناوچەی «بۆئین زەهرا»دا ژیان بەسەر دەبەن.(٦)

لە باكووری پارێزگای قەزوین و باشووری پارێزگای گیلان لە ناوچەگەلێكی وەك عمارلو و كلیشم و جیرندە و چەندین ئاوایی دیكە و هەروەها ژمارەیەك لە تایفەكانی ڕەشوەند نزیك بە ٨٠٠ بنەماڵە لە پارێزگای قەزوین و شارستانی ڕوودبار و دەوروبەری چۆمی شاهرود نیشتەجێن كە هەموویان لە ساڵی ١٠٠٧ی كۆچی هەتاوی لە كاتی كۆچكردنی مێژوویی كوردەكان بۆ خوراسان لەلایەن شا عەبباسی سەفەوی، لەم ناوچەیە نیشتەجێ كران كە بە گشتی كوردی كرمانجن و لە ئێستادا نزیك بە ٢٠٠٠ خێزان دەبن و بە زمانی كوردی قسە دەكەن. هەروەها نزیكەی ٢٠٠ بنەماڵەی كورد لە سەردەمی ڕەزاشا لە شارستانی ماكۆ بۆ قەزوین ڕاگوێزران كە ئەوانیش كرمانجن.(٧)

## • شوێنی ژیانی پێشوویان (پێش کۆچ پێکردنیان)

لـە پێوەندیـی لەگـەڵ ئـەوەی کوردەکانـی قەزویـن سـەر بـە کام ناوچەکانـی کوردسـتانن دەبـێ بڵێین ئـەو کوردانەی بۆ قەزویـن ڕاگوێـزراون، بەپێچەوانەی ئەو کوردانـەی کـە بـۆ ناوچەکانـی دیکـەی ئێـران کۆچیـان پێکـراوە، بـە هـۆی ئەوەی کـە لـە هـۆز و تایفـەی جۆراوجـۆر پێـك هاتـوون و فرەچەشـنیی زمانـی و ئایینیان لەنێـودا هەیـە و دوورخسـتنەوەکەش لە قۆناغگەلـی مێژوویی جۆراوجـۆردا بەڕێوە چـووە، هـەر بۆیـە بە ئاسـانی و لە ڕسـتەیەکدا ناتوانـرێ بڵێی بۆ نموونـە کوردەکانی قەزویـن لـە بنەڕەتدا سـەر بـە فلان ناوچـە لە کرماشـان، یان ئیـلام یان لوڕسـتان یان کوردسـتانن. شـوێنی نیشـتەجێبوونی سـەرەکیی هـەر تایفەیەکـی کورد لـە قەزوین دەبـێ بـە جیـا باسـی بکـرێ و قسـەی لەسـەر بکـرێ. بـۆ نموونـە هۆزەکانـی ***مافی* و *کاکاوەنـد*** کـە بـە زمانـی هەورامـی قسـە دەکـەن، بێشـك دەبێ سـەر بـە ناوچەی هەورامـان بـن کـە لە پارێزگاکانی کوردسـتان و کرماشـان هەڵکەوتـووە. یان **هۆزی چگینـی** لـە قەزویـن و ناوچـەی تارمـی خـواروو کـە بـە زمانـی لـوڕی دەپەیڤـن، شـوێنی سـەرەکیی ژیانی پێشـوویان پارێزگای لوڕسـتان، شارسـتانی دوورە، بەشـی ویسـیان بـێ. هەرچەنـد بێجگـە لـە لوڕسـتان، چگینیـەکان لەپارێزگاکانـی ئیـلام، خوزسـتان، مەرکـەزی، فـارس و تەنانـەت پارێزگاکانـی خوڕاسـان و گیلانیش ژیان بەسـەر دەبـەن. یـان بـۆ نموونـە ***هـۆزی «غەیاسـوەند»ی*** قەزوین کـە زۆربەیـان بە زمانی لەکی قسـە دەکەن، شـوێنی ژیانیان لە پێشـدا سـێ پارێزگای ئیلام، لوڕسـتان و کرماشـان بـووە. غەیاسـوەندەکان لـە پارێـزگای ئیـلام لـە دەرەشـار، دێهلـۆران و ئابدانـان ژیـان دەکـەن. لـە پارێـزگای لوڕسـتان لە خـوڕەم ئابـاد، مەلاییـر، نەهاوەند و پۆلدوختـەر نیشـتەجێن. لـە بابـەت هۆزەکانی دیکـەی کـوردی قەزوینیش دەبێ بـەم شـێوەیە بـاس بکـرێ.[٨] لـە باسـی هـۆزە کوردەکانـی نیشـتەجێی قەزوینـدا بـە کورتـی ئامـاژە بە شـوێنی ژیانـی پێشـووی ژمارەیـەك لـەو کوردانە کـراوە.

- **شوێنی ژیانی ئێستایان**

کوردەکانی قەزوین تەنیا لە یەك ناوچەدا نیشتەجێ نین، بەشێکیان لە ناوچەی تارمی خواروو ژیان بەسەر دەبەن، هێندێکیان لەنێوان قەزوین و ئابیەك و لە دەشتی بۆئین زەهرادا نیشتەجێن و ژمارەیەکیشیان لەناو شاری قەزویندا ژیان دەکەن. بە شێویەکی گشتی «کوردەکان لە قەزوین لە هەرێمی تارەم، قاقزان، دوودانگە، روودبار، ئەلەموت، کوهپایە، بەشاریات، پشت گەدێ، و هەرێمیکیش لەناو بازاردار بە ناوی ئومەرپهادا بڵاو کراونەوە. کوردی ئەو ناوچەیە بۆ چەند ساڵان دەچوونە کوێستانان، کوێستانەکانیشانیان لە هەرێمی قاقزان، دەورویەری قەزوین و رەشت و بەربناری ئەلبۆرز و تارەم و دەرویەری چۆمی شاهرود و هەرێمێك بە ناوی عمالودا بوون. زۆرجار هەندێك لە کوردەکان وازیان لە کوێستانەکان دێنا و لە گوندەکان و ناوشاری قەزویندا بە شێوەیەکی یەکجاری نیشتەجێ دەبوون.

لە کتێبی سەرداری قەزویندا هاتووە: ژمارەیەکی بەرچاو لە **چگینیان**، لە قاقزان، ئیقبال و هەروەها لە تارمدا نیشتەجێن و هێندێکیشیان ئاژەڵدارن و لە دەورویەری چەمی شاهرودێ دەژین.

**جەلیلوەند** هۆزێکی دیکە گەورەی بازێری قەزوینە، کە لە ژێر هۆزی زەندا حیساب دەکرێ، ئەو بە کوردی کەلهوڕی قسە دەکەن و لە هەرێمی قاقزان نیشتەجێن. هێندێك لەو گوندانەی کە جەلیلوەندی کەلهوڕ تێیاندا نیشتەجێن بریتین لە: گوندی باشگل، قەرەباز، یەنیجێی ژێری. جەلیلوەند لەنێو شاری قەزویندا زۆرە بەڵام بە گشتی لە گوندەکانی ئاخچەکەند و باشتیەل و قەرەباغ و یەنیجێی خوارووا ژیان دەکەن.

***هۆزی کاکاوەند:*** ئەم هۆزە لە گوندەکانی هەرێمی قاقزان دەژین و زیاتر بە کاری ئاژەڵدارییەوە خەریکن.

**هـۆزی چمشـگەزك:** چـوار سـەد هەتـا پێنجسـەد بنەماڵـە دەبـن کـە هێندێـك لـەوان لـە بازاری قەزوین دەژیـن و ئەو گوردانە پێش کۆچ پێکـردن لە ئازەربایجان و قەفقـاز بـوون و بـە زاراوەی کرمانجی قسـە دەکەن.

**هۆزی یەمەنی:** ئەو هۆزە لە گوندی ئالن قاقایێ دەژین کە دووسەد ماڵبات دەبن.

**هـۆزی وەلیـاری:** لـە گوندی کەلـج یان تارمـێ دا دەژیـن. کە دووسـەد بنەماڵە دەبن.

هـۆزی *کرمانـی*: لـە گونـدی لولجـرد یـان مالـی ئابـاد دەژیـن و نزیکـەی ٨٠ بنەماڵـە دەبـن.

**هۆزی ڕەشوەند:** لە دەوروبەری ڕوودباردا نیشتەجێن.[٩]

سـید محمدعلـی لـە کتێبـی «مینـودر یـا بـاب الجنـە قزویـن» لـەم بـارەوە دەڵێ: سـەرجەم هۆزە کوردەکان لە ئاواییەکانی سـەر بـە تارەم، قاقزان، دودانگـە، ڕوودبار، ئەلەمـووت، کوهپایـە، فشـاریان، فشـگلدەرە نیشـتەجێ کـراون. لەگـەڵ ئەوەشـدا ژمارەیەکیـش گەرمێـن ــ کوێسـتان دەکەن. زسـتانان لـە تـارەم و لێوارەکانی چۆمی شـاهرود و خاکـی عمارلویە و هاوینانیش بـۆ قاقزان و دەروبەری جادەی ڕەشـت و و داوێنـی ئەلبـورز و... دەچن.

گەڕەکـی کوردەکان، لە شـەقامی نەوابی باشـووری شـاری قەزوین لە حاشـیەی باشـووری ڕۆژئـاوای شـاری قەزویـن هەڵکەوتـووە و تێیـدا نزیکـەی ٦٢ بنەماڵـە (٤٠٠ تـا ٥٠٠ کـەس) لـە کوردە سـوننییەکان نیشـتەجێن. ئەم کەسـانە لە سـەردەمی ڕەزاشـادا لـە ماکـۆی ئازەربایجانـی ڕۆژئـاواوە کۆچێنـراون و بەرەبـەرە هاتوونەتـە قەزویـن و ئـەم گەڕەکەیـان پێـك هێنـاوە.[١٠]

## • هۆزە کوردەکانی نیشتەجێی قەزوین و دەوروبەری

هێندێك لە هۆزەکانی قەزوین و دەروبەری بریتین لە بێهتوویی، باجەلان، پاپلی، چگینی، جەلیلوەند، ڕەشوەند، غەیاسوەند، کاکاوەند، کرمانی، مافی، شکاك و جەلالی. حەشیمەتی هۆزی چگینی و غەیاسوەند لە کوردەکانی دیکە زیاترە.

**هۆزی چگینی:** لە کتێبی سەرداری قەزویندا هاتووە: ژمارەیەکی بەرچاو لە چگینیان، لە قاقزان، ئیقبال و هەروەها لە تارمدا نیشتەجێن و هێندێکیشیان ئاژەڵدارن و لە دەوروبەری جەمی شاهرودێ دەژین.

مەردوخی کوردستانیش لەسەر چگینیان ئاوا دەڵێ: چگینی هۆزێکی گەورەی کوردانن کە جوانمێر و مێرخاسیان لەناودا هەبوون و ئەو هۆزە لە هەرێمی کەرکوك و سلێمانی و تەنانەت بەغدایەشدا ژیان بەسەر دەبن. شەرەفخانی بدلیسی لە شەرەفنامەدا دەڵێ: چگینی هۆزێکی مەزنە و لەوێ تایفێدا زۆر مرۆڤی عەگید و جسوور هەبوون. سەرۆك هۆزەکانیان زۆرجار دەستیان بۆ سەر هۆزەکانی دیکە درێژ دەکرد و زۆرجار شکایەت لەسەر وان دەچوو بۆ لای شاتەهماسب و شاتەهماسبیش داوای لێدەکردن چیتر ئەو کارە نەکەن بەڵام دووبارە دەیانکردەوە. شاتەهماسب فەرمانی دا دەریان بکەن بەڵام کوردی چگینی دەڵێن لە ئێران ناچنە دەرەوە و لەئاکامدا شاتەهماسب کۆچیان پێدەکا و دەڵێ هەرکەس دژایەتی ئەو کۆچ پێکردنە بکا، ئەمن دەیکوژم. هەربۆیە ٥٠٠ سەرۆك هۆزی چگینی هاوبەندییەك پێك دێنن و لە ڕێگەی خۆراسانەوە دەچنە خوزستانێ. لە ناودارەکانی ئەو سەردەمی چگینی دەتوانین ئاماژە بکەین بە ئاغا سوڵتانی چگینی، ئاغا خانی چگینی، حەسەن عەلی چگینی، سەفەر قولی بەگی چگینی، زەکەر چگینی، بوداقخانی چگینی، ئیسماعیل قولیخانی چگینی بکەین. چگینی قەزوینێ چەند لقن کە بە هەموانیان دەڵێن چگینی، بەهادیوەند، بابایی، پیروەند، پیرقولیوەند، تاچناری، خنکالی، درویشوند، کەلوەند، کەوگیر، گودەرزوەند، کەفگیر، موختاروەند، نیزامیوەند و ... چەند لقی دیکەش هەن

کە هەموویان بە چگینی ناسراون. هەندێکیان لە هەرێمی قاقزان و ئیقبال و تارەمدا نیشتەجێ دەبن.

**هۆزی *غەیاسوەند*: محمدعلی گلریز لەبارەی هۆزی غەیاسوەند ئاوا دەنووسێ: لە سەردەمی ئاقامحەمەدخاندا ٤٠٠ خێزانی ئەو هۆزە بە سەرکردایەتی خەلەف لە کرماشان و لۆرستانەوە بۆ قەزوین کۆچیان پێکرا. حەشیمەتی هۆزی غەیاسوەند هەزار هەتا هەزاروپێنسەد خێزان دەبن. لە پیاوە گەورەکانی ئەو هۆزە دەتوانرێ ئاماژە بکرێ بە حاجی سالاری حشمەت، عزەتوڵڵا غەیاسوەند.**

هۆزی *جەلیلوەند*: جەلیلوەند هۆزێکی گەورەی قەزوینە کە وەك هۆزێکی **سەر بە زەند لەقەڵەم دەدرێت، ئەو بە کوردی کەلهوڕی قسە دەکەن و لە هەرێمی قاقزان نیشتەجێن. هێندێك لەو گوندانەی کە جەلیلوەندی کەلهوڕ تێیاندا نیشتەجێن بریتین لە: گوندی باشگل، قەرەباز، یەنیجێی خواروو. نزیکەی سێسەد خێزان دەبن. ئێدمۆندی ئینگلیزی لە سەفەرنامەکەی خۆیدا دەنووسێ کە جەلیلوەند هۆزێکی گەورەی کوردانە، هەروەها لە «مجمع التواریخ گلستان»دا هاتووە کە جەلیلوەند لەم تایفە سەرەکییانە پێکهاتووە: ئەحمەدوەند، بێهتوویی وەند، جەلیلیوەند، زوێروەند، نانکلی وەند، بوجوری وەند، کاکاوەند، قولی عەلی وەند، خاجەوەند، مافی وەند، قۆریە وەند و خەلیلوەند. لە سەردەمی قاجارەکاندا ئەو هۆزە لەژێر فەرمانی قەنبەرعەلی خانی سەعدەلدولە دا بوون. جەلیلوەند لە شەڕی هەراتد بەشدارییان کرد و لە سەردەمی مەشروتەدا سەرۆکەکەیان خوسرەوخان بوو. قەنبەرعەلی خانی سەعدەلدولە و خوسرەوخان و هاوژینەکەی بە ناوی خانم تاج الملوك لە مرۆڤە ئازاکانی ئەو هۆزە بوون. ئەو خانمە لە شەڕاندا بەشداری دەکرد و فیشەکدانی لەخۆ دەبەست و بە هۆی ئەوەشەوە خوسرەوەخان ئەوەندەی دیکەش بەناوبانگ ببوو. جەلیلوەند لەنێو شاری قەزویندا زۆرە بەڵام بە گشتی لە گوندەکانی ئاخچەکەند و باشتییەل و قەرەباغ و یەنیجێی خوارووداژیان دەکەن.**

**هۆزی باجەلان:** منوچهری ستوودە لە نووسینەکەی خۆیدا بەم شێوەیە باسی وان دەکا: باجەلان یەك لە هۆزە مەزنەکانی کوردن کە لە شاری قەزوین نیشتەجێن و ئەو ئێلە لە دوو گوندی ئیسماعیل ئاباد و نادرئاباد دا نیشتەجێن و نزیکەی ١٠٠ بنەماڵە دەبن.

**هۆزی مافی:** ئەم هۆزە لە قەزوێن نیشتەجێن و لەو هەرێمانەدا دەژین: باقرئاباد، حاجی تەپە، حوسێن ئابادی رۆکنا و حوسێن ئابادی مافی. حەشیمەتەکەیان نزیکەی ٦٠٠ خێزان دەبێ. لە پیاوە مەزنەکانی ئەو هۆزە دەکرێ ئاماژە بە حوسێن قولیخانی یزامولسەڵتەنە و محمد حسن خان سعدالملك، حیدرقلیخانی برهان الدوله، میرزا مەهدی خانی سەعدولمولوك و میرزا هاشم بکرێ.

**هۆزی کاکاوەند:** ئەم هۆزە لە گوندەکانی هەرێمی قاقزان دەژین و زیاتر بە کاری ئاژەڵدارییەوە خەریکن. حەشیمەتی ئەو هۆزی ئێستاکە نزیکەی هەزار بنەماڵە دەبێ. سەرۆکی ئەو هۆزە لە سەردەمی مەشرووتەدا مەسیح خانی کاکاوەند بوو. ئەو هۆزە ئەهلی حەق یان یارسانن. لە مەزنەکانی ئەم هۆزە دەکرێ ئاماژە بە مەسیح خان، ئەحمەدخان و هەروەها عەبدولقاسم خانی کاکاوەند بکەین. سەرۆك هۆزەکانی کاکاوەند بە گشتی لەنێو قەزویندا نیشتەجێ بوون کە ئێستاش لەوێ دەژین.

**هۆزی چمشگەزك:** چوار سەد هەتا پێنجسەد بنەماڵە دەبن کە هێندێك لەوان لە بازاری قەزوین دەژین و ئەو کوردانە پێش کۆچ پێکردن لە ئازەربایجان و قەفقاز بوون و بە زاراوەی کرمانجی قسە دەکەن.

**هۆزی ڕەشوەند:** لە دەوروبەری ڕوودبار دانیشتەجێن. محمدعلی گلریز لەسەروان دەنووسێ: هۆزی ڕەشوەند یەکێك لە هۆزە مەزنەکانی کوردانن کە لە قزوین دەژین و بەزاراوەی کرمانجی قسە دەکەن. ڕەشوەند لە دوو پەیڤی ڕەشمە و بەند پێك دێ کە کە ڕەشمە لە کرمانجیدا واتە تەناف و پێشتر وەك کەمەر دەیانهاویشتە پشتی خۆ. لە هۆزەکانی دیکە دەتوانین ئاماژە بە هۆزەکانی بێهتوویی، یەمەنی، وەلیاری و کرمانی بکەین.[11]

لە لاپەڕە ٢٧ی کتێبی «ایل ها و طایفەهای عشایری کرد ایران» بەم شێوەیە باس لە هۆز و تایفە کوردەکانی قەزوین کراوە:

« تایفە کوردەکانی قەزوین لەم ناوچانەدان: تارەم، قاقزان، ڕوودبار، ئەلەموت، داوێنی بشکلارە. ئەم تایفانە لە سەردەمی سەفەوییە و ئەفشارییەکان بۆ ئەم ناوچانە ڕاگوێزراون کە بریتین لە:

باجەلان، پاپلی، چگینی، جەلیلوەند، ڕەشوەند، غەیاسوەند، کاکاوەند، مافی، بێهتویی، کرمانی، بەمەنی، وەلی یاری.

کوردەکانی ئەم ناوچەیە خەریکی کاری ئاژەڵداری و وەرزێرین. ئاژەڵدارانی ئەم تایفانە لەنێوان ناوچەی قاقزان و دەوروبەرەکانی جادەی قەزوین، ڕەشت و لە داوێنەکانی ئەلبورز و تارمی قەزوین و لێوارەکانی چۆمی شاهرود و خاکی عمارلوودا گەرمێن و کوێستان دەکەن...

***تایفەی چگینی:*** ئەم تایفەیە بریتیە لە تیرەکانی بەهاریوەند، پاپائی، پیرەمەردوەند، کلوەند، گودەرزوەند، موختاروەند، نیزامی وەند، ڕەشوەند، میرخاند، پاچناری، خەرکانی، پیرقولی وەند، گوگیر، مال ئەمیر کە لە ئاوایییەکانی ئیقباڵ، قاقزان و تارمی قەزویندا نیشتەجێن. حەشیمەتی چگینییەکان نزیکەی نۆسەد بۆ هەزار بنەماڵە دەبێ.

***تایفەی جەلیلوەند:*** ئەم تایفەیە لە دێهستانی قاقزان نیشتەجێن. حەشیمەتیان نزیکەی ١٥٠ بۆ ٢٠٠ خیزان دەبن. ( دیارە مەبەست لەم ژمارانە کاتی نووسینی کتێبەکەیە کە نزیکەی سی ساڵ لەمەوبەرە. س. م )

***تایفەی مافی:*** ئەم تایفەیە نزیکەی ٢٠٠ بۆ ٢٥٠ بنەماڵەیە و لە ئاوایییەکانی دێهستانی بشاریات، میانکوهی قەزوین (فشگلدەرە) نیشتەجێن. ئەم تایفەیە گەلێك کەسی کارزان و زانای وەك حوسێن قولیخانی نیزامولسەڵتەنە و محەمەد حەسەن خانی سەعدولمولوك لێ هەڵکەوتوون.[١٢]

### • ئینتمای نەتەوەیی و هەستی کوردایەتی لای کوردەکانی قەزوین

بێگومان لە ڕۆژگارە جیاجیاکاندا تەواوی هەوڵی دەسەڵاتدارانی حاکم بەسەر ئێراندا ئەوە بووە کە کوردەکانی قەزوین لە ڕەگ و ڕیشە و خاك و خەڵکی خۆیان داببڕن و لەنێو خەڵکی ناوچەکانی دیکەدا بیانتوێننەوە. هەر لە سەردەمی ڕەزاخاندا کاتێك کوردەکانی بۆ ناوچەی قەزوین ڕاگواستن، دوای کۆچ پێکردنیش هەر پێنج بنەماڵەی کوردی لەگوندێکی فارس و گوندێکی تورکدا نیشتەجێ کردن بۆ ئەوەی بەم شێوەیە کوردایەتییان لەبیر بەرنەوە. لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێرانیش لەگەڵ ئەوەی کوردەکانی قەزوین ڕۆڵی بەرچاویان لەو شۆڕشەدا هەبوو، بەڵام ...!! لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ تێپەڕینی ڕۆژگار و زۆرداریی دەسەڵاتداران توانیبێتی هەستی کوردایەتی لە دەروونی کوردەکانی ئەو شوێنەدا بە یەکجاری بکوژێنێتەوە، لانیکەم بەشێکی زۆریان ئێستاش دڵیان بۆ نیشتمانی دایك هەر لێدەدا. ئەوەتا خانمە ڕۆژنامەنووسی کوردی قەزوین، سووسەن محەمەدخانی غەیاسوەند بەم شێوەیە لەم بارەوە دێتە ئاخاوتن:

« ئینتیما بۆ نیشتمانی دایك لەنێو کوردەکانی قەزویندا زۆرە. کوردەکانی قەزوین خۆشحاڵی خۆیان بە دیتنی کوردێکی خەڵکی کرماشان یان پارێزگای کوردستان هەرگیز ناشارنەوە. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی فیلمێك یان ئاهەنگێکی کوردی لە تەلەویزیۆن یان دیتنی وێنەگەلێکی کوردستان بە ئاسانی دەتوانرێ شادیی لە ڕووخساریان بەدی بکەی. سەردانی شوێنە سەرنجڕاکێشەکانی کوردستان ئێستاکەش یەکێك لە بەرنامەکانی سەفەرەکانیانە. هەنووکەش ڕێوڕەسمەکانیان بە ئاهەنگ و ئاوازە کوردییەکان و دەنگی گۆرانیبێژە کوردەکان وەجۆش دەخەن. بەڵام لەبەر ئەوەی کوردەکانی قەزوین بە گشتی لە

ناوچەیەکدا نیشتەجێ نین، بەو پێیە خۆشەویستیی و ئینتما بۆ نیشتمان و کولتوور و شوناسی کوردییش لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازە. بۆ نموونە کوردەکانی جەلیلوەند لە قەزوین بە هۆی پێکەوەژیانیان لەگەڵ تورکەکان، زمانەکەیان گۆڕاوە و بە تورکی قسە دەکەن. لە بەرامبەردا هێندێك تایفە و هۆزی دیکە هەن کە ئێستاکەش تەنانەت جلوبەرگی ناوچەیی خۆشیان پاراستووە و هەروا کەڵك لەو جلوبەرگە وەردەگرن. بەڵام تایفەی دیکش هەن کە لەوانەیە ئەمڕۆ نەزانن جلوبەرگی خۆیان بە چ شێوازێك و چ جۆرێکە.

کوردەکانی قەزوین هەرچەند مەودایان لەگەڵ زمان و کولتووره باوەکانی ئەم شارە زیاتر بووبێ، کەمتریش چوونەتە ژێر کاریگەرییان و هەر بەم پێیەش تا توانیویانە کولتوور و شوناسی خۆیان پاراستووە. بەڵام هەرچەند ڕادەی ئەم پێکەوەژیانە زیاتر بووە، سروشتییە زیاتر چوونە ژێر کاریگەریی ئەو کولتوور و زمانانە و کەمتریش بایەخیان بە شوناس و کولتووری خۆیان داوە. واتە لە ناوچە جیاوازەکان، ئەم ڕادەی ئینتیمایە جیاوازە. لەگەڵ هەمووی ئەوانەشدا ئەمڕۆ لە قەزوین هێندێك کوردمان هەن کە بە گۆڕینی ناوبانگی خۆیان دەیانەوێ شوناسی کوردیی خۆیان بشارنەوە. یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکان ئاسیمیلاسیۆنی کولتووری و ڕەگەزییە کە کوردەکانی قەزوین هەر لە سەرەتای گەیشتنیان بە ناوچەی قەزوین بە هۆی هۆکارگەلی سیاسییەوە لەگەڵی ڕووبەڕوو بوونەوە. بە زمانی زگماکی نەیانخوێندووە و فێری نووسین و خوێندنەوە نەبوون...کەوایە بێشك کوردەکان بە شوناسی خۆیان نامۆ دەبن و بەرەبەرە لەبابەت زمانی زگماکیی و کولتووری کوردی تووشی گرفت دەبن. جێکەوتنی ئەم کولتوورە هەڵەیەش کە قسەکردن بە زمانی ناوچەیی جۆرێك ئاست نزمیی و دواکەوتوییە، بۆتە هۆی ئەوەی بە تایبەت لە نێو وەچەی نوێی کوردەکان، زمانی کوردی تەنیا لە نێو چوار دیواری ماڵ یان ئەوپەڕەکەی لە کاتی میواندارییەکی خێزانیدا قسەی پێبکرێ. واتە ئەگەر کوردەکانی قەزوین هەتا ئەمڕۆ

بە هەر چەشنێك زمان و کولتووری خۆیان پاراستووە بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا کۆمەڵە هۆکارێك دەستیان داوەتە یەك بۆئەوەی هێندێك لە کوردەکانی قەزوین بە دوورکەوتنەوە لە زمان و شوناسی کوردی وەپێش یەکتر بکەونەوە.(١٣)

بێگومان ساڵەها دوورکەوتنەوە لە زێد و نیشتمانی دایك، نزیکبوونەوە و تێکەڵاویی لەگەڵ قەوم و نەتەوەکانی دیکەی قەزوین و لە هەمووان گرنگتر زوڵم و ناحەقییەك کە رێژیمە یەك لە دوای یەکەکانی دەسەڵاتدار بەسەر ئێراندا دەرحەق بەم کوردە دوورخراوانە کردوویانە، هۆکارن بۆ ئەوەی ئەوان لە زۆر لە باس و بابەتەکانی پێوەندیدار بە کوردستان بێئاگا بن. ئەگەرچی لەم ساڵانەی دواییدا بە هۆی هاتوچۆکردنیان بۆ هێندێك لە پارێزگا کوردنشینەکان و لە رێگەی فەزای مەجازی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەك فەیسبووك، و تویتێر و ... تا رادەیەك شارەزای باس و بابەتەکانی هاونەتەوەکانیان لە پارێزگاکانی دیکەی ئێران بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی هەموو کوردە نیشتمانپەروەرەکانی ناوە و دەرەوەی وڵات، و بە تایبەت چالاکانی مەدەنی نێوخۆیە کە تا ئەو جێگەیەی دەتوانن لە هەموو رێگەیەك بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ کوردەکانی قەزوین و هەموو ئەو شار و هەرێمانەی کوردی دوورخراوە لە نیشتمانیان تێدا دەژین، هەوڵ بدەن.

لە کۆتاییدا دەڵێین ئەگەرچی سەدان ساڵە ئەم کوردانە تووشی ڕاگواستن و دوورخستنەوە بوون و لە زێد و هاونیشتمانیان دابڕاون، بەڵام بێشك خەڵکێك کە توانیبێتی لەم ماوە دوور و درێژەدا بەرگەی ئەم هەموو نەهامەتیانە بگرێ، ئەوا سەدان ساڵی تریش هەستی نیشتمانپەروەری و عەشق بە زێدی باب و باپیران لە دەروونیاندا دانامرکێ و نامرێ.

## • سەرچاوەکان:

١. شریفی، محمود، نگاهی اجمالی به وجعیت کردهای قزوین در مصاحبە با سوسن محمدخانی غیاثوند، وەرگیراو لە ماڵپەڕی ڕۆژهەڵات تایمز.
٢. ویکیپیدیای فارسی.
٣. س.پ.
٤. کۆچبەرێن کورد، تەلەویزیۆنی تیشك /بەرنامەی «کۆچبەرێن کورد» ٢٠١٣.
٥. شریفی، محمود، س.پ.
٦. سەرچاوەی ژمارە ٤.
٧. www.wikipg.com
٨. شریفی، محمود، س.پ.
٩. سەرچاوەی ژمارە ٤.
١٠. سەرچاوەی ژمارە٢.
١١. سەرچاوەی ژمارە ٤.
١٢. میرنیا، سیدعلی، ایل ها و طایفەهای عشایری کرد ایران، نسل دانش، تهران، ل٢٧)
١٣. شریفی، محمود، س.پ.

## سێیەم

## کوردەکانی قوم

- چەند زانیارییەك لەبارەی پارێزگای قوم
- عێل و تایفە کوردەکانی قوم و دەوروبەری
- سەرچاوەکان

خوێنەری خۆشەویست، سەبارەت بە کوردەکانی قوم هیچ سەرچاوەیەکی تێروتەسەلتر لە کتێبی ( تاریخ سیاسی کرد و کردهای قم ) واتە «مێژووی سیاسیی کورد و کوردەکانی قوم» لەبەردەستدا نەبوو بۆ ئەوەی زانیاریی زیاتر سەبارەت بەم بەشە لە هاونەتەوەییەکانمان لەو ناوچەیەی ئێران پێشکەش بکرێ. هەربۆیە بێجگە لەو چەند دێڕە زانیارییەی کە لەبارەی پارێزگای قومەوە لە ماڵپەڕی ویکیپدیای فارسی وەرگیراون و چەند پەراوێزی کۆتایی ئەم بەشە، سەرجەم بابەتەکانی دیکە لەو کتێبە وەرگیراون.

- **چەند زانیارییەك لەبارەی «پارێزگای قوم»**

پارێزگای قوم لە باشووری پارێزگای تاران، باکووری پارێزگای ئیسفەهان،

ڕۆژهەڵاتـی پارێـزگای مەرکـەزی و ڕۆژئـاوای پارێـزگای سـمنان هەڵکەوتـووە و ناوەندەکەشـی شـاری قومـە.

بـە شـێوەیەکی مامناوەنـدی پارێزگای قـوم ٩٣٠ میـتر بەرزتر لە ئاسـتی دەریایە. نزیکـەی چواریەکـی ڕووبەری ئەم پارێزگایە ناوچەی کوێسـتانی و بـەرز و ئەوەی دیکـەی دەشـتە و کەشـوهەوایەکی گـەرم و وشـکی هەیـە. ڕووبەرەکـەی نزیکەی ١٤٦٣١ کیلۆمەتـری چوارگۆشـەیە و بـە پێـی دوایین دابەشـکاریی نێوخۆیی وڵات لـە سـاڵی ١٣٧٥، ناوەندەکـەی شـاری قومـە و تەنیـا شـاری سەرەکیشـیەتی. لـە ئێسـتادا پارێـزگای قـوم لـە٦ شـار، پێنـج بەخـش، دە دیهسـتان و ٣٦٣ گونـد پێـك هاتـووە. بەخشـەکانی بریتیـن لـە: بەخشـی مەرکـەزی، جەعفەرئابـاد، خەلجسـتان، کەهـەك (کوهـەك) و سـلفچگان. هەروەها شـارەکانی بریتیـن لە: قـوم، جەعفەرییە (گازرانـی پێشـوو)، دەسـتجرد، سـەلفچگان، قەنەوات(حاجـی ئابـادی لەکەکانـی پێشـوو) و کوهەك.

حەشـیمەتی شارسـتانی قـوم لـە سـاڵی ١٣٨٥ ی هەتـاوی (٢٠٠٦ی زایینـی)، ٩٥٩،٨٥٢ کـەس بـووە کـە لـە سـەدا ١٦/٩١ی خەڵکەکـەی لـە شـارەکاندا دەژیـن. شـایانی باسـە خەڵکێکی زۆر وەك کۆچبـەر ڕوویان لەم پارێزگایە کـردووە و لەوێ نیشتەجێ بوون.

بەپێـی ڕاپرسـییەك کـە سـاڵی ١٣٨٩ی هەتـاوی لەسـەر پێشـنیاری شـووڕای فەرهەنگـی عمومـی ئەنجـام دراوە، ئەم قەومانە لە قومدا نیشـتەجێن: فـارس، تورك، کـورد، عـەرەب، بەلـووچ، لـوڕ، شـومالی (گیلـەك، مازنـی، تالشـی و تورکەمەن).

پێویسـتە بگوتـرێ هـۆکاری پڕبایـەخ بوونـی ئـەم شـارە بـۆ بوونـی ئارامگـەی حەزرەتـی مەعسـومە (ع)، زیارەتگـەی شـێعەکان و هەروەهـا ناوەنـدی فێرکردنـی زانسـتە ئایینیـەکان (حـوزە علمیّـە)ی ئـەو شـارە دەگەڕێتـەوە.

### • عێل و تایفە کوردەکانی قوم و دەوروبەری

ئەو هۆز و عەشیرەتە ناسراوانەی کە لە قوم نیشتەجێن، بێجگە لە چەند تایفەیەکیان هەموویان ئەو تایفانەن کە لە شیراز و ناوچەکانی دیکەی وەك کرماشان، ئیلام، لوڕستان و ... بۆ قوم ڕاگوێزراون. ئەم تایفانە خزم و کەسانی نزیکی تایفەی زەند بوون کە دوای لێك هەڵوەشانی زنجیرەی زەندییە بە فەرمانی دەسەڵاتدارانی قاجار لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ کران.

لە زۆربەی کتێبەکان لە ناساندنی تایفەکانی نیشتەجێی قوم کورتە ئاماژەیەك بە هۆکاری هاتنی ئەوان بۆ ئەم ناوچەیە کراوە بەڵام زۆر بە قووڵی باسی وردەکارییەکانیان نەکردووە.

ئەفزەلولمولکی کرمانی لە کتێبی (مێژوو و جوگرافیای قوم)دا لە باسی ناساندنی هۆز و عەشیرەتەکانی قوم کە زیاتر مەبەستی عێل و عەشیرەتەکانی دەوروبەری قوم بووە، ئاماژەی بەوە کردووە کە هەموویان لەناو کۆمەڵەی ئەو تایفە کوردانە دان کە لە ناوچە جیاجیاکانی پارێزگای قوم نیشتەجێن. ناوبراو بێجگە لە ناساندنی ئەم تایفانە وەسفی حاڵ و ڕوحیە و چۆنیەتی ژیانی ئەم تایفانەی کردووە و دەڵێ حەشیمەتیان بیست و پێنج هەزار و حەوتسەد و پەنجا کەسە.

لە درێژەی ئەم بابەتەدا دەڵێ:

... بەڵام عەشیرەتەکانی دارولئیمانی قوم بنەچەکەیان لە وڵاتی فارسە، لە سەردەمی خاقانی شەهید ئاقامحەمەدخانی گەورە ئەوانی ڕاگواستووە و لە قوم نیشتەجێبوون. ئەوانە حەوت تایفەن کە بە بەشێك لە زەند دێنە ئەژمار و هەر دەستەیەك بە ناوێکی جیاواز ناسراوە.

هەریەك لەو تایفانە بوونە خاوەنی مەڕو ماڵات و حوشتر، هەندێکیان لەناو خودی شاردا نیشتەجێ بوون و لە گوندەکانی دەوروبەر کشتوکاڵ و باغی کەمیان

هەیـە و خۆیـان لە شـاردا بـە خزمەتکاریی خەریکـن و لە دامـودەزگای حکومەت دان و زۆربەیـان بـە تایفـەی لـەك بەناوبانگـن. هەموویان ئـازا و بەجـەرگ و خاوەن قەدوبـاڵای درێـژ و ناوشـانی پـان و ئەبـرۆ و چـاوی گـەورەن کـە بە پێـی پێکهاتە و ڕوخسـار و بـاڵا و هەیبـەت لـە زۆربـەی لاوەکانی ئێرانـی لەبەرچاوترن و بەشـێکی دیکـە تایفـەکان لـە قەڵاکانـی دەوروبـەری شـار نیشـتەجێن و زۆربەی کاتـەکان لە بیابانـەکان خێـوەت هەڵـدەدەن و مەروماڵاتـی زۆریان هەیـە و ...

ئەوانـە ئێسـتاکەش شـێوازی هۆزایەتیـان لەدەسـت نـەداوە و هەموویـان ئـازا و بەجـەرگ و سـوارکاری باشـن و بـە هەمـان عەبـای درێژ و چەکـە کۆنەکانیانـە و ... وەهـا زیـرەك و ئـازان کـە هەریەکێکیـان دەتوانـن خـۆی لەنێـو پەنجـا کەس سـوار و غولامـی شـاری بـە سـاغی بەدەربـەرن و ئـەم هونـەرە لـەم سـەردەمانەدا لـە پیـر و لاوانـی ئەوان بیـنراوە...

دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە ناوبراو ناوی ئەم تایفانە دێنێ کە بریتین لە:

تایفـەی زەنـد، تایفـەی گائینـی، تایفـەی سـەعدوەند، تایفـەی عەبدولمەلەکی، تایفـەی کەلهـوڕ، تایفـەی کورزەبەر، تایفەی لشـنی.

بـەڵام تیـرە و تایفەگەلێکـی دیکـە لـە قـوم نیشـتەجێن کە لەنێـو تایفـەی زەند و تایفـە ناوبراوەکانـدا دەژیـن و لە «مێـژوو و جوگرافیای قـوم»دا ئاماژەیـان پێنەکراوە. تایفـە و تیرەگەلـی وەك: زینـی وەنـد، ئاروەنـد، مەنسـووروەند، مەرشـەوەند... .

لـە شـوێنی دیکـە هەر لـەو کتێبـە (مێـژوو و جوگرافیای قـوم) تایفەکانی شـاری قومیشـی نـاو بـردووە کـە بریتیـن لـە: زەندیـە، تایفـەی بیگدلـی، تایفـەی حاجـی حوسێنی.

تایفەی زەندیە کە لێرەشدا ناوی هاتووە، خانەکانی عەشیرەتی زەند بوون کە هەر لە سەرەتای هاتنیان بۆ ناوچەکە لە شاری قوم نیشتەجێ بوون و ژماریەکیشیان پاشگری «خانەشاری»یان هەیە. و بە «زەندی خانەشاری» بەناوبانگن.

لە کتێبی «قوم نامە» لە نووسینی «سەید حوسێن مودەڕیسی تەباتەبایی» ئاماژەی بە ناوی ئەو حەوت تایفە کردووە کە پێشتر باسیان کرا. دیارە لەم کتێبەدا ژمارەی حەشیمەتی هەریەك لەم تایفانەی بە شێوەی جیا هاتووە.

لە کتێبی « عێل و قەرەجەکانی پارێزگای مەرکەزی» لە ناساندنی تایفەکانی دەوروبەری قوم تەواوی تایفەکانی نیشتەجێی ناوچەکەی لە چوارچێوەی عەشیرەتی زەند و ژێر کۆمەڵەی ئەم عەشیرەتە هێناوە. لە حاڵێکدا تایفەگەلێکی وەك: عەبدولمەلەکی، گائینی، سەعدوەند، ... هەرکامیان خوی خاوەن ڕێکخستنی عێلایەتی و تایفەیەکی سەربەخۆیە.

نووسەر لەم کتێبەدا گوتوویەتی لە عەشیرەتی زەند لە سنووری پارێزگای مەرکەزی (دەوروبەری قوم) تەنیا حەوت تیرەی سەربەخۆ ماونەتەوە:

عێل (تایفە)ی زەند لەك ـ تیرەی مەرشەوەند، تیرەی زەکی و سەفی، تیرەی عەبدولمەلەکی، تیرەی ئاروەند، تیرەی ئیمامقولی وەند، تیرەی سەعادەتمەند، تیرەی گایین.

هاتنی تایفە کوردەکانی نیشتەجێی شیراز و ناوچەکانی تری وەك کرماشان و ... بۆ قوم گوایە لە چەند نۆرەدا جێبەجێ بووە. بە شێوەیەك ئەم تایفانە لە مێژوو و ڕێکەوتی جیاجیا بۆ قوم ڕاگوێزراون. بۆ نموونە ڕێکەوتی کۆچی تایفەکانی زەند و دەوروبەرەکانیان لەگەڵ مێژووی تایفەکانی دواتری وەك سەعدوەندەکان، گایینییەکان، کورزەبەرەکان و شینی(چینی)یەکان چەند ساڵێك جیاوازی هەیە. کتێبی «مالك و زارع» ساڵی هاتنی سەعدوەندەکان و گایینییەکان بەم جۆرە باس دەکا:

... ئەو عەشیرەتانەی دیکە کە لە سەردەمی قاجاریەدا کۆچیان کردووە بریتین لە سەعدوەند کە لە سەردەمی محەممەدشا ( ۱۲۵۰/ ٦٤ ــ ١٨٣٤/ ٤٨) لە فارسەوە بۆ دەوروبەرەکانی ڕۆژهەڵاتی قوم ڕاگوێزراون.

عەشیرەتەکانی «گایینی»یشیان بۆ باکووری قوم کۆچ پێکردن. ئەوان لە سەرەتادا کاروباری هەڵگرتن و ڕاگواستنی دیوانییان لە ڕێگەی وشترداریەوە لە ئەستۆ بوو و دواتر بە ڕەزامەندیی خۆیان وازیان لەم پیشەیە هێنا و ڕوویان لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری نا. لەوەڕەگەکانیان لە درێژایی چۆمی ساوە و نزیکی لەوەڕەگەکانی شاهسەوەنەکان بوون و هەربۆیە بەردەوام لە شەڕ و کێشەدا بوون.

لە سەردەمی قاجاریەکاندا عەشیرەتەکانی عەبدولمەلەکیی فارسیش هاتنە قوم و لەوەڕگاکانی باشووری قومیان وەدەست هێنا. زۆربەیان وەشترەوان یان خزمەتکاری حکومەت بوون.

بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە لەم سەردەمەدا حەوت تایفە لە فارسەوە هاتنە قوم. ئەوان لە سەرەتادا مەڕدار نەبوون بەڵام بە تێپەڕینی ڕۆژگار وشتر و مەڕ و بزن و لەوەڕگەیان لە دەوروبەری قوم بەدەست هێنان....

هەروەها لە سەردەمی قاجارییەدا عەشیرەتەکانی شینی و کەرزە لە کرماشانەوە گەیشتنە قوم ... هەندێکیان بە تایبەت عەشیرەتەکانی هوداوەند خەڵکی خوڕڕەم ئاباد بوون و کەریم خان ئەوانی بردبوو بۆ فارس و ئاغامحەمەدخان ئەوانی لە فارسەوە بۆ تاران گواستەوە.

### زەند (zand)

لە پێوەندیی لەگەڵ ناساندن و باسکردنی زەندەکان لەوانەیە پێویست نەکا توێژینەوە لەبابەت ناو و پێشینەیان بکرێ. چونکە ناسراون و پێشینەیەکی درەوشاوەیان لە مێژووی ئێراندا هەیە. زەندەکان عەشیرەتێك بوون کە بە لێزانیی و لێهاتوویی یەکێك لە خەباتکارترین و ئازاترین پیاوەکانی ئەم وڵاتە (کەریم خانی زەند) توانی دادپەروەری بە واتای تەواو لە هەموو ئێران بڵاو بکاتەوە و بۆ ماوەی چەند دەیە دەسەڵاتی هەموو ئێران بەدەستەوە بگرێ.

زەندەکان یەکێك لە تایفە ئازاکانی لەکن کە ڕێڕەوی سەرەکیی ئەوان لە ناوچەکانی ناوەندیی زاگرۆسەوە بووە. گومانی ئەوە دەکرێ کە شوێنی سەرهەڵدانی یەکەمی ئەوان لە ناوچەیەك بە ناوی «چول جایدر» هەڵکەوتوو لە نێوان شارەکانی «دەرەشار»(ئیلام) و «پۆلدوختەر» بووە، کە دواتر لە ناوچەکانی «مەلاییر»، «پەری زەنگەنە» و «سیلاخور» نیشتەجێ دەبن. لەم نووسینەدا هەوڵ دەدرێ مێژووی زەندەکان تاڕادەیەك لە سەردەمی هاتنەسەرکاری «کەریم خان» هەتا لێکهەڵوەشانی ئەم زنجیرەیە و پاشماوەکانی ئەم عەشیرەتە هەتا ئێستاکە باس بکەین.

لە سەرەتادا پرسیارێك دێتە ئاراوە کە بۆچی لەگەڵ ئەوەکە کەریم خانی لەلای ئەم هەموو خەڵکە جێگەی ڕێز و بایەخ بوو، جێنشینەکانی نەیانتوانی درێژە بە ڕێگەی ئەو بدەن؟

لە وڵامدا دەبێ بگوترێ ئەم بارودۆخە تەنیا بۆ زنجیرەی زەندییە نەبووە، بەڵکوو بە درێژایی مێژوو زنجیرەکان و دامەزرێنەرانی دەسەڵاتەکان ئەم دۆخەیان بۆ هاتۆتە پێش. ئەوەکە جێگرەوەکانی بە هەویای بەدەسەڵات گەیشتن یان بەشداریکردن لە دەسەڵات تێکهەڵچوون و ناکۆکییان لەنێو دەرباریان و تەنانەت خەڵکیشدا پێك هێنا. هەرگیز نەیانویست و نەیانتوانی وەك کەریم خان بن. مەگەر کەسانێکی کەم کە تووشی چارەنووسێکی وەك چارەنووسی لوتفعەلی خانی زەند بوون، کە بە نیاز بوون ڕێگە و ڕێبازی گەورەپیاوانی وەك کەریم خان درێژە پێبدەن. بەڵام ناخۆشیی، تەماع و بەرچاوتەنگیی کەسانی دەوروبەر و دژمنان دەرفەتی جێبەجێ کردنی ئەم ویستەیان پێنەدان.

جێگرەوەکانی کەریمخانی زەندیش تووشی ئەم داخوازییانەی دەوروبەرەکانیان و تەماعی ئەوان لە بەدەسەڵات گەیشتن و وەلانانی یەکتر

بـوون کە ئـەم تێکهەڵچوونـە نێوخۆییانە لەنێو سـەرکردەکانی زەند و سـەردارەکانی دیکـەی ئێرانـدا بـوو بـە هـۆی ئـەوەی دەسـەڵاتدارێتیی زەندییـە لێك هەڵوەشـێ.

بەهەرحاڵ عێلی زەنـد یەکێـك لـە عێلەکانی لەکی ناوچەی زاگـرۆس (لوڕسـتان و ئیلام)بـوون کـە وەك تایفـە و عێلەکانـی دیکـە دەسـت وپەنجەیـان لەگـەڵ گۆڕانکارییـە سیاسـییەکانی وڵات نـەرم کـرد و لـە بگرەوبەردەی پێشـهاتوو لەسـەردەمی نادرشـادا لـەم نائەمنـی و گرژییانـەدا نەپارێـزران.

لـە کۆتاییەکانـی سـەردەمی سـەفەوییە و سـەرەتاکانی ئەفشـارییە سەرپەرشـتیی ڕێکخسـتن و دامودەزگاکانـی ئەم تایفەیە لە ئەسـتۆی کەسێك بە نێـوی «مەهدی خـان»بـوو کـە بە پیلانی نادرشـا بە دەسـتی یەکێـك لـە فەرماندەکانی خـۆی کوژرا و ئـەم کارە بـوو بـە هۆی ئـەوەی ئەم تایفەیە بۆ خوراسـان کـۆچ بکەن.

لـە کتێبـی «مێـژووی سیاسـی و کۆمەڵایەتیـی ئێـران لـە سـەردەمی زەنـد»دا بەم شـێوەیە بـاس کـراوە: «دوابـەدوای پیلانێـك لەلایـەن فەرماندەیەکـی نادر بـە ناوی باباخـان چاوشـلو، مەهـدی خان دەسبەسـەر دەکـرێ و دەکوژرێ و ماڵ و سـامانی خـۆی و تایفەکـەی تـاڵان کـرا. لەلایەن نـادرەوە، بنەماڵـەی مەهدی خانـی زەند کە بریتـی بـوو لـە محەمـەد، شـێخە، عەلـی وەیـس، ئەسـکەندەر، نادرخـان و کەریـم خـان، لەگـەڵ سـەرجەم کەسـانی بنەماڵەکـەی بـۆ خوراسـان ڕاگوێـزران. ناوچـەی دەرەگـەزی خوراسـان کـە بنەماڵـەی زەنـد تێیـدا گیرسـانەوە، ناوچەیەکـی ئـارام نەبـوو و ئـەوان بـۆ مـاوەی چەندین سـاڵ لەلایـەن هـۆزە تاڵانچییەکانەوە هێرشـیان کرایەسـەر.»

تایفەی زەند لەم سەردەمەوە هەتا ئەو کاتەی نادر زیندوو بوو، ناخۆشیی و نەهامەتی زۆریان دیت. کەریم خان کە بە کەریم توشمال (کوێخا، گەورە) بەناوبانگ بوو و خۆی یەکێك لە سەرکردە ناودارەکانی نادریش بووە لەگەڵ مردنی نادر بە یارمەتیی براکەی (سادق خان) تایفەکەیان لە دەرەگەزی خوراسانەوە بۆ

شوێنی سەرەکی و یەکەمی خۆیان واتە مەلایير دەگەڕێننەوە کە لەم سەردەمەوە بوو کەریم خان سەرۆکایەتیی تەواوی تایفەی بە ئەستۆوە گرت...

با بێینە سەر بنەچە و ڕەچەڵەکی ئەم تایفەیە، هەرچەند لە سەرەتادا گوترا پێویست بە توێژینەوە و لەسەر نووسین ناکات، بەڵام ڕێکخستنی عێلایەتی ئەوان چۆن بووە و چۆن پێك هاتووە و خودی ئەم عێلە سەرەتا لە چەند تایفە و تیرەی تر دروست بووە شیاوی قسە لەسەر کردنە.

لە کتێبی «مێژووی گۆڕانکارییە سیاسی ـ کۆمەڵایەتییەکانی ئێران لە سەردەمەکانی ئەفشارییە و زەندییە»دا هاتووە کە: «تایفەکانی لوڕستان لەباری زاراوەوە بۆ دوو گرووپی لەك و لوڕ دابەش دەبن. زمانی لەکی یەکێك لە لقە گەورەکانی زمانی کوردی و زمانی ئێرانی و ڕەسەنە کە قەومێك لە قەومە بە ڕەگەز ئێرانییەکان بە ناوی «لەك» قسەی پێدەکەن. تایفەکانی لەك زیاتر لە ناوچەکانی باکوور و باکووری ڕۆژئاوای لوڕستان و هەروەها لەنێو هەندێك لە تایفەکانی لوڕستان، ئیلام، کرماشان و چەند بەشێك لە هەمەدان و قەزوین ژیان بەسەر دەبەن. تایفەی زەند بە یەکێك لە تایفە لەك زمانەکان دێتە ئەژمار. ئەوان بە شوانی ژیان بەسەر دەبەن و بە ئەگەری زۆر لە سەردەمی شا عەبباس لە داوێنەکانی زاگرۆسەوە بۆ دەوروبەرەکانی پەری و کۆمازان لە نزیك مەلایير کۆچێنرابن. لە کتێبەکانی پێشینیان بە ناوی «کورد» باسیان کراوە و ئەمەش نیشانەی ئەو ڕاستییەیە کە کورد و لوڕ لەگەڵ هەبوونی جیاوازییە زمانی و زاراوەییەکان لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە سەر چاوگەیەك لە ئارياییە چیانشینەکان ڕۆژئاوای وڵات.» *

هەر ئەم سەرچاوەیە وەك سەرچاوەکانی دیکە، لە پێوەندیی لەگەڵ ڕێکخستنی نێوخۆیی تایفەی زەند دەڵێ:

« لەبارەی دابەشکارییە نێوخۆییەکانی تایفەکە، ئەوان بۆ سێ تیرەی

دیاریکراو دابەش دەکەن کە بریتین لە: زەندی بگلە، زەندی هەزارە و زەندی خەراجی. دوو تیرەی بگلە و هەزارە لە نەژادێك و تیرەی خەراجی لە ڕەعیەت و ژێردەستە و خەڵکی ئاسایی پێك هاتبوو. کەریم خان کە دامەزرێنەری زنجیرەی زەندییە بوو لە تیرەی بەگلە بوو و سەرۆکایەتیی ب تیرەی هەزارەشی بەدەستەوە بوو کە ئەوکات ئەڵلامراد قۆیتاس و براکەی خودامراد سەرپەرشتیی ئەو تیرەیان دەکرد و بە شوێنکەوتوویی لەوان تیرەی خەراجیش پێڕەوییان لە خانی زەند دەکرد.»

دوای مەرگی نادر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی گەورەی ئێران بەرەو هەرەسهێنان چوو و هەریەك لە سەرکردەکانی نادر هەوڵیان دا بە شێوەیەك دەسەڵات بەدەستەوە بگرن یان بەسەر ناوچەیەك لە وڵاتی پان و بەرینی ئێراندا زاڵ بن. هەبوونی سیستمی خانخانەکی لە ئێران و دەسەڵاتدارانی دەستڕۆیشتوو وەك سەرۆکی ئەم عێلانە بوونە هۆی ئەوەی تێکهەڵچوونی زۆر توند لەنێو ئەم حکومەتە ناوچەییانە بێنە ئاراوە.

هاوکات لەگەڵ ئەم گرژیی و ئاڵۆزییانە هەریەك لە سەرکردە و ڕکابەرەکانی نادر لە گۆشەیەك لە وڵات حکوومەتی سەربەخۆیان پێك هێنابوو، بۆ نموونە خانەدانی خودی ئەفشار لە ڕۆژهەڵاتی وڵات، قاجارەکان کە سەرۆکەکەیان محەمەد حەسەن خانی قاجار بوو و لە ڕەقیبە سەرسەختەکانی نادر و دواتریش کەریم خان بوو، لە باکوور و دەوروبەرەکانی دەریای خەزەر، لە ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات بارودۆخێکی هاوشێوە زاڵ بوو.

یەکێك لە برازاکانی نادر بە ناوی عەلیقولی خان لە خوراسان بە نێوی عادڵشا بۆ ماوەی ساڵێك وەك پاشای ئێران حکوومەتی کرد و سەرەنجام بە دەستی براکەی ئیبراهیم خان لەسەر کار لابرا و خودی ئیبراهیم خانیش بە دەستی لایەنگران و هێزەکانی شاڕوخ نەوەی نادرشا کوژرا. شاڕوخیش بە

نێوی شاهڕوخ شا هەتا هاتنەسەرکاری قاجارەکان لە خوڕاسان خەریکی دەسەڵاتداریی بوو.

سێ کەس لە سەرکردەکانی ئێران واتە عەلیمەردان خان و ئەبولفەتح خان کە لە سەرکردە بەختیارییەکان بوون لەگەڵ کەریم خانی زەند بە سەرنجدان بەو یەکێتییەی پێکیان هێنابوو، یەکێك لە شازادەکانی سەفەوی بەنێوی شا ئیسماعیلی سێیەم، کە تەمەنێکی ئەوتۆشی نەبوو، وەك پاشای ئێران ناساند و ئیسفەهانیشیان وەك پایتەخت بۆ دیاری کرد.

لەم کاتەدا کەریم خان بە وریایی و لێزانییەوە توانی وەپێش دوو سەرکردەکەی تر بکەوێتەوە و بەسەر چەند بەشێکی جیاواز لە خاکی وڵات بۆ وێنە ناوچەکانی ناوەڕاست و باشوور بە تەواوەتی زاڵ بێ.

دوای ئەوەی عەلیمەردان خان، ئەبولفەتح خانی لەنێو برد، کەریمخانیش توانی بە هاوکاریی هێزە لێهاتووەکەی، عەلیمەردان خانی بەختیاری لە کمرە(خومەین) تێك بشکێنێ و گوڵپایەگان داگیر بکات و دوای ئەمە توانی مێهرعەلی خانی حاکمی هەمەدانیش شکست بدات و هەمەدانیش بگرێت. دوای ئەم سەرکەوتنانە کەریم خان بڕیاری دا سەرکردە بەختارییەکان کە لە بەندیخانەی ئەودا گیرابوون، ئازاد بکرێن و بچنە پاڵ سوپاکەی کە ئەم هەنگاوەی کەریم خان دواتر کاریگەرییەکی باشی لەسەر یەکێتیی زەند لەگەڵ تایفە کوردەکانی دیکە دانا و ڕێگەی بۆ بەدەسەڵات گەیشتنی کەریم خان خۆش کرد. عەلیمەردان خانیش دوای ئەم بەسەرهاتە، بەدەستی یەکێك لە کەسانی دەورویەری کوژرا.

دوای ئەوە کەریم خان وەك دەسەڵاتدارێکی بەتواناتر و لەسەرتر خۆی دەربخات و لە بەرامبەریشدا هەروەك ئاماژەی پێکرا ڕەقیب و ڕکەبەرەکانیشی وەك محەمەد حەسەن خانی قاجار و ئازادخانی ئەفغان بە تەماعی بەدەسەڵات

گەیشتن، تێکهەڵچوونی زۆر خوێناوی و دوورودرێژیان لەگەڵ کەریم خان وەرێخست، کە سەرەنجام کەریم خان توانی بەسەریاندا سەرکەوێ و هێمنی و ڕێکوپێکی بۆ وڵات بگەڕێنێتەوە.

.... پێویستە لێرەدا ئاماژە بە ڕۆڵی کاریگەر و شوێندانەری تایفە کوردەکانی گەڵ کەریم خان بکرێ. ئەو تایفانەی کە یەکێتیی عێلایەتیی کوردیان پێك هێنابوو، ئەوپەڕی خزمەتگوزارییان پێشکەش بە زنجیرەی زەندییە و خودی کەریمخان کرد و هەتا کۆتاییش پێی وەفادار مانەوە و لە بەرامبەر دوژمنانیشدا بەوپەڕی گیانبازیی بەرگرییان دەکرد. لە بەرامبەردا کەریم خانیش ئەوپەڕی گرنگیی و بایەخی پێدان و ئەوەی لەدەستی هات بۆ خزمەت بەو تایفانە ئەنجامی دا.

... ئەم خزمەتگوزارییەی تایفەکانی ناو ئەم یەکێتییە تەنیا تا کاتێك کەریم خان لەژیاندا بوو، وەك خۆی مایەوە، چونکە دوای مەرگی کەریم خانی زەند (١١٩٣کۆچی) و هاتنەکایەوەی ناکۆکیی لەنێو میراتگراتی خانەدانی زەند لەسەر بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، تووشی چەنددەستەیی بوون و هەریەکیان لایەنی کەسێکیانی گرت.

کەریم خان توانی بە پشت بەستن بە دەسەڵات و لێزانیی خۆی و یارمەتیی و هاوکاریی تایفە کوردەکان، بەسەر زۆر دوژمنی وەك ئازادخانی ئەفغان، محەمەدحەسەن خانی قاجار، عەلیمەردان خانی بەختیاری، فەتحعەلیخانی ئەفشار و... دا زاڵ بێ و شکستیان بدات. چۆنییەتی بەربەرەکانی و شەڕەکانی ناوبراو لەگەڵ ڕکەبەرەکانی و هەروەها بارودۆخی ئێرانی دوای کەریم خان، لە زۆربەی کتێبە مێژووییەکاندا هاتووە و پێویست بە دووپات کردنەوە ناکات.

## چارەنووسی تایفەكانی گەڵ بنەماڵەی زەند دوای مەرگی كەریم خان

دوابـەدوای یەكێتیی خانەدانـی زەند لەگەڵ كەلهـوڕ، زەنگەنـە، عەبدولمەلەكی و ... و تایفەكانـی تـری لـەك (وەنـدەكان) یەكێـك لـە بەهێزتریـن ڕێكەوتنـە مێژووییـەكان بـۆ بەدەسـەڵات گەیاندنـی كەریـم خـان لـە ئێـران لەنێـو كوردەكانی كەرماشـان، لوڕسـتان، ئیـلام (كرمانشـاهان، پیشـكوە و پشـتكوە) بەسـترا.

ئـەم یەكێتییـە كـە لەسـەر یەكگرتوویـی ئـەم تایفانـە پێـك هاتبـوو، توانـی بـە توانایيەكـی تـەواوە یارمەتیـی كەریم خـان بكات بۆ ئـەوەی بە دەسـەڵات بگات و تـا كۆتایـی بەمەنـی زەندییـە تەباهـی و ئاسـایيش لـە ئێـران دابیـن بـكات.

ئـەو تایفانـەی كـە یارمەتیـی كەریـم خانیـان دا بـۆ ئـەوەی بـە دەسـەڵات بـگا بریتـی بـوون لـە: ئـەو تیـرە و تایفانـەی سـەر بـە عێلـی گـەورەی كەلهـوڕ، زەنگەنە، عەبدولمەلەكیی باجـەلان، خودابەندەلـوو، كولیایـی، گائینـی و.. و تایفەكانی تری (وەنـدەكان) وەك: نانكەلـی وەنـد، خواجەوەنـد، ئاروەنـد، مافـی وەنـد، بێهتویـی وەنـد، قوریەوەنـد، روتەوەنـد (ڕوتـەوەن)، جەلیلوەنـد، قولیەوەنـد، ئەحمەدوەنـد، كاكاوەنـد، غەیاسـوەند، بوجـول وەنـد، زەبیروەنـد، سـادەوەند (سـەعادەتمەند، سـەعدوەند)، مەرشـەوەند و...

ئـەم تایفانـە تـا كاتێـك كەریـم خـان لەژیانـدا مابـوو، لەسـەر پەیـمان و بەڵێنـی خۆیـان مانـەوە و ئـەم پەیـمان و وەفادارییەشـیان تـا كۆتایـی زنجیـرەی زەندییـە پاراسـت. هـەر ئەوانیـش بـوون كە لە كاتـی دوورخسـتنەوە و ڕاگواسـتنی خانەدانی زەندیـش بـە تەنیـا جێیـان نەهێشـتن و تەنانـەت لەگـەڵ ئەوانیـش بـۆ ناوچـە دوورەدەسـتەكان كۆچیـان كـرد.

هـەروەك بـاس كـرا دوای مەرگـی كەریـم خـان هەریـەك لـە سـەرۆكەكانی خانەدانـی زەنـد و سـەردارانی تـری ئێـران خوازیاری بەدەسـتەوە گرتنی دەسـەڵات لـە ئێـران بـوون كە ئەم هـۆكارە بوو بە هۆی ئـەوەی دووبەرەكـی و ناكۆكیی لەنێوان

بنەماڵەی زەند و سەردار و گەورەپیاوانی تر سەر هەڵبدات.

ناکۆکیی نێوان بنەماڵەی زەند لەنێو تایفە و تیرەکانی سەر بەو بنەماڵەیەشدا تەشەنەی سەند، بە شێوەیەك کە هەریەك لەم تایفانە لایەنی کەسێکیان دەگرت و گرژیی و تێکهەڵچوونی زۆریان لەنێودا هاتە ئاراوە. بە شێوەیەك کە لە میانەی ناکۆکیی نێوان عەلیمراد خانی زەند و سادق خان کە سادق خان دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو، تایفەکانی جەلیلوەند، مافی وەند، نانکەلی وەند، خودابەندەلوو، باجەلان لە عەلیمراد خان کە ماوەیەك دەسەڵاتدارێتیی کرماشانی بەدەستەوە بوو، نزیك بوونەوە کە لە ساڵی ١١٩٥ی کۆچی توانی سادق خان لە دەسەڵات دوور بخاتەوە و شیراز گەمارۆ بدا و بە یارمەتیی ئەو تایفانە بە دەسەڵات گەیشت. ئەم ناکۆکیی و دووبەرەکییانە بوونە هۆی ئەوەی وڵات تووشی پشێوی و ئاڵۆزیی بێت.

... لەم نێوەدا ئاغا محەمەدخانی قاجار توانی بە فێڵ و کەڵەك ئاگری دووبەرەکی لەنێو سەرکردەکانی زەند خۆشتر بکات و لەم ڕێگەیەشدا ئیبراهیم خانی کەلانتەر حاکمی شیرازیش یارمەتیی کرد و زۆر لە سەرۆك عەشیرەتەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا یان ناچاری کردن لەسەر سەرانی عێلی زەند شەڕ بکەن.

بۆ نموونە «... تایفەکانی نانکەلی و مافی لە حاڵێکدا کە لوتفعەلی خانی زەند لە «سمیرم» وەڕێ کەوت، لە شەودا لەلایەن ئەم تایفانە هێرشی کرایە سەر و ناچار کرا بۆ شیراز بگەڕێتەوە... دوای ئەم ڕووداوە لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و کاتێ زانیان حاجی ئیبراهیم خانی کەلانتەر هۆکاری ئەم هاندان و بەگژیەك وەنانەیە، ویستیان بیکوژن بەڵام سەرکەوتوو نەبوون و حاجی ئیبراهیم خانیش لە مەبەستیان ئاگادار بوو کە هەموویانی لێك بڵاو کردن و بۆ ناوچەی بەیزای فارس دووری خستنەوە.»

... بە لێکهەڵوەشانی زنجیرەی پاشایەتیی زەند و مەرگی لوتفعەلیخانی

زەنـد زۆربـەی تایفـەکان توانیـان بـۆ شـوێنەکانی پێشـووی خۆیـان بگەڕێنـەوە. بـەڵام زۆر لـە تایفـە سـەرەکییەکانیش لەسـەر بڕیـاری خانـی قاجار کۆچێنـران و بۆ ناوچەگەلێکـی وەك تاران، خوراسـان، قوم، کرمان، شـیراز، ئیسـفەهان، ئازەربایجان (ڕۆژئـاوا و ڕۆژهـەڵات)، سیسـتان و بەلوچسـتان، قەزوین، گیلان، مازەندەران، سـنە و ... بڵاوەیـان پێکـردن.

ژمارەیـەك لـە تایفـەی زەند بـە هـۆی ڕق و بێزارییەك کە لـە قاجاریـان هەبوو، لە ناوچـەی خانەقیـن و لەنێـوان ڕێگـەی کفری و سـیروان نیشـتەجێ بوون کـە ئەمانە لـە خـزم و نزیکانی کەریـم خانی زەنـد بـوون.

دوایـیـن حاکمـی زەنـد لـە قـوم نەجـەف خانـی زەنـد بـوو کـە لـە کاتی هێرشـی هێزەکانـی ئاغامحەمەدخانـی قاجـار شکسـتی خـوارد و ئاغـا محەمـەد خانیـش کەلبعەلـی خانـی خەلجـی بـۆ حکوومەتـی ئـەو ویلایەتـە دیـاری کـرد و ئەویـش براکـەی (حوسـێنعەلی خان)ی وەك جێگـری خۆی لەوێ دانا و خـۆی لە خزمەت خانـی قاجـاردا مایەوە.

گەورەتریـن ئامانجـی ئاغامحەمەدخانـی قاجـار ئـەوە بـوو پێش بـە یەکگرتن و شـکڵگرتنەوەی دووبـارەی ئـەوان بگـرێ کە ئەمەش بـوو بە هۆی ئـەوەی هەریەك لـەم تایفانـە بـۆ ناوچەیەکـی دوور ڕەوانـە بکات. ترسـی ناوبراو لە ئەگەری هێرشـی ئـەم تایفانـە بوو بە هـۆی ئەوەی تایفەگەلێکـی زۆر لە ئازەربایجـان و تورکمەنەکان بباتـە تـاران بۆ ئـەوەی ناوەندی دەسـەڵات بپارێزن.

بـەم شـێوەیە هێرشـە دڕندانەکانـی قاجـار بـوو بـە هـۆی ئـەوەی نـە تەنیـا تایفـەی زەنـد، بەڵکـوو زۆر تایفـەی دیکـەش کـە لەگەڵیـان بـوون، هـەر کامیـان بـۆ گۆشـەیەك لـە وڵات دوور بخرێنـەوە و ناکۆکیـی و دووبەرەکیـی نێوخۆیـی و سەرسـەختی و دوژمنکاریـی ئاغامحەمەدخـان بوونـە هـۆی لێکهەڵوەشـان و کۆتایـی هاتنـی دەسـەڵاتی عێلـی زەنـد لـە ئێـران. لەڕاسـتیدا دەبـێ بگوتـرێ کە

تەماعی سەرۆکەکانی زەند و سەرکردەکانی تری زەندیە بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات هۆکاری لەدەستچوونی دەسەڵاتی ئەوان بوو و ئیتر نیشانەیەك لە زەندەکان و میراتگرانیان لە مێژووی سیاسیی وڵات کە بتوانێ کاریگەریی و رۆڵێکی دیاری هەبێ نەمایەوە. دواتریش نەیانتوانی بە شێوەیەکی جیددی لە گۆڕەپانی سیاسیی ئێراندا خۆیان دەربخەن.

بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی سیمای درەوشاوەی خەڵکی ماندوویی نەناس و تێکۆشەری ئەم نیشتمانە زیندووە بکوژێتەوە. زۆر رۆڵەی ئازا و دلێر دواتر لەنێو هەر یەك لەم تایفانە هەڵکەوتن و لە بوارە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی، زانستی، کولتووریی و ... رۆڵی کاریگەر و شوێندانەریان گێڕا....

### زەندییە لە قوم

هەروەك باسکرا ڕیاکاریی و تێکهەڵچوون لەنێو خانەدانی زەندا لە گرنگترین هۆکارەکانی لێکهەڵوەشانی ئەم زنجیرەیە بوو کە بوو بە هۆی ئەوەی میراتگران و دەوروبەرەکانیان هەر کامیان بۆ گۆشەیەك لەم وڵاتە دوور بخرێنەوە و کۆچیان پێبکرێ. لەم پێناوەدا ئاغامحەمەدخانی قاجار بۆ ئەوەی بەسەر میراتگرانی خانەدانی زەندا زاڵ بێ و لەژێر چاوەدێری دابن، ئەوانی بۆ قوم ڕاگواست، لەبەر ئەوەی قوم لە ناوەندی دەسەڵات (تاران) نزیك بوو، ئەگەر رۆژێك بیانەوێ کردەوەیەکی دژە حکومەتی ئەنجام بدەن، ئەوا بتوانێ سەرکوتیان بکات و بیانهێنێتەوە ژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی خۆی.

... دوای مەرگی لوتفعەلیخانی زەند، کەسێك کە سەرپەرشتیی میراتگر و کەسوکارەکانی زەندی دەکرد و لەگەڵیشیان چوو بۆ قوم، کەسێك بوو بە ناوی «حەیدەربیك» کە یەکێك لە سەرکردە و سەردارانی عێلی زەند بوو. ناوبراویش بە فەرمانی ئاغامحەمەدخانی قاجار هەر دوو چاوی کوێر کرا. لە گەورەپیاوانی

دیكـەی خانەدانـی زەنـد كـە لەگەڵیـان چوونـە قـوم، كەسـانێكی وەك حەیـدەر قولیخـان و ئیمام قولیخـان بوون.

سـەرەتا ئـەم تایفـە لەگـەڵ تایفـە و تیرەكانـی سـەر بـە خۆیـان لـە نزیكییەكانـی قـەڵای «گـبری» واتە قەڵای سـەدری (ئەمـڕۆ كامكاری پێدەڵێـن) جێگیردەكرێن. ئاغامحەمەدخـان بـۆ كۆنـتڕۆڵ و سەرپەرشـتیی كردنیـان یەكێك لە سـەركردەكانی خـۆی بە نـاوی «سـەدرولمەمالیك» لەگەڵ چەندین كـەس دەنێرێتە قـوم بۆ ئەوەی پارێـزگاری پاشـماوەكانی بنەماڵـەی زەنـد و دەوروبەرەكانیـان بە ئەسـتۆوە بگرێت. خانەدانـی سـەدرولمەمالیك تا كۆتایی سـەردەمی قاجـارەكان لە ناوچەكـەدا مانەوە و كاروبارەكانـی ئـەم خەڵكەیـان لەژێـر چاوەدێریـدا بوو.

بـە هەڵوەشـانی حكوومەتـی قاجارییـە ئـەم خەڵكـەش وەك تـەواوی خەڵكـە كۆچێنراوەكـە توانیـان خۆیـان لەژێـر سـەیتەرەی قاجارەكانـی ڕزگار بكـەن و دووبـارە ڕێكخسـتنی عێلایەتیی خۆیان بەدەسـت بێننەوە. هەرچەند كـە نەیانتوانی ڕۆڵێكـی كاریگەریـان لـە ئاڵوگـۆڕە سیاسـییەكانی وڵاتدا هەبـێ، بەڵام لـە ناوچەی قومـدا گۆڕانكارییەكانـی بەرچـاوی ئـەم خەڵكـە بەرچـاو دەكـەون.

ئـەوان توانیـان چوارچێـوەی سـنووری ژیانـی خۆیـان كـە پێشـتر بۆیـان دیاری كرابـوو، پـەرە پێبـدەن و ناوچەگەلێكـی بەربـڵاو بێننـە ژێـر ڕكێفـی خۆیـان. ژمارەیەكشـیان چوونـە نـاو شـار و لـە ڕێكخـراو و شـوێنە ئیـداری و پۆسـتە سـەرەكییەكاندا جێـی خۆیـان كـردەوە.

خـان و سـەرۆك هـۆزەكان لە قوم لـە مناڵەكانی جەعفەرخانی زەند و سـادقخانی زەنـد بـوون كـە ئەوانـە سـەرەتا لـە گەڕەكـی «گوزەرخـان» لـە نزیـك حەرەمـی حەزرەتـی مەعسـوومە لەنێـو شـاردا نیشـتەجێ بـوون، كە دواتـر ناوچەی شـەریف ئابـاد شـوێنی نیشـتەجێبوونی سـەركردە و گەورەپیاوانـی زەنـد بـووە. خەڵكی سـەر بـەم عێلـە هـەروەك ڕابـردوو ڕێـز و بایەخیـان بـۆ ئـەو خانەدانـە دانـا و لـە تـەواوی

بوارەکانـدا یـار و یاوەریـان و پشـت و پەنایـان بـوون.

بێجگـە لـە خـان و سـەرۆکەکانی زەنـد، زەندەکانـی قـوم بـۆ دوو دەسـتە دابەش بـوون کـە ئـەوەش بەهـۆی ئـەوەوە بـوو حەیدەرییـك دوو کـوڕی بـە ناوەکانـی زەکیخـان و سـەفیخان هەبـوون کـە ئەمڕۆکـە زەندەکان بـە دوو لق دەزانـن: تایفەی سـەفیخان و تایفـەی زەکیخـان. تایفەکـەی دیکـە لـە منالّەکانـی «غولامعەلیخانـی زەنـد» ئێلخانـی گـەورەی زەندە.

زەنـدەکان دواتـر توانیـان گونـد و ئاوایـی زۆر دروسـت بکـەن کـە هەندێکیـان بریتیـن لـە: قـەلای گـبری، بوچـاب، چـاراوە، کاروان سەراسـەنگ، شـەریف ئاباد، دیـزار، حوسـێن ئابـاد... گەرمێن و کوێسـتانیان لە قـەڵای گبری هەتـا نزیکییەکانی گارزان و شـەریف ئابـاد و بەخشـی جەعفەرئابـادە.

ڕێکخسـتنی سیاسـی ـ کۆمەڵایەتـی عێلـی زەنـد لـە قـوم بـەم شـێوەیە بـوو کـە سـەرۆکەکانی زەنـد لەنێـو هـەر تایفەیـەك وەکیلێکیـان هەبـوو، واتـە دوو تایفـەی گـەورەی زەنـد لـە قـوم (تایفـەی سـەفیخان و تایفـەی زەکیخـان) هـەر یەکێکیـان وەکیلێکیـان هەبـوو و ئـەم وەکیلانـەش بـە سـەرنجدان بـە ناسـیاری و زانیارییـەك کـە لـە کەسـانی نـاو تیرەکانـی سـەر بـەم تایفانەیان هەبـوو، چەنـد کەسێکیان وەك کوێخـا لەنێـو تیـرە جۆراوجۆرەکانـدا هەڵدەبـژاردن. بـۆ وێنـە لـە وەکیلەکانـی ئـەم دوو تایفەیـە دەتوانیـن ئامـاژە بـە «حاجـی ئەسـەدوڵلای زەنـد» وەکیلـی تایفـەی زەکـی و «حاجـی ئەمروڵـڵا زەنـد» وەکیلـی تایفـەی سـەفیخان بکەیـن.

هـەروەك باسـکرا بـە هەڵوەشـانەوەی قاجـار، زەنـدەکان لەگـەڵ تایفەکانـی تـری نیشـتەجێی قـوم سـەرلەنوێ ڕێکخسـتن و ڕێکوپێکیـی پێشـووی خۆیـان بەدەسـت هێنایـەوە. گەورەپیاوەکانیـان وەك یەکـەم هەنـگاوی سـەرەکی، سـەرەتا داوایـان لـە ڕەزاشـا کـرد سـەری کەریـم خانـی زەنـد کـە لەلایـەن ئاغامحەمەخانـەوە لەژێـر پلیکانەکانـی کۆشـکی گوڵسـتان شـاردرابۆوە،

بدرێتــەوە و لــە شــیراز، بــازاڕی کولاەفەرەنگــی و لــە تەنیشــت تەرمــی کەریمخــان ژێرخــاك بکــرێ. «ڕەزاشــا»ش شــێوازی قاجارییەکانــی گرتەبــەر و پێشــی بــە هــەر چەشــنە ڕێکخســتنێکی ڕێکوپێکــی لەلایــەن زەندەکانــی قــوم گــرت و هەرگیــز ئیزنــی پێکهێنانــی حیــزب و گرووپــی سیاســی پێنــەدان.

گەورەپیاوانی زەند لە قوم بریتی بوون لە:

حەیدەربیـك، سـەفیخان و زەکیخـان و کوڕەکانـی، غولامعەلیخانـی زەند(سـەرخێڵی گـەورەی زەنـد)، غـولام حوسـێنی کـوڕی ( ئەویـش بازنـاوی ئێلخانـی گـەورەی زەنـدی هەبـوو، چونکە سەرپەرشـتیی تـەواوی تایفەکانی سـەر بـە تایفـەی زەنـدی لـە ئەسـتۆ بـوو)، میرزاخانـی زەنـد، ڕەزاخـان، میـرزا باقرخانـی زەنـدی وەکیلـی، میـرزا ئەحمەدخانـی زەنـدی وەکیلـی، دوکتـۆر ئەکبەرخانـی زەنـدی وەکیلـی، مامۆسـتا موحسـین خانـی وەکیلـی (شـاعیر و ئەدیـب)، دوکتـۆر لوتفعەلیخانـی زەنـد و ...زۆربـەی سـەرکردە و گەورەپیاوانـی عێلـی زەند لـە قوم لە خانەدانـی زەنـدی وەکیلـی بـوون.

«... خانەدانـی زەنـدی وەکیلـی لـە بنەماڵـە گـەورە و بەڕێزەکانـی قومـن و کەسـایەتیی زۆر گەورەیـان لـێ هەڵکەوتـوون.. بەڕێـز محەمـەد ڕەزا خانـی زەنـدی وەکیلـی سـەرۆکی ئـەم بنەماڵەیـە، ئاغـای دوکتـۆر ئەکبـەری زەنـدی وەکیلـی نەشـتەرگەر و سـەرۆکی دەرمانگـەی نەشـتەرگەریی نەخۆشـخانەی پەهلـەوی و دوکتـۆر جەعفـەری زەندی وەکیلی پزیشـکی ددان لە کەسـە ناسراو و بەناوبانگەکانـی ئـەم بنەماڵەیـە.»

لەنێو زەندەکان گەلێك سیمای دیار و ناسراو لە بوارە جۆراوجۆرەکانی سیاسی، سەربازی، زانستی، وەرزشی و ... هەڵکەوتوون کە باسکردنیان زۆری دەوێ. بەڵام دەتوانین لە سیما دیار و بەناوبانگەکانیان ئاماژە بە چەند کەسێك بکەین:

ـ سەرلەشکر عەبدولعەلی زەند

ـ دوکتۆر ئەکبەرخان، زەندی وەکیلی، سەرۆکی نەخۆشخانەی مەدائینی تاران

ـ سەرتیپ عەبدوڵڵا، زەندی وەکیلی، سەرۆکی سازمانی ئەمنیەتی ئیسفەهان.

ـ دوکتۆر حوسێن، زەندی وەکیلی، مامۆستای هەڵکەوتووی زانکۆی کالیفۆرنیای ئەمریکا.

ـ دوکتور ئەبولفەزل، زەندی وەکیلی، لێکۆڵەرەوەی تایبەت بە کوشتن، قازی و سەرۆك دادگە.

ـ سەرلەشکر ئەسغەرخان، زەندی وەکیلی، فەرماندەی ئیدارەی ئیتلاعاتی (زانیاری) ئیسفەهان.

ـ ئەندازیار ئەحمەد، زەندی وەکیلی، سەرۆکی جهاد و سەرچاوە سروشتیەکانی قوم

ـ خانم دوکتۆر هوما، زەندی وەکیلی، پزیشك.

ـ دوکتۆر ناسر، زەندی وەکیلی، دوکتۆری دەرمانساز.

ـ دوکتۆر بەهمەن، زەند، پزیشك.

ـ برایانی شەهید، پورزەند، لە پاڵەوان و کوشتی گیرە بەناوبانگەکانی ئێران.

ـ دوکتۆر لوتفعەلیخان، زەند، پزیشکی ددان.

ئەمڕۆکە لە قوم دوای پێکهاتنەوەی سیستەمی عێلایەتی، گەلێك تیرە لە تایفەی زەند جیا بوونەوە و هەر کامیان لە ناوچە ئاوایی نشینەکان یان لەنێو شاری قوم نیشتەجێن کە هەموویان پێشگری «زەند»یان پێوەیە. بەرچاوترینی ئەم تیرە و خانەدانە گەورانە بریتین لە:

ـ زەندی مەرشەوەند، ئاوایی قەلعە چەم، شاری قوم.

ــ زەندی ئاروەند، گوندی ونارچ.

ــ زەندی مەنسوروەند، شاری قوم.

ــ زەندی حەسەنخانی، ئاوایی مەجیدئاباد، حەسارسورخ، نەیزار.

ــ زەندی عەبدولمەلەکی، شاری قوم.

ــ زەندی زەکی، گەڕەکی زەندئاباد، شاە ئیبراهیم، شاری قوم (لە منداڵەکانی زەکیخانی برای کەریمخان)

ــ زەندی خانە شەهری، شاری قوم.

ــ زەندی وەکیلی، ئاوایی دیزار، گازرون، ...

ــ زەندی کەریمخانی، شاری قوم.

ــ زەندی نەژادی، شاری قوم.

ــ زەندییە، شاری قوم.

ئەمڕۆکە زەندەکان زیاتر لە شاری قوم نیشتەجێن و ، ئێستاکەش خەڵکی ئەم تیرانە لەو گوندانەی ناویان هات، نیشتەجێن و بە کاری وەرزێری و ئاژەڵدارییەوە خەریکن. لە شاری قوم ناوچەی «زەندئاباد» لەو شوێنە بەناوبانگانەیە کە ناوەندی گردبوونەوەی زەندەکانە. تەواوی زەندەکان و خزمەکانیان بە زمانی کوردی و زاراوەکانی «لەکی» و «کەلهوڕی» قسە دەکەن.

### *تایفەی کەلهوڕ (kalhor)*

عێلی کەلهوڕ یەکێك لە گەورەترین عێلەکانی ڕۆژئاوای ئێرانە و خۆی لقێك لە گۆرانی گەورە لەقەڵەم دەدرێت. خەڵکی سەر بەم عێلە لە پارێزگاکانی کرماشان، ئیلام، لوڕستان و شارەکانی خانەقین، مەندەلی، بەغدا و ... نیشتەجێن. خەڵکی ئەم عێلە ڕەسەنترین خەڵکی هەرێمی زاگرۆسن کە بەردەوام بە درێژایی مێژوو، پارێزەرانی بە ئەمەگی ئەم نیشتمانە بوون. عێلی کەلهوڕ ڕۆڵێکی

گرنگیان لە ئاڵوگۆڕە سیاسییەکاندا هەبووە و زۆرجار حەماسە و لەخۆبردووییان نواندووە و خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە ڕابردووی ئەم عێلە دەتوانن سەیری لاپەڕەکانی مێژووی نەتەوەکەمان و بە تایبەت مێژووی ئەم عێلە ئازایە بکەن کە بێگومان خۆی چەندین کتێب و وتاری دەوێ.

بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا زیاتر جەختی لەسەر بکەینەوە، پێوەندیی بە سەردەمی هاتنەسەرکاری کەریم خانی زەند وەك پاشای ئێران هەیە و ڕۆڵی ئەم عێلە لە یارمەتیدان و هاوکاریی کەریم خانە.

لە سەردەمی بەدەسەڵات گەیشتنی کەریم خاندا، حکومەتی ناوچەیی کەلهوڕ لەدەست عەلی خانی کەلهوڕدا بوو. عەلیخان توانایی و دەسەڵاتێکی زۆرتری بە بەراورد لەگەڵ عێلەکانی دیکەی وڵات هەبوو. ئەو یەکێك لە سەرکردە گەورەکانی ڕۆژئاوای وڵات بوو کە جێگەی سەرنجی تایبەتی کەریم خان بوو.

کەریم خان بۆ پتەوکردنی پێگەی خۆی لەنێو سەرۆکی عێلەکاندا بونیادی خزمایەتی لەگەڵ دامەزراندن، بە شێوەیەك کە لەگەڵ گەیشتنی کەریم خان لە ساڵی ١١٦٢ی کۆچی عەلیخانی کەلهوڕ لە ناوچەی هارون ئاباد (ئیسلام ئابادی غەربی ئێستا) لەگەڵ کوێخاکانی کەلهوڕ پێشوازی لێکرد و کەریم خان ماوەی چەند ڕۆژ لە هارون ئاباد مایەوە. لەم ماوەیەدا بوو کە کەریم خان هاوسەرگیری لەگەڵ کچی عەلیخان بە ناوی قەدەم خێر خانم کرد کە دواتر بە «شاپەسەند» ناوبانگی دەرکرد.

لەبەر ئەوەی کەریم خان خۆی کوردی لەك بوو، دەسەڵاتدارانی کوردی ناوچەی کرماشان، ئیلام، لوڕستان و لەکستانی بە گەورەترین پشتیوانانی خۆی دەزانین. هەربۆیە وای بەباش زانی سەرەتا پەیوەندیی برایەتی و سیاسیی عێلایەتی لەگەڵ ئەوان دامەزرێنێ و بە پشتوانیی ئەوان ڕێگە بۆ جێگیرکردنی

ئاسایش لە ئێران و لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێ خۆش بکات.

لەسەر ئەم بنەمایە سەرەتا لە کەلهوڕ کە گەورەترین و گرنگترین عێلی ڕۆژئاوای وڵات بوو، نزیك بۆوە و خەڵکی تایفەی زەنج و تایفەکانی تری سەر بە عێلی خۆی هان دا کە پێوەندیی خزمایەتیی لەگەڵ کەلهوڕ دامەزرێنن...

بەهەرحاڵ ئەم کارە کاریگەریی خۆی هەبوو و پێوەندیی ئەم عێلانە پتەوتر بوو و پشتیوانیی هەمەلایەنەی خۆیان لە کەریمخان دەربڕی. ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوەی بەستێنی پێکهاتنی یەکێتیی عێلایەتیی کورد ( کەلهوڕ، زەند، وەند، زەنگەنە و ...) بڕەخسێ.

عەلیخانی کەلهوڕ بۆ پشتوانیی لە کەریمخان بیست هەزار بنەماڵەی وەك هێز و داکۆکیکاری کەریمخان ڕەوانەی شیراز کرد. کە ئەم بیست هەزار بنەماڵەیە لە تایفە و تیرەکانی کەلهوڕ و سەر بە کەلهوڕ بوون کە بۆ دابینکردنی هێزی دەوڵەتی و پاراستنی پایتەخت لەگەڵ عێل و تایفەکانی دیکە بەرەو شیراز چوبوون.

هەروەك باسکرا ئەمە کەلهوڕەکان بوون کە گەورەترین یارمەتیی و خزمەتیان بۆ گەیشتن بە پاشایەتیی ئێران پێشکەش بە کەریمخانی زەند کرد و تا دوایین ساتەکانیش لەگەڵیان مانەوە و هەرگیز بەجێیان نەهێشتن و سەرەنجام لەگەڵ سەرۆکەکانی عێلی زەند بۆ قوم و ناوچەکانی وەك تاران، ساوە، شیراز، لوڕستان، ئازەربایجان، ئەردەبیل، گیلان، مازەندەران و ... کۆچێنران و لە شوێنی سەرەکیی خۆیان دوور خرانەوە.

بەڵام چۆنییەتیی گەیشتنی ئەم بەشە لە خەڵکی کەلهوڕ بە قوم. کە ئەوانیش هەروەك تایفە و تیرەکانی دیکەی نزیك لە زەند لە شیراز، دوای دەستبەسەرداگرتنی شیراز و کۆتایی هاتنی زنجیرەی زەندییە، خەڵکی تایفەی کەلهوڕیش لەگەڵ خانەدانی زەند و دەوروبەرەکانیان بۆ قوم ڕاگوێزران.

ژمارەیەك لە خەڵکی کەلهوڕ توانیان بۆ ناوچە و زێدی سەرەکیی خۆیان لە پارێزگاکانی کرماشان و ئیلام بگەڕێنەوە.

تایفەی کەلهوڕ لەگەڵ تایفەکانی دیکە واتە تایفەی مافی، خواجەوەند و عەبدولمەلەکی لە یەکەمین تایفەکان بوون کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە زەندەکان لەساڵی ۱۲۰٦ی کۆچی بۆ قوم و ناوچەکانی دیکەی وڵات نێردران.

•••

خەڵکی تایفەی کەلهوڕ هەر لە سەرەتای گەیشتنیان بە قوم لەگەڵ سەرۆکەکانی زەند لە شار نیشتەجێ دەبن و تێکەڵاوی کاری بەڕێوەبەریی و حکوومی دەبن. ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوەی وەك تایفە کۆچ پێکراوەکانی دیکەی کورد بۆ قوم، زمانی خۆیان لەدەست بدەن بە شێوەیەك ئەمڕۆکە تەنیا کەلهوڕەکانن کە کەمتر بە زمانی کوردی دەپەیڤن.

لەنێو خەڵکی کەلهوڕ لە قوم زۆر کەسایەتیی گەورەی زانستی و فەرهەنگیی و ... هەڵکەوتوون و ئەمڕۆکە زۆر لە سیما ناسراوەکانیان لە زانکۆ بەناوبانگەکانی دەرەوە خاوەن کورسیی مامۆستایەتین و زیاتریش بە «کەلهوڕ» ناسراون.

***لەك (سەعدوەند، سەعادەتمەند، سادەوەند) (Lak)***

ئەو تایفە لەکانەی کە لە قوم نیشتەجێن، هەر ئەو تایفانەن کە لەگەڵ خانەدانی زەند چوونە شیراز و دوای گیرانەوەی شیراز بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵات ڕاگوێزران و بەشێکی زۆریان بۆ ناوچە سەرەکییەکانی خۆیان لە پارێزگاکانی ئیلام، کرماشان و لوڕستان گەڕانەوە.

ئەوەکە «لەك»ەکان کێن و لە کوێ نیشتەجێن، دەبێ بگوترێ خودی «لەك» لقێکی گەورە لە کورد بووە کە لەنێوان پارێزگاکانی ئیلام، کرماشان و لوڕستاندا جێگیر بوون کە «لەکستان»ی پێدەگوترێ و شارەکانی وەك خوڕڕەم

ئاباد، هەرسین، ئەلیگودەرز، پولدوختەر، نورئاباد، سەحنە، کەنگاوەر، مەلایەر، سیلاخور، هەلیلان، کوهدەشت، رومشکان، تویسرکان، ئەسەدئاباد، نەهاوەند، زەردەلان و ... لەخۆ دەگرێت.

ئەم خەڵکە شێوەزارێکی تایبەتیان بە ناوی «لەکی» هەیە کە لەباری ریشەییەوە، سەرچاوەیەکی هاوبەشیان لەگەڵ شێوەزارەکانی کەلهوڕی، هەورامی، لوڕی، کرمانجی و .. هەیە.

مێژووی مەردوخ لەبارەی ناساندنی تایفەکانی لەك دەڵێ:

«ئەم تیرەش پێنج لقن: زنجیرەی دلفان، برهان، دالوەند. زۆربەیان شیعەن، لە خانەقین، خورڕەم ئاباد و ئەلەشتەر و مەحاڵی لوڕستان نیشتەجێن. لە کولیایی و هەمەدان و ئیسفەهان و لەنێو دەوڵەت ئاباد و سوڵتان ئاباد و دەوروبەرەکانی سنەدژ (ئیسفەندئاباد و ...)یش هەن. لە ناوچەی سڵماس (مەحاڵی ئازەربایجان) یش هەن. گۆیا لە شیرازەوە گەیشتونەتە ئەوێ.»

هەموو تایفە و تیرەکانی سەر بە لەك، پاشگری «وەن»یان پێوەیە کە لەوانەیە هێندێك تایفە ئەم پاشگرەیان هەبێ بەڵام بە شێوەزاری دیکە قسە بکەن کە هۆکارەکەی کۆچکردنی ئەوان بۆ ناوچەکانی دیکە و کاریگەریی وەرگرتن لە زاراوە و شێوەزارەکانی ئەو ناوچانە بووبێ.

سەبارەت بەو تایفە و تیرانەی کە چوونەتە ناوچەکانی دیکەی وەك ئازەربایجان، پارێزگای گیلان، مازەندەران، خوراسان، تاران، کەرەج، قەزوین و ....، زۆربەیان هەر ئەو تایفانەن کە لە گۆڕانکارییەکانی سەردەمی زەندییەدا بۆ ئەو ناوچانە ڕاگوێزراون.

هۆی ناولێنان:

لەك یەکسانە بە سەد هەزار، کە لە زمانی کوردی و هیندیدا هەنووکەش بەکار دێت و وشەیەکی پەهلەوییە. مێژووی مەردووخ دەڵێ: تیرەیەك لە عەشیرەتی

لـوڕن کـە سـەد هەزار کەسیان حەشـیمەت هەبـووە و هەر بـەم هۆیـەش «لەك»یان پێگوتوون.

مانایەکـی دیکـەی «لـەك» کـە لـە زمانـی کـوردی و زۆربـەی زاراوەکانـی کەلهوڕی، لەکـی، لـوڕی و ...لێـی هەڵدێنجرێ، ئەوەیە کـە واتای ناوچـە، ناحیە، بـەش و ... بەدەسـتەوە دەدا.

«لەك» بە واتای شتی سەخت، بەرد، وەك بەرد و ... هاتووە.

ئەمڕۆکـە لـە قـوم لەکـەکان بـە نـاوی تایفـەی «سـەعادەتمەند» دەناسـن کـە ناوچـەی بەناوبانگـی ئـەوان کـە هەنووکـە ناوەنـدی تایفـەی سـەعادەتمەندەکانە، «حاجـی ئابـادی لەکەکان»ـە.

تایفەی سـەعادەتمەند کە پێشـتر ناویان سەعدوەند(سـادەوەند/سـایەوەن) بووە لـە قـوم ناوەکەیـان بـۆ سـەعادەتمەند گـۆڕاوە. بنەچـەی ئـەم تایفەیـە لـە ناوچـەی «سـایەوەن» لـە نزیك هەرسـینی کرماشـانە کە ناوچەیەکـی هەر بەم ناوەیـە و لەگەڵ تایفـەی «ڕوتـەوەن» لەو ناوچەیە نیشـتەجێن و تایفەی سادەوەند(سـایەوەن) لە قوم بەشـێك لـە هەمـان تایفەی نزیك هەرسـینن.

بـەڵام گەورەپیـاوان و بەسـاڵاچووانی ئـەم تایفەیـە (سـەعادەتمەند لـە قـوم) بڕوایـان وایـە کـە ئاخێزگـەی سـەرەکیی ئـەم تایفەیـە ئیـلام بـووە کـە وای بۆدەچن نزیکایەتیـان لەگـەڵ تایفەگەلێکـی وەك ڕیزەوەندەکانـی ئیـلام هەیـە.

حاجـی ئابـاد لـە ١٢ کیلۆمەتـری شـاری قـوم هەڵکەوتـووە. هـەروەك گوتـرا خەڵکـی حاجـی ئابـاد سـەر بـە تایفـەی سـەعدوەند (سـەعادەتمەند/ سـادەوەند/ سـایەوەن)ن کـە هـەروەك تایفەکانی تری لـەك ( کاکاوەنـد، غەیاسـوەند، هداوەند، خواجەوەنـد، نانەکەلـی وەنـد و ...) کـە لـە ناوچـە جۆراوجۆرەکانـی وڵات بـڵاو بوونەتـەوە و سـەر بـە لەکەکانـن.

ئـەم تایفەیـە وەك هەمـوو ئـەو تایفانـەی بـۆ ئـەم ناوچەیـە و ناوچەکانـی تـری

وڵات كۆچێنراون، ملكەچی گۆڕانكارییە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكانی وڵات بوون و بەپێچەوانەی حەزی خۆیان لە تایفە و كەسە نزیكەكانی خۆیان جیا كراونەتەوە و كۆچیان پێكراوە.

هەروەك لە بابەتی پێشوودا ئاماژەی پێكراوە یەكێك لە هۆكارە سەرەكییەكانی بڵاوەپێكردنی عێل و تایفەكانی نیشتەجێی شیراز ترسی دەوڵەت لە خڕبوونەوەی دەسەڵاتی ئەوان بووە كە كۆبوونەوە و یەكگرتوویی ئەوان بۆتە هۆی نیگەرانیی بۆ دەوڵەتەكانی ئەوكات كە ئەمەش بۆتە هۆكاری ئەوەی بۆ ناوچە جۆراوجۆرەكانی وڵات كۆچیان پێبكەن بۆ ئەوەی پێش بە ئەگەری هێرشی ئەوان بۆ سەر حكوومەتی ناوەندی بگرن.

تایفەی سەعدوەند (سەعادەتمەند) لە ئاوایی حاجی ئابادی لەكان و گوندی نواران كە لە قەراخ چۆمی پێشووی قوم كە بە ناوی سەفی ئاباد بووە، نیشتەجێ بوون و خەریكی كاری ئاژەڵداری و وەرزێری بوون.

ژمارەیەك لە گەورەپیاوەكانیان پێیان وایە كە كاتی هاتنیان بۆ قوم بۆ سەردەمی سەفەوییەكان دەگەڕێتەوە كە بە پشت بەستن بەو بەردە قەبرانەی بەجێماون، ئەم قسەیە دەكەن. بەڵام هاتنی ئەم تایفە و چەند تایفەی تری وەك كورزەبەرە و لەشنی و ... بە پشت بەستن بە سەرچاوەكان بۆساڵی ١٢٥٠ی كۆچی دەگەڕێتەوە. ئەمە لەحاڵێكدایە كە تایفەگەلێكی وەك زەند، كەلهوڕ، مافی و عەبدولمەلەكی زووتر لەوانی دیكە لە شیرازەوە بۆ قوم كۆچێنراون (١٢٠٦ی كۆچی) دیارە تایفەی مافی نەچوونە قوم.

تایفەی سەعدوەند لەگەڵ گەیشتنیان بە قوم سەرەتا لە قوتابخانەی ڕەزەوییە كە ئێستاكە لە ناوەندی بازاڕی شاری قوم هەڵكەوتووە، نیشتەجێ بوون. بە هۆی نەبوونی جێ و شوێنی پێویست بۆ ژیان، ناچار بوون بۆ ناوچەی حاجی ئابادی ئێستا و دەوروبەری بیانگوێزنەوە. تایفەی هداوەند لەگەڵ ئەم تایفە بوون

و بەرەو ناوچەکانی تری وەك وەرامین و تاران چوون و لەوێ نیشتەجێ بوون.

تایفەی هداوەند وەك سەعدوەندەکان تەواوی تایبەتمەندییە کولتوورییەکان و زمانی خۆیان پاراستووە و ئەمڕۆکەش پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ ئەم تایفەیە هەیە.

بە گشتی شێوازی کۆچی لەکەکان لە ڕەوتی گۆڕانکارییە سیاسی - کۆمەڵایەتییەکانی وڵات، بەرەو ناوەند و باکووری و باکووری ڕۆژئاوای وڵات چوون.

تایفەی سەعادەتمەند لە حاجی ئاباد و دەوروبەری زیاتر لە ۱۰۰۰ بنەماڵە دەبن. یەکەمین سەرۆکی ئەم تایفەیە «حەیدەر بیك» بووە کە ئەوکاتەی دەگەنە قوم و لە دەوروبەری قوم نیشتەجێ دەبن و خەریکی کاری وەرزێری و مەڕداری و بەخێوکردنی ئەسپ و مانگا دەبن. لەگەڵ زۆربوونی حەشیمەتیان زەوی و زاری زیاتر بە دەستەوە دەگرن کە ئەم زەوی وزارانە لە دەوروبەری چۆمی قوم بوون.

حەیدەربەگ دوو کوڕی بە ناوەکانی مرادخان و مریدخان هەبوون و لە دەرباری قاجاردا جێی خۆی کردەوە و جێگە و پێگەیەکی تایبەتی بەدەست هێنا. بەهۆی لێوەشاوەیی و شارەزاییەك کە لەخۆی نیشان دەدات، نازناوی «خان» ی لەلایەن دەربارەوە پێدەدرێ. ئەم دەستڕۆیشتوویی و پێوەندییەی ئەوان دەبێتە هۆی ئەوەی لەوەڕگەی زیاتر بێننە ژێر دەستی خۆیان کە زۆربەی ئەم لەوەڕگانە وەك خەڵات و بێباج لە ناوچەکانی حەسارسورخ و قەنبەرەك دەدرێ بەوان و ئەم لەوەڕگانە هەنووکەش وەك لەوەڕگە لەقەڵەم دەدرێن.

گەورەپیاوەکانیان دوای مرادخان و مریدخان بریتی بوون لە:

ئاغا زەینەلعابدین بەگ، عیسا بەگ، حەسەن خان، غەزنەفەر خان، عیساخان، غەریب خان، حوسێن خان. لەپێوەندیی لەگەڵ چۆنیەتی گۆڕانکاری و

پێشهاتەكانی پێوەندیدار بە تایفەكانی لەك و بە تایبەت تایفەی سەعدوەند لەبەر ئەوەی نووسراوەیەكی تایبەت لەبەردەستدا نیە، زۆربەی زانیارییەكانی پێوەندیدار بەم تایفەیە بە شێوەی زارەكی و زاربەزار تا ئەمڕۆ لەنێو خەڵكدا پارێزراوە.

لەنێو ئەم خەڵكە كەسایەتیی دیار و بەرچاو لەباری زانستی و فەرهەنگیی و ... هەڵكەوتوون كە لە ناودارانی وڵات لەقەڵەم دەدرێن. لە كەسایەتییە فەرهەنگییەكان دەتوانین ئاماژە بە حاجی حوسێن سەعادەتمەند یەكەمین بێژەری ڕادیۆی ئێران بكەین كە لە موسیقادا شارەزاییەكی نموونەیی هەبوو

لە سیما ناسراوەكانی بواری وەرزش، كە مایەی شانازیی بۆ وەرزشی ئێران بوو، دەتوانرێ ناوی پاڵەوان «حاجی حوسێن كەللەپەز» ببردرێ كە یەكێك لە ناودارترین پاڵەوانانی سەردەمی قاجاریە بووە. ڕوویەڕووبوونەوە و زۆرانبازییەكانی ناوبراو لەگەڵ پاڵەوانەكانی سەردەمی قاجار وەك پاڵەوان ئەكبەری یەزدی و ... ئێستاش لەبیر خەڵك نەچۆتەوە. لە كتێبەكانی وەك مێژووی وەرزشی كۆنی ئێران لە نووسینی حوسێن پەرتەوبەیزایی، ئاوێنەی پاڵەوان نەما نووسراوەی حەسەنی میرەیی، مێژووی وەرزشی باستانی و زۆرانبازی پاڵەوانیی ئێران لە نووسینی مێهدی عەبباسی... چۆنیەتی قارەمانیەتییەكانی ناوبراو بە شێوەی تێروتەسەل باس كراوە. حاجی حوسێنی كەللەپەز لە گۆڕستانی خەدیجەخاتوونی نزیك حاجی ئابادی لەكەكان (حاجی أباد لكها) بەخاك سپێردراوە.

لە كتێبی مێژوو و جوغرافیای قومدا بەم شێوەیە لەبارەی تایفەی سەعدوەند باس كراوە: «یەكێك لەو حەوت تایفەی سەر بە زەند كە لە قوم نیشتەجێن، تایفەی سەعدوەندن كە لە قەراخ كارێزەكانی دەرەوەی شار و قەڵاكانی قوم نیشتەجێن. لەوەڕگەیان لە سنووری ئاوایی سەراجە (نزیك جەعفەرئاباد) و لە حەوت فەرسەخی قومە. زیاتر وشتر و مەڕ بەخێو دەكەن و هەندێكیان

دانیشتووی قەڵای موئمین ئاباد و حاجی ئابادی قومن، ژمارەیەکیشیان لە ڕۆستەم ئاباد و نەوارانن. زۆربەیان خەریکی کاڵەك و گندۆرەکردن و کاروباری ڕەعیەتین و لە زستاناندا مەڕوماڵاتیان دەبەنە شەمس ئاباد کە لە دوو فەرسەخی قوم هەڵکەوتووە و ... و زەوییە بوورەکانی ئاوایی قەمرودیش لەوەڕگەی ئەوانن».

***زینی وەند (زینی وەن) (zeinivand/ zeinivan)***

ئاخێزگە و شوێنی سەرەکی تایفەی «زینی وەند» (زینی وەن) لە پارێزگای ئیلام و شارەکانی دەرڕە شار و ئابدانانە. ئەو خەڵکەی ئەمڕۆکە لە قومدا بە ناوی تیرەی زینی وەند لەنێو تایفەکانی سەعدوەند (سادەوەند، سەعادەتمەند) بەسەر دەبەن لە سەرەتاکانی سەردەمی ڕەزاشا کە چەند بنەماڵە بوون، گۆیا بە هۆی ئەو گرژیانەی لە ناوچەکەیان هاتوونەت کایەوە، لە سەرەتای سەردەمی پەهلەوی گەیشتونە قوم، بە شێوەیەك کە دوای مەرگی ڕەزاشا ژمارەیەکیان سەرلەنوێ بۆ ناوچەی سەرەکی خۆیان واتە ئیلام گەڕانەوە.

لە کتێبی «قەومی لوڕ» بەشێك لەم تایفەیە وەك یەکێك لە لقەکانی تایفەی «میر» سەر بە میرئاواس کە لە پارێزگای لوڕستان نیشەجێن، ناوی هاتووە کە ناوچەکانی کوێستان و گەرمەسێریان بریتیە لە کەرگا و تەختی چو. هەروەها ئەم کتێبە شوێنی سەرهەڵدانی تایفەی زینی وەندی لە ئێلام بەم شێوەیە ناو هێناوە: گورزلەنگەر، دەرڕەشار، قەلعە گوڵ، کولەجو، ماەپارە.

هۆی ناولێنانی: زینی وەند (زینی وەن) واتە: کەسانی خاوەن چەك، چەکدار.

***ئاروان (ئاروەند، ئاروەن) (Arvand/ arvan)***

خەڵکێك کە بە ناوی تیرەی ئاروەند لە قومدا ژیان بەسەر دەبەن، بەشێك لە تایفەی گەورەی ئاروەند (راوان)ن کە ناوەندەکەیان پارێزگای لوڕستانە. تیرەی

ئارەونـد لەنێـو تایفەکانـی سـەعدوەند و زەنـد دا بەسـەر دەبـەن و لـە ئاواییەکانـی نـارج، نەیـزار و حاجی ئابـادی لەکەکان نیشـتەجێن.

خەڵکـی ئـەم تایفەیـە لـە لوڕسـتان بـە نـاوی ئـاروان نـاسراون و لـە شـارەکانی خـوڕڕەم ئابـاد و بروجێـرد پێوەندییـان لەگـەڵ تایفەگەلێکـی گـەورە و بەناوبانگـی وەك دالوەنـدەکان و بیرانوەنـدەکان هەیـە.

لـە کتێبـی «عێـلات و قەرەجەکانـی پارێـزگای مەرکـەزی» لـە بابـەت تیـرەی ئاروەنـددا هاتـووە:

«تیـرەی ئاروەنـد: بەشـێك لەم تیرەیـە، لە ئاواییەکانی نارج و بەشـێکی دیکەیان لـە نەیـزار و حاجـی ئابـادی لەکـەکان و ژمارەیەکیشـیان لـە دەوروبەرەکانی شـاری قـوم نیشـتەجێن. لـەم نێـوەدا، نزیکـەی ١٠٠ بنەماڵە لـە گوندی نـارج و نزیکەی ٨٥ بنەماڵـە لـە ئاوایـی نەیـزار، پێکهاتـەی عەشـیرەتیی خۆیـان پاراسـتووە و بە شـێوەی نیوەکۆچـەر، ٩ مانگ لە سـاڵ لە کوێسـتان دەمێننـەوە و هاتووچۆ دەکـەن. ڕێرەوی کۆچـی ئـەم تیرەیە، لەلای سـلفچگان بـۆلای ئەراك تـا دەوروبەرەکانی سـاوە، قرنی جوجیـن، مەلـەك ئابـاد و یـەل ئاباد بووە کە دیـارە هەموو سـاڵێك بەهۆی کێشـە و گرفتی زۆر، شـوێنی کوێسـتانەیان گۆڕانی بەسـەردا دێت.»

لـەم کتێبـەدا ئـەم تیرەیـە وەك یەکێـك لـە حـەوت تیرەکەی سـەر بە عێلـی زەند نـاوی هاتـووە. خەڵکـی ئـەم تیرەیە کـە لە قـوم نیشـتەجێن، وەك تیرەکانـی دیکەی سـەر بـە زەنـد، پێشـگری «زەند»یـان بـە شـۆرەت و ناوبانگەوەیـە و بـە «زەنـدی ئاروەنـد» نـاسراون. لـە لوڕسـتان ئاروەنـدەکان لـە خانەکانـی باجولوەنـدن.

### عەبدولمەلەکی (Abdolmaleky)

یەکێـك لـەو تایفـە ناسراوانـەی کـە بەشـێکیان لەگەڵ عێلـی زەند چوونە شـیراز و لەوێشـڕا چوونـە قـوم، تایفـەی عەبدولمەلەکیـن. ئـەم تایفەیە لـەو تایفانـە بوو کە

لە «یەکێتیی عێلایەتیی کورد» لە بەدەسەڵات گەیاندنی کەریم خاندا بەشدار بوون و تا کۆتایی کاری زەندەکان لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆیان بە وەفاداری مانەوە و لەگەڵ ئەوانیش بۆ ناوچە دوور و نزیکەکان ڕاگوێزران.

بۆ تایفەی عەبدولمەلەکی ئەمڕۆکە ناتوانرێ جێگە و شوێنێکی دیار و سەرەکی دیاری بکرێ، چونکە بەردە گۆڕی وا لە شاری قوروە و ئاوایی «قەڵا» هەن کە پێوەندییان بە گەورەکانی ئەم تایفەوە هەیە و بۆ سەدەی ١١ی کۆچی دەگەڕێنەوە. لەحاڵێکدا کە خەڵکی ئەم تایفەیە ئەمڕۆکە لە ناوچەکانی دیکەدا بە پێشینەیەکی هاوشێوە یان کەمتر بەرچاو دەکەون.

تایفەی عەبدولمەلەکی بێجگە لە شاری قوروە لە شارەکانی وەك سەرپولی زەهاو، قەسری شیرین، ئیسلام ئابادی ڕۆژئاوا کە زیاتر سەر بە تایفەکانی جاف و گۆرانن، نیشتەجێن. هەروەها بەشێك لە خەڵکی ئەم تایفەیە لە شارەکانی هەمەدان، بیجار، کەلاردەشت، شارستانی نور (پارێزگای گیلان)، تاران، ... نیشتە جێن.

لە کتێبی «قوم نامە»دا لەمەڕ تایفەی عەبدولمەلەکی هاتووە:

«لە عێلەکانی فارس، لە سەردەمی «خلد أشیان» هاتونە قوم. شارنشینن و زەوی و زاری کشتوکاڵیان نیە. مەروماڵاتیان بەپێی توانایی خۆیان هەیە. زۆربەیان وڵاغدارن و فەڕاشی حکومەتن و لەوەڕگەشیان لە باشووری شاری قومە. دوو تیرەن، عەبدولمەلەکی و زەندی شاری (ئەوانە لە تایفەی زەند جیاوازن).»

بە سەرنجدان بەو چەند ڕستەیەی کتێبەکە دەبێ بڵێین کە کەسانێك لە زەندەکان کە ناوبانگیان بە زەندی شاری دەرچووە، لە تایفەی عە بد و لمە لە کین.

هەروەها لە کتێبی «مالك و زارع» سەبارەت بە تایفەی عەبدولمەلەکیی

نیشتەجێی قوم هاتووە:

«لە سەردەمی قاجارەکاندا عەشیرەتەکانی عەبدولمەلەکیی فارسیش (مەبەست لە فارس، پارێزگای فارسە کە ناوەندەکەی شیرازە. و.) هاتنە قوم و لەوەرگەکانی باشووری قومیان بەدەستەوە گرتن و زۆربەیان یان وشترەوان بوون یان فەڕاشی حکومەت....»

لە کتێبی «مێژوو و جوغرافیای قوم» لە نووسینی ئەفزەلولمولکی کرمانی لەبارەی ئەم تایفەیە ئاوا باس کراوە:

«لە دانیشتووانی شاری قومن و حەشیمەتیان لە عێلەکانی دیکە کەمترە و لەگەڵ زەندی شاری کۆ بوونەوە، مەڕومالاتیشیان ئەوەندە زۆر نیە. زۆبەیان خەریکی کاری خزمەتکاری و فەڕاشی و نۆکەرایەتی ئاغا و زاناکانی شارن. لەوەرگەشیان لەلای قیبلە و لە دەشتی ونارجە.»

ئەم تایفەیە یەکێك لە یەکەمین تایفەکان بوو کە لەساڵی ١٢٠٦ی کۆچی بە فەرمانی ئاغامحەمەدخانی قاجار لەگەڵ تایفەکانی زەند، مافی، کەلهوڕ لە شیرازەوە بۆ ناوچە جیاوازەکان و یەك لەوان قوم ڕاگوێزران.

ئەمڕۆکە حەشیمەتی تایفەی عەبدولمەلەکی لە قومدا بە بەراورد لەگەڵ تایفە کوردەکانی دیکەی نیشتەجێی قوم، کەمترە کە هۆکارەکەشی کۆچکردنیان بۆ شار و ناوچەکانی دیکەی وەك تارانە.

تا ئەو جێگەیەی زانیاریی لەبەردەست دایە، خەڵکی ئەم تایفەیە لە قوم وەك شارەکانی دیکە (قوروە، ئیسلام ئابادی ڕۆژئاوا، قەسری شیرین، سەرپولی زەهاب و ...) ناوبانگیان هەر عەبدولمەلەکییە.

### *تایفەی لەشنی (Lasheny/ lesheny)*

ئەم تایفەیە یەکێك لە تایفە گەورە و بەرچاوەکانە کە ناوەندی

سەرەکییان پارێزگای کرماشان و لە تایفەکانی سەر بە عێلی گەورەی کەلهوڕن. ئەم تایفەیە بەپێی پەیمان و نەریتی عێلایەتیی خۆیان لەگەڵ تایفە کوردەکانی دیکە چوونە شیراز، کە دوای لێکهەڵوەشانی زنجیرەی زەندییە و بە هۆی ترسی قاجارەکان لە سەرلەنوێ شکڵگرتنەوەی دەسەڵاتی کوردەکان بۆ ناوچەی جۆراوجۆر ڕاگوێزران.

ژمارەیەك لە خەڵکی ئەم تایفەیە توانیان بۆ ناوچەی سەرەکیی خۆیان لە ناوچەکانی ماهیدەشتی کرماشان بگەڕێنەوە و تاقمێکیشیان بۆ ناوچەگەلێکی وەك درود، بەرنا، بەلیگودەرز، بروجێرد(وەروگێرد) لەپارێزگای لوڕستان و هەندێکیشیان لەگەڵ عێل و تایفەکانی دیکە و بنەماڵەی زەند بۆ کەلاردەشت و شارە جۆراوجۆرەکانی دیکە ڕاگوێزران.

ئەو بەشە لە لەشنییەکان کە لە پارێزگای لوڕستان بە تایبەت لەشارستانی «درود»ن بە نازناوی لەشنی بە پاشگر و پێشگری زەند بەناوبانگن. چونکە یەکێك لە کچەکانی کەریمخانی زەند درا بە گەورەی تایفەی لەشنی و بە لەشنیی زەند ناوبانگیان دەرکرد.

لە زۆربەی ئەو کتێبانەی کە لەبارەی عێل و عەشیرەتەکانی قوم نووسراون و ئاماژە بەم تایفەیە و تایفەکانی دیکە کراوە، دەتوانرێ باس لە کتێبی «قوم نامە»بکرێ کە لەیەك جێدا باسی خەڵکی ئەم تایفەیە و تایفەی کۆرزەبۆری کردووە.

بەڵام لە کتێبی «مێژوو و جوگرافیای مەمەسەنی» لە ناساندنی تایفەی لەشنی دا هاتووە:

« لەشنییەکان، تایفەیەکی گەورەبوون کە لە سەردەمی سەفەوییە بە دواوە دەسەڵاتێکی زۆریان لەنێو عەشیرەتە قەشقاییەکان و گشت عەشیرەتەکانی فارس دا هەبووە. لە شۆڕش و دژایەتیی مەلا موتەلیبی

كەربالّییش بە دژی كەریمخانی زەند لە ١١٧١ی كۆچی ناوی ئەم تایفەمان بەرچاو دەكەوێ و لە گەمارۆدانی شاری شیراز لەلایەن سوپای زەند بە دژی سالح خانی بەیات والیی فارس و لایەنگرانی ئازادخانی ئەفغان، هادی خانی لەشنی بەشێك لە شیرازی لەژێر دەستی سپای زەند نابوو.

ئەم تایفەیە كە بە بەشێك لە عێلاتی قەشقایی دێتە ئەژمار، لە ئێستادا ڕێكخستنێكی سەربەخۆی عێلایەتیان هەر بەم نێوە لەنێو عێلە قەشقاییەكان هەیە و بەشێكیان لە ناوچەی ماهوری میلاتی نیشتەجێن.»

لە جێگەیەكی دیكە و لە كتێبی «قەومی لوڕ، نوێژینەوەیەك لەبارەی پێوەندارێتیی قەومی و ...» یشدا ئاماژە بە بەشێك لە تیرەكانی تایفەی كوردی شولی كراوە كە لە فارسدا دەژین و هەنووكەش بە شێوەی كۆچ نشینی درێژە بە ژیانی نەریتیی خۆیان دەدەن و تێیدا باس لەوە كراوە كە تایفەی كوردی شولی خۆی لە حەوت تیرە پێك هاتووە و شوێنی ژیانی لەشنییەكانی لە فارس بەم شێوەیە دیاری كردووە: لە بەینی ناوچەكانی موبارەك ئاباد، نمودن، خونگەشت، كافتر، چەشمە ڕەعنا، حوسێن ئاباد و كێوی تەنگی حەنا و موبارەكدا گەرمێن و كوێستان دەكەن.

ئەمڕۆكە ناتوانرێ ئاخێزگە و شوێنێكی دیار بۆ تایفەی لەشنی دیاری بكرێ چونكە لەنێو چەند پارێزگایەكی ولاتدا بلاو بوونەتەوە كە بەشی زۆریان لە ماهیدەشتی كرماشان ژیان بەسەر دەبن.

### *تایفەی كۆرزە بۆر (Korzah-bor)*

ئەم تایفەیە یەكێكی دیكە لە تایفە كوردەكانی نیشتەجێی قومن كە وێدەچێ لە دەوروبەرەكانی سالّی ١٢٥٠ی كۆچی گەیشتبنە قوم. ئەم تایفەیە لەگەلّ تایفەی چینی (شینی) لە یەك كاتدا گەیشتوونەتە ئەم ناوچەیە.

کۆرزە بۆرەکان لەگەڵ تایفە و تیرەکانی دیکەی کورد لەگەل کەریمخانی زەند چوونە شیراز کە دوای لێکهەڵوەشانی دەسەڵاتداریێتی بنەماڵەی زەندیە لەلایەن قاجارەکانەوە دواتر بۆ قوم کۆچێنران. ئەم تایفەیە لە بنەڕەتدا نیشتەجێی ساڵح ئاوای پارێزگای ئیلام بوون و شوێنی سەرەکیان ناوچەیەك هەر بەم ناوە بووە کە ئەمڕۆکە ئەم ناوە (کۆرزە بۆر/ کورزەورە) لە ناوچە و کێوێك نراوە کە لە ناوچەی «کان و گونبەد»ی بەخشی ساڵح ئاوایە. لە نەخشە(خەریتە)ی جوگرافیایی ناوی ئەم ناوچەیە بە فەرهادئاباد نووسراوە.

... لە لاپەڕە ٨٣ی کتێبی «قوم نامە» لە نووسینی سەید حوسێن تەباتەبایی لە ناساندنی ئەم تایفە و تایفەی لەشنی دا هاتووە:

« ئەم دوو تایفەیە لە عێلەکانی کرماشان لە قوم نیشتەجێن. خەڵکێکی ئاسوودە و بە ژمارە کەمن و مەروماڵات و ئاژەڵێکی ئەوتۆیان نیە. پیشەیان کاروکاسبی و وەرزێرییە. چەند کەسایەتییەکی بەناوبانگیان هەیە و هێندێك وڵاغداری دەکەن و دانیشتووی شارن.»

لە کتێبی مێژوو و جوغرافیای قوم نووسراوی ئەفزەلولمولکی کرمانی ئەم تایفەیە بە بەشێك لە تایفەکانی سەر بە زەند دانراوە و دەگوترێ:

« لەتایفەکانی دیکەی سەر بە زەند تایفەی کۆرزەبۆر، دانیشتووی شارن. وشتر و مەڕیان نیە، زۆربەیان بە وڵاغداری و وڵاغ فرۆشی ژیانیان دابین دەکەن و هەندێکیان خەریکی کاری ڕەعیەتیین».

کۆرزەبۆرەکان هەروەها لە دەوروبەرەکانی پۆلدوختەر، سیلاخور و لە بروجێردیش هێندێك ئاوایی هەن بە ناوی بەسری (besri)، کارخانەی (سفیدکن)، زۆربەیان کۆرزە بۆرن. هێندێك کەس ئەم تایفەیە بە بەشێك لە عێلی بیرانوەند دەزانن.

ئێستاکە ژمارەیەك لە خەڵکی ئەم تایفەیە بێجگە لە شاری قوم لە ئاواییەکانی

دەوروبـەری شـاریش ژیان بەسـەر دەبەن و بە نازناوی کۆرزەبـۆر، ... بەناوبانگن.

### مەرشەدوەند (مەرشەوەن) (Mershadvand/ mershavan)

مەرشـەوەن (مەرشـەوەند، مەرشـەدوەند) یەکێـك لـە تیرەکانـی سـەر بـە عێلـی زەنـد لـە قومـە کـە لەگەڵ ئـەو تایفـە و تیرانەی کـە بۆ قـوم کۆچێنران، گەیشـتنە ئەو ناوچەیـە. خەڵکـی ئـەم تیرەیـە ناوبانگی زەنـد و پاشـگری مەرشـەوەندیان هەیە کە نیشاندەری جیاوازبوونیانە.

خەڵکـی ئـەم تیرەیە لـە بنەڕەتدا لە تایفـەی مەرشـەوەن (مەرشـەدوەند)ی عێلی «خـەزەڵ»ی پارێـزگای ئیـلام بوون کە ئێسـتاکە لـە ناوچەی چـەرداوڵ (شارسـتانی شـیروان و چـەرداوڵ) نیشـتەجێن، ئـەم تیرەیە هـەروەك ئـەو تایفە و تیـرە کوردانەی کـە لەگـەڵ عێلـی زەند چوونە شـیراز، بەشـێك لەم تایفەیـەش لەگەڵ ئـەوان چوونە شـیراز کـە دواتر لە شـیرازەوە بـۆ قوم ڕاگوێـزران. تایفەی مەرشـەدوەند لەگەڵ سـێ تایفـەی گـەورەی دیکـە لـە ناوچـەی (شـیروان و چـەرداوڵ) عێلـی خـەزەل پێـك دێنن.

لـە کتێبـی عێـلات و قەرەجەکانـی پارێـزگای مەرکـەزی سـەبارەت بـە تیـرەی مەرشـەوەندی نیشـتەجێی قـوم هاتـووە:

«بەشـێك لـەم تیرەیـە لـە ئاوایـی قەڵاچـەم یـان دەوروبەرەکانـی حەسارسـورخ و نەیـزاری حاجـی ئابـادی لەکـەکان و ئیـمام زادە عەبدوڵـڵا و دەوروبەرەکانـی شـاری قـوم (زەندئابـاد) نیشـتەجێن و تەنیـا نزیکـەی ٤٠ بنەماڵە لە ئاوایـی قەڵاچەم و نزیکـەی ١٥ بنەماڵـە لـە حەسارسـورخ هـەروا درێـژە بـە ژیانـی نیوەکۆچـەی بـە هەمـوو گیروگرفتەکانیـەوە دەدەن.

تیـرەی مەرشـەوەند لـە دوو تیـرەی ئەکبەریەیگی و سـەعادەتمەند پێـك هاتووە کـە یەکەمیـان لـە ئاوایـی (دە نمـك)ی ئـەراك، نزیـك داوەرئابـاد و دووەمینیـان لـە

دەوروبەرەکانی یافت ئاباد بە شێوەیەکی باش ژیان بەسەر دەبەن. ڕێڕەوی کۆچی هاوینەواریان، ڕێگەی سەرەوەی خومەین و سنووری خوارووی، نزیك ورچە و بۆ لای درود و هەندێکجار تا دەوروبەرەکانی ساوە و یان ناوچەی بایەرخان، باغ یەك، سلفچگان، ساڵ ئاباد، نۆبەران، فرقان، مەقسودئاباد و چوار قەڵایە.

لەو کتێبەدا تایفەی سەعدوەند (سادەوەند، سەعادەتمەند) بە بەشێك لەم تیرەیە دانراوە لەحاڵێکدا خودی سەعدوەند تایفەیەکی سەربەخۆیە و شوێنی جێگیربوون و نیشتەجێبوونیشیان بە ڕوونی دیارە. لەوانەیە ژمارەیەك لەم تیرەیە (مەرشەوەند) لەنێو ئەم تایفەیە دەژین کە بەسەرنجدان بەم بابەتە، ئەو کتێبە بەم شێوەیە باسی کردووە.

هەروەك باسکرا تیرەی مەرشەوەند (مەرشەوەن، مەرشەدوەند) لە ئێستاشدا لە شاریقوم (ناوچەی زەندئاباد)، گوندی نەیزار، قەڵعە چەم (قەڵاچەم)، قەلعە نو (قەڵای نوێ) و ... نیشتەجێن.

خەڵکی سەر بەم تیرەیە هەروەك تیرەکانی تری سەر بە زەند و کوردەکانی دیکەی نیشتەجێی قوم بە شێوەزاری لەکی و کەلهوڕی قسە دەکەن.

### *گائینی (Gaeeni)*

تایفەی گائینی وێڕای تایفەکانی دیکە ( عەبدولمەلەکی، کۆرزەبۆر، سەعدوەندەکان و ...) لە ساڵی ۱۲۵۰ی کۆچی لە شیرازەوە بۆ قوم کۆچێنران.

ئەم تایفانە کە لەگەڵ تایفە و تیرەکانی دیکە لە کرماشانەوە بۆ شیراز ڕاگوێزران، دوای ئەوەی تایفەکانی زەند و کەلهوڕ و لەکەکان بە فەرمانی ئاغا محەمەدخان لە شیرازەوە بۆ قوم ڕاگوێزران.

ئاخێزگە و شوێنی یەکەمی ئەم تایفەیە، ناوچەی گاکول لە دەوروبەرەکانی

بێستونی کرماشـان بـووە. خەڵکی ئەم تایفەیە لە شیراز هـەروەك تایفـە و تیرەکانی تـری «لـەك» لەگەڵ بنەماڵـەی زەنـد لـە کاری جۆراوجـۆردا بـۆ وێنـەی سـوپایی، پاراسـتنی شـارەکان و ... خەریکـی کار بـوون. لـەو کارانـەی کـە پێوەندییـان بـە دیوانسـالاری و ... بـووە، دەسـتێوەردانێکی ئەوتۆیـان نەبـووە.

خەڵکـی ئـەم تایفەیـە ئەمـڕۆ بێجگـە لـە شـاری قـوم لـە زۆر لـە ئاوابیەکانیـدا نیشـتەجێن کـە ژمـارەی ئـەم گوندانـە زیاتـر لـە بیسـت گونـدە و هەموویـان لـە دەروبـەری چـۆم (چـەم)ی سـاوەدا هەڵکەوتـوون و هەموویـان پاشـگری «گائینی»یـان پێوەیـە.

هەندێـك لـەم گوندانـە بریتیـن لـە: حوسـێن ئابـادی گائینـی، شـەمس ئابـادی گائینـی، فەیزئابـادی گائینـی، موحسـین ئابـادی گائینـی، عەلیابـادی گائینـی، مس ئابـادی گائینی، عەسـگەر ئابـادی گائینی و... هەتـا ئەنجیرئاباد کە سـنووری عێلی شاهسـەوەنە.

تایفـەی گائینـی هەروەهـا چەنـد تیـرەی وەك قـەرە چەکمەلـی، جـی خانـی، پیرەجـو و ...لەخـۆ دەگرێـت. خەڵکـی ئـەم تایفەیە لـە ناوچەی قـوم وەك خەڵکی دیکـە خەریکـی کاری جۆراوجـۆرن. ئەمڕۆکـە گائینییەکان بە دەگمـەن خەریکی کاری ئاژەڵـداری و مەڕداریـن. ئـەوان تێکـەڵاوی کاروبـاری خزمەتگـوزاری و ئیـداری و کاسـبکاری و زۆر کاری تـری لـەم شـێوەیەن.

لە کتێبی مێژوو و جوغرافیای قوم دا سەبارەت بەم تایفەیە هاتووە:

« لـەو تایفانەیـە کـە لـە قـوم دا بەشـێك لـە زەندییـە دێتـە ئەژمـار و پێـم وایـە هێندێـك بـە جێگـەی گائینـی، «قائینی»یـان پێدەڵێـن. ئەوانـەش یەکێـك لـە تایفە بەناوبانگەکانـن و گەورەکانیـان لـە قـوم نیشـتەجێن. زسـتانان لـە هـەرزاب لـە یـەك فەرسـەخی قوم هەتا پردی دەلاك و چۆمی سـاوە و، هاوینانیش بۆ لای شاهسـەوەن و سـنووری قانچـای نزیـك نۆبـەران و ئاوایی سـامان و یاتـان دەچن کە ئـەم ئاواییە

بەشێك لە ساوەیە و لە هەشت فەرسەخی ساوە هەڵکەوتووە و تایفەی گائینی لەکاتی هاوینەهەواردا دراوسێی عێلی شاهسەوەنن کە لە دەوروبەرەکانی ساوە دەمێننەوە... هێندێك گوند و زەویشیان لە قەراخ چۆمی قەراچای ساوە هەیە. زۆر تووڕەن و لاوی هورنەرمەندیشیان لەنێودا زۆرن. خەڵکی تاییفەی گائینی لە قومدا بە شێوەزاری کەلهوڕی قسە دەکەن.

### حەسەنخانی (Hasan-khani)

تیرەی حەسەنخانی لە بنەڕەتدا یەکێك لە تیرە جیابووەکانی تایفەی ئاروەند (ئاروان)ـە کە وەك تیرەکانی تری سەر بە عێلی زەند لە قوم لەنێو زەندەکاندا ژیان بەسەر دەبەن.

خەڵکی ئەم تیرەیە لە ئاواییەکانی مەجیدئاباد، حەسار سورخ، نەی زار و بەشێکیش لە شاری قوم نیشتەجێن. ئەم تیرەیە بە ناوی گەورەی خۆیان واتە «حەسەن خان» ناو نراوە. خەڵکی ئەم تیرەیە بە زەندی حەسەنخانی بەناوبانگن.

### کەل کۆ (kal - ko)

ئەم تایفەیە یەکێك لەو تایفانەیە کە لەگەڵ تایفەکانی دیکە بۆ ناوچەکانی قوم، ساوە و دەوروبەری ڕاگوێزراون.

لە زۆربەی ئەو سەرچاوانەی ناوی ئەم تایفەیە بە (کەلکۆ، کەلەکۆ، کەل کێو) هاتووە. لە حاڵێکدا ناوی سەرەکیی ئەم تایفەیە «کل کوە» (کەل کۆ ـ کەل کێو)ـە و لە هەمووان دروستترە.

ئەم تایفەیەدا لەڕاستیدا یەکێك لە تایفەکانی نیشتەجێی ئابدانان، زەڕین ئاوا و چەند بەشێك لە دێهلوران و موسیان و مێهران لە پارێزگای ئیلامن کە لەم ناوچانە نیشتەجێن.

تایفـەی کەلکـۆ لـە ئیـلام لەگـەڵ تایفەکانـی دیکـەی وەك ( مەمەسـی وەنـد، کایدخـردە، جایروەنـد) عێلـی کـوردی نیشـتەجێی بەخشـی ئابدانـان و دێهلورانی پارێـزگای ئیـلام پێـك دێنن. خودی ئـەم تایفەیەش لـە ناوچـەدا تیرەگەلێکی وەك: زەرگـوش، ماسـپی، ناسرعالـی، دەشـتی (قەیتولـی) و ... لەخـۆ دەگرێـت.

بـە ئەگـەری زۆر ژمارەیـەك لـەم خەڵکانـە لەگـەڵ تایفـە و تیرەکانـی دیکـەی کـورد کـە لەگـەڵ بنەماڵەی زەنـد چوونـە شـیراز و دوای داگیرکرانی شـیراز لەلایەن ئاغامحەمەدخانـی قاجـار و بڵاوەپێکردنـی عێـل و عەشـیرەتە کوردەکانی شـیراز بۆ ناوچەکانـی ناحیـەی مەرکەزیـی وەڵات کۆچپێکران. تایفـەی کەلکـو (کەللـە کۆ) لـە قـوم لـە ئاواییەکانـی مەسـیلە و مەنزەریـە نیشـتەجێن.

*کوردە پرژءبڵاوەکانی قوم و دەوروبەری*

بێجگـە لـەو تایفـە و تیرانەی کـە بە ڕێکخسـتنێکی بەهێزتـر گەیشـتونەتە قوم و تـا ئێسـتاش پێکهاتەی سـەرەتایی خۆیـان پاراسـتووە، ژمارەیەکی دیکـە لە خەڵك لـە تیـرە و تایفـە جیاوازەکانـی دیکـە بە شـێوەی خێزانـی پەرتءبـڵاو چوونەتە قوم و ماوەیەکـی دوورودرێـژە لەوێ نیشـتەجێن.

لـەو بنەماڵانـە کـە ژمارەشـیان زۆرە، دەتوانرێ ئامـاژە بکرێ بە چەنـد بنەماڵەیەك لـە ناوچەکانـی باولـە، چەوگان و ... لە سـەنقوری کولیایی کە نزیکـەی ٨٠ بنەماڵە و ژمارەیەکـی دیکـە لـە ناوچـە و ئاواییەکانی علـی بڵاغ، تینەمـۆ، هەزارخانی سـەروو و خـواروو، گـراز پهـن، تایفـەی خەزەلی و ... کـە لە ناوچە جیاوازەکانی شـاری قوم و یـەك لەوان نیروگا نیشـتەجێن.

لـەو کـوردە کۆچبەرانـەی کـە لـە ٢٠ بـۆ ٣٠ سـاڵی ڕابـردوودا گەیشـتونە قـوم، ژمارەیەك لە خەڵکی تایفەی «سیاەسـیاە» ی گێلانغەرب و ئیسـلام ئابادی ڕۆژئاوان کـە لـە سـەردەمی پەهلەویـدا سـەرەتا بـۆ سـاوە کۆچێـنران کـە چەندیـن خێزانیش

لەم تایفەیە چوونە قوم کە لە «نیروگاه» نیشتەجێن و خەریکی کاروباری بازاڕ و ئیدارین و ناوبانگیان بێغەم، تەیمووری و ... ناسراون. هەروەها ژمارەیەك لە کوردە کرمانجەکانی تورکیە لەم شارەدا نیشتەجێن.

- **سەرچاوەکان:**

١. محمدی، آیت، سیری در تاریخ سیاسی کرد و کردهای قم، چاپ اول، انتشارات پُرسمان، تهران ١٣٨٢.
٢. ویکی پیدیای فارسی.( fa.wikipedia.org.

## چوارەم

## کوردەکانی فارس

- چەند زانیارییەك سەبارەت بە پارێزگای فارس
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ فارس
- کوردەکانی فارس لە کۆندا (فەرمانڕەوایی شوانکارە)
- کوردەکانی ئەمڕۆی فارس و شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان
- ڕەوشی کولتووریی و ڕۆشنبیری

### • چەند زانیارییەك سەبارەت بە پارێزگای فارس

پارێـزگای فـارس یەکێـك لـە پارێزگاکانـی ئێرانـە کە لە بەشـی باشـووری ئێران هەڵکەوتـووە. لـە باکـوورەوە لەگـەڵ پارێزگای ئیسـفەهان، لە باشـوور و باشـووری ڕۆژهـەڵات لەگـەڵ پارێـزگای هۆرمـوزگان، لـە ڕۆژئـاوا و باشـووری ڕۆژئـاوا لەگـەڵ پارێـزگای بوشـێهر و لە باکـووری ڕۆژئـاواوە لەگەڵ پارێـزگای کۆهگیلویە و بویەرئەحمـەد و لـەلای ڕۆژهەڵاتـەوە بەهارسـتانی کرمـان و لـە باکـووری ڕۆژهەڵاتـەوە لەگـەڵ پارێـزگای یـەزد هاوسـنوورە.

ئەم پارێزگایە بە ڕووبەری نزیك بە ١٢٢,٦٠٨ کیلۆمیتری چوارگۆشە و حەشیمەتی نزیك بە ٤,٥٢٨,٥١٣ کەس (لە ساڵی ١٣٨٩ی هەتاوی) لە ٢٩ شارستان، ٩٤ شار، ٨٣ بەخش و ٢٠٤ دێهستان پێك هاتووە.

ناوەندی پارێزگا، شاری شیرازە کە پڕحەشیمەترین شاری پارێزگایە و شارەکانی مەرڤدەشت، کازرون، جەهرۆم و فەسا لە شارە پڕحەشیمەتەکانی ئەم پارێزگایەن و هێندێك لە شارستانەکانی دیکەی بریتین لە: ئابادە، ئەرسەنجان، ئەقلید، بەڤانات، پاسارگاد، جەهرۆم، خورەم بید، خەنج، داراب، سپیدان، سەروستان، فیروزئاباد، مەمەسەنی، نەیریز و

لەم پارێزگایە بێجگە لە زۆرینەی فارسی زمان، قەومگەلی جۆراوجۆری تر ژیان بەسەر دەبەن بۆ وێنە: لورەکان، قەشقاییەکان، عەرەب، لەك و ....، کە هەریەکیان بە زمان و شێوەزاری وەك فارسی، لوڕی، لارستانی، قەشقایی، سیوەندی، ئەردەکانی، عەرەبی و کوهمەرەیی قسەدەکەن.

سەرچاوە گرنگەکانی ئابووری ئەم پارێزگایە لەسەر بنەمای وەرزێری و ئاژەڵدارییە و شارۆچکەی پیشەسازی، پاڵاوگە، پیشەسازیی پێترۆشیمی و ... تێدا دامەزراون. بەهۆی هەبوونی شوێنی گەشتیاریی سروشتی و، بیناگەلی مێژوویی و ئاینیی یەکێك لە ناوەندە گرنگەگانی گەشتیاریی ئێرانە.

فارس لە بەردەنووسەکانی سەردەمی هەخامەنشیدا بەشێوەی پارسە و لە نووسراوە یۆنانییەکاندا بە شێوەی پرسیس هاتووە و فارس و فارسی شێوە عەرەبییەکراوەکەی پارس و پارسین. فارس ناوچەیەکی بەربڵاوە کە بەشێك لە باشوور و باشووری ڕۆژئاوای ئێرانی لەخۆ گرتووە و لە نزیکەی یازدە سەدە پێش زایین شوێنی نیشتەجێبوونی یەکێك لە تایفە ئارياييەکان بەناوی پارس بووە و هەر بەم بۆنەیەوە بە پارس ناوی دەرکردووە.

ناوی کەنداوی فارس لە ناوی ئەم ناوچەیە وەرگیراوە کە لە ساڵی ١٣٥٢ی

کۆچی هەتاوی لە دابەشکاریی وڵاتدا پێوەندیی پارێزگای فارس لەگەڵ کەنداوی فارس پچڕا و ناوچەکانی لێواری کەنداوی فارس پارێزگای بوشێهریان لێ پێك هات.[1]

- **سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ فارس**

بەپێی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان، کورد زۆر لەمێژە لە پارێزگای فارس و دەوروبەری نیشتەجێن. هێندێك لە سەرچاوەکان ڕەگ وڕیشەی کورد لەم ناوچانە بۆ مێژوویەکی زۆر کۆن و. هەندێکیان هەبوونی کوردان لەو ناوچانە بۆ سەردەمی کەریم خانی زەند دەگەڕێننەوە. «لەکەیەوە عێل و خێڵاتی کورد گەیشتوونە ئەم هەرێمە فارسە و لەوێوە دەسەڵاتیان پەیدا کردووە و بنەڕەتی فەرمانڕەوایی و سەرداریێتیان دامەزراندووە؟ مێژوو هێشتا ئەمەی بۆ ڕوون نەبووەتەوە.. کۆنترین بەڵگە لەبارەی کوردی وڵاتی فارسەوە بەدەست ئێمەوە بێ ئەمەیە: لە سەرەتای سەدەی سێیەمی زایینی (میلادی)دا لە شاری پازارگاد کە ئێستا پێی دەوترێ ئیستەخری فارس، (ساسان) ناوێ موویەدی پەرستشگای ناهید (واتە: مەلای زەردەشتییەکان) بوو. ژنی ئەم ساسانە پادشای عێلی (بازڕەنگی) کورد ناوی (رام بەهیشت) یا (مینا بەهیشت) بوو. ساسان کوڕێکی لەم ئافرەتە بوو ناوی نابوو (پاپەك)، ئەم پاپەکە کە گەورە بوو. سەرۆکیی شاری (خێر)ی پێ سپێردرا کە دەکەوتە کەناری زرێچەی (بەختەگان) و سەرەڕێی (سەروستان) و (نەیریز)ی ئێستەوە. لەم حەلەدا (گوزەهر) یا (گوچەهر)ی بازڕەنگی پادشای (فەسا) بوو. فەسا قەڵاییکی سپیی زۆر سەختی هەبوو کە سپای ئیسلام سێسەد ساڵ پاش ئەو ڕۆژە داگیریان کرد لەبەر سپێتی قەڵاکە ناویان نا (بەیضاء). کابراییکی (تیری) ناو ئەرگبود (واتە قەڵاوان)ی بوو. پاپەك کوڕی ساسان کوڕێکی بوو ناوی نابوو (ئەردەشێر). هێشتا ئەم کوڕە باڕ نەبووبوو

کە پاپەکی باوکی داوای لە گوزەهر کرد بیکا بە قەڵاوان و بە یارمەتیدەری تیری. ئەردەشێر پاش چەند ساڵی دەسەڵاتی پەیدا کرد و دژی گوزەهر راپەڕی، وەڵاتەکەی لێ داگیر کرد و خۆی ناونا پادشا و تانجی پادشاییتی لەسەرنا. (ئەردەوان)ی پێنجەم کە ئاخرین شای تیرەی ئەشکانیی وڵاتی چیا و عێراقی عەجەم بوو نامەیەکی بەم جۆرە بۆ ئەردەشێر نووسی: «کابرا! تۆ پێت لە بەرەی خۆت پتر درێژ کردووە. بەدەستی خۆت گۆڕ بۆ خەت هەڵئەکەنی ئەی کوردی لەناو خێوەتی کوردانا پەروەردە بوو! کێ ڕێی دای تانج لەسەر بنێی و بکەویە وڵات داگیرکردن؟»

بەم پێشەکییەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە لە سەرەتای زایینەدا عێلاتی کورد لە وڵاتی فارس زۆربوون و دەسەڵاتیان هەبووە و فەرمانڕەواییان دامەزراندووە، بەڵام بۆمان ڕوون نیە ئایا هەخامەنشیەکان ئەم کوردانەیان بەزۆر لە وڵاتی مادەوە هێناوەتە ئەم هەرێمانە، یاخۆ نەهاتی و قاتوقڕی بۆتەهۆی ئەوەی کۆچەرانی کورد بگوێزنەوە ئەم هەرێمی فارسە، یاخۆ شەڕ و هەرای نێوانی داریووشی هەخامەنشی و ئەسکەندەر بوەتە هۆی ئەوەی کوردانی هەرێمەکانی موسڵ و هەولێر بگوێزنەوە بۆ ئەوەی پاراستنی پایتەختەکەیان بەوان بسپێرن، یاخۆ ئەم کوردانە هەر لەبەر ئەوەی هەندێ لە بنەماڵەکانی پاشا تیرە (ملوك الطوائف)ی ئەشکانیی پەرتی، خەڵکی (نەهاوەند) بوو، ڕوویان کردوەتە ئەوێ؟....[٢]

دوکتۆر جەمشیدی سەداقەت کیش باس لە هەبوونی کوردان لەو ناوچانە دەکا هەر لە سەردەمەکانی بەر لە ئیسلام واتە لە سەردەمی هەخامەنییەکان تا کۆتایی سەردەمی ساسانییەکان و دواتریش لە سەردەمەکانی دوای ئیسلام هەتا ئەمڕۆ. بەڵام لە بەرامبەریشدا ژمارەیەك لە سەرچاوەکان زیاتر جەخت لەسەر هەبوونی کوردان لە سەردەمی زەندییە و دوای ئەو سەردەمە دەکەنەوە.

واتە «لەپێوەندیی لەگەڵ چۆنییەتی هەبوونی کوردان لە فارس و شیراز

گێڕانەوە و باسی جۆراوجۆر هەیە. یەکێك لە تیۆرییەکان کە بە پشت بەستن بە بەڵگە و دوکیۆمێنتی زۆر و ئیستدلالی مێژوویی لەلایەن دوکتۆر جەمشیدی سەداقەت کیش، مامۆستای مێژوو لە زانکۆی شیراز لە کتێبی «کوردەکانی فارس و کرمان»دا هاتووە ئەوەیە کە هەبوونی کوردان لە فارسدا ڕەگی لە مێژووی ئەم ناوچەیەدا هەیە و ناوبراو ناوچەکانی فارس و کۆهگیلویە و بویەرئەحمەد و ڕۆژهەڵاتی خوزستان لەبنەڕەتدا بە ناوچەکانی کورد دەزانێ.

بەڵام یەکێکی تر لە گێڕانەوەکان کە لەباری مێژوویی بەڵگەی هەستپێکراوتری لەپشتە: هەبوونی سەرداران و شەرکەرانی کوردە کە بۆ پشتیوانی لە کەریمخان گەیشتوونە شیراز و لەگەڵ ئەم سەرکردانە تایفەگەلێکی زۆر بۆ نموونە وەند و زەنگەنە بۆ پێکهێنانی ئۆردوویەکی یەکپارچە و وەفادار بە حکومەتی زەند، لەلایەن کەریم خانەوە بۆ ئەم ناوچانە ڕاگوێزراون دوای لەنێوچوونی زەندییە، بە بڕیاری ئاغامحەممەدخانی قاجار بۆ زێدی خۆیان دەگەڕێنرێنەوە. لەم نێوەدا ژمارەیەك لە عێل و تایفە کوردەکان لەنێو عێلە قەشقاییەکانی فارس دەمێننەوە کە زۆربەی کوردەکانی فارس لە پاشماوەکانی ئەو سەردەمەن.[٣]

بە بڕوای بابامەردووخ کوردستانی، زیاتر لە ٣٠ تایفەی بچووك لە عەشیرەی کورد لە پارێزگای فارس هەن، کە بێشك بەشی زۆری ئەم تایفانە پاشماوەی ئەو عەشیرانەن کە لەگەڵ کەریم خان بۆ ئەم هەرێمە هاتبوون. پاش هەرەسی دەسەڵاتی زەندییە ئەوان بە گرێبەست لەگەڵ عەشیرەی قەشقایی وەك بنەماڵە تێکەڵ دەبن کە بریتین لە: سەقز، زەنگەنە (پێنج تایفەی جودا کە تایفەیەکیان ئەمڕۆ بنەماڵەی کەشکۆڵی گەورەی قەشقاییان پێکدێنن)، کوورونی، بوگینی، بوربور و ئوریاد (بنەماڵەکانی تایفەی قەشقایی ئامالا)، لەك و وندا (داورودەستەی تایفەی قەشقایی بەرەشووری)، کوردلو (داورودەستەی تایفەی قەشقایی قەرەیواهیلو)، کوردشولی.[٤]

بەڵێ!»کەریم خان لە ساڵی ١١٦٤ی کۆچی مانگی شیراز دەکاتە پایتەختی خۆی و چەند تایفەیەکی کورد لە کوردستان دێنێتە شیراز وەك تایفەی ئەحمەدی وەند و کرونی، کلون عەبدە و خێڵی بایروەند...

ئێستا ئەگەر بیرۆکەی کوردبوونی کەریم خان قبووڵ بکەین، بەڕای لیکۆلەری ئەم بەرهەمە (دوکتۆر جەمشید سەداقەت کیش)، پاساوێکی لۆژیکییە کە کەریم خانی زەند بۆ مەبەستی پشتیوانی کردنی بۆ شیراز و دەورووپشتی ئەو کوردانەی هێنابێ. بوونی کوردێکی زۆر و رۆڵیان لە سەردەمی ئەم پاشایە، لە شیراز و فارس و پاشماوەی کوردەکان لە فارسدا ئەم بابەتە پشتراست دەکاتەوە. ئەمڕۆکە گوندێك بەناوی کرونی لە حەوت کیلۆمەتری باشووری شیراز هەیە هەرچەندە کورد نین بەڵام ناوی تایفەیەکی کورد لەسەر گوندێك لە تەنیشت شیراز هۆکارێکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ئەم بابەتەیە.(٥)

خالێکی گرنگ کە دەبێ باسی لێ بکرێت ئەمەیە: ئەو کوردانەی لە سەردەمی کەریمخانی زەند گواستراونەتەوە بۆ فارس هێشتاش لە فارسدا دەژین، بەڵام بەبێشك ژمارەیەکی زۆر لە سەردەمی قاجارییە گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی سەرەکی خۆیان.(٦)

## ● کوردەکانی ئەمڕۆی فارس و شوێنەکانی نیشتەجێبوونی ئێستایان

### *کوردەکانی غازیوەند لە فارسدا*

ئەمڕۆ زۆرتر لە ٢٠٠ خێزانی کوردی غازیوەند لە خێڵی گۆران لە گەڕەکی تەلخداشی شیراز دەژین. لەسەر ئەم باوەڕەن کە لەگەڵ کەریم خانی زەند هاتوونە شیراز. (ئەمڕۆ تەلخداش لە ناوەندی شارە و لە پەنای دووسایتی موتەهەری و سەتارخانە).

بەداخــەوە هیــچ جــۆرە زانیارییەکیــان لەبــارەی ژمــارەی خانــەوادەکان و لەکــوێ هاتوونــە و مێــژووی تــەواوی هاتنەویــان، نییــە. نزیکــەی ٤٥ خانــەوادە لــەوان لــە گەڕەکــی ســەرافی لەوبــەری دووســایتی موتەهــەری نیشــتەجێنە. ئــەوان خۆیــان بــە کــوردی قازیوەنــد (غازیوەنــد) دەزانــن و نزیکــەی ١٠٠ خانەوادەیــان ئەهلــی حەقــن. بــەڵام ئاییــن و باوەڕەکانیــان تەنهــا لەگــەڵ کوردەکانــی ئەهلــی حەقــی هەمــەدان بەیــەك دەچــن.

بنچینــەی خەڵکــی غەیــری کــوردی گەڕەکــی تەلخــداش لــە فراشــبەند (لــە شــاری فەیروزئابــاد لــە پارێــزگای فــارس)ە کــە وەك خۆیــان دەڵێــن لــەدوای کــوردەکان هاتوونەتــە تەلخــداش. ئەمانــە بــە کــوردەکان دەڵێــن «لــەك» و کوردەکانیــش بەپێــی بــاوەڕی عەشــایری غەیــری فــارس، کــە بەزمانــی فارســی هــەر کەســێك جگــە لــە لــە زمانــی خۆیــان (تــورك و عــەرەب) بــێ، تاجیــك دەڵێــن، بــە هەڵــە بــە ئــەوان دەڵێــن تاجیــك.

لەنێــو کوردەکانــی ئــەم گەڕەکــە تــا ئــەو ڕادەیــە کــە خەڵــك بەبیــری مــاوە، ئەڵڵاکەســی جــۆکار (١٣٥٩ی هەتــاوی، کۆچــی دوایــی کــردووە)، دواییــن کوێخــای ئــەم گونــدە بــووە و لــە کوردەکانــی تەلخــداش بــووە. لەقەبــی کوردەکانــی تەلخــداش زۆرتــر قوولــی پــوور، جــۆکار، مــۆلا، عەزیــزی و ڕاســتی و شــەفیعیە. [٧]

***باری دارایی کوردەکانی غازیوەند:***

بەگشــتی کوردەکانــی تەلخــداش بــاری داراییــان باشــە. زۆربەیــان خــاوەن لۆریــن و هەندێکیــان لــە مەیدانــی ســەوزەی شــیراز کار دەکــەن و لــە بارفرۆشــەکانن و خانووەکانــی کۆڵانــی ســەرافی باشــترە لــە خانووەکانــی گەڕەکــی تەلخــداش. ئەمانــە هیــچ کاتێــك جلــی کــوردی بەتــەواوی لەبــەر

ناکەن بەڵام دەبینین کە هەندێکیان شەڵواری کوردی لەبەر دەکەن. (٨)

ئایین: ئایینی نزیک بە تەواوی کوردەکانی غازیوەند شیعەیە و ئەم بابەتەش هۆکارێک بووە بۆ یەکگرتن و پێکەوەژیان لەگەڵ دەوروپشتیان. ژمارەیەکیشیان پەیڕەوی ئایینی ئەهلی حەقن و جار وایە کە خەڵکی دەوروپشت پێیان ناخۆشە، بەڵام تا ئێستا ئەم بابەتە گرفتی نەخوڵقاندووە.[٩]

## کوردەکانی کرونی فارس

ئەمڕۆ لە پارێزگای فارس، هەندێک کورد دەژین کە بەخۆیان دەڵێن کرونی (korooni). ئەمانە نزیکەی ٥٤٧ خانەوادەن کە لە چەند گوندێکی فارس نیشتەجێن کە خاوەن ئەم تایبەتمەندیانەن:

١ـزمانیان کوردییە.

٢ـلەڕووی ئایینییەوە شیعەی ١٢ ئیمامین.

٣ـهیچ جۆرە زانیارییەکیان نییە کە کەی و لەکوێ و چۆن هاتوونەتە فارس، هەندێکیان دەڵێن لە سەردەمی کەریم خانی زەند بۆ فارس دوور خراونەتەوە. هەندێکیشیان دەڵێن لە کرماشانەوە هاتوون و هەندێکی تریش دەڵێن لە کوردستانەوە هاتوون و ...

٤ـهەموویان عەشایر و بەگشتی کۆچەر بوون و لە نزیکەی ساڵی ١٣٤١ (ساڵی چاکسازیی زەوی‌ءار) هێدی هێدی بەشێوەیەکی ئاسایی لە گوندەکان جێگیر بوون. ئێستا تەنها ١٧ خانەوادە خەریکی کۆچ کردنن.

کوێستانیان لە ڕابردوو و ئێستادا گوندی چل چەشمەی کروونی لە ٤٠ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای شیرازە لە ناحیەی ئەرژەن لە شاری شیراز، گەرمیانیان لە ناوچەی سەرقەناتی ناوچەی دەشتەك لە ٢٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی باشووری شاری کازروونە.

هەرچەنـدە ڕێگایـان ١٢٨ کیلۆمیـترە، بەڵام هەندێکیـان لە گوندی قـەوام ئاباد و گوندەکانی تەنیشـتی لـە ناحیەی بەیزا لە شـاری سـپیدان جێگیر بوونـە، وا مەزەندە دەکرێـت کـە لـە ڕابـردوودا، ڕێگایـان لـە ناوچـەی دەشـتەکی شـاری کازرون تـا ناوچـەی گونـدی قـەوام ئابـادی واتـە ناوچـەی بەیـزا لـە شـاری سـپیدان بـووە و تەنانـەت زۆرتـر و دوورتریـش. ئەویش بـەرەو باکوور، بەم حاڵـە ڕێگایان نزیکەی ١٣٣ کیلۆمەتـر بـووە و ئـەم مەودایـەش دەشـێ ڕاسـت بێ.

٥ـ ئەمـڕۆ بەربڵاویـی کوردەکانـی کروونـی لـە پارێـزگای فارسـدا لەسـەر ڕێـگای کۆچیانـەوە بـووە کـە لـە گوندەکانـی دەشـتەکی شـاری کازرون (گەرمیـان) تـا گونـدی چـل چەشـمە (کوێسـتانە) بـەدی دەکـرێ.

٦ـ دوو گونـدی قـەوام ئابادی چیچکلـوو و چـل چەشـمەی کروونـی، هـەر هەموویـان کـوردن و کەسـێکی تـر تێکەڵیـان نەبـووە. بـەڵام لـە ناوچەکانـی تـرەوە، هـەر گوندێـك پێکهاتـووە لـە کـوردەکان، تورکـەکان، قەشـقایی و فارسـەکان.

٧ـ کوردەکانی گونـدی قـەوام ئابـادی چیچکلـو و گوندەکانی باباکوهـەك لـە کوردەکانی تـری کرونـی فـارس، جـودا بوونەتـەوە و بەگشـتی ئاگایـان لـە یەکـتر نییـە و پەیوەندییـان لەگـەڵ یەکـدا نییـە، هەرچەنـدە لـەڕووی تایبەتمەندییـە ئەخلاقـی و نـەژاد و هتـد بەیـەك دەچـن، بـەڵام زمانیـان هەندێـك جیـاوازە و لەکاتێکـدا کـە کوردەکانـی تـری کرونـی (جگـە لـە کوردەکانـی قـەوام ئابـادی چیچکلـوو و باباکوهـەك ) زمانیـان یەکـە.

گونـدی قـەوام ئابـادی چیچکلـو لـە ناوچەیەکـی زۆر دوورە، بۆیـە تایبەتمەندیـی فەرهەنگـی و کۆمەڵایەتییـان لەگـەڵ کوردەکانـی کرونـی فـارس جیـاوازە.

٨ـ بەربڵاویـی و دابـەش بوونیـان لـەڕووی جوگرافیاییـەوە لـە گوندەکانـی

فـارس بـەم شـێوەیەیە:

| ناوی گوند و ناوچە | خانەوادە |
| --- | --- |
| ١ـ ٨ـ گوندی چل چەشمەی کرونی لە شاری شیراز | ٢٣٠ |
| ٢ـ ٨ـ گوندی خەیرئابادی کرونی لە شاری کازرون | ٤٣ |
| ٣ـ ٨ـ گوندی بەهرام ئاباد لە شاری کازرون | ٥٠ |
| ٤ـ ٨ـ گوندی وەفادارئاباد لە شاری کازرون | ٣١ |
| ٥ـ ٨ـ گوندی شێخی لە شاری کازرون | ٢٧ |
| ٦ـ ٨ـ ناوچەی سەرقەنات لە دەشتەك لە شاری کازرون | ١٧ |
| ٧ـ ٨ـ شاری کازرون | ١١ |
| ٨ـ ٨ـ گوندی قەوام ئاباد لە شاری سپیدان | ١٤٠ |
| ٩ـ ٨ـ گوندی باباکوهەك لە شاری سپیدان | ٢٥ |
| ١٠-٨- کۆ | ٥٧٤ |

٩ـ لەنێوانیـان هیـچ کەسـێك واتـای وشـەی «کرونـی» نازانـێ. تەنیـا کەسـێك لـەوان، باسـی واتایەکـی دەکـرد کـە لـە کتێبێکـدا نـووسراوە کـە ئـەم وشـەیە لـە ئەسـڵدا وشـەی «کُرهانـی» بـووە لەکاتێکـدا ئـەم بۆچوونـە، زۆرتـر لـە بـواری زمانناسـی و فۆلکلـۆرەوە بنەمـای زانسـتیی نیـە...

١٠ـ کوردەکانی گونـدی قـەوام ئابـادی چیچکلـو خۆیـان بـە لـەك دادەنێـن و لـەم بارەیـەش هیـچ جـۆرە بەرهەمێکـی نـووسراو کـە باسـی لەکەکانـی فـارس بـکات، نیە.

١١ـ لەنێـوان لەقەبـی کوردەکانـی کرونـی گونـدی باباکوهـەك «گـوران نوبنیـاد» هەیـە کـە خۆیـان لـە هـۆزی گـۆران دەزانـن. لەنێـوان لەقەبەکانـی گونـدی بەهـرام ئابادیـش، لەقەبەکانـی زەنـدی هەیـە کـە ڕەنگـە لەژێـر کاریگەریـی هـۆزی زەنـد بووبـێ یـان بـەزۆری کۆچدانـی هەندێـك لـە هـۆزی

زەنـد بـۆ نێوانیـان (کـە لـەم حاڵەتـەدا بابەتـی زمانـی دێتـە ئاراوە) و لـە ئەنجامـدا ڕەنگـە تایفەیـەك لـە کـوردەکان بەنـاوی زەنـد بوویـێ.

١٢ـ بەپێـی ژمارەیەکـی زۆر لـە کێلـی گۆڕسـتانی قـەوام ئابـادی چیچکلـو لـە سـەدەی سـێزدەی ه.ق ژمـارەی کوردەکانـی زەنگەنـە لـەو ناوچەیـە زۆر بـووە...[١٠]

•••

## کوردەکانی کرونی شاری شیراز

### *کوردەکانی کرونی گوندی چل چەشمەی کرونی*

بەڕێـز دوکتـۆر جەمشـید سـەداقەت کیـش لـە لاپـەڕە ١٧٧ی کتێبەکەیـدا نووسـیویەتی:

لـە ڕۆژی پێنجشـەممەی ١٠ی گەلاڕێزانـی ١٣٨٠ (هەتـاوی) بـە مەبەسـتی لێکۆڵینـەوە لەسـەر کـوردەکان، چوومـە گونـدی چـل چەشـمە (چهـل چشـمە) کـە لـە ٤٠ کیلۆمەتـری ڕۆژئـاوای شـیراز هەڵکەوتـووە و لـە بەشـی ئەرژەنـی شـاری شـیرازە. لەگـەڵ حـەوت کـەس لـەوان وتووویـژم کـرد.

(ڕێـگای گونـدی چهـل چشـمە لـە دوای گونـدی خـان زەنیـان لـە ٤٠ کیلۆمەتـری ڕۆژئـاوای شـیرازە لـە جـادەی شـیراز کازرون، جـادەی لاوەکـی گونـدی چـل چەشـمەی کرونـی لـەلای ڕاسـتەوە جیـا دەبێتـەوە و لـەدوای نزیکـەی دوو کیلۆمەتـر دەگاتـە ئـەم گونـدە جوانـە.)

کوردەکانـی کرونـی چـل چەشـمە دەڵێـن هەتـا نزیکـەی ٥ سـاڵ لەمەوبـەر کوێسـتان و گەرمیانیـان دەکـرد و عەشـایر بـوون. گەرمیانیـان لـە ناوچـەی سـەرقەناتی دەشـتەك (لـە دەوروبـەر و بەشـی ناوەندیـی شـاری کازرون) و

کوێستانیان هەر ئەم ناوچەی گوندی چل چەشمە بووە کە بە شێوەیەکی ئاسایی نیشەجێ بوون. ئەمانە خۆیان لە تایفەی کرونی دەزانن و یەکێك لەوان وتی کە لە تەمەنی حەوت ساڵاندا لە باپیری گوێی لێ بووە کە لە خێڵی گۆران. بەڵام هەر هەموویان لەسەر ئەم باوەڕەن کە لە سەردەمی کەریم خانی زەند بۆ ئەم ناوچەیە کۆچ دراون.

ئێستا بەپێی وتەکانیان نزیکەی ٢٣٠ خانەوادەی کوردی کرونی لە چهل چەشمەدا دەژین و زۆربەیان لەقەبیان کازمی، حەسەنی، کرونی، ڕەیحانی و ڕۆحانییە.

کاری زۆربەی ئەو خەڵکە جوتیاری و ئاژەڵدارییە و باری ئابووری و دارایییان باشە، لەسەر مەزهەبی شیعەی ١٢ ئیمامین.

زمانی کوردەکانی کرونی کوردییە و گەلێك میواندار و بەحورمەتن.[11]

### کوردەکانی کرونی شاری کازرون

لە هێندێك لە گوندەکانی شاری کازرون کوردەکانی کرونی نیشتەجێن کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

### کوردەکانی کرونی گوندی خەیرئابادی کرونی

لە ١٣ کیلۆمەتری باکووری شاری کازرون و لەسەر ڕێگای قیرەتاوی کازرون ـ پیشابوور ـ شیراز لە ٥١:٣٥ درێژی جوگرافیایی و لە ٢٩:٤٠ی پانی جوگرافیایی هەڵکەوتووە. لە ڕابردوودا ئەم گوندە بە خەیرئاباد ناسرابوو و لە بەرهەمە نووسراوەکان خەیرئابادی کرونی هاتووە و ئەمڕۆ هەندێ: تنها کرونیی پێدەڵێن. ئەم گوندە ئێستا بەشێکە لە گوندی شاپوور لە ناحیەی ناوەندیی شاری کازرون و بەپێی وتەی ئەو کەسەی لێدوانی لەگەڵ

کـراوە، نزیکـەی ٣٠٠ خێزانـی تێـدا دەژیـن کـە لـەم ڕێژەیـە نزیکـەی ٣٠ خێزانـی کـوردی کرونیـیـە. خانـووی ئەمانـە لـە باکـووری مزگـەوت و لـە باکـووری گوندەکەیـە. لەقەبـی زۆربـەی کرونییەکانـی ئـەم گونـدە بریتییـە لـە: کازمـی، هیمەتـی، مهرابـی نـەژاد، غەیـوری، بـاسری و عەباسـی. نزیکـەی ١٣ خێـزان لـە کوردەکانـی کرونـی لـەم گونـدە بەهـۆی زەواج لەگـەڵ خەڵکـی ناوچەکانـی تـرەوە یـان بەهـۆی دۆزینـەوەی کار بـۆ شـاری شـیراز، شـاری کازرون، کەمـارج (لـە شـاری کازرون)، ئەحمەدئابـاد (لـە شـاری کازرون) و کوهمـەرەی سـەنقان و ... کۆچیـان کـردووە.

کرونییەکانـی ئـەم گونـدە خەریکـی کشـتوکاڵن و بـاری ئابـووری و دارایـیـان گونجـاوە بـەڵام زۆربـاش نییـە.

دوایـن کوێخـای کرونییەکانـی گونـدی خەیرئابـادی کرونـی ئەلیاسـی هیمەتـی نـژاد بـووە کـە لـە سـاڵی ١٣٥٤ی هەتـاوی، کۆچـی دوایـی کـردووە.

بـە لێکۆڵینـەوە و بەراوردکـردن و پرسـیارکردن دەرکەوتـوە کـە زمـان و زاری کـوردی تـەواوی کوردەکانی کرونـی شـاری کازرون وەك زمـان و زاری کوردیـی کوردەکانـی گونـدی چـل چەشـمەی کرونییـە...[١٢]

### *کوردەکانی کرونی گوندی بەهرام ئاباد*

بەهـرام ئابـاد لـە دوو کیلۆمەتـری باکـووری گونـدی خەیرئابـادی کرونـی لـە ١٥ کیلۆمەتـری باکـووری کازرون هەڵکەوتـووە. نـاوی تـری ئـەم گونـدە، زەریـن ئابـاد و زەریـن ئابـادی کرونییـە.

بەپێـی قسـەی خەڵکـی ئـەوێ، ڕێـژەی دانیشـتووانی ئـەم گونـدە ١٢٠ خێزانـە کـە نزیکـەی ٥٠ خێزانیـان کـوردن و لـە تایفـەی کرونینـە و بەگشـتی لەگـەڵ کوردەکانـی گونـدی خەیرئابـادی کرونـی خزمایەتیـان هەیـە. زۆربەیـان

جوتیارن و تەنها یەك یا دوو کەسیان خودانی قەڵابن. لەقەبی زۆربەیان: زەندی، ئەفرەنگ، فەرهادی، شێخی، پەیزرۆفتە و ئەفزەلییە.

ڕەچەڵەکی کوردەکانی کرونی گوندی بەهرام ئاباد ـ بەپێی قسەی یەکێك لەوانەی لێدوانی لەگەڵ کراوە ـ لە کرماشانە، بەڵام لەبارەی ئەوەی کە چ کاتێك بووە و چەند کەس بوونە زانیارییەك بەدەستەوە نییە، هەرچەندە لەم بابەتەش بەتەواوی دڵنیا نەبوو. هەڵبەت لە ڕابردوودا، کوردەکانی ئەم گوندە، لە هەمان ڕێگای کوێستان و گەرمیانی کوردەکانی کرونی (واتە چل چەشمە بەرەو ناوچەی دەشتەکی کازرون) کۆچیان دەکرد و نزیکەی سالّی ١٣٤١ (ساڵی چاکسازیی زەوییەکان) بە شێوەیەکی ئاسایی لەم گوندە نیشتەجێ بوونە.[١٣]

***کوردەکانی کرونی گوندی وەفادار ئاباد***

گوندی وەفادار کە لە ڕابردوودا بە سوڵتان ئاباد ناسراو بوو، لە سەردەمی شۆڕشی ئیسلامی، بە ناوی وەفادار ناسراوە, ئەم گوندە لە یەك کیلۆمەتری باکووری گوندی بەهرام ئاباد و ١٦ کیلۆمەتری باکووری شاری کازرون و لە هەمان ڕێگای گوندەکانی ترە.

لە ١٥٠ خێزانی ئەم گوندە، نزیکەی ٢٠ خێزانی کوردی کرونییە کە نزیکەی ساڵی ١٣٤١ واز لە کۆچکردن (ڕەوەندی) لە ڕێگای چل چەشمە بەرەو ناوچەی دەشتەکی کازرون دێنن و لەم گوندە جێگیر دەبن. ئەمان لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە ڕابردوویەکی دووردا، بۆ فارس دوور خراونەتەوە بەڵام لە چ کاتێك و لە کوێ، کەس نازانێ.

لەقەبی کوردەکانی ئەم گوندە: کازمی، ئەژدەری، ئەفرەنگە و لەنێوانیان

چوار خێزان لەم ساڵەی دواییدا چوونەتە گوندی ڕەشەن ئاباد و خەیرئاباد[١٤]

### کوردەکانی کرونی گوندی شێخی

گوندی شێخی کە ناوەکەی لە ناوی باپیرەگەورەی خاوەنی غەیرە کوردی ئەم گوندە وەرگیراوە، لە یەك کیلۆمیتری باکووری گوندی وەفادارئاباد و لە ١٧ کیلۆمیتری باکووری شاری کازرون هەلکەوتووە.

لەم گوندە کە ٧٠ خیزانن، ئەمرۆ ١٦ خێزانی کوردی کرونی تێدا دەژین کە لەم ساڵانەی دواییدا هەندێکیان بەو ئەم ناوچانە کۆچیان کردووە:

شاری بوشێهر : ٥ خێزان

کۆنار تەختە (لە پارێزگای بەشێهر) : ١ خیزان

شاری شیراز : ٢ خێزان

چنار شاهیجان (لە شاری کازرون) : ٢ خێزان

بەیزا (لە شاری سپیدان) : ١ خێزان

کۆی هەموویان: ١١ خێزان

### کوردەکانی کرونی سەرقەنات

لە سەرقەناتی ناوچەی دەشتەك لە نزیکەی ٢٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری کازرون ١٧ خێزانی کوردی کرونی لە کوێستانی چل چەشمە لەم مانگە (ئازاری ١٣٨٠) هاتوونە و بەشێوەیەکی کاتی جێگیربوونە، ئەمانە هێشتا بە ڕەوەندی ماون و گەرمیانی ئەو کوردە کرونیانە، هەر ئەم ناوچەی دەشتەکە.

### کورده‌کانی کرونی شاری کازرون

له کۆتایی شه‌قامی به‌هه‌شتی زه‌هرای شاری کازرون، ١١ خێزان له هه‌ر دوو لای دووسایته‌که و له نزیك یه‌که‌وه ده‌ژین که له ساڵی ١٣٢٤ی هه‌تاوی له گوندی چل چه‌شمه‌ی کرونی هاتوونه کازرون و خه‌ریکی جووتیارین و دوو که‌سیشیان مامۆستای سه‌ره‌تایین و له‌قه‌بیان به‌شکار، کازمی، عه‌باسی زاده، عه‌لیفه‌رد و شاوه‌له‌د و له‌م دواییانه سێ سه‌ر خێزان به‌ره‌و گوندی قه‌سری قومشه (له ڕۆژئاوای شاری شیراز)، شاری کوار و شاری شه‌هر ڕه‌زا (له پارێزگای نیسفه‌هان) کۆچیان کردووه. له وته‌کانی یه‌کێك له دانیشتووانی ئه‌و گونده واده‌رده‌که‌وێ که باپیرانیان به ٥٠ خێزانه‌وه له کرماشانه‌وه به‌ره‌و فارس هاتوون.[١٥]

### کورده‌کانی کرونی شاری سپیدان

کورده‌کانی کرونی گوندی قه‌وام ئابادی چیچکلوو

گوندی قوام ئابادی چیچکلوو له ٥٢:٢٥ درێژی جوگرافیایی و ٣٠:٠٥ پانی جوگرافیایی هه‌ڵکه‌وتووه و ئێستا به‌شێکه له دێهستانی بانێش له ناحیه‌ی به‌یزا. له شاری سپیدان سه‌ر به پارێزگای فارس و له ساڵی ١٣٦٩، ٦٥ خێزان بوون و ژماره‌یان ٣٥٥ که‌س بووه.

به‌رێز دوکتۆر جه‌مشید سه‌داقه‌ت کیش له لاپه‌ڕه ٢١٨ی کتێبه‌که‌یدا نووسیویه‌تی:

له ڕۆژی دووشه‌ممه‌ی ١٤ی گه‌لاڕێزانی ١٣٨٠ (هه‌تاوی) به مه‌به‌ستی لێکۆڵینه‌وه له‌سه‌ر کورده‌کانی ئه‌م گونده سه‌ردانی ئه‌م ناوچه‌یه‌م کرد. له لێکۆڵینه‌وه سه‌ره‌تاییه‌کان بۆم ده‌رکه‌وت که ته‌واوی ئه‌م ٧٠ سه‌ر خێزانه‌ی ئه‌م گونده کوردن و له نه‌ته‌وه‌کانی تر که‌س له‌م گونده ناژیت.

ئه‌م خه‌ڵکه له‌سه‌ر ئه‌م باوه‌ڕه‌ن که هه‌ر هه‌موویان کوردی له‌کن و له تایفه‌ی کرونین و پێیان وایه له سه‌رده‌می که‌ریم خانی زه‌ند بۆ فارس دوور خراونه‌ته‌وه.

هەڵبەت خۆشیان نازانن لە چ ناوچەیەك بۆ ئەم ناوچەیە دوور خراونەتەوە. ئەوان دەڵێن زمانیان لەگەڵ خەڵکی ئیلام و کرماشان یەکێکە بەڵام زمانیان لەگەڵ خەڵکی مەهاباد و سنە جیاوازە. ئەمەش بابەتێکە دەبێ پسپۆڕانی زماناسی بڕیاری لەسەر بدەن.

ئەمانە لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام و شیعەی ١٢ ئیمامین. کاروباری خەڵکی ئەم گوندە جووتیاری و ئاژەڵدارییە و زۆرتر خەریکی کەسابەتی یاسایین و باری ئابووریان باشە. لەلایەنی فەرهەنگییەوە خاوەن تایبەتمەندیی کوردەکانن و بابەتێ کە شایانی باسە ئەمەیە لەم کۆمەڵگا بچووکە. بەهۆی ئەم تایبەتمەندییە مەزنە. یەك کەس خووی بە ماددە بێهۆشکەرەکان نەگرتووە و زۆربەیان جگەرەش ناکێشن، کوردەکانی قەوام ئابادی چیچکلوو لەڕووی قەومی و نەتەوەییەوە زۆر پابەندن، چونکە لە تەواوی شاری سپیدان، تەنها ئەم گوندەیە کە تەواوی کوردن و هیچ کەسیان یاخی نەبووە.

گوندی قەوام ئابادی چیچکلوو هەتا ئێستا کە شۆڕای ئیسلامی هەیە، کوێخای نەبووە، بەڵام کوردەکانی ئەم ناوچەیە (لەگەڵ گوندی زەکیانی باباکوهەك) کەلانتەری هەبووە و دوایینیان ئیبراهیم خانی گورانی نیك بونیاد بووە کە لەساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە و لەدوای ئەو ئیتر کوردەکانی ئەم ناوچەیە کەلانتەریان نەبووە.

گرووپێك لە کوردەکانی ئەم ناوچەیە یان بەهۆی زەواج، یان بەهۆی کۆچکردن بە مەبەستی کار بەرەو ناوچەکانی تری فارس کۆچیان کردووە کە دابەش بوون و بەربڵاوی جوگرافیاییان بەم شێوەیەیە:

گوندی تەختەسەنگی (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ٣٠ خێزان

گوندی بانێش (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ٨ خێزان

گوندی حەفت خان (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ١٠ خێزان

گوندی دۆشمەن زیاری (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ١ خێزان

گوندی دەرەسفید (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ٢ خێزان

گوندی بهمەئی (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ١ خێزان

گوندی پۆشتی باغ (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ٢ خێزان

گوندی شا قوتبەددین (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ١ خێزان

گوندی کوشکی محەمەدئاباد (لە ناحیەی بەیزا، شاری سپیدان) ١ خێزان

گوندی بارزئاباد (لە ناحیەی ناوەندی، شاری مەرڤدەشت) ٥ خێزان

گوندی جەشنیان (لە ناحیەی ناوەندی، شاری مەرڤدەشت) ٣ خێزان

گوندی تورك ئاباد (لە ناحیەی زەرقان، شاری شیراز) ٤ خێزان

گوندی کوار (لەپارێزگای فاری) ١ خێزان

کۆی گشتی: ٧٠ خێزان

کەواتە لە ١٤٠ خێزانی گوندی قەوام ئاباد ٧٠ خێزان لە گوندەکە ماون و ٧٠ خێزانیش بەرەو شوێنەکانی سەرەوە کۆچیان کردووە. [١٦]

### *کوردەکانی گوندی باباکوهەك*

گوندی باباکوهەك کە خەڵکەکە پێی دەڵێن گوندی زەکیانی باباکوهەك لە ڕابردوودا بە قەڵای مونەوەری و گوندی کرونی ناسراو بووە و ئەمڕۆ لە ٥٢:٣٠ درێژی جوگرافیایی و ٣٠:٠٥ی پانی جوگرافیایی هەڵکەوتووە و بەشێکە لە دێهستانی بانێش لە ناحیەی بەیزای شاری سپیدان و لە ساڵی ١٣٦٩ی هەتاوی ژمارەی ٢٥ خێزان و ١٣٤ کس بووە.

لەم گوندەدا ١١ خێزانی کوردی تێدا دەژین و لەقەبیان گۆرانی نیك بونیاد، کەریمی و نەبەوییە. هەر هەموویان جوتیارن و لەسەر مەزهەبی شیعەی ١٢ ئیمامین و تەنانەت یەك کەسیش خووی بە ماددە بێهۆشکەرەکان نەگرتووە.

جگـە لـە کوردەکانی ئـەم گوندە کە خۆیـان بە هۆزی گـۆران دەزانـن، نزیکەی ٥٠ خێـزان لـە هـۆزی فارسـی زمانی بـاسری لـەم گونـدەدا دەژیـن. کوردەکانی ئەم گونـدە لەگـەڵ کوردەکانـی گونـدی قـەوام ئابـادی چیچکلـوو خزمایەتیـان هەیـە و بەداخـەوە هیـچ زانیارییەکیـان لەبـارەی مێـژووی هاتنیـان بۆئـەم گونـدە نیـە. باسرییـەکان نزیکـەی ١٠٠ سـاڵە هاتوونەتـە ئـەم گونـدە...[١٧]

***گوندی زەنگەنەی کرونی***

بەپێـی بۆچوونـی خەڵکـی گونـدی قـەوام ئابـادی چیچکلـوو و گونـدی باباکوهـەك، قەڵایـەك لـە نزیکـی هـەر دوو گوندەکـە بەنـاوی گونـدی زەنگەنـەی کرونـی یـان قـەڵای زەنگەنـەی کرونـی هەبـووە کـە کـورد بوونـە. قەڵاتەکـە ویـران بـووە و هیـچ کەسـێك زانیارییەکـی لەبارەی خەڵکی ئـەم گوندە نییە. لە گۆڕسـتانی گونـدی قـەوام ئابـادی چیچکلـوو، چەنـد کێلـی کوردەکانـی زەنگەنـەی کرونـی هەیـە کـە کۆنترینیـان هـی سـاڵی ١٢٤٢ی کۆچـی مانگییـە.[١٨]

- **کوردەکانی تری فارس**

***کوردەکان لە شیراز***

جگـە لـە کوردەکانی غازیوەنـد و کرونی فـارس، لەم پاریزگایـە گرووپگەلێکی تریـش هـەن کە لە خـوارەوە ئاماژەیـان پێکراوە:

١ـ پاشـماوەی کوردەکانـی زەندییـە کە بریتین لەم خێزانانە: بۆسـتانی زەند، زەند، زەنـدی، نیازمەنـد، کرونـی و کرانی، هـەر هەموویان لە شـیرازدا دەژین.

٢ـ گرووپـی کوردەکانـی زەنگەنـە بـە لەقەبـی زەنگەنـە کـە لە شـارەکانی شـیراز، بوشـێهر و ناوچەکانـی تـری پارێزگای بوشـێهردا دەژین.

•••

## *کۆڵانی لەکەکان لە شیراز*

لـە ناوچەی دەرەشـێخی شـەقامی لوتفعەلیخان لە شـاری شـیراز کۆڵانێك هەیە کـە بە نـاوی کۆڵانـی «لەکـەکان» بەناوبانگە. دوکتۆر جەمشـید سـەداقەت کیش لە میانـی سـەردانێکی مەیدانـی بـۆی دەرکەوتـووە کە ئێسـتا چەندین جـۆر خەڵك لە ناوچەکانـی ئەسـتەهبان، شـەهری کـورد، کوشـکەك (ناوچەیـەك لە شـاری شـیراز) و دوو سـەر خێزانـی کـورد لـە هەمـان تایفـە و گرووپـی کوردەکانـی غازیوەنـدی تەلخداش لـەم کۆڵانـەدا دەژین.

نزیکـەی ٦٠ سـاڵ لەمەوبـەر. زۆرینـەی خەڵکـی ئـەم کۆڵانـە لـە کوردەکانـی غازیوەنـد بوونـە و زۆربەشـیان پەیـڕەوی ئایینـی ئەهلـی حـەق بـوون.

کەواتـە نـاوی ئـەم کۆڵانە دەشـێ لـە سـەردەمی پاش کەریـم خانی زەنـد واتە بە هاتنـی کـوردەکان کە بە زۆری بەدەسـتی ئەم پاشـایە کـۆچ دراون، بووبێ.

ئەمـڕۆ لـە شـاری شـیراز خانەوادەگەلێـك هـەن کـە لەقەبیـان (لـەك، لەکـی باڵا، لەکـی پاییـن)ە کـە ڕەنگـە هـەر هەموویـان لـە پاشـماوەی کوردەکانـی سـەردەمی زەندی بـن.[١٩]

## *بۆچوونی نوێ*

لەنێـوان هـۆزە جیاجیاکانـی نیشـتەجێی فـارس و لەنێـوان عەشـایر، هەندێکیـان کـە ناویـان کوردییە یـان خۆیـان دەڵێن کە کـوردن.

بەڕێـز دوکتـۆر سـەداقەت کیـش دەڵـێ: «لـە درێـژەی لێکۆڵینەوەکانـم لەسـەر کوردەکانـی پـارس، وام بـۆ دەرکەوتـووە کـە دەشـێ بنچینەیـان و خوێنیـان کـورد بێ چ فـارس زمـان بن یـان چ تـورك زمـان. هەروەها بـە بۆچوونی مـن دوو تایفەی چهارراهـی و لەشـنی بنچینەیـان کـوردە و لـە پاشـماوەی کوردەکانـی سـەردەمی زەندییەن.»

گرووپی فارس زمانەکان:

**ـ لەکەکانی مەمەسەنی**

لە تایفەی جاویدی خێڵی مەمەسەنی لە فارسدا تیرەیەك بە ناوی لەك هەیە، تیرەی لەك (بە ٤٠ خێزان و ٢٠٧ خێزان)، لەکی باباخان (١٠ خێزان و ٦٩ کەس)، لەکی زەندی (٣٣ خێزان و ١٦٥ کەس) و لەکی نیازی (١٥ خێزان و ٩٢ کەس).

ئەمانە بە فارسی و بە شێوەزاری لوڕی مەمەسەنی قسە دەکەن، لە بنچینەی ئەم تیرەیە زانیارییەکمان نییە تەنها ئەوە نەبێ کە دیارە تیرەی لەکی زەندی لە سەردەمی کەریم خانی زەند بەرەو فارس هاتوون.

**ـ تیرەی دۆز کوردی**

لە تایفەی ڕۆستەم لە هۆزی مەمەسەنی، تیرەی دۆز کوردی (بە دوو خێزان و ١٧ کەس) دەژین. زمانیان فارسی بە زاری لوڕی مەمەسەنیە.

**ـ هۆزی کوردشولی**

هۆزی کوردشولی یەکێکە لە پێنج هۆزی سەربەخۆی سەردەمی قاجار، ئەمڕۆ بە ٦٦٩ خێزان و ٢٤٧٨٧ کەس لە فارس ژیان بەسەر دەبەن. کوردشولەکان دەڵێن لە پاشماوەی کوردەکانی ڕەمومی کوردەکانی پارسن.

**ـ تایفەی چهارراهی و لەشنی**

تایفەی چهارراهی نزیکەی ٥٠ساڵە لە گوندی چهارراه کە ئەمڕۆ ناوەندی ناحیەی سەرچەهانە لە شاری بەڤانات و بە ناوی کۆرەیی، بەشێوەیەکی ئاسایی نیشتەجێن.

تیرەکانی تایفەی چهارراهی بریتین لە: میرزایی، مۆرتەزایی، تەلایی، هاشمی،

حوسێن خان، میرشکاری، محەمەدخان، سالاری و قەلتاشی.

لە کاتی کۆچ کردنیان کوێستانیان ناحیەی سەرچەهان تا گوندی کۆرەیی و، گەرمیانیان ئابادەی تەشك لە شاری نەیریز هەتا شاری داراب بووە.

تایفەیەکی دیکەش لە هەمان گوند و لە شاری ئابادەی تەشك و تەنانەت داراب نیشتەجێ بوون بە ناوی لەشنی کە لە ساڵی ١٢٩٧ی هەتاوی ژمارەیان بەپێی ڕاپۆرتی هێنری فیلد ١٥٠٠ خێزان بووە. لە هەمان کاتدا لەشنییەکان بەسەر دوو گرووپ دابەش دەبوون و هەر دوو گرووپ نیشتەجێی گوند بوو. هەندێکیان لە خەفەرك و مەرڤدەشت و هەندێکیشیان لە ئابادەی تەشك دەژیان و هەندێکیان نیشتەجێی باکووری کەناری دەریاچە بوون. ژمارەیان ١٥٠٠ خێزانە و تیرە لاوەکییەکانیان بریتین لە: خەفەرکی پێکهاتوو لە: نەبوسەر، بازوەند، خەلیلوەند، شاوەند، توتکی. ئابادەی تەشکی پێکهاتوو لە: ئیروەند، عەبدوڵڵاوەند، خەفەروەند، موراد‌وەند، نەجمەددین وەند، یەزدان وەند، بەهمەن وەند، ئەولادی شێخ عەلی، ئەولادی ئەمیرئاقا، تیرەکانی مولیرەمەك، تولامەکی، کوشکایی، کە دواتر لەگەڵ بەهمەنی وەند یەکیان گرتەوە.

خەڵکی ناوچەکە هەموو جارێ هەردوو ناوەکەیان پێکەوە، واتا چهارراهی و لەشنی یان لەگەڵ یەك بەکار دەهێنا.

کۆنترین سەرچاوە کە باسی چهارراهی دەکات هی ساڵی ١٢٧٠ کۆچی مانگی و کۆنترین بەرهەمیش کە ناوی لەشنی دێنێ هی ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی مانگییە. هێنری فیلد چهارراهییەکان کە لە ساڵی ١٣١٦ی کۆچی بە ١٢٠٠ خێزان مەزەندە دەکات و لە شوێنێکی تر ڕێژەی چهارراهییەکان و لەشنییەکان بە ٦٥٠٠ خێزان مەزەندە دەکات کە لە هاویندا لە چهاررا و لە زستان لە دوورگەکانی دەریای بەختەگان ڕۆژگاریان بەسەر بردووە.

... کەواتە دەشێ تایفەی چهارراهی و لەشنی لە پاشماوەکانی کوردەکانی

سەردەمی زەند بووین کە لەگەڵ کەریم خانی زەند بەرەو فارس هاتوون و نیشتەجێبوون.

## ● گرووپی تورك زمانەکان:

***ـ تیرەی لەك***

ئەمرۆ لە تایفەی کەشکولی هۆزی قەشقایی تیرەیەك بە ناوی لەك (بە ٤٨ خێزان و ١٠٠٥ کەس) هەیە. ئەمانەش بە زمانی تورکی قسەدەکەن بەڵام دەزانین کە لەك، تایفەیەکی کوردە. لە مێژوو و شێواری کۆچیان بەرەو فارس و ناوچەکانی تر زانیارییەکمان بەدەستەوە نییە.

***ـ تیرەی عەلی کوردی***

ئەمڕۆکە، لە تایفەی فارسیمەدان لە هۆزی قەشقایی، تیرەیەك بەناوی عەلی کوردی بە ٤ خێزان و ١٥ کەس هەیە کە ئەمانە بە تورکی قسە دەکەن بەڵام وا دیارە کە خوێنی کورد لە دەمارەکانیان هەبێ.

**ـتیرەی شەبانکارە (شوانکارە)**

ئەمڕۆ دوو تیرەی شەبانکارە لە هۆزی قەشقایی، یەکێك لە تایفەی فارسیمەدان و ئەویتر لە تایفەی عەمەلە جارێ خەریکی کۆچڕەوین. بوونی ئەم دوو تایفەیە پێشاندەری بەزۆر کۆچدانی کوردەکانی شەبانکارە بۆ ناو هۆزی قەشقاییە کە لەژێر کاریگەریی زمانی هۆزی قەشقایی (تورکی قەشقایی) بە زمانی تورکی قسە دەکەن.[٢٠]

## ● پاشماوەی کوردەکانی کوفەج لە فارس

**پێشەکی**

هەندێك لە کوردەکان بەر لە ئیسلام لە پارێزگای کرمان دەژیان بەناوی قوفەس

یان کوفەج. زانیاری بە شێوەی نووسراو لەبارەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتەمی کۆچی مانگی لەدوای ئەمە زانیارییەکمان نییە. لە ساڵی ١٢٩٠ تا ١٢٩٣ کۆچی مانگی، ئەحمەدخانی وەزیری، مێژوونووس و جوگرافیناسی کرمانی ڕادەگەیەنێ کە تایفەی مێهنی کرمان لە پاشماوەی کوردەکانی کوفەجن و بەڕێز دوکتۆر محەمەد ئیبراهیمی باستانی پاریزی، بۆچوونی وەزیری پەسند دەکات.

ژمارەیەکی زۆر لە مێهنییەکان لە قۆناغەکانی پێشوو بەرەو فارس دێن و هەندێکیان لەوێ جێگیر دەبن کە ئەمڕۆ لە سێ تایفە پێکدێن.

لەسەر سنووری ڕوژئاوای فارس، لەسەر سنووری فارس و پاریزگای یەزد.

سێ تایفی مێهنی، تونەکی و قەلتاشی دەژین کە خەڵکی ئەم تایفەیە لەسەرئەم باوەڕەن سێ برا بوون کە هاتوونەتە ئەم ناوچەیە و ئەم سێ تایفەیان پێك هێناوە.

لە وەڵامی ئەوەی کە ئەم سێ برایە لەکوێ هاتوونە، زۆربەیان زانیاریان نەبوو، بەڵام هەندێك لە تایفەی مێهنی دەیانگوت لە کرمانەوە هاتوون کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاگاداربوونیان لە مێهنییەکانی کرمان لەکاتێکدا کە زانیاریی زۆربەیان دووره لە ڕاستی و ئەمەش لەبارەی هەریەك لەم تایفانە بەڕوونی دیارە.

خەڵکی ئەم سێ تایفەیە لەسەر مەزهەبی شیعەی ١٢ ئیمامین بەڵام لەنێوانی ئەم سێ تایفەیە، تایفەی مێهنی زۆرتر لە دوو تایفەکەی تر لەڕووی مەزهەبیەوە دەمارگیرن. زمانیان فارسییە، بەڵام لەهجەیان لەگەڵ ناوچەکانی دەوروپشتیان وەك گوندی خانسار و ناحیەی سەرچەهان یەکێکە.

جل لەبەرکردنی پیاوان، قات و جل لەبەرکردنی ژنان، وەك تەواوی ژنانی گوندەکانی فارس، لە داوێنێکی بەرین و کراسێکی درێژ پێکدێت.

خەڵکی ئەم سێ تایفەیە لەڕووی دابونەریت و فەرهەنگەوە وەك خەڵکی خانسار و ناحیەی سەرچەهانن. تایبەتمەندیی نەژادی و ئەخلاقیان وەك

کوردەکانی قوقەس و کوفەجە. بە دەستەواژەیەکی تر سەرکەش و یاخی و شەڕانگێزن. لەنێوان ئەم سێ تایفەیە میهنییەکان هەندێجار لەنێوان خۆشیان بەشەڕ دێن و هەروەك لە باسی کوردەکانی کرمان وتوومانە مێهنییەکان پاشماوەی قوقەسەکان و کوفەجەکانن، توتەکیەکان لەلایەن نەتەوەییەوە دەمارگیرترن و قەلتاشیەکانیش لە هەموویان زۆرتر یاخیان هەبووە و تەنها لە ساڵی ١٣٠٠ تا ١٣٥٧ه زۆرتر لە ٢٠ یاخیان هەبووە...

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی من (دوکتۆر جەمشید سەداقەت کیش) ئەمەیە کە هەر سێ تایفە لە پاشماوەی قوقەسەکان و کوفەجەکانن و نزیکەی ساڵی ١٠٠٠ی کۆچی مانگی بۆ فارس هاتوون و نازانین لەکوێوە هاتوون. لە گۆڕستانی توتەکیەکان و قەلتاشییەکان هیچ کێلێ نییە کە لێکۆڵینەوەی زۆرتری لەسەر بکرێت. بەڵام شکمان نییە کە یەکەمین جار کە ئەم تایفەیە هاتوونەتە فارس، ژمارەیان زۆربووە چونکە کێلەکانیان لە ناوچەی جیاجیاکان بڵاوە و دیارە کە ڕەوەند بوون. بەڵام لە کوێستان و گەرمیانیان زانیاریمان نییە چونکە نزیکەی ٦٠ ساڵ یان زۆرترە کە لەم ناوچەیە نیشتەجێن.

لە ساڵی ١٣٦٧ه. بە گۆڕینی گوندی چنارناز (ناوەندی مێهنییەکان) و گوندی توتەك (ناوەندی توتەکیەکان) لە فارس جیابوونەوە و خراونەت پاڵ شاری خاتەم لە پارێزگای یەزد. بەڵام دەبێ ئاماژە بەم بابەتە بکەین کە پەیوەندی نێوان ئەم سێ تایفەیە پچڕاوە بەڵام لە ڕابردوودا پەیوەندییەك لەنێوان توتەکیەکان و چهارراهییەکان کە قەلتاشی بەشێك لەوان بووە، بە تایبەت لە کاتی شەڕ و هێرش هەبووە و لە دژی دوژمنانیان یەکیان گرتووە.

ڕێژەی مێهنییەکان ١٨٤ خێزان، توتەکیەکان ٣٤٨ خێزان و قەلتاشییەکان ٤٩٣ خێزنە کە کۆی گشتیان ١٠٢٥ خێزانە. لە خوارەوە باسی هەریەك لەم سێ تایفەیە دەکەین:

### ١ ـ تایفەی مێهنی

### شوێنی نیشتەجێبوونیان:

لـە گونـدی چنارنـاز لە ناوچەی مەرڤدەشـت لە ناحیـەی ناوەندی شـاری خاتەم ڕێـك ١٥٠ خێـزان (٩٠٠ کـەس) لـە مێهنییـەکان دەژیـن کـە لـەم چەنـد ساڵەی ڕابـردوو ژمارەیـان لـە ١٧٠ خێـزان بـۆ ئەم ژمارەیـە کەم بۆتـەوە و ئەم بیسـت خێزانە لـەم سـاڵانەدا بەرەو شـیراز و یـەزد کۆچیان کـردووە.

لـە چنارنـاز جگـە لـە مێهنییـەکان تەنهـا پێنـج خێزانی تـر لـە هـۆزە عەرەبەکانی فارس دەژین.

### زۆرترین لەقەبەکان:

لەقەبـی تایفـەی مێهنی گوندی چنارنـاز زۆرترینیان: مێهنی، چناری، سـولەیمان زادە، زیبەندە، سـەحراگەرد، وەحشـی، تورابی، روشـەن، تالبی، چنارنـازی، عەلیزاد، کوهی، دەشـتی، شـوعلە، گەندۆمکار، زارع و کشاوەرز و...

### زێدی مێهنییەکانی گوندی چنارناز:

هەرچەنـدە مێهنییەکانـی چنارنـاز بەخۆیانیـش نازانـن لەکـوێ و کـەی بـۆ ئـەم گونـدە هاتـوون و بۆچـی هاتـوون ـ تەنانـەت یەکێکیـان دەیگـوت نزیکـەی ١٥٠ ساڵە هاتوونـە ئـەم ناوچەیە ـ بـەڵام لە گۆڕسـتانی کۆنی چنارناز نزیکـەی ١٠٠ کێل هەیـە کـە زۆربەیـان بەنـاوی سـالار و چەنـد دانەیـەك بـە نـاوی مێهنـی و دوو دانـە بەنـاوی سـالاری مێهنـی و کۆنترینیشـیان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٠٠٥ی کۆچـی مانگـی و نوێترینیـان هـی سـاڵی ١١١٤ی کۆچـی مانگی.

هەندێکیـان لەسـەر ئـەم بـاوەڕەن کە دوو بـرا بوونە و لـە کرمانـەوە هاتوونەتە ئەم ناوچەیـە و ئەمانـەش پاشـماوەی ئـەم دوو کەسـەن، هەندێکـی تریـش دەیانگوت

سێ برا بوون و بۆ ئەم ناوچەیە هاتوون و تایفەی مێهنی، توتەکی و قەلتاشیان پێك هێناوە. ئەم چیرۆکە لەنێوان توتەکی و قەلتاشییەکان بەهێزترە.

کەواتە لە سەرەتادا چەند هەزار خێزانی مێهنی لە کرمانەوە بۆ ئەم ناوچەیە هاتوون.

***مێهنییەکانی نیوە کۆچەر:***

مێهنییەکانی گوندی چنارناز لە بەهار و هاویندا تا نزیکەی١٨ کیلۆمەتری گوندی چنارناز دەڕۆن و خێوەت هەڵدەدەن. مەڕ و ماڵاتیان لە لەوەڕگەکان بەرەڵا دەکەن. کەواتە ئەمانە نیوەکۆچەرەو و نیوەڕەوەند لەقەڵەم دەدرێن.

***کوێخای مێهنییەکان:***

مێهنییەکان هیچ کاتێك کەلانتەریان نەبووە، بەڵام تا ئەوەی لەبیری خەڵك ماوە بەم شێوەیە: قایم مێهنی، عەباسی تورابی، ئەبوتوراب تورابی، فەرەجوڵڵا تورابی و خەلیلی تورابی (١٣٠٠ ـ ١٣٦٩ کۆچی) کوێخا بوون. لەدوای خەلیل تورابی ئیتر هیچ کەسێك کوێخا نەبووە و شورای ئیسلامی ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرتووە.

***تایبەتمەندی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی:***

مێهنییەکانی گوندی چنارناز سەرکەش و یاخین، خۆیانیش دان بەو سیفەتە دادەنێن و لەسەر ئەم باوەڕەن «ئەگەر کورتانی کەری مێهنییەکان لەبەر دەرگای ماڵێك بکەوێ، سبەی ئەم خانووە ئاگری تێبەردەبێ»، بەم شێوەیە ئەگەر دوژمنایەتی لەگەڵ کەسێك بکەن تا لەناوی نەبەن، ئاسوودە نابن...

دابونەریتی مێهنییەکانی گوندی چنارناز لەبەر ئەوەی تا ساڵی ١٣٦٧ بەشێك

بوونە لە پارێزگای فارس، هاوشێوەی دابونەریتی خەڵکی سەرچەهانە...

باری دارایی و ئابووری: مێهنییەکان لەلایەن باری ئابوورییەوە مام ماوەندین و بە دەرامەتێکی کەم لە ڕێگای جووتیاری ڕۆژگار بەسەر دەبەن.

شێوەزار و زمان: زمانی مێهنییەکانی گوندی چنارناز فارسییە و وشەکانیان وەك وشەگەلی خەڵکی سەرچەهانە.[21]

**٢ـ تایفەی توتەکی**

یەکێکی تر لە لقە پاشماوەکانی کوردەکانی کرمان، تایفەی توتەکییە کە لە گوندی توتەك لە دێهستانی مەرڤوەست لە ناحیەی مەرڤوەستی شاری خاتەم لە پارێزگای یەزد نیشتەجێن...

تایفەی توتەکی دابەش دەبنە تیرەکانی (کەریم خانی، محەمەدخانی، سەلیمی، مورادخانی، نورمحەمەدی، قەنبەری، دین محەمەدی و ئەولادی محەمەدی خان و لەقەبیان، بەزرنەفشان، تەیموری، نورمحەمەدی، مورادخانی، پورتەیموری، تەیموریان، توتەکی، نەجەفیانی و ئازەرنووش)ە.

**هاتن بۆ ناوچەی توتەك:**

بەپێی باوەڕی ئەم تایفەیە، سێ برا بوونە و هاتووتەنە ئەم ناوچەیە و تایفەکانی توتەکی، مێهنی و قەلتاشیان پێکێهناوە. دووکەس لەوانەی لێدوانیان لەگەڵ کراوە گوتوویانە کە سێ برا لە بافتی کرمان و شاری کرمان هاتوونەتە ئەم ناوچەیە و یەکێکیان گوتی دەڵێن لە کوردستان بۆ ئەم ناوچەیە دوور خراونەتەوە. هەرچەند بابەتی دوورخرابوونیان لە کوردستان بەدوور دەزانرێ چونکە زمانیان کوردی نیە.

**بەربڵاویی توتەکیەکانی ئەمڕۆ**

**بەربڵاویی توتەکیەکان لەم ساڵانەی دواییدا بەم شێوەیە:**

**گوندی توتەك: ١٠٠ خێزان**

**جەرئاباد (رەحمەت ئاباد لە شاری خاتەم): ٢٠ خێزان**

**مەرفوەست : ١٠ خێزان**

**شاری هەرات: ٢٥ خێزان**

**مونجی باڵا لە شاری بەڤانات: ١٥ خێزان**

هەرابەرجان لە شاری خاتەم: ٢ خێزان

**شاری یەزد: ٨ خێزان**

**شاری ئەستەهبان (لە پارێزگای فارس): ٣٠ خێزان**

**تاران: ٥ خێزان**

**مەشهەد: ١٢ خێزان**

**ئەسفەهان: ١ خێزان**

**شیراز: ٢٠ خێزان**

**خورەمی (لە شاری خورەم بید) ١٠٠ خێزان**

**کۆی گشتی: ٣٤٨ خێزان**

***تایبەتمەندییەکانی ئەخلاقیی توتەکیەکان:***

**توتەکیەکان بەگشتی نوکتەباز، سەرپێچیکەر و پشتیوانی مافی خۆیانن، لەرووی نەتەوەییشەوە دەمارگیرن، لە شەڕەکان بەشێوەیەکی سەیر پشتیوانی لە خۆیان دەکەن... توتەکیەکان لە فڕێدانی بەرد دەستێکی باڵایان هەیە و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە لە شەڕەکان، لایەنی بەرامبەر بریندار بێت و ڕا بکات.**

**باری ئابووری توتەکیەکان: باری ئابووری توتەکیەکان باشە و لە مێهنییەکانی**

گونـدی چنارنـاز باشـترین. بەگشـتی توتەکیـەکان جوتیـار و ئاژەڵـدارن و لـە کاتی وشکەسـاڵی کـە لەوەڕگـەکان بەرهەمیـان نییە، ڕوو لە کار و کاسـبیەکی تـر دەکەن، لەنێـوان ئـەو توتەکیانـەی کە بۆ شـارەکان کۆچیـان کـردوە، کارمەندیش هەیـە. [٢٢]

( خوێنەرانـی خۆشەویسـت بـۆ زانیاریـی زیاتـر سـەبارەت بـە توتەکیـەکان دەتوانـن سـەیری لاپەڕەکانـی ٢٩٧ تـا ٣١٠ی کتێبـی «کوردەکانی پـارس و کرمان» لـە نووسـینی دوکتـۆر سـەداقەت کیـش بکـەن)

*٣ـ تایفەی قەلتاشی*

... یەکێك لە تایفەی چهارراهییەکان، تایفەی قەلتاشییە کە بەپێی بەڵگەکان وا دیارە لەگەڵ مێهنییەکان و توتەکیەکان هاتوونەتە ئەم ناوچەیە و جێگیر بوون. هەرچەندە تا ساڵی ١٢٦٧ه. ئەم سێ تایفەیە لە ناوچەی فارس بوونە لەدوای گۆڕانکارییە جوگرافیاییەکان مێهنییەکان و توتەکیەکان دەبنە بەشێك لە پارێزگای یەزد و قەلتاشیەکانیش هەر لەسەر پارێزگای فارس دەمێننەوە.

بەڵام لەبارەی ئەوەی کە چۆن قەلتاشییەکان چوونەتە ناو چهارراهییەکان هیچ زانیارییەکمان نییە و هیچ کەسیش لەم بارەیەوە زانیاری نییە.

قەڵتاشیەکان لەسەر ئەم باوەڕەن کە سێ برا بوون و هاتوونەتە ئەم ناوچەیە و تایفەی مێهنی، توتەکی و قەلتاشیان دروست کردووە. ئەمانە هیچ جۆرە زانیارییەکیان لەبارەی کاتی هاتنیان بۆ ئەم ناوچەیە نییە و بەهۆی بەربڵاویی و فراوانی دابەش بوونیان و گۆڕانی شوێنیان، گۆڕستانێك نییە کە بەلای کەمەوە مێژینەیان دیاری بکرێت یان ئێستا بەدەست ناکەوێ.

قەلتاشییەکان نزیکەی ٦٠ ساڵ لەمەوبەر لەنێوان گوندی کۆرەیی ناوەندی ناحیەی سەرچەهان لە شاری بەڤانات و ئابادە تەشەك لە شاری نەیریز و تا شاری داراب، کوێستانە و گەرمیانیان کردووە و بەرەبەرە لەم ڕێگایە نیشتەجێ بوون....

بەربڵاویی قەڵتاشییەکان

بەربڵاویی قەڵتاشییەکان بەم شێوەیەیە:

پارێزگای فارس:

شاری بەڤانات

ناحیەی سەرچەهان

شاری کورەیی: ٣٠ خێزان

گوندی دەشت ڕەئیس: ١٠ خێزان

گوندی مەحمەدئاباد. ١٠ خێزان

گوندی توجەردی: ٧ خێزان

گوندی بەند نو: ١ خێزان

گوندی دێ زیارەت: ٤٠ خێزان

شاری داراب:

شاری داراب: ٥٠ خێزان

گوندی پاسۆخەن یان ڕەشیدئاباد: ١٥ خێزان

گوندی کورسیا: ٢٠ خێزان

شاری نەیریز:

شاری نەیریز: ١٥ خێزان

شاری ئابادەی تەشەك: ٤٠ خێزان

شاری تەشت: ٥ خێزان

گوندی چاە سۆرخ: ٥ خێزان

شاری شیراز:

شاری شیراز: ٥ خێزان

شاری ئەرسەنجان:

شاری ئەرسەنجان: ١٠ خێزان

دەوروپشتی ئەرسەنجان: ٣٠ خێزان

شاری مەرڤدەشت:

شاری مەرڤدەشت: ٧ خێزان

شاری ئەستەهبان:

شاری ئەستەهیان: ٥ خێزان

شاری رونیز: ٥ خێزان

شاری بەڤانات:

گوندی ریزەکان: ٥ خێزان

پارێزگای یەزد:

شاری یەزد: ٣٠ خێزان

شاری خاتەم:

شاری هەرات: ١٠ خێزان

گوندی: توتەك: ٨ خێزان

پارێزگای کرمان:

شاری شەهری بابەك: ١٥ خێزان

خەبەر: ٤٠ خێزان

شاری جیرۆفت:

شاری جیرۆفت: ٤٠ خێزان

پارێزگای ئەسفەهان:

شاری ئەسفەهان: ٢٠ خێزان

پارێزگای تاران:

تاران: ٥ خێزان

پارێزگای خوراسان:

شاری مەشهەد: ١٠ خێزان

کۆی گشتی: ٤٩٣ خێزان

***لقەکانی تایفەی قەلتاشی:***

گرووپێك بەناوی بەیلێ هەیە کە لە قەلتاشییەکانن کە زانیاریمان لەسەر ژمارەیان نییە، تایفەی قەلتاشی تەنها دوو بەیلێ بە ناوەکانی بەیلێ و مورتەزایی و بەیلێ کەریم خانیان بەبیر دێ.

زۆرترین نازناو: ئێستا زۆربەی نازناوی قەلتاشییەکان بەم شێوەیەیە: ئیعتیمادی قەلتاشی، قەلتاشی، قەلتاش، میرقولی، سالاری، بەخجەستە، حوسێن زادە، دانشی، کەریمی، چاکری، چاکری زادە، ئەفشار مەنش و سەرچەهانی.

باری دارایی قەلتاشییەکان: باری داراییان باش و لەبارە و زۆربەیان جوتیارن و خاوەن لۆرین.

تایبەتمەندیی ئەخلاقی: لەلایەن تایبەتمەندیی ئەخلاقی نەترس، دلێر، نافەرمان، لایەنگیری مافی خۆیان، دەمارگیری نەتەوەییە کە هەر وەك کوردەکانی قوقەس و کوفەجی کرمانن. [٣٣]

( خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە قەلتاشییەکان دەتوانن سەیری لاپەڕەکانی ٣١١ تا ٣٣٧ی کتێبی «کوردەکانی پارس و کرمان» لە نووسینی دوکتۆر سەداقەت کیش بکەن)

### ● ڕەوشی کولتووریی و ڕۆشنبیری

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا لەپێوەندیی لەگەڵ چۆنییەتی هەبوونی کوردان لە فارس و شیراز گێڕانەوە و باسی جۆراوجۆر هەیە. یەکێك لە تیۆرییەکان پێی

وایە کە هەبوونی کوردان لە فارسدا ڕەگی لە مێژووی ئەم ناوچەیەدا. بەڵام یەکێکی تر لە گێڕانەوەکان کە لەباری مێژوویی بەڵگەی هەستپێکراوتری لەپشتە: هەبوونی سەرداران و شەڕکەرانی کوردە کە بۆ پشتیوانی لە کەریمخان گەیشتوونە شیراز و لەگەڵ ئەم سەرکردانە تایفەگەلێکی زۆر بۆ نموونە وەند و زەنگەنە بۆ پێکهێنانی ئۆردوویەکی یەکپارچە و وەفادار بە حکومەتی زەند لەلایەن کەریم خانەوە بۆ ئەم ناوچانە ڕاگوێزراون دوای لەنێوچوونی زەندییە، بە بڕیاری ئاغامحەمەدخانی قاجار بۆ زێدی خۆیان دەگەڕێنرێنەوە. لەم نێوەدا ژمارەیەك لە عێل و تایفە کوردەکان لەنێو عێلە قەشقاییەکانی فارس دەمێننەوە کە زۆربەی کوردەکانی فارس لە پاشماوەکانی ئەو سەردەمەن.

زۆربەی ئەم کوردانە دوای تێکەڵبوون لەگەڵ تورکە قەشقاییەکان چوونە ژێر کاریگەریی کولتووری باڵادەست و لە ئێستادا بەشێکیان تەنانەت خۆشیان بە کورد نازانن (تایفەکانی کوردشولی و ...) بەڵام ژمارەیەك لەم تایفانە کولتوری کوردی و زمانی کوردیی خۆیان لە ماوەی دووسەد و ئەوەندە ساڵەی ڕابردوودا پاراستووە و هەنووکەش بە زمانی کوردی قسە دەکەن کە گەورەترینی ئەو تایفانە تایفەی کرانی یان «کرونی»یە کە لە ئاوایی چل چەشمەی کرونی لە ٤٠ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای شیراز و لە دوو گوند لە گوندەکانی بەیزا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شیراز و لە ئاواییەکانی دەوروبەری کازرون نیشتەجێن (نزیکەی دە ئاوایی بەشێوەی پرش وبڵاو).[٢٤]

- **سەرچاوەکان:**

١. ویکیپیدیای فارسی
٢. ڕۆژبەیانی، مەلاجەمیل، چوار دەوڵەتی کورد (چوار دەوڵەتی فەرامۆشکراوی نەناسراو دونبولی، شاهێنی، شوانکارە، مینەتشاهی)، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٧٣ .
٣. شیرازی، حسین کرد، کردان شیراز و چگونگی حچور در این دیار.، www. ٠٦/١٣٨٤/kurdshiraz.blogfa.com ، ٢٥شهریور ١٣٨٤.
٤. سەید شوکری، سەید سمایل، عەشایری کورد، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٧٩، ساڵی حەوتەم، ١٣٨٦ی هەتاوی، ل ٢٥.
٥. سەداقەت کیش، د.جەمشید، کوردەکانی فارس و کرمان، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: کامەران حەسەن، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٣٣.

٦. س.پ.ل١٣٨
٧. سەداقەت کیش، د.جەمشید، س.پ، ل ١٥١ـ١٥٢
٨. س.پ. ل ١٦٦
٩. س.پ. ل ١٦٩
١٠. س.پ. ل ١٧٢ـ١٧٥
١١. س.پ. ل ١٧٧
١٢. س.پ. ل ١٩٨
١٣. س.پ.ل ٢٠٥ـ٢٠٦
١٤. س.پ.ل٢٠٨
١٥. س.پ. ل ٢١٠ـ٢١٤
١٦. س.پ. ل ٢١٨
١٧. س.پ.ل٢٣٧
١٨. س.پ.ل ٢٤١
١٩. س.پ. ل ٢٤٤
٢٠. س.پ. ل ٢٤٩ ـ ٢٥٣
٢١. س.پ. ل ٢٦١ـ٢٦٧
٢٢. س.پ. ل ٢٩٧ـ٢٩٩
٢٣. س.پ. ل ٣١١ـ٣١٩
٢٤. شیرازی، حسین کرد، س.پ.

## پێنجەم

## کوردەکانی باکووری ئێران (مازەندەران، گوڵستان و ...)

- کوردەکانی پارێزگای مازەندەران
- کوردەکانی پارێزگای گوڵستان
- کوردەکانی پارێزگای گیلان
- کوردەکانی پارێزگای ئەردەبیل

بە چاوخشاندنێك بە سەرچاوە مێژووییەکاندا دەردەکەوێ کە عێل و تایفە جیاجیاکانی کورد لە ژمارەیەك لە ناوچەکانی باکووری ئێران ژیاون و بەشێکیان تا ئێستاش لەو ناوچانە درێژە بە ژیان دەدەن. لێرەدا بە کورتی باسی ژمارەیەك لەو عێل و تایفە کوردانە دەکەین. ئەو ناوچانەی لێرەدا باسیان دەکرێ کەوتوونەتە نێو پارێزگاکانی مازەندەران، گوڵستان، گیلان و ئەردەبیل.

## • کوردەکانی پارێزگای مازەندەران

- چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای مازەندەران
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ مازەندەران
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد لە مازەندەران
- تایفە کوردەکانی پارێزگای مازەندەران

### • چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای مازەندەران

پارێزگای مازەندەران لە باکووری ئێران و لە لێوارەکانی باشووری دەریای مازەندەران هەڵکەوتووە. ئەم پارێزگایە لەگەڵ پارێزگاکانی گوڵستان، سمنان، تاران، ئەلبورز، قەزوین و گیلان هاوسنوورە. ئەم پارێزگایە لەباری گەشتیاری و ڕاکێشانی گەشتیار پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی ئێران هەیە و سوودێکی زۆر لە دارستان، دەشت، کێو، مێژوو و دەریا وەردەگرێ. مازەندەران بەرزترین (کێوی دەماوەند) و نزمترین (دەریای مازەندەران) شوێنەکانی ئێرانی لەخۆ گرتووە.

ئەم پارێزگایە بە هەڵکەوتنی لە لێوارەکانی باشووریی گەورەترین دەریاچەی جیهان ناسراو بە دەریای مازەندەران (دەریای کاسپین، دەریای خەزەر) و هاوسنووری لەگەڵ چوار وڵاتی لێواری ئەم دەریایە واتە تورکمانستان، کازاخستان، ڕووسیا و کۆماری ئازەربایجان لەلایەك و هەڵکەوتنی لە باکووری

گەورەشارێکی وەك تاران (پایتەختی ئێران) لەلایەکی ترەوە، لە هەڵکەوتێکی جوگرافیایی ئیستراتیژیك بەهرەمەندە.

خەڵکەکەی بە زمانی تەبەری (مازەندەرانی) و فارسی قسە دەکەن. حەشیمەتی ئەم پارێزگایە زیاتر لە ٣ ملیۆن کەسە. شارستانی ساری ناوەندی پارێزگا و شارستانی بابۆل پڕحەشیمەترین شاری پارێزگایە. ئەم پارێزگایە ٢٢ شاری هەیە، هێندێك لە گرنگترین شارەکانی بریتین لە:شارستانی ئامۆل، بابۆل، بابۆلسەر، بێهشەهر، جوویبار، چالووس، کەلاردەشت، ڕامسەر، ساری، سەوادکوە، تەنکابۆن، فەرەیدوون کەنار، عەبباس ئاباد، قائیم شەهر، مەحموودئاباد، نوور، نەوشەهر و ... [١]

● سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ مازەندەران

کوردەکانی پارێزگای مازەندەران بەپێی بارودۆخێکی سیاسی و ئیستراتیژیکی کە لە کوردستان زاڵ بووە و هەروەها ناسەقامگیریی شوێنی مەبەست، دوابەدوای زنجیرەیەك لە بڕیاردانەکان و پێویستیە سیاسیەکان لە چەند سەدە لەمەبەرەوە بۆ شوێنە جیاجیاکانی ئەو ناوچەیە کۆچێنراون. لە پڕۆسەیەکی مێژووییدا و دوای هەوراز و نشێوی زۆر سەرەنجام توانییان بە شێوەیەکی ئاشتییانە لەگەڵ قەومە مازەندەرانییەکان پێکەوە بژین و پێوەندیی کۆمەڵایەتیی باشیان هەبێ. لەپێوەندیی لەگەڵ مێژووی وردی کۆچکردنی کوردەکان ئەوەی بەپێی بەڵگە مێژووییەکان درووستتر دێتە بەرچاو، ئەوەیە کە شەپۆلی کۆچکردنە زۆرەملێیەکانی کورد بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکان لە سەردەمی شاسمایلی سەفەوییەوە دەستی پێکردووە و لە سەردەمی پاشاکانی دیکەی وەك شاعەبباس و تەنانەت دوای نەمانی دەوڵەتی سەفەوییش لەلایەن نادرشای ئەفشار و کەریم خانی زەند درێژەی هەبووە. [٢]

● شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد لە مازەندەران

کوردەکان دوای گەیشتنیان بە مازەندەران بەپێی بارودۆخی جوگرافیایی و سیاسی لە قۆناغە جیاوازە مێژووییەکاندا، لەم شار و ناوچانەی خوارەوە بڵاو بوونەتەوە:

١. کورد لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای مازەندەران
٢. کورد لە ناوچەکانی باکووری شارستانەکانی جوویبار و ساری
٣. کوردەکانی شارستانی بێهشەهر

*١ ـ کورد لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای مازەندەران*

**کوردەکانی کەلاردەشت و کەجوور:** ئەم گرووپە لە کوردەکان لە کەلاردەشت بەگشتی بە «خواجەوەند» بەناوبانگن.

هێنری فیڵد: شوێنی نیشتەجێبوونی خواجەوەندەکان لە کەلاردەشت و گوندەکانی (پیمبور، عوسمان کەلا، کوتیر، تویدە، سنگ سرك، بنەفشە دێ، تەبەرسوو، ویجدان، تلوچال، کوردمەحەلە، تائیب کەلا، شاری چالووس و ئاوایی کەریم ئاباد، فەسیب دێ، ئیمام ڕوود)ە و پێی وایە لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی گرووپەکانی سوڵتان قولیخان، کاکاوەند، لەك و دێلفان، لە کەلاردەشت نیشتەجێ کراون. مەکنزی لە ساڵی ١٨٦٠دا نووسیویەتی کە نزیکەی ١٠٠ ئاوایی لە هەوارەکانی کلارستاق هەبوون و زیاتر لە ٦٠٠ بنەماڵە لە خواجەوەندەکان لەوێ نیشتەجێ بوون.

کۆچکردنی ئەم کوردانە زیاتر بەهۆی سیاسەتی سەرکوتکردنی ناڕازییەکانی ئەو ناوچانە بووە. لە شوێنێکی دیکە ڕابینێۆ دەنووسێ: خواجەوەندەکان (لەگەڵ مافی و کەلهوڕ) خەڵکی ناوچەکانی کوردستانن کە ئاغا محەمەدخان ئەوانی لە ناوچەی ئەردەلان (پارێزگای کوردستان)، گەرووس (بیجاڕ) هێناوەتە مازەندەران بۆئەوەی لەگەڵ عەبدولمەلەکیەکان کە لە شەهریارەوە

بۆ مازەندەران ڕاگوێزرابوون، تارانیان لە هەرچەشنە پشێویی و ئالۆزییەك بپارێزێ[٣]

بەپێی ڕاپۆرتی خوێندکار، ئەو کوردانەی کە لە سەردەمی زنجیرەکانی سەفەوی و قاجار دا بۆ ناوچەکانی باکووری ئێران و یەك لەوان کەلاردەشتی مازەندەران ڕاگوێزراون، ئێستاش کولتوور و زمان و ئایینی خۆیان پاراستووە. کوردەکانی کەلاردەشت هەموویان لە داوێنی کێوەکانی کەلاردەشت نیشتەجێن... کوردەکانی کەلاردەشت هەموویان لە تایفەی خواجەوەندن. ئەو گوندانەی کە کوردەکان تێیان نیشتەجێن بریتین لە: گویتەر، کلنوو، ئیسپەند کەلا، کورد مەحەللە، پەی قەلعە، لاهوو، گورگ پەس، حەسەنکێف، ولبال، مەکا، ئەجابیت، رودبارەك، تویدەرە، پیشنبوور، پینبوور، بازارسەر. حەشیمەتی کوردەکانی ئەم ناوچانە نزیکەی ٣٠ بۆ ٤٠ هەزار کەس دەبێ.[٤]

***کوردەکانی ناوچەکانی نەوشەهر و دەوروبەری:*** ژمارەیەکی دیکە لە کوردەکانن کە لە سەردەمی ئاغا محەمەدخاندا لە ناوچەکانی کرماشان و کوردستانەوە بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوای مازەندەران کۆچیان پێکراوە. کوردەکانی نیشتەجێی ئەم ناوچەیە بە کوردەکانی خەزایی ناسراون کە زۆربەیان لە نەوشەهر و بەشێکیشیان لە ئاوایییەکانی زانووس رستاق و دێهستانی کەجوور نیشتەجێن کە بە زمانی کوردی قسە دەکەن و بەسەر شێوەزاری مازەندەرانیشدا زاڵن.[٥]

### ***٢ـ کورد لە ناوچەکانی باکووری شارستانەکانی جوویبار و ساری***

هێنری فیلد لە کتێبی «مردم شناسی ایران» ئاماژە بەوە دەکا کە لە سەردەمی ئاغامحەمەدخانی قاجاردا هۆزێکی پێکهاتوو لە کوردەکان و تورکەکان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ تورکمەنەکانی ساوجبلاغ بۆ ناوچەی فەرەح ئاباد ڕاگوێزران. ئەم ناوچەیە لە ڕۆژئاوای چۆمی تەجەن هەڵکەوتووە. ئەمڕۆکە

چەند بەشێکی باکووری شارستانەکانی شاری و جوویبار لەخۆ دەگرێ.

***کوردەکانی قائیم شار:*** شەڕی نێوان ئێران و ئێراق هەلومەرجێکی هێنایەئاراوە (نەبوونی ئاسایش، کێشەی ئابووری و...) کە ژمارەیەك لە خەڵك لە ناوچەکانی باشووری وڵاتەوە بەرەو ناوچەی قائیم شار کۆچ بکەن. هەروەها ژمارەیەکی دیکە لە کوردەکان هەر بەهۆی ئەم بارودۆخە و هەر لەو سەردەمەشدا بەرەو فەرەیدووەن کەنار و بابولسەر و گەڕەکەکانی جەعفەرئاباد و ڕەحمان ئاباد هەڵکەوتوو لە باکوور و باکووری ڕۆژئاوای مەحموودئاباد کۆچیان کردووە. کوردەکانی ئەم ناوچانە هەنووکەش کەڵك لە جلوبەرگی کوردی وەردەگرن و لەنێو خۆیاندا بە کوردی قسە دەکەن.[٦]

### ***٣ـ کوردەکانی شارستانی بێهشەهر***

ئەو کوردانە بەگشتی لە ناوچەیەکدا نیشتەجێن کە دەکەوێتە ئوستانی مازەندەران، شارستانی بێهشەهر، بەخشی ناوەندی کە بە چوار قەلعەی عەبدولمەلەکی بەناوبانگە و لەم بەشانە پێك دێت:

شارۆچکەی زاغەمەزر، نزیکەی ١٣٠٠ خێزان

گوندی زینەوان، نزیکەی ٣٥٠ خێزان

گوندی ئەمیرئاوا، نزیکەی ٧٠٠ خێزان

گوندی حسەین ئاوا، نزیکەی ٧٠٠ خێزان

بەگشتی حەشیمەتی ئەوان نزیکەی ١٥٠٠٠ کەسە.

ئەو ناوچەیە لەلای باکوورەوە دەکەوێتە لێوارەکانی دەریای مازەندەران.[٧]

هەروەك ئاماژەی پێکرا ؛ ئەم ناوچەیە بە چوار قەلعەی عەبدولمەلەکی ناسراوە. لە چوار تایفەی فەوەند (فەهرەوەند)، زینوەند، شێخوەند و کالوەند پێك هاتووە کە لە شارستانی بێهشەهر و ئاواییەکانی (حسەین ئاوا، ئەمیرئاوا،

زینەوەن و زاغەمەزر) نیشتەجێن.

رابینۆ لە سەفەرنامەی مازەندەران و ئەستەرئاباد سەبارەت بە عەبدولمەلەکیەکان وەها نووسیوە: عەبدولمەلەکیەکان لە دەرگەز نیشتەجێ بوون و دواتر چوونە شیراز و دوای ئەویش بۆ شەهریار گوێزرانەوە. ئاغا محەمەدخان دوای ماوەیەك ئەوانی ناردە «نوور» و ٤٠ ساڵ لەوێ مانەوە. لەلایەن میرزا ئاقاخانی نووری لە ساڵی ١٨٥٥ی زایینی (١٢٣٤ی هەتاوی) بۆ زاغەمەزر لە نزیك ساری کۆچێنران. زمانیان لە بنەڕەتدا هەورامییە کە بە تێپەریی رۆژگار گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە [٨]

● باری کۆمەڵایەتی کوردەکانی ئەو ناوچەیە

خەڵکی چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی، لە بواری عەشیرەییەوە دەبنە چوار تاییفە و هەر تاییفەیەکیش دەبێتە چەند تیرە. بۆ نموونە زاغەمەرزییەکان دەبنە دوازدە تیرە، زینەوەندیەکان شەش تیرە، ئەمیرئاواییەکان دوازدە تیرە و حەسەین ئاواییەکانیش دوازدە تیرە.

ئەوان لەنێو خۆیاندا، هەر تیرەیەك کەسێك وەك نوێنەری خۆیان هەڵدەبژێرن کە پێی ئەڵێن پیر. ئەرکی پیر هەڵسووڕاندنی کاروباری خەڵکی و بەجۆرێك دەمڕاستیی و کەیخوداگەرییە. خەڵکیش لە بەرانبەر پیردا خاوەن ئەرکن و پێویستە بە ڕاوێژ و هەڵوێستەکانی پابەند بن. ساڵانەش بەشێك لە داهاتیان بە پیر ئەبەخشن تا لە ڕێگای خزمەتگوزاریی گشتییەوە خەرجی بکات. دەسباری دووچاربووانی کوت‌وپڕی بدات و ئەرکەکانی پێ هەڵسووڕێنێت. بۆ نموونە شالیکارەکان، لە هەر هێکتارێك برنجدا ٤ـ٥ کیسە برنج بۆ ئەو کارانە بە پیر ئەبەخشن. خاوەن پیشەکانی دیکەش هەر بەو ئاستە دەسباری پیر ئەدەن.

خەڵکی چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی، لە تەنگانە و فەرحانەدا بە هانای

یەکترەوە ئەچن و پێوەندییەکی هێقمیان هەیە. لای ئەوان ژن خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتییە و نەریتی دووژنی و چەندژنی باوی نیە.

لای ئەوان نەریتی چوارشەمەسووری و نەورۆز و سێزدەبەدەر بە گەرمی باوی هەیە و «کەمەرشال» کە وەك قەڵاڕۆچنێ ـ کڵاوڕۆژنە ی لای خۆمانە، ئێستاش باوی هەیە.

زۆر بەداخن بۆ ئەوەی کە هەنووکە گەمەی فوتباڵ، گەمە نەریتییەکانی ئەوانی بە فەرامۆشی سپاردووە. ئەوان بە گەمە، :کا یان هەمان کایە ـ کێڵێ »ی کوردی ئەڵێن.

لە ڕابردوودا بووکیان بە سواری ئەسپ گواستۆتەوە و زاواش تا چەند ساڵێك لەمەوبەر، لە کاتی گەیشتنی بووك بە دەروازەی ماڵەزاوا، سێو یان پرتەقاڵ یان هەناری بەسەردا کێشاوە. کەسێکیش وەك نوێنەری ماڵە بووك، پێشتر لە بووك خۆی بە ماڵە زاوا گەیاندووە و لە کەسانێکی خزمی زاوا داواکاری هەبووە. بۆ نموونە داوای گۆرانی وتن، ڕاکردن یان پووڵ...[٩]

کار و پیشەی خەڵکی ئەو ناوچەیە: بەهۆی هەڵکەوتەی سروشتییەوە، کار و پیشەی خەڵك، کشتوکاڵ و باخدارییە. لە پاڵ ئەوەشدا، بە پەروەردەکردنی ماسی و باڵندە و ئاژەڵداریشەوە خەریکن. کەسانێکیش بە کاروباری پیشەسازی، بەتایبەت پیشەسازی وەگۆڕیی (صنایع تبدیلی) بەروبومە کشتوکاڵیەکانەوە خەریکن.

بەرووبومی کشتوکاڵیی ئەو دەڤەرە، بە گشتی برنج، گەنم، جۆ، سویا، لوبیا، زەڕات (گەنمەشامی) و تەڕەکاڵە. بەتایبەت هەنی (شووتیی) ئەویێ بەناوبانگە.

لەبواری باخداریشدا پرتەقاڵ بەتایبەت لە جۆری تامسۆن، هەشتاڵوو، نارنگیی بە جۆرەکانیەوە و ...

بۆ نموونە بە تەنیا شارۆچکەی زاغەمەزر، زیاتر لە ٢٠٠٠٠ بیست هەزار

هێکتـار زەوی بـۆ شـالیزار و برنجـکاری هەیـە. یـان پرتەقاڵـی تامسـۆنی ئـەوێ بەناوبانگـە...

لەبواری ئاژەڵداریشـەوە، گاومێشـی ئـەوێ هـەم لەبـواری ئەژمـار و هـەم پەرداخیـیـەوە بەناوبانگـە و بـەزۆری لەو شـبهەجزیرە (نیمچەدورگـەی) «میان کالە» پـەروەردە دەکرێـت. وێـڕای ئـەوەش، مـەڕداری و گاوداریـش بـاوی هەیـە. ئەوان لەبـواری کولانـەداری سـەردەمیانەشـدا (کێڵگـەی پەلـەوەر) چالاکـن و مریشـکی بەشـێکی زۆری ئوسـتانی مازەنـدەران دابیـن دەکـەن. (١٠)

● فەرهەنگ و زمان

ئـەو خەڵکە لـە تیـرەی عەبدولمەلەکیەکانن کە بەزۆری لە سـەردەمی نادرشـای ئەفشـاردا پرژوبـڵاو کـراون و ئێسـتا ئـەم چـوار تایفەیـە لـەو شـوێنەدا نیشـتەجێن. بـە هەورامـی قسـە ئەکـەن و هێشـتا زیاتـر لـە سـەدا هەشـتاوپەنجی وشـەکانیان ڕەسـەنایەتی خـۆی پاراسـتووە و وەك خـۆی ماوەتـەوە.

ئـەوان خۆیـان بـە هەورامی ئەزانن و شـانازی بە پێشـینەی کوردبوونی خۆیانەوە ئەکـەن. لەنـاو خۆیانـدا بـە زمانـی خۆیـان قسـە ئەکـەن. بەتایبـەت لـەم سـاڵانەی دوایـیـدا هەسـتی نەتەوەییـان زیاتـر بووژاوەتـەوە و لـە زەماوەندەکانـدا، جاروبـار، جلوبەگـی کـوردی دەپۆشـن. بەتایبـەت جلوبەرگـی کـوردی دەبـەر منداڵەکانیـان دەکـەن و زۆرجاریـش بـووك و زاوا بـۆ ماوەیـەك بـەو جلوبەرگـەوە دەرئەکـەون. لـەم سـاڵانەی دوایـیـدا بـۆ بەربڵاوترکردنـی پێوەندیـی لەگـەڵ دەڤـەری هەورامـان و کـوردەواری لـە چالاکـی زیاتـردان. بـۆ نموونـە بـۆ بەڕێوەبردنـی مەراسـیمی سـێزدەبەدەر گرووپـی گۆرانـی و هەڵپەڕکێیـان لـە مەریوانـەوە داوەت کردبـوو کـە بـە هەوڵـی کاك سـەباح یەزدانـی ئـەو گرووپـە لـەوێ ئامـادە و بەرنامـەی هەبـووە.

ئاسـتی ڕۆشـنبیریی ئـەوان بـەرزە و ڕێـژەی خوێندەوارانـی ئاسـتی باڵایـان،

لەسەرەوەیە. بۆ نموونە تەنیا لە گوندی حسەین ئاوا زیاتر لە ۷۰۰ کەس لە بەشە جۆراوجۆرەکاندا، خوێندنی باڵایان تەواو کردووە.

کەسانێکیش بە تۆمارکردنی کولتووری ناوچەکە و نووسینەوەی مێژووی خۆیانەوە خەریکن و تا ئێستا توانیویانە لەسەر ئەرکی خۆیان چەند کتێب لەو بوارانەدا بڵاو بکەنەوە. بۆ نموونە ئەتوانین ئاماژە بەم بەرهەمانە بکەین: ۱ـ تاریخ ایل عبدالملکی، تألیف رضا قنبری عبدالملکی، انتشارات شلفین ۱۳۸۸. ۲ـامثال و اشاره و کنایه و تطبیق واژگان عبدالملکی با معادل فارسی، تألیف: حسن سلیمی عبدالملکی، انتشارات شلفین ۱۳۸۷ ۳ـ پیشینه عبدالملکی ها در مازندران و کردستان، حسن سلیمی عبدالملکی، انتشارات شلفین و ....[11]

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین ئەگەرچی کوردەکانی مازەندەران توانیویانە دابونەریتی خۆیان بپارێزن و هەنووکەش ئینتمایان بۆ وڵاتی باووباپیرانیان هەیە، بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە تێکەڵاوبوون لەگەڵ کولتوور و دابونەریتی خەڵکی ئەوێ، توانیویەتی کاریگەریی لەسەر زمان و کولتوور و کەلەپووری ئەوان دابنێ و بە سەرنجدان بەو ماوە زەمەنییە دوور و درێژەی تێکەڵاوبوون و پێکەوەبوون دەبێ چاوەڕوانیی وەها شتێکمان هەبێ.

### ● تایفە کوردەکانی پارێزگای مازەندەران

لەم پارێزگایە سێ عەشیرەتی گەورە و بەربڵاوی کورد نیشتەجێن: مۆدانلوو و جەهانبەگلوو (باکووری ساری) و خواجەوەند (باشووری نەوشەهر). عەشیرەی خواجەوەند بە بڕوای ال.اس.فۆرتیسکۆ لەپێشدا لە گەرووس و کوردستان بوونە و نادرشا هێناونیە مازەندەران. لەوانەیە عەشیرەکانی مۆدانلوو و جەهانبەگلووش هەر نادرشا بۆ ئەم ناوچەیەی هێنابن (بە ڕای ڕابینۆ)[12]

خوێنەرە خۆشەویستەکان، بەڕێز حەسەن سەلیمی عەبدولمەلەکی نووسەر

و یەکێك لە کوردەکانی سەر بە عێلی عەبدولمەلەکیی مازەندەرانە. ناوبراو لە وتارێکی پڕبایەخدا باسی لە مێژووی کۆچکردن و زمان و شێوەزار و کەسانی بەناوبانگ و بنەچەکە و ڕەچەڵەکی کوردەکانی عەبدولمەلەکی و زۆر بابەتی تر کردووە. لەبەر گرنگیی بابەتەکە بە پێویست زانرا بەشی زۆری وتارەکە وەگێڕینە سەر زمانی کوردی، ئەوەی خوارەوە بەشی زۆری وتارەکەی ناوبراوە:

***عێلی عەبدولمەلەکی: لە هەورامانەوە بۆ مازەندەران***

(کورتە مێژوویەکی کۆچکردنی عەبدولمەلەکی و عەبدولمەلەکیەکانی ئێران)

***-مێژووی کۆچکردن***

***لە هەورامانەوە بۆ باشووری ئێران:***

«هەروەك پێشتر گوترا، ئاخێزگە و شوێنی سەرهەڵدانی باب و باپیرانی عەبدولمەلەکی پێش ئیسلام لە هەوراماناتی کوردستان بوو بەڵام دیار نیە کە بە چ هۆکارێك و لە چ سەردەمێکەوە دوای هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، ئەوان لەو ناوچانەڕا بەرەو باشووری ئێران کۆچیان کردووە. لەم پێوەندییەدا مەکنزی یەکەمین سەرکونسوولی ئینگلیس لە ڕەشت لە سەفەرنامەکەی (١٨٥٨ی زایینی) دەنووسێ: عەبدولمەلەکیەکان قەرار بوو لە جیهاد بەدژی ئینگلیزەکان کە سەدری ئەعزەمی نیشتمانپەروەر و دینداری پێشوو ڕایگەیاندبوو، شەڕ بکەن، بەڵام پێش ئەوەی بێنە مەیدانەوە، شەڕ کۆتایی پێهات و ناچار نەبوون بەرەو باشووری ئێران سەفەر بکەن. دەڵێ عەبدولمەلەکیەکان لە بنەڕەتدا لەو ناوچەیەوە هاتوونە ئێرە.»

ئێستاش عەبدولمەلەکیەکان لە باشووری ئێران، دەوروبەری گەچساران لە ئاواییەك بەناوی سەراب ژیان بەسەر دەبەن کە بە مەلەك زادە و ئەسەدزادە

بەناوبانگن. لەسەر گۆڕی باب و باپیرانیشیان ناوبانگی عەبدولمەلەکی دەبینرێ و هەموویان خۆیان بە عەبدولمەلەکی یان ئومەلەکی دەزانن.

***لە باشوورەوە بۆ پارێزگای هەمەدان:***

دوای کۆچکردن بۆ باشوور، عەبدولمەلەکیەکان لە پارێزگای هەمەدان (لە شوێنێك لەنێوان مەلاییر، تویسەرکان و نەهاوەند) هاوسنوور لەگەڵ پارێزگای لوڕستان نیشتەجێ بوون. لە ناوچەگەلێك کە ئەمڕۆ بەم ناوانە بەناوبانگن: ئاواییەکانی گرا، فریازان، زاغە (کە دانیشتووانەکەی ئێستا بۆ تەیمورئابادی تویسەرکان کۆچیان کردووە)، نوقدە، دوقەلعە، فرس فج، دارانی خواروو، حوسێن ئابادی قشلاق، وردابە، نوئاوەرزەمان و محەمەدئابادی محەمەدزەمان.

لە هەمەدان (تویسەرکان)ەوە بۆ خوراسان (دەرگەز):

لە سەردەمی نادرشای ئەفشار، عەبدولمەلەکیەکان (ئەو عێلانەی ئێستا لە مازەندەران نیشتەجێن) لەگەڵ تایفەکانی زەندییە بۆ دەرگەزی قووچان نێردران و عەبدولمەلەکیەکانی کوردستان بۆ قەڵای عەبدولمەلەکی قروە دوور خرانەوە. ئیرەج ئەفشار لەم پێوەندییەدا دەنووسێ: «خەڵکی عێلی عەبدولمەلەکی لە ڕابردوودا نیشتەجێی دەرگەز بوون بەڵام بە هۆکارگەلێك کۆچیان کرد بۆ فارس.»

***لە خوراسانەوە بۆ هەمەدان و شیراز:***

پاش ئەوە، عەبدولمەلەکیەکان و بنەماڵەی زەندییە لە دەرگەزی خوڕاسانەوە بەرەو شوێنی یەکەمینی خۆیان واتە لوڕستان و دەوروبەری تویسەرکان کۆچیان کرد. لەوانەیە لە کاتی گەڕانەوە لە دەرگەز بۆ پارێزگای هەمەدان، ژمارەیەکی کەم لە عەبدولمەلەکیەکان لە بەخشی ڕوودابی سەبزەوار نیشتەجێ بین کە ئێستا نزیکەی ١٢ بنەماڵە (٥٦کەس)ی لەوێن. عێلی عەبدولمەلەکی لە کاتی دەسەڵاتدارێتیی

کەریم خانی زەند لە لوڕستان و تویسەرکانەوە چوونە شیراز. میرزا تەقیخانی سپەهر لە کتێبی شەڕی نێونەتەوەیی یەکەم دەنووسێ: «خانەدانی عەبدولمەلەکی لە عێلی زەندییەن. شوێنی لەدایکبوونی باب‌وباپیرانیان مەلاییرە کە لەوێڕا چوونە شیراز و کاتێك لوتفعەلیخان کوژرا، بنەماڵەی عەبدولمەلەکی بە فەرمانی پاشای ئەو ڕۆژە، ئاقامحەمەدخان، هاتنە تاران.»

***لە شیرازەوە بۆ تاران (شەهریار):***

بەپێی وتەی ئیرەج ئەفشاری سیستانی، عەبدولمەلەکیەکان دوای لەناوچوونی زنجیرەی زەندییە لە ساڵی ١١٦٩ی هەتاوی بە بڕیاری ئاغامحەمەدخانی قاجار سەرەتا بۆ شەهریاری تاران کۆچێنران و دوای ساڵێك بەرەو نوور و کەجوور کۆچیان کرد.

***لە تارانەوە بۆ مازەندەران (بەخشی کەجوور):***

عەبدولمەلەکیەکان لە سەردەمی ئاغامحەمەدخانی قاجار، دوای ساڵێك مانەوە لە شەهریاری تاران لە ساڵی ١١٦٩ی هەتاوی، بۆ مازەندەرانی ڕۆژئاوا (بەخشی کەجوور) کۆچێنران. ئەو ئاوایییانەی لە مازەندەرانی ڕۆژئاوا عەبدولمەلەکیەکانی لێ نیشتەجێن بریتین لە: سەید مەحەللە، کەش کوە و خوورڕەم ئاباد (تەنکابۆن)، ئاواییەکانی کەدیر، پوول، میرکولا و خاچەك (بەخشی کەجوور) و ئاواییەکانی سەلاحەددین کەلا (بەخشی نوور). پێویستە بگوترێ ئەم بنەماڵانەی عەبدولمەلەکی بەهۆی حەشیمەتی کەم و هاوسەرگیری لەگەڵ خەڵکی خۆجێیی ناوچەکە، زمانی زگماکیی و هەورامیی خۆیان لەبیر چۆتەوە و ئەمڕۆ بە زمانی تەبەری دەپەیڤن.

لە سەردەمی نیشتەجێبوونیان لە کەجوور بوو کە شەڕە ماڵوێرانکارەکانی ئێران و ڕووسیای تەزاری لە سەردەمی فەتحعەلیشای قاجار دەستیان پێکرد. لەم

شەڕانەدا کە لە ساڵی ١٢١٨ی کۆچی مانگیدا هەڵگیرسان، عەبدولمەلەکیەکان بە سەرکردایەتی جەعفەرخانی عەبدولمەلەکی لە شەڕکەرانی بەناوبانگی عەبباس میرزا بوون کە تەنیا لە ڕۆژێکدا بۆ پێشگرتن لە هێرشی تۆپەکانی ژێنەراڵ دالۆفی ڕووسی، چوارسەد شەهیدیان پێشکەشی ئێران کرد.

عەبدولمەلەکیەکان لە شەڕەکانی ئێران و ئەفغانیش بەشداریی چالاکانەیان هەبوو و لەم شەڕانەدا یەکێك لە گەورەکانی عێل بە ناوی ڕەشیدخانی عەبدولمەلەکی، باوەگەورەی نەمر حاجی ڕەشیدی ئەکبەری عەبدولمەلەکی لە حوسەین ئاباد، لە ڕێی بەرگریی لە خاك لەگەڵ لاوانی دیکەی عەبدولمەلەکی شەهید بوو.

***لە کەجووزەوە بۆ چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی (شارستانی بێهشەهر):***

بە وتەی ئیرەج ئەفشاری سیستانی، عێلی عەبدولمەلەکی لە ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی مانگی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێرشبەرە تورکەمەنەکان بۆ چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی ڕاگوێزران. هەربەپێی وتە و گێڕانەوەی خۆشیان لە سەردەمی هاتنیان بۆ مازەندەران، نزیکەی چوار هەزار بنەماڵە بوون، بەڵام بەهۆی ئاووهەوای ئەو ناوچەیە ژمارەیان بۆ شەشسەد بنەماڵە کەم بۆوە.

چوار تایفەی عەبدولمەلەکی لەو ئاوایانەدان: زاغەمەرز، زینوەند، ئەمیرئاوا و حوسەین ئاوا. زمانی خەڵکی چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی هەمان زمانە جوانەکەی کوردیی هەورامییە و عەبدولمەلەکیەکانی چوارقەلعە دوای چەندین سەدە دووریی لە زێدی باب‌وباپیرانیان هەروا پارێزەری زمان، کولتوور و نەریتەکانی پێشینیانی خۆیانن. دەتوانرێ نموونەی ئەو باوەڕانە لە پەند و شێعرەکانیاندا ببینرێ.

***ـ کەسانی بەناوبانگ و خاوەن پلەی بەرز لەنێو عێلی عەبدولمەلەکی:***

سەرۆکەکانی عێلی عەبدولمەلەکی لە سەردەمی زەندییەوە تا سەردەمی

پەهلەوی بە پێی ڕیزبەندیی مێژوویی بەم شێوەیەن:

١ـ عەبدولڕەزاق خانی عەبدولمەلەکی ٢ـ سادق خانی عەبدولمەلەکی ٣ـ ئەبداڵ خانی عەبدولمەلەکی (سەدەمی زەندییە)، ٤ـ جەعفەرخانی عەبدولمەلەکی (عیزامولمولکی بچووك) ٥ـ بەستام خانی عەبدولمەلەکی ٦ـ شوکروڵڵاخانی عەبدولمەلەکی ٧ـ جەعفەرخانی عەبدولمەلەکی ٨ـ سەرتیپ عەسکەرخانی عەبدولمەلەکی (عیزامولمولك) ٩ـ جەعفەرخانی عەبدولمەلەکی (عیزامولمولکی بچووك) ١٠ـ سەرتیپ قاسم خانی عەبدولمەلەکی (هەژیرئەلدەولە) (سەردەمی قاجارییە و سەرەتاکانی سەردەمی پەهلەوی).

*ـ زمان و شێوەزار:*

شێوەزاری عەبدولمەلەکی لقێك لە زاراوەی هەورامییە. دیارە ئەمڕۆ شێوەزارە غەیرە کوردی، تێکەڵاوی شێوەزاری عەبدولمەلەکی بوون کە دەبێ هۆکارەکەی لە دووربوونی عەبدولمەلەکیەکان لە زێدی بابوباپیرانیان و کۆچکردنە زۆرەملێیەکان بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵات، باشوور و باکووری ئێران بۆ پارێزگاری لە سنوورەکانی خاکی وڵات بزانرێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، زمان و کولتووری بێگانە تا ئێستاش نەیتوانیوە بە شێوەی تەواو ئەم شێوەزارە شیرینەی هەورامی تێك بدا و گۆڕانی بەسەردا بێنێ.

ئەمڕۆکە عەبدولمەلەکیەکانی ئێران بەپێی زانیاریی و باوەڕێك کە بە کولتووری ڕەسەنی خۆیانیان هەیە، هەنووکەش شێوەزاری کوردیی عەبدولمەلەکیان پاراستووە و دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە هەزار ساڵ دوورکەوتنەوە لە زێدی باب وباپیرانیان بە زمانی زگماکیی خۆیان دەپەیڤن. بۆ نموونە ئاماژە بە ژمارەیەك لە وشە و فرمان (فعل) ی عەبدولمەلەکی دەکەین:

کناچو (کچ)، کوڕە (کوڕ)، زام (برین)، کیانام (ناردم)، تاشام (تاشم،

تراشیم) و ... پێرستێکی تەواو لەم وشە و فرمانانە لە کتێبی (پەند و ئاماژە و وشە کوردییەکانی عەبدولمەلەکی) لە ئامادەکردنی نووسەری ئەم دێڕانەدا هاتووە کە خوێنەران دەتوانن سەیری بکەن...

•••

*ـ بنەچەکە و ڕەچەڵەکی کوردیی عەبدولمەلەکیەکان:*

هێندێك لە توێژەران و مێژوونووسان، عەبدولمەلەکیەکان بە قشقایی، لوڕ، ئەفشار و مەمەسنی ئەزانن. دوکتۆر ڕەزا عەبدولمەلەکی لە کتێبی «مێژووی عێلی عەبدولمەلەکی»دا، بە چەند بەڵگەیەکی مێژوویی، عەبدولمەلەکیەکان بە کورد دەزانێ... بێجگە لەمەش، نووسەر بەهۆی سەفەری زۆر بۆ ناوچە کوردنشینەکانی هەوراماناتی ئێراق و ئێران و ئەنجامدانی توێژینەوەی مەیدانیی لەو شوێنانە، قسەکردن لەگەڵ زمانزان و نووسەرانی بیاڤی کولتوور و ئەدەبیاتی هەورامی و هەروەها بەشداریی لە سیمیناری توێژینەوەیی لەبواری زمانی هەورامی، بەم دەرەنجامە گەیشتووە شێوەزاری عەبدولمەلەکی لقێك لە زاراوەی هەورامییە و زمانی هەورامی، دایکی شێوەزارەکانی هەورامی، زەنگەنەیی، باجەلانی، لەکی، کاکایی، زازاکی، کنولەیی و عەبدولمەلەکیە. ئێستا لێرەدا بە مەبەستی ناساندنی ئەم ناوچە، کەسایەتی و کۆنگرانە، ئاماژە بە چەند دانەیان دەکەین بۆ ئەوەی خوێنەرانی خۆشەویستیش بیانناسن و زانیارییان لەسەریان هەبێ.

*ئا:* ناوچەکان: سەردانی توێژینەوەیی بۆ کوردستانی ئێران ، بەخشی هەورامانات (ژاوەرۆ، تەخت، لهۆن)، هەجیج، هەورامان، کەماڵە، دزڵی، سنە، مەریوان، سەقز، قروە و قەڵای عەبدولمەلەکی. کوردستانی ئێراق: شارستانەکانی سلێمانیە، هەولێر، تەوێڵە لە بەشی هەورامان لهۆن. پارێزگای کرماشان: پاوە، کامیاران، پالنگان، جوانرۆ و کەنگاوەر. پارێزگای هەمەدان: شارستانی تویسەرکان

و ئاوایيەکانی گرا، فریازان، زاغە و نوقدە، دوقەلعە، فرس فج، دارانی خواروو، حوسێن ئابادی قشلاق، وردابە، نوئاوەرزەمان و محەمەدئابادی محەمەدزەمان.

ب: کەسایەتییەکان: چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز محەمەد ڕەشید ئەمینی (لێکۆڵەر و شاعیر)، دوکتۆر سۆران کوردستانی (توێژەر لە بواری مێژووی کورد)، ئەحمەد نەزیری (نووسەر و توێژەر)، موعتەسەم شافعی (چالاکی فەرهەنگی لە پاوە)، هەورامان بەهرامی (سەرنووسەری گۆڤار ئەهورا)، هادی سپەنجی (شاعیر و نووسەری پاوەیی)، ئەمیر ئەمینی (توێژەر و نووسەری پاوەیی)، فاتیح ڕەحیمی (نووسەر ڕیرمانی زمانی هەورامی). ئەوانە بە زمانی ماچۆ قسە دەکەن لە بەشی کوردستانی ئێراق: مامۆستا ئەیووب ڕۆستەم (نووسەر، شاعیر و بەرپرسی ناوەندی ڕۆشنبیریی هەورامانی لهۆن)، کاك جەمیل هەورامی (لە دامەزرێنەرانی ناوەندی ڕۆشنبیریی هەورامانی لهۆن)، بەڕێز کاکەیی (وەزیری پێشووی ڕۆشنبیری لە هەرێمی کوردستان و ڕاوێژکاری بەڕێز بارزانی).

ج: کۆنگرەکان: بەشداریی لە کۆنگرەی هەورامان ناسی (سەروئاباد)، کرنگرەی هەورامان ناسی (زانکۆی سنە، ١٣٨٤)، کۆنگرە ناودارانی هەورامانات (شارستانی پاوە، ١٣٨٦)، فستیواڵی هەورامان (تایبەت بە ماچۆ) لە سلێمانیە (٢٠٠٩ی زایینی).

•••

ـ وتەکانی مامۆستا مەردوخی کوردستانی و کورت فریشلێری ئەڵمانی لەبارەی عەبدولمەلەیك و زێدی سەرەکیيان لە هەورامان:

لێرەدا بەپێویستی دەزانم بۆ ئاگاداربوونی زیاتری خوێنەرە خۆشەویستەکان لەشوێنی سەرەکیی عەبدولمەلەکیەکان، ئاماژەیەك بە کتێبی بەنرخی برای خۆشەویستم، کاك جەمشیدی عەبدولمەلەکی لەژێر ناوی «کورتەمێژووی دێرینی عەبدولمەلەکی»بکەین بۆ ئەوەی بتوانین شوێنی ژیانی باب‌وباپیرانمان

بە خوێنەران بناسێنین کە لە زمان مامۆستا مەردووخی کوردستان و کورت فریشلێر نووسەری بە ڕەگەز ئەڵمانی باس کراوە.

کاك جەمشیدی عەبدولمەلەکی لە کتێبەکەیدا (کورتەمێژووی عەبدولمەلەکیەکان)دا، بە کەڵك وەرگرتن لە بەرهەمی مامۆستا مەردوخی کوردستانی نووسەری مێژوو و جوگرافیای ناوچەکانی کوردستان، ئاوای باس کردووە:« دانیشتووانی قەڵاکانی ناوچەی قوڕوە، پێشتر لە هەورامانات و ناوچەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئەو ناوچەیە خەریکی ژیانی ئاژەڵداری و تفەنگچییەتی بوون». (کورتەمێژووی دێرینی عەبدولمەلەکی. ل ١١٢).

هەر لەم کتێبەدا باسی لەوە کردووە کە « ژیانی دێرینی ئومەلەکیەکان لە ناوچەکانی هەورامان و بەشێك لە ناوچەی هەورامانی باشووری ڕۆژئاوا، زاڵ بەسەر جوانڕۆ و لە کوێستانە سەختەکان لە سەردەمی ماددییەکان بە ئاژەڵداری و ژیانی سەربازیی تێپەڕ دەبوو. (س.پ. ل١٢١)

هەروەها کاك جەمشید عەبدولمەلەکی لە کتێبەکەیدا بە گێڕانەوە لە کتێبی «کەنیزی شازادەخاتوونی فیرعەون» لە نووسینی کورت فریشلێری ئەڵمانی باس لەوە دەکا:

پیاوێکی ڕۆمی (یۆنانی) کە لە شەڕ لەگەڵ ئێرانییەکان لە ناوچەی ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات، لە نزیکیەکانی میانە، تێك دەشکێن، دوای شەڕ، لە گەڵ باقی سوپاکەی بەرەو ڕۆم دەگەڕێنەوە. ئەو کە سەرەتا لە بناری زاگرۆسەوە و لە ناوچەی هەوراماناتەوە بەرەو ئێراقی ئێستا و دواتر بەرەو سووریا وەڕێ کەوتووە، دەڵێ: لە بەرزاییەکان و بناری چیاکانی ناوچەی ڕۆژئاوای ئێران تووشی تایفەیەکی پڕحەشیمەت بووین بەناوی ئومەلەك یان ئەیومەلەك. پیاوەکانیان شەڕکەر و دلێر بوون و مەڕومالاتیان زۆر بوو. زستان بوو و کەشێکی تابڵێی سارد. ڕێگەیان لێ گرتین و ژمارەیەکیان لێ کوشتین و ئێمەش بەناچاری

دەستمان بە پاڕانەوە کرد کە برسیمانە، سەرەتا کەمێکمان خواردن پێبدەن و دواتر چیتان دەوێ وابکەن. ژمارەیەك لە سەرکردەکانی تایفەکە کە دیار بوو سەرۆکیانن، لە شوێنێك کۆ بوونەوە. دوای ڕاوێژکردن بۆ ئاگریان بۆ کردینەوە و خواردنی پێویستیان بۆ هێنایین و وەك دیل هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردین. لەبەر ئەوەی کاتی ڕۆژئاوابوون بوو، لە شوێنێکی تایبەت دایاناین و ئاوریان بۆ کردینەوە و تا بەیانی پاسەوانیان هەبوو. دوای ڕۆژهەڵات بە ڕادەی پێویست خواردنیان دایە سوپاکەم و ئازادیان کردین. لەگەڵ ئەوەی ئومەلەکیەکان دەیانزانی ئێمەی یۆنانی دوژمنی ئێرانییەکانین. دوای ئەوەی ژمارەیەك لە سەربازەکانیان لێ کووشتین، من پاڕامەوە و تکام لێ کردن، ئەوانیش هەڵسوکەوتیان باش بوو. زانیم کە ئێرانییەکان، بەتایبەت ئەم تایفە کوردانە، میواندۆستن ئەگەر میوان دژمنیشیان بێ.»

بە پشت بەستن بە وتەکانی ئەم دوو زانایە، دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە زێدی باب‌باپیرانی عەبدولمەلەکی لە کوردستان، بەشی هەورامانات بووە و ئەم شوێنەش بەپێی ئاماژەکانی ناو وتارەکە، بەشی ژاوەرۆ (بە ئەگەری زۆر بێساران، پاڵنگان، جوانرۆ و ناوچەی پاوە) شوێنی ژیانی باب و باپیرانی عەبدولمەلەکیەکان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ فەرماندە و سوپای یۆنانی بووە کە لە کۆتاییەکانی حکومەتی ئەسکەندەر و پێش حکومەتی سلوکیەکان و ئەشکانییەکان بووە. ئەنجامی ئەم بینین و قسەکردنانەی ئێستای عەبدولمەلەکیەکان سەلمێنەری ئەم ئیددیعایەیە کە شوێنی سەرەکیی عەبدولمەلەکیەکان، هەورامانات و شێوەزاریان هەورامییە.

***بڵاوبوونەوەی عەبدولمەلەکیەکان لە ئێستادا:***

ئێستاکە بەشێکی بەرچاو لە حەشیمەتی عەبدولمەلەکیەکانی ئێران لە چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی (بێهشەهری مازەندەران) و ناوچەکانی نێوان مەلاییر، تویسەرکان و نەهاوەندا نیشتەجێن. دوای ئەوان دەبێ ئاماژە بە عەبدولمەلەکیەکانی قەڵای شارستانی قروە بکرێ. عەبدولمەلەکیەکانی کۆچکردوو بۆ دەورووبەری تاران و قومیش لەباری ژمارەی خێزان و حەشیمەت، لە پلەی دواتر دان کە لە شارەکانی مامازن، خاتوون ئاباد، نەزەرئاباد، شەهریار، هەشتگرد و شارستانی قوم نیشتەجێن. دەبێ بگوترێ ئەگەری هەیە لە ئاواییەکانی ئاوباریك و شەکرئابادی ئەلەشتەری لورستانیش ژمارەیەك لە حەشیمەتی عەبدولمەلەکی نیشتەجێ بن. لە ڕۆژئاوای مازەندەران، عەبدولمەلەکی و مەلەکیەکان کە هەمان بنەماڵەکانی عەبدولمەلەکین، نیشتەجێن و توێژینەوەیان لەسەر کراوە. لە کۆتاییدا دەبێ ئاماژە بە عەبدولمەلەکیەکانی ڕوودابی سەبزەوار بکرێ کە نزیکەی دوازدە بنەماڵەن و زۆربەیان بۆ شارە گەورەکانی خوراسان کۆچیان کردووە...[١٣]

بەڕێز سیدعلی میرنیا بەم شێوەیە باس لە تایفە کوردەکانی پارێزگای مازەندەران دەکا:

***تایفە کوردەکان لە ساری:***

مێلگونێف بەم شێوەیە ناوی تایفە کوردەکان لە ساری دێنێ: جەهانبەگلوو، مودانلوو و ...

پێنجسەد کەس لە ساری ژیان بەسەر دەبەن کە لە سەردەمی محەمەدشای قاجار کۆچێنراون. لە ئاواییەکانی دیمتوران ، حەمیدئابادیش نیشتەجێن. جەهانبەگلوو و مەدانلوو لە ئەڕڕەدێ، دوو و نیو فەرسەخیی ساری نزیك لە چیا نیشتەجێن.

***تایفە کوردەکان لە بلوکی کلارستاق:***

لە بلوکی کلارستاق زیاتر خواجەوەندەکان دەژین کە بریتین لە: خواجەوەند،

عومرانلـوو، قلیچـی، عەبدولمەلەکی، جەهانبەگلـوو و مودانلوو.

***تایفە کوردەکانی جەهانبەگلوو و مودانلوو:***

تایفـە کوردەکانـی جەهانبەگلـوو و مودانلـوو لـە ئاواییەکانـی شیرخواسـت و میانـروز و فـەرەح ئابـادی مازەنـدەران نیشـتەجێن. مودانلـووەکان سەدسـاڵ پێـش ئێسـتا، لـە گرنگتریـن تایفـە کوردەکانـی مازەنـدەران بـوون. جەهانبەگلـوو لـە ئاواییەکانـی ئەنـدرود، چیـك رود، مەشـهەدی گەنجـروز نیشـتەجێن.

مودانلـوو لـە ئاواییەکانـی مشـك ئـاوا، جویـار، پەنبەچولـە، کوردکـەلا، لاریـم نیشـتەجێن و خەریکـی وەرزیـری و ئاژەڵداریـن. زمانیـان کوردییـە و بـە ڕادەیەکی کەمیـش بـە تورکـی قسـە دەکەن.

***تایفە کوردەکانی عەبدولمەلەکی و خواجەوەند:***

تایفـە گەورەکانـی کـورد لـە ناوچـەی نـور، عەبدولمەلەکـی و خواجەوەنـدن. تایفـەی عەبدولمەلەکـی لەلایـەن ئاغامحەمەدخانـی قاجـار لـە شـیراو و ناوچـەی شـەهریارەوە بـۆ نـور ڕادەگوێزرێـن و دوای چـل سـاڵ میـرزا ئاقاخانـی مـوری سـەدری ئەعزەمـی ناسرەددیـن شـا لـە دەوروبـەری سـاڵی١٢٧٥ی کۆچـی هەتـاوی دەیاناتـە زاغەمـەزر لـە نزیـك سـاری. عەبدولمەلەکیـەکان بـە تورکـی و کـوردی قسـە دەکـەن.

تایفـەی خواجەوەنـد لـە کەجـوور و نـوور نیشـتەجێن و تێکـەڵاوە لـە تیرەکانی خواجەوەنـد و شـەرەفوەند لـە کەجـوور و خواجـەوی و حواجەنوری لـە نـوور.

***تیرەکانی کەلبادی:***

تیرەکانی کەلبادی بریتین لە:

١ـ ئەشکارگەر

٢ـخواجەوی (خواجەوەند)

٣ـمسگەر

لە سەردەمی ناسرەددین شای سەرۆکی تایفە کوردەکانی کەلبادی ڕەزاقولیخان بووە... ئەم تایفەیە خەریکی وەرزێری و ئاژەڵداری و کاری دیکەن و بە گشتی سەر بە مەزهەبی شیعەن و لە ئەمیرئاواى زاغمەرز دەژین.

***عێلی خواجەوەند لە کلارستاق:*** کوردانی خواجەوەند لە بەخشی کەلاردەشت (کلارستاق)ی مازەندەران نیشتەجێن. ئەم کوردانە سەر بە عێلی گەورەی کەلبادین و زمانیان کوردی و فارسییە...

***سەردەمی ڕاگواستنی خواجەوەند:*** خواجەوەندەکان لە بنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی لوڕستانن. ئاغامحەمەدخانی قاجار پەنجا بنەماڵەی ئەوانی لە ئەردەڵان و گەڕووسەوە بردە مازەندەران بۆ ئەوەی بە هاوکاریی کەسێك بە ناوی عەبدولحەکیم تاران لە پشێوی و ئاڵۆزیی بپارێزێ. ئێستا کوردانی خواجەوەند لە کەلاردەشت نیشتەجێن...

بەپێی گێڕانەوەیەکی تر خواجەوەندەکان لە سەردەمی نادرشا و کەریمخانی زەند بۆ ئەم ناوچانە ڕاگوێزراون. لەوانەیە ئەم تایفەیە لە دوو قۆناغدا ڕاگوێزرابن. تایفەی خواجەوەند لە کلارستاقی مازەندەران پێکهاتووە لە تیرەکانی یەزدانی، دلفان ئازەری، مەشعەشی، لەك، خواجەوەند. بەناوبانگترینیان خواجەوەندە...

***تایفەی شەرەفوەند لە عێلی خواجەوەند لە کەجوور:***

تایفەی شەرەفوەند لە عێلی خواجەوەندن کە شەشسەد بنەماڵەیان لە هەزارخاڵی ڕۆژئاوای کەجووری مازەندەران نیشتەجێن. (دیارە ئەوکاتی کە

ئەو کتێبەی نووسیوە)

***تایفەی لەك لە عێلی خواجەوەند لە کەلاردەشت:***

تایفەی لەك لە عێلی کوردی خواجەوەندە و زیاتر لە کەلاردەشت نیشتەجێن. ئەم تایفەیەش لەگەڵ خواجەوەندەکان بۆ مازەندەران ڕاگوێزراون. سەرۆکەکانی خواجەوەند زیاتر لەم تایفەیە بوون. ئەم تایفەیە خەریکی کاروباری وەرزێرین و زمانیان لەکییە و بە تورکیش قسە دەکەن.

*تایفەکانی غەیاسوەند لە مازەندەران:*

تایفە کوردەکانی غەیاسوەند، ٨٥٠ بنەماڵەیان لە سەردەمی سەفەوییە بۆ بنارەکانی ئەلبورز، دەوروبەری جادەی قەزوین کۆچیان کردووە و لە دێهستانەکانی ئیقباڵ، ڕوودبار، قاقزان نیشتەجێن. ئاغامحەمەدخانی قاجار چوارسەد بنەماڵەی لەوان لە کرماشان و لوڕستانەوە گواستەوە بۆ مازەندەران. نزیکەی دووسەد بنەماڵەی غەیاسوەند و چەگەنی و ڕەشوەند لەنێوان لوشان و مەنجیل نیشتەجێن. تیرە بەناوبانگەکانی غەیاسوەند لە مازەندەران بریتین لە:

دەرویشوەند، کەلماسی، سلخوری، محەمەدبیگی، غەیاسی. زمانیان کوردیی و تورکییە ...

***تایفەی ئوسانلوو (ئیزانلوو):***

تایفەی ئوسانلوو کە لە خوراسان ئەم تایفەیە بە ئیزانلوو ناسراون. بە فەرمانی ئاغامحەمەدخانی قاجار لە دەشتی خوار و وەرامین بۆ مازەندەران ڕاگوێزراون. ئێستا (کاتی نووسینی کتێبەکە/ ئا) سەد و پەنجا بنەماڵەیان لە ساری و دەوروبەری نیشتەجێن و خەریکی وەرزێری و کشتوکاڵن. زمانیان تورکیەە و بە فارسیش قسە دەکەن.[١٤]

## • سەرچاوەکان:

١. ویکیپیدیای فارسی

٢. بررسی مهاجرت اجباری کردهای مازندران، ماهنامه اجتماعی فرهنگی ادبی مهاباد، سال یازدهم، شماره ١٢٥، سال ١٣٩٠.

٣. س.پ

٤. نزدیک به ٤٠ هزار کرد در کلاردشت مازندران ساکنند. -http://www.khwend kar.com/fa/?p=1925، 4 أوريل 2013.

٥. بررسی مهاجرت اجباری کردهای مازندران، س.پ.

٦. س.پ.

٧. مەحموودپوور، ڕەئوف، کوردەکانی مازەندەران لە گەشتێکی خێرا، وەگیراو لە: www.zerneyaso.blogfa.com/post-72.aspx.

٨. بررسی مهاجرت اجباری کردهای مازندران، س.پ.

٩. مەحموودپوور، ڕەئوف، س.پ.

١٠. مەحموودپوور، ڕەئوف، س.پ.

١١. مەحموودپوور، ڕەئوف، س.پ.

١٢. سەید شوکری، سەید سمایل، عەشایری کورد، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٧٩، ساڵی حەوتەم، ١٣٨٦ی هەتاوی، ل ٢٦.

١٣. عبدالملکی، حسن سلیمی، پیشینەی عبدالمالکی ها: عبدالملکی ها، وەرگیراو لە: http://ileabdolmaleki.blogfa.com/post-٧٥.aspx, دوشنبه بیستم دی ١٣٨٩.

١٤. میرنیا، سیدعلی، ایلها و تایفەهای عشایری کرد ایران، موسسه انتشاراتی و آموزشی نسل دانش، تهران، ١٣٦٨. ل ٣٥ ـ ٤١.

## • کوردەکانی پارێزگای گوڵستان

- چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای گوڵستان
- تایفە کوردەکانی پارێزگای گوڵستان

### • چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای گوڵستان

گوڵستان ناوی نوێی ناوچەیەکی مێژوویییە کە بە درێژایی مێژوو تا سەدەی حەوتەمی کۆچی بە ناوی ئەیالەتی گورگان و دوای ئەوەش تا سەرەتای سەدەی دەیەم بەناوی «ئەستەرئاباد» و لە نووسراوەکانی سەردەمە سەرەتاییەکانی ئیسلامی بە ناوی جۆرجان و لە ڕەشەمەی ١٣١٦ی هەتاویشەوە بە گورگان ناو نراوە. ئەم پارێزگایە هەتا ساڵی ١٣٧٦ ی هەتاوی (١٩٩٧ی زایینی) بەشێك لە پارێزگای مازەندەران بوو، بەڵام لەو ساڵەدا بوو بە پارێزگایەکی سەربەخۆ و شارستانی «گورگان»یش وەك ناوەندی پارێزگا دیاری کرا. زۆربەی شارەکانی ئێستای ئەم پارێزگایە پێشینەیەکی ئەوتۆیان نیە و لە گەورەبونەوەی گوندەکان پێك هاتوون بە واتایەکی تر بە گوندشار لەقەڵەم دەدرێن. لەگەڵ ئەمەشدا، شارەکانی گورگان و گونبەدی کاووس پێشینەی مێژوویییان هەیە و زۆربەی ئاواییەکانی ئەم پارێزگایە لە یەکتر نزیکن ...

حەشیمەتی پارێزگای گوڵستان بەپێی سەرژمێرییساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی (٢٠٠٦ی زایینی) زیاتر لە ١,٦١٧,٠٨٧ کەسە کە لەم ڕێژەیە ٧٣٢٦٩٩ کەس شارنشین و ٨٩٤٥٣٩ کەس گوندنشینن. لەم پارێزگایەدا تەنیا دوو شاری گورگان و گونبەدی کاووس حەشیمەتیان لەسەرووی سەد هەزار کەسەوەیە. ئەم پارێزگایە لە ڕەشەمەی ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی لە ١٤ شارستان بەناوەکانی ئازادشەهر، ئاق قەلا، گورگان، گونبەدی کاووس، بەندەری تورکەمەن، گەمیشان، ڕامیان، کوردکوی، بەندەری گەز، عەلی ئابادی کەتول، گالیکەش، کەلالە-مراوەتەپە، مینودەشت و هەروەها ٢٥ شار و ٢٣ بەخش و ٥٣ دێهستان پێك هاتووە.[1]

- **تایفە کوردەکانی پارێزگای گوڵستان**

لە چەند ناوچەیەکی ئەم پارێزگایە هێندێك لە تایفە کوردەکان دەژین کە دەتوانین بڵێین بەهۆی چارەنووسێکی هاوشێوەی کوردەکانی مازەندەران گەیشتوونەتە ئەو ناوچانە. چونکە هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، ئەم پارێزگایە هەتا ساڵی ١٣٧٦ ی هەتاوی (١٩٩٧ی زایینی) بەشێك لە پارێزگای مازەندەران بوو، بەڵام لەو ساڵەدا بوویە پارێزگایەکی سەربەخۆ و شارستانی «گورگان»یش وەك ناوەندی پارێزگای دیاری کرا. لە خوارەوە بە کورتی باس لە هێندێك لەو تایفانە دەکەین:

***تایفەکانی حەسەنوەند و کاکلوەند:*** تایفەی حەسەنوەند یەکێك لە عێلە گەورەکانی کوردە. ناوەندیی سەرەکیی ئەم تایفەیە لە ئەلەشتەرە. لە لوڕستان، تایفەی کاکلوەند لە عێلی حەسەنوەندە کە تیرەکانی حەسەنوەند و کاکلوەند لە ناوچەی ئەلەشتەر بڵاو بوونەتەوە. لەنێو سوارچاك و تفەنگچییەکانی ئەوان لە کۆندا کەسانێك هەبوون کە کار و کردەوەیان سەرسوڕهێنەر بوو. سەرکردە و سەردارانی تایفەی حەسەنوەند لە ڕابردوو، بە هۆی هەبوونی سوارچاکی

لێهاتوو و ئازا هەمیشە جێگەی سەرنجی دەسەڵاتداران بوون. بەگشتی ئەم تایفەیە لە پیاوانی ئازا و سوارکار و تیرهاوێژ پێك هاتبوو کە لە کاتی کۆچی عێلیشدا ڕۆڵی پارێزگارییان دەگێڕا. لە ئێستادا لە ئاواییەکانی ئیلوار و زەنگلانی کۆردکوی نیشتەجێن...

***تایفە کوردەکانی کوردکوی:*** لە دەشتی کوردکوی سەر بە شارستانی گورگان هێندێك لە تایفە کوردەکان دەژین کە بریتین لە:

۱ـ تایفەی زەعفەرانلوو ـ چەند بنەماڵەیەکی کوردی زەعفەرانلوو لە حەسارچەی سەر بە گونبەد نیشتەجێن.

۲ـ تایفەی کاکلوەند بە تیرە جیاوازەکانییەوە.

۳ـ تایفەی جەهانبەگلوو، لە عەلی ئاوا. ئەم تایفانە لە سەردەمی محەمەدعەلی شای قاجار بۆ ئەم ناوچەی براون.

٤ـ تایفەکانی عومرانلوو، دوانلوو، سپانلوو، منوچرلوو، عەرەب خیشانلوو، حوسێنلوو لە سەردەمی سەفەوییە و ئەفشارییەدا بۆ ئەم دەشتە ڕاگوێزراون یان خۆیان چوون. ئێستا گەرمێن و کوێستان ناکەن و ئێستا لە ئاواییەکانی سەرکەلاتە، خەراب شاری سەر بە کۆردکوی نیشتەجێن و خەریکی ئاژەڵداریی و وەزێرین. زمانی سەرەکیی ئەوان کوردییە و بە فارسی و تورکییش قسە دەکەن.

٥ـ کوردەکانی جەهانبەگلوو لە سەردەمی شاعەبباسی گەورە لە فەرەح ئابادی ساری نیشتەجێ بوون. دواتر لە گلویی دانیشتن. سەرۆکی تایفە شەکەرخان بوو کە لە فندرسك و کەتول دەسەڵاتداری ناوچەکە بوو. حوسێن خانی سوڵتان، یەکێك لە خزمەکانی شەکەرخان بە عەشیرەتی خۆیەوە گەیشتە دامغان و ژمارەیەکیش لە سەردەمی فەتحعەلیشای قاجاردا لە کوردمەحەلەی کۆردکوی ئەمرۆ و کوردئاباد و کەتوول نیشتەجێ بوون. زمانیان کوردی و تورکییە و بە فارسیش دەپەیڤن.

٦ـ تایفەکانی کوردزەیدی، باباکوردی لە ئاوایی خارکەلاتە ژیان بەسەر دەبەن کە لە بەندەری گەز چوونە ئەو ناوچەیە.

٧ـ کوردی کتولی لە عەلی ئاباد، خەریکی وەرزێرین.[٢]

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا تەنیا ئاماژە بە ناوی ئەو تایفانە کراوە کە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوانی پێشوو نیە. کوردەکانی گورگان: تایفەکانی حەسەنوەند، کاکاوەند. تایفە کوردەکانی کورد کوی: زەعفەرانلوو، کاکاوەند، جەهانبەگلوو، عومرانلو، دوانلوو، سەپانلوو، منوچێهرلوو، عەرەب خویشانلوو، حوسێنلوو. تایفەکانی کوردی زەیدی، باباکوردی، کتولی و ... (وابزانم کاکاوەند و کاکلوەند هەر یەکن، نووسەرەکان بە شێوەی جیا نووسیویانن.ئا)[٣]

● سەرچاوەکان:

١. (ویکیپیدیای فارسی)

٢. میرنیا، سیدعلی، ایلها و تایفەهای عشایری کرد ایران، موسسە انتشاراتی و أموزشی نسل دانش، تهران، ١٣٦٨. ل ٤١ ـ ٤٢.

3. www.laeen.persianblog.ir/page/kormanj1

## • کوردەکانی پارێزگای گیلان

- چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای گیلان
- تایفە کوردەکانی پارێزگای گیلان

### • چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای گیلان

پارێـزگای گیـلان لـە باکـوورەوە لەگـەڵ کاسـپین (دەریـای خـەزەر) و وڵاتـی ئازەربایجـان، لـە ڕۆژئـاواوە لەگـەڵ پارێـزگای ئەردەبیـل، لـە باشـوورەوە لەگـەڵ پارێزگاکانـی زەنجـان و قەزویـن و لە ڕۆژهەڵاتیشـەوە لەگەڵ پارێـزگای مازەندەران هاوسـنوورە. بەپێـی دوایین دابەشـکاریی نێوخۆیـی ئێران سـاڵی ١٣٨٩ی هەتاوی، پارێـزگای گیـلان لـە ١٦ شارسـتان، ٤٣ بەخـش، ٥١ شـار و ١٠٩ دێهسـتان پێـك هاتـووە. حەشـیمەتی پارێـزگا لـە سـاڵی ٨٩ی هەتـاوی، ٢,٤٨٠,٨٧٤ کـەس بـوو و ٠,٩ ی پانتایـی و ٣,٣ی حەشـیمەتی ئێـران لەخـۆ دەگـرێ. ناوەندەکـەی شـاری «ڕەشت»ـە و هێندێـك لـە گرنگتریـن شـارەکانی بریتیـن لـە بەنـدەری ئەنزەلـی، لاهیجـان، تالـش، لەنگـرود، ڕوودسـەر، بەنـدەری ئاسـتارا، فومـەن و ...

لــە گیــلان چەنــد گرووپێکــی ئیتنــی جیــاواز ژیــان بەســەر دەبــەن کــە گەورەترینیــان گیلەکــە و یەکێــك لەوانیــش عێلــی کــوردی عمارلوویــە کــە

ناوی بەخشی عمارلووی ڕوودباریش لەوان وەرگیراوە. بەپێی ڕاپرسییەك کە ساڵی ۸۹ی هەتاوی ئەنجام درا، لە توێژینەوەیەکی مەیدانی و لە کۆمەڵگەی ئاماری لەنێو دانیشتووانی ۲۸۸ شار و نزیکەی ۱٤۰۰ گوندی سەرانسەری ئێران، ٪ی ئەو «قەوم»انەی نموونەیان لێ وەرگیرا، لە پارێزگای گیلان بەم شێوەیە بوو: ٤،٥ فارس، ۷،۹ تورك، ۰،۹ کورد، ۰،۲ عەرەب، ۸٥،۹ شیمالی (گیلەك، تالشی و مازنی و تورکەمەن) و ۰،۷ بێوەڵام. ئەم پارێزگایە یەکێك لە خۆشترین پارێزگاکانی ئێرانە و ساڵانە خەڵکێکی زۆر لە سەرانسەری ئێران و لە زۆر وڵاتی دنیاوە بە مەبەستی گەشتیاری سەردانی ئەو پارێزگایە دەکەن.[١]

- **تایفە کوردەکانی پارێزگای گیلان**

شارستانی ڕوودبار و دەوروبەری (شارستانی تارم، ڕودباری ئەلەموت، شارستانی سیاهکەل و شارستانی تونکابۆن) بە ناوەندی کوردنشینی پارێزگای گیلان ئەژمار دەکرێن. تیرە و تایفە گەورەکانی کوردزمان بەتایبەت عمارلوو لە سەرانسەری ئەم ناوچانە بوونیان هەیە.

لە کۆنفدراسیۆنی عمارلوو ئەم تیرە و تایفانەی خوارەوە لە شارستانی ڕوودبار دەژین:

لە بەخشی عمارلوو شارستانی ڕوودبار: عمارلوو، قبە کرانلوو، ئوستاجلوو، بیجانلوو، بسشانلوو، شەمخانلوو.

لە بەخشی ناوەندی شارستانی ڕوودبار (ڕەحمەت ئاباد): برامکلە، حاتەمی، پیراسلوو، عمارلوو.

لە بەخشی ناوەندیی شارستانی ڕوودبار (گلوگاه): بێهتوویی، وەلی یاری، باجەلانی، چەمشگەزەك، کەلهوڕ و ڕەشوەند[٢]

لـەم پارێزگایـە دوو عەشـیرەتی گرینگـی کوردانـی لـێ بـووە: ڕیشـوەند (یـان ڕەشـوەند) و ئامارلـوو. بـە بـڕوای ڕابینـۆ عەشـیرەی ڕەشـوەند بەشـێك لـە عەشـیرەی بابانـن کـە سـولەیمانییەیان چـێ کـرد و شاعەباسـی هـەوەڵ ڕایگواسـتوونەتە گیـلان. ئەوانیـش لـە بەشـێکی زۆر لـە لەوەڕگەکانـی خۆیـان لەلایـەن عەشـیرەی ئامارلـوو، کـە لـە ڕۆژئـاوای ئێـران نادرشـا هێنابوونیـە گیـلان، دەرکـران. ئێسـتا عەشـیرەتی ڕیشـوەند بەشـی زۆریـان لـە پارێـزگای قەزویـن دەژیـن. [٣]

بەڕێـز سـیدعلی میرنیـا بـەم شـێوەیە بـاس لـە تایفـە کوردەکانـی پارێـزگای گیـلان دەکا:

تایفەکانـی عمارلـوو: مێلگونێـف لـە سـەفەرنامەی خۆیـدا تایفـە کوردەکانـی عمارلـوو لـە ناوچـەی عمارلـوو لـە سـەدەی هەژدەیەمـی زایینـی ١٨٥٨ ـ ١٨٦٠ بەرامبـەر بـە ١٢٣٩ی هەتـاوی لـە ناوایەکانـی عمارلـوو و بابامەنسـوور بـەم شـێوەیە بـاس دەکا: ١ـ تایفـەی وەلیخـان ٢ـ تایفـەی بیشـانلوو ٣ـ شـاقەلانلوو ٤ـ مەحمودلـوو ٥ـ چغلانلـوو ٦ـ چاخملـوو ٧ـ تیتکانلـوو ٨ـ میرزاخانلـوو ٩ـ تایفـەی کازم خـان، نەوروزخـان، باقلیخـان ١٠ـ قبـە کرانلـوو ١١ـ مەنجیلیەکیەکانـی بـادر (بەهادورلـو) ١٢ـ شـمکانلوو (شـمخانلوو)

***تایفەی ڕەشوەندلوو:***

کوردانـی عمارلـوو لـە تایفـەی ڕەشـوەند یـا ڕەشـوەندلوون کـە تیرەیـەك لـە عێلـی «بەبـە»ن کـە لـە سـلێمانیەی ئێـراق نیشـتەجێن. هەشـتا خێزانـی ئـەو تایفەیـە لەلایـەن شـا عەبـاس بـۆ دێهاتـی ڕوودبـار کۆچێـنران. تیرەیـەك لـەو تایفەیـە لـە قووچـان و شـیروانی خوراسـان نیشـتەجێن.

***تیرەی ڕەشوەند لە سیاهکەل:***

تیرەیەك لە کوردان لە سیاهکەل نیشتەجێن کە سەر بە تایفەی ڕەشوەندن و بە تایفەی عەین شێخ یان سیاهکەلی بەناوبانگن و زۆربەیان خەریکی ئاژەڵدارین. زمانیان کوردییە و بە فارسیش قسە دەکەن.

***تایفەکانی کورد لە شاندرمەن:***

ئاواییەکانی بەخشی مەعاف، سەر بە شاندرمەن (بەخشێکە سەر بە شارستانی ماسالی گیلان) کوردنشینن. ئەو کوردانەی ڕۆژێك لە زەنجان یا خەلخاڵەوە گەیشتوونەتە ئەو شوێنە... زۆربەیان خەریکی ئاژەڵدارین. زمانیان کوردییە و بە فارسیش قسە دەکەن.

***تایفە کوردەکان لە ماسولە:***

١ـ تایفەی عالیوەند:

ئەم تایفەیە لە پاشماوەکانی حاجی حەسەن (حەسەنلو)ن کە لە ماسولە سەر بە شارستانی فومەن دەژینو خەریکی کاری وەرزێرین...

٢ـ تایفەی ئیلبەگی: ئەم تایفەیە لە سەردەمی قاجارەکانیش لە ماسولە بوون و حەمەڕەزاخان، فەتحعەلی خان سەرۆکایەتی ئەو تایفەیان لە ئەستۆ بووە.

***تایفە کوردەکانی دیلمان:***

کوردانی دیلم لە ناوچەی کوێستانیی ڕۆژهەڵاتی سفیدرود، لە دەشتی دیلمان ژیان بەسەر دەبەن.. [٤]

## • سەرچاوەکان:

١. ویکیپیدیای فارسی

2. www.laeen.persianblog.ir/page/kormanj1

٣. سەید شوکری، سەید سمایل، عەشایری کورد، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٧٩، ساڵی حەوتەم، ١٣٨٦ی هەتاوی، ل ٢٤.

٤. میرنیا، سیدعلی، ایلها و تایفەهای عشایری کرد ایران، موسسە انتشاراتی و أموزشی نسل دانش، تهران، ١٣٦٨. ل ٢١ ـ ٢٤.

5. http://kurmanj.blogfa.com/post/34

## • کوردەکانی پارێزگای ئەردەبیل

- چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای ئەردەبیل
- **سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ ئەردەبیل**
- **شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد لە ئەردەبیل**

### • چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای ئەردەبیل

**پارێزگای ئەردەبیل یەکێك لە پارێزگاکانی ئێرانە کە لە باکووری ڕۆژئاوای ئەم وڵاتە هەڵکەوتووە. ئەم پارێزگایە لە باکوورەوە لەگەڵ کۆماری ئازەربایجان، لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ پارێزگای گیلان و کێوەکانی تالش و لەلای باشوورەوە لەگەڵ پارێزگای زەنجان هاوسنوور و دراوسێیە.**

**ئەم پارێزگایە بە ڕووبەری نزیك بە ١٧٩٥٣ کیلۆمیتری چوارگۆشە و حەشیمەتی نزیك بە ١,٢٤٩,٠٠٠ کەس (لە ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی) بەپێی دوایین دابەشکاریی وڵات، لە ١٠ شارستان، ٢٩ بەخش، ٢٦ شار و ٦٦ دێهستان پێك هاتووە.**

**ناوەندی پارێزگا، شاری ئەردەبیلە و شارستانەکانی تری ئەم پارێزگایە بریتین لە: بیلەسوار، پارس ئاباد، خەلخاڵ، سەرعین، کەوسەر، گەرمی، مشکین شار، نەمین، نەیر.**

**زۆربەی دانیشتووانی پارێزگای ئەردەبیل لە ئازەربایجانییەکان پێك هاتووە**

کە بە زمانی تورکیی ئازەربایجانی قسە دەکەن. دیارە لە هێندێك لە ناوچەکانی شارستانی خەلخاڵ (لە باشووری پارێزگا) زمانەکانی تاتی و تالشی لەنێو خەڵك قسەیان پێدەکرێ. ئەردەبیل لەگەڵ ئەم ڕووبەر و پانتاییە کەمەی، فرەچەشنیی زمانیی تێدایە، لە پەنا زمانی تورکیی ئازەربایجانی، کە زۆرینەی دانیشتووانی پارێزگا قسەی پێدەکەن، زمانی تالشی لە شارستانی نەمین و بەخشی عەنبەران و زمانی تاتی لە شاری کلور و ئاوایییەکانی بەخشی شاهرود و شارستانی خەلخاڵ قسەیان پێدەکرێ.

ئەم پارێزگایە یەکێك لە ناوچە گەشتیارییەکانی ئێرانە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم پارێزگایە ئاووهەوای فێنك و خۆشی ئەم ناوچەیە لە وەرزەکانی بەهار و هاوینە.

### *شارستانی خەلخاڵ*

شارستانی خەلخاڵ لە باشووری پارێزگای ئەردەبیل هەڵکەوتووە و ناوەندەکەشی شاری خەلخاڵە. ئەم شارستانە لە باکوورەوە لەگەڵ شارستانی کەوسەر، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ پارێزگای گیلان، لە باشوورەوە لەگەڵ پارێزگای زەنجان و لەلای ڕۆئاواشەوە لەگەڵ شارستانی میانە هاوسنوورە.

بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی، شارستانی خەلخاڵ ١٠٤٤٥٤ کەسی حەشیمەت هەبووە. زمانی خەڵکی بەخشی ناوەندی و بەشی زۆری ئاوایییەکانی ئەم شارستانە، تورکیی ئازەربایجانی و بەخشەکانی دیکەش بە زمانەکانی تاتی، گیلەکی و کوردی قسە دەکەن. لە هێندێك لە ئاواییو بەخشەکان زمانەکانی تالشی، تاتی و کوردی کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ.

لە شارستانی خەلخاڵ شێوەزاری جۆراوجۆر بوونیان هەیە کە دەکرێ ئاماژە بکرێ بە:

- زمانی تورکیی ئازەری لە خودی شار و زۆربەی ئاوایییەکانی خەلخاڵ.
- زمانی کوردی لە بەخشی مەرکەزی و لە دێهستانی لەنبەر و ئاوایییەکانی

دەورویەری.

- تاتی کە یەکێك لە شێوەزارە تایبەت و باستانییەکانە، لە بەخشی شاهرود و خەلخاڵ.

-تالشی کە لە هێندێك لە ئاواییە سنوورییەکانی ناوچەی شاهروود باوە.[1]

## ● سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ خەلخاڵ

کوردەکانی خەلخاڵ لە ڕەگەزی ئارییاین کە دوابەدوای زنجیرەیەك بڕیاردانی سیاسی لە نزیکەی ٢٥٠ ساڵ لەوەپێش لە باکووری خوراسانەوە بۆ خەلخاڵ کۆچێنران. ئەمڕۆکە زۆرکەس لە خەڵکی کرمانجی خەلخاڵ لەخۆیان دەپرسن کە چۆن هاتوونەتە ئەم ناوچە کوێستانییانە. لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەبێ بڵێین هەبوونی کوردان لە ناوچەی خەلخاڵ لە سەردەمی نادرشای ئەفشارەوە دەستی پێکردووە. ئەم خەڵکە دوابەدوای زنجیرەیەك بڕیاردانی سیاسی لە ڕۆژئاوای ئێرانەوە بۆ باکووری خوراسان ڕاگوێزران بۆ ئەوەی لە بەرامبەر بێگانەکاندا خۆڕاگریی بکەن.

لەڕاستیدا ئەم خەڵکە لە سەردەمی نادرشادا لە قوچانەوە بۆ خەڵخاڵ کۆچێنران. ئەوان بە جێگیربوون لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کێوەکانی تالش، دیوارێکی قەومیی نوێیان دروست کرد بۆ ئەوەی پێش بە گرژیی و تێکهەڵچوونی نێوان تالشەکان و هۆزەکانی شاهسەوەن بگرن. کەواتە پاڵنەری سەرەکی بۆ ڕاگوێزانی ئەم عێلە کوردانە لە قوچانەوە بۆ خەلخاڵ بەهۆی ئەو سیاسەتانەی نادرشاوە بووە.

دوای نەمانـــی حکومەتـــی ئەفشـــارییە، کوردەکانـــی لـــەو ناوچانـــە مانـــەوە و لەبەرئـــەوەی بـــە شـــێوەیەکی ئەوتـــۆ لەلایـــەن حکومەتـــی ناوەندیـــی زەنـــد و قاجـارەکان پشـتیوانیان لـێ نەکـرا، هەربۆیـە بـە گۆڕینـی ڕێـڕەوی سیاسـی ژیانـی ئاشـتیانەیان لەگـەڵ ئـازەری و تـورك و تالشـەکان هەڵبـژارد و لـەم پێناوەشـدا بـە شـێوەیەکی زۆر ســەرکەوتووانە کاریــان کــردووە.[2]

**• شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد لە ئەردەبیل**

لە شارستانی خەلخاڵی سەر بە پارێزگای ئەردەبیل نزیکەی ۲۰ گوندی کرمانجی نشین هەیە کە لە باکورەوە بۆ باشوور بریتین لە: میل ئاغاردان، بلوکانلوو، مستەفالوو، پیرانلوو، ئوجقازی خواروو، مورستان، کولستانی سەروو، حاجی ئاوا، لەنبەر، نەواشنق، خوداقولی قشلاق، چەلەنبەر، ئاقبلاق کورد، غەفوورئاوا، کالار، داودخانی، ئەلەنکەش، زاویەکورد.[٣]

*** هەڵکەوتی جوگرافیایی ئاوایی بلوکانلوو**

ئاوایی بلوکانلوو یەکێك لە ئاوایيەکانی پارێزگای ئەردەبیل سەر بە دێهستانی سەنجبودی ڕۆژهەڵات لە بەخشی ناوەندیی شارستانی خەلخاڵە. مەودای لەگەڵ خەلخاڵ ٢٦ کیلۆمەتر و بەرزایی لە ئاستی دەریا ١٨٤٠ میترە.

ئەم ئاواییە لە باکوورەوە لەگەڵ ئاوایی میل ئاغاردان و ئارپاچای، لە باشوورەوە لەگەڵ ئوجقازی خواروو، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ئاوایی مستەفالوو و لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ ئاوایی پیرانلوو دراوسێ و هاوسنوورە.

حەشیمەت: بەپێی سەرژمێریی گشتیی ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی ئاوایی بلوکانلوو لە ٢٠٣ بنەماڵە پێك هاتووە کە حەشیمەتەکەی ٨٧٠ کەسە. لە کۆی ئەو حەشیمەتە ٤٣٦ کەسی پیاو و ٤٣٤ کەسی ژن بوون. ئەم ئاواییە لەباری پڕایی حەشیمەتەوە لەنێو ئاوایيە کرمانج نشینەکان، پلەی دووەمی دوای ئاوایی لەنبەر هەیە.

زمان و مەزهەب: قەومییەتی خەڵکی ناوچەی بلوکانلوو کورد زمانە و بە شێوەزاری کرمانجی قسە دەکەن بەڵام لە ئێستادا زمانی فارسی لەنێو خەڵکی ئەم ناوچەیە برەوی سەندووە، چونکە لەم سەڵانەی دواییدا خەڵکێکی زۆر بەرەو شارەکانی باکووری ئێران بۆ وێنە تالش (هەشتپەڕ) و ڕەشت کۆچیان کردووە و هەروەها لەبەر ئەوەی کەسانێکیش بە پیشەی دەستگێڕییەوە خەریکن و لانیکەم بۆ ماوەی ٣ تا ٤ مانگ

لە ساڵ لێرولەوێن، ئەمەش كاریگەریی زۆری لەسەر ڕووكردنە زمانی فارسی داناوە. لەبەر ئەوە ئەگەری ئەوە هەیە لە چەند ساڵی داهاتوودا زمانی كرمانجی بە تەواوی بەرەو لەنێوچوون بڕوا و لەبیربچێتەوە، ئەگەر بەم شێوەیە بچێتەپێش. هەڵبەت ئەمە سەبارەت بە ئاوایییەكانی بلوكانلوو، مستەفالوو، لەنبەر، كولستان، مورستان و ئەقبلاغ دەبینرێ. بەڵام لە ئاوایییەكانی تری وەك پیرانلوو، چەلەنبەر و ... بەهۆی ئەوەی كۆچی دانیشتوانەكە بەرەو ناوەندی شارستانی خەلخاڵ و ناوچە تورك زمانەكانە، لەنێو خەڵكی واندا كاریگەریی زمانی توركی زیاترە.

هەربۆیە نفووزی زمانی توركی لەو ناوچەیە بەڕادەیەكە كە تەنیا گەورەپیاوان و بەتەمەنانی ناوچەكە شارەزای زمانی كوردین و لەكاتی پێویست و لە هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی ناوچەكە بەكاری دێنن. تەواوی كرمانجەكانی خەلخاڵ بۆ وێنە ئاوایی بلوكانلوو، لەباری مەزهەبییەوە بەتەواوی سەر بە مەزهەبی شیعەن. (٤)

● سەرچاوەكان:

١ـ ویكیپیدیای فارسی

www.kurmanj.blogfa.com/category/68 -4 - 3-2

شەشەم

## کورد لە چەند ناوچەیەکی دیکەی ئێران

کوردەکانی سیستان و بەلووچستان

- چەند زانیارییە لەسەر پارێزگای سیستان و بەلووچستان
- شوێنی نیشتەجێبوونی کورد لە سیستان و بەلووچستان
- تایفە کوردەکانی بەلووچستان

**● چەند زانیارییەك لەسەر پارێزگای سیستان و بەلووچستان**

پارێزگای سیستان و بەلووچستان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران هەڵکەوتووە. ئەم پارێزگایە بە ڕووبەری نزیکەی ١٨٧,٥٠٢ کیلۆمیتری چوارگۆشە بەرباڵاوترین و پانترین پارێزگای ئێرانە و زیاتر لە ١١٪ی پانتایی وڵاتی لەخۆ گرتووە. ئەم پارێزگایە لە دوو ناوچە واتە سیستان و بلووچستان پێك هاتووە. سیستان شارستانی زابۆل و شارەکانی دەوروبەری و، بلووچستان شارەکانی دیکە لە زاهیدانەوە تا چابەهار لەخۆ دەگرێ. ئەم پارێزگایە ١١٠٠ کیلۆمیتر سنووری لەگەڵ وڵاتانی پاکستان و ئەفغانستان و ٣٠٠ کیلۆمیتر سنووری ئاوییی لەگەڵ دەریای عەممان هەیە، کەواتە لە باکوورەوە لەگەڵ خوراسانی باشوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ وڵاتانی پاکشتان و ئەفغانستان، لە

باشوورەوە لەگەڵ دەریای عەممان و لە ڕۆژئاواشەوە لەگەڵ پارێزگاکانی کرمان و هۆرمزگان هاوسنوورە.

لەباری دابەشکاریی نێوخۆییەوە بەپێی دوایین گۆڕانکارییەکان ئەم پارێزگایە لە ١٨ شارستان، ٣٦ شار و ٤٣ بەخش پێك هاتووە. شارستانی زاهیدان بە حەشیمەتی ٥٦٧ هەزار کەسەوە، گەورەترین و پڕحەشیمەترین شار و لە هەمان کاتدا ناوەندی پارێزگایە. شارستانەکانی تری پارێزگا بریتین لە: ئیرانشەهر، چابەهار، خاش، دلگان، زابۆل، زابۆلی، زاهیدان، زەهەك، سەراوان، سەرباز، سیب سوران، قەسرقەند، کەنارەك، هیرمەند، نیك شەهر، میرجاوە، نیمروز، هامون.

لەباری مێژووییەوە:

پێش ئیسلام/ نیشتمانی ئەفسانەیی سیستان و بەلووچستان لە دوو ناوچەی باکوور و باشوور پێك هاتووە. سیستانی ئەمڕۆیی کە بەشی باکووری پارێزگا لەخۆ دەگرێت، لە کتێبی ئاڤێستادا یازدەهەمین نیشتمانێکە کە ئاهورامەزدا خوڵقاندوویەتی. هەروەها شوێنی لەدایکبوونی ڕۆستەمی دەستان قارەمانی حەماسیی شانامەی فیردۆسییە. مێژوونووسان سیستان بۆ گرشاسب، یەکێك لە نەوەکانی کیومەرس دەگەڕێننەوە. ناوی سیستان لە ناوی قەومی ئاریایی «سکا» وەرگیراوە. «سکا»کان لە دەروبەری ساڵی ١٢٨ی پێش زایین، سیستانیان داگیر کرد و تێدای جێگیر بوون.

ناوەکەی دیکەی سیستان «نیمروز»ە. هەروەها بینای زۆربەی شارەکانی سیستان بۆ پاڵەوانییە ئەفسانەییەکانی ئێران وەك زاڵ، سام و ڕۆستەم دەگەڕێننەوە. سەردەمانێك سیستان سەر بە دەوڵەتی ساسانی لەقەڵەم دەدرا کە بەدەستی ئەردەشیری پاپەکان داگیر کرا و لە ساڵی ٢٣ی کۆچی مانگی، موسوڵمانە عەرەبەکان داگیریان کرد. یەکەمین فەرمانڕەوای ناسراوی ئێرانی لەم ناوچەیە دوای ئیسلام، یەعقوبی لەیسی سەففاری بوو. هەروەها یەعقوب دوای شکستی عەرەبەکان، زمانی فارسی وەك زمانی فەرمیی وڵات ڕاگەیاند. دوای سەفاریان، سامانییەکان، غەزنەوییەکان و

سەلجوقییەکانیش هەریەك بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایی ئەم وڵاتەیان کردووە.

ناوچەی بەلووچستانی ئەمڕۆیی کە ناوچەی باشووریی پارێزگاکەیە، لە کۆنترین بەڵگە مێژووییەکاندا بە ناوی «مکا» ناسراوە و لە نووسراوەکانی هێرۆدۆت، مێژوونووسی یۆنانیدا بە «گدروزیا» ناوی هاتووە. دوابەدوای ڕووخانی هەخامەنشییەکان لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنی، ئەو لە کاتی گەڕانەوەی لە هیندوستانەوە، بە «گدروزیا»دا گەڕاوەتەوە. دوای ساسانییەکان لەلایەن عەرەبە موسوڵمانەکان لە سەردەمی خەلیفەی دووەم، زۆربەی خەڵکی ئەم وڵاتە بوونە موسوڵمان.

دوای ئیسلام/لە سەردەمی ساسانییەکان بەدواوە ئەم ناوچەیە هەمیشە بەشێك لە خاکی ئێران بووە تا ئەوەیکە بە دەستێوەردانی بریتانیا لەسەدەی نۆزدەیەمی زایینی بە کردەوە بە دوو بەشی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات دابەش کرا. لەوکاتەڕا بەلووچستان وەك ئەیالەت و ویلایەتەکانی تری وڵات حکومەتی خانی هەبوو تا لە ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی دوای شکستی «دوست محەممەدخانی بارکزایی» دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیی لەو ناوچەیەدا جێگیر بوو. (١)

### ● شوێنی نیشتەجێبوونی کورد لە سیستان و بەلووچستان

کوردەکانی بەلووچستان لە «سنگان» سەر بە شارستانی خاش لە داوێنی باشووری تەفتان و بەخشی زابۆلی سەر بە شارستانی سەراوان و ژمارەیەکیشیان لە سیستان ژیان بەسەر دەبەن. (٢)

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە باس لە شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکانی لە سیستان و بەلووچستان دەکرێ:

«کوردەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی بەلووچستانی ئێران کە لەوانەیە پاشماوەی ئەو عەشیرانە بن کە لەگەڵ لوتفعەلی خان لە شەڕی زۆر دژواری ساڵی ١٧٩٤ی شاری

بەم بوون. هەتا دەیەی ١٨٨٠ ئەوان لە خاش حوکمڕان بوون. فەرماندەکەیان ناسراو بە سەردار سەرحەد بوو. ئەمڕۆ ئەوان بە شێوەیەکی هەراو بەربڵاون. هێندێکیان لە داوێنی باکووری کێوی تەفتان دەژین و بەشێك لە دەورویەری مەگەس (زابۆلی ئێستا) نیشتەجێن و هێندێکیشیان هەر لە سیستانن. ڕەزم ئارا دەڵێ: هەشت گوند لە ناوچەی بەم پۆشت (bampost) لە عەشیرەکانی زەند دەژین کە بە زمانی بەلووچی قسە دەکەن. ئەوانە ڕەنگە هەر ئەوکاتی وەك کوردانی خاش چووبنە بەلووچستان.[٣]

لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران لە ناوچەکانی سیستان وبەلووچستان چەند گرووپێك لە کوردەکان ژیان بەسەر دەبەن کە لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوویدا بۆ ئەم ناوچەیە گواستراونەوە. لەوانە براهۆییەکان، زیکەکان، شەهرەکییەکان و لە سەردەمی نزیکتریشدا کوردەکانی نیشتەجێی تەفتان لە شارستانی خاش و کوردەکانی نیشتەجێی بزمانن کە دیارە ئێستا زمان و جلوبەرگ و دابونەریتی کوردییان پێوە نەماوە. براهۆییەکان، زیکەکان، شەهرەکییەکان کە ژمارەیەکیان لە سەرتاسەری هێڵی سنووریی ئێران و ئەفغانستان لە سیستان و بەلووچستان و خوراسان (سرەخس، تایباد و ...) بڵاو بوونەتەوە... کوردەکانی نیشتەجێی تەفتان لە شارستانی خاش گرووپێك لە کۆچبەرانی ڕۆژئاوای ئێران و لە وەچەی ئۆتڵان برای حوسێنی کوردی شەبوستەری پاڵەوانی ناوداری ئێرانین.

چیرۆکی نیشتەجێبوونیان لە سەرحەدی بەلووچستان بەم شێوەیەیە: حوسێنی کورد کە لەدایکبووی شەبوستەر و فەرماندەی گشتیی سوپای نادرشای ئەفشار بوو، دوای داگیرکردنی هیندوستان و گەڕانەوە لەوێ هەست بە پەشیمانی دەکا لەو هەموو کوشتارەی کە کردبووی. بەپێچەوانەی حەزی نادر واز لە فەرماندەیی دێنێ و چیتر سەرکردایەتی لشکرەکەی ناکات. سەرەنجام نادر دوابڕوای دەکا و لەگەڵ براکەی (ئوتڵان) بۆ بەلووچستان و ناوچەی سەرحەد دووری دەخاتەوە. حوسێن دەمرێ و ئوتڵانی برای دەمێنێتەوە و وەچەکەشی هەر بە ناوی کورد دەمێنێتەوە و تێکەڵاویی

لەگەڵ بەلووچەکان درووست دەکەن تا ئەو جێگەیەی دوای چەندین وەچە زمانی زگماکیی کوردییان لەبیر دەچێتەوە و زمانێکی نوێ کە تایبەت بە کوردەکانی تەفتان و کوردییەکان و جەماڵزەهییەکانە، هەڵدەبژێرن و هەروەها جلوبەرگی کوردیش بە تەواوەتی لەناوچووە و لەبیر کراوە و جلوبەرگی بەلووچی و ژمارەیەکیش کولتوور و زمانی بەلووچی هەڵدەبژێرن.

لەو سەردارانەی کە لە ئوتڵان بەجێ ماون و لە وەچەی راستەوخۆی ئەو بوون، بەناوبانگترینیان میریەحیای کوردە کە شەجەرەنامەی وەچەکەی بەم شێوەیەیە:

سەردار میریەحیای کورد ـ سەردار عەبدولکەریم خانی کورد ـ سەردار بێهروزخانی کورد ـ سەردار حاجی ئەمیرخانی کورد ـ سەردار حاجی ئەڵڵاڕەسانی کورد ـ سەردار وەلی محەمەدی کورد (سەرداری ئێستا) (٤)

### *کوردەکانی نیشتەجێی ناوچەی بزمانِ سەر بە شارستانی ئێرانشەهر*

گرووپێك لە کوردەکان کە لە نەوەکانی میرئەفزەلی کوردن، لە ئێستادا لە ناوچەی بزمان سەر بە شارستانی ئێرانشەهر دەژین. ئەم کوردانە کە لەو ناوچەیە زیاتر بە میر ناسراون لە وەچەی دوو برا بە ناوەکانی میرجەلال خان و میر شابازخانن کە هەردووکیان کوڕی میر کەریمن. ( میرکەریم کوڕی میر ئەولیا کوڕی میرزاخان کوڕی میر غولام شا کوڕی میرئەفزەل کوڕی میرزاخان کوڕی میریەحیا) ئەم کوردانە دانیشتووی سەرحەدی «خاش»ن دوای ئەوەی باوباپیرانیان بەهۆی تێکهەڵچوون لەسەر دەسەڵاتداریی و کوژرانی یەکێکیان لەلایەن کوڕەمامەکەی دەچنە بزمان بۆ لای گەورەپیاوانی میری بزمان کە خزمایەتیان لەگەڵ هەبوون و لەوێ نیشتەجێ دەبن. میر جەلال بوو بە باوکی چوار کوڕ بە ناوەکانی: میربلووچ ( کە دایکی لە تایفەی یارمحەمەد زەهی دانیشتووی سەرحەدە)، ڕەشیدخان (دایکی لە تایفەی بامرییە)، عەوێزخان (لەگەڵ ڕەشیدخان دایکیان یەکە)، عەلیخان (دایکی لە گەورەکانی میر و

لە لقی سۆهرابزەهی نیشتەجێی بزمانن).

ژمارەیەك لەو کوردانە لە ناوچەی بزمان نازناوی «کورد، کۆرد، کوردنیا، کوردنەسەب، کوردزادە و کوردبزمان و هەروەها میرسەجادی، سەجادی، میرزادە، حوسێنی یان هەیە...(٥)

### تایفە کوردەکانی بەلوچستان

تایفەکانی سۆهراب زایی، مستەفا زایی، میرابلوچ زایی، شەکرم زایی، ئەڵڵارەسان زایی، جەمال زایی، کەمالخانی زایی، عەلەم خان زایی، دۆرزادە، غولام رەسان زایی، شەهدادزایی، سەیدخان زایی، عولەماخان زایی، میریەحیا زایی، مرادزایی، گوڵ مەحمود زایی، ناگزی زایی، شاهمراد زایی، گەنگدازایی، بولگاگ زایی، مەتیم زایی، عەجەب زایی، کەرەم زایی، ناروزایی.(٦)

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە باس لە تایفە کوردەکانی بەلووچستان کراوە:

سۆهراب زایی، میرابلوچ زایی، مستەفا زایی، گدازایی، شەکرم زایی، ئەڵڵارەسان زایی، جەمال زایی، کەمالخانی زایی، عەلەم خان زایی، دۆرزادە، غولام رەسان زایی، شەهدادزایی، سەیدخان زایی، سالارزایی، عەلیخان زایی، میر یەحیا زایی، مرادزایی، گوڵ مەحمود زایی، ناگزی زایی، شاهمراد زایی، گەنگدازایی، ڕوودباهی، شاهمراد زایی، گەنگدازایی، بولگاگ زایی، مەتیم زایی، عەجەب زایی، کەرەم زایی، ناروزایی.

حەشیمەتی ئەم تایفانە لە ساڵی ١٣١١ی هەتاوی ١٠٠ خێزان و لە ساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی (١٩٦٩ی زایینی) ٨,٠٠٠ کەس و لە ساڵی ١٣٦١ی هەتاوی (١٩٨٢ی زایینی) نزیکەی ٨٠٠ خێزان بووە. (٧)

بەهەرحاڵ، زانیاریی سەبارەت بە کوردەکانی سیستان و بەلووچستان زۆر کەمە

یان ئەوەکە ئەمن نەمتوانیوە زانیاریی زیاتر سەبارەت بەو کوردانە کۆ بکەمەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم باش بوو ئەو چەند دێڕە زانیارییە بخەمەڕوو بۆ ئەوەی ئەگەر کەمیش بێ یان هەڵە و پەڵەشی تێدابێ، کەسانی شارەزاتر و پشوودرێژتر ئاوڕیان لێ بدەنەوە و بەدواداچوونی زیاتریان بۆ بکەن.

## • سەرچاوەکان:


١. ویکیپیدیای فارسی

٢. میرنیا، سیدعلی، ایل ها و گایفەهای عشایری کرد ایران، چاپ اول، موسسە انتشاراتی و آموزشی نسل دانش، تهران، ل ١٣٢.

٣. سەید شوکری، سەید سمایل، عەشایری کورد، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٧٩، ساڵی حەوتەم، ١٣٨٦ی هەتاوی، ل ٢٦.

٤. blogfa.com.www.sarhad٢

٥. سەرچاوەی پێشوو.

٦. www.laeen.persianblog.ir/page/kormanj١

٧. میرنیا، سیدعلی، س.پ.



خوێنەرانــی خۆشەویســت، لــە خــوارەوە ئامــاژە بــە چەنــد تیــرە و تایفەیەکــی دیکــەی کــورد دەکەیــن کــە لــە هێندێــك لــە شــار و ناوچەکانــی ئێــران (دەرەوەی کوردســتانی ڕۆژهــەڵات) بــڵاو بوونەتــەوە کــە بەداخــەوە نەمتوانیــوە زانیارییەکــی ئەوتۆیــان لەســەر کــۆ بکەمــەوە و تەنیــا زۆر بــە کورتــی ئامــاژە بــە نــاوی ژمارەیەکیــان کــراوە. بێگومــان ناســاندن و توێژینــەوە لەســەر ئــەو کوردانــە و هەمــوو ئــەو کوردانــەی کــە ئەمــن نەمتوانیــوە ناویــان بێنــم یــان زانیارییــان لەســەر کــۆ بکەمــەوە، هەنگاوێکــی پیــرۆزە و هیــوادارم لــە داهاتــوودا کەســانی بەتوانــا و پشــوودرێژ بەدواداچوونیــان بــۆ بکــەن.

***پارێزگای تاران***

عەشــیرەی پازووکــی عەشــیرەی ســەرەکی کــوردی ئــەم پارێزگایەیــە. بــە بــڕوای ئاڵبێــرت هاوتــم شــنایدەر، وەختــی خــۆی عەشــیرەی پازووکــی عەشــیرەیەکی خــاوەن دەســەڵات بــوون کــە لــە دەوروبــەری ئــەرزەرۆم و لــە

ئاناتۆلیا دەژیان، بەڵام لە کۆتایی سەدەی شازدەهەمدا پەرش وبڵاو دەبن و دەستەیەکی کەم لەوان لە دەوروبەری وەرامین و خار (خوار) نیشتەجێ دەبن. لە ناوچەی تاراندا هێندێك عێل و تایفەی بچووکی تر دەژین وەك: هەداوەند، بوربور، ئوریاد، زەرگەر، کوردبچە، نانکولی و قەراچورلو. هەروەها لە ساوە کوردی کەلهوڕی دەژین.[1]

هەروەها بە فەرمانی شا عەبباسی گەورە، لە ساڵی ١٠١٠ی کۆچی مانگی، لە کوردە ڕاگوێزراوەکانی ئازەربایجان و مەهاباد بۆ دەشتی خوار و وەرامین. چل و پێنج هەزار بنەماڵە بۆ ناوچەی سنووریی ئاخال، ئەبیوەرد و دەرگەز ڕاگوێزران کە دواتر چوونە قوچان، شیروان، ئیسفرایین و .. لەو ناوچانە خەریکی ئاژەڵداریی و ژیانی خۆیان بوون. ژمارەیەك ئەو کوردانە لە کاتی کۆچ پێکرانیان بۆ خوراسان، لە دەوروبەری دەماوەند، خوار و وەرامین مانەوە کە بریتین لە:

١ـ تایفەی کوردبەچە، ١٥٠ بنەماڵە، لە ڕوودهەن، وەرامین.

٢ـ تایفەی جاوان یا جابان (لە عێلی شادلوو) لە جاوانی دەماوەند.

٣ـ تایفەی شادلوو، لە سرخەدە و سەربەندانی دەماوەند.

٤ـ تایفەکانی شادلوو، زەعفەرانلوو، لە دەوروبەرەکانی وەرامین و گەرمسار.

٥ـ تایفەی بوربور، لە قەندات و ئەقارین، وەرامین.

٦ـ تایفەی ئیزانلوو، لە خوار.

٧ـ تایفەی قراچورلوو، لە دەوروبەری خوار.

٨ـ تایفەی پازوکی لە وەرامین.[2]

### پارێزگای خوزستان

سێ دەستە لە زەنگەنە و دەستەیەك لە جەلالی لە جانەکی گەرمەسێر هەڵکەوتوو لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەهواز نیشتەجێن. ئەوانە بە فەرمانی نادرشا هێنراونەتە وێ. هەروەها عەشیرەیەك بە نێوی ئاڵبو کورد لە حەوت گوند لە دەم ڕووباری کاروون لە باشووری ئەهواز نیشتەجێنە. [٣]

### پارێزگای ئیسفەهان

بە بڕوای بابامەردووخی کوردستانی لەم پارێزگایە عەشیرەیەکی کورد بە نێوی بازینجان دەژین.[٤]

### کوردەکانی پارێزگای کرمان

تایفە کوردەکانی پارێزگای کرمان

تایفەکانی بامری لە کێوەکانی بارز، لەك لە پاریز، خواجوینی (خواجەوەند)، ئەفشاری قاسملوو (قاسم ئولادی).

شوێن پێی کوردەکانی کرمان هەتا کەهنووج و بەم ڕۆیشتووە. مەهنی یەکان لە سیرجان و ڕەفسەنجان لە داوێنی کێوەکامی بارز. [٥]

بە بڕوای پرسی سایکس هەتا ئەم دوایيانە تاقمێکی بچووك لە تایفەی کورد لە ناوچەی سارۆدۆ یان شاردۆیا دەژیان و هەروەها بنەماڵەیەکیش لە عەشیرەی ئەفشاری کرمان بە نێوی میرکورد هەبوون.[٦]

• سەرچاوەکان:

١. سەید شوکری، سەید سمایل، عەشایری کورد، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٧٩، ساڵی حەوتەم، ١٣٨٦ی هەتاوی، ل ٢٥.
٢. میرنیا، سیدعلی، ایلها و تایفەهای عشایری کرد ایران، موسسه انتشاراتی و أموزشی نسل دانش، تهران، ١٣٦٨. ل ٤٣ـ٤٥.
٣. سەید شوکری، سەید سمایل، س.پ.
٤. سەید شوکری، سەید سمایل، س.پ.
5. www.laeen.persianblog.ir/page/kormanj1
٦. سەید شوکری، سەید سمایل، س.پ. ل ٢٦.

بەشی دووەم ٢
کورتەکانی دەرەوەی کوردستان

## ٢. باسی دووەم
## کورد لە کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو و کوردستانی پشت قەفقاسدا

- **دەروازەیەکی مێژوویی**
  بەندی یەکەم: ڕەوشی کورد لە ئیمپراتۆریی ڕووسیادا
- **بەندی دووەم: ڕەوشی کورد لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوودا**
  کورتەباسێك سەبارەت بە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو و قەفقاس
  ١ـ یەکێتیی سۆڤیەت
  ٢ـ قەفقاس
  ڕەوشی کورد لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوودا
  ١ـ لە سەرەتای دروستبوونی یەکێتیی سۆڤیەت
  ٢ـ ڕەوشی کوردەکان لە سەردەمی ستالیندا (سەرکوت و ڕاگواستن)
  ٣ـ کوردەکانی سۆڤیێت و جەنگی نیشتمانیی مەزن (١٩٤١ ـ ١٩٤٥)
  ٤ـ ڕەوشی کوردەکان لە دوای مردنی ستالین
  ٥ـ ڕەوشی کوردەکان دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت
- **بەندی سێیەم: ڕەوشی کورد لە کۆمارەکان، دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت**

- **یەکەم: کوردەکانی ئازەربایجان**
  چەند زانیارییەك سەبارەت بە کۆماری ئازەربایجان
  سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کورد بۆ ئازەربایجان
  ژمارەی کوردەکانی ئازەربایجان

● **چوارەم: کوردەکانی تورکمانستان**



● **پێنجەم: کوردەکانی قرقیزستان**



● **شەشەم: کوردەکانی کازاخستان (قزاقستان)**

## • دەروازەیەکی مێژوویی

ئەگەرچی بەجیا باسی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی هەریەك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەکرێ و ئاوڕ لە سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ ئەو کۆمارانە و چەندین بابەتی گرنگی دیکەش دەدرێتەوە، بەڵام وەك سەرەتایەك بە کەڵك وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك، بە شێوەیەکی گشتی باسی سەردەم و هۆکاری نیشتەجێبوونی کورد لە ڕووسیا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەکەم.

«لە سەرەتای سەدەی ١٩، گورجستان، ڕۆژهەڵاتی ئەرمەنستان و باکووری ئازەربایجان لەلایەن رووسیاوە داگیر کران. هەموو ئەم سەرزەمینانە کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی ئێراندا بوون، ژمارەیەکی بەرچاو کوردیان تێدابوو. ئەمە یا ئەم کوردانە (جگە لە کوردەکانی ئازەربایجان) لە نەوەی کوردەکانی قەفقازیای سەدەکانی پێشووتر بوونە یان، بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە مێژووییە ئاڵۆزانە کە لە سەردەمی دەسەڵاتداریی شەدادییەکان (جگە لە دەسەڵاتداری خورین و میدیانەکان لە سەردەمانی پێشووتردا) رووی داوە، روون نییە. تەنها شتێك کە دەکرێت بە دڵنیاییەوە بگوترێت ئەوەیە کە دانیشتووانی ڕەسەنی کوردستان بە کۆمەڵێك هۆ (لە گوشاری ئابووری و کێشەی ناوخۆییەوە

بگرە هەتا تایبەتمەندییەکانی ژیانی نیمچە ڕەوەندنشینی) سنووری خۆیان بۆ سەرزەوییەکانی دراوسێ و لەوانە قەفقاز درێژ دەکرد.[١]

مینۆرسکی دەڵێ: «ئەو کوردانەی لە ڕووسیادا ئەژین مەسەلەیەکی تایبەتی لە سیاسەتی ناوخۆماندا پێك ئەهێنن، کوردەکان بۆ یەکەمجار لە خاکی ڕووسیادا، دوای مۆرکردنی پەیمانی گوڵستان لەگەڵ دەوڵەتی فارسیدا لە ساڵی ١٨١٣ دا سەریان هەڵدا. کاتێك کە ناوچەی ئەلیزابت پوڵمان خستە سەر خاکی خۆمان و دوای هێرشی تورکەکان لە ساڵی ١٨٢٨ دا کوردەکانی ئەریڤان لە وڵاتی فارسەوە هاتنەلای ئێمە و لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٨٧٨ و لە ئەنجامی کۆچ کردنیان لە ناوچەکانی قارس و ئەردەهانەوە، ژمارەی کوردەکانی ڕووسیا دوو ئەوەندە زۆرتر بوو...»[٢]

بەڵام وەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەدەن «هەر لە سەرەتای هاتنی لەشکری ڕووسی و شەڕی ١٨٠٤ ـ ١٨٠٥ ەوە کورد کەوتۆتە ناو سنووری یا ڕاستتر، ژێر دەستی ڕووسیاوە و دانوستاندن لەنێوانیاندا پەیدا بووە، نەك وەك مینۆرسکی دەڵێت: پەیدابوونی کورد لە ئیمپراتۆریتی ڕووسیادا دەگەڕێتەوە بۆ دوای مۆرکردنی پەیمانی گوڵستان لە ١٨١٢ لەگەڵ ئێراندا، کە ناوچەی ئێلیزابێت پول خرایەسەر ڕووسیا. دیارە مینۆرسکی ڕەچاوی ئەو کوردانەی نەکردووە، کە چەندان سەدە پێشتر لە گورجستان بوون. ڕەنگە ئەوەیان ڕاستتر بێت ئەگەر بوترێت لە دوای مۆرکردنی پەیمانی گوڵستان بەشێکی کوردستان کەوتۆتە ژێردەستی ڕووسیاوە».[٣]

کەواتە «ساڵی ١٨١٣ لە پاش پەیمانی گوڵستان لەنێوان ئێران و ڕووسیادا، هێندێك مەڵبەندی کوردستان کەوتنە بەر خاکی ڕووسیا. کوردەکان لە ویلایەتی ئەلیزابیت پول دەژیان و پاشان بەپێی پەیمانی ١٨٢٨ی تورکمانچای بەشێك لە کوردەکانی ویلایەتی ئیرەوان و لەدواییدا کوردەکانی قارس و

ئەردەهانیش کەوتنەبەر ڕووسیا.

لەپاش شۆڕشی ئۆکتۆبر، بەپێی پەیمانی نێوان ڕووسیای سۆڤیەتی و تورکیا لە ٢١ی مارس ١٩٢١، مەڵبەندی قارس و ئەردەهان درانەوە بە تورکیا و لە یەکێتی سۆڤیەتی زیاتر لە چەند هەزار کوردێك نەمانەوە کە زۆربەیان لە کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتی لە مەڵبەندی تالین و ئالاگوز دەژیان و ژمارەیان لە پاش شەڕی دووەمی جیهانی دەگەیشتە ٢٦،٠٠٠ کەس.[٤]

لە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی» لە نوسینی بەڕێز «د.مارف خەزنەدار»یش بەم شێوەیە باس لەم بابەتە دەکری: «لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم (١٨٠٤ - ١٨٠٥) لە پاش سەرکەوتنی تسیتسیانۆڤ لە جەنگی ڕووس لەگەڵ عەجەم و مۆرکردنی پەیمانی گوڵستان لە ساڵی ١٨١٣ ناوچەی ئەلیزابیت پۆل کەوتە ناو خاکی ڕووسەوە، بەمە بەشێك لە کورد بوو بە هاووڵاتی ڕووسیا و لە پاش هێرشی تورکمانەکان لە ساڵی ١٨٢٨ کوردی ناوچەی یەریڤانیش لە وڵاتی ئێرانەوە هاتنە ناو ڕووسیا، لە ساڵی ١٨٧٨ لە ناوچەکانی قارس و ئەردەهانیشەوە گەلێ لە خەڵکی کورد کۆچیان کردە خاکی ڕووسیا.

... لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧ەو چەسپاندنی دەسەڵاتی تازەی سۆڤیەت لە هەموو خاکی ڕووسیای قەیسەریی کۆن، بە تایبەتی لە ناوچەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست کوردی ڕووسیەی کۆن بە کۆمەڵ لە گەلێ جێی جیاواز دەبینران.[٥]

وەك لە زۆر جێگەدا ئاماژەی پێدراوە«... کوردە ئێزیدییەکانیش بەهۆی موسڵمان نەبوونیانەوە، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە زەخت و زۆرێکی زۆریان لێکراوە و خێرا بەرەو قەفقاس کۆچیان کردووە. بەتایبەت لە ساڵی ١٨٨٥دا ژمارەی ئەو هۆزە کوردانەی لەدەست عوسمانییەکان ڕایان دەکرد و بەرەو قەفقاس دەڕۆیشتن، زۆر زیادی کردووە. سەرەتاکانی سەدەی بیستەم،

ئیمپراتۆریی ڕووسیا لە قەفقاس ٦٥ هۆزی کوردی لەخۆ گرتبوو.

هەروەها لەنێوان ساڵانی ١٩١٤ ـ١٩١٨ لە تورکیا چەوساندنەوەی ئەرمەنییەکان دەستی پێکرد و ئەم زوڵم و زۆرە کوردە ئێزدییەکانیشی گرتەوە. لەو ساڵانەدا، ئەو کوردە ئێزدیانەی کە لە عەنتاب، قارس و وان ـەوە ڕایان کردبوو، لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیان لە قەفقاس یەکیان گرتەوە.[٦]

لە کتێبی «گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت» بە وردی باس لە دوو زەمینەی مێژوویی گەیشتنی کورد بە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی ڕووسیا دەکرێت:

«دوو زەمینەی مێژوویی و سەرەکی هەن تا رادەیەك هۆی پەرتەوازەبوونی کوردی سۆڤیەتمان بۆ ڕوون کاتەوە، لە نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەهەم بەدواوە هەندێك خێڵی کورد دەیانویست بەرەبەرە سنووری لەوەڕگا کۆنەکانی دەشتی ئیڤان (دەشتی ئەرمەنستان و دەشتی یەریڤان) فراوانتر بکەن و پاشان کەوتنە ناو ئازربایجان و لە باکۆ نزیك بوونەوە. بەبەر بڵاوبوونەوەیان گوندی کوردی لێرەولەوێ پەیدا بوو. دیاربوو کاربەدەستانی تزاری ڕووس ئەو نیشتەجێبوونەی کوردانیان پێخۆشبوو، چونکە دەیانزانی چ جۆرە جەنگاوەرێکن و دەیانویست لە کاتی پێویستدا دژ بە دوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی بەکاریان بێنن. پاشان بەهۆی جەنگەکانی (١٨٢٨ ـ ١٨٢٩، ١٨٥٣ ـ ١٨٥٦، ١٨٧٧ ـ١٨٧٨)ی نێوان ڕووس و تورك و هەروەها شۆڕشە کوردییەکەی سەدەی نۆزدەهەمی ئەو هەرێمەوە جێ بە کوردان لەق بوو. کورد بە لێشاو پەنایان بۆ ڕووسیای تزاری برد و لەوێ دامەزران. بەزۆری یەزیدییەکان (کە کوردی خاوەن کێشێکی زەردەشتی تایبەتن) لەبەر جەور و ستەمی کاربەدەستی عوسمانی و سەرکردە کلاسیك و ئایینییەکانی کورد هەڵدەهاتن.

هەروەها سەرەتای سەدەی بیستەمیش کۆچی کورد هەر هەبوو. سەرەتای جەنگی جیهانگیری یەك، ژمارەی کوردەکانی پارێزگاری یەریڤان گەیشتە

٤٠,١٥٩ کەس، ٣١,٥٪ لەوان نیشتەجێ و ٦٨,٥٪یشی گەڕۆك بوون.

ئایین دەستی باڵای لە دامەزرانی کوردی ئەم پارچە یان ئەویتردا هەیە. وەك یەزیدییەکان زۆر دەمێك بوو زەبر و ئەشکەنجەی موسڵمانانیان چەشتبوو، بەچاکیان زانی لە ئەرمینیا و گورجستانی کرستیان ئایندا نیشتەجێ بن، چونکە کەمتر گێرمەکێشی ئایینیان لەگەڵ دەکردن و کوردی موسوڵمانیش روویان کردە ئازربایجانی موسوڵمان و بەدەگمەن دەچوونە گوندەکانی ئەرمەنی ئازەری نشین.

تەنانەت لەژێر سێبەری سیستێمی سۆڤیەتیشدا رەوشی ئایینی جیاوازکاری کردۆتە سەر چۆنێتی و ڕادەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی کوردی موسوڵمان یان یەزیدی. ئەگەرچی ژمارەی یەزیدییەکان کەمتر بوو، بەڵام هەر ئەوان پتر پەیوەستی پێناسەی کوردی خۆیان بوون و لە پاراستنی تایبەتمەندییە نەتەوایەتییەکاندا زۆر گیر بوون تا ئەو ڕادەیەی کۆششی کۆمەڵە گورجی و ئەرمەنییەکان نەیتوانیوە بیانتوێنێتەوە. بەڵام بار لەلای کوردانی موسوڵمان کە زۆرتر دووچاری توانەوە بوون پێچەوانەی نواند و هەرچەندە بە ژمارە پتر بوون لە زەمینە و باری کولتووری سۆڤیەتدا ئەوان لە پلەی دووهەمدان.

ساڵی ١٩١٥ بەدواوە کۆچی کورد کەم بۆوە و بارودۆخی جەنگی جیهانی و ساماناکی ڕژێمەکەی تاشناکی ئەرمەنی کە تا ٢٠ی نۆڤەمبەری ١٩٢٠ دەسەڵاتی لەسەر یەریڤاندا گیربوو. هەروەها وەرچەرخانی باری جەنگەکانی ناوخۆ و پروپاگەندەی یاوەرانی سوڵتان و مستەفاییە «کەمالیست»ەکانی دەیانگوت گوایە، بەلشەفیك خو و ڕەوشت و ئایین بەخێزان ناهێڵن، و زۆر باری تر... کاری ئەوتۆی کرد هەندێك لەو کوردە کۆچکردووانە بگەڕێنەوە. ئەوەبوو ساڵی ١٩٢٢ لە خودی یەریڤاندا تەنها ٨٦٥٠ کورد مایەوە.[٧]

کەواتە دەتوانین بڵێین کورد لە چەندین قۆناغی جیاواز و بە چەندین

هۆکاری جۆراوجۆر لەنێو خاکی سۆڤیەت جێگیر بووە. بەشێکیان دانیشتووی سەرەکی ئەم خاکانە بوون کە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دوای ئەوەی قەفقاز لەلایەن ڕووسیاوە داگیر کرا، ئەوانیش بوونە هاوولاتی ڕووسیا. واتە پاش دوو پەیمانی گولستان و تورکمانچای و دوای ئەوەی کە چەند ناوچەیەك لە خاکی ئێران بەپێی ئەو پەیمانانە درانە ڕووسیا، کوردی ئەو ناوچانەش چوونە ژێر دەسەلاتی ڕووسیا. هەروەها بەشێکیشیان ئەو کوردانەن کە لە ترسی زوڵم و زۆری دەسەلاتدارانی عوسمانی ناوچەکانی خۆیانیان جێهێشتووە و ڕوویان لە شوێنەکانی ئێستایان کردووە.

لە دەیەی ١٩٨٠ی زایینی نیشانەکانی لێکهەڵوەشانی یەکێتیی سۆڤیەت دەرکەوتن و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٩١ی زایینی ئەم وڵاتە بە فەرمی لێك هەڵوەشا و بەسەر چەند وڵاتی تردا دابەش بوو. حەشیمەتی کوردەکانی سۆڤیەتیش بەسەر ئەم وڵاتانەدا دابەش بوون و لەنێو کۆمارە تازە دامەزراوەکاندا بڵاو بوونەوە. لە درێژەدا بە کورتی ئاوڕ لە ژیان و گوزەرانی کورد لە هێندێك لەم وڵاتانە دەدەینەوە.

بۆ ئەوەی خوێنەری خۆشەویست بتوانێ باشتر لە بابەتەکە تێبگات و کورد گوتەنی «هەودا و مەودای لێ تێکەڵ نەبێ» باس لە ژیان و گوزەرانی کوردەکان لە سێ قۆناغدا دەکەین: قۆناغی یەکەم باسی ڕەوشی کورد لە سەردەمی ئیمپراتۆریی ڕووسیا و پێش پێکهاتنی یەکێتیی سۆڤیەتە. قۆناغی دووەم باس لە ڕەوشی کورد لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوودا دەکات و لە کۆتاییشدا باس لە ژیان و گوزەرانی کورد لەدوای ڕووخانی سۆڤیەت و درووستبوونی وڵاتە تازە دامەزراوەکان دەکرێ.

## • بەندی یەکەم: کورد لە ئیمپراتۆریی ڕووسیا دا

دوای یەکخستنەوەی خاکی ڕووسیا و دەستبەسەرداگرتنی سیبریا و زۆر ناوچەی تر لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ڕزگاربوون لە مەترسی تەتەر، تەزارەکانی ڕووسیا کەوتنە سەر کەڵکەڵەی دەستبەسەرداگرتنی دەروازی ئاوە گەرمەکان، چونکە ئەو ئاوانەی سەرەوە لەبەر سەرماوسۆڵی زستان و سەهۆڵبەندان کاتێکی کەمی ساڵ سوودیان لێ وەردەگیرا... لە سەردەمی پیوتەری یەکەم (١٦٨٢ ـ ١٧٢٥)ی زایینیدا ئەم کەڵکەڵەیە زۆرتر بەرجەستە بوو. شایانی باسە کە پیوتەری مەزن پتر لە هەموو تەزارەکانی پێش و پاش خۆی ڕۆڵی لە یەکخستن و فراوانکردنی سنووری ئیمپراتۆرییەکەدا بینیوە و لە سەردەمی ئەویشدا بوو ڕووسیا لەبەردەم جیهانی دەرەوەدا کرایەوە و لە ١٧٢١ دا بوو بە ئیمپراتۆریی و خودی پیوتەریش بە یەکەم ئیمپراتۆری ڕووسیا.

پیوتەر دەیەویست بگاتە دەریای ڕەش و ناوچەی ئازۆف ئەم کارەش ئاسان نەبوو، چونکە ناوچەکە لەژێر دەستی ئیمپراتۆری عوسمانیدا بوو. تەنانەت لە دەوروبەری دەریای ـ ئازۆف ـ یشدا هێزێکی زۆری لە قەڵادا بوو... پیوتەری مەزن هەرچەندە چەند جارێك بەگژ لەشکری عوسمانیدا چوو و دوای چەند شەڕێك توانی ناوچەی ئازۆف بگرێتەوە. لە سەردەمی یەکاترینای دووەمدا ١٧٦٨ ـ ١٧٧٤ ڕووسەکان کەوتنە هەڕەشەکردن لە ڕۆخەکانی دەریای سپی ناوەڕاست. نەك هەر ئەمە بەڵکو ڕوسیا کەوتە هەڕەشەکردن و دەست خستنەناو کاروباری ناوخۆی خاکی عوسمانی.

... سەرەنجام تورکەکان ناچار بوون لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕوسیادا ڕێك بکەون. پەیمانی ـ کچلك قینارجا ـ مۆر بکەن. ئەو پەیمانە ڕێگەی بە ڕووسیا دا بێتە ڕۆخەکانی دەریای ڕەش و مافی ئەوەی پێدا کە لە ناو ئاوی ـ تورکی!ـ دا

هاتوچۆ بکات و بە سەربەستی لە تەنگەی بسفۆر و دەردەنیل بپەڕێتەوە.

... ڕووسیا لەسەر بەدیهێنانی مەبەستەکانی خۆی هەر بەردەوام بوو، بۆیە لە سالانی ١٧٨٢ ـ ١٧٩٢ی.ز دا شەڕ دەستی پێکردەوە و ڕوسیا جارێکی تر سەرکەوتنی بەدەست هێنا و کۆمەڵێك مەرجی تری بەسەر ئیمپراتۆری عوسمانیدا سەپاند و بە پێی پەیمانی (یاس) سنووری گەیاندە سەر ڕووباری (دنێستەر) و هەر لەو کاتەیشەوە بووە سنووری هەر دوو دەوڵەت. [٨]

لەلایەکی ترەوە «ئەگەر بۆ ڕۆژگاری کۆن بگەڕێینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ناوچانەی بە میدیا ناسراون. دوای لەناوچوونی ئیمپراتۆری مەزنی میدیا و گرتنی ناوچەکە لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە، کورد ناوبەناو فەرمانڕەوایی کردووە و بەپێی وتەی مامۆستا حوزنی موکریانیش بێت ئەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت ئازەربایجانی سەروو ـ سۆڤیێتی کۆن ـ و ئازەربایجانی خواروو ـ ئێران ـ بە ناوی فەرمانڕەوایەکی کوردەوە ناونراوە. فەرمانڕەواکە کە ناوی ئاترەپات بووە، خودی ئەسکەندەری مەکدۆنی دایناوە. داماو موکریانی دەڵێت واتە ئەو ناوچەیە کە لە فەرهەنگی ڕووسدا بە پشت قەفقاس ناسراوە، هەر لە دێرزەمانەوە کورد و باووباپیرانی، ئەرمەن و گورجی لێ ژیاوە. ئینجا لە ئەنجامی ـ فتوحات ـ ی ئیسلامی تورکی بۆ هاتووە و تا سەردەمێکیش کورد هەر فەرمانڕەوایی ناوچەیەکی فراوانی نیشتەجێگەی هۆزە تورکەکانی کردووە. هەربۆیە مامۆستا ئەمین زەکی بەگ لەباسی سەردەمی ئیسلامیدا دەڵێت: بەپێی ـ صبح الاعشی ـ باسی بیست و چوار ناوچەی کوردی کراوە کە یەکێکیان وڵاتی ـ بسقاد ـ ە، کە لانەی تیرەکانی فریادیە بووە، هەندێك ناوچەی وڵاتی ئۆزبێك ـ ئازەربایجان ـ و هی تریشیان بەدەستەوە بووە.

زۆری تریش لە مێژوونووسەکان باسی ئەوە دەکەن کە لە پێش هاتنی تورکرە گەزەکان بە ماوەیەکی زۆر کوردی تێدا ژیاوە. خاتوو ئاریستۆڤا سەبارەت

بە فەرمانڕەوایی کوردە شەدادییەکان دەڵێت: لە سەدەی پانزەدا ناوچەیەکی فراوان لە ئێلیزابێت پول ـ یا گیانجی (گەنجە/ئا) تا ئانی (تورکیای ئەمڕۆ) لەژێر فەرمانڕەوایی بنەماڵەی شەدادیدا بووە.»[٩]

لەلایەکی تریشەوە «سەلجوقییەکان کە زۆربەیان شوانکارە بوون و لە کۆتایی سەدەی دەیەمدا بوون بە موسڵمان، ئیسلامیان کردە بیانوو بۆ هاتن بەرەو ئێران و کوردستان و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست ... لەنێوان (١٠٤٢ ـ ١٠٥١) ی زایینیدا توانیان بەشێکی زۆری کوردستان داگیر بکەن و لە (١٠٨٣ ـ١٠٨٦) ی.ز.شدا دەوڵەتی دۆستەکی کوردیشیان لە کوردستانی ناوەڕاستدا ڕوخاند. دواییش پەرەیان بە داگیرکردن دا و زۆر ناوچەی تریان گرت و بە تایبەتیش دوای سەرکەوتنیان بەسەر بیزەنتە فەلەکاندا جێگەپێی خۆیان توندتر کرد و لە ڕۆژگاری سوڵتان عەلائەدین کەیقوبادی یەکەم (١٢١٩ ـ١٣٢٦) ی زایینیدا گەیشتنە ئەوپەڕی بەهێزی. بەڵام لەگەڵ ئەو بەهێزییەشدا چەند هەوڵیان دا نەیانتوانی بگەنە گورجستان و داگیری بکەن و هەندێك ناوچەیشیان لە ئەنجامی سەرکەوتنی دەوڵەتی ئەیوویی بەسەریاندا، لەدەست دا، هەرچەندە دوایی مەغۆلەکان بۆیان گرتنەوە.»[١٠]

خوێنەری خۆشەویست واز لەوە دێنین کە تورك و هاوڕەگەزەکانیان تەنانەت دوای دروستکردنی ئیمپراتۆریی عوسمانی بە چ شێوەیەك پەرە بە فراوانخوازیی خۆیان دەدەن و دواتر لەلایەن هۆزە تورکمانەکانەوە قەرەقۆینلو و ئاق قۆینلو لە ناوچەکانی ئازەربایجان و سیواس و ... دەست بە فەرمانڕەوایی دەکەن و تا ئەوکاتەش لە «دامێنی چیاکانی قەفقاز بەرەوخواروو بۆ سەر ڕووباری ئاراس و لەوێشەوە بە ناو مەڵبەندەکانی ماکۆ و خۆی بەرەوخوار تا سەر دەریاچەی ورمێ و بەرەو خوارتر شوێنی ژیانی هۆزە کوردییەکان بووە.» لێرە بەدواوەیە کە سەفەوییەکان لەسەر

دەستی شائیسماعیلی سەفەوی لە ساڵی ١٥٠٢ی زایینیدا بە یارمەتی قزڵباشەکان دێنە سەر شانۆی ناوچەکە و دەوڵەتی سەفەوی دروست دەکەن و بیر لە فراوانکردنی سنوورەکانی دەکاتەوە و تەنانەت بەنیازە تەنگ بە ئیمپراتۆریی عوسمانیش هەڵچنێ.

« سوڵتان موورادی عوسمانی ماوەیەك خۆی لەبەردەم شا ئیسماعیلی سەفەویدا بۆ نەگیرا و تەنانەت یارمەتی پاشاکانی میسر و شامیش دادیان نەدا. بەڵام لەدوایيدا هێزەکانی خۆی کۆ کردەوە و ئەوە بوو لە ٢٣ی تەمووزی ١٥١٤ی زایینی شەڕی شومی چاڵدیران لەنێوانیاندا ڕوویدا و عوسمانییەکان سەرکەوتن.

زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان یەکەم دابەشکردنی کوردستان بۆ ئەو ڕۆژگارە و ئاکامی ئەم شەڕە دەگێڕنەوە. هەرچەندە وا دەردەکەوێت کە بە کردەوە درەنگتر بوویێت، ئەویش دروست لە ١٧ی ئایاری ١٦٣٩ی زایینیدا کە لە دوای چەند شەڕ و بەیەکدادان و ناوچە داگیرکردن، پەیمانی (زەهاو) لە نێوان سوڵتان موورادی چوارەم و شاعەباسی سەفەوی مۆر کرا. بەپێی ئەم پەیمانە سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت لە کوردستاندا دەستنیشان کرا و زۆربەی ناوچەکانی کوردستان کەوتە ژێردەستی ئیمپراتۆریی عوسمانییەوە و دەسەڵاتی ئێران تەنیا بەسەر ناوچەکانی پشت زاگرۆسدا مایەوە. هەرچەندە زۆریش گوێیان بەم پەیمانە نەدا و بەردەوام پێشێلیان دەکرد، بەڵام تا دوو سەدەیەك هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهات و پارسەنگی هێزیان تێك نەچوو.»[11]

لە ساڵی ١٧٢٢ی زایینیدا، لەکاتێکدا هۆزە ئەفغانییەکان بە شێوەیەکی کاتی دەستیان بەسەر ئێراندا گرت و سەفەوییەکانیان لە تەختی دەسەڵات لابرد، عوسمانییەکان دەترسان کە ڕووسیاش سوود لە نەمانی ئیمپراتۆری

سەفەوی وەربگرێت و ناوچەکانی سەرووی ئێران بگرێت کە دەمێك بوو مرخی لێ خۆشکردبوو. هەربۆیە عوسمانییەکان دەستوبردیان کرد و چوونە ناو گورجستانەوە و دواییش لە ساڵی ١٧٣٤ دا لەگەڵ ڕووسیادا لەسەر بەشکردنی سەرووی ئێران ڕێك کەوتن. بەڵام زۆری نەبرد نادرشا ـ کە بە «نادرقلی»ش ناسرابوو ـ کە لە هێزە ئەفشارییە تورکمانییەکان بوو، لە ساڵی ١٧٢٥ دا لە نزیك ڕووباری (مێهماندۆست) ئەفغانییەکانی شکاند و دواییش نەهاوەند، لە ساڵی ١٧٣٠یشدا هەمەدان، ئەردەڵان، کرماشان و ناوچەکانی سەرووی ئێران و ئەوەریری گرت. کاتێك خۆیشی بەو هێزییەوە بینی، پەیمانی نێوان سەفەوی و عوسمانی لەژێر پێی نا. نادرشا لە ١٧٣٤ی. زیشدا هێرشی بۆ سەر ناوچەی قەفقاز برد و تبلیسی گرت...

... ئیمپراتۆریی ڕووسیاش هەر لە سەرەتای هێرشەکانیدا زۆر بایەخی بە سنوورەکانی خوارووی ڕۆژئاوا و دەریای ڕەش داوە، بۆیە لەپێشدا هێرشی کردۆتە سەر ئەو جێگایانە و مەرجی خۆی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاندووە. ئینجا ڕووی کردۆتە ناوچەی قەفقاز و سنووری ئێران و ڕۆژهەڵاتی عوسمانی. دوای شەڕوشۆڕێکی زۆر لە (١٨٠٤ ـ ١٨٠٥)ی.ز دا لەشکرێکی گەورەی ڕووسی بە سەرۆکایەتی جەنەڕاڵ تسیتسیاتۆڤ توانی گورجستان بگرێت.»[١٢]

هەروەك باس کرا لەشکری ڕووس گورجستانی گرت و دوای ئەوەش بیریان لە ڕاکێشانی کوردەکان بۆ لای خۆیان کردەوە و سەرەنجام «ڕووسەکان توانیان بە هەر شێوەیەك بێت بەشێك لە کوردەکانی قەفقاز ڕابکێشن بەتایبەتی دوای گرتنی قەرەباغ لە شەڕی ١٨٠٤ ـ ١٨٠٥ دا. هەرچەندە هەندێکیشیان دواتر لە شەڕەکانی ١٨٢٦ ـ ١٨٢٨ دژی ڕووسیا جەنگیون.

وەك دەردەکەوێت هەر لە سەرەتای هاتنی لەشکری ڕووسی و شەڕی

١٨٠٤ ـ ١٨٠٥ەوە کـورد کەوتۆتـە نـاو سـنووری، یـا ڕاسـتتر، ژێـر دەسـتی ڕووسـیاوە و دانوسـتاندن لـە نێوانیانـدا پەیـدا بـووە، نـەك وەکـو مینۆرسـکی دەڵێـت: پەیدابوونـی کـورد لـە ئیمپراتۆریـی ڕووسـیادا دەگەڕێتـەوە بـۆ دوای مۆرکردنـی پەیمانـی گوڵسـتان ـ ١٨١٢ لەگـەڵ ئێرانـدا، کـە ناوچـەی ئێلیزابێـت پـول خرایـە سـەر ڕووسـیا. دیـارە مینۆرسـکی ڕەچاوی ئـەو کوردانـەی نەکـردوە کـە چەنـدان سـەدە پێشـتر لـە گورجسـتان بـوون. ڕەنگـە ئەوەیـان ڕاسـتتر بێـت، ئەگـەر بوترێـت لـە دوای مۆرکردنـی پەیمانـی گوڵسـتان بەشـێکی کوردسـتان کەوتۆتـە ژێردەسـتی ڕووسـیاوە.

کاتێکیـش ڕووسـیا ناوچـەی یەریڤانـی گـرت، کوردەکانـی ئەوێـش خرانـە سـەر ئیمپراتۆریـی ڕووسـیا و بەمـە ژمـارەی کـورد زۆرتـر بـووە. کـوردی ناوچـەی تـری دراوسـێش دەیانویسـت بدەنـە پـاڵ ڕووسـیا...

... دواییـش کـە لـە سـاڵی ١٨٢٩ دا ڕێکەوتنـی (ئەدریانـە پـۆل) مـۆر کـرا، ناوچـەی بایەزیدیـش چـووە ژێـر دەسـەڵاتی ڕووسـیا. ئیـتر لـەم کاتـەوە کاربەدەسـتانی لەشـکری ئیمپراتـۆری ڕوسـی کەوتنـە بایەخـدان بـە لایەنـی جەنگیـی کـورد، بـۆ یەکەمجاریـش هـەر لـە هەمـان سـاڵدا لـە شـەڕی دژی ئیمپراتـۆری عوسـمانیدا تیپێکـی سـەربازیی چوارسـەد سـوارەی کوردییـان دروسـتکرد و دواتریـش لـە شـەڕی کرێـم ـ قـرم ـ دا لـە سـاڵی ١٨٥٣ ـ ١٨٥٨ دا دوو تیپـی کـوردی دیکەیـان دروسـتکرد. مینۆرسـکی دەڵێـت: لـە سـاڵی ١٨٧٧ ـ ١٨٧٨ یشـدا تیپێکـی هەزار و سێسـەد کەسـی میلیشـیای کوردی دروسـت کـراوە، زۆر کوردیـش پلـەی سـەربازیی بـەرز تـا دەگاتـە جەنەراڵیـان، هەبـووە...»[١٣]

ئـەوەی بـاس کـرا، بـە کورتـی ئاوڕدانەوەیەکـی خێـرا بـوو لـە ڕەوشـی کـورد لـە سـەردەمی ئیمپراتۆریـی ڕووسـیا و پێـش پێکهاتنـی یەکێتیـی سـۆڤیەت .

## • بەندی دووەم: ڕەوشی کورد لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا

پێش ئەوەی باسی ڕەوش و گوزەرانی کورد لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و کۆمارەکانی پشت قەفقاس بکەین، پێویستە بە کورتی چەند زانیارییەك سەبارەت بە یەکێتی سۆڤیەت و قەفقاس بخەینەڕوو.

### *کورتەباسێك سەبارەت بە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو و قەفقاس*

* ١- یەکێتیی سۆڤیەت

یەکێتیی سۆڤیەت وڵاتێك بوو لە ڕووسیا و چەندین کۆماری یەکگرتوو پێك هاتبوو کە لە سەردەمی دامەزرانی لە ١٩٢٢ تا سەردەمی هەڵوەشانی لە ١٩٩١ بەشێکی گەورە لە ڕۆژهەڵاتی ئورووپا و باکووری ئاسیای لەخۆ دەگرت و بە بەرباڵاوترین و پانترین وڵاتی جیهان ئەژمار دەکرا.

لە ئووتی ١٩١٤ ڕووسیا چووە ناو شەڕی یەکەمی جیهانی. سەرەتا تەنیا بەڵشەڤیکەکان و شۆڕشگێڕە سۆسیالیستەکان دژی شەڕ بوون، بەڵام تێکشکانەکانی ڕووسیا پشتیوانانی دەسەڵاتداریتیی سزاری گەیاندە لانیکەمی خۆی. لە ساڵی ١٩١٧ دوای دوو ڕاپەڕینی فێوریە و ئۆکتۆبەر لە ڕووسیا، حیزبی بەڵشەڤیك بە ڕێبەرایەتیی ولادیمێر ئیلیچ ئۆلیانۆف ناسراو بە لێنین دەسەڵاتی لەم وڵاتەدا بەدەستەوە گرت. ڕووسیای بەڵشەویکی ڕووبەڕووی هێرشی لایەنگرانی ڕێژیمی پێشوو و هێزە دەرەکییەکان بە تایبەت بریتانیا بۆوە. ئەو سەردەمە بە قۆناغی شەڕی نێوخۆیی ڕووسیا بەناوبانگە و تێیدا سوپای نوێی سۆڤیەت لەژێر ناوی سوپای سوور کە بە هەوڵی لێئۆن ترۆتسکی و لەژێر سەرکردایەتی ئەودا پێك هاتبوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی سوپای بەرەی سپی ببێتەوە کە لە ئەفسەران و ژێنەراڵەکانی سەردەمی سزار پێك هاتبوو. لە ١٩٢٢ و

دوای سەرکوتی دژبەران و نەیاران حیزبی بەلشەڤیك کە نێوی خۆی بۆ حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت گۆڕیبوو، دامەزرانی ولاتی «یەکێتی سۆڤیەتی سۆسیالیستی» ڕاگەیاند. ئەم ولاتە لە یەکێتی ڕووسیا و ناوچەکانی سەر بە ڕووسیای سزاری (قەیسەری) پێك هاتبوو.

لە ماوەی شەڕی نێوخۆیی و دوای ئەوە حیزبی کۆمۆنیست کە تەنیا حیزبی ڕێگەپێدراو لە سۆڤیەت بوو، سیاسەتێکی ئابووریی سەختگیرانەی پەیڕەو دەکرد کە بە کۆمۆنیزمی جەنگی بەناوبانگە. بە کۆتایی هاتنی شەڕی نێوخۆیی و جێگیربووی دەسەلاتداریتیی حیزب بەسەر تەواوی ولاتدا، سیاسەتێکی ئابووری نوێ بە ناوی بەرنامەی نوێی ئابووری گرایەبەر. ناکۆکیی نێوان ڕێبەرانی سۆڤیەت لەسەر شێوازی بەرەوپێشبردنی سیاسەتە ئابوورییەکان پەرەی سەند. لە ساڵی ١٩٢٤ و دوای مردنی لێنین کێشمەکێش لەسەر جێنشینیی ناوبراو زیاتر تەشەنەی ستاند و سەرەنجام ژۆزف ستالین توانی دژبەرانی خۆی بە تایبەت ترۆتسکی سەرکوت بکات و جێگەی لێنین بگرێتەوە. ئەو لە چەند قۆناغدا دەستی بە وەلانان و پاکتاوکردنی دژبەرانی خۆی لەنێو حیزبدا کرد. لە بواری ئابووریشدا بە دروستکردنی کۆلخۆزەکان (کێڵگەی هەرەوەزی) سیمای وەرزێریی ڕووسیای گۆڕی و سیاسەتی بەپیشەسازی کردنی سۆڤیەتی گرتەبەر و لە سەردەمی ئەودا سۆڤیەت بوو بە زلهێزێکی پیشەسازیی گەورە.

لە ساڵی ١٩٣٩ لە بەرەبەری دەسپێکردنی شەڕی دووهەمی جیهانی، یەکێتی سۆڤیەتی پەیمانی دەسدرێژی نەکردنی لەگەڵ ئەڵمانیای نازی گرێدا، بەڵام لە ١٩٤١ بە هێرشی بەربلاوی ئەڵمانیا، سۆڤیەتیش چووەناو شەڕەکەوە. لەم شەڕەدا کە بە شێوەی فەرمی بە جەنگی نیشتمانیی مەزن ناسراوە، دەوڵەت و حیزب و خەڵکی یەکێتیی سۆڤیەت بە خۆڕاگری لە بەرامبەر سوپای ئەڵمانیا و قوربانیدانی زۆر توانییان ڕێڕەوی شەڕەکە بگۆڕن و بە تایبەت دوای نەبەردی

ستالینگراد هێزەکانی سۆڤیەت چوونەناو حاڵەتی هێرش کردنەوە. تێکشکانی ئەڵمانیا لە ١٩٤٥ کە بەشی زۆری قورسایی شەڕەکە لەسەر شانی سۆڤیەت بوو، ئەم وڵاتەی کردە یەکێك لە زلهێزەکانی جیهان.

دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی و دەسپێکردنی قۆناغی شەڕی سارد، کێشمەکێش و ڕوویەڕووبوونەوەی دوو زلهێز واتە یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەریکا سیاسەتی تەواوی جیهانی بۆ ماوەی چوار دەیە خستە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. کە بە ڕوویەڕووبوونەوەی نێوان سۆسیالیزم و سەرمایەداریش ناسراوە. سۆڤیەت لە ١٩٤٩ توانی ببێتە خاوەن توانای ناوکی و کۆتایی بە پاوانخوازیی ئەمریکا لەم بوارەدا بێنێ.

لە ساڵی ١٩٥٣ دوای مەرگی ستالین، جێگرەوەکانی بە شێوەی ڕێبەریی دەستەجەمعی کاریان دەکرد. بەڵام لە کۆتاییدا نیکیتا خرۆشچۆف توانی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت. لە ساڵی ١٩٥٦ خرۆشچۆف لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت کوشتارەکانی ستالینی دایەبەر ڕەخنە و هەوڵی ناشیرینکردنی سیمای ناوبراوی دا. لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خرۆشچۆف زۆر لە توندوتیژییەکانی سەردەمی ستالین وەلانران. زۆر لە زیندانیانی سیاسی و عەقیدەتی ئازاد کران و داوای گەڕاندنەوەی حەیا و حورمەت بۆ زۆر لەو کەسانە کرا کە لە سەردەمی ستالیندا بە تاوانی سیخوڕی و دژایەتیکردن ئیعدام کرابوون. هەروەها لەم سەردەمەدا یاسای بازرگانیی ئازاد تا ڕادەیەك قبووڵ کرا کە ئاسەواری قەرەبوونەکراوی خستە سەر جەستەی سیستەمی سۆسیالیستی کە پشتیوانی ئابووری ڕێنوێنیکراو بوو و دواتر زنجیرە ڕووداو و پێشهاتگەلێکی بەدوای خۆیدا هێنا هەتا گەیشتە لێکهەڵوەشانی سۆڤیەت.

لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٦٠ ڕێبەرانی حیزب، نیکیتا خرۆشچۆفیان بە پیلانی لئۆنید برژنێڤ ناچار بە دەست لەکار کێشانەوە کرد و دوای ماوەیەك لە

ڕێبەرایەتیی دەستەجەمعی، برژنێف دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. لە سەردەمی ئەودا چاکسازیی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە لە سەردەمی خرۆشچۆف دەستی پێکردبوو، بەرەو کزبوون ڕۆیشت و باڵادەستیی حیزب و دەوڵەت بەسەر تەواوی بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بەهێز بوو. لە سەردەمی برژنێف گەندەڵیی زۆر کرا بە شێوەیەك کە زاوا و کوڕەکانیشی دەستیان لەوەدا هەبوو. بە هاتنەسەرکاری یوری ئاندرۆپۆف کە وەك جێگری برژنێف یارمەتیی دەدا، دۆسیەی گەندەڵییەکانی خستەگەڕ بۆ ئەوەی بەشێوەی زانستی تاوتوێی ڕەوشی گەندەڵییەکان بکا و پێشی بەم کارە بگرێ. بەڵام برژنیف پێشی ئەم کارەی گرت و لە سەردەمی ئاندرۆپۆف و چێرنینکۆدا کارێکی ئەوتۆ ئەنجام نەدرا و لە سەردەمی میخائیل گۆرباچۆف لە سۆڤیەتدا دەست بە چاکسازیی بنەڕەتی کرا.

سەرەنجام لە دەیەی ١٩٨٠ی زایینی نیشانەکانی لێکهەڵوەشانی یەکێتیی سۆڤیەت دەرکەوتن و سەرەنجام لەساڵی ١٩٩١ی زایینی ئەم وڵاتە بە فەرمی لێك هەڵوەشا و بەسەر چەند وڵاتی تردا دابەش بوو. وڵاتانی پێکهێنەری سۆڤیەتی پێشوو بە پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان، لە کۆمەڵگەی وڵاتانی هاوبەرژەوەند دا بوونە ئەندام. (١٤)

**● ٢ـ قەفقاس (قفقاز)**

قەفقاس ناوچەیەکە لەنێوان دەریای خەزەر و دەریای ڕەشدا و بۆ دوو بەشی قەفقاسی باشووری (ئەودیوی قەفقاس) و قەفقاسی باکووری (باکووری قەفقاس) دابەش دەبێ. قەفقاسی باشوور یان ئەودیوی قەفقاس کۆمارەکانی ئازەربایجان، ئەرمەنستان، گورجستان (جۆرجیا) و چەند بەشێکی بچووك لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران و باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لەخۆ دەگرێ.

قەفقاسی باکووری ئێستا بەشێك لە ڕووسیایە و کۆمارە خۆبەڕێوەبەرەکانی

چیچان، داغستان، ئینگوشتیا، کاراچای ـ چەرکەسیا، کاباردینۆ ـ بالکاریا، هەرێمی کراسنۆدار، ئادیغیە، ئوستیای باکوور، ئالانیا و وڵاتی ئیستاورۆپۆل لەخۆ دەگرێ.

بەشە سەرەکییەکانی قەفقاسی باشوور (ئەودیوی ئەفقاز) و داغستان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی قەفقازی باکوور هەتا سەردەمی قاجارەکان بەشێك لە خاکی ئێران بوو. بەڵام لە سەردەمی فەتحعەلیشای قاجار لە ماوەی شەڕەکانی ئێران و ڕووسیا، لە ئێران جیا بۆوە و درا بە ڕووسیا.

دوای هەڵوەشانی سۆڤیەت، سێ وڵاتی ئازەربایجان، ئەرمەنستان و گورجستان بەسەر باشووری قەفقازدا حکومەت دەکەن و کۆماری خۆبەڕێوەبەری داغستانیش بەشێك لە ڕووسیایە.

لە قەفقازدا گەلێك گرووپی ئیتنیکی نیشتەجێن: ئازەری، گورجی، ئەرمەنی، ڕووسی، کورد، تالێش، ئابخاز، لەزگی، چەرکەس، مەغوول، ئوستی، تورك، یونانی، تات، تاتار، ئاوار، چیچانی، ئینگوش و ...

گرووپە ئیتنیکییەکانی نیشتەجێی قەفقاس سەر بە سێ گرووپی سەرەکی قەفقازی، هیندوئوروپایی و تورك نەژادن:

قەفقازی: گورجی، ئابخاز، لەزگی، چەرکەس، ئاوار، چیچانی، ئینگوش، قاباردی، تاباساری، لەك، ئودی، ساخوری، ئاغول، روتول، دارکی.

هیندوئوروپایی: ئەمەنی، ڕووسی، کورد، تالێشن ئوستی، یۆنانی، تات

خەڵکی تورك: قوموق، نوغای، بالکار، قەرەچای، ئازەربایجانییەکان.

قەفقاز لەباری نەژادی و زمانیی یەکێك لە فرەچەشنترین ناوچەکانی جیهانە. زمانە قەفقازییەکان بە دوو گرووپ لە زمانەکان دەگوترێن کە لە ناوچەی قەفقازی نێوان دەریای ڕەش و دەریای خەزەردا لەڕێگەیانەوە پەیوەندی دادەمەزرێ. نزیکەی ۳۰ بۆ ٤٠ زمان لەم ناوچە جوگرافییەدا هەیە کە ئەم

فرەزمانییـە لـە ناوچەیەکـی ئـاوا بچووکـدا شـتێکی سەرنجڕاکێشـە.

شارەکانی قەفقاز: هێندێك لە شارەکانی قەفقاز بریتین لە:

کۆماری ئازەربایجان: باکۆ، گەنجە، لەنکەران، شماخی، شەکی، نەخجەوان.

ئەرمەنستان: ئیرەوان (یەریڤان)، ئاچمیادزین، گیومری، وانادزوری.

گورجستان: تفلیس (تبلیس)، باتومی، سوخومی، تسخینوالی، پوتی.

ڕووسیا: مەخاچ قەلعە، دەربەند، گروزنی، ئیستاورۆپۆل.

تورکیا: قارس، ئەردەهان، ڕیزە، ئارتوین.[١٥]

**ڕەوشی کورد لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا**

کاتێـك بـاس لـە ڕەوش و گوزەرانی کورد لەنێـو کۆمارەکانی یەکێتی سـۆڤیەتی پێشـوو دەکەیـن، وەك پۆلێنبەندییەکـی سـەرەتایی دەبـێ لـە پێنـج قۆناغـدا ئـاوڕ لە ژیـان و گوزەرانیـان بدرێتەوە. واتە لە سـەرەتای دروسـتبوونی یەکێتی سـۆڤیەت، لە سـەردەمی سـتالین، لە سـەردەمی جەنگی نیشـتمانی مەزن ١٩٤١ ـ ١٩٤٥، لە دوای مردنـی سـتالین و لـەدوای هەڵوەشـانەوەی سـۆڤیەت. لـە خـوارەوە بە کورتی باسـی ڕەوشـی کورد لـەم پێنج قۆناغـە دەکرێ:

***١ ـ لە سەرەتای دروستبوونی یەکێتی سۆڤیەت***

بـە شـێوەیەکی گشـتی دەتوانیـن بڵێیـن « کوردەکانـی یەکێتـی سـۆڤێت لـە ناوچـە کشـتوکاڵییەکانی ئەرمینیـا و ئازەربایجـان و جۆرجیـا و ژمارەیەکـی تـر لـە کۆمارەکانـی یەکێتـی سـۆڤێت نیشـتەجێ ببـوون.

کوردەکانـی ڕووسـیا بەتایبەتیـش ئەوانـەی ئەودیـوی قەوقـاز بـە شـێوەیەکی گشـتی پشـتگیریان دەکـرد لـە دەسـەڵاتی سـۆڤێتی و بەشداریشـیان کـرد لـە دامەزراندنیـدا. بـەڵام بارودۆخیـان لە سـاڵانی دوای شـۆڕش لەوپـەڕی نەهامەتی و

ناڕەحەتیدا بوو. ئەمەش بەهۆی ئەو وێرانکاری و قاتوقڕی و برسێتیەی ڕوویدا لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ و هاتنەناوەوەی بەریتانیا بۆ باکۆ هەروەها هێرش و پەلامارەکەی هێزەکانی تورکیا بۆ سەر ئەرمینیا و ئازەربایجان لە ساڵی ١٩١٨. لەم بارودۆخەشدا حکومەتی ئازەربایجان لە ساڵی ١٩٢١ چەند ڕێوشوێنێکی گرتەبەر بە مەبەستی پێشکەشکردنی کۆمەکیە پێویستییەکان بۆ دانیشتوانی برسی، لەگەڵ ئەمانەشدا بارودۆخی ئابووریی کوردەکان لە ساڵی ١٩٢٢ ـ ١٩٢٥ بەسەختی و دژواری مایەوە. بە جۆرێك زیاتر لە ٥٠٪ی دانیشتووانی وڵات لەباری برسێتیدا بوون و هەزاران ئەو خەڵکەی کە ماڵ وحاڵیان لەدەستدا بوو بە پێپەتی و برسێتی لە ئەشکەوتەکاندا دەژیان و «کیرۆسین»یان پێنەبوو بۆیە ئاگریان بە دار و توێکڵەدار دەکردەوە. (کیرۆسین: شلەمەنیەکە ئامادەی سوتاندن و کڵپەسەندنی زۆرە. فەرهەنگی دەریا)

لەم بارودۆخەشدا حکومەتی ئازەربایجان بڕیاری دا بە دامەزراندنی قەزای کوردستان لە ناوچەکانی (کالبجار، لاچین، کوباتلین، زانگلیان) چونکە کوردەکان بە شێوەیەکی چڕ لەم ناوچانە نیشتەجێ بوون. پاشان ئەم قەزایە گۆڕا بوو بە هەرێمی نەتەوەیی کوردستان و خاوەن ئۆتۆنۆمی کە ناوەندەکەشی شاری لاچین بوو.

لە ساڵی ١٩٢٥ لیژنەیەکی تایبەت پێکهات بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی قەزای کوردستان. ئەو ڕێگاچارانەی کە ئەم لیژنەیە پێشنیاری کرد و جێبەجێ کرا، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە گەشەکردنی ئابووری و ڕۆشنبیری قەزاکە. هەروەها دەست کرا بە دەرکردنی ڕۆژنامەی (کوردستانی سۆڤێتی)، لەگەڵ کردنەوەی پەیمانگەیەکی پەروەردەیی هونەری لە شاری «شوش» و پەخشی کەناڵێکی ڕادیۆ بە زمانی کوردی و خوێندنی منداڵان بە زمانی دایك و چەندین کتێبی قوتابخانە وئەدەبی و سیاسی چاپ کرا. هەموو دامودەزگا کارگێڕییەکان

لـە قەزاکـە دەسـتبەکار بـوو و ...»[١٦]

بەڵـێ! «دوای شـەڕی یەکەمی جیهانـی، کـوردی ئـەو ناوچانـە و بـە تایبەتـی ئەوانـەی لـە ئەرمەنستان دەژیـان، توانیویانـە پێشـکەوتن و بەرهەمـی دەوڵەمەندی کولتـووری بخولقێنن. ئەوەش دوای شۆڕشـی ئۆکتۆبر، کاتێك سیاسـەتێکی نوێی یارمەتیدانـی گـەلان بەڕێـوە چـوو. لینیـن پشـتیوانی لـە ماف یەکسـانی گـەلان کرد و دژی چەوسـاندنەوەی کەمایەتییـە نەتەوەییەکانـی نیشـتەجێی یەکێتـی سـۆڤیەت بـوو. قانـوون و یاسـاکانیش لەبواری ئـەو بۆچوونـەدا بەڕێـوە دەچوون.

لـەو وڵاتـەدا یـازدە کۆمـار دامـەزران کـە ژمارەیـەك کۆمـاری خودموختـار و هێندێکیـش ناوچەی خـاوەن مافـی دیاریکـراوی ئۆتۆنۆمی بـوون. نیزیکەی ١٠٠ نەتـەوە، کۆمەڵـەی نیشـتمانی و کەمایەتـی بـە شـێوەی دێموکـرات سـازمان دران و لەنـاو ئەوانەشـدا کوردیـش هەلەکەیـان قۆسـتەوە و دەسـتیان بـە دامەزراندنـی قوتابخانـەی کـوردی، چـاپ و بڵاوکردنـەوەی ڕۆژنامـە و دامەزراندنـی ئێزگـەی ڕادیۆیـی کـرد. ئـەو سـەردەمە گەلێـك توێژینـەوەی زانسـتی لەبابەت زمـان، مێژوو و ئەدەبیاتـی کـوردی ئەنجامـدران و فـرە کتێبیـش چـاپ کران. حکوومەت پشـتی ئـەو تێکۆشـینانەی دەگـرت و یارمەتـی منداڵانی فەقیری کـوردی دەدا کە پـەروەردە بـن و تواناییەکانیـان نیشـان بـدەن...»[١٧]

### ٢ـ ڕەوشی کوردەکان لە سەردەمی ستالیندا (سەرکوت و ڕاگواستن)

وەك لـە سـەرچاوە جۆراوجۆرەکانـدا بـاس کـراوە لە سـەردەمی سـتالیندا ڕەوش و گوزەرانـی کـوردەکان بـەرەو خراپـی ڕۆیشـت. «مەخابـن ئـەو هەلومەرجـە دێموکراتیـە لەبـارەی کـە خێـرا دوای شۆڕشـی ئۆکتۆبـر دامەزرابوو، پـاش ماوەیەك بـە تـەواوی تێکچـوو... لـە سـەردەمی سـتالین، شـەپۆلی تیـرۆر تـەواوی وڵاتـی داگرتـەوە. چەوسـانەوەی بەدیـاری هێنـا و وڵاتی بـەرەو جێگۆڕکێـی بەکۆمەڵ برد.

ئـەو ئاکارانـە بەپێچەوانـە و دژی بیروبۆچوونـی سۆسیالیسـتی بـوون و بـە واتایـەك کـردەوەکان گەلێـك جیاوازیـان لەگەڵ نـاوەرۆك و بابەتی ناو کتێبەکان هەبـوو. [١٨]

دیارە هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێکراوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کوردەکان لە هەموو کۆمارەکاندا وەکیەك نەبووە. بەڵام لە درێژەدا هەموو کوردەکانی ئەو کۆمارانە تووشی چەوسانەوە بوون. بۆ نموونە کوردەکان لە ئەرمەنستان بەئازادی تێکۆشانی خۆیان پەرە پێدەدا و لەنێوان کوردەکان و ئەرمەنەکاندا لێك تێگەیشتنی زۆر هەبوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٣٨ ڕۆژنامەی کوردی (ڕێیا تازە)ش ڕاگیرا لە ئەرمینیا لەگەڵ داخستنی پەیمانگای هونەری کورد و. دەستکرا بە ڕاگواستنی زۆرەملێی کورد بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و زۆر لە ڕۆشنبیرە کوردەکانیش تووشی چەوسانەوە و دوورخستنەوە بوونەوە.

هـەروەك بـاس کراوە«لـە سـاڵی ١٩٣٠ هەرێمی کوردسـتانی خـاوەن ئۆتۆنۆمیان لەنـاو بـرد و لـە سـیيەکاندا وازیان هێنا لە دەربڕینی وشـەی «کورد» و بە شـێوەیەکی فەرمی دەسـتکرا بە کەمکردنـەوەی ژمارەی دانیشـتووانی کورد...

ڕاگواسـتنی کـوردەکان لەودیـوی قەوقـازەوە بـۆ ناوچەکانـی تـری یەکێتـی سـۆڤیەت ڕۆڵـی هەبـوو کـە بـەزۆر تواندنەوەیـان. لـە سـاڵی ١٩٣٧ دەسـتکرا بـە ڕاگواسـتنی بەشـێك لـە کوردەکانـی ئەودیـوی قەوقـاز (وەك ڕەگەزێکـی نەخـوازراو) بـۆ کۆمارەکانی ئاسـیای ناوەڕاسـت و کازاخسـتان و هەروەها لە سـاڵی ١٩٤٤ کـورد و تـورك و هەمەشـیيەکان لـە خاکـی جۆرجیـا دەرکـران بـەرەو هەمـان ئـەو کۆمارانـە... کـوردە ڕاگواسـتراوەکان لەژێـر چاوەدێرییەکـی تایبەتیـدا بـوون، مافـی سـەردان و دەرچوونیـان نەبـوو لە بازنـەی ئـەو ناوچانەی کە تیایدا نیشـتەجێ ببـوون، هەروەهـا بێبەش کرابـوون لە مافـە دەسـتوورییەکانیان. تەنانـەت زۆرێکیان ناچـار دەبـوون دەسـتبەرداری ڕەگـەزی نەتەوەیی خۆیان بین و بچنە سـەر ڕەگەزی ئـازەری یـا کازاخـی یاخـود هـەر ڕەگەزێکـی تـری گەلانـی ناوچەکـە، ئەمـەش بۆ

خۆ دوورخستنەوە لە چەوساندنەوە یاخود بۆ ئەوەی مافی چوونە دەرەوەیان هەبێت بۆ خوێندن.

...لەڕاستیدا ئەو شەپۆلە تیرۆر و چەوساندنەوەی سالانی سییەکان کە لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە لەدژی کورد کرا، بوو بە بەربەست لەبەردەم پێشکەوتنی نەتەوایەتی کورد. هەر لەو سەردەمەدا هەموو ناوەندە کەلتووری و ڕۆشنبیریە نەتەوەییەکانی کورد لە ئازەربایجان داخران. تەنانەت ناوی کورد وەك ڕەگەز و نەتەوەیەکیش نەدەبرا. پێش ساڵی ١٩٣٨ خوێندن لە ئەرمینیا بە زمانی کوردی بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٣٨ ڕۆژنامەی کوردی (ڕێیا تازە)ش ڕاگیرا لە ئەرمینیا لەگەڵ داخستنی پەیمانگای هونەری کورد و دەستکرا بە ڕاگواستنی زۆرەملێی کورد بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و ناوچەی «الطای»، ژمارەیەکیش لە ڕۆشنبیرانی کورد ڕوویەڕووی چەوساندنەوە بوونەوە وەك (عەرەب شامیلۆف، حاجی جندی، جددۆ گنجۆ، ئەحمەد میرزا و ...)[١٩]

### ٣ـ کوردەکانی سۆڤێت و جەنگی نیشتمانیی مەزن (١٩٤١ ـ ١٩٤٥)

لەگەڵ ئەوەی کوردەکانی سۆڤیەت تووشی ئازار و ئەزیەتێکی زۆر و تەنانەت ڕاگواستن و دوورخرانەوەش بوون و لەژێر دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت بەتایبەت لەسەردەمی ستالیندا ژیانێکی تاڵیان تێپەڕ کرد، بەڵام ئامادە بوون بەرگریی لێ بکەن و تەنانەت لەپێناویدا گیانیش لەدەست بدەن.

«خۆڵمۆگۆرەڤ (دکتۆرای لە زانستە مێژووییەکاندا هەیە) دەڵێت: کوردەکان هەروەکو چۆن باوباپیرانیان قارەمانانە جەنگاون و شەڕیان دژی ڕۆم، عەرەب و تورك کردووە، هەروا لە جەنگی دژ بە ئەڵمانیا قارەمانانە دەجەنگین. هەر بۆ نموونە لە ڕۆژەکانی سەرەتای ئەو شەڕە زۆر سەختەی دەوروبەری (سمۆلێنسك)دا، مەمیدۆڤ و شاعیری بەناوبانگی کورد مورادۆڤ کەخەڵکی

ناوچەی ئەشقئابادی تورکمانیا بوون، لەناو هاوسەنگەرەکانیاندا بە قارەمانێتی ناویان دەرکردبوو.

سیامەندۆڤ لە دەورویەری (تولا) لە تشرینی یەکەمی ١٩٤١ دا زۆر قارەمانانە دەجەنگی. لەناو بەرگریکەرانی لینینگرادیشدا ئەفسەرە کوردەکانی وەکو نادرۆڤ، جەفارۆڤ، چەتۆییێف و چەندان سەربازی خەڵکی گوندی مینکێندی ناوچەی لاچین لە ئازەربایجان هەبوون...

خۆڵمۆگۆرەڤ لەسەر باسەکەی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: کوردەکان تەنیا لە ناوچەی قەفقازدا نەدەجەنگین، بەڵکو لەویەری باکووری سۆڤیێت، لە دەریای سەهۆڵبەندی ئارکتیك و لە دەریای ڕەش و سپی و هەموو بەرەکانی جەنگدا بوون. جگە لەوەی لەناو پارتیزانەکانی بێلۆروسیا و ئۆکراینا و تەنانەت ناوچەی پاریسیش دەجەنگین. لە ناوچەی پاریسی پایتەختی فەڕەنسادا دەستەیەکی پارتیزانی بە ڕابەری مامۆشیان هەبوو، کە کورد بوو.

کوردەکان لە ڕزگارکردنی چیکۆسلۆڤاکیا، پۆلۆنیا و هەنگاریادا بەشداریان کردووە و هەندێکشیان تا ناو ئەڵمانیای نازی چوون. لەناو خاکی هەنگاریادا فەرماندەی دەستەی تۆپ، کە ناوی یارماتۆڤ بوو، کوردی ئەرمینیا بوو کە ناوی بەوە دەرکردبوو ڕاستەوڕاست بە یەك نیشانە چل سەرباز و ئەفسەری ئەڵمانی کوشتبوو.

کەپیتان فەرجێڤ دەستە تۆپهاوێژەکەی تا بەرلین گەیاندبوو تا لە نزیك دیواری ـ ڕایخ ـ دا بریندار بوو. سەرهەنگ سیابەندۆڤ بەرزترین خەڵاتی وەرگرت و بوو بە یەکێك لەوانەی نازناوی قارەمانی یەکێتی سۆڤیێتیان وەرگرت.

هەروەها کورد لە دوای شەڕ لەگەڵ ئەڵمانیاش، لە ئەیلولی ١٩٤٥ دا لە بەرەی جەنگ دژی ژاپۆندا بەشداریی کردووە کە ناودارترینیان مایۆر ئاجۆییێف بوو.

بێگومان لە ساڵانی جەنگی ئەڵمانیا و سۆڤیێتدا هەزاران و بگرە سەدان

هـەزار سـۆڤێتی لـە هەمـوو جـۆرە نەتـەوەکان هەبـوون کـە چ بـە خواسـتی خۆیـان و بـە بـڕواوە، یـا خـود بـەزۆر لـە کاتـی دیلێتیـدا چوونـە پـاڵ ئەڵمانـەکان و چەندان لەشـکریان دژی سـۆڤێت دروسـتکرد و شانبەشـانی نازییـەکان دەجەنـگان. بەناوبانگترینیـان سـوپای جەنـەراڵ ڤلاسـۆڤ بوو. هەروەهـا لە ڕۆژئـاوای ئۆکراینیا و لـە ناوچـەی بەڵتیك چەندان دەسـتەی ناسیۆنالیسـتی هەبوو، کە هـاوکاری توندیان لەگـەڵ ئەڵمانەکانـدا دەکـرد.

لەنـاو نەتەوەکانـی قەفقازیشـدا هەبـوو کـە هـاوکاری لەگـەڵ ئەڵمانەکانـدا دەکرد. بەتایبەتیش کاتیـك ئەسـتیا، چیچێنیـا، ئینگوشـێتی و چەنـدان شـوێنی تـری قەفقازیـان داگیـر کـرد. بەڵام تا ئێسـتا هیچ بەڵگەیەك لەسـەر ئەوە بەدەسـتەوە نیـە کـە بیسـەلمێنێت تەنیـا کوردێك چیـە ناپاکـی کردبێـت و لەتـەك ئەڵمانیەکاندا جەنگـی بێـت، بۆیـە وا جوانیـش پاداشـتی کوردیـان دایـەوە و لـە دوای جەنـگ سـتالین لـە تۆڵـەی تاوانی خەڵکانی سـەر بە نەتـەوەی تر، جارێکی دی کوردیشـی ڕاگواسـت. [٢٠]

### ٤ ـ ڕەوشی کوردەکان لە دوای مردنی ستالین

دوای مردنـی سـتالین، لە پرۆسـەیەکی تێپەڕاندنی پاشـماوەکانی چەوسـاندنەوە و ئاسـتەنگ و بەربەسـتەکانی بـەردەم ژیانـی کەلتـووری و ڕۆشـنبیری کـورد و بوژاندنـەوەی ژیانـی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی دانیشـتوانی کـورد لـە ناوەڕاسـتی پەنجـاکان، هەروەهـا هەمـوو ئـەو بەربەسـتانە هەڵگیـران کـە ڕێگـر بوون لەبـەردەم هاتوچـۆی کـوردەکان لـە کازاخسـتانەوە بـۆ ئاسـیای ناوەڕاسـت کـە لـە سـەردەمی سـتالیندا تووشـی چەوسـاندنەوە و مەینەتـی بـوون.

لـە سـاڵی ١٩٥٤ ڕادیـۆی یەریڤـان دەسـتی کـردەوە بـە پەخشـی بەرنامەکانـی بە زمانـی کـوردی و ڕۆژنامـەی (ڕێیا تازە) دەسـتیکرد بە دەرچوون لە مانگی شـوباتی

ساڵی ١٩٥٥. هەروەها زۆرێك لە ڕۆژنامەکان لەسەر ڕووپەڕەکانیان شوێنیان تایبەت کردبوو بۆ کەلتوور و ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردەکان. هەروەها بەشی کوردی دامەزرا لە پەیمانگای هونەری ئەرمەنی، کە ئەرکی پێگەیاندنی کادیر بوو بۆ خوێندنی زمانی کوردی و ئەدەبی کوردی لە قوتابخانەکانی گوند و لادێ کوردەکان. هەروەها لقی ئەدیبەکانی کورد کە سەر بە یەکێتی ئەرمەن بوون هەستان بە تاوتوێکردنی چۆنیەتی گەشەپێدانی بابەت و پرسی ئەدەبی کوردی سۆڤێتی. لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان لێکۆڵینەوە لە بابەتی مێژووی کورد و ڕۆشنبیری و کەلتووریان لە یەکێتی سوڤێت بە شێوەیەکی بەرچاو بوژایەوە. هەروەها بە پێشنیار و دەستپێشخەری ڕۆژهەڵاتناس و زانای ناودار (یوسف ئابگاروفتیش ئۆربیلی) نوسینگەی (کوردۆلۆجیا) لە پەیمانگای (ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤێتی ـ لینینگراد) لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا کرایەوە.

لە ساڵی ١٩٥٥ کۆمەڵەیەك دامەزرا لە بەشی ڕۆژهەڵاتناسی لە ئەکادیمیای زانستەکانی ئەرمەنی، پاشان لە ساڵی ١٩٧١ ئەم بەشە گۆڕا بوو بە پەیمانگا و ئینجا بوو بە لقی کوردۆلۆجیا. هەروەها بەشێکی هاوشێوەش دروست بوو لە پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤێتی لە مۆسکۆ. کە ئەمانە کاری گەورە و زۆریان ئەنجام دا بە تایبەتیش لە بابەتەکانی مێژووی کورددا. هەروەها بابەتی کوردۆلۆجیا شوێن و پێگەی خۆی هەبوو لە پرۆژەکانی پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسیەکانی ئەکادیمی لە جۆرجیا و ئازەربایجان...

لە شەستەکان و حەفتاکاندا لەدوای ئەرمینیا، جۆرجیا بوو بە ناوەندێکی گرنگی گەشەکردنی کەلتووری کورد لە یەکێتی سۆڤیەت... هەروەها تێبینی زۆربوونی خەڵکی ڕۆشنبیر دەکرا لە ئەندازیا و پزیشك و مامۆستا. خانەی چاپ و بڵاوکراوەکان کاری ئەدەبی کوردی زۆریان کرد. هەرەها چەندین لێکۆڵینەوە ئەنجامدرا لە پرس و بابەتەکانی کەلتوور و مێژووی کورد. لەگەڵ هەڵبژاردنی

نوێنەرانـی دانیشـتوانی کـورد لە ئەنجومەنە باڵاکانی سـۆڤێتی لە ئەرمینیـا و جۆرجیا.

ئـەو کۆنگـرە گشـتییەی کـە تایبەت بـوو بە مێژووی کـورد لە یەکێتی سـۆڤێت و بارودۆخـی ئێسـتایان ڕووداوێکـی گرنـگ بوو لە ژیانـی کوردەکانی سـۆڤێتدا. ئەم کۆنگرەیـەش لـە سـاڵی ١٩٩٠ بەسـترا بە ئـاگاداری و سەرپەرشـتی دەسـەڵاتدارانی ناوەنـد، بـەڵام هەنگاوێکـی درەنـگ وەخـت بـوو لـە چارەسـەرکردنی کێشـەکانی کـورد لـەڕووی مافەکانـی نەتەوەیـی لـە یەکێتی سـۆڤێت.

لەگەڵ ئەو ڕێوشـوێنە نایاسـاییانەی کە دەسـەڵاتدارانی حکومەت گرتیانەبەر لە بەرامبـەر بەشـێك لـە کەمینەکانـی کـورد (ڕاگواسـتن و کـردەوە زۆرەملێیەکانی تر) بـەڵام کـوردەکان لـە یەکێتـی سـۆڤیەت خاوەنـی مافەکانـی هاوولاتیبوونـی خۆیان بـوون لـە وڵاتێکـی زلهێـزدا. بوونـی پانایەکـی فراوانـی فرەنەتـەوەی و کەلتـووری و نەبوونـی ڕەگەزپەرسـتی ئـەو دەرفەتـەی بـۆ چیـن و توێـژە ڕۆشـنبیرەکەی کـورد ڕەخسـاند کـە پـەرە بـدەن بە کەلتـوور و ڕۆشـنبیری کـورد. هەروەها ئـەو کوردانەی کـە لـە کۆمارەکانـی یەکێتـی سـۆڤیەتی جـاران دەژیـان، لـە ناوەنـدەوە «مۆسـکۆ» وەکـوو نیمچـە گرەنتییەکیـان هەبوو کـە پارێزگاری دەکـرد لە بارودۆخـی مافەکانی نەتەوەییـان... [٢١]

### ٥ ـ ڕەوشی کوردەکان لە دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت

بـۆ بـاس لەسـەر ئـەم بابەتـە پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بکـەم کە ڕەوشـی کـوردەکان لـەدوای هەڵوەشـانەوەی سـۆڤیەت، لـە هـەر کام لـە وڵاتانـی دوای ڕووخانـی سـۆڤیەت جیاوازییـان هەیـە. بۆیـە لـە بەشـی تایبـەت بـە کوردەکانـی هەریـەك لەو وڵاتانـەدا، بەجیـا باسـی ڕەوش و گوزەرانیـان کـراوە.

## • سەرچاوەکانی بەندی یەکەم و دووەم:

١. ڕەحمانی، وریا. کوردستان و کورد لە ڕوانگەی نەخشەوانیەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٥٩ ـ ٦٠.

٢. مینۆرسکی، کورد، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: حەمەسەعید حەمەکەریم، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٣. ل١٧٣.

٣. عەلی، ئارام، پەیوەندی نێوان کورد و روسیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی لیرە، سلێمانی، ١٩٩٩. ل٤٤.

٤. قاسملوو، عبدالرحمن، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦. ل ٩٧.

٥. خەزنەدار، د.مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، بەرگی یەکەم ل ٤٤ـ٤٥..

٦. کەریم، ڕەمەزان، واقیعی کورد لە ئەرمەنستان، وەرگیراو لە: /pukmedia.com KS_Direje.aspx?Jimare=17873، ڕێکەوتی 27/8/2013)

٧. کۆمەڵێك نووسەر، گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت، کۆمەڵێك نووسەر، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە: م. گۆمەیی، سوێد، ٢٠٠٢،ل ٣٦٠ ـ ٣٦١.

٨. عەلی، ئارام، س.پ. ل ٢٧ ـ ٢٩.

٩. عەلی، ئارام، س.پ. ل ٣١ ـ ٣٢.

١٠. عەلی، ئارام، س.پ.٣٣.
١١. عەلی، ئارام، س.پ.٣٦ـ٣٨.
١٢. عەلی، ئارام، س.پ.ل ٤٠ـ٤٢.
١٣. عەلی، ئارام، س.پ.ل ٤٤ـ٤٥.
١٤. (ویکیپیدیای فارسی)
١٥. س.پ
١٦. لازاریف، م.س، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٠١ـ٤٠٢.
١٧. بورکای، کەمال، کورد و کوردستان، وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە: عەلی فەتحی، چاپی یەکە، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٦٠.
١٨. بورکای، کەمال، س.پ. ل ٢٦٠.
١٩. لازاریف، م.س، س.پ. ل ٤٠٢ـ٤٠٧.
٢٠. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٥٨ ـ ١٦٠.
٢١. عەلی، ئارام، س.پ. ٤٠٨ـ٤١٠.

### • بەندی سێیەم:
## کورد لە کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو و کوردستانی پشت قەفقاسدا

یەکێتـی سـۆڤیەتی پێشـوو کـە نزیکـەی ٢٪ی حەشـیمەتی کوردەکانی لەخۆ دەگـرت، ئـەو حەشـیمەتە ئێسـتا لـە چوارچێـوەی چەندیـن کۆماری سـەربەخۆی جیـاوازدا ژیـان بەسـەر دەبـەن و، بەشـێکی گرنگی دیاسـپۆرای کـورد پێکدەهێنن. ئەمڕۆکـەی دیاسـپۆرای کـورد کـە بـە نـاوی «کوردەکانـی سـۆڤیەتی پێشـوو» دەناسرێـن، ١ لەسـەر ٦ی ئـەو گوندانـە پێکدەهێنـن کـە ژمارەیـان دەگاتـە زیاتـر لە هـەزار گونـد، هەروەهـا لـە شـار و شـارۆچکەکاندا بـڵاو بوونەتـەوە.[1]

هـەروەك پێشـتر ئامـاژەی پێکـرا، لـە دەیـەی ١٩٨٠ی زایینـی نیشـانەکانی لێکهەڵوەشـانی یەکێتیـی سـۆڤیەت دەرکەوتـن و سـەرەنجام لـە سـاڵی ١٩٩١ی زایینـی ئـەم وڵاتـە بـە فەرمی لێك هەڵوەشـا و بەسـەر چەنـد وڵاتی دیکـەدا دابەش بـوو. حەشـیمەتی کوردەکانـی سـۆڤیەتیش بەسـەر ئـەم وڵاتانـەدا دابـەش بـوون و لەنێـو کۆمـارە تـازە دامەزراوەکانـدا بـڵاو بوونـەوە. لـە درێـژەدا بـە کورتـی ئـاوڕ لـە ژیـان و گوزەرانـی کـورد لـە هێندێـك لـەم وڵاتانـە دەدەینـەوە.

## • یەکەم: کوردەکانی ئازەربایجان

- چەند زانیارییەك سەبارەت بە کۆماری ئازەربایجان
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کورد بۆ ئازەربایجان
- ژمارەی کوردەکانی ئازەربایجان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ئازەربایجان
- ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی ئازەربایجان
- سەرچاوەکان

### • چەند زانیارییەك سەبارەت بە کۆماری ئازەربایجان

کۆماری ئازەربایجان گەورەترین وڵاتی قەفقازە کە لە باشوورەوە لەگەڵ ئێران، لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ ئەرمەنستان و تورکیا، لە باکووری ڕۆژئاواوە لەگەڵ گورجستان و لە باکوورەوە لەگەڵ ڕووسیا هاوسنوور و دراوسێیە. هەروەها ئەم وڵاتە خاوەن سنووری ئاویی لەگەڵ وڵاتانی تورکمانستان و کازاخستان لە لێوارەکانی دەریای خەزەرە.

کۆماری دیموکراتیکی ئازەربایجان کە لە ساڵی ١٩١٨ دامەزرا، لە ١٩٢٠دا خرایە سەر ڕووسیا و لە ساڵی ١٩٩١ دا سەربەخۆیی خۆی بەدەست هێنایەوە. ماوەیەك دواتر، لە سەردەمی شەڕی قەرەباغی کوێستانیدا، ئەرمەنستانی دراوسێی، قەرەباغی کوێستانی (ناگۆرنوقەرەباغ) و ناوچەکانی دەوروبەری و ناوچەکانی کرکی، یوخاری ئیسکیپارا، برخودارلی و سوفولوی داگیر کرد. کۆماری قەرەباغی کوێستانی کە لە قەرەباغ هەڵکەوتووە و ئێستاش هەر هەیە، هیچ وڵاتێك بە فەرمیی نەناسیوە ئەگەرچی بە شێوەی دوفاکتۆر لەدوای شەڕەوە وڵاتێکی سەربەخۆ بووە.

کۆماری خودموختاری نەخجەوان کە لە خاکی کۆماری ئازەربایجان جیا بۆتەوە و پارێزگای خودموختاری قەرەباغی کوێستانیی(ناگۆرنوقەرەباغ)یش یەکە فیدراڵەکانی کۆماری ئازەربایجانن. ناوچەی قەرەباغ و حەوت بەخشی دەوروبەری هەڵکەوتوو لە باشووری ڕۆژئاوای کۆماری ئازەربایجان لە ماوەی شەڕی قەرەباغدا لەلایەن هێزەکانی ئەرمەنستانەوە داگیر کران.

ئەم وڵاتە کە تا ساڵی ١٩١٨ی زایینی هەرگیز ئازەربایجانی پێنەوتراوە، سەردەمێك ناوە کۆنەکەی «ئەڵبانیا» بوو. لە نووسراوەکانی مێژوونووسانی کۆن بۆ وێنە پلیبیوس و ئیسترابۆنیش بە ناوی «ئەڵبانیا» ناوی هاتووە. بە بۆچوونی ژمارەیەك لە توێژەران، ئەڵبانیا لەسەرچاوە پارتی زمانەکان بە شێوەی «ئەردان»هاتووە. لە سەرچاوەکانی سەردەمی ئیسلامیدا ئەم ناوەی بە ئەران و ئەلران نووسراوە. ئەم ناوە بەئەگەری زۆر پێوەندیی بە ناوی پارتیی «ئەدان»ەوە هەبێ. هەندێکجاریش بە دوو ناوی ئەران و شەروان باسی کراوە. دوای لشکرکێشییەکانی تەیموور و داستانی تورکمەنەکانی ئاق قوینلو و قەرەقوینلو بەرەبەرە ناوی ئەران لە کتێبەکان لابرا.

پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران و ڕووس و دوای ئەوەی ئەم نیشتمانە خرایەسەر خاکی ڕووسیا، لە ساڵی ١٩١١ی زایینی حیزبی موساوات لەسەر خاکی ئێستای کۆماری ئازەربایجان دامەزرا. موساواتییەکان لە مارسی ١٩١٨ی زایینی ڕاپەڕینێکی چەکدارانەیان لە باکو وەڕێخست کە دوای ماوەیەك ناوچەکانی دیکەشی گرتەوە. ئەوان لە ٢٧ی مەی ١٩١٨ لە شاری تفلیس دەوڵەتێکیان پێك هێنا و بەناوی «کۆماری ئازەربایجان» سەربەخۆییان ڕاگەیاند. لە کۆتایی ١٩١٩ و سەرەتاکانی ١٩٢٠ دەوڵەتی موساواتییەکان تووشی قەیرانی سیاسیی و دارایی بوو. لە بەهاری ١٩١٩ لە ناوچەکانی موغان و لەنکەران دەوڵەتی شۆڕەوی دامەزرا. لە ٢٦ی ئاوریلی ١٩٢٠ دا کۆمیتەی ئینقلاب بە سەرۆکایەتی نەریمان

نەریمانۆڤ پێك هات. لە ٢٨ی ئاوریلی ١٩٢٠ دەوڵەتی موساواتییەکان ڕووخا و کۆمیتەی شۆڕش دەسەلاتی لە باکو بەدەستەوە گرت و خۆی وەك دەوڵەتی «کۆماری شۆڕەویی سۆسیالیستیی ئازەربایجان» ناساند.

دوای ڕووخانی سۆڤێت لە ساڵی ١٩٩١، کۆماری ئازەربایجان سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و «ئەیاز موتەللیبۆف» ڕێبەری حیزبی کۆمۆنیست وەك یەکەمین سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا و تا ئێستا ئەم کەسانەی خوارەوە وەك سەرۆکی کۆماری ئازەربایجان کاریان کردووە:

١ـ محەمەدئەمین ڕەسولزادە، دامەزرێنەی حیزبی موساوات لە ساڵانی پێش جێگیربوونی یەکێتی سۆڤیەت.

٢ـ ئەیاز موتەللیبۆف ١٩٩١ـ ١٩٩٢

٣ـ ئەبولفەزڵ ئیلچی بیگ ١٩٩٢ ـ١٩٩٣

٤ـ حەیدەر عەلیێف ١٩٩٣ ـ ١٩٩٨، ١٩٩٨ ـ ٢٠٠٣

٥ـ ئیلهام عەلیێف ٢٠٠٣ ـ ٢٠٠٨، ٢٠٠٨ ـ ٢٠١٣.

حەشیمەتی ئازەربایجان لە ساڵی ٢٠١٢دا نزیکەی ٩,١٢٥ میلیۆن کەس بووە، زۆربەی حەشیمەتەکەی موسوڵمانی شیعەن. زمانی فەرمیی وڵات، تورکیی ئازەربایجانییە و لە پەنا ئەویش، زمانەکانی ڕووسی، ئەرمەنی، لەزگی، کوردی، تالیشی و تاتی قسەیان پێدەکرێ. [٢]

## ● سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کورد بۆ ئازەربایجان

ناوچەی کوردستانی سووری پێشووی کۆماری ئازەربایجان (لاچین، کەڵبەجار، گوبادلی (قوبادلی) و ناحیەکانی زەنگیلان) هەروەها ئەو کوردانەی لە کۆماری سەربەخۆی ئازەربایجان دەژین، بە کوردەکانی ئازەربایجان ناو دەبرێن.

شەڕی «قەرەباغ» کە لە ساڵی ١٩٨٨ لەنێوان ئازەرییەکان و ئەرمەنییەکان

ڕوویـدا، کوردەکانـی دانیشـتووی کوردسـتانی سـووری بەتـەواوی خسـتە دۆخـی پەنابەرێتـی نێوخۆییـەوە. لـە ئەنجامـی داگیرکردنـی کوردسـتانی سـوور و ناوچەی سـەربەخۆی کاراباغ (١٩٩٢ ـ ١٩٩٣) لەلایـەن سـوپای ئەرمەنییەکانـەوە، ئـەو کوردانـەی لـەوێ دەژیـان، ناچـار بوون پەنا بـەرن بۆ هەرێمـە جیاجیاکانی کۆماری ئازەربایجـان. لاچیـن لـە ١٩٩٣٢/٥/١٧، کەلبەجـار لـە ١٩٩٣/٤/١٢، گوبادلـی لـە ٧/٣١ـ١٩٩٣/١٠/٢٩ داگیر کراون. کوردەکانی کوردسـتانی سـووری پێشـوو، ئێستا وەك پەنابـەر لـە هەمـوو پارێزگاکانـی ئازەربایجـان دەژیـن.

لـەڕووی ڕەمەنـەوە کوردەکانـی ئازەربایجـان وا چەندیـن نەوەیـە لـەو وڵاتـە دەژیـن. دەرفەتـی ئەوەمـان نییـە بگەڕێینـەوە بـۆ کۆچەکانـی بـەر لە سـاڵی ١٥٨٧، بۆیـەش وامان بەڕاسـت زانی کە ئەو کوردانەی ئێسـتا نیشـتەجێی خاکـی باکووری ئازەربایجانـن، وەکـو سـەرەتایەکی مێژوویـی و یەکـەم نـەوەی کوردەکانـی ئازەربایجـان بناسـێنین کـە لە سـەدەی ١٦هەم بـەو لاوە هاتوون. ئەم نەوەیە لەسـەدا سـەد کەوتۆتـە ژێـر کاریگەریـی سیاسـەتی تواندنـەوە و لـە هەمـوو تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانـی دابـڕاوە.

ئـەو کوردانـەی لـەدوای ١٥٨٧ەوە کۆچیـان پێکـراوە، ژمارەیـان دەگاتـە دەیـان هـەزار کـورد، شوناسـی عەشـیرەیی خۆیـان بـزر کـردووە و نامـۆن لەگەڵ شوناسـی نەتەوەییشـیان.

ژمارەیەکـی تریـان ئـەو کوردانەن کە لـەدوای سـەدەی ١٦هەمـەوە، بەتایبەت لە کۆتایـی سـەدەی ١٩هـەم و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمەوە، لە خاکی کوردسـتانەوە بـۆ ئەو وڵاتـە دوور خراونەتـەوە.... [٣]

ژمـارەی کوردەکانـی ئازەربایجـان: لـە ئازەربایجـان « ئـەو پەنجـا گونـدەی شـارۆچکەکانی گوڵباجـار (کەڵباجـار)، لاچیـن، کوباتلـی، زەنکلـەر (زەنگیـلان) و نەخچـەوان تـا کۆتایـی سـییەکان بـە گشـتی کـورد بـوون. بـەڵام ئێسـتا وەك

تێکەڵەیەکی ڕەگەزی دەریدەخەن و دەزگاکانی ئامار ژمارەی کورد یەکجار ناتەواو دەردەخەن. ساڵی ١٩٢٦ ژمارەی کورد لەوێ ٤٢,٠٠٠ کەس بووە، بەڵام ساڵی ١٩٥٩ ژمارەکانی ئامار پووکاوەتەوە بۆ ٣٠٣ کەس، و ساڵی ١٩٧٠ بوون بە ٥٤٨٨ کەس. ئەوە لەخۆیدا دیاردەیەکی دژ بە ڕەوشە ئاساییەکەی پەرەسەندنی دێموگرافییە. گریمان کوردی موسوڵمان بەهۆی ژن وژنخوازی و خزمایەتی ناو ئازەرییەکانی برای ئاینیدا توابنەوە، هێشتا مێشك هەرزەگۆیی ئەوتۆ و ژمارەی ئاماری لەم شێوەیەی پێ پەسند ناکرێت.

لەبەر نادروستی ژمارەکانی ئامار ناچارین بە بۆچوونی خۆ ژمارەی دانیشتووانی کوردزمان لە ئازەربایجانی سۆڤیەتیدا دیاری بکەین، بەو پێیەی سەرچاوەکانی کوردی سۆڤیەت دەیگێڕنەوە، ژمارەیان لەنێوان ١٥٠,٠٠٠ و ٢٠٠,٠٠٠ کەس دایە. (٤)

کوردەکان یەکێك لە قەومەکانی نیشتەجێی ئازەربایجانن کە لەژێر گوشاری توندی تواندنەوە و ئاسیمیلەبووندا، ژمارەیان زۆر دابەزیوە، بە شێوەیەك ئەگەر کوردێك لەجێگەی ئەوەی خۆی وەك ئازەربایجانییەك بناسێنێ، پێداگریی لەسەر شوناسی ئێتنیکی خۆی کردبوایە، توانای دۆزینەوەی کاری نەدەبوو.

پرۆفیسۆر کۆرنێل لەپێوەندیی لەگەڵ حەشیمەتی کوردەکانی ئازەربایجان دەڵێ: «ئاماری کوردەکان زۆرە، هێندێك بە نزیکەی لەسەدا دەی حەشیمەتی ئەو وڵاتەیان لەقەڵەم داون». هێندێك لە سەرچاوە کوردییەکان ئاماژە بە هەبوونی ٢٠٠,٠٠٠ کەس کورد لە کۆماری ئازەربایجان دەکەن، بەڵام لە ئاماری فەرمیدا گوتراوە تەنیا ١٢,٠٠٠ کورد لەم وڵاتەدا دەژین. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە دوای ساڵی ١٩٣٠ بەرەبەرە سەرچاوە دەوڵەتییەکان بە ئانقەست زۆربەی کوردەکانیان لەباری قەومییەتەوە بە ئازەربایجانی لەقەڵەم داوە. (٥)

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا بەم شێوەیە باسی ژمارەی کوردەکانی

ئازەربایجـان کـراوە:

«حەشـیمەتی کوردەکانـی ئازەربایجـان بەپێـی ئامـاری سـاڵی ١٩٧٩، ١٢ هەزار و ٢٢٦ کـەس بـووە، لـە حاڵێکـدا لـە سـاڵی ١٩٢٦ زیاتـر لـە ٣١٠٠ کەس بـوون و لە ئێسـتادا ٣٧ هـەزار و ٢٠٠ کەسـن.»[٦]

تاهیـر سـلێمان سەرنوسـەری ڕۆژنامـەی «دیپلۆماتـا کـورد» لـە ئازەربایجـان لەبـارەی ژمـارەی کـوردی ئازەربایجانـەوە دەڵێـت:» بەپێـی لێکۆڵینەوەیـەك کـە خـۆم کردوومـە، نزیکـەی ملیۆنێـك و ٥٠٠ هەزار کـورد لە ئازەربایجان هـەن، بەڵام زۆربەیـان ئاسـیمیلە بـوون، واتە لەنێو کۆمەڵگـەی ئازەریدا تواونەتـەوە. دۆکۆمێنت و بەڵگەنامـە فەرمییـەکان دەڵێـن ١٣ هـەزار کـورد لـەو وڵاتـەدا هـەن.»[٧]

واتــە بەهــۆی نەبوونــی ئامارێکــی دروســت و هەروەهــا هەوڵەکانــی دەوڵـەت بـۆ تواندنەوەیـان لەنێـو ئازەرییەکانـدا، ناتوانیـن ڕێـژەی دروسـتی ئـەو کوردانــە دیاریــی بکەیــن.

● شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ئازەربایجان

لـە ناوچـەی زەنگیـلان، کەڵباجار، قوباتلـی، لاچین لـە سـەدەی نۆزدەهەمەوە تا سەرەتای سـەدەی بیستەم.

١ـ لە ناوچەی زەنگیلان.

٢ـ ناوچـەی کەڵباجار لە گوند و شـارۆچکەکانی ئاخجەکنـد، زەیلیك، ئورجلو، سـویوخ بولاغ شورتانی سـەروو و شورتانی خواروو.

٣ـ ناوچـەی قوباتلی لـە گوندەکانی زیلانلی، کورت ماخروزلو، میـرزاك و یردی مەلای سـەروو (مولوی سـەروو) و مەلای خواروو، سـیلالی (جەلالی).

٤ـ ناوچـەی لاچیـن لـە گوند و شـارۆچکەکانی ئاخ بـولاخ، ئاخجەکنـد، بوزلو، زیرتـی قەلاچـە، کەمالـی، قەرەکشـیش، قەرەقشـلاق، لاچیـن، میـن کینـد، میـرك

چیراکلی، شەیلانلی.[٨]

لە کتێبی «پەیوەندی نێوان کورد و ڕووسیا»دا جێگای ژیانی کوردەکانی ئازەربایجان بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری کراوە:

لە ناوچەکانی زەنگێلان، کێلبەجار، قوباتلی، لاچین و ئیسماعیل، گەنجە. هەروەها ناوچەی ناگۆرنی قەرەباخی ئەرمەنینشین.[٩]

**● ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی ئازەربایجان**

ئەگەر بە کوردی و بە کورتی باس لە ژیانی کوردەکانی ئازەربایجان بکەین دەبێ بڵێین بەداخەوە زۆربەی ماوەی ژیانیان لەناخۆشی و چەوساندنەوەدا بەسەر بردووە. بۆ ئەوەی خوێنەری خۆشەویست بە کورتی و بە ڕوونی دیمەنێکی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی ئازەربایجانی بێتە پێش چاو، ئاوڕ لە ڕەوشی ئەو کوردانە لە سەردەمی دوای پێکهاتنی یەکێتی سۆڤیەت دەدەینەوە:

کوردی ئەم وڵاتە لە ناوچەکانی لاچین و کەڵبەجار دەژین، بە ئایین موسوڵمان و بە مەزهەب شیعەن. لە سەرەتای دامەزراندنی سۆڤیەت مافی خوێندەوارییان هەبوو، قوتابخانەی کوردی هەبوو، کتێبی کوردی قوتابخانەکان بەزمانی کوردی و تیپی لاتینی چاپ دەکرا. بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند و پێش جەنگی دووەمی گێتی مافی نەتەوایەتی نەما و کورد لەناو ئازربایجانییان توانەوە. هۆی سەرەکی بۆ ئەمە ئەوەیە کە کورد و ئازربایجانی هەر دوو لایان موسوڵمان و بە مەزهەب شیعەن. دروشمی دەسەڵات بەدەستانی ئازربایجان ئەوەبوو کە «ئێمە موسوڵمانین!» دیارە بە مانا ئەنترۆپۆلۆجییەکەی، نەك بە مانا ئایینییەکەی، ئیتر ئەمە بووە هۆی توانەوەی کورد لەناو ئازربایجانییان.

دیارە ئەمە لەسەر کوردی تورکمانستانیش پیادە کرا و ئەوانیش « لە سەرەتای دامەزراندنی دەسەڵاتی سۆڤیەت قوتابخانەی کوردی و کتێبی کوردییان هەبوو

بە تیپی لاتینی، بەڵام پێش جەنگی دووەم ئەم مافەیان لێ سەندرایەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کوردی تورکمانستانی سۆڤیەت تا ئێستاش پارێزگاریی ئەدگاری نەتەوایەتیی خۆیان کردووە، وەکو کوردی ئازربایجان مەترسی توانەوەیان نییە. چونکە ئەمانە وەکو ووترا بەمەزهەب شیعەن و تورکمانەکان سوونەن. ئیتر ئەمە بووە هۆی ئەوەی پارێزگاریی ناوەڕۆکی نەتەوایەتی خۆیان بکەن.[١٠]

« کاتێك لە ٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٧دا شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەرپا بوو، هەموو گەلان و نەتەوە بچووکەکانی ڕووسیای تەزاری بەرەو پیری چوون و بە هیوایەکی زۆرەوە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە بە لابردنی ڕژێمی تەزار ئاهێك بەبەریاندا بێتەوە و لە چەوساندنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریان بێت و هەر هیچ نەبێت لایەنی کەمی مافە نەتەوەییەکانیان بەدەست بهێنن.

کوردەکانی قەفقازیش بە هەمان شێوە چاوەڕوانی دەروویەك بوون کە شۆڕشی ئۆکتۆبەر بۆیان بکاتەوە، بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە کۆمارەکانی قەفقاز یەکسەر نەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتەوە، بەڵکو دوای چەند ساڵێك، ئینجا ڕژێمی سۆڤێتی دروست بوو. ئازەربایجان لە بەهاری ١٩٢٠ دا کەوتە دەست لایەنگرانی سۆڤێت. لە ئەرمینیاش لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا بەڵشەفیکەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست. خۆ لە گورجستان تا سێ ساڵ دواتریش حوکم هەر بە دەستی مێنشەفیکەکانەوە بوو.

... چەوساندنەوەی کورد بەتایبەتی لە ئازەربایجاندا کاتێك پارتی موساوات لە ئەیلولی ١٩١٨دا دەسەڵاتی گرتەدەست، زۆرلە هی سەردەمی تەزار سەختتر بوو. د. کەمال مەزهەر دەڵێت: لەو ماوە کورتەی دەسەڵاتیاندا موساواتییە ڕەگەزپەرستەکانی ئازەربایجان بێپەروا پەردەیان لە ڕووی ڕاستەقینەی شۆڤێنی خۆیان ڕامالی. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی ناوچە کوردەوارییەکان لە ترسی ئەوان و داشناقەکانی ئەرمەنستان ناچار بوون بۆ ناو خاکی تورکیا و ئێران

هەڵبێـن و دوای نەمانـی دەسـەڵاتی ئـەوان ئینجا توانیـان بەرەبەرە بـۆ مەڵبەندەکانی جارانیـان بگەڕێنەوە.

هەروەهـا لەبـارەی چەوسـاندنەوەی کوردەکانـەوە، د. کەمـال مەزهـەر لـە زمانی ـبوکشـپان ـەوە دەڵێـت: ڕاوەدوونانـی کـورد و گاڵتەپێکردن بەزمـان و دابونەریتیان پـەرەی سـەند، کـورد بۆتـە گاڵتەجاڕ و مایـەی نوکتە لەسـەردانان لەلایـەن موسـاواتییەکانەوە کـە توانیـان جارویـار بەشـێکی کـەم خەڵکـی هەرەدواکەوتـوو ڕابکێشـنە ئـەم گێژاوەوە. هەر ئـەو دەوروبەرە دانیشـتووانی ژمارەیـەك گوندی کورد ـسویندیان خوارد دەست لە زمانی کوردی هەڵبگرن... وەکو دانیشتوانی گوندی ـکەمالیـن ـی ناوچـەی لاچیـن.

... بێگومـان ڕەفتـاری شـۆڤێنیانەی تورکـە موسـاواتییەکان زۆرتـر پاڵـی بـە کـوردەوە دەنـا بـەدەم کارگێڕانـی سـۆڤێتیەوە بـڕۆن و پشـتگیری لـە دامەزراندنـی فەرمانڕەواییەکـی بەلشـەڤی بکـەن، هەرچەنـدە جێگـەی داخـە گۆڕانکارییەکـی ئەوتـۆی وەکـو ئـەوەی چاوەڕوان دەکـرا و لە ئەرمەنسـتانی دراوسـێدا ڕووی دابوو، لـە ئازەربایجـان ڕووی نـەدا.[11]

پـاش ماوەیـەك مەڵبەنـدی کوردسـتانی سـوور دامـەزرا و دوای چەنـد سـاڵ هەڵوەشـێنرایەوە و تەنانـەت کوردەکانـی ناوچەکـەش تووشـی ڕاگواسـتن و دورخرانـەوە بـوون و ئـازار و ناڕەحەتیـی زۆریـان بینـی.

« لـە دەیـەی ١٩٣٠ دا لەسـەر ڕەگەزنامـەی کـوردەکان نـووسرا «هاووڵاتـی ئازرەبایجـان» و بـەم شـێوەیەش کوردبوون بەڕەسـمی قەدەغە کرا. لەسـاڵانی ٧٠ی سـەدەی ڕابـردوودا تەنهـا ئۆرگانێك کە بەنـاوی کوردایەتییەوە مابـوو، ژوورێك بوو سـەر بـە ئەکادیمیـای زانسـتەکانی ئازەربایجـان، بـەڵام ئەویـش هەڵگیـرا و چیـتر وشـەی «کـورد» لەو وڵاتـە نەبیسـترایەوە.

ئەمـەی خـوارەوە ڕەهەنـدە جیاجیاکانـی بـەزۆر ئاسـیمیلەکردنی کوردەکانـە لـە

سەدەی بیستەمدا:

لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی ١٨٨٠ دا لە ناحیەکانی گوبادلیی ئێستا، لاچین، کەلبەجەر، زەنگیلان و جەبرایل دەوڵەت لیستێکی ناوی گوندەکانی ئامادە کردووە. لە لیستەکەدا ناوی ئەو گوندانەش هاتووە کە دانیشتووانەکەی بە زمانی کوردی قسە دەکەن: کۆر جەلالی، عەبدالار (ناوە کۆنەکەی شارۆچکەی لاچین)، زەرتی، کاری کەهاسی، مینکەند، کونابلی، کۆدەکلەر، مۆلو، شخۆڤا، گازی ـ کوردەلیلەر. پاش نەوەد ساڵ واتە لە ساڵی ١٩٧٠ لەم گوندانە تەنانەت یەك کەسیش نەبووە کە بە زمانی کوردی قسە بکات.

ساڵی ١٩٣١ لە گوندی زەریت ( شارۆچکەی لاچین ) کە دووەم نەوەی کوردەکانی ئازەربایجان دەگرێتەوە، لە ٢٨٠ کەس تەنها پێنج کەسی بەساڵاچوو، ئەویش بەزۆر چەند وشەیەکی کوردی لەبیر مابوو. دیسان هەر لە نەوەی دووەم، لە گوندی میریك (شارۆچکەی لاچین) کە حەشیمەتەکەی ٣٧٤ کەس بوو، ٣١ کەسیان، لە گوندی تاتلار (شارۆچکەی کەلبەجەر) کە ژمارەیان ٢٢٥ کەس بووە تەنها بەساڵاچووەکانیان توانیویانە بەزۆر بەخێچ و خواری کوردی قسە بکەن.

ئەوەش هەڵەیە کە دەوترێت کوردەکانی نەخجەوان زمانی خۆیان فەرامۆش نەکردووە. لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کوردەکانی گوندی کیلیتی سەر بە نەخجەوان، کە لە سەردەمی نادرشادا پەلکێشی ئێرە کراون، تەنها پیر و بەساڵاچووەکانیان هەندێك کوردییان دەزانی... [١٢]

شایانی باسە «هەندێك لە کوردەکان بەشوناسی ئازەری توانیان بگەنە باڵاترین پۆستە ڕەسمییەکانی ئەو وڵاتە. ئیلهام حەیدەر، چوارەم سەرۆك کۆماری ئازەربایجانە. کوڕی حەیدەر عەلییێف ی سەرۆك کۆماری پێشووە. سەرۆکی حزبی ئازەربایجانی نوێیە. رامیز ئەنوەر ئۆغڵو مەهدییێف،

سەرۆکی نووسینگەی سەرۆکایەتی کۆماری ئازەربایجان، ڕاوێژکاری دەوڵەتی ئازەربایجان و مامۆستای ئەکادیمیای زانستە میللییەکانی ئازەربایجان. حاجی باڵا ئەبوتالیبۆف، قایمقامی باکو. عەلیشانۆف عارف دوزەن ئوغڵو، ئابووریناسی ئازەربایجانی، ئەندامی ڕێکخراوی زانستە ئابوورییەکان، سەرۆکی ڕادیۆ و تەلەویزیۆنی ئازەربایجان. ڤاسف تالیبۆف ئەندام پەرلەمان و سەرۆکی مەجلیسی باڵای سەربەخۆی نەخجەوان. بەیلەر ئەیوبۆف لێپرسراوی پاسەوانە تایبەتییەکانی سەرۆک کۆمار.

حاڵی حازر لەناو کەسە چالاکەکانی ئێمەدا ئەو ناوانە هەن: کامیل حەسەنۆف. سەرۆکی ناوەندی شارستانیەتی کوردیی (ڕۆناهی)، تاهیر سلێمان سەرنووسەری ڕۆژنامەی (دیپلۆمات)، هەروەها نووسەری کورد ئەحمەدی حەپۆ.

بەڵگە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی لە سەدەی ١٧هەمەوە لەسەر کوردەکانی ئازەربایجان پەیڕەو کراوە. پاشان لە سەدەکانی دواتردا کە ئاسەواری کوردەکانی شەددادی دیار نەماوە، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنێت کە لەدوای داگیرکردنی ئازەربایجان لەلایەن سەلجوقییەکانەوە، ئەو کوردانە ڕووبەڕووی سیاسەتی تواندنەوە و پاکتاوکردن بوونەتەوە.

ئەو بەڵگانە وێڕای هەموو کەموکوڕییەکان دەیسەلمێنن کە ئەو کوردانەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە کوردستانی قەفقاس نیشتەجێ بوون، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە بەئاشکرا کار بۆ پاکتاوکردنیان کراوە. دەتوانین هۆکارەکانی پاکتاوی ڕەگەزی کە تا ئەو قۆناغە درێژەی هەبووە، بەچەند فاکتەرێك شی بکەینەوە:

١ـ لەو ناوچانەی کوردەکان تێیدا ژیاون، بەتایبەت لەسەر ئەو خاکانەی کە کوردستانی سوور بە جوگرافیای کوردستانەوە دەبەستێتەوە (خۆرئاوای کوردستانی سوور و هەندێك لە خاکەکانی باشووری خۆرئاوا تاکو ڕووباری

ئاراس)، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی ئەرمەنی گوازرانەوە بۆ ئەو شوێنانە، هەروەها خەڵکی ئازەری هێنرا بۆ ئەو خاکانەوە، بەرەبەرە کوردەکان توانەوە و لە کوردبوونی خۆیان دابڕان.

٢- دابڕانی ئەو کوردانە تەنها لە خاکی کوردستانی گەورە نەبوو، بەڵکو لەناو خۆشیاندا لێک دابڕان، بەهۆی پێشهاتە سیاسییەکانەوە، خەڵکێکی زۆر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئاوارە بوون، هەندێک کەس لە دەست گوشارە سیاسییەکانی عەشیرەتەکەی ڕایکردبوو، ئەمەش وایکرد خەڵک زوو زوو جێگۆڕکێ بکات و دابڕانەکان هێندەی تر قووڵ بوونەوە. کوردەکانی کوردستانی سوور، بەتایبەت لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەیەکجاری لە بەشەکانی تری نەتەوەکەیان دابڕان و تووشی جۆرێک لە گۆشەگیری بوونەوە. ئاڤەریانۆڤ، یەکێک لە ئەفسەرە پلەبەرزەکانی سوپای ڕووسیا لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسیویەتی: کوردەکانی ئەیالەتی یەلیزاڤێتپۆل بە تەواوی لە کوردی ناوچەکانی تری ڕووسیا دابڕاون و گۆشەگیر کراون.

٣- جموجۆڵی بەردەوام، کۆچکردن لە کەشوهەوای سەختدا، هەڵچوون بە شاخە ئاسێکاندا، هەمووی وایکردووە پەیوەندییە عەشارییەکان لاواز ببن، لەکاتێکدا پەیوەندیی عەشایەری ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە پاراستنی چۆنایەتی نەتەوەیی.

٤- خەڵکی کوردستانی سوور کە لەڕووی نەتەوەییەوە تووشی گۆشەگیری بوون، بەدرێژایی سەد ساڵ پەیوەندیی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییان لەگەڵ ئازەرییەکان و تاڕادەیەکیش ئەرمەنییەکان هەبووە. پێداویستییە سەرەکییەکانی ئەو کوردانە کە زیاتر بە کاری ئاژەڵدارییەوە سەرقاڵ بوون، لەڕێی پەیوەندییە بازرگانییەکانیان لەگەڵ خەڵکی ئازەرییەوە دابین کراوە... ئەمەش فێربوونی زمانی ئازەری بۆ ئەوان کردۆتە ناچارییەک.

٥ـ پەیوەندیی ئابووریی بەردەوام و لاوازبوونی پەیوەندییە عەشارییەکان، وایکرد لەسەر زەمینەی ئایینی هاوبەش، خزمایەتی لەنێوان کوردەکان وئازەرییەکاندا زیاد بکات.

٦ـهاودینی لەو ولاتەدا وایکردووە (کوردەکانی ئازەربایجان وەك ئازەرییەکان شیعەن) کە نەتەوایەتی بە پلەی دووەم بێت و لە کەشێکی وەهاشدا نزیکایەتی کورد و ئازەری زۆر بەهێز بووە.

هەموو ئەمانە لەگەڵ خۆشکردنی زەمینەی پاکتاوی ڕەگەزی، بەرەبەرە جێبەجێکردنەکەشی مسۆگەر کردووە. سەرەڕای هەموو ئەوانەی کە باس کرا، تاکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم ئەو پاکتاوی ڕەگەزییەی لەسەر کوردەکان پەیڕەو کراوە، بێگومان بە زۆرەملێ کراوە و بە ویستی کوردەکان خۆیان نەبووە[١٣]

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا پێم باشە قسەیەکی ڕێزدار تاهیر سلێمان سەرنووسەری ڕۆژنامەی «دیپلۆماتا کورد» لە ئازەربایجان، بەبیر بێنمەوە کە دەڵێت: «هیوادرام ئەوەی بەسەر کوردی قەفقاسیا هاتووە، بەسەر گورگی چۆڵایی و شاخەکانیش نەیێت! تاوەکو ئێستا دوو گۆڕی باب و باپیرانمان لە یەك شوێن نییە».[١٤]

**• سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ یەکەم**

١. ڕەمەزان کەریم، وردەکاریی پەرش و بڵاویی کوردەکانی یەکێتیی سۆڤێتی پێشوو، (www.faceiraq.com/inews.php?id=1473208

٢. ویکیپیدیای فارسی.

٣.کەریم، ڕەمەزان، کوردەکانی ئازەربایجان، 18/3/2013 ، www.knwe.org.

٤. کۆمەڵێک نووسەر، گەلێکی پەرموردە و بێشتمانی پەرت. وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە: م. گۆمەیی، سوید، ٢٠٠٢، ل ل٣٥٨ و ل٣٥٩.

٥.ویکیپیدیای فارسی

٦. هفتەنامە سیروان، www.sirwanweekly.com/Default. (aspx?page=Complete&cp=2147

www.rudaw.net/sorani/world/14092013 .7

٨. هەورامی، د.ئەفراسیاو، کوردستانی پشت قەفقاس، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ١٩.

٩. عەلی، ئارام، پەیوەندی نێوان کورد و روسیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی لیرە، سلێمانی، ١٩٩٩. ل ١٦٥.

١٠. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. ٤٥ ـ ٤٦.

١١. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٣٧ ـ ١٣٩.

١٢. کەریم، ڕەمەزان، کوردەکانی ئازەربایجان، 27/3/2013 ، www.knwe.org.

١٣. کەریم، ڕەمەزان، س.پ. ٢٠١٣/٤/١٦.

١٤.سەرچاوەی ژمارە ٧.

## • دووەم: کوردەکانی ئەرمەنستان (ئەرمینیا)

- چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی ئەرمەنستان
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ ئەرمەنستان
- ژمارەی کوردەکانی ئەرمەنستان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ئەرمەنستان
- ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی ئەرمەنستان
- پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی کوردەکان لە ئەرمەنستان
- چالاکیی ڕۆشنبیریی و سیاسیی کوردەکانی ئەرمەنستان
- یادێك لە ڕادیۆی کوردیی یەریڤان (ئێرەوان)
- سەرچاوەکان

### • چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی ئەرمەنستان

ئەرمەنستان (ئەرمینیا) لە قەفقازیای باشوور (ئەودیوی قەفقاز) لەنێوان دەریای ڕەش و دەریای خەزەر هەڵکەوتووە کە بە سنووری نێوان ئاسیا و ئەورووپا لەقەڵەم دەدرێت. ئەو وڵاتە لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ تورکیا، لە باکوورەوە لەگەڵ گورجستان (جۆرجیا)، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ کۆماری ئازەربایجان و لە باشوورەوە لەگەڵ ئێران و کۆماری خۆبەڕێوەبەری نەخجەوان (بەشێك لە

کۆماری ئازەربایجان) هاوسنوور و دراوسێیە.

پانتایی خاکی ئەرمەنستان ٢٩٨٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و حەشیمەتەکەی نزیکەی ٣,٢٠٠,٠٠٠ کەسە. پایتەختەکەی شاری یەریڤان (ایروان)ـە و لە یازدە پارێزگا بە ناوەکانی ئاراگاتسوتێن، ئارارات، ئارماویر، گوغارکونیك، کوتایك، لورین، شیراك، سیونیك، تاووش، وایوتس جور و یەریڤان (ئیرەوان) پێك هاتووە و گرنگترین شارەکانیشی بریتین لە: یەریڤان، گیومری، وانادزور، ئەچمیادزین، هەرازدان، ئابوویان، ئارتاشات، ئارماویر، گاوار، گوریس، ئاشتاراك، ئەستیاناوان، ئەسپیتاك، چارنتساوان، سوان، سیسیان، ئیجوان، ئارتیك و دیلیجان.

ئەرمەنستان بە درێژایی مێژووی خۆی شوێنی پێکدادانی وڵاتگران و شەڕگەی ئیمپراتۆرییە جۆراوجۆرەکان بووە. لە ٢٧٠٠ ساڵ لەمەوبەر تا ئێستا لەلایەن ئیمپراتورییەکانی ئێران، ئەسکەندەر، ڕۆم، بیزانس، خەلافەتی ئیسلامیی عەرەبەکان، مەغوولەکان، تاتارەکان، عوسمانییەکان و ڕوسییەکان داگیر کراوە. لەو ماوەیەدا پاشایەتییە جۆراوجۆرەکانی ئەرمەنستان توانیویانە نزیکەی ١٧٠٠ ساڵ دەسەڵاتی ئەم وڵاتە بەدەستەوە بگرن.

ئەرمەنستان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەشێك لە ئێران بووە و کولتوورەکەی کاریگەرییەکی زۆری کولتووری ئێرانی بەسەرەوەیە. دوای ڕووخانی پاشایەتی ئەرمەنستان لە ساڵی ٤٢٨ی زایینی، ئەم ناوچەیە جارێکی دیکە بوو بە بەشێك لە ئێران... لە سەردەمی سەفەوییەدا ئەرمەنستان شوێنی شەڕ و کێشمەکێشمەکانی دوو ئیمپراتۆرییەتی سەفەوییە و عوسمانی بوو و یەریڤان چەندین جار لەلایەن هێزەکانی عوسمانییەوە داگیرکرا. بەپێی ڕێککەوتننامەی زەهاو لە ساڵی ١٦٣٩ی زایینی ئەرمەنستانی ڕۆژهەڵات کە یەریڤانیشی دەگرتەوە، چووە ژێر دەسەڵاتی سەفەوییە و ئەرمەنستانی ڕۆژئاوا (ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئەمڕۆ بە ناوەندێتیی شارەکانی ئەرزڕۆم، سیواس و وان) لەژێر دەستی

عوسمانییەکاندا بوو. لە شەڕەکانی نێوان ئێرانی قاجاری و ڕووسیا تیزاری لەسەر قەفقاز ناوچەی سیونیك هەڵکەوتوو لە باشووری ئەرمەنستانی ئێستا کەوتە بەردەستی ڕووسیا و ... لە خولی دووەمی شەڕەکانی ئێران و ڕووسیای تیزاری لە ساڵی ١٨٢٧ی زایینی کە لە سەردەمی دەسەڵاتداریتیی فەتحعەلی شاری قاجاردا ڕووی دا، سوپای ئێران بە فەرماندەیی عەبباس میرزا لە بەرامبەر سوپای ڕووسیا بە فەرماندەیی پاسکۆویچ تووشی شکست بوو. دواتر بەپێی پەیماننامەی تورکمانچای، ئەرمەنستان بە فەرمی لە ئێران جیا بۆوە و بوو بە بەشێك لە ڕووسیا.

لە ساڵی ١٩٢٠ تا سەردەمی لێکهەڵوەشانی سۆڤیەت، ئەرمەنستان لەژێر ناوی کۆماری سۆسیالیستی ئەرمەنستانی سۆڤیەت، یەکێك لە ١٥ کۆمارەکەی پێکهێنەری یەکێتیی سۆڤیەت بوو. لە ساڵی ١٩٩١ دوای هەڵوەشانەوە سۆڤیەت بوو بە وڵاتێکی سەربەخۆ.

کۆمەڵکوژیی ئەرمەنییەکان: لە ڕابردوودا ناوەندی سەرەکی حەشیمەتی ئەرمەنییەکان ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئێستا بەتایبەت ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی وان بوو. پاکتاوکردنی ئیتنیکیی ئەرمەنییەکان لە ساڵەکانی ١٩١٥ و ١٩١٦ لەلایەن حکومەتی تورکە لاوەکانی تورکیا بوو بە هۆی ئەوەی بە سەدان هەزار ئاوارەی ئەرمەنی خۆیان بگەیەننە ئەرمەنستانی ڕۆژهەڵات (ئەرمەنستانی ئێستا). بە هۆی ئەم نەژادکوژییەوە زیاتر لە ملیۆنێك و حەوتسەد هەزار ئەرمەنی گیانیان لەدەست دا و نزیکەی دوو ملیۆن کەسی تر بە ناچاری زێدی خۆیان جێهێشت.

زمانی ئەرمەنی یەکێك لە زمانە هێندوئوروپاییەکانە کە لە ناوچەی قەفقاز و بە تایبەت لە وڵاتی ئەرمەنستان باوە. ئەم زمانە بە خەتی تایبەت بە خۆی واتە ئەلفوبێی ئەرمەنی کە لەلایەن مەسروب ماشتوتێس داهێنراوە، دەنووسرێ...

ئەرمەنـی دوو شـێوەزاری گـەورە و سـەرەکی هەیە: یەکێکیان ئەرمەنـی ڕۆژهەڵاتی و ئەویـتر ئەرمەنـی ڕۆژئاوایـی. زمانـی فەرمیـی وڵاتـی ئەرمەنسـتان بـە شـێوەزاری ئەرمەنیـی ڕۆژهەڵاتیـە. کـۆی ئاخێوەرانـی زمانـی ئەرمەنـی لـە دنیـادا ٩ ملیـۆن کەسـە. بێجگـە لـە زمانـی ئەرمەنـی، لـەم وڵاتـەدا لـە بەشـی ڕۆژئـاوا و باشـووری ڕۆژئـاوا زمانـی «کـوردی»ش باوە و بـەکار دەهێنرێ. هەروەها زمانی ڕووسـیش لەم وڵاتـەدا لەلایـەن خەڵکێکـەوە کەڵکـی لـێ وەردەگیرێ.

خەڵکـی ئەرمەنسـتان بـە درێژایـی مێـژوو زەردەشـتیی مەزداپەرسـت بـوون کـە جیاوازیـی لەگـەڵ لقـی زەردەشـتیی زەروانیـی ساسـانیەکان هەبـوو. ئەرمەنییـە زەردەشـتیەکان زیاتـر جەخـت لەسـەر پەرسـتنی خـۆر و ڕووناکی دەکەنـەوە بەڵام دوای ئـەوە، ئایینـی مەسـیحیەت لـەم ناوچەیـەدا بـرەوی سـەند. لـە سـاڵی ٣٠١، ئەرمەنسـتان یەکەمیـن وڵات بـوو کـە مەسـیحیەتی وەك دینـی فەرمیـی وڵات هەڵبـژارد. (دوازدە سـاڵ پێـش ڕۆمـا).[1]

- **سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ ئەرمەنستان**

بەڵگـەی مێژوویـی تێروتەسـەل لەبەردەسـتدان سـەبارەت بـەوەی کـە چەندیـن هـۆزی کـوردی جیـاواز لەنێـوان سـەدەی ١٠ بـۆ ١٢ دا لەسـەر خاکی ئەرمەنسـتانی ئێسـتا ژیـاون. پێـش زایـن و دواتریش، لە سـنووری دەوڵەتی ئەلبانیدا کە بەشـێك لـە خاکـی ئەرمەنستانیشـی دەگرتـەوە، کـوردەکان هـەر لەسـەر ئـەو خاکـە بـوون و دەوڵەتـی میخرانیـش کـە دەوڵەتێکـی کوردی بـووە (سـەدەی ٦ بـۆ ٧) ناوچەکانی نەخجـەوان و زەنگـەزوری لەخـۆ گرتـووە. کاتێـك هەمـوو ئەمانە دێنینـە بەرچاوی خۆمـان، دەزانیـن کـە مێـژووی کـورد لەسـەر ئـەو خاکانـە درێـژ دەبێتـەوە، پاشـان لـە ناحیەکانـی قـەدی و ئاراراتـی ئەرمەنسـتانەوە تێدەپەڕێـت و دەگاتـە قـەزای زەنگـەزوری ئەمـڕۆ، ئـەوە کوردسـتانی سـوورە و دەیسـەلمێنێت کـە کـورد لەسـەر

خاکـی ئەرمەنسـتانی ئێسـتا، مێژینەیەکـی کۆنیـان هەیـە.[٢]

هەروەهـا لـە مـاوەی زەمەنیـی جۆراوجـۆردا کـوردەکان لـە شـوێن و ناوچەکانی دیکـە و یـەك لـەوان لە ناوچە کودنشـینەکانی تورکیـاوە، بە هۆکارگەلـی جۆراوجۆر روویـان لە ئەرمەنسـتان کـردووە.

● **ژمارەی کوردەکانی ئەرمەنستان**

بەهـۆی پێشـکەوتنە سیاسـی و سـەربازییەکانی ناوچەکـە، کـوردەکان لەنێـوان ئەرمەنسـتان و کوردسـتان و ناوخـۆی وڵاتیشـدا کۆچـی بەکۆمەڵیـان زۆر کـردووە. لـە ئەنجامـی ئـەو کۆچانـەدا، سـاڵی ١٨٣٠ لـە ئەرمەنسـتان ١٥ هـەزار و ٢١٥ کەس (٩,٤ی ژمـارەی گشـت دانیشـتووان) کـورد هەبـوون. لـە ١٨٥٠ دا ئـەو ژمارەیـە دابەزیـوە بـۆ ٨ هـەزار و ٨٩ کەس (٣,٤ی ژمارەی گشـت دانیشـتووان). بەم ئامارەوە بۆمـان دەردەکەوێـت کـە ٧ هـەزار و ١٢٦ کـورد لەجێـی خۆیـان نەمـاون و کـەم بوونەتەوە. دوابەدوای شـەڕی قرم (١٨٥٣ ـ ١٨٥٦) و شـەڕی ڕووس و تورك (١٨٧٧ ـ ١٨٨٨)، کـوردەکان لـەو جوگرافیایـە ژمارەیـان بـەرز بۆتەوە.

لـە سـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەهـەم، لـە ویلایەتـی ئەرمەنسـتان ژمـارەی کـوردەکان دەگەیشـتە ١٠ هـەزار و ٧٣٧ کـەس، لـە کۆتاییەکانـی سـەدەی نۆزدەهەمـدا، ئـەو ژمارەیـە گەیشـتبووە ٣٦ هـەزار و ١٨٨ کـەس. بەگوێـرەی ئەنجامـی سـەرژمێرییەکانی سـنووری ئیمپراتۆریـی ڕووسـیا لـە سـاڵی ١٩٠٣، لـە کـۆی ٣٧ هـەزار و ٦٨ کـوردی ئەیالەتـی یەریڤـان، ١٥ هـەزار و ١٥٢ کەسـیان لـە سـوورمەلی، ٦ هـەزار و ٤٦١ کەسـیان لـە ئەچمیەدزیـن، ٣ هەزار و ٩٦٢ کەسـیان لە ئەلیکسـاندراپۆل، ١١ هـەزار و ٤٩٣ کەسـیان لـە قەزاکانـی یەریڤـان، نەخجـەوان و شـەرور ـ دەرەلـەز نیشـتەجێ بـوون.[٣]

بـەڵام بـە گوێـرەی سـەرچاوەیەکی دیکـە «ژمـارەی کـوردی ئـاوارە بـە گوێرەی

ئاماری سەرژمێری ساڵی ١٩٧٠ لە ئەرمینیا کردوویەتە نزیکەی ٣٧,٤٨٦ کەس. یەك لە سێی ئەو ژمارەیە لە یەریڤان دەژین و ئەوانی دی دابەش بوون بەسەر ٢٢ گوندی دوو شارۆچکەی «ئالاکوێز» و «تالین». و چەند گوندێکی ئاوێتەی کوردی ـ ئازەری و کەمتر کوردی ـ ئەرمەنی.[٤]

بەهۆی هاتووچۆ و ڕاگواستنی زۆر و کۆچکردن لە کاتە جۆراوجۆرەکاندا بێگومان ئاماری دانیشتووانی کوردی نێو هەریەك لەم وڵاتانە جۆراوجۆرە و سەرچاوەکانیش ئاماری جیاواز بەدەستەوە دەدەن.

**• شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە ئەرمەنستان**

کوردەکان لە سەدەی ١٩هەمدا، لەو قەزایانەی ئەرمەنستان نیشتەجێ بوون کە سەر بە ئەیالەتی یەریڤانی کۆنن: شەروور ـ دەرەلەز، ئەلیسکاندراپۆل، نەخجەوان، نۆڤۆبایەزید، یەریڤان، ئەچمیەدزین و سوورمەلی.[٥]

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کورد لە ئەرمەنستان لەم ناوچانەی خوارەوە ژیان بەسەر دەبەن:

ناوچەکانی ئالاران، ئارتاشات، ئارتی، ڤیدین، باسارگیچار، دیلیجان، کوتائیس، تالین، ئەچمیادزین، شائومیان، ناوچەی ئاپاران، ئەکتیمبریان و شاری ئیرەڤان (یەریڤان).

**• کوردی پشت قەفقاس لە سەدەی ١٠ـەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم:**

١ـ کوردی ناوچەی ئاپاردان لە گوند و شارۆچکەکانی ئالاگیز، گونداخساز (قونداخساز)، جارجاریس، کوریولاخ، پامبی کوردی، کورویوگاز، جاموشلوی بچوك، میراك سەنگار (سەنگیار)، چوبان ماز کەخیل و هۆزەکانی، محەمەدی

ڕۆژکی، سپیکی بیلا (بێنیلا).

٢ـ کوردی ناوچەی باسار گیچا لە گوندەکانی گەیسو (غەیسو)، کەیاباشی، کوربولاخ کەیر (کیرد) کە هۆز و خێڵەکانی باشکی، کەراڵی و شاڤیلکی لێ دەژین.

٣ـ کوردی ناوچەی دلیجان، لە گوندەکانی گولەڤینو، سیمینوڤکا زۆربەیان لە هۆزی جەلالین.

٤ـ کوردی ناوچەی نوکتەمبیرن لە گوندەکانی ئایگیشات، ئایکەڤان، مەرگەشات سۆڤێتەکان کە هۆز و خێڵەکانی ڕوموشی و شەرکی تێدا دەژین.

٥ـ ناوچەی تالین لە گوند و شارۆچکەکانی ئاکسکو، بایسیز، گلتو (گیلتو)، دیان زاڤیستان، کەلاش بەگ، کەلاخ تالا، کشل ئامار، کانارلاگ، کانارخاچ، کامیرگوخ، سادون چی، سایرانس، سیچانلو (ئافتونا)، سوریك تەلیك (تەلەك) کە هۆز و خێڵەکانی زوکوری، نورتولوو، ڕەشی، ڕۆژکی، سیپکی، حەسەنی لەوێن.

٦ـ ناوچەی شائومیان (تا ١٩٦٦ ناوی زەنگی باسار و پێش ئەوەیش ناوی ناوچەی ئارتاشات بووە) ئەچیرلووی سەر و خوار و هۆز و خێڵەکانی بروکی.

٧ـ ناوچەی ئەچمیادزین لە گوندەکانی ئایارلو، کوروکیند (کیوروکیند) کە هۆز و خێڵەکانی شەرکی، دیڤنا تێیاندا دەژین. (٦) هەروەها لە هێندێك لە گەڕەکەکانی یەریڤان وەك جەردیش، ئاوان، چوارباغ و مەلاتییە بەزۆری کوردەکان نیشتەجێن.[٧]

لە کتێبی «پەیوەندی نێوان کورد و ڕووسیا»دا جێگای ژیانی کوردەکانی ئەرمەنستان بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری کراوە:

لە ناوچەکانی ئەباران، ئەشتەرناك، ئەرتەشات، ئەرتی، ڤێدین، باسارگێچار، دیلیژان، کۆتایك، ئۆکتێمبێریان، تالین، ئێچمیادزێ، لەگەڵ یەریڤان و هەندێك شاری تری ئەرمەنی. هەروەها لە ناوچەی نەخچەوان، کە کۆمارێکی خاوەن ئۆتۆنۆمییە و لەناو سنووری بەڕێوەبەرایەتی ئەرمینیا دایە.[٨]

**• ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی ئەرمەنستان**

کوردەکانی ئەرمینیا هەرچەندە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی تایبەتیان نەبوو، بەڵام حکومەتی ئەرمینیا هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە بایەخی بە کورد و کەمایەتییە نەتەوەییەکانی تر داوە. لە ساڵی ١٩٢١ دا کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمینیا بەشی کەمایەتی نەتەوەیی دروستکرد کە ڕۆڵێکی باشی لە ڕێکخستنی ژیانی کورد و چاککردنی پەیوەندی نێوان کورد و ئاسوری و ئەمەرن و کەمایەتییە نەتەوەییەکانی تردا بینی. لە ساڵانی ١٩٢٦ _ ١٩٢٧ دا کورد، کە ١٪ی دانیشتووانی ئەرمینیای پێکدەهێنا، ٥٪ی زەوییان بەسەر دابەشکرا و لە دواییشدا گەیشتە ٢٠٪. جگە لەوەی لە باجدانیش ڕزگار کران.(٩)

کوردەکانی ئەرمەنستان بە گشتی گوندنشینن و خەریکی کاری ئاژەڵداری و وەرزێرین. بەشێکیشیان بەتایبەت خوێندەوارەکانیان لە شاری یەریڤان یان شارەکانی گومریە، سیڤان، ئارتاشاك، ئاشتراك، خەریکی کارە ئیدارییەکانن یان لە بازاڕەکاندا خەریکی پیشەی جۆراوجۆرن.[١٠]

**• پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی کوردەکان لە ئەرمەنستان**

لەم بارەیەوە دەبێ بڵێین کە کوردەکان هەم پێوەندییەکی باشیان لەنێوخۆیاندا پێکەوە هەیە و هەمیش لەگەڵ ئەرمەنەکان.

**ئا ـ پێوەندییەکانی نێوان کوردەکان:**

هەروەك باس کراوە لە ئەرمەنستان کوردەکان بە یەزیدی و موسوڵمانەوە پێکەوە دەژین. لە ڕابردوودا پێوەندییەکانیان پێکەوە زۆر باش نەبوو، بەڵام ئێستا کۆتایی بەم بابەتە هاتووە و لە شادیی و شیوەندا پێکەوەن و ...

**ب ـ پێوەندییەکانی نێوان کوردەکان و ئەرمەنییەکان:**

کوردەکان و ئەرمەنییەکان پێوەندیی زۆر باشیان پێکەوە هەیە و لە بنەڕەتدا پێوەندیەکانی نێوان کورد و ئەرمەن خاوەن زۆر خاڵی هاوبەشە. هەردوو نەتەوەکە خاوەن بەسەرهات و ئازاری مێژوویی هاوشێوەن. لەباری مێژووییشەوە دەتوانرێ لێکچوونی زۆر لە شوێنە مێژووییەکانیاندا ببینرێ. قەڵای یەریڤانی کۆن کە پێشینەیەکی ٢٧٠٠ ساڵی هەیە، دەتوانرێ لەگەڵ قەڵا مێژووییەکانی کوردستان بۆ نموونە لە دیاربەکر، وان یان هەولێر بەراورد بکرێ. هەروەها هەردوو نەتەوەکە لە ڕەسەنترین نەتەوەکانی ناوچەکەن و خاوەن دابونەریتی تایبەت بە خۆیانن.

عومەر سەردار نووسەری ناسراوی کوردی ئەرمەنستان، کە خاوەن چەندین بەرهەمە و ئێستا سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان لە ئەرمەنستانە، لە وەسفی دۆستایەتیی نێوان نەتەوەکان دەڵێ:» نەتەوەیەك کە خاوەن کولتوورێکی دەوڵەمەند بێت، هەرگیز لە پێکەوەژیان لەگەڵ خەڵکی دیکە ناترسێت، بەڵام ئەو نەتەوانەی مێژوویەکی ڕوونیان نیە و ڕۆشنبیرەکانیان تەواوی هەوڵیان بۆ مێژوو سازکردن بێت، بەردەوام لە دڵەڕاوکێ دان و خەریکی بیانوو دۆزینەوە و دروستکردنی قەیران بە دژی نەتەوەکانی دیکەن. ناوبراو گوتی: هەم کوردەکان و هەم ئەرمەنەکان لەو نەتەوانە نین کە لە پێکەوەژیان لەگەڵ یەکتر یان نەتەوەکانی دیکە بترسن. وەك ئەوەیکە هێندێك لە نەتەوەکان ئەنجامی دەدەن.«

ڕۆستەم جاسم مامۆستای زانکۆی یەریڤان و یاساناسی کورد کە خۆی بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی شەشەمی ئاپریلی ئەو وڵاتە کاندید کردبوو و حیزبەکەیان ٣٦ کورسی بەدەست هێنابوو، بەم شێوەیە باسی لە کۆمەڵگەی ئەرمەنستان دەکرد: « ئەرمەنستان کۆمەڵگەیەکی ڕۆشنبیرە. هەربۆیە ئەرمەنییەکان و کوردەکان پێکەوە دەسازێن و لەم دوو ساڵی دواییدا سەرۆك کۆماری ئەرمەنستان بەشداریی لە ڕێوڕەسمی نەورۆزی کوردەکاندا کردووە.

لێرەدا ناکرێت باسی ڕوانگەی پێکهاتەی سۆسیالیستی لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ نەتەوەکانی ئەو وڵاتە لە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو نەکرێت. ڕووسەکان ڕۆڵێکی ئەرێنیان لە پێکەوەگونجانی نەتەوەکان پێکەوە بە میرات جێهێشتووە. هەردوو نەتەوەکە، ڕووس نەك وەك نەتەوەیەك بەڵکوو وەك کولتوورێکی دەوڵەمەند سەیر دەکەن چونکە لە ڕووسیای سۆسیالیستیدا ڕێز لە مافی نەتەوەکان دەگیرا. ڕووسەکان هیچکات نەتەوە و زمانەکانی دیکەیان بە مەترسی بۆ سەر نەتەوەکەی خۆیان نەدەزانی، بەڵکوو دەرفەتی پەرەپێدانی کولتووری نەتەوەیی خۆیانیان پێدەدان و لە سایەی ئەم ڕوانینەدا کولتوورە بچوکەکان گەشەیان دەکرد.»

دوو گۆرانیبێژی ئەرمەنی کە هیچ کامیان لەژیاندا نەماون، وەك هێمای یەکێتیی و برایەتی نێوان کورد و ئەرمەن دەناسرێن. «کارابیت خواچو» و «ئارام تیگران» کە تەواوی تەمەنی خۆیان لەڕێی ئاوازی کوردیدا بەسەر برد. دەنگی ئەم هونەرمەندانە لای ملیۆنان کورد دەنگێکی ئاشنایە. ئەم دوو هونەرمەندانە ژیان خۆیان و خزمەکانیان بە قەرزداری کوردەکان دەزانی لەبەرئەوەی لەدەست تورکە عوسمانییەکان ڕزگاریان کردبوون...

شەڕەکانی ساڵی ١٩٩٤ی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان بوونە هۆی کوژران و کوشتاری بەکۆمەڵی کورەکانی ناگۆرنوقەرەباغ. هێزە ئازەرییەکان، کوردەکانیان کردە سپەری بەڵا و هێڵی پێشەوەی شەڕ و هێزەکانی ئەرمەنییش کوردەکانیان کۆمەڵکوژ کرد. چونکە شوێنی تێکهەڵچوونەکەیان بە گشتی ناوچە کوردنشینەکان بوون. چارەنووسی ڕووداوەکانی لاچین و کەلباجار لە ناگۆرنوقەرەباغ کە سەردەمێك بە کوردستانی سوور ناسرابوو، شەڕی چاڵدێرانی نێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و سەفەوی بەبیر دەهێنایەوە. کوردەکانی ئەرمەنستانی بەم بابەتە زۆر هەستیار بوون و لاوانی کورد خۆیان لە چوونە

سەربازی (عەسکەری) دەبوارد و لەو ساڵانەدا بە هەزاران لاوی کورد لەگەڵ بنەماڵەکانیان بەرەو ڕووسیا کۆچیان کرد و ئەمەش زیانی بە حەشیمەتی کوردەکان لە ئەرمەنستان گەیاند.[١١]

● **چالاکیی ڕۆشنبیریی و سیاسیی کوردەکانی ئەرمەنستان**

لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان ئەرمینیا بوو بە ناوەندێك بۆ گەشەکردنی کەلتوور و ڕۆشنبیریی کورد لە یەکێتی سۆڤێتیدا. ئەوە بوو چینێك لە ڕۆشنبیرانی کورد دروست بوو لە ماوەی ١٥ ساڵدا کە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە پەرەپێدانی کەلتوور و ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد، هەروەها ژمارەیەکی زۆریان لە کتێبی قوتابخانە و ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی بە زمانی کوردی لەچاپ دا لە ساڵی ١٩٢١ تا ساڵی ١٩٢٩، کە ئەلف‌ءبێی ئەرمینیان بەکار دەهێنا لە نووسینەوە ئەدەبی کوردی کە ئەم ئەلف‌ءبێیەش دانرا بوو لەلایەن (ئاکوب کازاریان) پسپۆڕ لە ئەدەب و زمانی کوردیدا و بە جۆرێك دانابوو بگونجێت لەگەڵ داواکاری و پێویستییەکانی زمانی کوردی، لە ساڵی ١٩٢٩ بۆ چاپکردنی بەرهەمە ئەدەبیەکانی کورد ئەلفوبێی لاتینیان بەکار دەهێنا ئەمەش بە بڕیارێکی حکومەتی ئەرمینی، ئەم ئەلفوبێیەش لەلایەن نووسەری کورد و کەسایەتی کۆمەڵایەتی (عەرەب شامیلۆف) و (ئیساك مورروغلووف)ی ئاشوورییەوە دانرا. لە کانوونی دووەم و شوباتی ساڵی ١٩٢٢ کوردەکان بەشداریان کرد لە دەستەی باڵای تەشریعیی دەوڵەت لە کۆنگرەی یەکەمی ئەرمینیای سۆڤێتی، لەو کۆنگرەیەشدا دەستووری کۆمارەکە پەسەند کرا، کە لەو دەستوورەدا هاتووە (هەموو ئەوانەی لەم وڵاتەدا دەژین خاوەنی مافەکانیانن بە یەکسانی و بەبێ جیاوازیی نەتەوەیی و ئایینی) لە چوارچێوەی ئەرمینیای سۆڤێتیدا. هەروەها کار و چالاکیەکی زۆر و بەرفراوان ئەنجام درا لەو کۆمارە بە مەبەستی زیادبوونی

کاری سیاسی و باشترکردنی کەلتوور و ڕۆشنبیری کەمە نەتەوایەتییەکان و شێوازی ژیانیان.

لە ساڵی ١٩٢١ کتێبی خوێندنی قوتابخانە بە زمانی کوردی دانرا، لەگەڵ پێگەیاندنی مامۆستایان و کردنەوەی قوتابخانە لە گوند و لادێ کوردەکان کە هەر لەو ساڵەدا (٥) قوتابخانە کرایەوە، لە ساڵی ١٩٢٥ ژمارەی قوتابخانەکان گەیشتە ١٠ قوتابخانە و لە ساڵی ١٩٣٠ گەیشتە ٢٧ قوتابخانە. لەو کاتەدا دەستیان کرد بە نەهێشتنی نەخوێندەواری لەنێو دانیشتووانی کوردە بەتەمەنەکان.

لە سەرەتای حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٤ دەستەی سەرۆکایەتی لیژنەی ناوەندیی حزبی شیوعی لە ئەرمینیا دەستی کرد بە تاوتوێکردنی پرسی کارکردن لەنێو کوردەکاندا. هەروەها پێشنیاری کرد بۆ لیژنەکانی قەزای (لینین ئاکان) و (زمیادزین) کە لە چوارچێوەیەکی بەرفراواندا کوردەکان بەشدار بکەن لە کارەکاندا و بەردەوام بوون لە کار و پرۆژەکانیان وەکو دروستکردنی قوتابخانە و کاری زۆرتری ڕێکخراوە حکومی و هەرەوەزییەکان لەنێو دانیشتووانی کورددا. هەموو ئەم پلان و پرۆژانە ڕۆڵیان هەبوو لە هۆشیاری نەتەوایەتی لەلای کورد و گەشەکردنی و بەشدارییان لە ژیانی سیاسی وڵاتدا.

لە ساڵی ١٩٣١ پەیمانگای هونەری پەروەردەی کوردی کرایەوە لە یەریڤان و چەندین خول ئەنجام درا بۆ پێگەیاندنی مامۆستایانی کورد لە یەریڤان بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی پەروەردەی کوردەکان. ئەو کۆنگرە گشتییەی (کوردناسەکان ـ کوردۆلۆجیا) کە لە ساڵی ١٩٣٤ بەسترا لە ئەرمینیا ڕووداوێکی گرنگ بوو لە کەلتوور و ڕۆشنبیری تازەپێگەیشتووی کورد. ئەم کۆنگرەیە دەرگای کردەوە لەسەر توانا نوێیەکان بۆ توێژینەوەی زانستی و لێکۆڵینەوە. هەروەها کۆنگرە گفتوگۆی کرد لەسەر بابەتی باشترکردنی توانای زمانی کوردی ئەدەبی و پەرەپێدانی ئەدەبی کوردی لە پەیوەندییە هاوبەشەکانی لەگەڵ زمان

و ئەدەبی ئـەو کوردانـەی کـە لـە دەرەوەی یەکێتـی سـۆڤیەت نیشـتەجێن.

لـە بیسـتەکان و سـییەکان ژمـارەی بەرهەمی ئەدەبی و شـاعیرە کـوردەکان زۆرتر بـوو ئەگـەر ژمـارەی کتێبـە ئەدەبـی و سیاسـی و فێرکارییـەکان بـە زمانـی کـوردی گەیشـتبێتە ٣٢ ناونیشـان لـە سـاڵی ١٩٢٢، ئـەوا لـە سـاڵی ١٩٣٧ ژمـارەی گەیشـتە ٧٠ ناونیشـان. هەروەهـا بەرهەمـی ئەدیبـە کـوردەکان بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ لەچاپ دەدرا لـە مۆسـکۆ، زۆرتـر بـوو، هەروەهـا وەردەگێـڕدرا بـۆ سـەر زمانـی ئۆکرانـی و جۆرجـی و ...هتـد.

لـە هەمـان کاتـدا هونـەر و مۆزیکـی کوردی گەشـەی کرد لـە ئەرمینیا. لە سـاڵی ١٩٣٨ تیپـی شـانۆی کوردی گەڕۆك دامـەزرا لە ناوچەی (ئالاگـز)، لە ماوەی چەند ساڵێکیشـدا چەندیـن فیلمـی بەڵگەنامەیـی و هونەری دەرکـرا لە سـەر ژیانی کورد وەکـو (زاری ـ١٩٢٦) و (کـوردە یەزیدیەکان ـ ١٩٣٣) ...

هەروەهـا ڕادیۆکـە پەخشـی بەرنامەکانـی خـۆی دەکـرد بـە شـێوەی خولـی لـە کۆمارەکـە و ئەدیبەکانـی کـورد کاریـان دەکـرد وەك بەشـێك سـەر بـە یەکێتـی ئەدیبەکانـی ئەرمـەن، لـە سـاڵی ١٩٣٠ ڕۆژنامـەی (ڕێیا تـازە) لە یەریڤـان دەردەکرا، کـە تیشـکی دەخسـتە سـەر زۆربـەی لایەنـە جیاوازەکانـی کۆمەڵایەتـی و سیاسـی و ڕۆشـنبیریی کـورد لـە ئەرمینیـا و چەندیـن نـووسراو و وتـاری بـڵاو دەکـردەوە لەسـەر خەبـات و تێکۆشـانی ئازادیخـوازی نەتـەوەی کـورد لـە دەرەوە. لـە سـاڵی ١٩٣٢ یەکـەم کۆنگـرەی (کوردۆلۆجیـن ـ کوردناسـان) لـە یەکێتـی سـۆڤێت لـە یەریڤـان بەسـترا کـە چەنـد ڕێنماییەکـی گرنگـی دەرکـرد بـۆ پەرەپێدانـی کەلتوور و ڕۆشـنبیری کـورد.(١٢)

دەبێ لێرەدا ئامـاژە بەوە بکەیـن ئەو شـەپۆلە تیرۆر و چەوسـاندنەوەی سـاڵانی سـییەکان کـە لەلایـەن یەکێتـی سـۆڤێتەوە دژی کـورد کـرا، کاریگەریـی زۆریشـی لەسـەر پێشـکەوتنی کەلتـوور و ڕۆشـنبیریی کـورد لـە ئەرمینیـاش هەبـوو کـە

پێشـتریش باسـی کـرا. بەڵام لـە چلەکان بـەدواوە و بە تایبـەت دوای مردنی سـتالین بـارودۆخ گـۆڕا و ڕۆژنامە و ڕادیۆ دەسـت بـەکار بوونەوە و لە زۆر بواری دیکەشـدا گۆڕانکاریـی بەلایەنـی ئەرێنیـدا هاتـە کایـەوە.

جێـی خۆیەتـی لـە کۆتایی ئەم باسـەدا ئاماژە بـە کۆمەڵە و ڕێکخراوە سیاسـی و ڕۆشـنبیرییەکانی کـوردی لە ئەرمەنسـتان بکەین.

لـە کتێبـی «پەیوەندی نێـوان کورد و ڕووسـیا» ناوی سـێ کۆمەڵەی ڕۆشـنبیریی کـوردی ئەرمەنسـتان بـەم شـێوەیە هاتووە:

١. کۆمەڵەی ڕۆ (ڕۆژ)

٢. کۆمەڵەی تایبەت بە یەزیدییەکان

٣. ئەنجومەنی ڕشنبیرانی کورد

ئەنجومەنـی ڕۆشـنبیرانی کـورد لـە سـاڵی ١٩٩٢ دا لە ئەرمینیـا دامـەزرا. نوێنەرانی کـوردی یەریڤـان، ئێچمیـادزێ، ئەراگاتـس، تالیـن (نـەك تاللینـی پایتەختـی ئیسـتۆنیا)، ئەنتـەراك و ئەرمافیزلـە دەسـتەی نووسـەرانی ڕۆژنامـەی ڕێیاتـازە لـە یەکـەم کۆبوونـەوەی دامەزراندنـدا بڕیاریـان دا خەبـات لـە پێنـاوی پەرەپێـدان بـە کولتـووری نەتەوەیـی، پاراسـتنی ژیاریـی نەتەوەیی و زمـان، هەروەهـا خەبات لەبۆ بەهێزکـردن و پاراسـتنی پەیوەنـدی برایانـەی نێـوان کـورد و ئەرمـەن و نەهێشـتنی ناکۆکـی ناوخـۆی کوردواتـە لە نێوان کـوردی موسـوڵمان و یەزیدیدا بـکات... [١٣]

- **یادێك لە ڕادیۆی کوردیی یەریڤان (ئێرەوان):**

لـە سـەردەمی شـەڕی سـارد لەنێـوان دوو زلهێـزی جیهـان واتـە ئەمریـکا و سـۆڤیەت، لـە یەکێـك لـە کۆمـارە بچووکەکانـی سـۆڤیەت بـە نـاوی ئەرمەنسـتان و لـە پایتەختەکـەی واتـە یەریڤـان (ئێـرەوان)، لـە سـەرەتاکانی سـاڵی ١٩٥٥ی زایینی بەشـی کوردیـی ڕادیـۆی یەریڤـان دەسـتی بـە بڵاوکردنـەوە کـرد. لـەو سـەردەمەدا

ڕادیـۆی ئەرمەنسـتان بێجگـە لـە زمانـی ئەرمەنـی بەرنامـەی بـە هیـچ زمانێکـی دیکـە نەبـوو تـا ئـەوەی بەرنامـەکان بـە زمانەکانـی کـوردی و عەرەبیـش بـڵاو بوونـەوە. بەشـی کـوردی لـە سـەردەمی دەسـەڵاتدارێتیی خرۆشـچۆف بە هـەوڵ و ماندووبوونـی کەسـانێکی وەك حاجـی جونـدی، جاسـم جەلیل، خەلیـل مرادۆف و ئەمینێ عـەوداڵ دامـەزرا. جاسـم جەلیـل یەکەمیـن بەرپرسـی بەشـی کوردیـی ڕادیـۆی ئێـرەوان بـوو، دوای ئـەو خەلیـل مـرادۆف بـۆ مـاوەی ٢٤ سـاڵ، لـە سـاڵی ١٩٥٧ تـا ١٩٨١ سەرپەرشـتی بەشـی کـوردی بـوو. بەشـی زۆری ئـاواز و گۆرانییـە کوردییـەکان لـە سـەردەمی بەرپرسـایەتیی ئاوبـراودا بەرهـەم هێنـران و تۆمـار کران. هاوسـەرەکەی ئەزنیفـە ڕەشـید دوای چەنـد سـاڵ بێـژەری، لـە سـاڵی ١٩٨٢ بەهۆی چوونەسـەری تەمـەن و پیـری، دەسـتی لـە کاری بێـژەری هەڵگـرت.

لـە سـەردەمێکدا کـە خەلیـل مـرادۆف سـەرۆکی بەشـی کوردیـی ڕادیـۆ بـوو، هونەرمەندانـی وەك کارابێـت خاجـۆ، ئـارام تیگران، سـەیدا شـەمدین، خانـا زازێ، شـیروئە بیـرو، فاتمـە عیسـا، ئاسـلیکا قـادر و ... بـە دەنگـی دڵبزوێنی خۆیـان زیاتر سـەرنجی گوێگرانیـان بـۆلای ڕادیۆکە ڕادەکێشـا.

ئەمـە یەکەمیـن ڕسـتەیەکە بـۆ یەکـەم جـار لـە سـاڵی ١٩٥٥ لەلایـەن یەکەمیـن بێژەرانـی ڕادیـۆ، حاجـی جونـدی و زینـوا ئیـوا بە گوێـی گوێگرەکان گەیشـت.

ڕادیـۆ لە سـاڵی ١٩٦١دا کێبرکێیەکی بۆ بێژەران وەرێخسـت کـە ٢٥ لاوی کورد تێیـدا بەشـدار بـوون. ئەزنیفـە ڕەشـید و سێڤاسـا عەبـدۆ وەك بێژەرانـی ژن و کەرەم سـەییاد و سـیدار ئەمیـن وەك بێژەرانی پیاو، هەڵبژێـردران. سـیدار ئەمین ئەگەرچی خـاوەن دەنگێکـی بـاش بـوو، بـەڵام تەنیـا سـاڵێك لـە ڕادیـۆدا کاری بێـژەری کـرد چونکـە شـارەزایی لە زمانـی کوردیدا کـەم بوو.

بەڕێوەبەرانـی ڕادیـۆ دەنگـی ئێـرەوان لە ماوەی سـاڵانی بڵاوبوونەوەیدا، جاسـم جەلیـل، خەلیـل مـرادۆف، ئەحمەد گوگە، ئیتال کـەرەم بوون و لە ئێستاشـدا کەرەم

سەییاد سەرپەرشتیی ڕادیۆکەیە.

جەمیلە جەلیل کچی جاسم جەلیل کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە ڕادیۆکەدا بەپرسی بەشی کولتووری و هونەری بووە، ساڵی ٢٠١١ لە چاوپێکەوتن لەگەڵ یەکێك لە ماڵپەڕە کوردییەکان، لەمەڕ بەرنامەکانی ڕادیۆی کوردی یەریڤان دەڵێ: «بەرنامە سەرەکییەکانی ڕادیۆ هەواڵەکان و شرۆڤەی بابەتە گرنگە سیاسییەکان و هەروەها سیاسەتی دەوڵەتی شۆڕەوی (سۆڤیەت) بوو. هەواڵەکان بە زمانی ڕووسی لە مۆسکۆوە دەهاتن و لە ڕادیۆ لەلایەن کارمەندەکانی بۆسەر زاراوەی کوردیی کرمانجی وەردەگێردران و بڵاو دەکرانەوە. لە ئەرمەنستان ئاژانسێکی هەواڵدەری هەبوو، هەواڵمان لەویش وەردەگرتن و ئەو ڕووداوە گرنگانەی کە لە ئەرمەنستان دەهاتنە پێشەوە، لە ڕادیۆ باسیان دەکرا و بڵاو دەبوونەوە. ڕۆشنبیرەکانی ئێمە بابەتیان لەسەر گوندەکان و ژیانی کوردەکان، لەبارەی کرێکاران و کەسانی سەرکەوتوو کە توانیبوویان پلەکانی سەرکەوتن ببڕن، دەنووسی و ئێمە دوای هەڵسەنگاندن بڵاومان دەکردنەوە. بەڵام کاری زۆر گرنگی ڕادیۆ تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی مۆسیقا و گۆرانی کوردی بوو کە لایەنگری لە هەموو بەشەکانی دیکە زیاتر بوو. ئێمە دەچووینە ئەو گوندانەی کوردەکانی لێ نیشتەجێ بوون و دەنگی ئەو کەسانەمان تۆمار دەکرد کە ئاواز و گۆرانی کوردییان دەزانی و بە دەنگی خۆی دەیانگوت، دواتر لە ڕادیۆ بڵاومان دەکردەوە.»

دوای هەڵوەشانی یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١ و سەرهەڵدانی کێشە و گرفتە ئابوورییەکان و بێکاری، خەریك بوو ڕادیۆ دادەخرا. کارمەندەکانی توانای کۆکردنەوەی مووچەیان نەبوو، زۆربەیان ڕادیۆیان بەجێهێشت. دەوڵەتی ئەرمەنستانیش ئیتر توانای دابینکردنی دارایی بەرنامەکانی نەبوو. لە ئاکامدا ماوەی بڵاوبوونەوەی بەرنامەکان بە زمانی کوردی لە کاتژمێر و نیوێك، بۆ کاتژمێرێك لە ساڵی ١٩٩٥ و دواتر بۆ ٤٥ خولەك لە ساڵی ١٩٩٦ و دواتر بۆ نیو

کاتژمێر تا ئەمڕۆ کەم کرایەوە. لە ئێستادا ژمارەی کارمەندانی ڕادیۆ، تەنیا شەش کەسە. کەرەم سەیاد لەم بارەوە دەڵێ: ڕادیۆی کوردی هەتا دەیەی نەوەدی زایینی کاتژمێر و نیوێك بەرنامەی هەبوو بەڵام بەهۆی کێشەی ئابووری ئێستاکە ئێمە بۆ ماوەی نیو کاتژمێر بە کوردی بەرنامە بڵاو دەکەینەوە. ئەو هەروەها دەڵێ: نە تەنیا بەشی کوردی بەڵکو پەخشی ڕادیۆ بە زمانەکانی دیکە و تەنانەت زمانی ئەرمەنییش، لە ماوەی بەرنامەکانیان کەم کراوەتەوە.

ڕادیۆی نەتەوەیی ئەرمەنستان هەنووکە بە ١٢ زمان و یەك لەوان زمانی کوردی بڵاو دەبێتەوە. بەشی کوردیی ڕادیۆی یەرێڤان ئێستاکە بە سەرپەرشتیی کەرەم سەیاد و کچەکەی بە ناوی لەیلا کەرەم و کوڕەکەی بە ناوی تیتال کەرەم و هەروەها سیما سەمەند و هێندێك کاتیش جەمیلە جەلیل کچی جاسم جەلیل، هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی نیو کاتژمێر بڵاو دەبێتەوە.

کەرەم سەیاد کە بۆ ماوەی ٤١ ساڵ لە ئێزگەی ڕادیۆدا کاری کردووە، بەم شێوەیە باسی ساڵەکانی سەرەتای دامەزراندنی ڕادیۆ دەکات: لەنێو کوردەکانی ئەرمەنستان هەمو کەسێك خاوەنی ڕادیۆ نەبوو. لە گوندی ئێمەدا تەنیا ڕادیۆیەك هەبوو کە بە بڵێندگۆیەکی تارادەیەك گەورە لە ناوەندی ئاوایی پێوەند درابوو و خەڵك لە کاتی دەسپێکردنی هەواڵەکان و بەرنامەکانی دیکە، لە دەوری کۆ دەبوونەوە و بە زەوق و خۆشییەکی زۆرەوە گوێیان لێ دەگرت.

لە ساڵی ١٩٥٥ تا ساڵی ١٩٦١ ڕادیۆ هەر هەفتە سێ جار و هەر جارەش بۆ ماوەی ١٥ خولەك بەرنامەی بڵاو دەکردەوە. تا سەرەنجام لە یەکی ئاوریلی ١٩٦١ بە بڕیاری کۆمیتەی ئیجرایی حیزبی کۆمۆنیست و بە پێشنیاری مەلا مستەفا بارزانی کە پێشتر سەردانی بەشی کوردیی ڕادیۆ ئێرەوانی کردبوو و بەڵێنی بە بەرپرسانی ڕادیۆ دابوو کە لەلای سەرکردەکانی سۆڤیەت باسی زیادکردنی ماوەی بڵاوبوونەوەی ڕادیۆ دەکات، و لە ئاکامدا ماوەی بڵاوبوونەوەی ڕادیۆ بوو

بە کاتژمێر و نیوێك. هەروەها شەپۆلەکانی ڕادیۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤین و زۆربەی کۆمارەکانی سۆڤیەتی دەگرتەوە، ڕادیۆ لە ماوەی چەند ساڵدا لەنێو کوردە کرمانجی زمانەکانی ناوچە کوردنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا لایەنگرانێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و بیسەرانیش بە ناردنی نامە و دواتریش بە پێوەندیی تەلەفۆنی، پێوەندییان بە ڕادیۆوە دەگرت. بەشی کوردی کولتووری و هونەری ڕادیۆ کە وتووێژی لەگەڵ گۆرانیبێژان دەکرد و گۆرانییەکانی بڵاو دەکردنەوە، توانیووی لایەنگری زۆر بۆلای خۆی ڕابکێشێ.[١٤]

## ● سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ دووەم

١. ارمنستان/http://fa.wikipedia.org/wiki/.

٢. کەریم، ڕەمەزان، واقیعی کورد لە ئەرمەنستان، وەرگیراو لە: pukmedia.com/KS_Direje.aspx?Jimare=17873، ڕێکەوتی 27/8/2013.

٣. کەریم، ڕەمەزان، س.پ.

٤. کۆمەڵێك نووسەر، گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە. م. گۆمەیی. سوید. ٢٠٠٢. ل٣٥٨.

٥. کەریم، ڕەمەزان، س.پ.

٦. هەورامی، د.ئەفراسیاو، کوردستانی پشت قەفقاس، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ١٨ ـ ١٩.

٧. صوفی زادە، هادی، سفری بە میان کردهای ارمنستان، وەرگیراو لە: www.akhbar-rooz.com/article.jsp?essayId=45459، ڕێکەوتی 10/5/2012.

٨. عەلی، ئارام، پەیوەندی نێوان کورد و روسیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی لیرە، سلێمانی، ١٩٩٩. ل ١٦٥.

٩. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٥١ و ١٥٤.

١٠. صوفی زادە، هادی، س.پ.

١١. صوفی زادە، هادی، س.پ.

١٢. لازاریف، م.س، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٠٤ـ٤٠٦.

١٣. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٦٨.

١٤. یادی از رادیو کردی ایروان، ترجمە از انگلیسی و کردی کرمانجی: محمد أتشزای، (http://kurdpress.ir/Fa/NSite/FullStory/Print/?Id=42294،6/1/1392

## • سێیەم: کوردەکانی گورجستان (جۆرجیا)

- چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی گورجستان
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ گورجستان
- ژمارەی کوردەکانی گورجستان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە گورجستان
- چالاکیی ڕۆشنبیریی و سیاسیی کوردەکانی گورجستان
- ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی گورجستان
- سەرچاوەکان

### • چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی گورجستان (جۆرجیا)

ئەم وڵاتە بە ڕووبەری ٦٩٧٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشە و حەشیمەتی نزیك بە ٥ ملیۆن کەس لە باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش و لە ناوچەی قەفقازی باشوور هەڵکەوتووە. لەگەڵ وڵاتانی تورکیا، ئەرمەنستان، ڕووسیا و ئازەربایجان دراوسێیە و دوای کۆماری ئازەربایجان لەباری ڕووبەر و حەشیمەتەوە دووەمین کۆماری قەفقازیای باشوورە.

ئەم وڵاتە سیستەمی کۆماری هەیە و ئایینی زۆربەی خەڵکەکەی مەسیحی

ئەرتەدۆکس و زمانیان گورجییە. کۆماری خودموختاری ئاجاریا بە ڕووبەری ٣ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە لە بەشی باشووری لێواری دەریای ڕەش لەنێو ئەم وڵاتە دایە. پارێزگای خودموختاری ئوستیای باشووریش بە پانتایی ٣,٩ هەزار کیلۆمەتر لە داوێنەکانی باشووری قەفقازیای گەورەش هەر لەناو پێکهاتەی کۆماری گورجستان دایە.

وڵاتی گورجستان بۆ ٨ پارێزگا، ناوچەیەکی خودموختار لە ئوستیای باشوور بە ناوەندێتی تسخینوای و دوو کۆماری خودموختار بە ناوەکانی ئاجاریا بە ناوەندێتی باتومی و ئابخازیا بە ناوەندێتی سوخومی دابەش کراوە. پایتەختەکەی شاری تفلیس و شارە گرنگەکانی بریتین لە کوتائیسی، روستاوی، گوری، پوتی، سوخومی، متسخنا، چیاتورا، تقیبولی، زوگدیدی، تسقالتوبو، تقوارچلی، گاگرا و تەلاوی.

لەباری سیستەمی پەروەردەییەوە یاسای بنەڕەتی گورجستان خوێندنی لە قوتابخانەکان هەتا پۆلی نۆ بەشێوەی بێبەرامبەر دیاری کردووە. هەروەها لە زانکۆ حکومییەکان، خوێندکاران لە ئیمکاناتی خوێندن بەهرەمەندن. لە گورجستان قوتابخانە بە زمانەکانی ڕووسی، ئەرمەنی، ئازەربایجانی و ئاسی و ئابخازی هەیە.

زمانی گورجی زمانی فەرمی و باوی خەڵکی گورجستانە کە زۆرترین قسەکەری لەنێو زمانە قەفقازییەکاندا هەیە. هەروەها یەکێك لە کۆنترین سیستەمەکانی نووسین خەتی گورجییە کە پێشینەیەکی درووودرێژی هەیە. ئەلف‌بێی گورجی نەتیجەی پەرەسەندنی ئەو ئەلف وبێی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە گورجستان باو بووە. ئەلف‌بێی گورجی ٣٣ پیتە کە لە ٥ پیتی دەنگدار و ٢٨ پیتی بێدەنگ پێك هاتووە و لە چەپەوە بۆ ڕاست دەنووسرێ.

بەپێی ئاماری ساڵی ٢٠٠٢ی زایینی، زۆربەی خەڵکی گورجستان (نزیکەی ٧٠٪) مەسیحیین و سەر بە کلیسای ئەرتۆدۆکسی گورجستانن.

دوای ئۆرتۆدۆکسەکانی گورجی، ئیسلام لە گورجستان وەك گەورەترین کەمایەتی ئایینی لەقەڵەم دەدرێت. حەشیمەتی موسوڵمانەکانی ئەو وڵاتە، لە ئازەربایجانییەکانی گورجستان و قەومەکانی دیکەی دانیشتووی ئەم وڵاتە و یەك لەوان ئاجاریا پێك هاتووە. هەروەها ڕووسەکانی دانیشتووی گورجستان و ئەرمەنییەکانی ئاپوستولیك و ژێرمەنەکانی پرۆتستان لە کەمایەتییەکانی تری ئەم وڵاتەن. گورجییەکان گەورەترین قەومی گورجستانن و لە تەواوی وڵاتدا بڵاو بوونەوە و دەسەڵاتی ناوەندییان لەدەست دایە. ئازەربایجانییەکانی گورجستانیش وەك گەورەترین کەمایەتیی قەومی گورجستان لەقەڵەم دەدرێن

لەباری سیاسییەوە: دوای سەربەخۆیی گورجستان لە ساڵی ١٩٩١، ئیدوارد شوارد نادزێ وەزیری دەرەوەی پێشووی یەکێتی سۆڤیەت، وەك یەکەمین سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە هەڵبژێردرا. گورجستان هەر لەو کاتەوە لەسەر کۆمارەکانی خودموختاری ئوستیای باشوور و ئابخازیا ناکۆکیی لەگەڵ ڕووسیا هەبوو. چونکە ڕووسیا ڕێگەی نەدەدا گورجستان دەسەڵاتی خۆی لەم دوو ناوچەیە پیادە بکات. بەڵام بەهۆی لاوازیی گورجستان و هەروەها نزیکایەتی دەوڵەتی ئەوکات -بە تایبەت خودی شواردنادزێ- لە ڕووسیا، ئەم وڵاتە ڕازی بوو کە دەست لە کاروبارەکانی کۆمارە خودموختارەکانی ئوستیای باشوور و ئابخازیا وەرنەدات و دژایەتی لەگەڵ ئامادەبوونی هێزەکانی ڕووسیا لەو دوو ناوچەیە نەکات.

بەڵام دوای شۆڕشی گوڵزەر لە ساڵی ٢٠٠٣ لە گورجستان کە بە پشتیوانیی ئەمریکا هاتە کایەوە و بوو بە هۆی وەلانانی دەوڵەتی نزیك لە ڕووسیا و هاتنەسەرکاری دەوڵەتی نزیك لە ڕۆژئاوا، میخاییل ساکاشویلی، بارودۆخی سیاسیی ئەم وڵاتە تووشی گۆڕان بۆوە. دەوڵەتی نوێ سیاسەتی دوورکەوتنەوە لە ڕووسیا و نزیك بوونەوە لە ڕۆژئاوا (بە تایبەت ئەمریکا)ی گرتەبەر. هەروەها

خوازیاری ئەندامبوون لە یەکێتیی ئورووپا و ناتۆ بوو.

لە گەلاوێژی سالّی ٢٠٠٨ سوپای گورجستان بۆ گەڕاندنەوەی ئوستیای باشوور بۆ سەر خاکی گورجستان، هێرشی کردە سەر ئەو ناوچەیە، کە لەگەلّ دژکردەوەی توندی ڕووسیا ڕووبەڕوو بۆوە و ناچار بە پاشەکشە کرا. ئێستا ڕووسیا تەنیا وڵاتێکە سەربەخۆیی دوو ناوچەی ئابخازیا و ئوستیای باشووری بە فەرمی ناسیوە و بە هۆی هەبوونی هێزەکانی لەم دوو ناوچانە، بە کردەوە کۆنترۆلّی ئەوانی لەبەردەست دایە....

لەباری ئابوورییشەوە وڵاتی گورجستان بەهۆی بەهرەمەندبوون لە ئیمتیازەکانی وەك هەلّکەوتی جوگرافی و ئاووهەوای گونجاو، هەبوونی کشتوکالّێکی پێشکەوتوو، کانگا و بەهرەوەگرتن لە پیشەسازی و سەنعەتی توریستی بە یەکێك لە دەولّەمەندترین کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو دەهاتە ئەژمار و خەلّکەکەی لە ژیانێکی ئیستانداردی بالاّ بەهرەمەند بوون. بەلاّم دوای لێکهەلّوەشانی سۆڤیەت لە سالّی ١٩٩١ی زایینی و ڕوودانی شەڕە نێوخۆییەکانی نێوان سالاّنی ١٩٩١ ـ ١٩٩٤ی زایینی ئابووریی گورجستان وەك وڵاتێکی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتوو، تووشی قەیرانی جیدیی بۆوە.

هەتا پێش سالّی ١٩٩١ی زایینی، گورجستان بەشێکی زۆر لە بەرویومەکانی خواردن و کشتوکالّی هەناردە دەکرد و یەکێك لە هەناردەکارە سەرەکییەکانی سەوزە، میوە، چا، مەشرووباتی کحولّی و دانەوێلّەکان بۆ گشت کۆمارەکانی تری سۆڤیەت بوو. دوای سەربەخۆیی، بازارە سوونەتییەکانی ئەم وڵاتە لەدەست چوون و ئاستی گشتی بەرهەمهێنانیش بە هۆی کێشە سیاسی و ئابوورییەکان دابەزی... [1]

- **سەردەم و هۆکاری کۆچ کردنی کوردەکان بۆ گورجستان**

زۆر بەڵگە هەن سەبارەت بەوەی کە کوردەکانی ئێستای جۆرجیا، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لەژێر گوشاری دەوڵەتی عوسمانی ڕایان کردووە، بەشێکی زۆریان لە خاکی ئەرمەنستانەوە تێپەڕیون.(٢)

کوردەکانی گورجستان بەشێك لە تایفە کوردەکانن کە لە سەردەمی عوسمانیدا شۆڕشیان دژی تورکەکان کردووە و دوای ئەوەی سەرکوت کراون، بەرەو وڵاتی گورجستان ڕایان کردووە.(٣)

بەپێی بەڵگە مێژووییەکان، کوردە یەزیدییەکان لە سەردەمی دەسەڵاتداریتیی سزاری گورجی لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٢ی زایینی لە یەکێك لە هۆزە کوردەکان، میزۆپۆتامیان جێهێشت و لە ئەرمەنستان نیشتەجێ بوون و دواتر بەرەو گورجستان کۆچیان کرد. لە دەیەی ١٧٦٠ ی زایینی کوردەکان لە بەرامبەر هێرشی عوسمانییەکان داوای یارمەتییان لە سزاری گورجستان (ئیراکلی دەیەم) کرد. سەرەتاکانی ١٧٧٠ سزاری گورجی لە نامەیەکدا بەڵێنی یارمەتیی هەمەلایەنەی بە ڕێبەری کوردەکان (چوبان ئاغا) دا و بۆ نەبەرد بە دژی دوژمنی هاوبەش (عوسمانی) بانگهێشتی کرد.

... لە ناوەڕاستەکانی سەدەی ١٩ بەدواوە ژمارەی کۆچبەرانی کورد لە گورجستان زیادی کرد و لە سەرەتای سەدەی بیستەم ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی وان و قارس و ناوچە کوردنشینەکانی دیکەی تورکیا بۆ دوورکەوتنەوە لە گوشاری دەسەڵاتدارانی عوسمانی و هەروەها حەزنەکردن بە هاتنەسەر ئایینی ئیسلام، ڕوویان لە جۆرجیا کرد.(٤)

- **ژمارەی کوردەکانی گورجستان**

بەپێی ئاماری ساڵی ١٨٩٧ی ئیمپراتۆریای ڕووسیا لە ویلایەتی تفلیس

(تبلیس) ٢٥٣٨ کورد ژیاون. زۆر بەڵگە هەن سەبارەت بەوەی کە کوردەکانی ئێستای جۆرجیا، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لەژێر گوشاری دەوڵەتی عوسمانی ڕایان کردووە، بەشێکی زۆریان لە خاکی ئەرمەنستانەوە تێپەڕیون. ژمارەیان لەسەرووی ٤٠ هەزارەوەیە.[٥]

بەپێی هەندێك لە سەرچاوە نافەرمییەکان نزیکەی ٤٠ هەزار کورد لە گورجستان دەژین کە زۆربەیان خاوەن ئایینی ئێزیدین و لە ئێراق، تورکیە، ئەرمەنستان و ئازەربایجانەوە بەرەو گورجستان ڕۆیشتوون.[٦]

حەشیمەتی کوردە موسوڵمان و یەزیدییەکانی گورجستان بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٢٦ی ئەم وڵاتە، ٢٥٠٢ کەس بووە، بەڵام دواتر ژمارەیان زیادی کردووە و ئێستاکە ژمارەیان نزیکەی ٤٠ هەزار کەس دەبێ کە زۆربەیان یەزیدین.[٧]

ئاماری سەرژمێری ساڵی ١٩٧٠ دەریخستووە کە ٢٠,٦٩٠ کورد لە گورجستان هەن و زۆربەیان لە شاری تەفلیسدا لە گەڕەکی کوردان دەژین. بەشی زۆر لە کوردی گورجستان و ئەرمینیا یەزیدین.[٨]

بەپێی ئەو زانیارییانەی کوردەکانی ئەم وڵاتە خۆیان باسی دەکەن، ژمارەی کوردی ئێزدی لە جۆرجیا پێشتر ١٠٠ هەزار کەس بووە، بەڵام بەهۆی خراپیی بارودۆخی ئابووری وڵاتەکەوە زۆربەیان بەرەو ئەورووپا و ڕووسیا کۆچیان کردووە. ئێستا نزیکەی چل هەزار کوردی ئێزدی لە جۆرجیا ماونەتەوە، کە زۆربەیان لە پایتەختدا دەژین.[٩]

- **شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە گورجستان**

لە گورجستان زۆربەی کوردەکان لە تفلیس ژیان بەسەر دەبەن. بەپێی هەندێك لە سەرچاوە نافەرمییەکان نزیکەی ٤٠ هەزار کورد لە گورجستان دەژین کە زۆربەیان خاوەن ئایینی ئێزیدین و لە ئێراق، تورکیە، ئەرمەنستان

و ئازەربایجانەوە بەرەو گورجستان ڕۆیشتوون و زۆربەیان لە شاری تفلیس پایتەختی گورجستاندا ژیان بەسەر دەبەن. ژمارەیەکیشیان لە بەخشی ئوستیای باشوور سەر بە گورجستان و هەروەها بە ڕادەیەکی کەمتر لە دوو کۆماری ئابخازی و ئاجاریی گورجستاندا بڵاو بوونەتەوە.[١٠]

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ، زۆربەیان ئێستا لە شاری تفلیس (پایتەختی جۆرجیا) جێگیرن و پێش گواستنەوەیان لە ١٩٤٤دا کوردەکانی جۆرجیا لە ناوچەکانی باشووری جۆرجیادا کە هاوسنووری تورکیان، واتە ناوچەکانی ئاخالتیسخ (میسخیتی)، (جەواخیتی)، ئادیگی، ئەسپیندزە، ئاخە کەلاك، بورچالین و لە گوندەکانی خۆیان منیادزە، ڕوستاوی، تسکالیتبالا، ناکەلاکفی، تسوند و ... هتد. بەپێی سەرچاوەکان، کوردە موسڵمانە سوننییەکان (جگە لە ئێزیدییەکان) لە ٢٢ گوندی میسخیتیدا دەژین.[١١]

- **چالاکی ڕۆشنبیریی و سیاسیی کوردەکانی گورجستان**

لەم بارەیەوە دەتوانین بڵێین ، شوێنپەنجەی کوردە ئێزیدییەکانی جۆرجیا بەسەر پێشخستنی کەلتوور و ئەدەبیاتی کوردییەوە دیارە. ژمارەی ناودارەکانیان کوردەکانی ئەرمەنستانی تێپەڕاندووە. سەلیم خان مۆسۆییێف وا ١٣ ساڵ زیاترە کە پەرلەمانتارە لە پەرلەمانی ڕووسیا. پرۆفیسۆری گەورەی کورد ئیڤانی عومەر فاریزۆڤ کە خاوەنی فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردیی «ڕۆناهی دیتی»یە لە ساڵی ١٩٥٧، ساڵانێکی زۆر لەوێ ماوەتەوە، پاشان بە دەیان ساڵ بەرپرسی بەشی پەیوەندییە ئابوورییەکان بووە لە ئینستوتی وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقای زانکۆی دەوڵەتیی مۆسکۆ.

زانای ناودار «پ. زەرا عەلی یوسۆپۆڤا» ئەوا چەند ساڵێکە سەرۆکایەتی بەشی کۆمەڵەی کوردناسی و سانت پتربورگ دەکات لە ئەکادیمیای زانیاری

رووسیا کە لە بواری ڕۆژهەڵاتناسیدا خەبات دەکەن، هەر لە بواری زانیاریدا هەر دوو زانای گەنج ساموێل کۆچۆیی و د. نۆداریێ ماسەکی کە کوردن، بە شانازییەوە کارەکانیان بەرەوپێش دەبەن.

«نازی شیرایا» کە پێشکەشکارە لە سێرکی مۆسکۆ، هەر لەوێ لەدایك بووە. کاتێك گرووپی سێرکی مۆسکۆ سەردانی وڵاتانیان دەکرد، لەسەر پۆستەری سێرکەکە تەنها وێنەی ئەو پێشکەشکارە کوردە دەبینرا کە هەمیشە بە جلوبەرگی کوردییەوە دەردەکەوتە پێش تەماشاچییەکانی، پاشان چەند (ئارتیست) هونەرمەندێکی تر لەدوای ئەوەوە پەیدا بوون، کە ناوبانگیان دەرکرد. سەرتیڤ مورادۆڤ عەزیزی بەشار عەسکەریان کە ئەمڕۆ هونەرمەندێکی گەلەری رووسیایە.

زینا ئەدۆ تالۆئەڤا دەنگبێژی کۆمەڵەی هونەری «ڕێزۆ» بوو، کە کۆمەڵەیەکی بەناوبانگیش بوو. ئاوازدانەری کورد، ئەوەی ئاوازی «ئێسترا دایێ کەرەمێ گەردەن زەری» داناوە، کارەکانی خۆی هەر لەو کۆمارەدا دەست پێکردووە. «دوبیرا تاریەل» و «ڕێزۆ برۆئەڤ» لە مۆسکۆ ناوەندی کەلتووری کوردیان دامەزراند و ساڵانێکی زۆر کارەکانیان بە سەرکەوتوویی بەڕێوە برد. بەهۆی ڕۆژنامەکەیانەوە کە ناوی «گۆلۆس کوردا» واتە (دەنگی کوردان) بوو، هەروەها بە زمانی ڕووسی مانگی جارێك لە مۆسکۆ دەردەچوو، میللەتی ئێمەیان بە خەڵکی سۆڤیەتی پێشوو و ڕووسیا دەناساند.[١٢]

کوردەکانی گورجستان لەنێوان ساڵانی ١٩٦٠ ـ ١٩٨٠ چەند حیزب و ڕێکخراوی کوردیان دامەزراند و ژمارەیەك ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیان دەرکرد، بەڵام دوای سەربەخۆیی گورجستان (ساڵی ١٩٩١) هەر چەشنە چالاکییەکی کوردەکان قەدەغە کرا و تەنانەت بەشی کوردیی ڕادیۆی گورجستان داخرا. ئەم بارودۆخە بە هۆی دەمارگرژیی زۆری ئیدوارد شواردنادزێ، سەرۆك کۆماری

گورجستان هاتە ئاراوە. ناوبراو لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتە بوو و دوای سەربەخۆبوونی گورجستان بوو بە سەرۆك کۆماری ئەم وڵاتە نوێیە.[١٣]

لە شەستەکان و حەفتاکانـدا لەدوای ئەرمینیا، جۆرجیا بوو بە ناوەندێکی گرنگی گەشەکردنی کەلتووری کورد لە یەکێتی سۆڤیەت... هەروەها تێبینی زۆربوونی خەڵکی ڕۆشنبیر دەکرا لە ئەندازیار و پزیشك و مامۆستا. خانەی چاپ و بڵاوکراوەکان کاری ئەدەبی کوردی زۆریان کرد. هەرەها چەندین لێکۆڵینەوە ئەنجامدرا لە پرس و بابەتەکانی کەلتوور و مێژووی کورد. لەگەڵ هەڵبژاردنی نوێنەرانی دانیشتوانی کورد لە ئەنجومەنە باڵاکانی سۆڤێتی لە ئەرمینیا و جۆرجیا[١٤]

بێجگە لە «یەکێتی ئافرەتانی کوردی گورجستان»، لە شوباتی ساڵی ١٩٩٠ دا لە تبلیسی پایتەختی گورجستاندا کۆمەڵەی کوردی ڕوناهی دروست بوو. ئەم کۆمەڵەیە پاراستن و بایەخدان بە فەرهەنگ و دابونەریتی کوردی و پتەوکردنی پەیوەندی نێوان کوردەکانی گورجستان و بەشەکانی تری بە ئەرکی خۆی دەزانی.

« لە بارودۆخی ئێستادا ئیزنی دەستێوەردان و چالاکیی لە کاروبارە سیاسییەکاندا بە کوردەکانی گورجستان نادرێت و تەنیا چەند ڕێکخراوێکی کولتووری و ڕۆشنبیرییان هەیە. کوردەکانی گورجستان هەتا ساڵی ١٩٩١ ڕەوشێکی ئاساییان هەبوو (ساڵی ١٩٩١، لێکهەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیەت و سەربەخۆیی گورجستان) و کەمینەیەکی چالاك بوون کە هێندێك ئازادیی و مافی نووسین و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بە زمانی کوردی هەبوو. تەنانەت ساڵی ١٨٥٧ کتێبی پیرۆزی ئینجیل و هەروەها تەورات بۆ یەکەمجار لە زمانی یۆنانییەوە بۆ زمانی کوردیی کرمانجی وەرگێڕدرا... بەڵام دوای هەڵوەشانی سۆڤیەت و سەربەخۆبوونی گورجستان، کوردەکان بەرەو دۆخی نالەباری

پێشـوو گەڕانـەوە، چونکـە گورجسـتان دوای سـەربەخۆبوونی مافـی کەمایەتییـە قەومییەکانـی بـە فەرمـی نەناسـی و بـەم پێیـە مافـە کولتوورییەکانی کوردان پێشـێل کـران ودوور خرانـەوە و ئاوارەیـی کوردەکانی ئەم وڵاتە دەسـتی پێکـرد و زۆربەیان بـەرەو ئورووپا ڕۆیشـتن. ئێسـتا کـوردەکان خوازیاری ئـەوەن هاوشـێوەی ئەرمەنی و ئاشـوورییەکان وەك کەمایەتییەکـی ئیتنـی بـە فەرمـی بناسرێـن.»[١٥]

لێـرەدا وەك نموونـە ئامـاژە بـە قسـەکانی کوردێکـی دانیشـتووی ئـەو وڵاتـە لەم پێوەندییـەدا دەکەیـن:

«تاکۆ ئەبازدید تەمەن ٤٣ ساڵ یەکێکە لە کوردانی جۆرجیا و جارێکیش هاتۆتە هەرێمی کوردستان و سەردانی پەرستگای لالشی کردووە. ئەبازدید خۆزگە بە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت دەخوازیت و دەڵێت:» ئەوکاتە کوردان لەم وڵاتە ئازادیی زیاتریان هەبووە و لە سیاسەتدا بەشدار بوون، بەڵام پاش سەربەخۆیی جۆرجیا، دژایەتییەکی زۆری کورد کرا و ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنە کوردییەکان داخران. ئێستاش کورد لەم وڵاتەدا تەنها بەکارەوە سەرقاڵە و جگە لە چەند کۆمەڵەیەکی ئایینی و ڕۆشنبیریی بچوك بچوك، هیچ شتێکی دیکەمان نیە».[١٦]

## ● ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی گورجستان

بەگشتی کوردانی ئەم وڵاتە هەژارن و پیاوانیان لە بازاڕە میلییەکاندا بە کاری قورس و دەستگێڕییەوە سەرقاڵن. تاکۆ ئەبازدید تەمەن ٤٣ ساڵ یەکێکە لە کوردانی جۆرجیا و جارێکیش هاتۆتە هەرێمی کوردستان و سەردانی پەرستگای لالشی کردووە. ئەبازدید بۆ سڤیل گوتی: لە دەیەی ڕابردوودا کوردانی جۆرجیا بە لێشاو ڕوویان کردۆتە ئەوروپا بۆ کارکردن، بەشێکی زۆری ئەو کوردانەی لە وڵاتەکەشدان، لە چینی هەژارن. جۆرجیا بۆخۆی وڵاتێکی دەوڵەمەندی ئابووری نیە و بەشێکی زۆری خەڵکەکەی لە چینی هەژارن کە لەنێویشیاندا کوردەکان.[١٧]

کوردەکان لە گورجستان خەریکی دەستگێڕیین و ژمارەیەکی دیاریکراو لەو کوردانە بە پێکهێنانی چینێکی پیشەوەر، بوونە خاوەنی کۆمپانیا پیشەسازییەکان لەو وڵاتەدا، بەڵام زۆربەیان بە دەستفرۆشی و کاری قورس لە بازاڕەکانی تفلیس سەرگەرمن و ڕەوشی ژیانیان زۆر نالەبارە. تەنانەت ژن و منداڵەکانیش لە بازاڕەکانی حەوتووانە خەریکی کاری دەستفرۆشین. زۆربەی ئەم ژنانە لە ڕەوشی هەنووکەیی خۆیان ڕازی نین و بە ئاواتی گەڕانەوە بۆ کوردستانن. ئەوان بەدوای ئاگاداربوون و پێوەندیکردن بە کوردەکانی وڵاتانی دراوسێی گورجستانەوەن.

زۆربەی ئەم بنەماڵانە کە لە بازاڕەکانی گورجستاندا پیشەی دەستفرۆشی و کرێکارییان هەیە، منداڵەکانیان بۆ کار و خوێندن ڕەوانەی ئورووپا دەکەن. گوهار عەلیخان، تەمەن ٤٨ ساڵ، لە بازاڕی شاری تفلیسدا لەگەڵ هاوسەرەکەی خەریکی کەوش (پێڵاو) فرۆشتنن و سێ منداڵیان هەیە. دوو کەسیان لە فەڕانسە و یەکێکیان لە بەریتانیایە و بۆ کار و خوێندن چوونە ئورووپا، چونکە لە گورجستان بە هۆی بێکاری و هەژاری نەیاندەتوانی درێژە بە خوێندن بدەن. هەرچەند گوهار عەلیخان لە گورجستان لەدایك بووە بەڵام هەست دەکا لە کوردستان چاوی بە ژیان هەڵێناوە و بۆ گورجستان کۆچی کردووە. ئەو زمان و داب ونەریتی باووباپیرانی خۆی پاراستووە. گوهار عەلیخان دەڵێ: ئێمە کوردەکان جیاوازیمان لەگەڵ گورجییەکان هەیە. ئاواتە خوازم بۆ زێدی خۆم بگەڕێمەوە.

ئەمڕۆکە زۆربەی کوردەکانی دانیشتووی گورجستان بە ئاواتی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆیانن و بە هیوای ژیانێکی شیاو درێژە بە ژیان دەدەن، بەڵام ژمارەیەکیان لە گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان بێهیوا بوون و خۆیان لەگەڵ بارودۆخی هەنووکەیی ئەو وڵاتە گونجاندووە و تەنانەت منداڵەکانیشیان شارەزاییەکیان لەسەر زمانی کوردی نیە.

کریستیانا جەنگیز کە لە یەکێك لـە بازاڕەکانی تفلیس خەریکی قاوە فرۆشتنە، خـۆی لەگـەڵ ڕەوشـی ئارایـی گورجسـتان گونجانـدووە و خوازیاری گەڕانـەوە بۆ کوردسـتان و نیشـتمانی خۆیـان نیە ئـەو دەڵـێ: «نامهـەوێ بگەڕێمەوە کوردسـتان چونکـە دەترسـم و نازانـم چـۆن پێشـوازیم لـێ دەکـرێ.» بـەڵام ئەو جەخـت لەوە دەکاتـەوە کـە منداڵەکانی ئەگـەر حەزیـان لـێ بـوو، دەتوانـن بـۆ نیشـتمانی بـاب و باپیرانیـان بگەڕێنـەوە. گـوزەل باپیـر، تەمـەن ٦١ سـاڵ، بۆچوونێکـی دیکـەی هەیە و دەڵـێ زۆرم پێخۆشـە بگەڕێمـەوە کوردسـتان و زۆربـەی کاتـەکان بـە کـوردی گۆرانـی بـۆ نیشـتمانەکەم دەچـڕم. ئـەو دەڵێ: شـانازی بـە کوردبوونی خـۆم دەکەم و بـە تاسـەی گەڕانـەوە بـۆ کوردسـتان دەژیـم و تەنانـەت لـەم تەمەنـی بێتاقەتـی و پیریەشـدا هیـوادارم بـۆ زێـدی خۆیـم بگەڕێمەوە.

ئەمـە ڕەوشـی ژیانـی کوردانـی گورجسـتانە کـە چەندیـن سـاڵ پێـش ئێسـتا بـۆ ڕزگاربـوون لـە زوڵـم و زۆریی حکومەتی عوسـمانی، زێدی خۆیان جێهێشـتووە و گەیشـتوونەتە گورجسـتان. بەڵام بە هۆی ڕووداو و پێشـهاتەکانی سـەدەکانی دوایی و شـکڵگرتنی وڵاتی سـەربەخۆی گورجسـتان و گەشـەی ئەفکاری ناسیۆنالیسـتی لەنێـو سـەرکردەکانی ئـەم وڵاتـە، زۆر لـە کـوردەکان لە بیـری گەڕانەوە بۆ نیشـتمان و زێدی سـەرەکیی خۆیـان دان.(١٨)

## • سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ سێیەم

١. گرجستان/http://fa.wikipedia.org/wiki.
٢. ڕەمەزان کەریم، وردەکاریی پەرش و بڵاویی کوردەکانی یەکێتیی سۆڤێتی پێشوو، www.faceiraq.com/inews.php?id=١٤٧٣٢٠٨)
٣. کردهای گرجستان، ویکیپیدیای فارسی،کردهای گرجستان .fa.wikipedia /org/wiki .
٤. س.پ
٥. ڕەمەزان کەریم، س.پ.
٦. سەرچاوەی ژمارە ٣.
٧. سەرچاوەی ژمارە ٣.
٨. کۆمەڵێك نووسەر، گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە: م. گۆمەیی، سوێد، ٢٠٠٢، ل٣٥٨.
٩. کامەران، ڕاوێژ، کورد لە قەفقاس، -www.civilnews.org/dddetail_arti cals.php?id=12921&z=10&1=1 ،26/4/2014.
١٠. سەرچاوەی ژمارە٣.
١١. هەورامی، د.ئەفراسیاو، کوردستانی پشت قەفقاس، چاپی یەکەم، لە

بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ٢٠ ـ ٢١.

١٢. کەریم، ڕەمەزان، کوردەکانی جۆرجیا، کوردستانی نوێ 19/2/2013، www.knwe.org/Direje.aspx?Jimare=17636Cor=2&Besh=w=Witar

١٣. گـذری بـر احـوال کردهـای گرجسـتان، مترجـم: آمنـه خاکـی، منبـع: روداو انگلیسـی: (www.kurdpress.com/fa/Nsite/Fullstory/New

١٤. لازاریف، م.س، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٤٠٩.

١٥. سەرچاوەی ژمارە٣.

١٦. کامەران، ڕاوێژ، س.پ.

١٧. کامەران، ڕاوێژ، س.پ.

١٨. سەرچاوەی ژمارە ١٣.

## • چوارەم: کوردەکانی تورکمانستان

- چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی تورکمانستان
- **مێژووی لێکۆڵینەوە لە کوردی تورکمانستان**
- **سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ تورکمانستان**
- **شوێنی نیشتەجێبوونی کورد لە تورکمانستان**
- **ژمارەی کوردی تورکمانستان**
- **ژیانی ئابووریی کوردی تورکمانستان**
- **ماڵ، خواردەمەنی و جلوبەرگی کوردی تورکمانستان**
- **پێوەندیی کۆمەڵایەتیی خێزانی کورد**
- **زمان، ڕۆشنبیری و خوێندەواری، مۆسیقا و هەڵپەڕکێ**
- **ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) کوردی تورکمانستان**
- **ژیان و بەسەرهاتی جافەرقولی (١٨١٤ ـ ١٩٠٥)**
- **سەرچاوەکان**

### • چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی تورکمانستان

خاکی تورکمانستان لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەم وەك بەشێك لە تورکستانی گەورە کەوتە دەست دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا. لەو کاتەدا بە ناوی

خانـەوە میرنشـینی بچووك لەناوەوە بوون، نـاوی زۆربەیان لە هـۆز و تیرە و عەشرەتە تورکـە مەغۆلـەکان وەرگرتبـوو، لەباتی میرنشـینی نـاوی «خانیەت»یـان وەرگرتبوو، هەنـدێ جاریـش خانیەتـەکان بـە نـاوی شـارەکانەوە بـوون، وەکو خانیەتـی خێوە، یـا خانیەتـی بوخارا و هـی دیکە.

تورکمانسـتان گەرمتریـن و وشـکترین بیابانـە لـە ئاسـیای ناوەڕاسـتدا. زیاتـر لـە سـەدا نـەوەدی خاکی تورکمانسـتان سـارایە. چوار لـە پێنجی ئاقاری تورکمانسـتان دەکەوێتـە نـاو یەکـێ لـە گەورەتریـن بیابانـی هەمـوو گێتـی و ئاسـیا و نـاوی جوگرافـی «قەرەقوم»ە. بە زمانـی تورکی بە مانـای «لمـی رەش» هاتـووە. ڕووباری کەمـە، بەشـێك لـە زێـی ئەموودەریـا، مورغـاب، تەجیـن بە خاکـی تورکمانسـتاندا تێدەپـەڕن.

لـە سـەدەی نۆزدەهـەم و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم تـا جەنگـی یەکەمـی گێتـی میرنشـینی تورکمانسـتان بـە نـاوی خانیەتـەوە وەکـو کۆلۆنیالێـك قەیسـەری ئیمپراتـۆری ڕووس بەڕێـوەی دەبـرد.

لـە دوای شۆرشـی ئۆکتۆبـەر (١٩١٧) لـە تەمـووزی سـاڵی ١٩١٨ دژی بۆلشـەڤیکەکان (ڕووسی سپی) تورکمانسـتانیان داگیر کرد، لەدوای شەڕوشۆڕێکی کوشـندە سـوپای سـوور توانـی بەسـەر دوژمنانیـدا زاڵ بـێ و لـە سـاڵی ١٩٢٠ تورکمانسـتان کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی سـۆڤیەتەکانی ئـەو سـەردەمە.

لـەو ماوەیـەدا بێئارامـی باڵـی بەسـەر هەمـوو خاکـی ڕووسـیای کـۆن داگـرت بـوو، شەروشـۆر و بەرهەڵسـتی بوو لـە نێوان بۆلشـەڤێك و دوژمنەکانیـان بە تایبەتی لـە ناوچەکانـی ئاسـیای ناوەڕاسـت و قەفقاسـدا، لە ناوەڕاسـتی سـیەکانی سـەدەی بیسـتەم کۆمۆنیسـتەکان توانیان خاکی ڕووسـیای کـۆن کۆنترۆڵ بکـەن و خەریکی چەسـپ کـردن و دامەزراندنـی کۆمەڵـی سۆسیالیسـت بـن. بـەم جـۆرە لـە ٢٧ی تشرینـی یەکەمی ١٩٢٤ کۆماری تورکمانسـتانی سـۆڤیەتی سۆسیالیسـت دروسـت

بوو. خاکی کۆمارەکە کەوتۆتە نێوان زەریای قەزوین و ڕووباری ئەموودەریا، ئۆزبەکستان لەلای ڕۆژهەڵات و ئێران و ئەفغانستان کەوتوونەتە لای باشووری.

قەوارەی وڵات ٤٨٨ هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشەیە، دانیشتوانی لە تورکمان و ڕووس و ئۆزبەك و کورد پێك هاتوون. پایەختی وڵات شاری عەشقابادە، شاری ماری (مەڕۆی کۆن) لە شارە گەورەکانی کۆمارەکەیە.

لە کشتوکاڵدا لۆکە و هەرزنی هەیە، لە کانی مەعدەن کبریت و مەگنیسیۆمی زۆرە، پیترۆڵ و خەلووزیشی لێ دۆزراوەتەوە، پیشەسازی قوماشی لۆکە و مافوور و شەراب و کەرەستەی بیناسازی هەیە.

پێش شۆرشی نوکتۆبەر لەناو تورکمانانندا لە سەدی یەکێك کەمتر خوێندەوار بوو، لە ساڵی ١٩٥٠ دا زانستگای تورکمانستان کرایەوە و لە ساڵی ١٩٥١ ئەکادیمیەی زانستی دامەزرا. لە ساڵی ١٩٩٢ لە یەکێتیی سۆڤیەت جیابوونەوە و بوو بە کۆمارێکی سەربەخۆ.[١]

- **سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ تورکمانستان**

مێژووی کوردەکانی تورکمەنستان لەگەڵ کوردی خوڕاساندا هاوبەشە، بەشێك لەوان بەهۆی دانانی سنووری نوێی ڕووسیا و ئێرانەوە خرانە ناو چوارچێوەی ئیمپراتۆریی ڕووسیاوە و بەشێکی تریان بەهۆی سیاسی و ئەنجامی شکستی ڕاپەڕینەکانی کوردی خۆڕاسانەوە لە ترسی دەسەڵاتدارانی ئێران، بە تایبەت لە کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە پەرەوازەی ناو خاکی ڕووسیا یا یەکێتی سۆڤیەت بوون.[٢]

مامۆستا کەمال مەزهەر سەبارەت بە کوردەکانی تورکمێنیا دەڵێت: چارەنووسی ئەمان یەکێکە لە داستانە پڕ لە کارەساتەکانی مێژووی گەلی کورد. دەوروبەری کۆتایی سەدەی شازدە شاعەباسی یەکەم، کە بەدەسەڵاتترین

پاشای سەفەوی بوو، ژمارەیەکی زۆر لە کوردی کوردستانی ئێرانی بۆ ناوچەی خۆراسان گواستەوە، بە نیازی بەرهەڵستی هێرشی یەك لەسەر یەکی هۆزە ئۆزبەکیە چاونەترسەکان بۆ سەر سنووری باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران. شاعەباس بەو کارەی دەیویست دوو نیشان بپێکێت، لەلایەکەوە بەشێك لە هۆزە کوردە بەهێزەکان خەریك بکات و لە کوردستانیان دور بخاتەوە، لەلایەکی تریشەوە بە ئەوان بەربەستی دەستدرێژیی ئۆزبەکەکان بکات کە لە ڕۆژهەڵاتەوە تەواو تەنگیان بە دەوڵەتە بەرفراوانەکەی هەڵچنیبوو.

بەشی زوری ئەو کوردانەی شاعەباس ڕایگواستە خوراسان لە هۆزی زەفەرانلوو و شەدەڵوو بوون. د. کەمال درێژە بە بابەتەکە دەدات تا دەگاتە باسی زوڵموزۆر و چەوساندنەوەی سەفەوی و قاجارییەکان بۆ سەر کورد ئینجا باسی ڕاپەڕینی کوردەکانی خۆراسان دەکات و دەڵێت: هەر ئەو باری قورسی ژیانە بەشێك لە کوردی خۆراسانی ناچار کرد دەورویەری کۆتایی سەدەی پانزدە پەنا بەرخاکی تورکمانستان بەرن کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی ڕووسیاوە. [٣]

بەڵێ! «مێژووی کوردی تورکمانستانی ئاسیای ناوەڕاست پێوەندی ڕاستەوخۆی بە مێژووی کوردی خۆراسانەوە هەیە، چونکە بە بنەچە کوردی ئەوێن و لەوێوە بۆ تورکمانستان کۆچیان کردووە. کوردی خۆراسانیش مێژووی خۆیان هەیە دەگەڕێتەوە ئەو سەردەمە مێژوویيانەی بەشێك لە عەشرەتەکانی کورد لە کوردستانەوە (ناوچەکانی باکوور و باکووری ڕۆژئاوای ئێران) ئاوارەی خوراسان کراون، لەبەر ئەوە مێژووی بەسەرهاتی کوردی تورکمانستان و کوردی خۆراسان یەکێکە و بیبلیۆگرافیا و سەرچاوەی لێکۆڵینەوەیان هاوبەشە و لە یەکتری جیا ناکرێنەوە. [٤]

### لە کوردستانی ئێرانەوە بۆ خۆراسان

لەدوای جەنگی چالدێران ١٥١٤ و دابەش بوونی خاکی کورد بەسەر دوو دەوڵەتەکەی سەفەوی و عوسمانی هەلێکی لەبار پەیدابوو بۆ چەوساندنەوەی کورد و دەست داگرتن بەسەر سامانی نەتەوەیی ئەو میللەتە.

لە ساڵی ١٦٠٨ کوردی دانیشتوانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران لە ناوچە و عەشرەتەکانی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ و براۆست و شنۆ و ورمێ کەوتنە جموجۆڵ دژ بەدەستدرێژی دەوڵەتی سەفەوی، لە هەرێم و ناوچە جیاوازەکانی کوردەواری بەرهەڵستی چەوساندنەوەی دەسەڵات دەکرا. لەبەر سەوە فەرمانڕەوایی سەفەوی بە زۆر بەشێك لە کوردی ئەو ناوچانەی ئاوارەی خۆراسان کرد، لە لایێك بۆ ئەوەی ڕزگاری لە هەڵسان و شۆڕشەکانیان بێ، لەلایێکی دیکەوە سنووری ڕۆژهەڵاتی ئێران لە هێرش و دەستدرێژیی تورکمان و ئۆزبەکەکان بپارێزێ...

لە ماوەی مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی بۆ جاری دووەم لەنێوان ئێران و عوسمانی لە ساڵی ١٦١٨ شا عەبباس پازدە هەزار بنەماڵەی کوردی ئاوارەی خۆراسان کرد لەمانە عەشرەتەکانی جافەرانلوو و شادیلوو لە ناوچەکانی قۆچان و شێروان و بجنورد نیشتەجێ بوون، لە پاشانا لە بەشەکانی دیکەی خۆراسان دەرەگەز، قەلات و تەراخان و جێی دیکە بڵاو بوونەوە.

کوردی خۆراسان لە سەرەتای نیشتەجێبوونیان پێنج ناوچەی بەڕێوەبردنیان دروست کرد لەو خاکەی کەوتۆتە نێوان ئەستراباد و چناران و لە دواییدا ئەمە بووە بنکەی دروستبوونی کوردستانی خۆراسان.

### لە خۆراسانەوە بۆ تورکمانستان

بە هۆی پێوەندی کشتوکاڵی و هاتوچۆی مەڕوماڵات لەنێوان ئێران و تورکمانستاندا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم لە ئەنجامی مانەوەی هەندێ لەو

کوردانە لە خاکی تورکمانستاندا گوند و ئاوایی کوردی پەیدا بوو، ئەمە بووە بنکەیێك بۆ ئەوەی کوردی دیکەی خۆراسان هان بدرێن بۆ کۆچ کردنیان لەپێناوی ژیانێکی باشتر.

وەك لە سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ لەدوا سالآنی سەدەی نۆزدەم، بەشێکی زۆر لە کوردی باکووری خۆراسان روویان کردە ناوچەکانی ئەودیو زەریای قەزوین لە ئەنجامی پەیدابوونی کوللە و داهاتنی گرانی و قات و قڕی. تا ئێستاش گەلێ لە پیرەمێردانی بەساڵاچووی کورد بەسەرهات و حیکایەتی سالآنی کوللە دەگێڕنەوە و ژیانی ناڵەباری ئەو ڕۆژگارە دەخەنە ڕوو. لەناو خەڵکی دا بە «ساڵانی کوللە» ناوی دەرکردووە.

بەشێکی تری خێزانی کورد لە کوردستانی ئێرانەوە لەبەر هەژاری و گەڕان بە شوێن نان تاك تاك و بەکۆمەڵ لەگەڵ ماڵ و منداڵیان کۆچیان کردووە بۆ ناوچەکانی ئەودیو زەریای قەزوین و گوندی تایبەتی یان بۆ خۆیان دامەزراندووە.[٥]

- **شوێنی نیشتەجێبوونی کورد لە تورکمانستان**

کوردەکانی تورکمانستان لەم شار و ناوچانەدا نیشتەجێن: عەشق ئاباد، گۆك تەپە، کاتاخکەن، باغر، فیروزە، چولی، گەرماب، منتیکالار. هەروەها لە قەزای تورکمەن، کالینین، بایرام عەلی سەر بە پارێزگای ماری، ژمارەیەکی بەرچاوی کوردی لێیە.[٦]

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە ئاماژە بە شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد لە تورکمانستان کراوە: عەشق ئاباد، ماری و گوئیك تەپە، کاتاخکین (لە گوندەکانی باقیر «باگیر» و فیروزە، چولین، گەرماب، ...) هەروەها لە ناوچەکانی تورکمەن ـ کالین، بارمە عەلی ( لە کوردەکانی خاننشینی دەرەگەز، قەلات،

ڕودکان، کوچـان و بجنـوردن).

کـوردی ناوچەکانـی مـاری، بارامەعەلـی لـە ناوچەکانـی پـری کوپێتـداغ لـە سـاڵانی ٣٠ی سـەدەی بیسـتەمەوە هاتـوون. هەروەهـا لـە تاشـائوز، چوارجـوو، حەسـارقەڵا، کوریـن و میخەنلـی دەژیـن.[٧]

لـە کتێبی «کوردسـتان و کورد لـە ڕوانگەی نەخشـەوانیەوە» لەم بـارەوە هاتووە:» ناوچـە سـەرەکیەکانی نیشـتەجێبوونی کـوردان لـە تورکمەنسـتان «گوپـت داخ» و «فیریوزا»یـە و هەندێـك گرووپـی گوندنشـینی بچووکتر لـە «جیوك تەپـە»، «خاخا» و «کاراکالا» و هەندێـك کۆمەڵگـەی شارنشـین لە «باگیر»، «بایرام عەلی» و «عیشـق ئابـاد»ی پایتەخـت دەژین.[٨]

هەروەهـا لـە کتێبـی «پەیوەنـدی نێـوان کـورد و ڕووسـیا»دا جێـگای ژیانـی کوردەکانـی تورکمانسـتان بـەم شـێوەیەی خـوارەوە دیـاری کـراوە:

بـە زۆری لـە ناوچەکانی باشـووری سەرسـنووری ئێـران و لە ناوچەی ئەشـقاباد، گیـوك تێپیـن، کەناخکیـن، تورکێـن ـ کالیـن، بەیـرەم عەلـی ناوچـەی ماریـی. هەروەهـا لـە ئەشـقابادی پایتەختـی تورکمێنیـادا.[٩]

دیــارە لــەم ســەرچاوانە و لــە زۆر ســەرچاوەی دیکــەش شــوێنەکانی نیشــتەجێبوونی کــورد هــەر ئەمانــەن کــە ئاماژەیــان پێکــرا. هەرچەنــد لــە ســەرچاوە جۆراوجۆرەکانــدا گۆڕانــکاری لــە شــێوەی نووســینی نــاوی شــوێن و ناوچەکانـدا دەکـرێ .بـۆ نموونـە جیـوك تەپـە، گوئیـلك تەپـە و گـۆك تەپـە هەریەکــن بــەڵام بــە شــێوەی جۆراوجــۆر نــووسراون.

### ● ژمارەی کوردی تورکمانستان

لەبابەت ژمارەی کوردەوە پێش شۆڕشـی ئوکتۆبەر ١٩١٧ هیچ سـەرچاوەیێك لەبەردەسـتدا نییـە. کوردی ئـەوێ خۆیان دەڵێـن ژمارەیان لە نێوان حـەوت هەزار و

هەشت هەزار کەس بووە، هۆی ئەو نەزانینە ئەوەبوو لە ناوچەی جیاجیا دەژیان، پێوەندی لەنێوان ئەم ناوچانەدا کز بوو، جگە لەوەی هەندێ جار لەبەر هەر هۆیێك بووبێ کوردی ئەوێ خۆی بە فارس یان ئازربێجانی ناونووس کردووە.

لە سەرژمێری ساڵی ١٩٢٦ لە تورکمانستانی سۆڤیەتی کۆن ژمارەی کورد (٢٨٠٣) کەس بووە، کەچی لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٩دا ژمارەیان (٢٢٦٣) کەس بوو، هۆی کەمبوونەوەی ژمارەیان ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٥ دا بەشێکیان گەڕانەوە خۆراسان و هی تریش لە سەرژمێری دا خۆیان بە کورد نەنووسی بوو. بێگومان بە گشتی سیاسەتی دەوڵەت، بە تایبەتی سیاسەتی ستالینی کوردی ترساندبوو، نەك تەنیا کوردی تورکمانستان بەڵکوو کوردی هەموو کۆمارەکانی قەفقاسیش هی وەکوو ئازەربێجان و ئەرمەنستان و گورجستان، لەمانە ئێزیدی نەبێ بە هۆی ئایینەوە نەتەوایەتی خۆیانیان پاراست کەچی کوردی ئازربێجان لەبەر ئەوەی وەکوو ئەوان موسڵمانی شیعە بوو نەیانتوانی پارێزگاری ئەدگاری نەتەوەیی یان بکەن. هەرچەندە ئەم دیاردەیە زۆر زۆر کاریگەر نەبوو لە تورکمانستان چونکە تورکمان ئیسلامی سوننین کەچی کوردی ئەوێ ئیسلامی شیعەن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ترس وای لێ دەکردن ئەگەر خۆیان بە تورکمانیش نەنووسن بە فارس خۆیان حسێب بکەن. ئەم سیاسەتە وای کردووە تا ئێستاش ژمارەی کورد لە وڵاتەدا بە تەواوی نەزانرێ چەندە.[١٠]

بەپێی هەندێك لەو خەمڵاندنانەی کە کراوە، زیاتر لە ١٠٠ هەزار کورد لە بیستەکاندا لە تورکمانستان دەژیان، بەڵام سەرژمێرییەکانی دواتر لە قۆناغێکی پشکنین و لێکۆڵینەوە دەرکەوت ژمارەیەکی زۆر لەوانەی سەر بە نەتەوەی کوردن، کەمی کردووە لە هەموو ئەو ناوچانەی کە تیایدا نیشتەجێ بوون.[١١]

- **ژیانی ئابووریی کوردی تورکمانستان**

پێوەندی عەشیرەتی لەناو کوردی تورکمانستان گەلێ بەهێز و پتەو بوو. لە کۆندا خەڵکی بە ناوی عەشیرەتەکانیانەوە خۆیان بە خەڵکی دەناساند، عەشرەتە گەورەکانی وەکوو جافەرانلوو و شادیللوو کرابوون بە چەند بەشێکەوە، ئەندامانی عەشرەتە گەورەکان و لقەکانیان نەریتی عەشیرەتییان دەپاراست. نەوەی تازە بەو جۆرە ئاگاداری پێوەندی عەشرەتی نیە، ناوی کۆمەڵە کوردەکانی ئێستا زۆربەیان بە گوند یا ناوچە یا شارەکانی باکووری ئێرانەوە دەناسرین. وەکوو سیسپیرانلوو، مالیانلوو، روشوانلوو، جیڤانلوو، شیروانلوو، قەلاتلوو، قوشگونالوو و هی دیکە.

کشتوکاڵ بنچینەی ئابووری کوردی تورکمانستانە، لە ئاواییەکانی ناو شاخ و دامەنی چیاکانی کۆپیت داغ و دووشاك، لە گوندەکانی باگیر و فیرۆزە و گەرماب و حەسار قەڵا و کورین میخینال خەریکی کشتوکاڵ چاندنی زەوین. بە زۆری کوردی تورکمانستان خەریکی چاندنی دانەوێڵە و سەوزەن، باغەوانی میوەجاتیان پێخۆشە. ئاو لە جۆگە و کارێزی ناو شاخ وەردەگرن.

لەپێش شۆڕشی ئوکتۆبەر زۆربەی کورد زەویان نەبوو، وەك کرێکاری کشتوکاڵ بۆ دەرەبەگەکان کاریان دەکرد. هەندێکیان زەویان لە بەگەکان بەکرێ دەگرت، کرێیەکان دیاری نەکراوبوون، خاوەن زەوی بە ئارەزووی خۆی کرێی لێ وەردەگرتن، ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی جووتیار هەمیشە قەرزاری بەگ بێ، ئیتر هەندێ جار جووتیاری قەرزار قەرزی بۆ نەدەدرایەوە ناچار دەبوو لە قەرز ڕا بکا بۆ شار، بە تایبەتی شارانی عەشقاباد و ماری (مەڕۆی کۆن)، ناچار دەبوو لە پێناوی پارووی نان پیشەی کۆڵهەڵگری هەڵبژێرێ.

لەگەڵ بایەخدان بە کشتوکاڵ لە پێش شۆڕشەوە تا چاکسازی ساڵانی ١٩٢٥ ـ١٩٢٦ی پاش شۆڕش هەندێ لە کوردی تورکمانستان خەریکی بەخێوکردنی

مەڕ و ماڵات و پیشەی شوانکارەیی بوون. لەدوای شۆڕش کوردیش وەکوو هەموو خەڵکی دیکەی وڵاتی سۆڤیەتەکانی کۆن کۆڵخۆزیان دروست کرد پاش ئەوە ڕانە مەڕی خۆیان فرۆشتە کۆڵخۆزەکان. ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە کورد مەڕی تایبەتی بە خۆی هەیە لەڕووی نەژادەوە بە «مەڕی کوردی» ناسراوە.

لە ئاژەڵ، کورد ڕەشەوڵاغ و وشتر و گوێ درێژیان هەیە. بەرهەمی مەڕ زۆرە، ژیانی دارایی خێزانیان بەرز دەکاتەوە. خوری و پێستە و شیر و بەرهەمی دیکە بەشی خۆیان دەکا، ئەوەی زیادە لە بازاڕ دەفرۆشرێ.

زۆربەی کەلوپەل و ڕایەخی ناوماڵ خۆیان دروستی دەکەن، ئەوەی لە خوری دروست دەکرێ بابەتی زۆرە: مافوور، جاجم، کەلوپەلی نوستن، جۆرك (خورج)، جەواڵ، پشتێند، گۆرەوی و شتی دیکە.

کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات لەبابەت ژیانی ئابووری کوردی تورکمانستانەوە، بە پێی ناوچە جوگرافیەکان و پیشەی خەڵکەکەی دەگۆڕا. بۆ بەڵگە لە ئاوەدانی قەلا ژیانی لە سێ وێنەدا دەبینرێ: یەکەمیان لە گوندەکانی گیندوڤار، عەلی بەگ، سولوکلی، حەسار قەلا، کوورێن، گوزلیك، ئەمانە لەناو شاخ دا بوون، لەوێ شوانکارە و خاوەن مەڕوماڵات دەژیان. دووەمیان لە گوندەکانی یانباش، ئاق مەیدان، کاریزاك، مەخینلی، لە نزیك بناری شاخ بوون، لێرە خاوەن مەڕوماڵات و ڕەنجبەری کشتوکاڵ پێکەوە دەژیان، سێیەمیان لە گوندەکانی باگیر، گوێچکە، باباراب، ئاراپ قەلا، لێرە کورد لەگەڵ تورکمان پێکەوە دەژین و تەنیا خەریکی کشتوکاڵن.[١٢]

### ● ماڵ، خواردەمەنی و جلوبەرگی کوردی تورکمانستان

بەگشتی خانووی خێزانی کورد لەپێش شۆڕشی ئوکتۆبەر بریتی بوو لە تاقە

ژوورێکی لە قوڕ دروستکراو و زیاتر لە کۆخی دەکرد و شایانی ئەوە نەبوو مرۆڤی تێدا بژی، بە دەگمەن لە کۆمەڵی کوردەواری ئەوێدا خانوویێك دەبینرا لە خشت (کەرپووچ) دروست کرابێ.

بۆ دروستکردنی خانوو دار و دەوەن و قوڕ بەکار دەهێنرا. خانووەکان پەنجەرەیان نەبوو، ئەرزی ناوماڵ پانایەکی خۆڕسکی ئاسایی بوو، دەسکاری نەکرابوو، لەناو ژووری ماڵ دەلاقەیان دروست دەکرد بۆ پاراستنی کەلوپەل و جلوبەرگ.

لەدوای شۆڕش گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەر خێزانی کورددا هات، لە شار و لە گوند، بەڵام ئەوەی شار زیاتر بوو. لە دێهاتەکاندا هەموو خێزانێك پارچە ئەرزێکی هەیە، بەشی ئەوە دەکات خانووی لێ دروست بکا و بەشێکی بکاتە باغچە و بێستان و سەوزە و داری بەرداری لێ بڕوێنێ.

بە زۆری خێزانی کورد بە تەنیا دەژی، هەندێ جار دوو خێزان پێکەوە دەژین، بە گشتی ئەم دوو خێزانە خزمی یەکتری دەبن، یا دۆست و برادەرێکی زۆر نزیك دەبین لە یەکتری.

لە هەموو ماڵێکدا کەلوپەلی مۆدێرن دەبینرێ، وەکوو قەنەفە و کانتۆر و ڕادیۆ و قاپ قاچاغی فەغفووری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەلوپەلی نەتەوایەتی تایبەتی یان پاراستووە، وەکوو: تەشتی هەویر، سەتڵ، لەنگەری، ساج، جەڕە، دیزە، گۆزە، کەندوو، هەرزاڵە و گەلێکی دیکە.(١٣)

خواردەمەنی: خواردەمەنی کوردی ئەو وڵاتە جۆراوجۆرە، بە زۆری نەتەوەییە و تایبەت بە خۆیانە. هەندێکی خواردەمەنییەکانیان لە تورکمانان وەرگرتووە، لەم دواییە خواردەمەنی ڕووس و ئۆکرانی و ئازربێجانی و هی دیکەشیان وەرگرتووە، بەڵام بەتەواوی سیستێمی خواردەمەنی نەتەوەیی خۆیان پاراستووە.

گۆشت گرنگترین مادەی خواردەمەنییە، بە تایبەتی گۆشتی بەرخ و مەڕ، گۆشتی مانگا کەم بەکار دێنن، لەلایان مەقبوول نییە، کەچی گۆشتی مریشك و باڵندەی دیکە بە زۆری بەکار دێنن، بەڵام گۆشتی ئەسپ و ماین ناخۆن. ئێمە لەبەر ئەوە باسی ئەو جۆرە گۆشتەمان کرد چونکە نەتەوەکانی تورکە تەتارەکانی ئاسیای ناوەڕاست هەموویان موسوڵمانی سوننین و گۆشتی ئەسپ و ماین لەلایان حەڵاڵە، بەڵام کوردی ئێمە ئەو جۆرە گۆشتە ناخۆن.

کوردی تورکمانستان زۆربەی چێشتی گەرم لە گۆشت دروست دەکەن. دیارترین خواردەمەنییان کە لە گۆشت دروست دەکرێ، شلەکەی (شۆروا)ی پێدەڵێن، واتە شۆربا (سووپ)، ئەویتر (پەڵوو)ی پێدەڵێن، واتە پڵاو. بەزۆری حەزیان لە خواردەمەنی شلەیە، لەمانە لۆلکە و پیرخەنیلە و شلەساوەر و سنداره و هی دیکە، ئەمانە لە ئارد و دانەوێڵە و قەرەخەرمان و ڕۆن دروست دەکەن. هێلکە بە گەلێ شێوە خواردەمەنی لێ دروست دەکرێ، لەوانە بە پیاز و ڕۆن و هەرەشتە شلەی لێ دروست دەکرێ، ئەم خواردەمەنییە «کاروان ئاشی» پێدەڵێن.

وەکوو هەموو کۆمەڵێکی کوردەواری و کۆمەڵێکی شوانکارەیی کوردی ئەو وڵاتە لە شیر گەلێ بەرهەمی تازە دروست دەکەن وەکو ماست و پەنیر و کەرە و سەرتوو و لۆر و فرۆ و دۆ و هی دیکە.

نان لای کورد شتێکی پیرۆزە بە چاوێکی بەرز تەماشای دەکرێ. دوو ڕێگە بەکار دێنن بۆ دروست کردنی، یەکێکیان بە تەنوور و ئەوی دیکەیان بە ساج. نان لەلایان دوو بابەتی هەیە هەویری فەتیر و هەویری ترشاو.

سەوزە بابەتی زۆرە بە کاڵی دەخورێ لە چێشتی گەرمیشدا بەکار دەهێنرێ. بیبەر بە هەردوو بابەتیەوە (شیرین و تیژ) دەوری باڵای هەیە لەسەر خوانی کوردی تورکمانستان. سەوزە بە گشتی لای ئەوان تەنیا بۆ خواردن نییە بەڵکوو

دەرمانـی هەمـە ڕەنگـی لـێ دروسـت دەکەن.

ماڵـی کـورد میـوە زۆر بەکار دێنـن، نەك تەنیا وەکـو خۆی بەڵکـو خواردەمەنی گەرمیشـی لـێ دروسـت دەکـەن. هەروەهـا میوەی وشـك کـراو، یا خۆیان وشـکی دەکەنـەوە یـا لـە بازاڕ دەیکڕن، ئەمە بۆ چێشـتی گەرم بە کاری دێنن و خۆشاویشـی لێ دروسـت دەکەن.

لـە سـەردەمی کۆنـی سـۆڤیەتەکان گـۆڕان بەسـەر خواردەمەنـی ئـەو وڵاتـەدا هاتبـوو، وەکـوو پەیدابوونـی کاتلێـت و بـۆرش ( سـووپی ڕووسـی) زەڵاتـەی جۆراوجۆر [١٤]

**جـل وبەرگ:** کوری تورکمانسـتان تا ئێسـتا جلوبەرگی نەتەوەییان پاراسـتووە، ئـەدگاری ڕەسـەن و جوانـە تایبەتـی یە بە خۆیـان. بەرگی ژن و پیـاو و منداڵ بە پێی ڕۆژانـە و سـەردەمی جـەژن دەگۆڕێ، بابەتـی زۆرە و ڕەنگاوڕەنگـە بە تایبەتی جلی ژنـان جوانـی ڕەنگەکانـی سـەرنج ڕاکێشـەرە. جلی سـەرەکی پیـاو کـراس و دەرپێ یـە، «کراسـێ میـران» و «دەرپـێ مێـران»ی پێدەڵێـن، هەروەهـا کورتەکـی هەیـە، ئەمەیـان بابەتـی زۆرە و بـە زسـتانە و هاوینـە دەگـۆڕێ. جلوبەرگـی ژنـان بریتییـە لە کـراس و دەرپـێ (شـەلوار)ی پێدەڵێـن، لەگـەڵ چاکەت و سـەرپێچ.

ژنی کورد هۆگری خشڵی خۆرازاندنەوەیە، ئەم خشڵانە بە زۆری لە زیو دروست دەکرێن وەکوو: ئەموستیلە، بازن، گوارە، ملوانکە، هەیاسە و گەلێکی دیکە.

پێـڵاوی ژن و پیـاو بابەتـی زۆرە، لـە قایـش و چەرمـی نـەرم دروسـت دەکرێـن. کـوردی ئـەو وڵاتـە وەکـوو هەمـوو کوردێکـی تـر بایـەخ بـە پێـڵاو دەدا، ڕەنگـە ئەمـە زیاتـر پێوەندیـی بـەوەوە هەبـێ وڵاتیـان و جێگـەی ژیانیـان بـە زۆری ناوچە شـاخاوییەکانە. پێـڵاو پێیـان دەپارێـزێ لـە ئـازاری زەوی ڕەق و بـەردی تیـژ.

گۆڕانی سروشـتی و دەسـەڵاتی سـۆڤیەتی کـۆن بێگومان کاریان لـە جلوبەرگی کـورد کـردووە بـەوەی لـە شـێوەی گوندییـەوە دەربـاز بـن بـۆ شـێوەی شارسـتانی.

لەبەر ئەوە زیاتر لە شار و هەندێ جاریش لە گوندەدا کچی عازەبی کورد لاسایی جلوبەرگی کچە ڕووس و تورکمان و ئازربێجانی دەکەنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جلوبەرگی قەومی خۆیان پاراستووە، لەهەر جێگەیەك ببینرێن دەناسرێن کە کوردن.[١٥]

- **پێوەندیی کۆمەڵایەتیی خێزانی کورد**

پێوەندیی بنەماڵەیی و خزمایەتی لەناو کۆمەڵی کوردی تورکمانستاندا بە شێوەیەکی گشتی پارێزراوە. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گرنگی بە بنەماڵە و خێزانی بچووك دەدرا، واتە دایك و باوك و کوڕ و کچیان، پێوەندی تیرە و هۆز و عەشرەت کز بوو و باوی ئەوەندە نەمابوو. باوك سەرۆکی خێزان بوو، ئینجا دایك و لە پاشانا کوڕ.

لەناو کوردی ئەو وڵاتە وەکو هەموو موسڵمانێك کوڕ ئامۆزا و خاڵۆزا و پوورزای خۆی دەخوازێ، ئەم نەریتە لەلایەن کوردەوە پێڕەو دەکرا لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەت هەوڵی دەدا ئەم جۆرە خوازبێنی یە نەمێنێ، چونکە وەکو دەزانین لە ئایینی مەسیحی و لەناو ڕووسدا قەدەغەیە، لەناو موسوڵمانەکانیش کەم بوو لەگەڵ ئەوەی ئەوان موسوڵمانن ئەمە کارێکی ڕەوایە لەلایان بەڵام هەموو موسوڵمانان بە تورکمانەکانەوە بۆ ئارەزووی دەسەڵات ئەم جۆرە خوازبێنی یە کەمتر بووبوو، کەچی لەناو کورددا باوی مابوو.

بە زۆری لەناو کوردانـدا کچ لە تەمەنی ١٤ یا ١٥ساڵی بە شوو دەدرێ، کوڕ لە ١٨ تا ٢٠ ساڵی ژنی بۆ دەهێنرێ. لە کۆنا زۆری وا هەبوون لە ژنێك زیاتریان دەهێنا، بە تایبەتی ئەوانەی دەوڵەمەند بوون. هەر لەو سەردەمە کۆنانەدا خوازبێنی و ژنهێنان لەناو چینی هەژاران دا لەنێوان خۆیان دا بوو، دەوڵەمەندەکانیش پێڕەوی ئەم نەریتەیان دەکرد. لە سەردەمی دەسەڵاتی

سۆڤیەتەکان ئـەم نەریتـە لەنـاو چووبـوو، چونکـی چینـی هـەژار و دەوڵەمەنـد لەو کۆمەڵـەدا نەمابـوو.

ئاهەنگـی ژنهێنـان لای کوردی تورکمانسـتان زۆر لە ئاهەنگـی کوردی دیکەی وڵاتـی سـۆڤیەت و کوردی نـاوەوەی کوردسـتان دەکا، بە تایبەتی خەڵکی دەشـت و دێهات و ئاواییە کشـتوکاڵیەکان.

لە ڕۆژگاری کۆندا ئایینی ئیسـلام و ئایینزای شـیعە کاری گەورەی کردبووە سەر کۆمەڵـی کـوردی تورکمانسـتان. بـە تـەواوی هەمـوو فەرزەکانـی ئاییـن دەگەیەنرانە ئەنجام. مـەلا ڕێبـەری ئاییـن بوو، ئاخونـد و سـەییدیش (ئـەوەی پێغەمبـەر) لەنـاوەوە بـوون، ئەمانـە لەگـەڵ مـەلاکان دەوری ڕێبەرییـان هەبـوو، ڕێگـەی ڕاسـتی ئیسـلامەتییان بـە خەڵکی پێشـان دەدا، دەوری پزیشـکییان هەبـوو، تیماری نەخۆشـیان دەکـرد بـە تایبەتـی دوعـا و نوێـژ و نوشـتە خەڵکیـان دڵنیا دەکـرد کە لە نەخۆشـی چـاك دەبنـەوە و برینیـان سـاڕێژ دەبێ. مـەلا و ئاخونـد و سـەیید کـوڕ و کچیـان لـە یەکـتری مـارە دەکـرد، مارەکردنـی ڕەسـمی لـە دادگا بـەلای کـوردەوە نەدەبـووە کارێکـی شـەرعی تـەواو ئەگـەر مـەلا دەسـتی تێـدا نەبوایـە.

مـەلاکان دەبـوو هەمـوو مەرجەکانـی شـەرع بخەنـە پراکتیکـەوە لە کاتـی مردن و ئامادەکردنـی بـۆ ناشـتن. عاشـوورا جێـی تایبەتـی هەیـە لەنـاو دەروونـی کوردی ئـەو وڵاتـە، لـە دە ڕۆژەکەدا هەموو دەسـتوورەکانی کـە بە درێژایی مێژوو دروسـت بـوو دەخەنـە پراکتیکەوە. خوێندنەوەی قورئان و گێڕانەوەی بەسـەرهاتی حوسـێنی کـوڕی عەلـی کـوڕی ئەبـوو تالیـب و شـەهیدبوونی لـە دەشـتی کەربـەلا، ئینجا لاواندنـەوە و لەخـۆدان. لـە پێشـانا بـە دەسـت لـە سـنگ و ئینجـا بـە زنجیر لە شـان و مـل و پشـت، لەدواییـدا بـە قامە لـە تەوقی سـەر، ئـەم کردەوانەی عاشـوورا لەوێ «شەخسـی ڤەخسـی» پێدەڵێـن. ئەمـە لـە ڕسـتەی «شـا حوسـێن وا حوسـێن»ەوە هاتـووە لـە کاتـی لەخـۆدان دا بە دەنـگ و ئـاوازەوە لە دەمیـان دێتـە دەرەوە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سۆڤیەتەکان هەندێ لە نەریتی کە بە دواکەوتوو دەژمێردران لە ناوچوون، لەگەڵ ئەوەش دا لەناو هەندێ کۆمەڵێ کوردەواری ماونەتەوە، وەکو داگیرساندنی مۆم یا چرا و ڕووناکی لەسەر گۆڕی مردووان، باوەڕکردن بەگۆڕی پیاوچاکان، بە تایبەتی لە کۆمەڵی دەشت و لادێ و خەڵکی گوند. بەشێك لەو کوردانە باوەڕیان بە گیانی پاك و گیانی پیس هەیە، هەروەها باوەڕیان بە نەمردنی گیان هەیە، وەکوو یارسانەکان (ئەهلی هەق) هەندێکیان وا دەزانن گیان گەڕۆکە و لە گشت دایە (دۆنادۆن)، لە لەشێك دەردەچێ بۆ لەشێکی دیکە. بەمە و گەلێ نەریتی کوردی تورکمانستان وەك موسوڵمانانی نەتەوەکانی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست و شوێنەکانی دیکەی گێتی یە.

ئەوەی کۆن و بەساڵاچووەکان لەگەڵ ساڵنامەی مەسیحی (گریگۆری) ساڵنامەی هیجریش بەکار دێنن، هەردوو جۆرە ساڵنامەکە ئەوەی مانگی ئەوەی ڕۆژی. ئەم ساڵنامەیە پێوەندی بە کۆچی پێغەمبەرەوە هەیە لە مەککەوە بۆ مەدینە.

جگە لە جەژنە ئایینییەکانی ڕەمەزان و قوربان جەژنی نەورۆز لەلایان پیرۆزە و ڕێزی دەگرن و ئاهەنگی تایبەتی بۆ دەگێڕن.

لەبارەی ناوی کوڕ و کچی کوردی تورکمانستان ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ناوی پیاو لەو کۆمەڵەدا ئەو ناوە عەرەبی یە موسوڵمانیانەن کە بە زۆری شیعە بەکاری دێنن، وەکو: عەباس، ئەلی (عەلی)، قوربان، حەسەن، حوسێن، ڕەزا، شامیرزا، مووسارەزا، کازم، قاسم، محەمەد(مەمەد) بەڵام ناوی ژنانیان کوردیان تێدا هەیە، وەکو: سۆناگولل، غونچەگوڵ، گوهەر، بیبی، ئەرزی گول، نارگول، و هی دیکە. [١٦]

- **زمان، ڕۆشنبیری و خوێندەواری، مۆسیقا و هەڵپەڕکێ**

زمان: ئێتنۆگرافەکان دەڵێن: کوردەکانی تورکمێنیا کۆنترین کۆمەڵە کوردن کە کۆچیان بۆ ئاسیای پێشین کردووە. ئەم کوردانە زمانیان کەمێك لەهی کوردەکانی پشت قەفقاز جودایە و بڕێکی زۆر وشەی خوازراوی فارسی و تورکێنی تێدایە.

لێرەدا دەمەوێت باسی ئەو بەسەرهاتە بکەم کە کوردی ناوچەیەکی تر لە کاتی سەردانیدا بۆ تورکمێنیا بەسەری هاتووە:

کوردیکی کازاخستان کە ناوی قوربانعەلی مەمیدەڤ بوو، باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن لەیەکدابڕان دەبێتە هۆی تواندنەوەی کورد... ئینجا نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت: لە گوندی باگیری تورکمێنیا چوونەتە ماڵی کوردێك، کە ناوی شاهنزار بەهلولۆڤ بووە. ئەو ماڵە کوردە زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێ کردوون، بەڵام کاتێك ویستوویانە بئاخڤن، هیچ لەیەك تێنەگەیشتوون و کوردیەکەیان بۆ ئەمان زمانێکی نەزانراو بووە. هەربۆیە ناچار بوون پەنا بەنەبەر زمانی ڕووسی[١٧]

کوردی تورکمانستان بەشێکی گرنگن لە نەتەوەی کورد ئەوەی لە کوردستان و کوردەواری دەرەوەی نیشتمانی کورد دەژین، بە ئایین موسوڵمانن و لەسەر ئایینزای شیعین، زمانی قسەکردن و نووسینیان دیالێکتی کرمانجیی سەرووە. زمانیان لە ڕووی دارشتنی فەرهەنگییەوە لەگەڵ شێوەزاری کوردی ئەرمەنستان و گورجستان تا پلەیێك کوردی ئازربێجانیش یەکتری ناگرنەوە. ئەمە لەوەوە هاتووە کوردی تورکمانستان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی زمانی تورکمانی و فارسی و ڕووسی، ئەمە لەلایێکی دیکەوە بە سوود گەڕاوەتەوە بۆ زمانی کوردی بەوەی دەوڵەمەنتر بووە.

لەپێش دەسەڵاتی سۆڤیەتەکانی کۆن دا خوێندەواری لەناو کورددا نەبوو، بەڵام دوای شۆڕشی ئوکتوبەر نەخوێندەواری بە دەگمەن دەبینرێ، لێرەدا نابێ

ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە دەڵێین خوێندەواری لەناو کورداندا هەیە، مەبەست ئەوە نیە خوێندەوارییەکەی بە زمانی کوردییە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە زمانی خوێندن و ڕۆشنبیرییان تەنیا بە زمانی تورکمانی یا ڕووسی دەخوێنن و دەنووسن، زمانی کوردی تەنیا قسەی پێدەکرێ.

لەپێشانا ١٩٣٠-١٩٣٢ دا لە کۆمەڵی کوردی ئەو وڵاتەدا قوتابخانەی هەبوو و گەلێ کتێبی قوتابخانەش بە زمانی کوردی و پیتی لاتینی چاپ کراوە. بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند و لە ئەنجامی سیاسەتە تیرۆریستی و ناهەموارەکەی ستالینی خوێندن لە قوتابخانە کوردییەکاندا بووە بە تورکمانی. ئەو کتێبە کوردییانەی لەو ساڵانەدا لە شاری عەشقاباد چاپ کرابوون بۆ یادگاری مێژوو هەندێکیان ماونەتەوە.

لە ماوەی فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی سۆڤیەتی کۆن ژیانی کوردی ئەو وڵاتە گۆڕانی بنچینەیی بەسەردا هاتبوو، بە تەواوی بە پێچەوانەی ژیانی پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوو. زۆربەی خەڵکی لە کۆلخۆز و سۆفخۆز و فابریقەکان کاریان دەکرد، بۆ بەڵگە کچە کوردی مەعسوومە حوسێن (تەمەن ٢٢ ساڵ) چێلەك دۆش بوو لە گوندی باگیر لە کۆلخۆزی کۆمۆنیزم کاری دەکرد. کچە کوردێکی دیکە ماسێ سەبزۆ (تەمەن ١٦ سال) هەر لەو کۆلخۆزەدا کاری دەکرد. کوڕێك بە ناوی ئەڵلاوێردی سوبحان وێردی (تەمەن ١٩ ساڵ) وەستای میکانیکی ئوتومۆبێل و تراکتۆرەکانی کۆلخۆز بوو. حەسەن شەڤلی (تەمەن ٣٠ ساڵ) سەرکاری بەشێك لە کۆلخۆزوانەکان بوون.

لە شارەکانی تورکمانستان بە تایبەتی عەشقاباد پزیشك و ئەندازیار و مامۆستای قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەنجی و ئامادەیی و مووچەخۆری میری لەناو کوردان دا دەبینرێن، لەمانە حەسەنی کولی بەیتارە (پزیشکی ئاژەڵ) لە ئاوایی باگیر. لە مامۆستایانی قوتابخانە حەیدەرجان(تەمەن ٢٤

ساڵ). جگە لەمانە بابالی ئانا مەمەد کارگێڕی فابریقەی کیمیایە، خوشکی ئەو کابرایە مەلیکە ئانا مەمەد سکرتێری ڕێکخراوی کۆمسۆمۆڵی ناوچەیی یە لە عەشقاباد. [١٨]

مۆسیقا و هەڵپەڕکێ: مۆسیقا و ئامێرەکانی لەناو کوردی تورکمانستان هێشتا لێیان نەکۆڵراوەتەوە. بەڕاستی ئامێری مۆسیقا و ئاوازی نەتەوەیی ڕەسەنیان هەیە. ئامێری مۆسیقا بریتییە لە: قووشمە (دووزەلە)، بلیر (بلوێر)، بەرەبان (دەف)، دووتار. جگە لە دووتار ئامێرەکانی دیکە هەموویان کوردین و لەناو تورکماناندا نابینرێن. مۆسیقای کوردی زیاتر ڕەنگدانەوەی مێژووی پڕ لە کارەسات و ناسۆر و پەژارەیە. ئاواز لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکی دیکە دەمێنێتەوە.

شایی و هەڵپەڕکێ لەگەڵ کورد دەژی، لەهەر کوێیەك بێ لێی جیا نابێتەوە، لە نیشتمان یا هەرجێیەکی کوردەواری لە دەرەوەی نیشتمان. شایی و هەڵپەڕکێ بنچینەییەکانی ئەم کوردانە ئەمانەن: دووقەرسە (دووپێیی)، سێقەرسە (سێپێیی)، ئالەگوز، قۆچان و خەراوە، ئەوەی دواییان تازە داهاتووە، ئەوانی دیکە کۆنن. زۆربەی ئەم شاییانە بە ڕشبەڵەکیش دەکرێن. [١٩]

- **ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) کوردی تورکمانستان**

بەرهەمی ئەدەبی بە دوو شێوازی نووسین دروست دەبێ، شێعر و پەخشان. ئێمە کە دەچینە ناو گێتیی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) ئەو بەشە کوردەی دوور لە کوردستان، خۆمان لەناو گەنجینەیەکی بە نرخ دەدۆزینەو، چونکە ژیانی ئەو کۆمەڵە کوردەی لە نیشتمانی دوور کەوتۆتەوە ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕەسەنی نەتەوەیی خۆیەتی و لە ژیانی مەڵبەندی تازەیدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەوڵەمەنتر بووە.

### شێعر و بابەتەکانی

شێعری میللی (فۆلکلۆری) نموونەیەکی هونەری، کولتووری و ئایینی و نەتەوەیی کوردی پاراستووە. تا ئێستا بە شێوەیەکی زانستی لێی نەکۆڵراوەتەوە، لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا لەو وڵاتەدا هەندێ تێکست کۆ کرایەوە، بەڵام لە دواییدا لەبەر هۆی سیاسی کە مافی خوێندن بە زمانی کوردی لەناو کوردی تورکمانستان کۆتایی پێهێنرا، چاپکردنی ئەو تێکستانەش نەگەیشتە ئەنجام.

بەرهەمی شێعری ئەدەبی میللی لەڕووی کێشەوە خۆماڵی (سیلابی)یە. بە زۆری کێشە سووکەکان بەکار دەهێنرێن. لەڕووی قافیەشەوە ڕەنگاوڕەنگە. ئەگەرچی بەزۆریش شێعری جووت قافیە (مەسنەوی) دەبینرێ، هەرچی گۆرانییەکانیشە کە لە سێ نیوەدێڕ شێعر پێك هاتوون، بە زۆری یەك قافیەیان دەبێ (ااا.ب ب ب) و لەسەر حەوت کەرت دەهۆنرێتەوە.

ئەم جۆرە گۆرانییانە بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شێعری میللی کوردی تورکمانستان داگیر دەکەن، ئەوەی جێی سەرنج ڕاکێشانە ئەم جۆرە گۆرانییە لە ئەدەبی میللی کوردستانی تورکیا ئەوەندە زۆر نییە وەکو ئەو ئەدەبەی ئێمە لێرەدا باسی دەکەین کە بەشێکە لە ئەدەبی کوردستانی تورکیا. بەلای ئێمەوە هۆی پەرەسەندنی ئەم جۆرە گۆرانییانە لەناو کوردی خۆراسان و لە پاشانا کوردی ئەوێ لەگەڵ خۆیاندا بردبێتیان بۆ تورکمانستان، ئەوەیە ئەمانە ئەم هونەرە گۆرانییەیان لە کوردی دەوروبەری کرماشان و سنە و سلێمانی وەرگرتبێ.

هونەرەکانی شێعری میللی لەڕووی ناوەڕۆکەوە گەلێ بابەتی هەیە، ئەم بابەتانە هەموویان بە قسە دەوترێن و بە گۆرانی دەبێژرێن، لەمانە شێعری شایی و هەڵپەڕکێ و ژن هێنان و هەموو جۆرە زەماوەندێك، شێعری مێرانی (قارەمانی، حەماسی) و دڵداری و لای لایەی لانك، شێعری ئیشکردن و شوانکاران، شێعری شین و لاواندنەوە (کلامێ شینان)، شێعری تریاك کێش و سەرخۆشان،

گۆرانی ژنەبی یان و هی دیکە. ئەم دوو بابەتەی دواییان بۆ ڕەخنە و گاڵتە و گەپ بەکار دەهێنرێن.[٢٠]

خوێنەرانی خۆشەویست بۆ خوێندنەوەی کۆمەڵێك نموونە لە شێعرە جۆراوجۆرەکان دەتوانن سەیری لاپەڕەکانی ٧٨ هەتا ١٧٠ی کتێبی (کوردی تورکمانستان «مێژوو ـ ئەتنۆگرافیا ـ ئەدەب»،دانانی: دوکتۆر مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان ـ هەولێر ٢٠٠٣ ـ چاپی یەکەم ـ چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ـ هەولێر) بکەن.

### *بەڵام لەبابەت پەخشان و بابەتەکانی*

بەرهەمی پەخشانی لە ئەدەبی میللیدا بە قەوارە لە بەرهەمی شێعری کەمتر نییە. جگە لەوە هەندێ حیکایەتی پەخشانی بە تایبەتی ئەگەر دیالۆجی تێدا بێ بە شێعر ناواخن دەکرێ، لەمانە بۆ بەڵگە حیکایەتی میللی «مەلـلا میوەلی» بە پەخشان دەگێڕدرێتەوە و دیالۆجی حیکایەتەکە بە شێعرە. زۆر جار حیکایەتخوان ڕووداوەکان بە پەخشان و قسەی ئاسایی دەگێڕێتەوە، کە دەگاتە شێعرەکان بە گۆرانی دەیانچڕێ. ئەم دیاردەیە بە زۆری لە حیکایەتە درێژەکاندا بەرچاو دەکەوێ، زیاتریش بۆ ئەوەیە حیکایەتخوان یا دەنگبێژ بەشێك لە بەرهەمەکە کە دەبێ بە شێعر، چڕینی شێعرەکە بە ئاوازی گۆرانی ماندووی دەکا، لە کاتێکدا لە شێعرەوە دەبێتە پەخشان، گێڕانەوەی ئاسایی دەبێتە مایەی حەسانەوە بۆی.

بە گشتی لە ئەدەبی میللی دا بابەتی حیکایەت و «گەپی وەمەنی» واتە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان لەناو کوردی تورکمانستان دەکەونە بەرچاو.

دەبێ ئەوە بڵێین حیکایەتەکان لە بابەت ناوەرۆکەوە ڕەنگاوڕەنگن، هەندێ لایەن لە ژیانی کۆمەڵایەتی ڕوون دەکەنەوە، لە بزووتنەوەی دەروونی و ئاوات

و ئامانجی ئادەمزاد دەدوێن، ئاوڕ لە دڵداری و هەندێ لایەنی ڕابواردنی مرۆڤ دەدەنەوە، چێژ دەخەنە ناو دڵی منداڵان و ڕووداوی ئەفسانەیی دەکەن بە بەرهەمێك بۆ گەورانیش زاخاوی مێشك دەبن.

خوێنەرانی خۆشەویست دەتوانن چەند پەخشانێکی جوانی کوردانی تورکمانستان لە لاپەڕەکانی ١٧٠ تا ٢٠٠ی کتێبی «کوردی تورکمانستان» دا بخوێننەوە.

هەروەها قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی زۆر جوانیشیان هەن کە ئەوان خۆیان گەپی وەمەنی - واتە (قسەی بە مەعنا)ی پێدەڵێن. ئەدەبی میللی کوردی تورکمانستان لەم بابەتە گەلێك دەوڵەمەندە. لێرەدا هەندێ نموونە لەم پەندانە دەخەینەڕوو، ئەم بەڵگانە ئەو ڕاستییە دەردەخەن کە لەبنجدا ئەم پەندانە یەکێکن و لە گەشت و گەڕان دان لەناو هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی و لە زۆر شوێندا لەگەڵ پەندی نەتەوە هاوسێکان و هەموو میللەتانی سەر ڕووی زەوی یەکتری دەگرنەوە.

١ـ ئادەمێ ك میر پێ گرت، ژە رەددی وەرسێ ژ ئەترسی.

واتە (مرۆڤی مار پێوەدراو، لە خشەی گوریسیش دەترسی). لە فارسیشدا دەڵێن (مارگزیدە از ریسمان سیاه و سفید می ترسد).

٢ـ شووژنێ وەرخۆ نەوینی، ئەمما دەرزی یێ وە ئەر خەڤالی خۆ دەوینی.

٣ـ هەر بلندییێك پەستی یێ خۆ ژ هەیە.

٤ـ هووچکێ سوورۆ پەلاوی بخۆ.

٥ـ وە دەستی هەولی خۆ ئیر مەگیر.

٦ـ پی لە سەری ماری راکە تەمەن وە تە گز.

٧ـ قەدری زێر زەرگەر زان.

٨ـ سا هەڤالی خۆ چالێ مەکوول، وەخۆ دەکەوی.[٢١]

### ● ژیان و بەسەرهاتی جافەرقولی (١٨١٤ ـ ١٩٠٥)

جافەر قولی شاعیری ناسراوی کوردی خۆراسان و تورکمانستان ئەوەندەی لای خەڵکی بەناوبانگ و خۆشەویستە، ئەوەندە لە ژیان و بەرهەمی شێعری نەکۆڵراوەتەوە. ئەو زانیارییەی لە ناوەوەیە لە بابەت ئەم شاعیرەوە بەشێکی لە ئەفسانە دەکا، لەگەڵ ئەوەش دا مێژووی ئەدەبی کوردی ڕەنگین دەکا، چونکە ئەفسانەی ئەگەر بێبنیادی ڕاستیش بێ، هۆش و بیر دەجوولێنێ و خەیاڵ و چێژ دەبزوێنێ و هەندێ جار بەرەو دۆزینەوەی ڕاستی دەبێتەوە و هەندێ جاریش دەبێتە ڕەمزی سۆفیزم.

جافەر قولی (جەعفەر) بە جافەر قولی زەنگلی، جافەرقولی بێچارە، جاقەر قولی عەندەلیب، جافەر قولی موختار ناسراوە. هەندێ لەم ناوانە خۆی بۆ خۆی دانابوون، لەناو خەڵکی بەم ناوانە ناسراوە.

ئێمە لەم ماوەیەدا هەوڵ دەدەین زانیاری لەبابەت ژیانی شاعیرەوە بخەینەڕوو بەپێی سەرچاوەی کوردانی خۆراسان و تورکمانستان.

١ـ ئەوەی لە سەرچاوەی کوردی خۆراسان هاتووە دەڵێ، جافەر قولی لە ئێلی کوردی زەنگەلانلوو بوو، لە دەوروبەری ساڵی ١٨١٤ لە گوندی شکافکۆی لە بنەماڵەیەکی ڕەنجبەری دێهاتی لەدایك بووە. ئەم گوندە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی قوچان. خوێندنی بە ڕێکوپێکی نەبووە.

لە تافی لاویەتیدا توشی حاڵەتی پرتەوی (ئیشراق) بووە و گرفتاری جوانی کچێك بووە، ناوی ملواری بووە، لەم لایەنەوە خۆی دەڵێ: «مەلە نینم، خود بەندەم، وە سی جزمێ قورئانێ». (واتە مەلا نیم، شاعیرن، بە شی جزمی قورئان).

کوردی خۆراسان پێیان خۆشە لە بابەت جافەرقولییەوە بڵێن: ئەگەر مەولانا عەشقی شەمسی تەبریزی بێ، جافەر قولی عەشقی ملواری یە. ئەم شاعیرە بە

دڵدار و هونەروەر و جیهانگەرد و موسیقار و دانای دەژمێرن، کە ناوی دەبەن « مەلیکولشوعەرای کرمانج »ی پێدەڵێن.

لە سەرچاوەی کوردی خۆراسان دەگێڕنەوە شوکورولڵا ناوێك سەد و سی ساڵ ژیاوە (١٨٠٢-١٩٣٢)، بۆ خەڵکی گێڕاوەتەوە لە کاتی خۆی دا چاوی بە جافەر قولی کەوتووە لە ناوچەیەکی نێوان چەگنە و سوڵتان مەیدان لە ویلایەتی قۆچان، ئەو دەمە بە تەمەن پیر بووە، بەڵام لەسەرخۆ بووە، دووتاری بە ملەوە بووە و بە گۆرانی شیعری خۆی چڕیوە. دەڵێن ماوەیەکی زۆر لە سارا و بیابانان لەگەڵ ئاژەڵ و درندە و باڵندان دا ژیاوە. شار بە شار و کووچە بە کووچە بە دووتارەوە شیعری خوێندۆتەوە. گەلێ گێڕانەوەی تریش لەناوەوەن لەبابەت گەشت و گەڕان و ئاوارەیی جافەر قولییەوە، لەوانە گۆیا ماوەیەك لە وڵاتی خوارەزمدا ژیاوە لەو خاکانەی ئێستا بە کۆمارە ئیسلامیەکانی ئاسیای ناوەڕاست ناویان دەبەن.

لە بابەت مردنی شاعیرەوە دیسانەوە هەندێ ئەفسانە کەوتۆتە ناوەوە، وەکوو ئەوەی دەڵێن نەمردووە، ئاوی ژیانی خواردۆتەوە وەکو خدر پێغەمبەر زیندووە و جێی تایبەتی نییە، هەمیشە لە سەفەر و هاتوچۆ دایە. دوور لە ئەفسانە هەندێ کەس لەسەر ئەو باوەڕەن لەدوا ڕۆژانی ژیانی لە خوارەزم ژیابێ و لە ساڵانی سەرەتای سەدەی بیستەم (١٩٠٥) کۆچی دوایی کردبێ.

٢ـ سەرچاوەی کوردی تورکمانستان لە بابەت جافەر قولییەوە، ئەو زانیارییانەیە کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٦١ عەباس مەمەد نەزارۆڤـ لە شاری ماری (مەڕۆی کۆن)ی نزیك شاری عەشقاباد کۆی کردبوونەتەوە.

سەرچاوەی ئەو زانیارییانە، ناوی نەزار ئەحمەد بوو، لە ساڵی ١٩٠٧ لە گوندی لاین لە ناوچەی دەرەگەز لە ئێران لەدایك بوە. لە ساڵی ١٩٤٩ لەگەڵ خێزانی شێروانی ئەلفەغی (لەدایك بووی ١٩٠٩) لەبەر هەژاری و سەختی

ژیـان ڕووی کردۆتـە تورکمانسـتان.

ئـەوەی نـەزار ئەحمـەد بـۆ عەبـاس مەمـەد نەزارۆڤـی گێڕاوەتـەوە بیـرەوەری تەمەنـی دوازدە سـێزدە سـاڵەی بـووە. ئەویـش لـە کابرایەکـی بیسـتووە نـاوی ئەڵڵا پەنـا بـووە، ئـەو کاتـە پیر بـووە و تەمەنی دەوروبەری هەشـتا سـاڵ بووە، ئـەم کابرایە ئاخونـد بـووە، لـە مەدرەسـەی ئایینی وانـەی زانسـتییەکانی ئایینـی وتۆتەوە.

لـە گێڕانەوەکانـی نـەزار ئەحمـەد ئـەوە دەردەکـەوێ ئەڵـڵا پەنـا هاوڕێیەکـی نزیکـی جافـەر قولـی بـووە، زیاتر هـۆی ئـەو نزیکیـەی وەك برایەتـی وا بـوو ئەوە بـوو هەردووکیـان خوێنـدەوار بـوون. لـەو زانیارییانـەدا ئـەوە دەردەکـەوێ جافـەر قولـی دەنگی خۆش بووە، هەمیشـە بـەدەم ئامێری تـارەوە گۆرانی وتـووە، بە زۆری شـێعری خـۆی خوێندۆتەوە. ئەو گۆرانییانەی بەسـەر کچێك وتـووە، ناوی ملواری بـووە، ئەمـە کچـی کاروالا گولـی بـووە، خەڵکـی گونـدی زەنـگلان لـە ناوچـەی دەرەگـەزی ئێران.

دەڵێـن ڕۆژێـك لـە ڕۆژان ئەڵـڵا پەنـا لەگـەڵ هاوڕێیانـی خـۆی پـارە کـۆ دەکەنـەوە و دەچـن بـۆ لای باوکـی ملـواری بـۆ ئـەوەی کچەکـەی بۆ جافـەر قولی بخـوازن، بـەڵام شـاعیر بـەم کردەوەیـە ڕازی نابـێ. ئەڵـڵا پەنا لێـی دەپرسـێ، ئەدی چیـت دەوێ؟ دەڵـێ: کـە لـە تەمەنـی مێردمنداڵـی دا بـووم، هەمـوو سـاڵێك بـە مەڕوماڵاتـەوە ڕوومـان دەکـردە کوێسـتان. سـاڵێك لـە سـاڵان کـە لە چیا نیشـتەجێ بوویـن، ڕۆژێکیـان لـە قەراغ کانـی و ئاوێك خـەوم لێ کـەوت. لە خەومـا ملواریم دی، دەسـتبەجێ ئاگـری عەشـق لەنـاو دڵ و دەروونـم دا گـڕی سـەند و لـە هـۆش خـۆم چـووم. لـە پڕ خەبـەرم بووە و لەخەو هەڵسـام و هەسـتم کـرد زمانـم لاڵ بووە و قسـەم بـۆ ناکـرێ. کات ئێـوارە بـوو، یەکسـەر باپیـرەم (باوکـی دایکـم) بردمی بۆ زیارەتـی ئیـمام، بێگومـان مەبەسـی ئیـمام ڕەزای مەشـهەدە لە خۆراسـان، مانگێك لـەوێ مامـەوە لەپـاش ئـەوە زمانـم کرایەوە.

لەدوای ئەوەی گرفتاری عەشقی ملواری دەبێ دووتار هەڵدەگرێ و شێعر و گۆرانی وەك لێشاو لەناخی دڵییەوە هەڵدەقوڵێن. بە دێهات و ئاواییان دا دەسوورایەوە، بە شوێن ئەو ملوارییە دەگەڕا کە لە خەو چاوی پێی کەوت بوو.

لە گوندی زەنگلان چاوی بە ملواری کچی کاروالا گولی دەکەوێ، بەڵام ئەوە نەبوو کە لە خەوندا بینی بووی، هەرچەندە ئەمە شێوەی لەوی دەکرد بەڵام ئەو نەبوو، لەبەر ئەوە بڕیاری دا ژن نەهێنێ تا ملواریی خەونەکە نەدۆزێتەوە.

ئەڵڵا پەنا ڕووداوێکی دیکەش لە ژیانی جافەر قوڵی دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

جارێکیان جافەر قولی داوەتێکی بچووك بۆ هاورێ نزیکەکانی دەکا.لەو کۆڕە پڕ لە چێژ و زەمزەمەیەدا لە کاتی گۆڕانی چڕین زمانی لاڵ دەبێ و لە هۆش خۆی دەچێ.

ئەڵڵا پەنا و هاوڕێکانی وشترێك ئامادە دەکەن، جافە قوڵی سواری وشتر دەکەن و بزنێك دەخەنە ناو خۆرجێکەوە و لەسەر پشتی وشتری دادەنێن و بەرەو ئارامگای «ئیمام باڤە ڕەمەزین» کە نزیك گوندەکەی خۆیان بوو دەکەونە ڕێ، ڕێگە شاخاوی بوو، جافەر قولی شێعری بۆ هاتبوو، بەڵام زمانی نەبوو و نەیدەتوانی بیخوێنێتەوە، تا کاتێکی لە دوورەوە ئارامگەی ئیمام باڤەرەمەزین دەرکەوت، لە پڕ زمانی کرایەوە و ئەم شێعرەی خوێندەوە:

بیست جایلە نازەنینۆو
تەڕەنە باڤە رەمەزینۆو
هەم سوونگیرن، هەم لاچینۆو

سیسا بووزە روو وا دەرنە
سنگی تە پالووزە تەرنە
دەشتی وان و ئەز لە سەرنە

هاوڕێیانی جافەرقولی لە گوڵزاری ئارامگەی ئیمام باقە رەمەزین کۆڕیان بەست و بزنەکەیان سەر بڕی و سەیرانێکی خۆشیان کرد و گەڕانەوە ماڵی خۆیان. دوا هەواڵی شاعیر کە ئەڵڵا پەنا بە نەزار ئەحمەدی وت بوو، ئەوە بوو لە پاش چەند ڕۆژێك جافەر قولی ون بوو، ئیتر کەس بە جێگە و ڕێگەی نەدەزانی.

ماوەی نیو سەدەیەك بەسەر ئەم زانیارییانە تێپەڕی بوو، ئەم جارەیان نەزار ئەحمەد لە حاجی سمایلی بیستبوو، وتبووی: لەو کاتەی چووبووم بۆ حەج لە مەککە چاوم بە پیرێکی نەخۆشی پەککەوتوو کەوت، سەر و ریشی و سمێڵی زۆر سپی بوون. بیابەخ لەو گۆڕە کەوتبوو. لێی نزیك بوومەوە. دەست بەجێ ناسیمەوە ئەمە جافەر قولییە. لێم پرسی ئەوە چی دەکەی لێرە با پێکەوە بچینەوە وڵات. جافەر قولی وتی: تا نەگەمە مەبەسی خۆم و ملواری نەدۆزمەوە، ڕوو لە وڵات ناکەمەوە! وتم: ئاخر پیر بووی و بە تەواوی داکەوتووی! وتی: ئەگەر ملواری بدۆزمەوە تازە و گەنج دەبمەوە.

هەروەها نەزار ئەحمەد گێڕابوویەوە لە چەند پیرێکی دیکە بیستوویەتی جافەر قولی لە تافی لاویدا لە گوندی خۆیان ژنی هێناوە، بەڵام نزیکی ژنەکە نەکەوتووە.

هەر چۆنی بێ جافەر قولی کەسێکی مێژووییە، خەیاڵی خەڵکی کورد ڕاستییەکانی بەسەرهاتی شاعیریان هەندێ جار بە ئەفسانە لێکداوەتەوە، بەمە سامانی نەتەوایەتییان دەوڵەمەندتر کردووە.

### شێعری جافەر قولی

بەلای خەڵکی کوردی تورکمانستان جافەر قولی شاعیرێکی بێهاوتا و دەنگخۆشێکی بەناوبانگ بووە، هیچ شایی و زەماوەندێك بەبێ ئەو نەکراوە، لەدوای هەموو زەماوەندێك گەلێ دیاریی بەنرخی پێشکێش دەکرا، بەڵام بۆ

خۆی هەڵینەدەگرتن، بەڵکو بەسەر هەزار و بێتەوایان بڵاوی دەکردنەوە.

لە ماوەی زیاتر لە سەدەیەك بەرهەمی شێعری جافەرقولی لە سنگ و مێشکی خەڵکی کورد پارێزراون، چونکە لەناو عەشرەتە کوردەکانی خۆراسان و تورکمانستان خوێندەواری باو نەبووە، لەبەر ئەوە تۆمار کردنی بەرهەمی ئەم شاعیرە دوا کەوتووە.

بە گشتی شێعری جافەر قولی دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١ـ شێعری قوتابخانەی ئیسلامەوی (لێکدانی ئەدەبی عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی و کوردی)، ئەمەیان بریتییە لە قەسیدە و غەزەل و تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و هی دیکە.

٢ـ شێعری خۆماڵی میللی کە لە شێعری سەرزاری فۆلکلۆرییەوە نزیکە.

لە بەرهەمی شێعری جافەرقولی لە هەندێ جێگە ئەم دوو جۆرە شێعرە بە ڕوونی لە یەك جیا دەکرێنەوە و هەر یەکەیان شەقڵی تایبەتی خۆی پێوەیە، بەڵام زۆر جار هەردوو بابەتەکە تێکەڵ بە یەکتری دەبن و هونەرێکی بەرز دەکەوێتەوە ناوەوە و شایەدی ئەوە دەبێ جاقەر قولی وەکو شاعیرێکی بەرز بخاتەڕوو.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هەندێ لە شێعری جافەر قولی تۆمار کراون، بەم جۆرە ٣٢ دەستنووس لەبەر دەست بووە، ئەمانە هیچ یەکێکیان ڕۆژی نووسینەوەیان لەسەر نەنووسراوە، لە دواییدا ئەمانە بوون بە سەرچاوەی بنچینەیی بۆ چاپکردنی دیوانی جافەر قولی.

لێرەدا هەوڵ دەدەین ناوی گرنگترین و جوانترین بەرهەمی هەموو بابەتەکانی جافەر قولی بخەینەڕوو، مەبەس لە هەموو بابەتەکان شێعری تەقلیدی و میللی و فۆلکلۆر ئامێز و شێعرە تێکەڵ کراوەکانە. هەندێکیان ناویان هەیە و بڕێکیان ناویان نییە، ئێمە بۆ ناساندن ناویان بۆ دادەنێین.

١ـ لە مەیخانە، تەرکیب بەندە، لە حەوت خشت پێك هاتووە.

٢ـئیزدواجی عەلی بە فاتیمە.

٣ـمیعراجنامە، لە ١٧ پێنجین پێك هاتووە، نیوەدێری پێنجەم ئەمەیە:

مەرحەمەت کر خوداوەند  پێغەمبەر چوو میعراجێ

٤ـدیداری ملواری لە باغ، لە ١٧ پێنجین پێك هاتووە.

٥ـداستانی فیتنەی سالار لە خۆراسان، بە زمانی تورکییە لە ساڵی ١٢٦٤ه/ ١٨٤٧م نووسراوتەوە.

٦ـداستانی سلێمان و بەلقیس، بریتییە لە ٣٤ پێنجین.

٧ـشێعرێکی بۆ قات و قڕی ساڵی ١٢٨٨ه/ ١٨٧١م وتوە. لە شێوەی موناجات دایە، لە ١٨ پێنجین پێك هاتووە.

٨ـ ٣٢حەرف بە شێعر لێکدراوەتەوە.

٩ـملواری دڵی من برد.

١٠ـکەچکێ نە قزل حەسارێ.

١١ـگولجهان ژە من جودا بوو.

١٢ـجان و دل بێ تابن ئیرۆ.

١٣ـداستانێ مرتەزا عەلی و بەندێ بەربەر.

١٤ـپوور و پشێمانی دەروون، لە ١٦ پێنجین پێك هاتووە.

١٥ـلە دیوانی جافەر قولی دا ٥٨ چوارین بەدی دەکرێ.

١٦ـملواری ڕندە، ئەمە قەسیدەیەکی درێژە.

جافەر قولی جگە لە زمانی کوردی دایکی خۆی، عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە، دوور نییە زمانی هەندێ لە تورك نەژادانی ئاسیای ناوەڕاستیشی زانی بێ، لەوانە بە تایبەتی زمانی ئۆزبەکی و زمانی دانیشتووانی تورکمانستان.

لە دیوانی شاعیردا برێك شێعری تورکی بەرچاو دەکەوێ، مەبەس لێرەدا تورکی عەسمانییە، هەروەها ئاگاداری زمانی ئازەری و تورکمانی ڕۆژهەڵاتی

ناوەراسـت بـووە. بێگومـان زمانـی ئەمانـە بـە تـەواوی جیـاوازە لەگـەڵ زمانـی تورکمانـی تورکمانسـتانی ئاسـیای ناوەڕاسـت.

### *شێعری جافەر قولی لەناو کوردی تورکمانستاندا*

تێکسـتی شـێعری جافەرقولـی ئـەوەی لێـرەدا بـڵاوی دەکەینـەوە، تایبەتییـە بـە کـوردی تورکمانسـتان. دیـارە ئـەوان لـە خۆراسـانەوە هێناویانـە و بە ئەزبـەر نەوە بە نـەوە پاراسـتوویانە. ئەوەنـدەی ئێمـە ئـاگادار بیـن ئـەم شـێعرانە بـۆ یەکەمیـن جـار بـڵاو دەکرێنـەوە، ئەگـەر هەندێکیـان بڵاویـش کرابووبنەتـەوە، ڕەنگـە جیـاوازی لەنێـوان ئەمانـەی ئێمـە و بڵاوکراوەکانـدا هەبێ. لێـرەدا هەمـوو شـێعرەکان بەسـەر یەکـەوە دەبـن بە سـەرچاوە بۆ بەراوردکردن و سـاغ کردنەوە و تێگەیشتنی تێکسـتە جۆراوجـۆرەکان.

لـەم کتێبـەدا ئـەو شـێعرانەی جافـەر قولـی کـە بـە نـاوی «گۆرانییەکانـی جافـەر قولـی» بڵاویـان دەکەینـەوە لەنـاو کـوردی تورکمانسـتان و هەمـوو کـوردی کۆمارەکانـی دیکەی ئاسـیای ناوەراسـت بـە شـێوەیەکی فـراوان دەخوێندرێنەوە و بـە گۆرانـی دەووترێـن، بـە تایبەتی لە شـایی و هەڵپەڕکـێ و زەماوەنـدی ژن هێنان.

ئـەم شـێعرانە لە هیـچ دەسنووسـێك نەنووسراونەتـەوە، بەڵکو بەدەم لە کەسـانی بەسـاڵاچوو و مـەلا و ئاخونـد وەرگیـراون. ئەوانـەی ئـەم شـێعرانەیان گێڕاوەتـەوە زۆرن، بـەڵام ئێمـە هەندێکیـان دەسـت نیشـان دەکەین.

١ـ شامیرزا مووسا رەزا (لە ساڵی ١٩٠٣ لەدایك بووە).

٢ـ مووسایێف ڕەزا (لە ساڵی ١٨٩٠ لەدایك بووە) برای شامیرزایە.

٣ـ شەرەف خانۆڤـ قەرەخان (لە ساڵی ١٨٩٢ لە دایك بووە).

٤ـ مەلا ئەڵڵا قولی مەمەد (لە ساڵی ١٨٩٨ لە دایك بووە).

ئەمانە هەموویان لە شاری عەشقاباد دادەنیشن.

٥ـ نەزار ئەحمەد (لە ساڵی ١٩٠٧ لەدایك بووە)، لە شاری ماری دادەنیشێ.

٦ـ سەفەر ئیبراهیم (لە ساڵی ١٩٠٤ لە دایك بووە) لە گوندی باگیر لە نزیك شاری عەشقاباد لە کۆلخۆز دادەنیشێ. ....[٢٢]

خوێنەری خۆشەویست، بۆ خوێندنەوەی شێعر و گۆرانییەکانی جافەر قولی دەتوانن سەیری ئەم دوو بەرهەمە بکەن:

١ـ کوردی تورکمانستان، لە دانانی دوکتۆر مارف خەزنەدار.

٢ـ دیوانی جافەر قولی، کلیم الله توحدی.

## • سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ چوارەم

١. خەزنەدار، د.مارف، کوردی تورکمانستان، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٣. ل١٣ و ١٤.

٢. هەورامی، د. ئەفراسیاو، کوردستانی پشت قەفقاس، چاپی یەکەم، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥. ل ٢٠.

٣. عەلی، ئارام، پەیوەندی نێوان کورد و روسیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی لیرە، سلێمانی، ١٩٩٩. ل ١٦٦.

٤. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل١٥.

٥. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٢٣ ـ ٢٥.

٦. کەریم، ڕەمەزان، وردەکاریی پەرش و بڵاویی کوردەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو (www.faceiraq.com/inews.php?id=1473208)

٧. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ١٩.

٨. ڕەحمانی، وریا، کوردستان و کورد لە ڕوانگەی نەخشەوانیەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠٠٩، ل ٦٢.

٩. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٦٥.

١٠. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٢٥.

١١. لازاریف، م.س، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٤٠٣.

١٢. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٢٦ ـ ٢٨.

١٣. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٢٨ ـ ٢٩.

١٤. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٢٩ ـ ٣١.

١٥. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٣١.

١٦. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٣٢ ـ ٣٥.

١٧. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٦٥.

١٨. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٣٦ ـ ٣٧.

١٩. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٣٨.

٢٠. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٧٨.

٢١. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٢٠٠ تا ٢٠٥.

٢٢. خەزنەدار، د.مارف، س.پ. ل ٣٩ ـ ٤٧.

## • پێنجەم: کوردەکانی قرقیزستان

- چەند زانیارییەك لەسەر وڵاتی قرقیزستان
- سەردەم و هۆکاری کۆچ کردنی کوردان بۆ قرقیزستان
- ژمارەی کوردەکانی قرقیزستان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە قرقیزستان
- چالاکیی کوردەکانی قرقیزستان
- سەرچاوەکان

### • چەند زانیارییەك لەسەر وڵاتی قرقیزستان

کۆماری قرقیزستان بە ڕووبەری ١٩٨٥٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشە، لە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای ناوەڕاست هەڵکەوتووە. ئەم وڵاتە لە باکوورەوە لەگەڵ کازاخستان، لە باشوورەوە لەگەڵ تاجیکستان، لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات لەگەڵ چین و لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ کۆماری ئۆزبەکستان هاوسنوورە.

حەشیمەتەکەی ٥،١٤٦،٠٠٠ کەسە. ٦٤،٩٪ قرقیز، ١٢،٥٪ ڕووس و ١٣،٨٪یش ئۆزبەکن و زۆر کەمایەتیی دیکەشی لێ دەژین. خاوەنی ٧ پارێزگایە و پایتەختەکەی شاری «بیشکەك»ە. زمانی فەرمیی خەڵك ڕووسی و قرقیزی و ئایینەکەیان ئیسلامە. لەسەدا ٧٥ی خەڵك موسوڵمان و لەسەدا ٢٠ی مەسیحی و ٥٪ی شوێنکەوتووی

ئایینەکانی دیکەن.

پێشتر قرقیزستان بەشێك لە تورکستانی ڕووسیا بوو. دواتر لە سالی ١٩٢٦ی زایینی، بو بە یەکێك لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت. دوای لێکهەڵوەشانی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١، بوو بە وڵاتێکی سەربەخۆ.[١]

- **سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ قرقیزستان**

مێژووی کوردی قرغیزستان پڕ لە ئێش و ئازارە. جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٣٧ لە نەخجەوان و ئەرمەنستانەوە و جاری دووەمیش لە ساڵی ١٩٤٤ لە گورجستانەوە بە دەیان هەزار کورد لە ترێن و کامیۆنی ئاژەڵان سوار کران و لەژێر کۆنترۆڵ و کەشی پۆلیسیی ئەرتەشی سۆڤیەتدا بەرەو ئاسیای ناوەڕاست ڕاگوێزران لە ڕەوتی ئەو ڕاگواستنەشدا بە سەدان کەس گیانیان لەدەست دا.[٢]

لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ساڵی ١٩١٧ گۆڕانکاری بەسەر زۆر شتدا هات و ئەو گۆڕانکارییانەش دوو ئەنجامی لێ وەدەست هات: یەکەمیان: ئەو کوردانەی کە هەمیشە لەکۆچی بەردەوامدا بوون، شوێن و جێگای خۆیان بۆ دیاری کرا. دووەم لە ساڵی ١٩٢٣ هەتا ساڵی ١٩٢٩ لە سەردەمی لینیندا خوێندنگەی تایبەت بە زمانی کوردی کرایەوە و هەروەها ڕۆژنامە و بڵاوکراوە بە زمانی کوردی بڵاو کرایەوە.

لە ناوەڕاستی ساڵانی سییەکاندا ئیدی کۆتایی بە پیادەکردنی سیاسەتی کلتوورە هەمەجۆرەکان هات و لەو کاتەوە سیاسەتی مەرکەزییەت پیادە کرا و هەموو بڕیارەکان لە ئاستی سەرەوە دادەبەزینە خوارەوە، دووبارە کێشەی نێوان هاووڵاتیە ڕووسەکان و کەمینەکان سەری هەڵداوە، ئەم دیاردەیە دژی کەمینەی کوردەکانیش بوو، بەهەزاران کورد سەرلەنوێ لە کازاخستان و قرغیزستان و سیبیریا نیشتەجێ کران و بەرەو ئەو ناوچانە ڕاگوێزراون.[٣]

پرۆفیسۆر دوکتۆر کنیاز ئیبراهیم، ڕۆژهەڵاتناس و ئەندامی ئاکادێمی و سەرۆکی

كوردەكانی كازاخستان كە لە زانكۆی ئابای ئەڵماتا سەرۆكی ناوەندی زمانەكانی دنیایە دوای شەڕی قەرەباغ، ئەرمەنستانی جێهێشتووە و لە سەرەتای ساڵی ١٣٦٩ دەگاتە ئەڵماتای كازاخستان و لەوێ نیشتەجێ دەبێ. لە یەریڤانی ئەرمەنستان بۆ ماوەی چەند ساڵ لە زانكۆی خاچاتوری ئابوویان وەك بەرپرسی بەشی زمانناسیی و ئەدەبیاتی ئازەری كاری كردووە.ئێستاكەش ئەندامی یەكێتیی نووسەرانی كازاخستان و ئەندامی یەكێتیی ڕۆژنامەنووسانی كازاخستانە.لەلایەكی دیكەوە ئەو لە كازاخستان و ئاسیای ناوەڕاستدا، نوێنەری ناوەندی پەناكورد بووە و بەرپرسی گۆڤاری ئەدەبیی «نوبار»ە لە ئەڵماتایە كە بە زمانەكانی كوردی و ڕووسی بڵاو دەبێتەوە.

ئەو زۆر خەڵاتی نەتەوەیی وەرگرتووە.بەسەرشەش زمانی زیندووی نێونەتەوەییدا زاڵە و نزیكەی بیست بەرهەمی بەنرخی كوردی پێشكەش بە كتێبخانەی كوردی كردووە. ناوبراو لەم پێوەندییەدا دەڵێ:

لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینی بنەماڵەی دایكم و دووهەزار بنەماڵەی دیكە بەهۆی گۆڕانكارییەكانی سنوور دەچنە نێو سنوورەكانی نەخجەوان لە سۆڤیەتی پێشوودا. ئەو سەدەم زۆر لە عەشیرە كوردەكان بەهۆی ڕاپەڕینی ئاگری و شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران بەرەو سنوورەكان ڕایان دەكرد و لە ترسی زوڵم و زۆریی ئیمپراتۆریی عوسمانی ماڵ و وڵاتی خۆیان جێدەهێشت.

خەڵكی كورد بە وەزعێكی زۆر كارەساتبار تەبعید كراون. هێندێكیان چوونەتە ئێران. ئێمە سەر بەو عەشیرەتانە بووین كە ساڵی ١٩٢٦ هاتووینە ناو خاكی سۆڤیەتی پێشوو. زۆر لە عەشیرەتە كوردەكان بۆ نموونە بروكی، جەلالی و سیپەكییەكان دەربەدەر بوون. بەڵام زۆرزبەیان بروكی بوون كە تا ساڵی ١٩٣٧ لەوێ مانەوە.

... ساڵی ١٩٣٧ بەبیانووی ئەوەكە كوردەكان لەسەر سنوورەكانی ئازەربایجان، ئەرمەنستان و توركیا كاری سیخوڕی و هەواڵگریی ئەنجام دەدەن، دەسەڵاتدارانی ئازەربایجان و ئەرمەنستانیش دەیانەویست كوردەكان لەوێ دوور بخەنەوە.ئامانجیان

دوورخستنەوە و یەك نەتەوەکردنی ئەو ناوچانە بوو. لەو ساڵەدا کوردەکانیان سواری شەمەندەفەری تایبەت بە هەڵگرتنی ئاژەڵ و مەروماڵات کرد و لەژێر کۆنترۆڵی سوپادا تەبعیدیان کرد. هیچکەس نەیدەزانی بۆ کوێیان دەبەن. دوو مانگی تەواو لەرێگەدا بوون، بە شێوەیەکە هێندێك لە دایکەکان منداڵەکانیان جێدەهێشت و دەڕۆیشتن!! سەرەنجام خۆیان لە سنووری کازاخستان و قیرقیزستان دەبیننەوە. لە شوێنێك کە بەڕاستی سەرما و بیابانێکی مەترسیداری هەبوو. نە کوردەکان زمانی ئەوانیان دەزانی و نە خەڵکی ئەو ناوچە سەخت و کوێستانییانە.

بنەماڵەی ئێمەشیان ـ باوك، دایك، خوشك، برا، بابەگەورە و دایەگەورە و خزمەکان ـ یان لە ویلایەتی غەزەل قیبای قرقیزستان دابەزاند لە نزیك ئوشی، ئوشی لە نزیك سنووری ئۆزبەکستانە. کوردەکانی ئەرمەنستانیان بۆ قرقیزستان و کوردەکانی ئازەربایجان و نەخجەوانیشیان بۆ کازاخستان دەهێنا. بنەماڵەی ئێمە تا ساڵی ۱۹٤۱ بۆ ماوەی سێ ساڵ لەو شوێنە مانەوە.»[٤]

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا هاتووە: لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بە تایبەتیش لە ساڵی ۱۹٤٤بۆ جارێکی تر لەلایەن سۆڤێتەوە دەست کرایەوە بە سیاسەتی ڕاگواستنی زۆرەملێی کورد لە جۆرجیا و ئەرمینیا بۆ بیابانەکانی کازاخستان و ئۆزبەکستان و قرغیزستان و تورکمانستان. ئەمجارەشیان بە بیانووی ئەوەی کورد لە نەژادی ئاریین و هەمان ڕەگەزی ئەڵمانین لەکاتێکدا گەنجانی کورد ڕەوانەی جەنگ کرابوون بۆ دژایەتی کردنی نازییەکان و تورکیاش لەبەرەی نازییەکاندا بوو، بەڵام ئیتر نازانرێت بۆچی ستالین بەو شێوە لە کورد تووڕە بوو و تا بەو جۆرە لە چلەی زستاندا و بە شواری شەمەندەفەر ڕایانبگوێزێت کە بەشێکیش لە منداڵەکانیان لە ڕێگادا گیانیان لەدەست داوە.

د. محەمەد عەلی سوێرکی کە نووسەر و توێژەرێکی کوردی ئۆردنە لە ژمارە ۳۱٤۷ی ڕۆژنامەی« الاتحاد» لە نووسینێکدا بە ناونیشانی «کوردانی قرغیزستان»

دەڵێت: ئەو کوردانەی لە قرغیزستان دەژین لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و بەتایبەتیش لەپاش داخستنی سنووری نێوان تورکیا و یەکێتی سۆڤیەت ڕوویان لە ڕووسیا قەیسەری کردووە کە پێشتر لە ناوچەکانی سەر بە کوردستانی سوور ژیاون.

یەکەمین کۆچی کوردان بۆ قرغیزستان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٧ و دووەم کۆچی بەزۆریشیان بۆ ئەو وڵاتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٤ واتە بەر لە کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی و هۆکاری ئەو ڕاگواستنەشیان کۆمەڵێك هۆکاری هەیە کە باوەڕپێهێنەر نین لەوانەش:

دەسەڵاتدارانی سۆڤیێتی بە ڕابەرایەتی ستالین پێی وابووە کە کورد لەبەر نزیکیان بە سنوورەکانی تورکیا دەبنە مایەی مەترسی بۆ سەر ئاسایشی سۆڤێت، ئەمە جگە لەوەی ستالین کوردی بە سیخوڕی کردن بۆ ئەڵمان تۆمەتبار کردووە لەبەر ئەوەی کوردیش سەر بە نەژادی ئارین و لەگەڵ ئەڵماندا هاونەژادن.[٥]

- **ژمارەی کوردەکانی قرقیزستان**

ژمارەی حەشیمەتی کوردەکانی ئەم وڵاتە بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٨٩، ١٤ هەزار و ٢٦٢ کەس بووە بەڵام لە هێندێك سەرچاوەدا هاتووە کە ٤٦ هەزار و ١٥٠ کەسیش نووسراوە کە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئاماری ١٩٨٩ هەیە. (٦)

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا هاتووە «نزیکەی» ٧,٩٧٤ کورد لە قەرقیزستان دەژی. بە تایبەتی ئەوان لە شارۆچکەی ئوچە کۆبوونەتەوە. زۆرم لا سەیر بوو کە بینیم لە گشت ئەو بیابانە بەرفراوانەدا ئەوان ئەو شوێنە شاخاوییەیان هەڵبژاردووە بۆ لەوەڕی ئاژەڵەکانیان کە «بە دەگمەن هەڵدەکەوێت».[٧]

ساڵی ١٩٨٩ لە سەردەمی سۆڤیەتدا سەرژمێریی کراوە و بەپێی ئەم سەرژمێرییە ژمارەی کوردان لە قرقیزستاندا ١٤٣٠٠ کەسە، بەڵام وەك کوردەکان خۆیان باس دەکەن، ژمارەیان زۆر لەوە زیاترە.

شێخ ڕەمەزان سەیید (ڕەمەزان سەیدۆڤ محەمەدۆفیج) سەرۆکی کۆمەڵەی کورد لە قرغیزستان لەم بارەیەوە دەڵێت: ئێستا لەساڵی ۲۰۱۳ دەوڵەت بە ڕەسمی دەڵێ ۱۳۵۰۰ کورد لەم وڵاتە هەن، بەڵام بە حیسابی ئێمە نزیکەی ۳۰,۰۰۰ کەسین. چونکە کورد لە قرقیزستاندا ئاسیمیلە کراوە و لەناو پاسپۆرتی خۆیدا، بە کورد نەنووسراوە، بەڵام ئەگەر لێی دەپرسی تۆ کێی؟ دەڵێ من کوردم.[٨]

- **شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە قرقیزستان**

شوێنی نیشتەجێی کوردان لە قرقیزستان لە ناوچەی ئوش، تالاس، جەلا ئاباد و فرونزە.[٩]

دوای ساڵی ۹۱ و هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت کوردی هەرێمی جەلال ئاباد و ئوش، لە ناچاریان بەرەو بیشکەکی پایتەخت و دەوروبەری کۆچ دەکەن.

سیاسەتی گۆرباچۆف بوو بەهۆی ئەوەی لە ئۆزبەکستانێ شەڕ لەنێوان ئۆزبەك و تورکان دروست بێ و ئەمەش کاریگەریی لەسەر وڵاتی قرقیزستانیش دانا و تێکهەڵچوون لەنێوان قرقیز و ئۆزبەکاندا هاتە کایەوە. هەربۆیە زۆر نەتەوە لە ترسان قرقیزستانیان جێهێشت و لەناو ئەو نەتەوانەدا کوردیش هەبوو.

دوای ئەوە ئازەری چوونە ئازەربایجان، ئەرمەنی چوونە ئەرمەنستان، ڕووس چوونە ڕووسیا و ... تەنیا کورد مانەوە. بەشێکیان چوونە ڕووسیا و بەشێکیشیان بەرەو ئەڵماتای کازاخستان کۆچیان کرد و ژمارەیەکیشیان لە گوند و هەرێمەکانیانەوە روویان لە بیشکەکی پایتەخت کرد.

کوردەکانی قرقیزستان بە گشتی لە بیشکەکی پایتەخت و دەوروبەری دەژین. گوندی چادگولێ یەك لەو گوندانەیە بەشێك لە دانیشتووانی کوردن. لەو گوندەدا کورد لەگەڵ ئولگوور (ئویغور)، قرقیز، ڕووس و نەتەوەکانی تر لە ئاشتی و ئارامیدا دەژین و لە بۆنە و ڕێوەڕەسمەکانی یەکتر بەشدار دەبن. ئەو وێنەیەی خوارەوە،

وێنەی ڕێوڕەسمی سەرەخۆشیی بنەماڵەیەکی کوردە کە خەڵکی زۆر لە نەتەوەکانی دیکەش تێیدا بەشدارن.[۱۰]

- **چالاکیی کوردەکانی قرقیزستان**

کوردەکانی قرقیزستان لە زۆر کاروباری هونەری و کولتوورییدا چالاکن و لە هێندێك لەو چالاکیانەدا خەڵکی سەر بە نەتەوەکانی دیکەش بەشداریی دەکەن. لە پەیداکردنی بژیوی ژیانیشدا وەك هەموو خەڵکی ئەو وڵاتە بە کاری جۆراوجۆرەوە خەریکن و لە زۆر شوێن و ناوەندی دیکەشدا کار دەکەن

«یەکێتی کوردانی قرقیزستان ساڵی ۱۹۹۲ بە ناوی «نیشتمان» کرایەوە. ساڵی ۲۰۰۱ یەکێتی کوردان ناوی خۆی بۆ «میدیا» گۆڕی و لەژێر باڵی ئاسامبیلیای گەلی قرقیزستاندا کاروباری هونەری و کلتووری و ئەدەبی ئەنجام دەدەن.

بە وتەی شێخ ڕەمەزان لەو ئاسامبیلیایەدا کوردان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە و وەك هەموو میللەتانی تری قرقیزستان جێگە و شوێنی خۆیان هەیە.

سەرۆکی ئاسامبیلیای قرقیزستانیش دەڵێ: «ئاسامبیلیا ناوەندی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەکانی قرقیزستانە. لە قرقیزستان زیاتر لە ۱۲۰ میللەت دەژی. ئاسامبیلیا کار بۆ ئەوە دەکات کێشەیان لەنێودا ڕوو نەدات. ئەو دەزگا فەرمییە ساڵی ۱۹۹٤ کرایەوە. لەبن باڵی ئەو ئاسامبیلیایەدا ۲۸ نەتەوە خاوەن کۆمەڵە و دەزگان. بێجگە لە کوردان دوو میللەتی تریش هەن کە بێدەوڵەتن و لە ئاسامبیلیاشدا دەوریان هەیە.. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە هەر نەتەوەیەك خاوەن مافی خۆی بێ و چاند و هونەری خۆی بەرەوپێش بەرێ و بە زمانی خۆی قسە بکات. بۆ ئێمە شانازییە لەتەنیشت ئێمەوە کورد هەن.»

یەکێتی لاوانی کوردی قرقیزستان لەبن باڵی کۆمەڵەی کوردانی کوردانی کاروباری هونەری ئەنجام دەدەن، هەر لەگەڵ ئەوانیشدا خوێندەوار و لاوی سەر بە نەتەوەکانی دیکەش

هەوڵی چالاکی دەدەن و زۆر لە لاوانی قرقیزیش بەشداریی کار و چالاکییەکانیان دەکەن.

بە سەرپەرستیی کۆمەڵەی میدیا لە ڕادیۆی فەرمیی دەوڵەتدا حەفتەی جارێکی بیست خولەك بەرنامە بڵاو دەکرێنەوە و تێیدا موزیك و گۆرانی کوردی بڵاو دەکرێتەوە، خەڵك بانگ دەکرد بۆ ئەوەی قسە لەسەر کوردی قرقیزستان بکەن، باسی زمانی زگماکی دەکرێ.

لەنێو کۆمەڵگەی کوردی قرقیزستاندا دوای ساڵی ١٩٦٠، گەلێك کەسی ناودار هەڵکەوتوون. لەناو واندا گەلێك حاکم، دوکتۆر و ئەندازیار و هەن و لە هێزەکانی پۆلیسدا خەڵکیان زۆرە، لەوێ ئەرتەشی پۆلیسی کوردان هەیە.

عەزیز داودی ئاغابەگ و برایمی پاشای نادر دوو کەس لە پۆلیسە پایەبەرزەکانن کە بۆ ماوەی ساڵانێکی دووردرێژ لە وەزارەتی کاروباری نێوخۆیی قرقیزستاندا کاریان کردووە. هەردووکیشیان ئەندامی چالاکی جڤاکی کوردانن کە خاوەن گەلێك خەڵات و میدالیای بەنرخن و لەگەڵ ئەوەی خزمەتی قرقیزستان دەکەن، لە هەمان کاتدا شانازیی بە کوردبوونی خۆشیان دەکەن.

ڕەسووڵ محەمەدێ سیلتێن یەکێك لەو دوکتۆرانەیە کە زۆر شاگردی ڕووس، قرقیز و ئولگور لەبەدەستیدا کار دەکەن. ئەو ساڵی ١٩٧٠ لە مەسیسێ ئەرمەنستان لەدایك بووە و پێش هەڵوەشانی شۆڤیەت بنەماڵەکەیان کۆچیان بۆ قرقیزستان کردووە. ئەو لە نەخۆشخانەیەکی گەورەی بیشکەك کار دەکا و لەناو کورداندا بەناوی «دوکتۆرێ مە» ناسراوە. ئەو هەم کاری نەشتەرگەری دەکا و هەم لە ئینستیتۆی دوکتۆری کار دەکا و دەرسی نەشتەرگەری دەڵێتەوە.

لە یەکێك لە گەورەترین بازاڕەکانی بیشکەکی پایتەختدا، کە خەڵکی زۆر نەتەوە و گەلی جیاواز کاری تێدا دەکەن و زۆربەی کارکەر و فرۆشیارەکانی ژنن، ئەوا زۆر ژنی کورد هەن و بەیانیان دەچنە سەرکار و ئێوارەش بە دڵێکی خۆش دەگەڕێنەوە.

## • سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ پێنجەم

١. ویکیپیدیای فارسی.
٢. تەلەویزیۆنی ڕووداو.
٣. همایەر، م.شترۆ و هێکمان، ل. یاڵچین، کورد لە سووریا و ئازەربایجان و ئەرمەنستان. وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: ڕێبوار تۆفیق بەنگینە. چاپی یەکەم. ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١١. ل ٣٣.
٤. ساڵح کەوربڕی، أشنایی با بزرگان کردی کرمانجی (5)، http://dibistan. blogfa.com/post/52، Mon 2 Jul 2012.
٥. کورد و کەمینەکانی تری سۆفیەت لە سەردەمی ستالین دا، PUKmedia، وەرگیراو لە: http://www.faceiraq.com/inews.php?id=1380838 ، 5/2/2013.
٦. هفتەنامە سیروان، www.sirwanweekly.com/Default. aspx?page=Complete&cp=2147.
٧. کۆمەڵێك نووسەر، گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت، کۆمەڵێك نووسەر، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە: م. گۆمەیی، سوێد، ٢٠٠٢، ل ٣٦٠.
٨. تەلەویزیۆنی ڕووداو.
٩. هەورامی، د.ئەفراسیاو، کوردستانی پشت قەفقاس، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ١٩.
١٠. تەلەویزیۆنی ڕووداو.
١١. تەلەویزیۆنی ڕووداو.

## • شەشەم: کوردەکانی کازاخستان (قزاقستان)

- چەند زانیارییەک سەبارەت بە وڵاتی کازاخستان
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ کازاخستان
- ژمارەی کوردەکانی کازاخستان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە کازاخستان
- چالاکیی ڕۆشنبیریی و سیاسیی کوردەکانی کازاخستان
- ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی کازاخستان
- سەرچاوەکان

### • چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی کازاخستان

کازاخستان (قەزاقستان) وڵاتێکە لە ئاسیای ناوەڕاستدا هەڵکەوتووە. لە باکوورەوە لەگەڵ ڕووسیا، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ چین، لە باشوورەوە لەگەڵ ئۆزبەکستان و لە باشووری ڕۆژئاواوە لەگەڵ تورکمانستان هاوسنوورە. پانتایی ئەم وڵاتە ٢,٧١٧,٣٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە و حەشیمەتەکەی ١٦ ملیۆن و ٦٠٠ هەزار کەسە. پایتەختی ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٩٨ لە ئەلماتی لە باشوور بۆ ئاستانە لە باکوور گوێزرایەوە. گرووپگەلێك لە نەتەوەخوازان لە ڕووسیا و لە

نێوخۆی كازاخستان داوای سەرلەنوێ خستنەوەسەری باكووری كازاخستان بۆ سەر خاكی ڕووسیایان دەكرد و ئەمە یەكێك لە پاڵنەرەكانی سەرۆك كۆماری كازاخستان بۆ گواستنەوەی پایتەخت بۆ شارێك لە ناوەندی وڵات و نزیك لە ڕووسیا بوو و ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی ژمارەیەكی زۆر لە كازاخەكان بچنە ئەم شارە و ئەم ئیددیعایەش بۆخۆی دامركێتەوە.

هەروەك گوترا پایتەختی كازاخستان ئاستانەیە و شارە سەرەكییەكانیشی بریتین لە ئەڵماتا (ئاڵماتی)، قەراغەندی، چیمكەنت، ئاترایۆ، ئیسكمەن، ئاكتاو پاولودار پتروپاولسك و ئوست كامنگورسك

دانیشتووانی سەرەكیی ناوچەی ئەمڕۆیی كازاخستان لە هۆزە بە ڕەچەڵەك ئێرانییەكانی ئیسكیت بوون. خەڵكی بە ڕەگەز تورك لە سەدەی پێنجەم بەملاوە دەستیان بە كۆچكردن بۆ ئەو ناوچەیە كرد. لە سەدەی سێزدەیەم، ئەم ناوچەیە لەلایەن چەنگیزخانی مەغۆلەوە داگیر كرا. دوای مەرگی ئەو، ئەم ئیمپراتۆرییە لەنێو كوڕەكانیدا دابەش كرا و كازاخستانی ئەمڕۆ وەبەر چاگادای، كوڕی چەنگیزخان كەوت. بەڵام بەشی ڕۆژئاوا و زۆربەی بەشەكانی باكوور چووە ژێر دەستی گنقیز، نەوەی چەنگیزخان. بەهۆی دەسەڵاتدارێتیی درێژخایەنی مەغۆلەكان بەسەر ئەم ناوچانەدا، كاریگەریی توخمە كولتوورییەكانی مەغۆلی لە ناوچەكەدا دەركەوتووە.

دوای شۆڕشی ئۆكتۆبەر و پێكهێنانی یەكێتیی سۆڤیەتی پێشوو، كازاخستان لەژێر ناوی كۆماری سۆسیالیستیی كازاخستانی سۆڤیەت بوو بە یەكێك لە كۆمارەكانی ئەو وڵاتە. دوای ڕووخانی سۆڤیەتیش، كازاخستان لە ڕێكەوتی ١٦ی دیسامبەری ١٩٩١ دوایین كۆماری سۆڤیەت بوو كە سەربەخۆیی ڕاگەیاند.

كازاخستان وڵاتێكە كە چەندین ئیتنیك و قەومی جیاوازی تێدا دەژین. كازاخەكان نزیكەی ٦٣٪ی دانیشتووانی ئەو وڵاتە پێكدێنن. ٢٣،٧٪ی خەڵكی

ئـەو وڵاتـە ڕووس و هەروەهـا چەنـد قەومێکـی وەك ئۆزبـەك، ئۆکراینـی، ئەویغور و ... تێدا نیشتەجێن. ئایینی ٧٠٪ی خەڵـك ئیسـلام و خەڵکەکەی دیکـەش مەسیحیین. تایبەتمەندیی چەندقەوم بوون کاریگەریی لەسەر هونەر و کولتووری وڵات داناوە. زمانی کازاخی، زمانی خەڵکی کازاخ و زمانی نەتەوەیی ئـەم وڵاتەیـە و بێجگـە لەویـش چەندیـن زمانـی دیکـە لـەو وڵاتـە کەڵکیـان لـێ وەردەگیـرێ. [١]

* سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردەکان بۆ کازاخستان

لـە ناوەڕاسـتی سـاڵانی سـییەکاندا ئیـدی کۆتایـی بـە پیادەکردنـی سیاسـەتی کلتـووری هەمەجـۆرەکان هـات و لـەو کاتـەوە سیاسـەتی مەرکەزییـەت پیـادە کرا و هەمـوو بڕیـارەکان لە ئاسـتی سـەرەوە دادەبەزینـە خـوارەوە، دووبارە کێشـەی نێوان هاووڵاتیـە ڕووسـەکان و کەمینەکان سـەری هەڵـداوە، ئەم دیاردەیـە دژی کەمینەی کوردەکانیـش بـوو، بەهـەزاران کـورد سـەرلەنوێ لـە کازاخسـتان و قرغیزسـتان و سـیبیریا نیشـتەجێ کـران و بەرەو ئـەو ناوچانـە ڕاگوێـزراون. [٢]

... سـاڵی ١٩٣٧ بەبیانـووی ئـەوە کـە کـوردەکان لەسـەر سـنوورەکانی ئازەربایجـان، ئەرمەنسـتان و تورکیا کاری سـیخوڕی و هەواڵگریی ئەنجـام دەدەن، دەسـەڵاتدارانی ئازەربایجـان و ئەرمەنسـتانیش دەیانەویسـت کـوردەکان لـەوێ دوور بخەنـەوە. ئامانجیـان دوورخسـتنەوە و یـەك نەتەوەکردنـی ئـەو ناوچانـە بـوو. لـەو سـاڵەدا کوردەکانیـان سـواری شـەمەندەفەری تایبـەت بـە هەڵگرتنـی ئـاژەڵ و مەرومـاڵات کـرد و لەژێـر کۆنترۆڵی سـوپادا تەبعیدیان کرد. هیچکـەس نەیدەزانی بـۆ کوێیـان دەبـەن. دوو مانگـی تـەواو لەڕێگـەدا بـوون، بـە شـێوەیەکە هێندێـك لـە دایکـەکان منداڵەکانیـان جێدەهێشـت و دەڕۆیشـتن!! سـەرەنجام خۆیـان لـە سـنووری کازاخسـتان و قیرقیزسـتان دەبیننـەوە. لـە شـوێنێك کە بەڕاسـتی سـەرما و

بیابانێکی مەترسیداری هەبوو. نە کوردەکان زمانی ئەوانیان دەزانی و نە خەڵکی ئەو ناوچە سەخت و کوێستانیانەش زمانی کوردەکانیان دەزانی.[٣]

ڕێزدار پڕۆفیسۆر نادر نادرۆف بەم شێوەیە باسی سەردەم و هۆکاری ئاوارەبوونی بۆناو خاکی سۆڤیەت و سەرەنجام ڕاگواستنیان بۆ کازاخستان دەکات: «باوکم لە تافی لاوێتیدا بەهۆی زوڵم و ستەمی تورکەکان لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە هاونیشتیمانییەکانی لە چۆمی ئاراس دەپەڕنەوە و دەگەنە نەخجەوان کە ئێستا بەشێکە لە کۆماری ئازەربایجان. دیارە ئەوکات بەشێك لە سۆڤیەت بوو. لەوێ گوندێك ئاوەدان دەکەنەوە و ناوی دەنێن «قیقاچ». لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا هەر کەسێك لەبەر زوڵمی تورکەکان ڕا دەکات، دەچێتە ئەوێ. بەم شێوەیە کۆمەڵێك لە کوردەکان لەوێ ئاواییەك بۆ خۆیان دروست دەکەن و نیشتەجێ دەبن. ئەمە قسەی ساڵەکانی ١٩٢٥ ـ ١٩٢٦ ـە.

واتە دوای شکست شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، زۆر لە عەشیرەت و تایفە کوردەکان بەهۆ تێکشکانی شۆڕشی شێخ سەعید و ئەم شەڕە نابەرامبەرە دەربەدەر بوون. ئەمن لە سەرما و سەخڵەتیی ساڵی ١٩٣٢ لەدایك بووم. لە ساڵی ١٩٣٦ باوکم کۆچی دوایی کرد. گۆڕەکەی لە گوندی قیقاچە. دوای مردنی باوکم تەمەنم ٥ ساڵ بوو، لەگەڵ دایکم و ٩ کەسی دیکە لە ئەندامانی بنەماڵەکەم لە ساڵی ١٩٣٧ دوور خراینەوە و لە گوندی «قیقاچ»ەوە بۆ کازاخستان گوێزراینەوە.

ڕاگواستن بە سێ قۆناغ ئەنجام درا بە واتایەکی تر لەوی سێ گرووپ لە کوردەکان بوونیان هەیە: بەشێکیان لە ساڵی ١٩٣٧ لە ئەرمەنستان و ئازەربایجان بۆ ئێرە (کازاخستان) ڕاگوێزراون، کەئێمە بووین. گرووپێکیان لە ساڵی ١٩٤٤ هێنراونە ئێرە کە لە کوردەکانی گورجستانن و دراوسێکەمان عەزیز زیا بەدرخان لەو گرووپەیە. بەشێکی دیکەیان لە ساڵی ١٩٩٠ دوای شەڕی قەرەباغ لەنێوان

ئازەربایجـان و ئەرمەنسـتان هاتوونەتـە ئێرە. کنیـاز ئیبراهیم لـە کوردەکانی قەرەباغە و لەگـەڵ ئـەم تاقمـە بۆ ئێـرە هاتووە.

ڕۆژانـی ڕاگواسـتن زۆر ناخۆش و خەفەتهێنـەر بـوون. بـە وتـەی کـوردەکان لـەو ڕۆژانـەدا دایـك منداڵـی خـۆی جێدەهێشـت و دەڕۆیـی! پەندێکـی پێشـینیانی کـوردی هەیـە کـە دەڵێ: «ئێمـە دوو جـار لـە نیشـتمان دەرکراوین». نزیکـەی دوو مانـگ بـە سەرلێشـێواوی لـە ڕێگـەدا ماینـەوە. زۆر لـە خـزم و ناسـیاوانمان لەنێـو واگۆنـی شـەمەندەفەرەکاندا لـە بـەر زەختـی سـەرما و برسـییەتی مـردن. دۆخێکـی مەترسـیدار بـوو کـە باسـکردنی ئاسـان نیە.

لەبیرمـە لەلایـەن سـۆڤیەتی پێشـوو هاتـن و ئێمەیـان لـە ئۆتۆمبێلـە کۆنەکانـی تایبـەت بـە ڕاگواسـتنی مەڕومـاڵات سـوار کـرد و بـەرەو وێسـتگەکانی شـەمەندەفەریان بردیـن. ئـەم بەسـەرهاتە لە کۆتایی پاییـزی سـاڵی ١٩٣٧ ڕووی دا. هـەر چوار بنەماڵەیـان خسـتەناو واگۆنێکـی شـەمەندەفەر و هـەر بنەماڵەیەکیش لە گۆشـەیەکی واگۆنەکـە. دوای دوو مانـگ ئێمەیـان هێنایـە ئێرە. واتە شـاری تاراس کـە پێشـتر «میرزویان»یان پێدەگـوت و ئێمەیان لێـرە دابەزاند و سـواری عارەبانەی ئاژەڵانیانیـان کردیـن. سـەرماوەز بـوو. بەفـر تـا ئەژنـۆ باریبـوو. سـەرما و سـۆڵەیەك کـە دایـك منداڵـی خـۆی بەجێدەهێشـت. ئێمەیـان لـە ١٥٠ کیلۆمەتری تـاراس لە بیابانێکـی بەڕەهوتـدا بەرەڵـلا کـرد و گوتیـان دەبـێ ئێـوە لێـرە ژیـان بەسـەر بـەرن. بنەماڵـە کـوردەکان ڕەشـماڵیان لەگـەڵ خۆیـان هێنابـوو و لـەوێ هەڵیانـدان و هەتـا بەهـار لـەو ڕەشـماڵانەدا ماینـەوە. گوتیـان خانووتان بۆ دروسـت دەکەیـن. کەبەهار هـات، عەرزیـان پێداین و دەسـتیان بە دروسـتکردنی خانووی بە قوڕ و خشـتە کرد.

بـاش لەبیرمـە سـاڵی ١٩٣٨ پۆلیـس و ك.گ.ب هاتـن و دەیانپرسـی کـە سەرپەرشـتیی خێزانەکـە کێیـە؟ براگەورەکـەم، عەبدوڵـلا، کـە تازە ژیانی هاوبەشـی پێکهێنابـوو و لەویـش گەورەتـر، خوشـکم، کـە ئەویـش شـووی کردبـوو و لـە

خێوەتەکەی تەنیشت ئێمە دەژیان و دوو کوڕی هەبوون. عەولای برام هەڵستا و گوتی ئەمن سەرپەرشتی ماڵم. پێیان گوت کە بەدوامانـدا وەرە! زاواکەشمان چوو. لەو شەوەدا سەرپەرستی هەموو ماڵەکانیان لەگەڵ خۆیان برد. تەنیا ئەو پیاوانە نەبێ کە ئەو شەوە چووبوونە ئاش (ئاسیاو) یان چووبوونە ئاودێری زەوییەکان. ئەوان ڕزگاریان بوو. ئەو کەسانەیان بردە چیمکەنت. دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە و ئیتر ئاگامان لێیان نەما. ئیتر ئێمە هیچ هەواڵێکمان نەزانین و تا ئەو کاتەی کە گەورەش بووم و دواتر بوومە پرۆفیسۆریش، زۆرجار وەشوێنیان کەوتم. هەمیشە دەمگوت: براکەم لەکوێیە؟ خوشکەزاکەم هەمیسە پرسیاری سەبارەت بە باوکی دەکرد. لە شەوێکدا ٤٠ پیاوی کوردیان لەگەڵ خۆیان برد. براکەم، زاواکەم، ئەوانی دیکەش کوڕەمام و کەسوکارمان بوون!! [٤]

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بە تایبەتیش لە ساڵی ١٩٤٤بۆ جارێکی تر لەلایەن سۆڤێتەوە دەستکراوە بە سیاسەتی ڕاگواستنی زۆرەملێی کورد لە جۆرجیا وئەرمینیا بۆ بیابانەکانی کازاخستان و ئۆزبەکستان و قرغیزستان و تورکمانستان. ئەمجارەشیان بە بیانووی ئەوەی کورد لە نەژادی ئاریین و هەمان ڕەگەزی ئەڵمانین لەکاتێکدا گەنجانی کورد ڕەوانەی جەنگ کرابوون بۆ دژایەتی کردنی نازییەکان و تورکیاش لەبەرەی نازییەکاندا بوو، بەڵام ئیتر نازانرێت بۆچی ستالین بەو شێوە لە کورد تووڕە بوو و تا بەو جۆرە لە چلەی زستاندا و بە سواری شەمەندەفەر ڕایانبگوێزێت کە بەشێکیش لە منداڵەکانیان لە ڕێگادا گیانیان لەدەست داوە. [٥]

- **ژمارەی کوردەکانی کازاخستان**

لە کتێبی «کوردستانی پشت قەفقاس» ئاماژە بەوە کراوە لەم وڵاتە بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٨٩ ڕێژەی کورد ٢٥٤٢٥ کەس بووە.

ساڵی ٢٠٠٩ کە سەرژمێریی حکوومەتی کرا، حەشیمەتی کوردەکان بەپێی پاسپۆرتی ئەوانەی شوناسی کوردییان هەیە، ٣٧ هەزار کەس ڕاگەیەنراوە. بەڵام بەپێی ئاماری نافەرمی زیاتر لە ٨٠ هەزار کورد لە کازاخستان دەژین، ئەو جیاوازییەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆر لە کوردەکان کە لە ئازەربایجان، ئەرمەنستان و گورجستانەوە بۆ ئێرە ڕاگوێزراون یان کۆچیان کردووە، وەك ئازەری یان گورجی یان ئەرمەنی تۆمار کراون. ئەمە یەکێك لە هۆکارەکانە. هۆکاری دیکە ئەوەیە زۆر لە کوردەکان کە لە پازدە ساڵی دواییدا لە ئازەربایجان و ئەرمەنستانەوە هاتووبە ئێرە، هێشتا ئیقامەی کازاخییان وەرنەگرتووە و تا ئیستاش بە هاووڵاتی ئەژمار ناکرێن. (٦)

- **شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە کازاخستان**

کوردی کازاخستان لە هەندێك کۆمەڵگەی نزیك بە شاری چیمکنت و شارۆچکەی جەمبوول و کەناری ئەڵمەئاتە دەژین و بە گوێری ئاماری ساڵی ١٩٧٠ ژمارەیان کردوویەتە ١٢,٣١٣. (٧)

هەم لە کتێبی «کوردستانی پشت قەفقاس»ی دوکتۆر ئەفراسیاو هەورامی و هەم لە کتێبی «پەیوەندی نێوان کورد و ڕووسیا»ی ئارام عەلی و لە زۆر سەرچاوەی دیکەش باس لەوە کراوە کە کوردەکانی کازاخستان بە زۆری لە ناوچەی ئەڵمائاتا(ئاڵماتا) دەژین.

- **چالاکیی ڕۆشنبیریی و سیاسیی کوردەکانی کازاخستان**

کوردەکان لە کازاخستان توانیویانە خۆیان بگەیەننە زۆر شوێنی گرنگ و لە گەلێك بواری ڕۆشنبیریی و سیاسییدا چالاکی بنوێنن. بێگومان ئەمەش بەشی زۆر بۆ خۆماندووکردن و هەوڵی کوردەکانی ئەو وڵاتە دەگەڕێتەوە.

«لە پارلەمانە ناوچەییەکان پەرلەمانتاری کورد هەبووە، بەڵام کوردەکان نەیانتوانیوە بچنە پەرلەمانی ناوەندی. بارودۆخی کوردەکان خراپ نیە. لە هەموو شوێنێك کورد هەن. خەریکی خوێندن و زانیاریین، لە کاروباری دەوڵەتیدا هەن، لە تەشکیلاتی پۆلیس و لە بەشی بازرگانیدا کار دەکەن و زۆریش سەرکەوتوون.

کوردەکان لە هەموو شوێنێك بۆ وڵاتی خۆیان تێدەکۆشن. زۆربەیان نیشتمانپەروەرن. زمانی خۆیان پاراستووە. لە ماڵی خۆیاندا بە زمانی کوردی قسە دەکەن. کاتێك باسی کورد و کوردستان دەکرێ، ئاخ و هەناسە بۆ نیشتمان هەڵدەکێشن و ...» [٨]

بۆ ئەوەی بە باشی لە هەوڵ و زەحمەتی کوردەکان و گەیشتنیان بە ئاستە باڵاکان تێبگەین پێویستە لە درێژەی ئەم بەشەدا ژیان و بەسەرهاتی پرۆفسۆر نادر نادرۆف بخوێنینەوە بۆ ئەوەی لە دەرەنجامی هەوڵ و تێکۆشانی ئەو مرۆڤە مەزنە تێبگەین.

- **ڕەوشی ژیان و گوزەرانی کوردەکانی کازاخستان**

بارودۆخی کوردەکان خراپ نیە. لە هەموو شوێنێك کورد هەن. خەریکی خوێندن و زانیاریین، لە کاروباری دەوڵەتیدا هەن، لە تەشکیلاتی پۆلیس و لە بەشی بازرگانیدا کار دەکەن و زۆریش سەرکەوتوون.

کوردەکان لە هەموو شوێنێك بۆ وڵاتی خۆیان تێدەکۆشن. زۆربەیان نیشتمانپەروەرن. زمانی خۆیان پاراستووە. لە ماڵی خۆیاندا بە زمانی کوردی قسە دەکەن. کاتێك باسی کورد و کوردستان دەکرێ، ئاخ و هەناسە بۆ نیشتمان هەڵدەکێشن و ...» [٩]

**• سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ شەشەم**

١. سەرچاوە: ویکیپیدیای فارسی

٢. همایەر، م.شترۆ و هێکمان، ل. یالچین، کورد لە سووریا و ئازەربایجان و ئەرمەنستان، وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: ڕێبوار تۆفیق بەنگینە، چاپی یەکەم، ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١١. ل ٣٣)

٣. ساڵح کەوربڕی، ێشنایی با بزرگان کردی کرمانجی (٥)، http://dibistan.blogfa.com/post/52، Mon 2 Jul 2012.

٤. www.vokradio.com/content/view/1624/1

٥. کورد و کەمینەکانی تری سۆفیەت لە سەردەمی ستالین دا، PUKmedia، وەرگیراو لە: ، http://www.faceiraq.com/inews.php?id=1380838 5/2/2013.

٦. سەرچاوە: www.vokradio.com/content/view/1624/1

٧. کۆمەڵێك نووسەر، گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە: م. گۆمەیی، سوێد، ٢٠٠٢، ل ٣٦٠.

٨. سەرچاوە: www.vokradio.com/content/view/1624/1

سەرچاوە: www.vokradio.com/content/view/1624/1

## • حەوتەم: کورد لە ڕووسیا و کۆمارەکانی دیکەی سۆڤیەتی پێشوو
(ئۆزبەکستان، تاجیکستان و ....)

وەك لە سەرچاوەکاندا ئاماژە کراوە و لە زۆریشیاندا بە کورتە باسێك ئاوڕیشیان لێ دراوەتەوە، کوردەکان لە کۆمارەکانی دیکەی سۆڤیەتدا هەن، بەڵام بەداخەوە زانیارییەکی ئەوتۆم لەسەر دەست نەکەوتن کە باسی کوردی هەریەك لەو وڵاتانەش بە جیا بکەم. بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە پێم حەیف بوو ئەگەر تەنانەت بە چەند وشەیەکیش بێ، ئاماژەیان پێنەکەم. پێم وابێ هۆکاری سەرەکیش لە باس نەکردنیان، کەمیی ژمارەی دانیشتووان لە هەرکام لەو وڵاتانە بووبێ.

• **کوردەکانی ڕووسیا:** کوردەکانی ڕووسیا ئاماژەیە بۆ ئەو قەومە بە ڕەگەز کوردانەی کە هاووڵاتی فیدراسیۆنی ڕووسیان یان لە ڕووسیا لە دایك و باوکێکی کورد بەدنیا هاتوون. کوردەکان پێشینەی زیاتر لە دوو سەدە ژیانیان لە ڕووسیا هەیە. زۆربەی کوردەکان لە قەفقاز نیشتەجێ بوون کە دوای ئەوەی قەفقاز خرایەسەر ئیمپراتۆریای ڕووسیا، بەرەو ڕووسیا کۆچیان کرد. لە شەڕەکانی نێوان ئیمپراتۆریای ڕووسیا و ئێران ئیزنی نیشتەجێبوون بە کوردەکان لەنێو ڕووسیا درا

و چەند کۆمەڵێکیان لەنێو خاکی ڕووسیا گیرسانەوە. بەدوای ئەویشدا لە ماوەی شەڕەکانی نێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و ڕووسیاش ژمارەیەك لە کوردەکان بەرەو ڕووسیا کۆچیان کرد. [1]

هەروەها بەشێکی بەرچاوی کوردەکانی نەخجەوانیش کە ژمارەیان دەگاتە ٢٠ هەزار کەس، دوای دەیەی ١٩٩٠، بە هۆکاری سیاسی ـ ئابووری کۆچیان کردووە بۆ ڕووسیا و ئاسیای ناوەڕاست. [2]

شەڕەکانی ساڵی ١٩٩٤ی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان بوونە هۆی کوشتاری بەکۆمەڵی کوردەکان ناگۆرنوقەرەباغ. هێزە ئازەرییەکان. کوردەکانیان گردە سپەری بەلا و هێڵی پێشەوەی شەڕ و هێزەکانی ئەرمەنییش کوردەکانیان کۆمەڵکوژ کرد. چونکە شوێنی تێکهەڵچوونەکەیان بە گشتی ناوچە کوردنشینەکان بوون. چارەنووسی ڕووداوەکانی لاچین و کەلباجار لە ناگۆرنوقەرەباغ کە سەردەمێك بە کۆماری کوردستان سوور ناسرابوو، شەڕی چاڵدێرانی نێوان ئیمپراتۆریی عوسمانی و سەفەوی بەبیر دەهێنایەوە. کوردەکانی ئەرمەنستانی بەم بابەتە زۆر هەستیار بوون و لاوانی کورد خۆیان لە چوونە سەربازی (عەسکەری) دەبوارد و لەو ساڵانەدا بە هەزاران لاوی کورد لەگەڵ بنەماڵەکانیان بەرەو ڕووسیا کۆچیان کرد و ئەمەش زیانی بە حەشیمەتی کوردەکان لە ئەرمەنستان گەیاند. [3]

زۆربەی کوردەکان لە ناوچەکانی خاباروفسك، کراسنودار، کورسك و ناو شاری مۆسکۆ ژیان بەسەر دەبەن. [4]

بە سەرنجدان بە دوایین سەرژمێریی قەومیی لە فیدراسیۆنی ڕووسیا لە ساڵی ٢٠١٠ی زایینی حەشیمەتی گشتیی گرووپە بەرەگەز کوردەکان ٦٣٬٨١٨ کەسە [5]

جێگەی ئاماژە پێدانە کە «سێنتەری کولتوری کوردی ساڵی ١٩٨٩ لە مۆسکۆ دامەزراوە و ڕۆژنامەی «گۆلەس کوردا ـ دەنگی کورد»ی بە زمانی ڕووسی

دەردەکرد کە لەڕاستیدا خزمەتێکی باسی پرسی کوردی دەکات و ڕۆڵی لە بەستنی دوو سێ کۆنفرانسی تیۆری لەسەر پرسی کوردی بینیوە.

هەروەها «بەرەی یەکبوون» ڕێکخراوێکە لە ١٩٩٠/٧/٢٤دا لە مۆسکۆ دروست بووە. وەکو لە پەیڕەوی ناوخۆییەکەیدا هاتووە لەسەر ئاستی یەکێتی سۆڤیەتی جاران کار دەکات و لەلایەن نوێنەرانی بەشەکانی سۆڤێت دروست بووە و پێک هاتووە.(٦)

**کوردەکانی ئۆزبەکستان**: حەشیمەتی کوردەکانی ئەم وڵاتە بە ٣٦٠٠ کەس لە سەردەمی ئێستا دانراوە، بەڵام بەپێی ئاماریساڵی ١٩٨٩ ژمارەیان ١٨٣٩ کەس بووە. کوردانی ئەم وڵاتە بە زمانی کوردیی کرمانجی قسە دەکەن و بەشی زۆریان شوێنکەوتووی ئاینی ئیسلامن و نزیکەی ٢٠٪یان مەسیحین.(٧) شوێنی نیشتەجێبوونی کوردان لە ئۆزبەکستان هەرێمی تاشکەنت، سەمەرقەند، فیرگانە، بوخارا، کاشکادەرین (لە حەوت هەرێم و ٤٣ ناوچە جێگیر کراون.(٨)

● **کوردەکانی تاجیکستان**: لە تاجیکستان ٣٤٦ کوردی کرمانج ژیان بەسەر دەبەن کە بەپێی ئاماری ساَی ١٩٨٩ زیاتر لە ٥٦ کەس بوون.(٩)

● **کورد لە ئۆکراین**: لە بەخشی کریما ٩٠٠ کورد دەژین بەڵام ئامارێکی گشتیی ئەو کوردانە لەبەردەستدا نیە. سەرچاوەکان ئاماژەیان بەوە کردووە کورد لە وڵاتانی بێلارووس، ئیستونی، لاتیڤیا و لیتوانی و مۆڵداوی هەیە بەڵام زانیارییەکی ئەوتۆیان بەدەست نەداوە.(١٠)

**• سەرچاوەکانی بەندی سێیەم/ حەوتەم**

١ کردهای روسیه/wiki/www.fa.wikipedia.org .

٢. کەریم، ڕەمەزان، کوردەکانی ئازەربایجان، www.knwe.org، ٢٠١٣/٣/١٨.

٣. صوفی زادە، هادی، سفری بە میان کردهای ارمنستان، وەرگیراو لە: www. akhbar-rooz.com/article.jsp?essayId=٤٥٤٥٩، ڕێکەوتی ٢٠١٢/٥/١٠)

٤. کردهای روسیه/wiki/www.fa.wikipedia.org .

٥. س.پ

٦. (عەلی، ئارام، پەیوەندی نێوان کورد و روسیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی لیرە، سلێمانی، ١٩٩٩.ل ١٧٠ ـ ١٧١)

٧. هفتەنامە سیروان، www.sirwanweekly.com/Default. aspx?page=Complete&cp=٢١٤٧))

٨. هەورامی، د.ئەفراسیاو، کوردستانی پشت قەفقاس، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥، ل ٢١.

٩. هفتەنامە سیروان، س.پ.

١٠. هفتەنامە سیروان، س.پ.

**• بەندی چوارەم: چەند بابەتێکی پێوەندیدار...**

خوێنەری خۆشەویست، لە بەندی چوارەمدا کۆمەڵێك بابەتی گرنگ و پێوەندیدار بە کوردەکانی سۆڤیەتی پێشوو دەخرێتەڕوو کە بە پێویست زانراوە باسیان بکرێ.

**• یەکەم: کوردستانی سوور**

گرنگترین و سەرەکیترین دەسکەوتێك کە بزووتنەوەی کوردی قەفقاز لە بیستەکانی سەدەی بیستەم دا بەدەستی هێنا، دامەزراندنی مەڵبەندی ئۆتۆنۆمی بوو. گەلی کوردیش وەکو هەموو نەتەوە و گەلەکانی تری ژێردەستی ئیمپراتۆریی ڕووسی هەوڵی دا سوود لەو پرینسیپە وەربگرێت کە لە بەیاننامەی مافی نەتەوەکانی ڕووسیا لە ١٥ی نۆڤەمبەری ١٩١٧ دا جاڕدرا. ئەویش سەبارەت بە دابینکردنی «پەرەسەندنی سەربەخۆیی کەمایەتییە نەتەوەییەکان و گرووپە ئێتنیکیەکانی دانیشتووی خاکی ڕووسیا» بوو.

بێگومان ئەو پرینسیپەش لە ساڵی ١٩٢٠ەوە و دوای حەوتەمین کۆنگرەی سەرانسەریی سۆڤێتیەکانی ڕووسیا، بە کردەوە کەوتە کارەوە. بەپێی بڕیارەکانی ئەو کۆنگرەیە کەوتنە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر خواستەکانی ئەو گرووپە نەتەوەییانەی کە دەیانویست خۆیان لە شێوەی هەرێم و پارێزگا و ناوچە و ... ڕێك بخەن.

بەپێی ئەم بڕیارانەش کۆمیتەی ناوەندی بەجێگەیاندنی ئازەربایجان (ك.ن.ب.ئا) بڕیاری لەسەر ئەوە دا کە دوو مەڵبەندی بەڕێوەبەریی دروست بکەن. یەکێکیان ناگۆرنی قەرەباغ و ئەوی تریان ئەو مەڵبەندە بوو کە لەدواییدا بە کوردستانی سوور ناسرابوو.

حکومەتی ئازەربایجان (ك.ن.ب.ئا) و ئەو کۆمیسیۆنانەی خەریکی دانانی سنووری ئەم دوو ناوچەیە بوون، زۆر گفتوگۆیان لەسەر کارەکەیان دەکرد و هیچ جارێکیان گومانیان سەبارەت بە دروستکردنی مەڵبەندی ئۆتۆنۆمی قەرەباغ نەدەبوو. بەڵام مشتومڕێکی زۆریان لەسەر ناوچەی کوردستانی سوور بە تایبەتی ناوچەی قوباتلین (یاخود قوباتلی، یا قوبادلی) دەکرد و (ك.ن.ب.ئا) چەند ڕایەکی لەمەڕ ئەو پرۆسە هەبوو. بۆ نموونە لە تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٢٢دا سێ بڕیاری جیای داوە. بەپێی یەکەمیان ناوچەی قوباتلین دەبوو هەڵبوەشایەتەوە. بەڵام بەپێی دوو بڕیارەکەی تر بە چارەسەرنەکراوی بەجێیان هێشتبوو.

لە کانونی دووەمی ١٩٢٣ دا جارێکی تر کەوتوونەتەوە گفتوگۆکردن لەسەر ناوچەی قوباتلین، تا لە ئاکامدا لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٢٣ دا بڕیار درا (کوردستانی ئۆتۆنۆمی دروست بکرێت کە سێنتەر و سنوورەکانی بەپێی سنووردانانی ناگۆرنی قەرەباخی ئۆتۆنۆمی بێت).

هەڵبەتە ئەم بایەخ و گرنگیدانە بە قەرەباخ زۆرتر لەوەوە هاتبوو کە لە ناو سنووری بەڕێوەبەرایەتیی ئەرمینیاشدا ناوچەیەکی گەورەی ئازەرنشین - بێگومان کوردنشینیش - واتە نەخچەوان هەبوو کە بە هەمان شێوەی قەرەباخ خاوەنی ئۆتۆنۆمییە. ئەمە و هەروەها بوونی کۆماری ئەرمینیا وەك پشتیوانێك بۆ ئەرمەنەکانی قەرەباخ وای لە دەسەڵاتدارانی ئازەربایجان و تەنانەت یەکێتی سۆڤیەت کردبوو بە چاوێکی ترەوە لە قەرەباخی ئەرمەننشین بڕوانن و پرسی

کوردی قەفقازیش وەکو پەراوێز تەماشا بکەن.

من (مەبەست نووسەری کتێبی «پەیوەندی نێوان کورد و روسیا»یە) وای بۆ دەچم کە یەکێك لە مەبەستەکانی دروستکردنی یەکەیەکی بەڕێوەبەرایەتی وەکو کوردستانی سۆڤێتی ڕاستەوخۆ لە نێوان کۆماری ئەرمینیا و قەرەباخدا، لەیەکدابڕینی جوگرافی و دروستکردنی بەربەستێك لەنێوان ئەرمەنەکانی هەردوو دیودا بووە، چونکە لە بنەڕەتدا بەپێی دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتی ئیمپراتۆریی ڕووسی قەرەباخ بەشێك لە ئەرمنیا بووە و ئازەریەکان، کە هەموو دەم هەوڵیان بۆ داوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی سۆڤێت و بە یارمەتی ستالین بەدەستیان هێناوە و خستویانەتە ناو سنووری خۆیانەوە.

... ئەوە بوو مەڵبەندی کوردستان دروستکرا، کە وەکو د. کەمال مەزهەر پێی دەڵێت «کوردستانسکی ئویەزد» (ناوچەی کارگێڕیی کوردستان) دوای مانگێك واتە لە ئابی ۱۹۲۳ دا، گوسێ (یا حوسێ) حاجییێف کرا بە سەرۆك و شارۆچکەی لاچین مەرکەزی یان پایتەختی. هەر ئەو دەوروبەرەش ئەلیاسۆف کرا بە بەڕێوەبەری کاروباری پەروەردە و فێرکردنی ناوچەی کارگێڕیی کوردستانی سەر بە کۆماری ئازەربایجانی شورەوی، لەوساوە زاراوەی کوردستانی ئازەربایجان دروستبوو. (بەپێی فەرهەنگی ڕوسی ـ عەرەبی، ف.م.بوریتسوف، بەرگی ٢ کە لە ۱۹۲۸ دا دەرچووە، بەرامبەر «ئۆیزد»: مەڵبەند یا قەزا نووسراوە. ئاماژەش بۆ ئەوە کراوە کە ئەوە بەشێکی بەڕێوەبەرایەتی بووە تاساڵی ۱۹۲۹ لە ڕووسیادا بەکار دەهات، هەر لەبەر ئەوە من مەڵبەندم لە ناوچە پێ باشتر و ڕاسترە. ئارام عەلی)

ئەکادیمیك نادرۆف دەڵێت: ئەنجوومەنی وەزیران بڕیاری دا لە شەش ناوچەی ئازەربایجان کە کوردی تیا دەژیان مەڵبەندی کوردی دابمەزرێت، کە سێنتەرەکەی ـ پیریجان ـ بوو، لە دوایشدا کرا بە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کورد و

سێنتەری ـ لاچین و دواتر شوشە ـ بوو.

بەپێی دوکتۆر کەمال مەزهەر بێت کوردستانی سوور لە «پێنج دایەرە، یا مەڵبەندی سەرەکی پێکهاتبوو کە ئەوسا ناویان : کەڵبەجار، کوردحاجی، مورادخانلی، قەرەقشلاغ و قوتوورلی بوو» واتە یەکێك لەوەی نادرۆڤ کەمتری ژماردووە.

بەپێی کتێبەکەی بوکشپان بێت وەکو ڕۆژنامەی «گۆڵەس کوردا» زۆر بە کورتی لەسەری نووسیوە: کێلبەجار، قوباتلی، لاچین و بەشێك لە ناوچەی جبرایل بووە.

بەڵام خاتوو تاتیانا ئاریستۆڤا کە شارەزایەکی باشی لە مێژووی کوردی قەفقاز و زانیارییەکی دروستتری لەسەر مەڵبەندی کوردستان هەیە، تەنیا ناوی چوار ناوچەی هێناوە کە تەنیا یەکێکیان وەك ئەوەی د. کەمال مەزهەرە و بەم شێوەیەن: کێلبەجار، لاچین، قوباتلی، زەنگیلان.

هەرچۆنێك بێت دیارە کێلبەجار و لاچین بە دوو ناوچەی کوردیی تەواو دانرابوون، کە وەکو د.کەمال مەزهەر دەڵێت: بەڵگەنامەی ڕەسمی تر هەیە کە لە بیستەکان ٩٩,٢٪ی دانیشتووانی لاچین و ٩٩,٥٪ دانیشتووانی کەڵبەجاری بە کورد لەقەڵەم داوە. لە ناوچەکانی تریشدا ڕێژەی کورد کەمتر بووە و بە هەموو مەڵبەندەکە ٧٢٪ی کورد بووە کە سەرجەم بۆتە ٣٧١٨٢ کەس. هەرچەندە ئەمەش جێگەی گومانە چونکە بەپێی سەرژمێریی ١٩٢٦ بووە و ئاشکراشە تا ئێستا هیچ سەرژمێرییەکی ڕەسمی، ژمارەی ڕاستەقینەی کوردی نەداوە.[1]

### • سنووری مەڵبەندی کوردستانی سۆڤیێتی

لە سەرەوە مەڵبەندی گەنجە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ناگۆرنی قەرەباخ، لە ڕۆژئاوا مەڵبەندی نور ـ بایەزیدی ئەرمینیا، لە خوارەوە مەڵبەندی جبرایل.

**• هەندێك لە گوند و شارۆچکەکانی مەڵبەندی کوردستانی سۆڤێتی**

ناوچەی لاچین: زێرتی، میکێند، بۆزلو، کەماڵلی، کەلاچە، چێراخلی، ئەگجاکێند، قەرە کەشیش، ئاق ـ بولاخ، شێیلانلی، کەراس ـ بینە، چای ـ بینە.

ناوچەی کێلبەجار: شورتان، زەیلیك، ئوروفژلو، سۆیرخ ـ بولاخ، ئەتجاکێد و خەلانلی.

**• هەندێك لە تیرە و هۆزەکانی مەڵبەندی کوردستانی سۆڤێتی**

لاچین. فەتو، ئەلاڤێردی، شاسوارلی (شاهسوڤەرلی). ئەرەتولو. مەمێدلی.

شێرفلی، کرڤلی (قرەڤلی)، شێرەفلی (شەرەفلی)، لەزگی (لێوگی)، میری، کیونێری (کیونەری)، سەفی، کولی، ئاغالی، ئۆغلی، سمایلیار، کەرەلارا (قەرەلەر)، نەبیلیار (نەبیلار)، ئەسەدلیار (ئەسەدلار)، خوزێلیار، ئیساخانلەر (ئیساهەنلار)، مەمێدلیڤەر، شەفیقلەر و چیچیکلەر.

کێلبەجار: ناگیلی (نەگلی)، گیوتدی (گیودی)، حوسێین کولیلیار، کیولیلیار، کولیکلیو (قولیوقلیو)، نێژیکلی (نێژیڤلی)، عەلی ڕزالی، میریکلی، کێچرلی (کچەرلی)، قەرەخانلیار، حوسێنلەر، مەیللەر (مایلار)، میشادیللەر (میشادلەر)، ئێنیازلەر، شوکورلەر.

... ژیانی کوردەکانی کوردستانی سوور لە زۆر لاوە کەوتە بووژاندنەوە. ڕۆژنامە، چاپەمەنی کوردی و کتێبی خوێندن بە کوردی بڵاو دەکرایەوە. ڕادیۆ و دەزگای تری ڕاگەیاندنی کوردی و قوتابخانە بە زمانی زگماکی خەڵکەکە کرایەوە. هەرچەندە شایانی باسە لەگەڵ ئەوەشدا کە لە مەڵبەندی کوردستاندا دامودەزگای ئۆتۆنۆمی و نیمچە سەربەخۆییێك و خودموختاری هەبوو، بەڵام کوردەکانی ئەرمینیا لە هەلومەرجێکی باشتردا دەژیان و لەوێ دەسکەوتی

باشتریان بەدەست هێنابوو.

کوردەکانی ئەرمینیا هەرچەندە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی تایبەتیان نەبوو، بەڵام حکومەتی ئەرمینیا هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە بایەخی بە کورد و کەمایەتییە نەتەوەییەکانی تر داوە.

ساڵی ١٩٢٩ مەڵبەندی کوردستان هەڵوەشێنرایەوە. مەڵبەندی کوردستان خاوەن ئۆتۆنۆمی و تایبەتمەندییەکی خۆی بوو، بەڵام سنوورەکەی زۆرتر بەڕێوەبەرایەتی بوو وەك لەوەی ئێتنیکی بێت.

شایانی باسە ئەو جۆرە مەڵبەندە واتە نۆیزد. لە سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی سۆڤێتیدا لابرا و یەکەیەکی تری بەڕێوەبەرایەتی لە جێگەی دروست کرا. مەڵبەندی کوردستانیش بوو بە هەرێمی کوردستان، کە لەم ناوچانە پێك هاتبوو: کێڵبەجار، لاچین، قوبادلی، قوتورلی، زەنگیلان و بەشێك لە جبراییل.

خاتوو ئاریستۆڤا دەڵێت: لە پێش دامەزراندنی هەرێمی کوردستان، نیاز وابوو هەرێمی ئەراکس دروست بکرێت و جبراییل بکرێت بە سێنتەری و لەم ناوچانە پێك بێت: کەریاگی، قوتورلی و ناوچە کوردنشینەکانی کێڵبەجار، لاچین، قووباتلی و زەنگیلان.

بەڵام بەپێی ئەو پرۆژەیە دەبوو ناوچەی کێلبەجار و قوتورلی لەبەر دوورییان لە ـ جبراییل ـەوە جیا بکرێنەوە. دەتوانرا ناوچەی ـ لاچین ـیش بخرێتە سەر سێنتەری هەرێمەکە. بەڵام ئەو کاتە دەبوو ڕێگای جبراییل ـ کە چل و پێنج کیلۆمیتر درێژایی بوو، بەبیابانی پۆلی ـ گیریان ـ دا بڕۆیشتایە. لەبەرئەوە چاکتر وابوو، کە هەرێمی کوردستان دروست بکرێت.

بەڵام ئەمەش زۆری نەخایاند و پاش ماوەیەك هەرێمی کوردستانیش هەڵوەشێنرایەوە، هەروەکو کەچۆی دەڵێت: هەرێمی (هەروەها مەڵبەندی ـ ئا) کوردستان هەرچەندە بە بڕیارێك لە سەرەوە دروستبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا

ئـاوات و ئامانجـی هەمـوو کوردەکانـی ئـەو ناوچەیـە بـوو، هـەر بۆیـە بـە کارێکی یاسـایی دادەنرێـت. بـەڵام هەڵوەشـانەوەی بەبـێ پرسـکردن پێیـان نایاسـایی بـوو.

بێگومـان ئـەم هەرێمـەش هـەر بەنـاو بـوو، جگـە لـەوەی هەنگاوێکیـش بـوو بـەرەو دواوە، هەروەکو دیمانشـتێین کە لە پرسـی نەتەوەییدا پسـپۆڕ بـوو، وتویەتی: هەرێمـی کوردسـتان هەیە، بـەڵام بە تەواوەتی بـە تورك کراوە. هەرچەنـدە لە لایەنی سیاسـیەوە بەرژەوەندیـمان لـەوە دایـە کە کـوردەکان پەرەسـەندێکی سـەربەخۆیان هەبێـت، چونکـە ژمارەیەکـی زۆر لایەنگریـان لەودیـوی سـنوورمانەوە هەیە.

دیمانشـتێین کـە بەر هێرشـی بوکشـیان کەوتبـوو، پەنجەی بـۆ ئەوە ڕاکێشـابوو.

کـە لـە ئازەربایجانـدا بەگشـتی پەیوەندییەکـی زۆر خـراپ لەگـەڵ کەمایەتییـە نەتەوەییەکانـدا هەبـووە. بـە تورككردنـی تاڵیشـەکان لـە سـاڵی ١٩٣٠ دا یەکێـك لە ڕووە خراپـەکان و شـۆڤێنیزمی تورکـە ئازەرییـەکان بـوو.

سـەبارەت بـە هۆیەکانـی هەڵوەشـاندنەوەی کوردسـتانی سـوور، یەکێـك لـە بەشـداریکەرانی کۆنفرانسـی دووەمـی کوردەکانـی سـۆڤێت، لـەو بڕوایـە دایـە کـە ئـەو ناوچـە و هەرێمـە نەتەوەییانـە هەڵوەشـێنراونەتەوە نـەك لەبـەر ئـەوەی هیـچ سـوود و بەرژەوەندیـی بـۆ کەمایەتییـە نەتەوەییـەکان نەمابـوو، بەڵکـو لـە ئەنجامـی ئـەو دەرئەنجامـەی سـەبارەت بـە تەواوبوونـی چارەسـەرکردنی پرسـی نەتەوەیـی و نەهێشـتنی دواکەوتوویـی نەتەوەیـی کـە سـەرانی ئەوکاتـەی سـۆڤێت پێـی گەیشـتوون. گوایـە گەلـی سـۆڤێتی بـوە گەلێکـی هاوسـەنگ و سـفت و هیـچ جیاوازییەکـی نەتەوەیـی لەئـارادا نەمابـوو و بـەرەو دروسـتبوونی نەتـەوەی سۆسیالیسـتی دەڕۆن. هەربۆیـە تێرمینـی «گەلـی سـۆڤێت» بەسـەر دانیشـتووانی دەوڵەتێکـی فرەنەتەوەییـدا سـەپێندرابوو، کـە پتر لە سـەد و بیسـت نەتـەوە و دەیان و سـەدان زمانـی نەتەوەیـی جیـاواز پێکهاتبـوو.

بـۆ باشـتر بەرجەسـتەکردنی ئـەو هەسـتە نەخۆشـەی سـتالین، دەبوو ئـەو ناوچە

نەتەوەییە بەڕێوەبەرییانەش لەناو ببرێن و هەر پارچەیەی بخرێتە سەر ناوچە و هەرێمێکی تر، ئەویش بێگومان بە نیازی توانەوەیان و ئینگلیزئاسایی کەرتکردنیان و لەدواییدا زاڵبوون بەسەریاندا.

... دوای هەڵوەشانەوەی کوردستانی سوور، حکومەتی ئازەربایجان کۆمیتەیەکی بۆ لێکۆڵینەوەی ژیان و بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی بوکشپان دروستکرد. کۆمیتەکە دوای شەش مانگ کار ڕاپۆرتێکی لەسەر کوردەکانی ئازەربایجان نووسی، کە دواتر بوکشپان لە شێوەی کتێبدا چاپی کرد. د. کەمال مەزهەر دەڵێت بوکشپان کە هەڵوەشاندنەوەی ناوچەی کارگێڕیی کوردستانی ئازەربایجانی پێ ڕەوا بوو، بە ئاشکرا هەوڵی داوە ژمارەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە کەم بکاتەوە. بەپێی قسەی ئەو کە کەم ڕێگەی تێدەچێت، دوای دامەزراندنی کوردستانی سوور، ژمارەیەکی زۆر لە ئازەرییەکانی ئەم ناوچەیە خۆیان بە کورد نانووس کردووە.

واتە کۆمیتەکە کورد وتەنی هێشتا سڵاوی داوەتەوە و کوردی قەرزار کردووە. بەڵام کۆمیتەکە دانی بەوە داناوە کە زۆر هەڵە و کەموکورتی هەبووە و بەتایبەتی لە بواری خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیرییەوە هیچ کارێکی وا نەکراوە. بۆیە د. کەمال مەزهەر دەڵێت. بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەڵەیەی کە بوکشپان بە تاوان لەقەڵەمی داوە، کاربەدەستانی ئازەربایجانی شورەوی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣١دا ژمارەیەك بڕیاریان دەرکرد، وەك کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی سەرەتایی کوردی کە بڕیار بوو تا ساڵی ١٩٣٣ـ١٩٣٤ هەموو ناوچە کوردەوارییەکان بگرێتەوە. ئەلفوبێی کوردی بە پیتی لاتینی دانرا، سێ کتێبی خوێندنی کوردی لە چاپ درا و هەروەها بڕیار درا بەشی کوردیی سەربەخۆ لە فێرگەی پەروەردەی شائومیان بکرێتەوە و زمانی کوردی بکرێتە زمانی لێکۆڵینەوە و لێدوانی کۆبوونەوەکانی پارت و کۆمسۆمۆڵ.

بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە هەر بڕیاری ڕووت و وشەی سەر کاغەز بوون. بەپێچەوانەوە لەبری چاککردنی باری ژیانی کوردەکان، حکومەتی سۆڤێتی کەوتە ڕاگواستن و پەرشوبڵاوپێکردنی کورد بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان. جگە لەوە، گرتن و زیندانیکردن و بۆ سیبریا ڕەوانەکردن بوو بە چارەنووسی زۆر لە خوێندەوار و زانا و ناودارانی کورد وەك عەرەبی شەمۆ، حاج جوندی و ...

بێگومان کارەکە تەنیا بە ڕاگواستن تەواو نەبوو، بەڵکو تواندنەوەشی بەدوادا هات، چونکە بە گرووپی بچوك بچوك و تەنانەت لە خێزان دابڕانیش، بڵاوەیان پێکرا. وردە وردە ڕۆژنامە کوردییەکان، کتێب و بەرهەمی تری ئەدەبی نەهێڵران. ئینجا قوتابخانە و ئێزگەی ڕادیۆ داخران. لە قوتابخانەکانیشدا چیتر بە زمانی کوردی وانە نەدەوترایەوە. هەموو ئەم کارانە بوونە هۆی ئەوەی ئاستی کولتووریی کوردەکان نزم بێتەوە و زمانەکەشیان بەرەو مردن بڕوات. کار گەیشتە ئەوەی وەکو «کەچۆی» دەڵێت: لە نەخشەی دیموگرافی ئازەربایجان، تورکمانیا، کازاخستان، قیرگیزیا، ئوزبێکستان و تاجیکستان بە تەواوی ناوی «کورد» سڕایەوە، بەڵام نە ستالین و نە برنێف نەیانتوانی بۆ هەتاهەتایە ناوی کورد بسڕنەوە، ئەمەش بۆ چاکەی گەلانی ئەرمینیا و گورجستان دەگەڕێتەوە. هەرچەندە ئەوانیش کاری نایاسابیان بەرامبەر کورد کردووە. بۆ نموونە لە ئەرمینیاش تێکنیکۆمی کوردیی پشت قەفقازی پەروەردە و لقی کوردناسیی زانکۆ داخران و تەنیا شانۆیەکی دەوڵەتی کوردیش کە هەبوو هەڵوەشێنرایەوە و سێ جار ئەلفوبێی کوردی گۆڕدرا.[٢]

## دووەم: ئەدەبی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا

لە سەدەی بیستەمدا لەناو کۆمەڵی کوردی وڵاتی ڕووسیادا تەنیا لەناو کوردی ئەرمەنستان لە قەفقاس ئەدەبی نووسراوی هونەری بە زمانی کوردی پەیدا بوو. خەڵکەکە بە گشتی هەژار و نەخوێندەوار و ئاوارەی وڵاتانی عوسمانی و ئێران بوون. لەناو کوردی ئەوێ قسەیێك هەیە دەڵێ: «لە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ تاکە یەك کەس خوێندن و نووسینی بووە ئەویش عەرەبی شەمزیە». ئەم قسەیە لەوانەیە بەڕاستی هەندێ ورد نەبێ، بەڵام لە ڕاستییەوە زۆر نزیکە. بۆ بەڵگە ڤـ مینۆرسکی ئەوە دەگێڕێتەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەم کوردی ئێران و عوسمانی لە هاتوچۆدا بوون، هیچ هۆیەك نەبوو ڕێگەیان لێ بگرێ لە بڕینی سنوور و نیشتەجێبوون لە قەفقاس. لە یەریڤان دوو قوتابخانەی کوردی هەبووە، هەروەها قونسوڵی ڕووس لە شاری خۆی لە ئێران قوتابخانەیەکی بۆ کورد کردبووەوە، ڕەنگە ئەم قوتابخانانە بەو ناوەوە کورد بووبن چونکە بۆ قوتابییانی کورد کرابوونەوە، ئەگینا باوەڕ ناکرێ بە کوردی وانەیان تێدا وترابێتەوە. دەڵێن لەو سەردەمەدا پێش جەنگی یەکەمی گیتی لە شارانی خارکۆڤ و کییێڤ لە هەریەکەیانا قوتابییێکی کورد هەبوو.

کوردی ئەو وڵاتە هەرچەندە خوێندن و نووسین و بەرهەمی ئەدەبی نووسراویان نەبوو، بەڵام لە ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) زۆر دەوڵەمەند بوون و خاوەن گەنجینەیەکی بێهاوتا بوون، لەبەر ئەوە هەرکە خوێندەواری لەناویاندا بڵاو بووەوە، بایەخێکی زۆریان بە کۆکردنەوە و تۆمارکردنی تێکستی ئەو بەرهەمە میللییانە دەدا بە شیعر و پەخشانەوە. لەدواییدا دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لە ناوەرۆکی کۆکراوەکان. تا ئێستا پسپۆڕانی ئەوێ لە مەیدانی فۆلکلۆردا لە ڕیزی پێشەوەن لە هەموو کوردستاندا.

- **لە نەخوێندەوارییەوە بۆ خوێندەواری**

لە ساڵی ١٩٢٩ عەرەبی شەمۆ و مامۆستای قوتابخانەی ئەرمەنی ئی.مارۆگوولۆڤ یەکەمین ئەلفوبێی کوردی بە تیپی لاتینییان بڵاو کردەوە بۆ نووسینی کوردی. کتێبەکە بەناوی «خۆ خۆ هینبوونا خاندنا نڤیسارا کرمانجی» بوو. لە یەریڤان ٢٥٠٠ دانەی لێ چاپ کرابوو. لە پاشانا هەزاران دانەیان بە لیست بڵاو کردەوە. دەوڵەت بڕیاری لەسەردا و بە ڕەسمی وەك ئەلفوبێیەکی زانستی کەوتە کارەوە. ئەم ئەلفوبێیە تا ساڵی ١٩٣٧ بەردەوام بوو. سەدان کتێبی کوردی پێ چاپ کرا. لە ساڵی ١٩٣٨ تەنیا یەك کتێبی کوردی لەیەریڤان بڵاو کرایەوە، ئەویش دیارە پاشماوەی کتێبەکانی ساڵی پێشوو بوو. بەم جۆرە بەپێی سیاسەتی فاشی و تیرۆریانەی ستالین زمانی کوردی و ئەدەب و خوێندەواری و ڕۆشنبیری کورد قەدەغە کرا تا دوای جەنگی دووەکی گیتی. ئەم کارە کوردی هەموو ناوچەکانی ڕووسیای گرتەوە لە قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاستدا. لەدوای جەنگی دووەم لە ساڵی ١٩٤٦ تەنیا دانیان بە مافی کوردی ئەرمەنستان هێنا. لەو کاتەی پێویست بوو ئەلفوبێ لاتینیە کۆنەکە زیندوو بکەنەوە، وازیان لەو هێنا و ئەلفوبێیەکی دیکەیان دانا لەسەر بنچینەی ئەلفوبێی کیریلی یا (سیریلی) کە زمانی ڕووسیشی پێ دەنووسرێتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەم ئەلفوبێیە لە لاتینی باشترە چونکە تاکی کورد لە ئەرمەنستان سێ زمان فێر دەبێ، زمانی خۆی و ئەرمەنی و ڕووسی. زمانی ئەرمەنی ئەلفوبێی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر ئەلفوبێی زمانی کوردی بە تیپی لاتینی بێ ئەو کاتە پێویستە سێ جۆرە ئەلفوبێ بزانێ، بەڵام ئەگەر ئەلفوبێی ڕووسی بەکار بێنێ مانای ئەوەیە قوتابیی کورد دوو جۆرە ئەلفوبێ فێر دەبێ لەباتی سێ جۆر. ئەم ڕایە تا ڕادەیێك بەجێیە، بەڵام بێ گومان ئەو ئەلفوبێیە تەنیا بۆ کوردی ئەرمەنستان کەڵکی دەبێ، بە میلیۆن کوردی دەرەوەی کوردستانی گەورە سوودی لێ وەرناگرن.

لە ساڵی ١٩٤٦ ئەو مافانەی لە کوردی ئەرمەنستان زەوت کرابوو درایەوە پێی. ڕۆژنامەی «ڕیاتازە» دەستی کردەوە بە دەرچوون، لەساڵی ١٩٤٦ و ١٩٤٧ دوو سێ کتێب و لە ساڵانی دوای ئەو چەند کتێبێکی دیکەی بەنرخ بڵاو کرانەوە لە بابەت زمانی کوردی و ئەلفوبێی تازە لەسەر بنچینەی ئەلفوبێی کیریلی، هەروەها چەند کتێبێکی زۆر بەنرخ لە بابەت ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) کوردی بڵاو کرانەوە. ئیتر لەمە بەدواوە بایەخێکی زۆر بە چاپەمەنی کوردی دەدرا. هەموو ساڵ کتێبێکی زۆر قوتابخانەکان بەچاپ دەگەیەنران، لە ئەوانیش زیاتر بایەخ بە بەرهەمی ئەدەبی دەدرا شیعر و وتار و چیرۆک و ڕۆمان و بابەتی دیکە. ژمارەی چاپکردنی کتێب لە هەڵبەزین و دابەزیندا بوو هەندێ ساڵ دوو سێ کتێب، هەندێ ساڵی دیکە زیاتر لە دە کتێب بڵاو دەکرانەوە. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٩٦٠ سێزدە کتێبی کوردی جۆراوجۆر لە شاری یەریڤان بڵاو کراوەتەوە.

- **پەیدابوونی ئەدەبی نووسراوی هونەری**

پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەری١٩١٧ میللەتی کوردی ئەرمەنستان نەخوێندەوار بوو، بەڵام ئەدەبێکی بەرزی هەبوو جێی نرخ پێدان و شانازی بوو لەلایەن گەلێ لە کوردناسان و ڕۆژهەڵاتناسانی ڕووس و ئەورووپاییانی دیکە، ئەگەر قسەی باشیان بکردایە دەیانووت میللەتێکە بە شاعیر خوڵقاوە. لە پاش پەیدابوونی خوێندەواری لە ناو ئەم کوردانەدا، لە ژێر کاریگەریی ئەو ئەدەبە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە ئەدەبێکی نوێ پەیدا بوو، واتە کلاسیکی بە مانا ئەدەبی نووسراوی بەرز (مومتاز). ئەو بەرهەمە لە پلەی ئەدەبی هونەری نووسراوی هەموو نەتەوەکانی ڕووسیای سۆڤیەتی ئەو سەردەمە بوو، واتە نەتەوە ئەورووپایی و ئاسیاییەکان. لێرەدا نەوەکو تەنیا کورد بەڵکو هەموو نەتەوەکانی ئەو وڵاتە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی ئەدەبی کلاسیکیی پێشکەوتووی ڕووس.

ئینجا لـه بابـەت کـوردەوە زیـاد لەسـەر کاریگـەریـی ئەدەبـی ڕووسـی، ئەدەبـی ئەرمەنیـش تـا ڕادەیێـك کاریگـەریـی بەسـەر ئەدەبی کوردی ئـەو وڵاتـەوە هەبوو.

بەگشـتی ئەدەبـی کـوردی لـه قەفقاسـی ڕووسـیا لەسـەر قانـوون و تیۆرییێکـی دەوڵـەت بەڕێـوە دەچـوو، دەڵێ «بەرهەمی ئەدەبی و هونەری پێویسـتە بە ڕوخسـار نەتەوەیـی و بەنـاوەرۆك سۆسیالیسـتی بـێ». واتـە زمانـی بەرهەمەکـە قەومییـە، بەڵام ناوەرۆکـی پێویسـتە لـە پێناوی دروسـتکردنی کۆمەڵی سۆسیالیسـتی بـێ و لە دوای ئـەودا کۆمۆنیـزم هەمـوو ئادەمـزادی سـەر ڕووی زەوی بەڕێـوە ببـا. هەرچەنـدە ئـەم تیۆرییـە هەڵـە بـوو، چونکە بـە فەرمانـی دەسـەڵات و دانانـی تیۆری داهێنانی ئەدەبـی لـە ڕووی جوانکارییـەوە دورسـت نابـێ. ئەدەبی کـوردی و ئەدەبی هەموو نەتەوەکانـی ئـەم وڵاتـە بـە شـێوەیەکی ڕەسـمی و بـەزۆر کەوتبـووە ژێـر بـاری ئەم ئـارەزووە قورسـەوە. بەڕاسـتی هەرچەنـد پێـڕەوی ئـەم تیۆرییـە کرابـێ و بەرهەمـی ئەدەبـی بێتـام کەوتبێتـە نـاوەوە، نموونەیەکـی زۆری بەرهەمێکی جـوان و ڕەنگینی ئەدەبـی کـوردی نـووسراو بـۆ یەکەمین جار لەنـاو کوردانی قەفقاسـی ڕوسـیا پەیدا بـوو، ڕەنگدانـەوەی ژیانـی کۆمەڵایەتـی و بیـری کوردایەتـی و دڵـداری نـاو دڵ و دەروونـی ئادەمـزادی کـورد بوو.

بۆ یەکەمین جار کۆمەڵێك وتار و شێعر و چیرۆك لە کتێبێکدا لە ساڵی ۱۹۳۲ لە یەریڤان بڵاو کرایەوە بەناوی «عەفراندنا ئەولن» ـ تۆپکرنا نڤیسارا سێکسیا کرمانجا ڕەخ ئەسۆسیاسیا نڤیسکارا فلستانێ» ـ لەلایەن «نەشرا حوکمەتا شەورا فلستانێ» بڵاو کراوەتەوە. ئەم بەرهەمە لقی کوردی لە یەکێتی نووسەرانی ئەرمەنستان کۆی کردۆتەوە و بڵاوی کردۆتەوە. ئەمینی عەبدال پێشەکی بۆ نووسیوە.

ئـەم کتێبـە بـۆ یەکەمین جـار نموونـەی شـێعری تـازە لەدایکبووی کـوردی ئەو ناوچەیـەی بـڵاو کردۆتـەوە. چەنـد نموونەیێکـی پەخشـانیش لـە کورتـە وتـار و کورتـە چیـرۆك تیایـدا بەرچـاو دەکـەون. کتێبەکـە برێك لـە پارچە لیریکـی کورت

و وتاری ئەدەبی ئەم شاعیر و نووسەرانەی گرتۆتەخۆ: حاجی جندی، ئازات نوشتوونی، ئەمینی عەبدال، عەتاری شەرۆ، فەتی، سالح، بایلۆزی چەچان.

شێعر و نوسینی کوردی ناو کتێبەکە بە زمانێکی میللیی ڕەوتن نووسراونەتەوە، لە ئەدەبی میللی سەرزارەوە زۆر نزیکن. شاعیران کێشی سیلابی خۆماڵی میللیی لاوك و گۆرانی ناو خەڵکی کوردیان بەکار هێناوە. لە هەموو ڕوویێکەوە نزیکترە لە ئەدەبی میللی، چونکە یەکەمین تاقیکردنەوەیە بۆ دروستبوونی ئەدەبێکی ڕۆشنبیرانەی سەردەم. ئەوەی تازە و گرنگ بێ ناوەرۆکی ئەو نووسین و شێعرە نوێیە هەموو بەپێی بڕیارێکی دەسەڵاتی دەوڵەت لە دەوروبەری بیروڕای دروستکردنی کۆمەڵێکی سۆسیالیستی بەپێی تیۆریی مارکسیزم بەڕێوە دەچێ. ناوەرۆکی لە ئایین و سۆفیزم و دڵداری و هەستی دەروونی ناوەوەی ئادەمزاد دوورە. هەرچۆنێ بێ لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە دیاردەیێکی نوێیە لە ئەدەبی کوردیدا، وەك ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە گرنگەی لەو ماوەیەدا کەوتە ناوەوە لە کوردستانی باشوور. لە شاری سلێمانی واتە بزووتنەوەی «شێعری نوێ» لەگەڵ جیاوازی لە نێوان ئەم دوو ڕێنیسانسە، هەردووکیان ئەدەبی کوردییان دەوڵەمەندتر کرد.

لەم ماوەیەدا هەندێ نموونە لەیەکەمین عەفراندنی کوردی قەفقاس دەخرێتە ڕوو:

عەتاری شەرۆ لە لیریکی «ئەم ژ دخونن»دا دەڵێ:

خوەندنا مە ڕۆنایە، فرەیە
عولمێ وێ زەف زێدەیە
چێکرنا سۆسیالیزمی ل بەر مەیە
دەورانا مە، دەورانەکا زێدەیە

خوەندنا مە خوەشە ئو ئەشقە

ئەم هەڤرا دخوونن تفاقە

خوەندنا مە ب زمانێ دێیە

ئەم زوو بقەدینن گۆتنا شێورێیە

زمانێ مەیس لال ڤەبوو

خەڤاتچی تەف شا بوون

ملێ مەیی گریدایی ئازا بوو

دەورانا کەڤن ئوندا بوو

شاعیر لەم لیریکەدا باس لە کەڵکی خوێندن دەکا، بۆ هاوزمانانی خۆی ئەوانەی تا ئەو سەردەمە خوێندەوارییان تێدا نەبووە. لە شێعرەکەدا بەپێی پێویست هەندێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی نوێ بەکار دێنێ وەکو سۆسیالیزم و شێورێ یا شۆرەوی بۆ زاراوەی سۆڤیەت. شاعیر بەراوورد لە نێوان ژیانی کۆن و تازەی کورد دەکا، چۆن لە پێشانا زمانیان لاڵ بوو و خوێندەوار نەبوون و ئێستا بەهۆی خوێندن زمانیان کراوەتەوە. لە پێشانا دیل بوون، ملیان لە کۆت و زنجیردا بوو، ئێستا لە ئازادی و ژیانی سەربەستی دان.

ساڵح شاعیرێکی دیکەی قۆناغی یەکەمی پەیدابوونی ئەدەبی کوردییە لە قەفقاسی ڕووسیا، لە شێعرێکیدا بەناوی «یەکێ گولانێ»دا دەڵێ:

عیدا یەکێ گولانێ

سەر ملێ پرۆلێتارا بەیرەقێ سۆرن

دکشن ژ کووچێ بەرلینی، لوندۆنێ

بەیرەقی سۆر هەر ئالیا دفرن

ژ وان نامینن پرۆلێتاریێ دن
گشکی سازی دەزگەنە
سیلح و چەك دەستێ وان دانە
جێرگە ب جێرگە دکشن
گاڤێ درێژ داڤێژن
بهەڤرا کلامێ ئینگلابێ دڤێژن
دەف زورنە بەر وان د هەژن
پێشدا جمعەتا خەڤاتچیا
قەت تالاشێ نەکیشنن ژ فاشیستا
بسەرکاریا تفاقا کۆمۆنیستا
ببرن کۆکا کاپیتالیستا
دیوانا زولومدارا هلشینن
قەید جیدارا بقەتینن
هەڤالا ژ کەلا، زندانا دەرخینن
بەیراقا سۆر هەر دەرا دا جکینن

شاعیری کورد ساڵح بەم لیریکە پێشوازی لە جەژنی یەکی ئەیاری کرێکارانی گێتی دەکا. ئەمە جەژنێکی پیرۆز بوو لە ڕووسیای سۆڤیەت. بەهۆی پێویستی ناوەڕۆکی لیریکەکە شاعیر هەندێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی سیاسی و ئابووری بەکار دێنێ بەپێی بیروباوەڕی مارکسیزم. ئاڵای سوور ڕەمزی دەوڵەتی ڕووسیای سۆڤیەت و هەموو کرێکارانی گێتی بوو. شاعیر تەنیا بەمە نەوەستاوە هەندێ زاراوەی دیکەی بەکار هێناوە وەکو پرۆلیتاریا، فارشیست،کۆمۆنیست، کەپیتالیست، هەروەها ئینقلاب بە مانای شۆڕش.

ئەم وشانە بۆ یەکەمین جار هاتوونەتە ناو بەرهەمی ئەدەبی کورد (شێعر و پەخشان) لە ئەنجامی ڕەنگدانەوەی سیستێمی تازە لە فەرمانڕەوایی سەردەمی سۆڤیەتەکان لە ڕووسیای دوایی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۱۷.

بە گشتی گۆڕانێکی قووڵ بەسەر ئەدەبی کوردی ئەو وڵاتەدا هات، بەتایبەتی پاش جەنگی دووەمی گیتی کە بۆ جاری دووەم کورد هەندێ مافی خوێندن بە زمانی خۆی وەدەست هێنا.

* بەرهەمی ئەدەبی لە ڕووی ڕوخسارەوە

کەرەستەی نووسینی ئەدەبی کوردی لەو وڵاتەدا لەسەر بنج و بناوانی ئەدەبی میللیی سەرزاری کورد بوو. زمانی قسەکردنی کوردی بەکار دەهێنرا. شاعیران بەرهەمیان لەسەر کێشی سیلابی میللی و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی لاوك و گۆرانی دەهۆنییەوە، بەڵام شێوە و بابەتەکانی لاساییکردنەوەی ئەدەبی ئەوروپایی بوو، بەتایبەتی ئەدەبی ڕووسی. لەبەر ئەوە ئەدەبی کوردی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا لەم ڕووەوە وەك ئەدەبێکی ئەورووپی پەیدا بوو. شاعیر یا نووسەر بەرهەمی بە پەخشان و شێعر دەنووسییەوە، وەکو دەستووری ئەورووپاییان، ئەوانەی کوردیش زۆربەیان لەم بابەتە بوون، ئەگەرچی بە گشتی هەردوو نووسەری گەورە و بەناوبانگیان عەرەبی شەمۆ و عەلی عەبدولڕەحمان بەرهەمی ئەدەبییان پەخشان بووە.

بەرهەمی ئەدەبی کوردی ئەو وڵاتە لە قاڵبی ئەم بابەتانەی لای خوارەوە بەرچاو دەکەوێ:

۱ـ وتار: بابەتێکی گرنگە لە ئەدەبدا، لایەنی هەموو زانستییە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە. ئەوەی لە ئەدەبی داهێنراوەوە نزیکە ئەو وتارانەن لە وەسف و دڵداری و کۆمەڵایەتی و تا پلەیێکیش لە سیاسەت و ئابووری دەدوێن، ڕەخنە

و پێکەنین و ناوەرۆکی قەشمەری ئامێزیان تێدایە. بەزۆری ئەو نووسەرانە بەکاری دێنن ئەوانەی ڕۆژنامەنووسن لە گۆوار و ڕۆژنامەکاندا کار دەکەن. وتار لەناو کوردانی ئەو وڵاتەدا بەهۆی ڕۆژنامەی «ڕیاتەزە»وە زۆر پێش کەوت، لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە بەبێ پسانەوە هەفتەی دوو جار بڵاو دەکرایەوە تا ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت (١٩٩١).

٢ـ چیرۆك: سەرچاوەی بنچینەیی نووسەرانی کورد لەم لایەنەوە گێتیی چیرۆکی ڕووسی دەوڵەمەند بوو، ئەوان ئاگاداری ئەدەبی کوردی دەرەوە نەبوون. هەروەها ئەدەبی هاوسێکانی کوردی دەرەوەش. چونکە بەشێکی زۆر کەمیان نەبێ زمانانی عەرەبی و تورکی و فارسییان نەدەزانی. لەگەڵ سەرچاوەی ڕووسی ئاگاداری ئەدەبی ئەرمەنی و گورجی بوون، ئەمانەش زیاتر دەشکێنەوە سەر ئەدەبی ڕووسی و ئەورووپایی. لەبەر ئەوە مەشقی نووسەرانی کورد بۆ نووسینەوەی چیرۆك بە لاساییکردنەوەی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەورووپا بوو. گەلێ جاریش وەکو ئەوان بەبێ ئەوەی هەست بکەن وتار و چیرۆك تێکەڵ بەیەکتری دەبوون. بەڵام بەلای ئەوانەوە وەکو دەستوور هەموو نووسینێك ماکی جوانکاری تێدا بێ دەچێتە ناو بەرهەمی ئەدەبییەوە هەتا ئەگەر لەلایەن ڕەخنەگر و مێژوونووسانی ئەدەبەوە ناویشی بۆ نەدۆزرێتەوە.

٣ـ ڕۆمان: ئەگەر مێژووی ئەم بابەتە بەرزە لە ئەدەبی کوردیدا بنووسرێتەوە، پێویستە سەرەتای پەیدابوونی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا دەست پێبکا و بەناوی یەکەمین ڕۆماننووسی کورد عەرەبی شەمۆ ببەسترێتەوە. لە پاش ماوەیێکی زۆر بۆ دووەمین جار بابەتی ڕۆمان لە کوردستانی عێراق لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم سەری هەڵدا. بێگومان ڕۆمانی «پێشمەرگە»ی ڕەحیمی قازی ئەویش لە ژێر کاریگەریی ئەدەبی ڕووسی و لاساییکردنەوەی عەرەبی شەمۆ بوو. چونکە ڕەحیم لە دوای

نیشـەجێبوونی لـە باکـۆ لـە سـاڵی ١٩٤٦ەوە تـا کۆچـی دوایـی لـە ژێـر کاریگەریی ڕۆشـنبیری ئەورووپـا ڕۆمانەکـەی نووسـیـەوە. هونـەری ڕۆمـان پایەیێکـی بـەرزی هەبـوو، لـە ئەدەبـی کوردی ئەوێـدا پێش کەوت، ڕۆماننووسـی گـەورە هەڵکەوتن. عەرەبـی شـەمۆ و عەلـی عەبدولڕەحـمان لـە دامەزرێنـەران بـوون، ئـەوەی پـاش ئـەوان بەرهەمـی بەپێزیـان لـەم لایەنـەوە داهێنـاوە. ئـەوەی سـێیەمی ئـەو وڵاتـە کەمتەرخەمـی نەکـردووە، لەگـەڵ ئـەوەی تەگـەرەی زۆر ڕێگـەی پێشـکەوتنیانی گرتبـوو، بەرهەمـی بـاش و جوانیـان بـڵاو کردۆتـەوە.

٤ـ لیریـك: لـە ڕووی ڕوخسـاردوە و بـە ژمـاردی دیر ئـەم جۆرە شـیعرە ئەورووپاییە لـە پارچـە و غەزەلی شـێعری کلاسـیکی نەتەوەکانـی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت دەکا. کـوردی ئـەو وڵاتـە ڕاسـتەوخۆ لە شـێعری ڕووسـییان وەرگرتـووە و زۆریـش لە لاو ك و گۆرانیـی ئەدەبـی میللیـی خۆیـان دەکا. وەکـو چـۆن لیریك لە ئەدەبـی هەموو گێتـی هونەرێکـی سـەرەکییە و هەموو لایەنەکانی ژیانـی ئادەمزادی نـەوەی دووەم و سـێیەمی ئـەم ڕێنیسـانسـە ئەدەبییـە لـە نیوەی دووەمـی سـەدەی بیستەم ئـەم جۆرە شـێعرەیان بۆ هەموو هەسـت و نەسـتێکی کەسـێتی و سـایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و سیاسـی و کوردایەتـی بـەکار هێنـاوە. دەرچوونـی ڕۆژنامـەی «ڕیاتـەزە» بـە ڕێکوپێکـی بـۆ ماوەیێکی زۆر هۆیێکی گرنگ بوو نووسـەر و شـاعیرانی هان دەدا ئـەم بابەتە شـێعرە بهۆننـەوە بۆ ئـەوەی لاپەڕەکانـی ڕۆژنامەکەی پـێ ڕەنگین بکەن.

٥ـ پۆییـم (قەسـیدەی درێـژ، بەیتـی ئەدەبـی میللیـی سـەرزار): ئـەم بابەتـە شـێعرە لـە کۆنـەوە لـە ئەدەبـی کلاسـیکی ڕۆژئـاوا بـووە، لـە ڕۆژهەڵاتـدا قەسـیدە (چامـە)ی پێدەڵێـن، لـە ئەدەبـی میللیـی سـەرزاری کـوردی «بەیـت»ی پێدەڵێـن. شـاعیرانی ئەدەبـی کـوردی نوێـی ئـەو وڵاتـە وەك لاسـاییێك لـە ئەدەبـی ڕووسـی و تـا ڕادەیێکیـش لـە ئەدەبـی ئەرمەنـی و گورجیـان وەرگرتـووە، ئیـتر هەسـتیان پێـی کردبـێ یـا نەکردبـێ، زۆر بـاش لەگـەڵ ڕێبـازی ئەدەبـی کوردیـدا گونجـاوە،

چونکە «بەیت» بابەتێکی زۆر گرنگە لە ئەدەبی میللیی سەرزاری کورد، لەبەر ئەوە ئەگەر بەزۆریش سەپێندرابێتە سەر شاعیران ئەوان لە خۆیانەوە ئەو جۆرە شێعرە پێویستەیان هێناوەتە ناو ئەدەبی نوێوە، چونکە شتێکی نامۆ نییە لە لای ئەوانەوە.

## ● نووسەر و شاعیران

لە سەرەتای دروستبوونی ئەدەبی نووسراوی کوردی شاعیری خوێندەوار نەبوو، ئەوانەی دەستیان بە شیعر نووسین کرد، شاعیر نەبوون، هەستی شێعرایەتیان هەبوو، یا شاعیری میللی بوون و گوێی مۆسیقیان بەهێز بوو، قوتابی و خوێندەواری هەموو لایەنەکانی زانستییە پراکتیکی و کۆمەڵایەتییەکان مەشقی نووسینی شێعریان دەکرد. لە نەوەی دووەم و سێیەمدا نووسەر و شاعیری بەڕاستی پەیدا بوون و دەوری گرنگیان هەبوو لە پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا. مێژووی ئەدەبی کوردی ناوی گەلێکیان دەور دەکاتەوە. هەندێ لەمانە دەچنە ناو نەوەی یەکەمەوە، واتە ئەوانەی تەمەنیان درێژ بووز لەم ماوەیەدا پێویستە یادی هەندێکیان بکرێتەوە. ئەمانە نووسەر و شاعیر بوون، بەرهەمی پەخشانی و شێعرییان هەیە.

ئەحمەد مرازی (١٩٠٢ ـ ١٩٦١)، جەدۆی گەنجۆ (١٩٠٦ ـ ١٩٤٥)، نادۆی خدۆ (١٩٠٧)، میرۆیی ئەسەد (١٩١٩)، ئوسڤی بەکۆ (١٩٠٩ ـ ١٩٦٩)، سەمەند سیابەندۆڤ، لە بەرهەمهێنانی ئەدەبی داهێنراو و جێ پەنجەیان دیارە. ئەمانە لە نەوەی یەکەمی بزووتنەوەکە بوون، لە خوێندەواریدا گەیشتنە ئەوەی ببن بە شاعیر و نووسەر و دەوریان لە پێشخستنی ئەدەبدا هەبێ.

لە نەوەی دووەم و سێیەم، هەندێکیان تا ئێستا لە ژیان دان پێویستە ئاماژە بۆ ئەم شاعیر و نووسەرانە بکرێ:

سەعیدی ئیبۆ (١٩٢٤)، سمۆی شەمۆ (١٩٢٨)، کارلێنی چەچانی (١٩٢٩)، فەریکی ئوسب (١٩٣٤)، عەمەریکی سەردار (١٩٣٥)، جەردۆی ئەسەد، باخچۆی ئیسکۆ، ئۆردیخانی جەلیل، وەزیری ئەشۆ و هی دیکە. [٣]

هەر لەم پێوەندییەدا و لە سەرچاوەیەکی دیکەدا باس لەوە دەکرێ کە ئەدەبیاتی کوردی لە یەکێتی سۆڤیەت بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

***قۆناغی یەکەم:*** ئەو کاتەی لەناو هەموو گوندێکی کوردنشیندا خوێندنگەی کوردی کرابۆوە، لەڕێی ناوەندەکانی نەهێشتنی نەخوێندەوارییەوە هەموو بەتەمەنەکان فێری خوێندنی کوردی بوون، ڕۆژنامەی کوردی چاپ دەبوون و ئەو کۆمارانەی کوردی لێ دەژیا، پشتگیریی بەرەوپێشچوونی زمان، کولتوور و ئەدەبی کوردییان دەکرد. ئەو قۆناغە کە لە ساڵی ١٩٣٠یەوە دەست پێدەکات و تاکو ساڵی ١٩٣٨ی خایاند. لەو قۆناغەدا وێڕای کەموکوڕییەکانی ناوەڕۆك و زمان، بناغەی ئەدەبیاتی کوردی لە یەکێتی سۆڤیەت دانرا، ئاسەوارە ئەدەبیەکان جێگیر بوون، لە بواری زمانەوانییەوە هەنگاوی هێژا و بەنرخ هاویشترا.

***قۆناغی دووەم:*** لە ساڵی ١٩٣٨ەوە تاکو مردنی ستالین، ڕاستتر وایە بڵێین هەتا ساڵی ١٩٥٥ی خایاند. ئەو کاتەی چرای ژیانی کولتووری و ئەدەبی کوردەکان کوژابۆوە. لەو دۆخە دژوارەشدا هەل بۆ نقیسکارە کوردەکان ڕەخسا چەند بەرهەمێکی خۆیان چاپ بکەن.

لە ساڵی ١٩٥٥ بەدواوە: ئەدەبیاتی کوردی دەکەوێتە ناو قۆناغی ژیانەوە کە ئەمەش ناوی نوێ و شێوازی نووسینی نوێ لەگەڵ خۆیدا دێنێت، ئەو کاتەی ئەدەبیاتی کوردی خۆی لە دروشمی سیاسی و کاریگەریی ئەدەبیاتی دراوسێکانی ڕزگار دەکات، بەڵام مخابن دوای ساڵی ١٩٣٨، لە ئازەربایجان و تورکمانستان هیچ بەرهەمێك بە زمانی کوردی چاپ نەبوو. [٤]

## سـێیەم: ژیـان و بەسـەرهاتی چەنـد زانـا و ئەدیبێکـی کـوردی یەکێتـی سـۆڤیەتی پێشـوو

کوردەکانـی یەکێتـی سـۆڤیەتی پێشـوو چ لـە بـواری زانسـت و چ لـە بـواری ئەدەبیاتـدا گەلێـك مرۆڤـی زانـا و بلیمەتیـان لەنێـودا هەڵکەوتـووە کـە توانیویانـە بـە هـەوڵ و تێکۆشـانی زۆر و، خۆڕاگرتـن لـە بەرامبـەر دژوارییەکانـی ڕۆژگاردا خزمـەت بـە نەتەوەکەیـان و بگـرە بـە خەڵکـی دیکـەش بکـەن. کەسـانێکی وەك ئادر ئادروف. کنیاز ئیبراهیم. عەرەب شەمۆ. جەلیلی جەلیل. جاسم جەلیل. قەناتـی کـوردی، حاجـی جونـدی و چەرکـز خـودۆ و دەیـان کەسـی تـر ئەمـڕۆ نەتەنیـا لەسـەر ئاسـتی کوردسـتان، بەڵکـو لـە دنیاشـدا کەسـانێکی نـاسراون و بەرهەمەکانیشـیان لـە زۆر وڵاتـان و بـە زۆر زمانـان وەرگێـڕدراون و کەڵکیـان لـێ وەردەگیردرێـت.

جێگـەی وەبیرهێنانەوەیـە کە ژنانی کوردی نێو کۆمارەکانی یەکێـتی سـۆڤیەتی پێشـووش لـەم کاروانـە بەجێ نەمـاون و لەناو ئەوانیشـدا کەسـانێکی زۆر زێهاتی و خـاوەن بەهرە سـەریان هەڵـداوە.

«خاتـوو نـوریێ یۆلاتۆڤـا ژنـە بێـژەر و یەکـەم ڕۆژنامەوانی کـوردە کە لـە ڕادیۆی کوردیـی یەریڤـان کاری کـردووە. لـە دەوروبـەری سـاڵەکانی ١٩٠٠ لەدایـک بووە و لـە کۆتایـی سـاڵەکانی ١٩٧٠ کۆچـی دوایـی کـردووە. هەروەهـا خاتـوو ئەزنیڤـە ڕەشـید، خاتوو سێڤاسـا عەبدۆ، خاتوو گولیزار جاسم،لوسـیان حوسـێن و زۆری تر لـە بەشـی کوردیـی ڕادیـۆ دەنگی یەریڤـان وەک بێژەر و نووسـەر کاریـان کردووە. سیما سـەمەندیش ژنـە نووسـەر و ڕۆماننووسـێکی ئـەو سـەردەمەی کـوردە. زادینا شـاکر هونەرمەندێکـی نـاسراوی کـوردە. سوسـیکا سـمێ خانمـە دەنگبێژێکـی کـوردە کـە لە سـاڵانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا دەگەڵ تیپە هونەرییەکەی گۆرانیان

دەگوت. دەنگبێژە ژنەکانی دیکە بریتین لە: ئەسلیکا قادر، کوبارا خدۆ، جەمیلە چاوش و خانا زازێ.

هەروەها خاتوو دکتۆرە نوورا جەوەری و خاتوو جەمیلە جەلیل گۆرانی و موزیکی کوردییان کۆ کردۆتەوە و لە چەند کتێبدا بڵاویان کردۆتەوە. بەناوبانگترین دکتۆرە ژنەکانی ئەو سەردەمەی کورد دکتۆرە فەریدە حەجی و دکتۆرە دۆنارا مەحمودۆڤان بوون. هەروەها لەو سەردەمەدا زۆر لە ژنانی کورد زوو بوونەتە مامۆستا کە بەناوبانگترینیان فەریدە حەجی و لوسیان ئەشۆن.[٥]

خاتوو زەرا یووسف زمانناس لە زانستگای لینینگراد، فەرهەنگێکی بە هاوکاری قەناتی کوردۆ نووسیوە و هەروەها توێژینەوەیەکی ناوبراو هەیە کە باس لە زاراوەی سلێمانییە دەکات.[٦]



لێرەدا بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهاتی چەند زانا و ئەدیبێکی کوردی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەکەین کە لە میانەی باسی ژیانی ئەوانیشدا ئاماژە بە زۆر بابەتی دیکەش دەکرێ.

- ***پرۆفیسۆر نادر نادرۆف***

*نادر کەرەم یان پرۆفسۆر نادر نادرۆف یەکێك لە بەناوبانگترین پسپۆڕانی نەوت و شیمی لە سەرانسەری دنیایە. نادرۆف سەرۆکی فەخری یەکێتیی کوردەکانی ڕووسیا و ئەندامی ئاسامبلیای نەتەوەیی کازاخە. ناوبراو لەساڵی ۱۹۹۳ وە ئەندامی هەمیشەیی ئاکادیمیای زانیاریی نەتەوەیی کازاخستانە و خاوەنی ئەم خەڵاتانەی خوارەوەیە:*

پێشـاهەنگی فێرکاریـی نەتەوەکانـی کۆمـارە فیدراڵـە سۆسیالیسـتییەکانی سـۆڤیەتی پێشـوو (١٩٦٧)، خەڵاتـی کۆمـاری کازاخسـتان لەسـەردەمی یەکێتـی سـۆڤیەتی پێشـوو لەژێـر نـاوی زانیاریـی و تەکنۆلۆژیـا (١٩٨٠)، وەرگـری خـەڵات لـە بـواری زانیاریـی و تەکنۆلـۆژی خانەنشـینکراوانی کازاخسـتان لـە سـۆڤیەتی پێشـوو (١٩٨٢)، خەڵاتـی داهێنـان لـە یەکێتیـی سـۆڤیەتی پێشـوو (١٩٨٥)، وەرگرتنـی خەڵاتـی کۆمپانیای نەوتی سـۆڤیەتی پێشـوو (١٩٩١)، خەڵاتـی ئەندازیارانـی موحتەشـەمی سـەدەی بیسـتەم (٢٠٠٠)، خەڵاتـی ئەندازیـاری فەخـری کازاخسـتان لـە سـاڵی ٢٠٠١.

ئاغـای نـادرۆف هەروەهـا لـە سـاڵی ١٩٨١ میداڵیـای ئـاڵای سـووری لە یەکێتـی سـۆڤیەتی پێشـوو، سـاڵی ١٩٩٩ شایسـتەی میداڵیـای «کورمێت»ی کازاخسـتان، لـە سـاڵی ٢٠٠٦ میداڵیـای «دۆستیك» و لـە سـاڵی ٢٠٠٣ لـە وڵاتی فەڕانسـە خەڵاتی میداڵیای ئاڵتوونیی یەکێتیی پشـتیوانی لە پیشەسـازی نێونەتەوەیـی لە بواری بەرەوپێشـبردنی پیشەسـازی، میداڵیـای ئاڵتوونی «ئێس پـی ئـای» وەرگـرت و ڕێـز لـە ماندووبوونەکانـی گیـرا. هەمـان دامـەزراوەن، سـاڵی ٢٠٠٤ لەگـەڵ پێدانـی میداڵیـای ناپلئۆن نازنـاوی «مارشـاڵی زانیاری» بـە ناوبـراو دا و بێجگـە لەوانـەش ئاغاینـادرۆف دەیـان خەڵاتـی نەتەوەیـی و نێونەتەوەیـی وەرگرتـووە.

ئاغـای نادرۆف تا ئێسـتا ٩٥٠ بەرهەمی زانسـتی وەك وتـار، ٢٥٠ زانیاریی داهێنەرانـەی «پاتێنـت» و ٣٥ بەرگ کتێبی نووسـیوە. دوو بـەرگ لە کتێبەکانی تایبەتـە بـە ژیـان خـۆی و کوردەکانـی کازاخسـتان. کتێبـی «ئێمـە کوردەکانی کازاخسـتان» چاپـی سـاڵی ٢٠٠٣ی ئەڵماتاتـا، ٥٣٠ لاپەڕەیـە و بـە زمانـی ڕووسـییە. کتێبـی «جیاوازیـی زەمـان» چاپـی ئەڵماتاتـا ٧٠٠ لاپەڕەیـە و بـە زمانـی ڕووسـییە. لە سـاڵی ١٩٩٦ەوە سەرنووسـەری گۆڤاری نـەوت و گازە.

خوێنەری خۆشەویست، ئەوەی لە خوارەوە دەیخوێنیەوە، دەقی چاوپێکەوتنی بەڕێز ساڵح کەوربڕی لە ساڵی ٢٠١٢ لەگەڵ نادر نادرۆف، یەکێك لە زانا ناودارەکانی کورد و بە واتایەك مارشاڵی زانست و زانیاریی و باوکی نەوت و گازە. ئەم چاوپێکەوتنە لەلایەن هادی سۆفی زادە کراوەتە فارسی و منیش وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. ئەگەرچی چاوپێکەوتنەکە هێندێك دوورودرێژە بەڵام لەبەر گرنگیی کەسایەتیی نادرۆف و ئەو بابەتانەی لە چاوپێکەوتنەکەدا باسیان کراوە، بێجگە لە چەند بەشێکی کەم، بە پێویستمان زانی دەقی چاوپێکەوتنەکە بە تەواویی وەرگێرینە سەر زمانی کوردی. چونکە لە ناوئاخنی چاوپێکەوتنەکەدا کۆمەڵێك بابەتی پێوەندیدار بە ژیان و بەسەرهاتی کورد لە کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو ئاوڕیان لێ دراوەتەوە. ئەم وتارە پێشتر لە چەند ماڵپەڕ و ڕۆژنامەی دیکەدا چاپ و بڵاو بۆتەوە.

**پرسیار:** نادر کەرەم (نادرۆف) کێیە؟ لە کام عەشیرەتە؟ باب و باپیری کێن؟

**وەڵام:** ئەمن نادر کەرەم یان بە دەستەواژەیەکی دیکە نادر نادرۆف لە ساڵی ١٩٣٢ی زایینی لە ئاوایی «قیقاچ»ی نەخجەوان چاوم بە ژیان هەڵێناوە.

باپیرم نادر ئەحمەدە. پێیان دەگوت: «حاجی نادر». ناوی ئەویان لەسەر من ناوە. باب و باپیرانمان خەڵکی «وان»ی کوردستانی تورکیان. هەموویان لەوێ هاتوونە دنیا و هەر لەوێش کۆچی دواییان کردووە. لە ساڵی ١٩٢٠ هەتا ١٩٢٥ دەوڵەتی تورکیە کوردەکانی زۆر ئازار دەدا و لە بەندیخانەی دەکردن کە یەکێك لەوان باپیری من بووە. ساڵی ١٩١٨ یان ١٩٢٠ بە وردی نازانم، باپیرم بە پێیان (پیادە) چۆتە حەج و گەڕاوەتەوە. چوون بۆ حەج لەو سەردەمەدا وەك ئێستا ئاسان نەبووە. یان دەبووایە زۆر دەوڵەمەند بووایەی یان دەبووایە بڕوا و ئیمانێکی پتەوت هەبایە یان ئەوەی مرۆڤێکی جوامێر بوایەی. بەم شێوەیەی

بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوە، باپیرم بە مێگەلە مەڕێکەوە چووە بۆ حەج و لەوێ هەموویانی قوربانیی کردووە و بۆتە حاجی و گەڕاوەتەوە (پێدەکەنێ و درێژەی دەدا) لەو سەردەمدا ٦ مانگی پێدەچوو هەتا دەگەیشتنە حەج و دەگەڕانەوە. بەڵام ئێستا بە سێ کاتژمێر دەچن و دوای چەند ڕۆژ دەگەڕێنەوە و دەڵێن بووینە حاجی (ڕووی لە حەسەنی حاجی سلێمانە کە لەلامان دانیشتووە) باپیری ئەم برا خۆشەویستەش لەگەڵ باپیری من بە ٦ مانگ چوونە حەج و گەڕاونەوە. دوای گەڕانەوەی، لە «وان»دا ڕێز و حورمەتێکی زۆریان بۆ باپیرم داناوە.

باوکیشم کەرەم حاجی نادرە کەرەم ئاغاشی پێدەڵێن ئێمە لە تایفەی «بیشکا» سەر بە عەشیرەتی «بروکی»ین. (یەکێك لە گەورەترین عەشیرەتە کوردەکانی تورکیا). دایکیشم لە عەشیرەتی «شاولیکی»یە. باوکم لە تافی لاوێتیدا بەهۆی زوڵم و ستەمی تورکەکان لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە هاونیشتیمانییەکانی لە چۆمی ئاراس دەپەڕنەوە و دەگەنە نەخجەوان کە ئێستا بەشێکە لە کۆماری ئازەربایجان. دیارە ئەوکات بەشێك لە سۆڤیەت بوو. لەوێ گوندێك ئاوەدان دەکەنەوە و ناوی دەنێن «قیقاچ». لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا هەر کەسێك لەبەر زوڵمی تورکەکان ڕا دەکات، دەچێتە ئەوێ. بەم شێوەیە کۆمەڵێك لە کوردەکان لەوێ ئاواییەك بۆ خۆیان دروست دەکەن و نیشتەجێ دەبن. ئەمە قسەی ساڵەکانی ١٩٢٥ ـ ١٩٢٦ ـە.

**پرسیار:** واتە دوای شکستی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران؟

**وەڵام:** ڕاستە، دوای شکست شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران. زۆر لە عەشیرەت و تایفە کوردەکان بەهۆ تێکشکانی شۆڕشی شێخ سەعید و ئەم شەڕە نابەرامبەرە دەربەدەر بوون. ئەمن لە سەرما و سەخڵەتیی ساڵی ١٩٣٢ لەدایك بووم. لە ساڵی ١٩٣٦ باوکم کۆچی دوایی کرد. گۆڕەکەی لە گوندی قیقاچە. دوای مردنی باوکم تەمەنم ٥ ساڵ بوو، لەگەڵ دایکم و ٩ کەسی دیکە لە ئەندامانی

بنەماڵەکەم لە ساڵی ١٩٣٧ دوور خراینەوە و لە گوندی «قیقاچ»ەوە بۆ کازاخستان گوێزراینەوە.

**پرسیار:** ڕاگواستنی ساڵی هەزار و نۆسەد و سی و حەوتت لەبیر ماوە؟ دەکرێ کەمێك لەسەر ئەو سەردەمە ناخۆش و کارەساتبارە بدوێی؟

**وەڵام:** ڕاگواستن بە سێ قۆناغ ئەنجام دراوە بە واتایەکی تر لەوێ سێ گرووپ لە کوردەکان بوونیان هەیە: بەشێکیان لە ساڵی ١٩٣٧ لە ئەرمەنستان و ئازەربایجان بۆ ئێرە (کازاخستان) ڕاگوێزراون، کە ئێمە بووین. گرووپێکیان لە ساڵی ١٩٤٤ هێنراونە ئێرە کە لە کوردەکانی گورجستانن و دراوسێکەمان عەزیز زیا بەدرخان لەو گرووپەیە. بەشێکی دیکەیان لە ساڵی ١٩٩٠ دوای شەڕی قەرەباغ لەنێوان ئازەربایجان و ئەرمەنستان هاتوونەتە ئێرە. کنیاز ئیبراهیم لە کوردەکانی قەرەباغە و لەگەڵ ئەم تاقمە بۆ ئێرە هاتووە.

ڕۆژانی ڕاگواستن زۆر ناخۆش و خەفەتهێنەر بوون. بە وتەی کوردەکان لەو ڕۆژانەدا دایك منداڵی خۆی جێدەهێشت و دەڕۆیی! پەندێکی پێشینیانی کوردی هەیە کە دەڵێ: «ئێمە دوو جار لە نیشتمان دەرکراوین». نزیکەی دوو مانگ بە سەرلێشێواوی لە ڕێگەداماینەوە. زۆر لە خزم و ناسیاوانمان لەنێو واگۆنی شەمەندەفەرەکاندا لە بەر زەختی سەرما و برسیەتی مردن. دۆخێکی مەترسیدار بوو کە باسکردنی ئاسان نیە.

**پرسیار:** دەکرێ پێمان بڵێی هۆکاری ئەم ڕاگواستنە چ بوو و ئایا پێیان دەگوت هۆکاری ئەم دوورخستنەوەیە چ بوو؟

**وەڵام:** نەخێر. هیچیان بە ئێمە نەگووت. تەنیا گوتیان کەلوپەلەکانتان کۆ بکەنەوە. مەڕ و ماڵاتەکانتان بفرۆشن و لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا دەبێ ئامادە بن و دەتانبەینە شوێنێکی دیکە.

**پرسیار:** دەتانزانی بۆ کوێ دەگوێزرێنەوە؟

**وەڵام:** ئێمـە هەرگیـز نەماندەزانـی بـۆ کـوێ و بۆچـی تەبعیـد دەکرێیـن. لەبیرمە کـە لەلایـەن سـۆڤیەتی پێشـوو هاتـن و ئێمەیـان لـە ئۆتۆمبێلـە کۆنەکانـی تایبـەت بـە ڕاگواسـتنی مەڕومـاڵات سـوار کـرد و بـەرەو وێسـتگەکانی شـەمەندەفەریان بردیـن. ئـەم بەسـەرهاتە لـە کۆتایـی پاییـزی سـاڵی ١٩٣٧ ڕووی دا. هـەر چـوار بنەماڵەیـان خسـتەناو واگۆنێکـی شـەمەندەفەر و هـەر بنەماڵەیەکیـش لـە گۆشـەیەکی واگۆنەکـە. دوای دوو مانـگ ئێمەیـان هێنایـە ئێرە. واتە شـاری تاراس کـە پێشـتر «میرزویان»یان پێدەگـوت و ئێمەیان لێـرە دابەزاند و سـواری عارەبانەی ئاژەڵانیانیـان کردیـن. سـەرماوەز بـوو. بەفـر تـا ئەژنـۆ باریبـوو. سـەرما و سـۆڵەیەك کـە دایـك منداڵـی خـۆی بەجێدەهێشـت. ئێمەیـان لـە ١٥٠ کیلۆمەتری تـاراس لە بیابانێکـی بەڕەهوتـدا بەرەڵـلا کـرد و گوتیـان دەبـێ ئێـوە لێـرە ژیـان بەسـەر بـەرن. بنەماڵـەی کـوردەکان ڕەشـماڵیان لەگـەڵ خۆیان هێنابـوو و لەوێ هەڵیانـدان و هەتا بەهـار لـەو ڕەشـماڵانەدا مانـەوە. گوتیـان خانووتان بۆ دروسـت دەکەیـن. کەبەهار هـات، عەرزیـان پێداین و دەسـتیان بە دروسـتکردنی خانووی بە قوڕ و خشـتە کرد.

بـاش لەبیرمـە سـاڵی ١٩٣٨ پۆلیـس و ك.گ.ب هاتـن و دەیانپرسـی کـە سەرپەرشـتیی خێزانەکـە کێیـە؟ براگەورەکـەم، عەبدوڵـلا، کـە تازە ژیانی هاوبەشـی پێکهێنابـوو و لەویـش گەورەتـر، خوشـکم، کـە ئەویـش شـووی کردبـوو و لـە خێوەتەکـەی تەنیشـت ئێمـە دەژیـان و دوو کـوڕی هەبـوون. عەوڵای برام هەڵسـتا و گوتـی ئەمـن سەرپەرشـتی ماڵـم. پێیان گـوت کـە بەدوامانـدا وەرە! زاواکەشـمان چـوو. لـەو شـەوەدا سەرپەرسـتی هەمـوو ماڵەکانیـان لەگـەڵ خۆیـان بـرد. تەنیا ئەو پیاوانـە نەبـێ کـە ئـەو شـەوە چووبوونـە ئـاش (ئاسـیاو) یـان چووبوونـە ئاودێـری زەوییـەکان. ئـەوان ڕزگاریـان بـوو. ئـەو کەسـانەیان بـردە چیمکەنـت. دوو ڕۆژ لـەوێ مانـەوە و ئیـتر ئاگامـان لێیـان نەمـا. ئیـتر ئێمە هـچ هەواڵێکـمان نەزانیـن و تا ئـەو کاتـەی کە گەورەش بـووم و دواتـر بوومە پرۆفیسـۆریش، زۆرجار وەشـوێنیان

کەوتم. هەمیشە دەمگوت: براکەم لەکوێیە؟ خوشکەزاکەم هەمیشە پرسیاری سەبارەت بە باوکی دەکرد. لە شەوێکدا ٤٠ پیاوی کوردیان لەگەڵ خۆیان برد. براکەم، زاواکەم، ئەوانی دیکەش کورەمام و کەسوکارمان بوون!!

یەکێك لە براکانم بەناوی ئەنوەر کەرەم نادر کە مامۆستایەکی پێگەیشتوو و ناسراوە، شێعری دەهۆنییەوە. یەکێك لە شێعرەکانی بەناوی ٤٠ پیاو بوو. ئەو ٩ـ ١٠ ساڵ لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد.

سەرەنجام لە ساڵی ١٩٩٣ دوای سەربەخۆیی کازاخستان لە سۆڤیەتی پێشوو، سەرۆك کۆماری کازاخستان نورسوڵتان نەزەربایوف ڕایگەیاند ئەو کوردانەی لە ساڵانی ١٩٣٧، ١٩٤٤ و ١٩٥٠ ڕاگوێزراون، لێبوردنیان بۆ دەربچێ. دوای ئەم عافووکردنە ئەمن دووبارە داوام کرد کە چ بەڵایەك بەسەر براکەمدا هاتووە؟ ك.گ.ب یان بانگهێشت کرد و بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکانی پێوەندیدار بە قوربانیانیان هێنا کە لە بینای ك.گ.ب لە شاری تاراس بوون، تا ئەوکات هیچ کەس دەستی پێیان ڕانەگەیشتبوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٣ بەدواوە دەرفەتی تاوتوێکردنی دۆسیەی قوربانییەکان ڕەخسا.

بەپێی ئەو بەڵگە ئاشکراکراوانە دوو پرسیاریان لە براکەم کردبوو، یەکەم: ئایا تۆ سیخوڕی تورکیای؟ ئایا تۆ دژی دروستکردنی کۆڵخۆز و سۆفخۆزی؟ واتە دروستکردنی شار و گوند. لە سیستەمی کۆمۆنیستیدا ئەم دوو بابەتە زۆر گرنگ بوون. براکەیشم ئەم دوو تۆمەتانەی ڕەت کردبۆوە. ئەو نووسین و خوێندنەوەی نەدەزانی و ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ك.گ.ب بە دڵی خۆی بەڵگەی دروست کردبوو. ئەو ٢٥ ـ ٢٦ ساڵی تەمەن بوو. دوای دوو ڕۆژ دانپێدانانێکی تەزویریان دروست کردبوو کە گۆیا ئەوان تۆمەتەکانیان قبووڵ کردووە و گوتوویانە ئێمە سیخوڕیی بۆ تورکیا دەکەین و دژی دروستکردنی کۆڵخۆز و سۆفخۆزین. ئەمن ئەو بەڵگە ساختانەم بینین. دوای ئەم بەڵگە دروستکردنە

درۆیینە ئەو ٤٠ پیاوەیان بردووە و گوولەبارانیان کردوون و کوشتوویانن. لە ساڵی ١٩٣٨ دوای بردنی ئەو ٤٠ کەسە و پاش سێ ڕۆژ ئەشکەنجە و ئازار و بەزۆر دانپێدانان و دروستکردنی بەڵگەی بەدرۆ و ساختە، هەموویان بردوون و کوشتوویانن و لە دەوروبەری چیمکەنت شاردوویانەوە کە لەوێ بێجگە لە کوردەکان، خەڵکی سەر بە نەتەوەکانی تریشیان لە خاکدا شاردبۆوە، ئێستا ئەم شوێنە بۆتە زیارەتگە.

**پرسیار:** لەژێر ئەو بەڵگانە ناوی چ کەسێك هەبوو؟

**وەڵام:** دیارە ناوی حکوومەت هەبوو. بێجگە لە حکوومەت دەبوایە ناوی کێ هەبێ؟

**پرسیار:** مەبەستم ناوی کەسێکی تایبەتە کە بۆتە هۆی کوژرانی ئەو ٤٠ کەسە.

**وەڵام:** ناوی فەرماندارەکەم لەبیر نیە. تەنانەت کۆپیی ئەو بەڵگانەشیان پێنەداین. تەنیا نیشانیان داین و ئێمە هاتینەوە!

**پرسیار:** ئایا دەوڵەت لەم بارەیەوە داوای لێبوردنی لە ئێوە کرد؟

**وەڵام:** بەڵێ، داوای لێبوردنیان لێ کردین و ئێمەشیان بەخشی (بە تاوانی کامە تاوانی نەکردوو)... بەڵام لەڕاستیدا ئەمن بیرم دەکردەوە کە دەوڵەت زۆر لەوە پێشتر ئێمەی بەخشیوە بەڵام وا نەبوو. بەڵکو لە ساڵی ١٩٩٣ەوە لە ئێمە خۆش بوون.

**پرسیار:** ئێمە بیستوومانە کە دەوڵەت لە قۆناغی خوێندندا زەخت و فشارێکی زۆری خستۆتە سەر ئێوە، ئایا ئەمە ڕاستە؟

وەڵام: بەڵێ ڕاستە. گوێ بگرە با بۆت باس بکەم. ساڵی ١٩٥٦ ئەمن مافی ئەوەم نەبوو کە لە ئاوایی خۆمان بچمەدەر و بچمە گوندێکی دیکە. ڕاستە ئێمە لە گرتووخانەدا نەبووین، لەڕاستیدا زیندانیی بووین. پێشتر بە گوندەکەی ئێمەیان دەگووت «بودیوەند» دواتر «ئارستاند» و ئێستا نێوی «قاشقابولاغ»ـە. ئەمن لە

ساڵی ١٩٤٨ خوێندنی سەرەتایی زمانی کازاخیم تەواو کرد و دەمەویست بچمە زانکۆ، بەڵام ڕێگەی چوونەدەر لە ئاواییم نەبوو. ئەوکات هێشتا ستالین لەسەر حوکم بوو. نامەیەکم بۆ ستالین نووسی و پرسیم تاوانی ئێمە چیە؟ ئێمەتان ڕاگواستووە بێ ئەوەی هۆکارەکەمان پێبڵێن. ئێستا بۆ ڕێگە نادەن بخوێنین؟

**پرسیار:** وەڵامیان دانەوە؟

**وەڵام:** بەڵێ وەڵامیان دایەوە. گوتیان مافی خوێندنتان هەیە بەڵام لە پایتەختەکان نا! زانکۆکانیش تەنیا لە پایتەختەکان هەبوون. وەك ئێستا نەبوو کە لە هەر شارێك زانکۆیەك هەیە. لە شاری قزڵ ئۆردو ئەنیستیتۆیەکی پەروەردەی مامۆستایان هەبوو. بێجگە لەو، بژاردەیەکی دیکەم لەبەردەم نەبوو. لە قزڵ ئۆردو کە ئەوکات پایتەختی کازاخستان بوو، دەستم بە خوێندن کرد. دواتر شارێکی ڕووس نشین بە ناوی ئیرینبورگ بوو بە پایتەخت کە لە کولتوور و شوێنی کازاخەکان زۆر دوور بوو. قزڵ ئۆردوش لە نزیکیەکانی سیبریا بوو. لە ساڵی ١٩٢٩بەدواوە ئەڵماتاتا وەك پایتەخت دیاری کرا. لە قزڵ ئۆردوش زانکۆ کرایەوە.

**پرسیار:** بۆ دەرس خوێندن لە قزڵ ئۆردو وەرگیران؟

**وەڵام:** بەڵێ وەرگیرام. بەڵام چ وەرگیرانێك؟ بەو ئاسانییە نەبوو. ساڵێك وەدوایە کەوتم و لە ساڵی ١٩٤٩ هەواڵیان نارد کە وەرگیراوم و دەتوانم لە تاقیکردنەوەدا بەشدار بم. ئێستا ئیزنی چوونەدەرم نەهاتبۆوە، بەڵگەکانی خۆیم دایەدەست پۆلیسی ئاوایی. دەبووایە ئەوان فەرمانی چوونەدەرم دەربکەن بۆ ئەوەی بچمە قزڵ ئۆردو. نامەکە گەیشتە ناحیە و لەوێوە بۆ ئەڵماتاتا و لەوێشەوە بۆ موسکۆ نێردرا. سەرەنجام مۆسکۆ ئیزنی دا و هەتا کاتی گەیشتنی هەواڵەکەی لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٩ نزیك بووینەوە و کاتی تاقیکردنەوەکان گەیشت. نەمدەزانی چ بکەم؟ براکانم واتە ئەنوەر، سەعدی و قادر گوتیان بڕۆ بۆ شار، خەبەرێك بزانە و لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئەنیستیتۆ باسی بکە، لانیکەم

شار دەبینی. منیش جانتاکەم دەست دایە و وەڕێ کەوتم و حەوتوویەك دوای تاقیکردنەوەکان گەیشتمە ئەوێ.

ڕاستەوخۆ چوومەلای سکرتێری ئەنیستیتۆ و سەیری بەڵگەکانمی کرد. گوتم بۆ بەشدارییی لە تاقیکردنەوەکاندا هاتووم. سەری هەڵێنا و پێم پێکەنی و گوتی بەڕاستی عەقڵت لە سەری دایە؟ کاتی تاقیکردنەوە بەسەر چووە، تۆ بۆچی هاتوویە ئێرە؟ ئەمن شەرمم دەکرد باسی ژیانی خۆمی بۆ بکەم. لێی بێهیوا بووم و چوومە لای یەکێکی دیکە. ئەویش پێم پێکەنی. چوومە لای بەڕێوەبەری ئەنیستیتۆ. گوتیان لێرە نیە و جێگرەکەی لێرەیە. جێگرەکەی پیاوێکی کۆریایی بوو. بۆم باسی باردۆخی خۆم کرد. گوتی ئەمن لە وەزعی تۆ دەگەم. بارودۆخی ئێمەش وەك هی ئێوە بووە، ئێمەش لە ساڵی ١٩٣٧ بە زۆر ڕاگوێزراوین. ئەمن ڕێگەت پێدەدەم. ئەو مرۆڤە جوامێرە زۆری هاوکاری کردم کە وەها یارمەتیدانێك لە سەردەمی ستالیندا ئاسان نەبوو، بەڵام ئەو کردی.

**پرسیار:** ناوی ئەوتان لەبیر ماوە؟

**وەڵام:** هەڵبەت کە لەبیری ناکەم. ناوبانگەکەی «لی»بوو. هەرگیز لەیادی ناکەم. ئیزنی پێدام بەڵام گوتی ناونیشانی مامۆستاکانت پێدەدەم و دەبێ یەك بە یەك بیاندۆزینەوە و پێیان بڵێی مودیر کاری پێتانە. ئەگەر هاتن ئەمن حاڵ و وەزعی تۆیان بۆ باس دەکەم. نە ئوتومبێل هەبوو، نە پاسێك، بە پێیان گەڕەك بە گەڕەك مامۆستاکانم دەدۆزینەوە و ئاگادارم دەکردنەوە کە بێنە قوتابخانە. هەموویان هاتن و ئیمتحانیان لێ وەرگرتمەوە و دەرچووم. چوار ساڵ لە قزڵ ئۆردو مامەوە بێئەوەیکە ئیزنی چوونەدەر لە شارم هەبێ. دوای تەواوکردنی خوێندن ناردیانمە شاری «چولاکتوی». «چولاگتوی» شارێکی بچووك لە نزیك «قاشقابلاغ»بوو کە ئێستا ناوەکەی بۆ «کاراتاو» گۆڕدراوە. ساڵی ١٩٥٣ لەوێ لە ڕشتەی شیمی (بەشی کیمیا) بوومە مامۆستا. لەوێش مافی ئەوەم نەبوو لە

شـار وەدەرکـەوم. بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ لـەو شـارە مامۆسـتا بـووم و لـەو ماوەیـەدا قەرزەکانـی حکوومەتـم دانـەوە.

لـە سـاڵی ۱۹۵٦ سـەرۆکی دەوڵەتـی سـۆڤیەت ئاغـای خرۆشـچۆف بـوو. ئـەو بڕیـاری دا هەمـوو مامۆسـتاکان لـە یاسـای ڕێگرتـن لـە هاتوچـۆ ئـازاد بـن. ناوبراو سـەبارەت بەمـە ڕەخنـەی لـە سـتالین گـرت و گوتـی دروسـت نیـە لەکاتێکـدا مامۆسـتاکان منداڵانی ئـەم وڵاتە پـەروەردە دەکەن، ئیزنی سـەفەرکردن لە گوندێك بـۆ گوندێکـی دیکەیـان نەبێـت. بەم شـێوەیە ڕەوشـی خراپـی مامۆسـتایان کۆتایی پێهـات. پێشـتر لـە پاسـپۆرتەکەشـدا هاتبـوو کـە خاوەنـی ئەمە مافـی چوونـەدەر لە ناوچەی خۆی نیە. دوای ئەو یاسـایە، پاسـپۆرتی نوێم وەرگرت و سـەرم لە مۆسـکۆ هێنایەدەر.

دیـارە دەبـێ بڵێـم سـەرەتا چوومـە ئەڵماناتـا و داوای کارم کـرد. بـەڵام گوتیـان تەنیـا کازاخـەکان دادەمەزرێنـن، چوومە بیشـکەك لە قرغیزسـتان، لەوێـش گوتیان قرقیـزی بـۆوان پێویسـتە. گوتـم نـە کازاخـم و نـە قرقیـز، دەبـێ چ بکەم. بـە کورتی بـەرەو موسـکۆ چووم.

سـاڵی ۱۹۵٦ لـە موسـکۆ بـۆ درێژەدانـی خوێنـدن لـە ئاسـتی بـاڵای زانکـۆدا ناونوسـییم کرد. خـۆم بە بەختەوەر دەزانی کـە وەك کوردێك بـۆ وەرگرتنی دوکتۆرا بەشـداریی دەکـەم. دەمگـوت تـۆ بڵێـی کوردێکـی دیکـە دوکتـۆرای لـە مۆسـکۆ وەرگرتبـێ؟ دەبێ بڵێـم یەکـەم کـورد لـە خوێندنی بـاڵای مۆسـکۆدا، ئەمـن بووم.

دواتـر لـە مۆسـکۆ بـەدوای هاوڕێـی کـورددا دەگـەڕام. کتێبخانەی لینیـن لەوێ بـوو کە سـەرم لێهەڵدێنا. لە ڕووسـیا هەرکـەس بیهەوێ زانیاریی لـە ڕێگەی کتێبەوە بەدەسـت بێنـێ، لە کتێبخانـەکان دەتوانێ ئـەو کتێبانە وەربگری. بەڵام سـەبارەت بە کـوردەکان زیاتـر لـە ۱۵ کتێـب بـە زمانی کـوردی نەبوو.

**پرسیار:** ئایا ناونیشانی کتێبەکانت لەبیر ماوە؟

**وەڵام:** کتێبەکان هەموویان لەلایەن نووسەرانی کوردی سۆڤیەتی پێشوو نووسرابوون. نووسەرانێکی وەك حاجی جوندی، قەنات کوردۆ، جاسم جەلیل. قسەم لەگەڵ یەکێك لە کارمەندانی کتێبخانەکە کرد و باسی ئەو کوردانەم لێ پرسی کە هاتوچۆی کتێبخانەیان دەکرد. گوتی: هێندێك جار کوردەکانی ئەرمەنستان و گورجستان دێنە ئێرە. گوتم دەمەوێ زانیاریم سەبارەت بەو کەسانە هەبێ کە لە مۆسکۆ دەژین. گوتی لە مۆسکۆ تەنیا کوردێك دەناسم کە هێندێکجار دێتە ئێرە. ناوی کەسەکەم لێ پرسی. گوتی ناوی کولوس شەرۆ بە. ئەو نەیدەزانی کوردی کام ناوچەی کوردستانە بەڵام دەیزانی لە مۆسکۆ دەژی. داوام لێکرد لە کاتی هاتنی بۆ کتێبخانە ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنی ئەو کەسەم بۆ بنووسێ و بمداتێ. دوای ١٥ ڕۆژان سەرلەنوێ چوومە کتێبخانە و ژمارە تەلەفۆنی کولۆسی یادداشت کردبوو و پێی دام. تەلەفۆنم بۆ کرد و بە زمانی ڕووسیی قسەم لەگەڵ کرد.

گوتی: تۆ کوردی؟ گوتم: بەڵێ کوردم و لە کازاخستانەوە هاتووم، لێرە دەرس دەخوێنم. گوتی: دەتوانی بە کوردی قسە بکەی؟ گوتم: بێگومان دەتوانم بە کوردی قسە بکەم. گوتی: پێم خۆشە بە کوردی یەکتر بدوێنین بۆ ئەوەی بۆ یەکەم جار دەنگی کوردی لە هاند(گوشی)ی تەلەفۆنی ڕووسیادا دەنگی بێ.

هاوڕێیەتیەکەمان دەستی پێکرد. ئەو لە کوردەکانی گورجستان بوو. محامی (وەکیل)ی دادگا بوو. ئەگەر بە هەڵە نەچووبم ماوەیەکیش لە وەزارەتی دەرەوە کاری کردبوو. چەند ساڵێك لە من گەورەتر بوو. ڕۆژێك پێی گوتم کوردێك دەناسم کە لە کوردەکانی ئێراقە و ناوی مستەفا بارزانییە. ئەمە ساڵی ١٩٥٧ بوو.

بە کۆلۆسم گوت پێم خۆشە بیبینم و قسەی لەگەڵ بکەم. کولۆس پێی باش بوو. لەو سەردەمدا ئەمن ناو و گەورەیی مستەفا بارزانیم بەرگوێ کەوتبوو. ڕۆژێك لە شوێنێك دانیشتبووین و لەگەڵ کۆلۆس پێکەوە خەریکی مەشرووب

خواردنـەوە بوویـن. زەنگـی تەلەفۆنەکـەی لێـدرا و بەڕێـز مسـتەفا بارزانـی بـوو. لـە کاتـی قسـەکردنی کولۆسـدا بـۆم دەرکـەوت کـە کەسـایەتیەکی گـەورەیـە. چونکـە کولـۆس زۆر بـە ڕێـز و حورمەتـەوە قسـەی لەگـەڵ دەکـرد. دواتـر قسـەی لەگـەڵ منیـش کـرد و لـە حـاڵ و وەزعـی منی پرسـی. منیش وەڵامـم دایـەوە. دوای تەواوبوونـی پێوەندیـە تەلەفۆنییەکـە کولـۆس گوتی: ئەگـەر حەز دەکـەی با بچینە لای. گوتـم کولـۆس ئێمـە ئارەقـمان خواردۆتـەوە، شـەرمە، قەرارمـان بـۆ ڕۆژێکی دیکـە دانـا. ژمـارە تەلەفۆنەکـەی ئـەوم لـە کۆلـۆس وەرگـرت و چەنـد ڕۆژ دواتـر تەلەفۆنـم بۆ کرد و چوومە سـەردانی. لـە ئاپارتمانێك دەژیا. زۆری پرسـیار لێکردم. منیـش وڵامـی هەموو پرسـیارەکانم دایەوە. لە کوێـوە هاتووم، کـوردی کام ناوچەم، ئێسـتا چ کارەم، بـە کورتـی باسـی ژیانـی خۆمـم بـۆ کـرد. ئەویش باسـی خـۆی بۆ کـردم. گوتـی: ئێمە بۆ ڕزگاریـی نەتەوەی کورد خەبـات دەکەین، کـوردی ئێراقم، لـە سـاڵی ۱۹٤٦ بوومـە پەنابـەر لێـرە. سـەرەتا لـە تاشـکەندی ئۆزبەکسـتان بوویـن، ئێسـتا ژمارەیەکـمان بۆ مۆسـکۆ ڕاگوێزراون و لێـرە خەریکی خوێندنـن. بە کورتی قسـەمان لەگـەڵ یەکـتر کـرد و دواتریـش ئیزنـی ڕۆیشـتنم لێ وەرگـرت...

•••

**پرسیار: ئەگەر دەکرێ سەبارەت بە دوکتۆراکەتان قسەمان بۆ بکە؟**

**وەڵام:** بەڵـێ، ئەمـن سـاڵی ۱۹۵۹ خوێندنـم لـە مۆسـکۆ تـەواو کـرد. دەوڵـەت منـی بـۆ «خاباروسـکا» نـارد. یەکێـك لـە شـارەکانی ڕووسـیا لـە نزیـك سـنووری ژاپـۆن، لـە نزیـك «ولادیوستوك»ـە. لـەوێ لـە بـواری شـیمی خەریکـی چالاکـی بـووم. لـە مۆسـکۆوە بـۆ ئـەوێ حـەوت شـەو و ڕۆژ بە قەتـار دەبـوو ڕۆیشـتبای. بە ناچاری سـێ سـاڵ لەوێ بووم. هەر لەو شـارەش توانیم پلەی پرۆفسـۆری بەدەست بێنـم. ئـەوکات لە ڕووسـیا پلەی دوکتـۆرا بەس نەبوو و پرۆفیسـۆری باشـتر بوو. بەم پلەیـە لـە خوێنـدن لـە هـەر شـوێنێك بمویسـتایە، دەمتوانـی کار پەیـدا بکـەم یـان

پێشنیاری کارم پێیدەن. لە کاری شیمیدا پسپۆڕی زۆر نەبوون. گوتیان دەبێ تۆ کادری شیمی پەروەردە بکەی. ئەمن ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستیش بووم. بەڵام هیچکات حیزب گرنگیەکی ئەوتۆی پێنەدام. حیزبیش وەك زیندان بوو (بەپێکەنینەوە)، زیندانی حیزب. ئەگەر هەر کارێك کە دەیانەویست ئەنجامت نەدابا، بە واتای لەدەستدانی پیشەکەت بوو، چونکە ئەگەر بەپێی حەزی وان نەجووڵابایەوە، سەرەتا لە حیزب دەردەکرای و دواتر پیشەکەت لێ دەستێننەوە. دوای سێ ساڵ لەلایەن بەرپرسی حیزبی کۆمۆنیست پەیامم بۆ هات بگەڕێمەوە (چیمکەنت)، کە بەخۆشییەوە زۆربەی خزمەکانم لە چیمکەنتن.

دوای حەوت ساڵ ئاغای کونایف کە بەرپرسی حکومەتی کازاخستان بوو، بانگهێشتی کردم. لە «ئاترایۆ» ناوەندێکی زانستی هەبوو. برای کونایف سەرۆکی ناوەندی ئەکادیمی زانیاری بوو. منیان وەك سەرۆکی ئەو ناوەندە دیاری کرد. ساڵی یەکەم قبووڵم نەکرد. ئەمن بە هۆکارێك پێم خۆش بوو قبووڵی نەکەم بەڵام بڕیارەکە لەلایەن حیزبەوە دەرکرابوو و چارە نەبوو. دەبووایە ئەو ناوەندە یان داخرابایە یان لەژێر بەڕێوەبەرایەتی بەڕێوەبەرێکی نوێ بەڕێوە بچێ. ئەو بەڕێوەبەرەش من بووم. لە ماوەی دوو ساڵدا ئەنیستیتۆکەم لەباری چۆنایەتییەوە گەیاندە پلەیەکی باڵا. لەبەر ئەم کارە دیپلۆمی ئیفتخاری و ئاڵای شەکانەوەیان پێدام. منیش ناوبانگێکی باشم بۆ ئەو ناوەندە پەیدا کرد. دواتر لە ساڵی ١٩٧٧ کونایف بانگی کردم و منی وەك سکرتێری یەکەمی ئاکادیمیای زانیاریی دانا. هاوکات بەرپرسی ئەنیستیتۆی «ئاترایۆ»ش بووم. لەو سەردەمدا من سیمایەکی ئاکادێمیك بووم. هەرچی پلەی باڵای دەوڵەتی هەبوو، هەموویانم وەدەست هێنابوو...

(ساڵی ١٩٨٦ لاوانی کازاخستان شۆڕشیان کرد و لە ئاکامدا کونایف لەسەرکار لادرا و نەزەربایێوف دەسەڵاتی بەدەستەوەگرت و دوابەدوای ئەوەش زۆر لەو کەسانەی کاتی خۆی لایەنگری کونایف بوون لەسەر کار دەرکران. سەرەتا

بەنیاز بوون کە نادرۆفیش دوور بخەنەوە بەڵام بەهۆی لێوەشاویی خۆیەوە نە تەنیا دەرناکرێ و دوور ناخرێتەوە بەڵکو لە ماوەی ١٥ ساڵدا سێ جار میداڵیای شانازی لەدەستی نەزەربایۆف وەردەگرێت...)

**پرسیار:** بیستوومانە «نورسوڵتان نەزەربایۆف» بە باوکی خۆی بانگتان دەکات؟

**وەڵام:** دەڵێ «باوکی من»، «برای گەورەم»، چەند ڕۆژ پێش ئێستا بۆ ڕێوەڕەسمی هەشتا ساڵەم پەیامی ناردبوو. لە زۆر نووسیندا هەم کونایف و هەم نەزەربایۆف باسی منیان کردووە. ڕێزی زۆریان بۆ کوردەکان هەیە. «کونایف» دۆستی بنەماڵەیی ئێمە بوو. دەیتوانی کاتژمێر ١٢ ی نیوەشەو بێتە ماڵەوە. کەسایەتییەکی وەك «کونایف» سێ میداڵیای ئاخرین پلەی باڵای سۆڤیەتی هەبوو. لە تەواوی سۆڤیەتی پێشوودا تەنیا کونایف و بێرژنێف گرنگترین میداڵیاکانی سۆڤیەتیان وەرگرتبوو. کەسی سێهەم نیە.

**پرسیار:** ئەگەر دەکرێ باسی چالاکییەکانی ئێستای خۆتان بکەن؟

**وەڵام:** ئەمن کار لەسەر نەوت و گاز دەکەم. کازاخەکان پێم دەڵێن: باوکی زانستی نەوت. هەروەها بە لومونوسۆف ی کازاخەکانم دەشوبهێنن. لومونوسۆف زانایەکی گەورەی ڕووسەکانە. لە هەموو دنیا ناسراوە. زانکۆی بە ناو کراوە. یەکێك لە بیرمەندانی گەورەی شیمی (کیمیا)یە. هەروەها زانای بواری فیزیا و ئەدەبیات و زمانیشە.

**پرسیار:** کوردستان وڵاتی نەوت و گازە. بیروڕای جەنابت سەبارەت بە وزەی کوردستان چۆنە؟ ئایا هەرگیز بیرتان لەوە کردۆتەوە لە کوردستان کار بکەن؟

**وەڵام:** چۆن نامهەوێ. با بارودۆخەکە کەمێك ڕوون بێتەوە. پێم خۆشە لەوێ لەسەر نەوت، وزەی خۆر و وزەی با کار و خزمەت بکەم...

...ساڵی ٢٠٠٦ چوومە کوردستانی باشوور. سەردانی وەزارەتی نەوتم کرد، وەزیر لەوێ نەبوو، لەگەڵ جێگرەکەی دانیشتم، ڕێککەوتنن واژۆ کرد و

بە خۆشحاڵییەوە گوتیان ئێوە گەورەی ئێمەن و چ بڵێن ئەنجامی دەدەین. لە زانکۆکانی سەلاحەددین و دهۆکیش کۆبوونەوەمان هەبوو. بەڵام تا ئێستا باسی ئەو ڕێککەوتنانەیان نەکردۆتەوە. بارودۆخی ئەوێ شەڕ و سیاسەتە.

ساڵی ٢٠٠٨ جارێکی تر چوومەوە کوردستان. بۆ بەشداریی لە فستیواڵی «جگەرخوێن». کاك مەسعوود بارزانیم دیت. زۆرمان قسە کرد. کەسێکم بە ناوی عەبدولسەلام بینی کە شارەزای بواری نەوت بوو. گوتی دەمانەوێ لە سلێمانیە دامەزراوەی نەوتی دامەزرێنین، یارمەتیمان دەدەی؟ گوتم ئەگەر لە هەر چوار پارچەی کوردستان سەنعەتی نەوت وەری بخەن. ئەمن یارمەتیان دەدەم. خزمەت بە نەتەنەوەکەم ئاواتی منە.

**پرسیار: ٢٤ کاتژمێری نادرۆف چۆن بەسەر دەچێ؟**

وەڵام: ئەمن کار زۆر دەکەم. لەمێژ ساڵە ژیانی من بەم شێوەیە. ئەمن لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا بوومە پرۆفیسۆر. ئەوکات زۆر کەس پێی سەیر بوو. زۆبەی خەڵك لە تەمەنی ٥٠ و ٦٠ ساڵیدا بە پلەی پرۆفسۆری دەگەن. ئەوە بۆ ماوەی چەند ساڵیش لە خوێندن وەدوا کەوتم ئەگینا لەوانەبوو لە تەمەنی ٢٧ ـ ٢٨ ساڵیدا ببمە پرۆفسۆر. لەم بارەوە با قسەیەکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە. هەرکات وەبیرم دێتەوە پێکەنینم دێت. ژنبراکەم پێی دەگوتم: بە تۆ دەڵێن پرۆفسۆر، بەڵام من باوەڕ ناکەم تۆ پرۆفسۆر بی. ئەمن پرۆفسۆرەکانم لە تەلەویزیۆندا دیوە مووی سەریان سپی بووە و زگیان زلە، بەڵام تۆ چۆن بوویە پرۆفسۆر، نازانم؟! هەمیشە پێکەنینم بەم قسەیە دێ. پرۆفسۆربوون ئاکامی جیددی بوونی من لە کار دایە. دیارە بە تێپەڕینی زەمەن سلامەتی خۆمم لەدەست داوە. ئێستا بەو دەرەنجامە گەیشتووم سلامەتی لە کار گرینگترە. ئەگەر تەندرووستیی مرۆڤ باش نەبێ، ناتوانێ کار بکا.

ئەمن هەموو ڕۆژێك کاتژمێر حەوت لە خەو هەڵدەستم. هەتا هەشت و

نیو خەریکی حەمام کردن و نان خواردن دەبم و دەچمە شوێنی کار. تا ئێوارە لەم نووسینگەیەدا کار دەکەم. دەخوێنمەوە، چاوپێکەوتن دەکەم، دەنووسم، ئێوارانیش خەریکی پیاسەکردن و هاتوچۆ دەبم بۆ ئەوەی بتوانم لەسەرپێ بمێنمەوە. هەموو شەوێکیش سەعات ١٢ دەخەوم.

دەزانی جیاوازیی نێوان مرۆڤی زانا و مرۆڤی ئاسایی چیە؟ مرۆڤی زانا کەسێکە لە کاتی خەویشدا مێشکی چالاکە، لەڕێگەشدا هەروایە. کاتێك لە «خاباروسکی» بووم، هێندێك جار دەچووینە سینەما، ئەوکات تەلەویزیۆن کەم بوون. لە فیلمەکەدا شتی پێکەنیناوی هەبوو کە هەموویان پێدەکەنین. حەلیمەی هاوسەرم لە تەنیشتمەوە بوو، ناڕەحەت دەبوو، دەیگوت هەمووان پێدەکەنن بەڵام تۆ بۆ پێناکەنی؟ نەك ئەوەی من پێنەکەنم، بەڵام لەو کاتەدا بیرم لەلای کارەکەم بوو. کاری شیمی ئاوایە. شەو و ڕۆژ فکرەی نوێم بە مێشکدا دێ و دەبێ ڕایانگرم. ئەمە بابەتێکی خراپ نیە. ئەمن مێژووشم خوێندۆتەوە، ئەوانەی مێشکیان زۆر چالاکە، تەمەنی زیاتر دەکەن.

**پرسیار:** مامە نادر لەسەر ئیزنی ئێوە باسی چۆنیەتی یەکتر ناسینی تۆ و حەلیمەخانم بکەین. چۆن یەکترتان ناسی؟ ئایا پێوەندیی خۆشەویستیتان لەنێودا بوو یان بەپێی نەریتی بنەماڵەیی هاوسەرگیریتان کرد.؟ هەروەها بۆم باسی منداڵەکانیشتان بکەن؟

**وەڵام:** دایکم و خزمەکانم هەمیشە پێیان دەگوتم هەرکات ویستت ژن بێنی دەبێ هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی کورد بکەی. منیش دەمگوت پێم خۆشە لەگەڵ کیژێکی کورد هاوسەرگیری بکەم بەڵام دەبێ کەمێك خوێندەواریی هەبێ. کچە کوردی وا کە ئەوکات خوێندنی باڵای خوێندبێ، زۆر کەم بوون. کاتێك لە «خاباروسکی» مامۆستا بووم، جارێك چوومە بیشکەك. خاڵم کە ناوی مەلا هەمزە بوو، مرۆڤێکی خۆش تەبع و خوێندەوار بوو... ئەوکات دایکم زۆر

لەسەرحاڵ بوو. پێی گوتم لە بیشکەك سەردانی خاڵت بکە. ئەمنیش بەڵێنم پێدا و چووم. خاڵم گوتی بۆ تا ئێستا هاوسەرگیریت نەکردووە؟ ئەودەم تەمەنم ۲۹ ساڵ بوو. گوتم دایکم پێی خۆشە لەگەڵ کچێکی کورد هاوسەرگیری بکەم و کچی خوێندەواریش دەست ناکەوێ، چ بکەم؟ بۆ نموونە ئایا لە گوندی ئێوە کچێکی خوێندەوار پەیدا دەبێ؟ گوتی: ئا، کچێکی کورد لە گوندی ئێمە هەیە لە زانکۆی جەلال ئاباد خەریکی وەرگرتنی دوکتۆرایە، ئەگەر پێت خۆشە با بچینە ماڵیان. کچەکەیان نیشان دام و یەکترمان بەدڵ بوو و لە ماوەی ساڵێکدا هاوسەرگیرمان کرد. دایکی لە عەشیرەتی بروکی و باوکی لە عەشیرەتی جەلالییە. ئەوانیش لە کوردە دوورخراوەکانی ئەرمەنستانن کە بۆ قرغیزستان ڕاگوێزراون.

ساڵی ڕابردوو جەژنی ۵۰ ساڵەی هاوسەرگیریمان بوو. ۳ کوڕ، ۳ بووك و ۷ نەوەم هەیە. هەمویان خوێندنی باڵایان تەواو کردووە. کوڕە گەورەکەم «باری» دوکتۆری مێشکە. هاوسەرەکەشی «نارینا» جێگری سەرۆکی بانکە. یەکەمین کچە کوردە لە بواری بانکداری لە ئاستی باڵادا خوێندوویەتی. ئەوان سێ منداڵیان هەیە. کوڕەکەیان دەرچوونی زانکۆی لومونوسۆفە. ئەو سێیەمین کەسی کازاخستانە کە دەوڵەت ناردوویەتی بۆ لەندەن. دەبێ تا چوار ساڵان لەوێ کار بکات و بگەڕێتەوە. کچەکەیان واتە نەوەی دووهەمم ساڵی ڕابردوو زانکۆی ئەمریکی لە دوبەی تەواو کردووە. ئەمساڵ هاوسەرگیری کردووە و مێردەکەی لە کوردەکانی ئەرمەنستانە. ئێستا لە شاری نیکۆلایفی ئۆکراینا دەژین. نەوەکەی ترم تەمەنی ۷ ساڵە.

کوڕی دووەمم ناوی «عارف»ـە. کوڕێك و دوو کچی هەیە. منداڵەکانی خەریکی خوێندنن. سێیەمین کوڕیشم لەگەڵ ئێمە دەژی. ناوی «دیمیتری»یە بە دما بانگی دەکەین. کوڕی دما ناوی «عەبداڵ»ـە. ئەمن پێی دەڵێم «عەبداڵ

خان». کاری من لە ماڵێ زیاتر یاریکردن لەگەڵ عەبداڵە. زۆرم خۆش دەوێ. هاوڕێمە. لە کوڕی دووەم دوو نەوەم هەیە کە ناویان دیلان و ژیانا یە. بنەماڵەکەمان زۆر تێکەڵاوین. زۆربەی کاتەکان پێکەوین، خوا لێیان ڕازی بێ.

هەروەك ئاماژەم پێکرد حەلیمەخانم دەرچووی زانکۆیە و خوێندنی باڵای لە بواری دوکتۆرای زانیارییدا تەواو کردووە. شێعری جوان دەنووسێ. مامۆستای زمانی کوردییە. کاتێك زوڵم لە کوردان دەکرێ، شێعری غەمگین دەهۆنێتەوە. جاری وابووە بە شێعرەکانی گریاوم و فرمێسك لە چاوانم باریوە. لەبارەی ئازایەتی و نیشتمانپەروەری کوردەکان دەنووسێ. ئێستا خانەنشین کراوە و لەگەڵ نەوەکانی خەریکە. ژنێکی زانایە و لە هەر دەرفەتێکدا خەریکی نووسینە. کاری چاکم کرد هاوسەرگیریم لەگەڵ ئەو کردووە. هێندێك لە کوردەکان لێم دەپرسن چۆن ناسیت و بۆ یەکتر بوون؟ دەڵێم ئەمن بینیم و خواش ڕێکی خست. خوا دەستی منی گرت و دەستی حەلیمەی لە دەستی من نا. دیار ئەویش بە هەبوونی مێردێکی وەك من بەختەوەرە...

**پرسیار:** قوربان، حەشیمەتی کوردەکانی کازاخستان لە ڕابردوودا چەند و لە ئێستادا چەندە؟

**وەڵام:** ساڵی ٢٠٠٩ کە سەرژمێریی حکوومەتی کرا، حەشیمەتی کوردەکان بەپێی پاسپۆرتی ئەوانەی شوناسی کوردییان هەیە، ٣٧ هەزار کەس ڕاگەیەنراوە. بەڵام بەپێی ئاماری نافەرمی زیاتر لە ٨٠ هەزار کورد لە کازاخستان دەژین.

***پرسیار:*** *بۆ جیاوازیی لەو ئاستەدا؟*

**وەڵام:** زۆر لە کوردەکان کە لە ئازەربایجان، ئەرمەنستان و گورجستانەوە بۆ ئێرە ڕاگوێزراون یان کۆچیان کردووە، وەك ئازەری یان گورجی یان ئەرمەنی تۆمار کراون. ئەمە یەکێك لە هۆکارەکانە. هۆکاری دیکە ئەوەیە زۆر لە کوردەکان کە لە پازدە ساڵی دواییدا لە ئازەربایجان و ئەرمەنستانەوە هاتوونە ئێرە، هێشتا ئیقامەی

کازاخییان وەرنەگرتووە و تا ئیستاش بە هاووڵاتی ئەژمار ناکرێن. یەکێك لەوان «باری باڵا»ی شاعیرە. کاری ئیقامەکەی ئەمڕۆ و سبەی پێدەکرێ.

**پرسیار:** کوردەکان لە کازاخستان چ ڕۆڵێکیان هەیە، بۆ نموونە هیچکات کوردەکان چوونەتە پەرلەمان؟

**وەڵام:** لە پارلەمانە ناوچەییەکان پەرلەمانتاری کورد هەبووە، بەڵام بۆ پەرلەمانی ناوەندی، کوردەکان نەیانتوانیوە بچن.

**پرسیار:** کێشە بەرچاوەکانی کوردەکانی کازاخستان چین؟

**وەڵام:** باروودۆخی کوردەکان خراپ نیە. لە هەموو شوێنێك کورد هەن. خەریکی خوێندن و زانیارین، لە کاروباری دەوڵەتیدا هەن، لە تەشکیلاتی پۆلیس و لە بەشی بازرگانیدا کار دەکەن و زۆریش سەرکەوتوون.

**پرسیار:** ڕوانینی کوردەکانی کازاخستان بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستان چۆنە؟ تا چەند زانیارییان لەسەر نیشتمانی باب و باپیرانیان هەیە؟

**وەڵام:** کوردەکان لە هەموو شوێنێك بۆ وڵاتی خۆیان تێدەکۆشن. زۆربەیان نیشتمانپەروەرن. زمانی خۆیان پاراستووە. لەماڵی خۆیاندا بە زمانی کوردی قسە دەکەن. کاتێك باسی کورد و کوردستان دەکرێ، ئاخ و هەناسە بۆ نیشتمان هەڵدەکێشن. و لە دووریی وەتەن پشتیان چەماوەتەوە. دیارە کەسانێکیش هەن کە نیشتمانپەروەر نین بەڵام ژمارەیان کەمە. ژمارەیەك خراپکاریش هەن. بەڵام پێم وایە مرۆڤی خراپ لەنێو هەموو نەتەوەکاندا هەن...

**پرسیار:** نەتەوەکانی ئاسیای ناوەڕاست و بە تایبەت کازاخستان تا چ ڕادەیەك ئاگاداری خەباتی نەتەوەی کوردن؟

**وەڵام:** دەبێ بڵێم یەکەم جار بە لوتفی مەلا مستەفا بارزانی، ئەوان ناسیارییان لەسەر کورد پەیدا کرد. لە سەردەمی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو ماوەماوە لە ڕۆژنامەدا لەبارەی کوردیان دەنووسی. زۆر کورد دەناسم کە ناوی سەرکردەکانی کورد وەك

بارزانی، تاڵەبانی، ئۆجەلانیان لە کوڕەکانیان ناوە.

**پرسیار:** لە کاتی کۆچی دوایی باوکت جەنابت چوار ساڵان بووی. هیچکات بیرت لەوە کردۆتەوە کە ڕۆژێك سەردانی گۆڕەکەی بکەی؟

**وەڵام:** هەڵبەت، چەندین جار بیرم لەوە کردۆتەوە. نە تەنیا زیارەتی گۆڕی باوکم، بەڵکو دیتنی کوردستان، شاری وان، شوێنێك کە باب‌وباپیرانمان لەوێ مردوون. ئەمە ئاواتی دڵی منە. ئاواتی لەم جۆرە زۆرن. ئەگەر قیسمەت بێ ئاواتەکانم دێنمەدی. بەڵام ئاواتی گەورەم ئازادیی و سەربەخۆیی کوردستانە. لە ساڵی ۱۹۹۲یان ۱۹۹۳ وتارێکم نووسی. پێش ئەوەی خاڵە «نادۆ»م کۆچی دوایی بکات. لێم پرسی تو چۆن بیر لە کوردستان دەکەیەوە؟ ئەودەم خەباتی کوردەکان گەیشتبۆ لووتکە. لە وەڵامدا گوتی: تەنیا خەمی من لە ژیاندا ئەوەیە کوردستانی ئازادم نەدیت. بەڵام ڕۆژێك دێت وەچەی دوای ئێمە ئەوە بە چاوی خۆیان دەبینن.

**پرسیار:** پەیام و ئامۆژگاری ئێوە بۆ وەچەی داهاتووی کوردەکان چیە؟ چ بکرێ و چ نەکرێ؟

**وەڵام:** بە دڵێکی گەورە، بە نیازپاکی و عیزەت، بە هەستی نیشتمانپەروەرانە، بە خۆ ئامادەکردن، دەبێ ناوی کورد و کوردستان لە دنیادا بڵاو بکەنەوە. دەبێ هەر لاوێکی کورد بە شانازییەوە بڵێ ئەمن کوردم! ئەمن زیندووم. ئەوەی بۆ نەسڵی داهاتوو پێویست بێ ئەنجامی دەدەم. لاوان و وەچەی دواڕۆژ بنیاتنەرانی داهاتووی نەتەوەی ئێمەن.

**پرسیار:** مامۆستای بەڕێز، بە دەستەواژەیەکی تر، ئاغای نادر نادرۆف، بە چاوپێکەوتنتان سەربەرز و خۆشحاڵین. هیوادارن هەر بمێنن، بە هیوای ئەوەی لە جەژنی ۹۰ ساڵیی و ۱۰۰ساڵیتاندا بەشدار بین.

**وەڵام:** منیش زۆر خۆشحاڵم. بە بینینتان شادم، سەرکەوتنتان بۆ بە ئاوات دەخوازم[۷]

### • پرۆفیسۆر کنیاز ئیبراهیم

«ئەمن کنیاز ئیبراهیم نەبی میرزا کە بە ناوی کنیاز ئیبراهیم میرزایۆف»یش ناسراوم، لە یەکی گوڵانی (اردیبهشت)ی ساڵی ١٩٤٧ی هەتاوی لە زەنگیباساری ئەرمەنستان چاوم بە ژیان هەڵێناوە. ئەم شوێنە لە نزیک چۆمی ئەرەسە و لەسەر سنووری وڵاتی تورکیا هەڵکەوتووە. ناوی گوندەکەمان ڕیحانلوو»یە و بنەماڵەکەمان لەبنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی سەرحەد (ناوچەگەلێکی وەك وان. موس، ئاگری. ماکۆ و ناوچەکانی دەوروبەری)ـە. ئێمە سەر بە عەشیرەی گەورەی جەلالیین. باب و باپیرانمان لە کوردستانی ئێرانەوە گەیشتوونەتە لای بایەزید و لەوێشەوە چوونە ئیدەر و لەوێ نیشتەجێ بوون.»

پرۆفیسۆر دوکتۆر کنیاز ئیبراهیم، ڕۆژهەڵاتناس و ئەندامی ئاکادێمی و سەرۆکی کوردەکانی کازاخستان کە لە زانکۆی ئابای ئەڵماتا سەرۆکی ناوەندی زمانەکانی دنیایە دوای شەڕی قەرەباغ، ئەرمەنستانی جێهێشتووە و لە سەرەتای ساڵی ١٣٦٩ دەگاتە ئەڵماتای کازاخستان و لەوێ نیشتەجێ دەبێ. لە یەریڤانی ئەرمەنستان بۆ ماوەی چەند ساڵ لە زانکۆی خاچاتووری ئابوویان وەك بەرپرسی بەشی زمانناسیی و ئەدەبیاتی ئازەری کاری کردووە. ئێستاکەش ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کازاخستان و ئەندامی یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی کازاخستانە. لەلایەکی دیکەوە ئەو لە کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاستدا، نوێنەری ناوەندی پەناکورد بووە و بەرپرسی گۆڤاری ئەدەبیی «نۆبار» لە ئەڵماتایە کە بە زمانەکانی کوردی و ڕووسی بڵاو دەبێتەوە.

ئەو زۆر خەڵاتی نەتەوەیی وەرگرتووە. بەسەر شەش زمانی زیندووی جیهانیدا زاڵە و نزیکەی بیست بەرهەمی بەنرخی کوردی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە.

لاوە ٦٥ ساڵەکەی ئێمە سەربوردەیەکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەیە، لە ٦٥ساڵ ژیانی خۆیدا زۆر ڕووداو و بەسەرهاتی بینیوە و زۆر کارەساتیشیان بۆ باس کردووە. لە سەرەتادا باسی ڕەنج و کوێرەوەییەکانی دایکی دەکات:

«دایکم کچی محەمەد نادر یوسف (محمی نادوی عوسو) لە عەشیرەتی بروکی میلان بووە و لە وان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینی بنەماڵەی دایکم و دووهەزار بنەماڵەی دیکە بەهۆی گۆڕانکارییەکانی سنوور دەچنە نێو سنوورەکانی نەخجەوان لە سۆڤیەتی پێشوودا. ئەو سەدەم زۆر لە عەشیرە کوردەکان بەهۆی ڕابەریی ئاگری و شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران بەرەو سنوورەکان ڕایان دەکرد و لە ترسی زوڵم و زۆریی ئیمپراتۆریی عوسمانی ماڵ و وڵاتی خۆیان جێدەهێشت.

خەڵکی کورد بە وەزعێکی زۆر کارەساتبار تەبعید کراون. هێندێکیان چوونەتە ئێران. ئێمە سەر بەو عەشیرەتانە بووین کە ساڵی ١٩٢٦ هاتووینە ناو خاکی سۆڤیەتی پێشوو. زۆر لە عەشیرەتە کوردەکان بۆ نموونە بروکی، جەلالی و سیپەکییەکان دەربەدەر بوون. بەڵام زۆربەیان بروکی بوون کە تا ساڵی ١٩٣٧ لەوێ مانەوە.

... ساڵی ١٩٣٧ بە بیانووی ئەوەی کوردەکان لەسەر سنوورەکانی ئازەربایجان، ئەرمەنستان و تورکیا کاری سیخوڕی و هەواڵگریی ئەنجام دەدەن، دەسەڵاتدارانی ئازەربایجان و ئەرمەنستانیش دەیانەویست کوردەکان لەوێ دوور بخەنەوە. ئامانجیان دوورخستنەوە و یەك نەتەوەکردنی ئەو ناوچانە بوو. لەو ساڵەدا کوردەکانیان سواری شەمەندەفەری تایبەت بە هەڵگرتنی ئاژەڵ و مەروماڵات کردن و لەژێر کۆنترۆڵی سوپادا ڕایانگواستن. هیچکەس نەیدەزانی بۆ کوێیان دەبەن. دوو مانگی تەواو لەڕێگەدا بوون، بە شێوەیەکە هێندێك لە دایکەکان منداڵەکانیان جێدەهێشت و دەڕۆیشتن!! سەرەنجام خۆیان لە

سنووری کازاخستان و قیرقیزستان دەبیننەوە. لە شوێنێك کە بەڕاستی سەرما و بیابانێکی مەترسیداری هەبوو. نە کوردەکان زمانی ئەوانیان دەزانی و نە خەڵکی ئەو ناوچە سەخت و کوێستانییانەش زمانی ئەوانیان دەزانی.

بنەماڵەی ئێمەشیان ـ باوك، دایك، خوشك، برا، بابەگەورە و دایەگەورە و خزمەکان ـ یان لە ویلایەتی غەزەل قییای قرقیزستان دابەزاند. لە نزیك ئوشی، ئوشی لە نزیك سنووری ئۆزبەکستانە. کوردەکانی ئەرمەنستانیان بۆ قرقیزستان و کوردەکانی ئازەربایجان و نەخجەوانیشیان بۆ کازاخستان دەهێنا. بنەماڵەی ئێمە تا ساڵی ١٩٤١ بۆ ماوەی سێ ساڵ لەو شوێنە مانەوە.

سێ ساڵ دوای دەسپێکردنی شەڕی دووهەمی جیهانی جوامێرێکی ڕۆشنبیر، شاعیرو نووسەر بەناوی جەبار نادری بەفریایان دەکەوێت و دەیانگەڕێنێتەوە ئێرەوان (یەریڤان). کنیاز ئیبراهیم بەم شێوەیە باسی ئەو ڕۆژە مێژووییانەی کورد دەکات:

« لەنێو ڕاگوێزراوەکاندا بنەماڵەی وەزیر نادریش هەبوون. ئەوانیشیان تەبعید کردبوو. وەزیر نادری هات و بنەماڵەی خۆی برد. دەوڵەت سەبارەت بە بنەماڵەی ئێمە دەیگووت ئەوانە گومانیان لەسەرە و دەتوانن جاسووسیمان لەسەر بکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی وەزیر لە دامودەزگای دەوڵەتیدا کاری دەکرد و لەنێو دەزگای زانیاریی ك.گ.ب دەستی دەڕۆییشت و قسەی وەردەگیرا، گوتی ئەم زەمانەتیان دەکەم و لێیان بەرپرسیارم.

ئەو بنەماڵەی ئێمەشی لەگەڵ بنەماڵەی خۆیان لە ساڵی ١٩٤١ گەڕاندەوە ئێرەوان. لەوێ خانوو و مڵکی بۆ ١٠ بنەماڵەی دابین کرد. ساڵی ١٩٤٢ بنەماڵەی ئێمە دەچنە گوندی ریحانلوو هەڵکەوتوو لە زەنگیباسار. لەو ساڵەدا براکەم بەناوی تەیموور لەدایك دەبێ کە ئێستا تەمەنی ٧٠ ساڵە. برایەك و خوشکێکم بەناوەکانی یەعقوب و گوڵناز لە تەمەنی ٢ـ٣ ساڵی لە قرقیزستان دەمرن. دایك و باوکم بەدەستی بەتاڵەوە لە

قیرقیزستانەوە دەگەڕێنەوە ئەرمەنستان. دایك و باوکم زۆرجاران دەیانگوت بە منداڵەوە چووینە قرقیزستان بەڵام بەبێ منداڵ گەراینەوە! دواتر باوك و دایکم بوونە خاوەنی ٩ منداڵ. ٧ برا و ٢ خوشك... ئێمە لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ لە ئیرەوانی ئەرمەنستانەوە هاتینە ئەلْمائاتای کازاخستان...»

کنیاز ئیبراهیم ساڵی ١٩٥٥ دەست بە خوێندنی سەرەتایی دەکات و هەتا ساڵی ١٩٦٣ لە گوند دەخوێنێ. لە ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ منداڵانی ماڵی خاڵی لە ئیرەوان دەچێتە ئامادەیی. ناوی خوێندنگەکە ئاخوندۆف بووە کە بە ناوی ئازەرییەکان بووە. لە ساڵی١٩٦٥ ـ ١٩٦٦ خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات و دەچێتە پەیمانگای زمان و مێژووی زانکۆی باکۆ. لەوێ دکتۆرا وەردەگرێ و لە ساڵی ١٩٧٨ تێزی دوکتۆراکەی لەسەر پێوەندیی ئەدەبیاتی کوردەکان و ئازەرییەکان دەنووسێ.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە لە هەواڵەکاندا ئاماژە بەوە کراوە ساڵی پار پرۆفیسۆر کنیاز ئیبراهیم وەك جێگری سەرۆك کۆماری کازاخستان هەڵبژێردراوە.

خوێنەری بەڕێز، ئەوەی سەرەوە چەند بەشێك لە ژیان و بەسەرهاتی ئەم زانا ناودارەی کوردە کە لە چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ساڵح کەوربەری باسی لێوە کراوە و سەرەتا لەژێر سەردێڕی «لە ئیرەوانی ئەرمەنستانەوە تا ئەلْماتای کازاخستان» لە ژمارە ١٤٠ی ڕۆژنامەی ڕووداو چاپ کراوە کە لە ئورووپا و لە شاری کۆڵن بڵاو دەبێتەوە و دواتر کراوە بە فارسی و لە ماڵپەڕی خوارەوە دانراوە و منیش لەوم وەگرتووە. (٨)

### ● ئەمینی عەبدال

ئەمین کوڕی عەبدال باسۆرە لە ساڵی ١٩٠٦ لە گوندی ئەمانچایر لە ناوچەی قارسی کوردستانی عوسمانی لە دایك بووە. باوکی قەت بیری لەوە

نەکردۆتـەوە ئەمینـی بەلەنـگاز لەدایکبـووی گوندێکـی هـەژار و نەخوێنـدەوار و دواکەوتـوو ڕۆژێ لـە ڕۆژان ببـێ بـە زانـا و شـاعیر. تەمەنـی سـێزدە سـاڵ بـووە لـە دوای جەنگـی یەکەمـی گێتـی دایـك و باوکـی زێـدی باپیرانیـان بەجـێ هێشـتووە و خۆیـان لـە درندەیـی تورکـە کەمالیـەکان ڕزگار کـردووە. ئەمیـن لە سـاڵی ١٩٢٠ وەکـو گەلـێ لە منداڵـە ئاوارەکانی کوردسـتانی عوسـمانی لـە مـردن ڕزگاری دەبێ بـەوەی لە هەتیوخانـەی ئەمەریکیەکان لە شـاری ئەلێکسـاندرۆپول (لینینەکان)ی ئەرمەنسـتان بەخێـو دەکـرێ.

لـە سـاڵی ١٩٢٣ ئەمیـن ڕوو دەکاتـە شـاری تفلیـس و لـەلای مامـی دەژی. خوێندنـی قوتابخانـەی سـەرەتایی و خانـەی پـەروەردە تـەواو دەکا و دەگەڕێتـەوە ئەرمەنسـتان و ماوەیێـك دەبێتـە مامۆسـتا لـە هەنـدێ لـە گوندەکانـی کـورد لـە ناوچـەی ئەپـاران. لـە سـاڵی ١٩٣١ دەبێ بـە قوتابی زانسـتگای یەریڤان و لە سـاڵی ١٩٣٦ تـەواوی دەکا. لـەو کاتـەدا دەبێتـە یەکـێ لـە ئەندامانی دەسـتەی نووسـەرانی ڕۆژنامـەی «ڕیاتـازە». خەریکـی نووسـینی وتـار و بڵاوکردنەوەی تێکسـتی ئەدەبی میللـی (فۆلکلـۆر) دەبێ.

بەبـێ ئـەوەی واز لـەو جموجۆڵیـە ڕۆشـنبیرییەی بێنـی جارێکـی دیکـە دەگەڕێتـەوە سـەر خوێندنی بـاڵا. ماوەیێك خەریکی خوێنـدن و لێکۆڵینەوە دەبێ لـە ئەدەبـی کوردیـدا تا لـە سـاڵی ١٩٤٤ دوکتـۆرای لە ئـەدەب وەرگرتـووە. بەینێك بـووە بـە مامۆسـتا لـە زانسـتگای یەریڤـان، لە پاشـانا کـراوە بـە کارگەری زانسـتی لە ئەکادیمیـەی ئەرمەنسـتان و خەریکـی کوردناسـی بـووە بەتایبەتی لـە ئەتنۆگرافیا و فۆلکلـۆری کـوردی کۆڵیوەتـەوە.

ئەمیـن ڕۆشـنبیرێکی بەتوانا بوو کۆششـی لـە بەرچاوە لـە هەمـوو گۆڕەپانەکانی کولتووری کوردی قەفقاسـی ڕووسـیا. دڵسـۆزی کارە زانسـتی و ئەدەبییەکانی بووە تـا کۆچـی دوایی لـە ٢٢ی ئەیلوولی سـاڵی ١٩٦٤ و ناوی بەزیندوویـی ماوەتەوە لە

مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا.

لە قۆناغی یەکەمی مافی خوێندەواری کوردی لەو وڵاتەدا (۱۹۳۰ ـ ۱۹۳۷) ئەمین دەوری باڵای هەبوو لە پێشخستنی خوێندەواری لە کۆمەڵی کوردەواری بەتایبەتی دانانی کتێبی قوتابخانە بەپێی بەرنامەی خوێندنی هەموو زانستییەکان بەزمانی کوردی. لەو کتێبانە کە ژمارەیان دەگاتە دەیان کتێب هەندێکیان خۆی داناون و هی دیکە بە هاوکاری لەگەڵ دانەرانی دیکە. جگە لەمە چەند کاری گرنگی دیکەی گەیاندۆتە ئەنجام لەوانە دانانی فەرهەنگی ئەرمەنی ـ کوردی (۱۹۳۳) و کتێبی «فۆلکلۆرا کورمانجا» (۱۹۳٦) لەگەڵ کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیرانی کورد ئەم کتێبەیان داناوە، تا ئیستا بە گەورەترین و چاکترین کتێبی کوردی دەژمێردری لە بابەت پاراستنی تێکستی ئەدەبی میللیی سەرزار. هەروەها بەشداری کردووە لە گۆڕینی «دەستووری یەکێتی سۆڤیەت (۱۹۳۸) بۆ زمانی کوردی.

لە قۆناغی دووەمی مێژووی خوێندەواری کوردی لەو وڵاتەدا (لە ۱۹٤٥ەوە تا کۆچی دوایی ئەمین) لەسەر دانانی کتێبی قوتابخانە کوردییەکان بەردەوام بوو، جگە لە کتێبی بەرنامەی خوێندن چالاکی لە دانانی کتێبی یاریدەدەر بەرچاو بوو، کتێبی «ڕاست نووسین» سەرچاوەیێکی بنچینەیی بوو بۆ یەکخستنی ڕاست نووسین بەپێی ئەو ئەلفوبێیەی لەسەر بنچی ئەلفوبێی کیریلی دانرا بوو بۆ نووسینی زمانی کوردی. ئەو کتێبە لە سالی ۱۹٥۲ چاپ کراوە، لە ساڵی ۱۹٥۸ دووبارە چاپ کراوەتەوە.

مەیدانی جمووجۆڵی زانستی ئەمین فراوان بوو. لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن بەشداری کردووە، وانە و موحازەرەی لە قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی و خوێندنی زانستگا وتۆتەوە. کارگەری زانستی بووە لە ئاکادیمیەی ئەرمەنستان و هەندێ باسی لە بابەت ئەدەب و فۆلکلۆر و ئەتنۆگرافیای کورد

بڵاوکردۆتـەوە. لەسـەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامـەی «ڕیاتـازە» لەسـەر گەلـێ مەسـەلەی ڕۆژانـەی ژیانـی کـورد و دەسـەڵاتی ئـەو سـەردەمەی سۆڤیەتەکانی نووسـیوە. بەم جۆرە ئەمیـن یەکێکـە لـەو ڕۆشـنبیرانەی بـۆ هەمـوو چینەکانـی کۆمەڵـی کـوردی نووسـیوە لـە قوتابیـان و مامۆسـتایان و خوێندەوارانـی بـەرز و هەمـوو خەڵکـی دیکـەی کـورد بە گشـتی.

ئەمیـن لـە سـەرچاوەکانی ژیانی پێشـووی فێری شـێعردانان بـووە، لـە قوتابخانە فێـری شـتی دیکـە بـووە لەوانەیـە یارمەتـی دابـێ بـۆ چەسـپاندنی بیـری شـێعرەکە. لـە ڕووی ڕوخسـارەوە نووسـەر لـە مەرجەکانـی شـێعری میللـی سـەرزاری کـوردی نەچۆتـە دەرەوە، کێـش و قافیـەی خۆماڵـی بـەکار هێنـاوە، زمانی شـێعری گۆڕیوە، لـە زمانـی کۆمەڵـی کشـتوکاڵی و دانەوێڵەیـی دەری هێنـاوە بـۆ زمانـی شارسـتانی. زمانـی پاکـە وەکـو هەمـوو شـێعری کـوردی ئـەو وڵاتـە. لەبـەر نزیکـی لـە زمانـی رووسـی و ئەرمەنـی هەنـدێ وشـەی فەرهەنگـی و زاراوەی تـازە بابەتـی ئـەو دوو زمانـە کەوتوونەتـە نـاو زمانـی شـێعرییانەوە. ئەگەر لەو شـێعرانەدا وشـەی عەرەبی و تورکـی بەرچـاو بکـەون هـەر ئەو وشـە کۆنانـەن کە بـە درێژایـی مێـژوو چوونە ناو زمانەکەیانـەوە، هەرچـی وشـەی فارسیشـە بـە نەبـوو حسـێب دەکـرێ.

بەگشـتی شـێعری ئەمیـن بریتییـە لـە لیریـك، هەنـدێ لـەو بابەتـە شـێعرەی لـە ڕووی ژمـارەی دێڕەکانیانـەوە زۆر کورتـن، لـە برووسـکەییێك دەکـەن ناوەڕۆکیـان لـە قسـەی نەسـتەق و پەندی پێشـینیان و و تـەی دانایانـەوە وەرگیرا بـێ. هەروەها لە پۆێیـم (قەسـیدەی درێـژ) بەرهەمـی هەیـە، بیـری هەندێکیانـی لـە ئەدەبـی میللیـی سـەرزار وەرگرتـووە، هـی هەندێکـی دیکەیانـی لـە داهێنانـی خۆیەتـی. هەندێ لە پۆێیمـە بەرچاوەکانـی ئەمانـەن: مەمـێ و زینـێ، زەلیخـا و فەتـولا، ئەحمـێ خۆلێ، سـێ برا، گولیـزەر و هـی دیکە.

شێعری لـە سـەرەتادا لـەو کتێبانـەدا بڵاوکراوەتـەوە کـە نـاوە نـاوە شـاعیر و

نووسـەران بەنـاوی بەرهەمـی نووسـەرانەوە بڵاویـان دەکـردەوە، لەدوایـیـدا لە سـاڵی ١٩٣٥ بەشـێکی شـێعری ئەمیـن بەنـاوی بەهـار لـە یەریڤـان بڵاوکرایـەوە.

لەڕووی ناوەڕۆکەوە شێعری ئەمین فراوانە هەموو لایێکی گەشبینی گرتۆتەوە، ئەگەر ڕەشبینی لای هەبێ بەرامبەر بە دوژمنە، دوژمنیش نەیاری دەسەڵاتی سۆڤیەتە. ئەوەی نەیاری سۆڤیەتیش بێ کوردی خۆش ناوێ. ئەمەیە بیروباوەڕی کوردی ئەو وڵاتە. هەرچۆنێ بێ بەرهەمی شێعریان بەگشتی ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی و لە ڕووی هونەرییەوە چۆتە ناو گەنجینەی قسەی جوانەوە.

ناوەرۆکی شێعری ئەمین خەریکی ئەم مەبەستانەن کە لەو خاڵانەی لای خـوارەوە ڕوون دەکرێنـەوە:

١ـ کوردایەتـی: شـاعیر بەپێـی هەمـوو شـتێکی پێوەنـدی بـە کـوردەوە هەیـە، کوردایەتـی دەکا. بـاس لـە جوگرافیای کوردسـتان دەکا، لە سـامانی نەتـەوەی کورد دەدوێ، بـە شـان و باهـووی گەورەکانـی هەڵدەڵـێ. وەسـفی بەهـار و بلبـل و شـاخ دەکا، شـۆڕەژنی کـورد و کچـی نازەنیـن و سـلۆی ڕەنجبـەر و حەسـۆی شـوان لـە دەشـت و زۆزانانـی شـاخی ئەلەگـەز سـەرچاوەی ئیلهامـی ئەمینـی عەبدالـن.

٢ـ نیشـتمانی سـۆڤیەت: ئەمیـن و زۆربـەی خوێنـدەوارانـی کـورد، کـوردی بەڕاسـتی بـوون، دەسـەڵاتی ئـەوێ لـە دڕندەیـی تورکـە کەمالیـیـەکان ڕزگاری کردبـوون، لەبـەر ئـەوە لـەڕووی سـایکۆلۆجییەوە خۆیـان گونجاندبوو لەگـەڵ ئەو بیروڕایـەی پیـاو دەتوانـێ دوو نیشـتمانی هەبـێ. هەرچۆنـێ بـێ ئەمـە ڕاسـت بـێ یـا هەڵـە، ئەنجامـی بـە چاکـە کەوتـەوە. ئـەم ڕاسـتییەش لـە هەمـوو ئـەو بەرهەمـە ئەدەبییانـە دەردەکـەوێ کـە شـاعیر و نووسـەرانی ئـەو وڵاتـە دایـان هێنـاون.

ئەمیـن شـێعری بـۆ ناوچـە و شـار و ئاوەدانییەکانـی وڵاتـی سـۆڤیەتی کـۆن نووسـیوە، وەکـو ڕووسـیا و ئەرمەنسـتان و گورجسـتان و لینینگـراد و مۆسـکۆ و یەریڤـان و لینینـەکان. هەروەهـا بۆ شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر و جەژنی کرێـکاران و لینین

و کۆڵخۆز و شتی دیکەی نوسیوە.

لە ڕووی جوانکارییەوە بەرهەمی شێعری ئەمین لەو پلە هونەرییە دەوەستێ کە شاعیرە بەتواناکانی کوردی قەفقاسی ڕووسیا گەیشتوونەتێ.

نموونەی شێعری:

ئەز هاتمە ژ ئەلەگەزێ

ژ چیایێ بەدەو چار سەری

تەرا ئانییە کلامێ تەزە

سەلاما ئالاڤی دلباری

•••

ئەزێ شامە دلێ من بار

کە لە تژی، تەرا بووم یار

نها دچم، دوور دکەڤم

گەلۆ کەنگێ تە ڤەگەرم

ئەمینی عەبدال زانا و نووسەر شاعیری کوردی قەفقاسی ڕووسیا یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیرە کەمانەی ئەو وڵاتە توانییان لە هەر دوو مەیدانی زانستی و ئەدەب خزمەتی ئەو بەشە کوردە بکەن کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هەوڵی دا سەرلەنوێ دەست بە خوێندن و نووسین و مەدەنییەت بکاتەوە. لە پێشخستنی خوێندەواری لە قوتابخانە کوردییەکاندا کۆششی ئەمین لە بەرچاو بوو، لێکۆڵینەوەی زانستی لە زانستگا و ئەکادیمیە لە بارەی کوردناسییەوە بەنرخ بوو. لە نووسینی ئەدەبیدا وتار و چیرۆك و لیریك و پۆێم (قەسیدەی درێژ) دەوری باڵای هەبوو. ئەمە بوو بەهۆی دەوڵەمەنکردنی ئەدەبی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیادا.[٩]

**• پرۆفیسۆر شاکرۆ خلۆ محۆ**

پرۆفیسۆر شاکرۆ لە ساڵی ١٩٣٠ لە ناوچەی ئەلەگەز لە ئەرمەنستان لە خێزانێکی کوردی ئێزیدی لە عەشیرەتی سپکی لەدایك بووە. لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩ لە قارسەوە کۆچیان کردووە بۆ ئەرمەنستان لەبەر هێرش و پەلاماری عوسمانییەکان بۆ ئەم ناوچانەی کوردستانی تورکیا.

ساڵی ١٩٤٨ چۆتە زانکۆ و لە ساڵی ١٩٥٢ لە زانکۆی یەریڤان لە بەشی مێژوو دەرچووە و پاشان بووەتە مامۆستای مێژوو. لە ساڵانی (١٩٥٥ ـ ١٩٦٠) وەك جێگری سەرنووسەری ڕۆژنامەی ڕێیا تازە کار دەکات کە ڕۆژنامەیەکی بەناوبانگی کوردییە و لە ساڵانی سییەکانەوە لە یەریڤان دەردەچێت تاکو ئێستا. لە هەمان کاتدا دەستی بە خوێندنی دکتۆرا کرد. پاشان لە بەشی کوردیی لە ئەنیستیوتی ڕۆژهەلاتناسی لە یەریڤان دەستی بە کار کردووە. ساڵی ١٩٦٣ بوو بە خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا و تێزەکەی بە ناوی (بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە عێراق پاش جەنگی جیهانی دووەم). لە ساڵی ١٩٧٨یش لە شاری مۆسکۆ بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرت و تێزەکەشی بە ناوی (کێشەی ئۆتۆنۆمی کورد لە عێراقدا) بوو.

پرۆفیسۆر شاکرۆ خاوەنی دوو بڕوانامەی دکتۆرا بوو کە هەردووکی لەسەر شۆڕشی گەلی کورد بووە لە کوردستانی عێراق.

لە ساڵانی (١٩٨١ ـ ١٩٩٤) لێپرسراوی بەشی کوردی بوو لە ئینستیوتی ڕۆژهەلاتناسی لە یەریڤان. لە ساڵی ١٩٨٥ دا بوو بە پرۆفیسۆر و لە ساڵی ١٩٩٦ دا پلەی ئەکادیمی زانستی ئەرمەنی پێ بەخشرا کە بەرزترین پلەی زانستییە لە ئەرمەنستان.

لە ساڵی ١٩٩٤ دا پرۆفیسۆر شاکرۆ لەگەڵ کۆمەڵێك ڕۆشنبیری وەك پرۆفیسۆر

لازاریـڤ، پرۆفیسـۆر حەسرەتیان، دکتۆر بەشیر سـەبری، دکتۆرە ژیگالینـە، دکتۆرە زارێ یۆسوپۆڤنە، دکتۆرە ڤاسیلیڤنە، دکتۆرە موسـەیلان و دکتۆرە سـمیرنۆڤە ناوەنـدی لێکۆڵینـەوەی کوردییـان لـە مۆسـکۆ دامەزرانـد و ئەویـان بە لێپـرسراوی ناوەندەکـە دەستنیشـان کـرد کـە زیاتـر لێکۆڵینەوەکانیـان دەربـارەی کێشـەی کورد بـوو لە کوردسـتانی ئێراق. هەروەها بەشـێك لە لێکۆڵینـەوەکان دەربـارەی ڕێزمانی کـوردی و لەهجەکان بـوون. ئـەم ناوەنـدە تـا ئێسـتا چەندیـن کتێـب و نامیلکـەی بـە زمانی ڕووسـی و کـوردی دەرکـردووە لەوانە: مێژووی کوردسـتان، شـەرەفخانی بدلیسـی، مێژووی دیالێکتی کـوردی، کێشـەی کـورد لـە کوردسـتانی باشـوور، کەشـکۆڵی کـوردی و ...

پرۆفیسـۆر شـاکرۆ زیاتـر لـە ٢٠ کتێـب و نامیلکـەی جۆراوجـۆری بەچـاپ گەیانـدووە و لـە واشـنتۆن، پاریـس، سـتۆکهۆڵم، بەرلیـن، برۆکسـێل، کوردسـتانی ئێـراق و مۆسـکۆ بەشـداریی لە دەیان کۆنفرانـس و کۆڕ کردووە و هەمیشـە هەوڵی بـۆ یەکگرتنـەوەی دەنگـی کـورد داوە.

ناوبـراو خەڵاتـی زێڕینـی پیرەمێردی سـاڵی ٢٠٠٤ی لەڕێوڕەسـمێکدا لە شـاری سلێمانی پێشـکەش کرا.

سـەرەنجام ڕۆژی پێنجشـەممە ڕێکەوتـی یەکـی مانگـی دووی ٢٠٠٧ پرۆفیسـۆری گـەورەی کـورد شـاکرۆ خـدۆ محـۆ لـە یەکێك لـە نەخۆشـخانەکانی شـاری مۆسـکۆ کۆچـی دوایـی کـرد. [١٠]

### • پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ

کوردنـاس و زانـای مەزنـی کوردی یەکێتی سـۆڤیەتی جـاران پرۆفیسـۆر قەناتی کـوردۆ لـە ڕۆژی ١٩٠٩/٩/٢١ لە گوندی «سوسـز»ی ناوچەی «قانزمان»ی هەرێمی قـارس لـە کوردسـتانی تورکیا ی سـەر بـە دەوڵەتی عوسـمانی لەدایك بـووە. ناوی

تـەواوی «قەنـات کـوڕی کـوردۆ کـوڕی کەلـەش کـوڕی خـدر»ە و لەسـەر ئایینی ئێزیدی بووە.

لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٨ دا کە تورکەکان بەسەر ئەرمەندا زاڵ بوون، بنەماڵەی قەنات و خەڵکی ئاوابیەکان خۆیان لە چنگی تورکەکان ڕزگار کرد و بەرەو ناوچەی «ئاپاران»ی ئەرمەنستانی ژێردەستی ڕووسیا کەوتنەڕێ و لەو ناوە لە گوندی «کۆربلاخ» نیشتەجێ بوون کە خەڵکی گوندەکە هەموویان کورد بوون. هەر لەو ساڵەدا تورکەکان ناوچەی ئاپارانیان داگیر کرد بە تایبەتی گوندەکانی کورد. بۆیە ماڵی قەنات ماوەیەك دەربەدەر بوون و لەدواییدا گەڕانەوە ئاپاران و باوکی بە حەماڵی گوزەرانی دەکرد و لە ساڵی ١٩٢٠ دا ڕوویان کردە گورجستان و لە شاری «تفلیس» نیشتەجێ بوون و ملیان دایە ڕەنجبەری و باوکی لە ١٩٢١ دا کۆچی دوایی کرد و پەروەردەکردنی ئەو کوڕۆ ١٢ ساڵییە کەوتە ئەستۆی دایکی و هەر لەو ساڵەدا لە قوتابخانەی «هاگۆپ گازاریانی»ی ئەرمەنی ناسراو بە «لازۆ» دەستی بە خوێندن کرد و ئەو زانایە بە پتی لاتینی ئەرمەنی فێری کوردی و ، ژنەکەشی فێری زمانی ئەرمەنی کرد.

قەناتـی کـوردۆ لـە سـاڵی ١٩٢٨ دا خوێنـدنـی سـەرەتایی لەو قوتابخانـە تایبەتیە تـەواو کـرد و لـە کۆلێـژی کارگـەران لە شـاری لینینگـراد وەرگیـرا و لە سـاڵی ١٩٣١ دا ئـەو کۆلێـژەی تـەواو کـرد، کـە بەرامبـەر قۆناغـی ناوەنـدی و ئامادەیـی بـووە و لـە کۆتایـی ئـەو سـاڵەدا قەنـات و دوو هاوڕێـی کـوردی لـە کۆلێـژی زمانەوانـی زانکـۆی لینینگـراد وەرگیـران و لە سـاڵی ١٩٣٦ دا خوێندنی تەواو کـرد و بڕوانامەی دیبلۆمـی وەرگـرت و هـەر ئـەو سـاڵە لـە بەشـی دکتـۆرا وەرگیـرا و لـە سـاڵی ١٩٤١ دا خوێندنـی بـاڵای تـەواو کـرد و بڕوانامـەی دکتـۆرای وەرگـرت و لـە پەیمانـگای ئەسـتۆگرافیای ئەکادیمیـای زانسـتی سـۆڤیەت دامـەزراوە، دوای ماوەیەکـی کـەم نێردرایـە «فابریقـەی شـەفەقی سـوو» تـا مانگیشـوباتی ١٩٤٢.

دکتۆر قەناتی کوردۆ لە ساڵی ١٩٤٥ بووە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی ڕووسیا و لەپاش جەنگ بوو بە مامۆستای زمانی کوردی و وانەی بە خوێندکارانی بەشی ئێرانی دەگوتەوە.

لە ساڵی ١٩٤٧ەوە تاکو ١٩٦٠ سکرتێری لیژنەی ناوچەی پارتی کۆمۆنیستی پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتناس بووە و لە شاری لینینگراد تاکو ساڵی ١٩٥٨ قەناتی کوردۆ و ئیسحاق تسوکەرمان و مارگریت ڕۆدینکۆ خەریکی کوردناسیی بوون لە بەشی ئێرانی پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسی و لە ساڵی ١٩٥٨دا بەشی کوردی بە یارمەتی یوسف ئۆربیلی سەرۆکی پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسی جیا کرایەوە و بووە بە بەشێکی سەربەخۆ.

لە سەرەتادا ئۆربیلی خۆی بووە سەرۆکی، بەڵام لەدواییدا دکتۆر قەناتی کوردۆ بە سەرۆکی بەشەکە هەڵبژێردرا. ئەوەی شایانی گوتنە دکتۆر قەنات لە ساڵی ١٩٦٨ دا بڕوانامەی دکتۆرای «ناووك» واتە دکتۆرای زانستەکانی وەرگرت و پلەی زانستی بووەتە پرۆفیسۆر.

تاکو ڕۆژی کۆچی دوایی لە ١٩٨٥/١٠/٣١، وەك سەرۆکی بەشی کوردی و زانایەکی مەزنی کورد و کوردناسێکی دڵسۆز و لێهاتووی نەتەوەکەی خزمەتی زمان و وێژە و مێژووی کوردی کرد.

پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ گەلێك بەرهەمی بەنرخی نووسیوە و بڵاو کردۆتەوە لەوانە:

١. تەحویری مێژووی کورد لە زانستی مێژووی بۆرجوازیی فارس ـ ساڵی ١٩٥٤.

٢. خەباتۆر ئابۆڤیان وەکو کوردناس و ئەسنۆگراف ـ ساڵی ١٩٥٥.

٣. بیروباوەڕی ناڕاست لەبارەی زمانی کوردییەوە ـ ساڵی ١٩٥٥.

٤. کورد لە پەرتووکی «نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست» ـ ساڵی ١٩٥٧.

٥. فەرهەنگی کوردی ـ رووسی «شێوەی کرمانجی باشوور» ـ ساڵی ١٩٨٣.
٦. پەرتووکی رێزمانی کوردی ـ رەوان ـ ساڵی ١٩٥٦.
٧. ئەحمەدی خانی و بەرهەمی مێژوویی.
٨. دروستبوونی وشە لە زمانی کوردیدا (مۆرفۆلۆجی و فۆنەتیك).
٩. کوردی سۆڤیەت لە وێژەی کوردی دەرەوەدا.
١٠. بیروباوەڕی قارەمانیەتی لە بەرهەمی وێژەی ئەحمەدی خانی دا.
١١. قەڵای گەل ـ چیرۆك.
١٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ـ بەشی یەکەم چاپی سوید.
١٣. مێژووی ئەدەبی کوردی بەشی دووەم چاپی سوید.[١١]

**● مامۆستا عەرەبی شەمۆ**
**(عەرەب شامیلۆڤ)**

عەرەب کوڕی شەمۆ (شەمسەدین) کوڕی شامیل بەپێی دەستووری بنەماڵەی ئێزیدیان خۆی و باب و باپیرانی لە چینی شێخانن. لە نێوەندی کۆمەڵی کوردی بە ناوی «عەرەبی شەمۆ» و لە ناو رووساندا بە «عەرەب شەمۆ یێڤیچ شامیلۆڤ» ناسراوە. لە ساڵی ١٨٩٥ لە گوندی سووسز لە ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایك بووە. ژیانی سەردەمی منداڵی وەکو هەموو کوردێك قورس و نالەبار بووە، زیاد لەسەر ئەمە وەك ئێزدییێك بەربەرەکانی کراوە و بەبێ دین لە قەڵەم دراوە. بەهۆی ئەوەی لە بنەماڵەی شێخان بووە ئایینی ئێزیدی تا رادەیێك رێگەی داوە فێری خوێندن و نووسین بێ، ئەگینا تەنیا دەسەڵاتی عوسمانی لە رووی خوێندەوارییەوە هۆی دواکەوتنیان نەبووە، بەڵکو قەدەغەکردنی خوێندن و نووسین لە لایەن ئایینەکەی خۆیانەوە

کاریگەرتـر بـووە.

لـە دەوروبـەری شۆڕشـی ئۆکتۆبـەری ١٩١٧ عـەرەب لە گوندی سـاری قامیش بـووە لـە ناوچـەی قـارس، لـەو کاتـەدا ئـەو پارچـە خاکـەی عوسـمانی لەلایـەن ڕووسـیای قەیسـەرییەوە داگیـر کرابـوو. لـەو ڕۆژانـەدا دەسـەڵاتی قەیسـەری عەرەبـی زینذانـی کردبـوو بـە تاوانـی بڵاوکردنـەوەی بیروبـاوەڕی بۆلشـەڤیکی و لە شـاری سـتاڤرۆپۆل لـە باکـووری قەفقـاس دەخرێتـە بەندیخانـەوە. ماوەی سـاڵێك لـەو بەندیخانەیـە دەمێنێتـەوە. بەهـۆی دانانـی پیلانێکـی نهێنییـەوە لـە بەندیخانـە ڕادەکا و ڕوو دەکاتە موسـکۆ. هەر لەو کاتەدا لە سـاڵی ١٩١٨ لە پارتی کۆمۆنیسـت دەبـێ بـە ئەنـدام. عـەرەب یەکەمین کـورد بـووە لـە ڕووی خوێنـدەواری و خەباتی پراکتیکییـەوە لـەو پارتییەدا بووە بەئەنـدام. لە سـاڵانی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٤ دەبێ بە قوتابی و لـە ئامـۆژگای ڕۆژهەڵاتناسـی ئەکادیمیـەی زانسـتی لـە مۆسـکۆ دەخوێنـێ. ئەم خوێندنـە جـۆرە وەرسـوڕانێك بـووە لە ژیانـی خوێندەواری عـەرەب، شـارەزایی لە زمـان و ئـەدەب و مێـژوو و جوگرافیـای کـورد و کوردسـتان پەیـدا کـردووە. جگـە لـەوە کادیرێکـی پڕۆپاگەنـدەی باشـی لـێ هەڵکەوتـووە لـە کاروباری سیاسـەت و پارتییایەتـی. لەبـەر ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٢٤ دەینێـرن بـۆ شـاری یەریڤـان و دەکرێتـە بەرپرسـیار و نوێنـەری پارتـی کۆمۆنیسـت لـە ناوچـە کوردییەکانـی ئەرمەنسـتان و گورجسـتان بەتایبەتـی ناوچـەی ئەلەگـەز.

بۆ ماوەی هەشـت نۆ سـاڵ عـەرەب نوێنەری کورد دەبێ لـە هەموو کاروبارێکی پارتییایەتـی و پێوەندیـی کـورد بـە دەسـەڵاتی دەوڵەتـەوە. وەکـو خـۆی دەیـووت ماڵـی تایبەتـی خۆی نەبـووە، هەر ڕۆژە لـە ئاوەدانییـەك کاری کردووە و هەر شـەوە لـە ماڵێـك خەوتـووە. لـە سـاڵی ١٩٣٢ ڕووی کردۆتـە شـاری سـانت پیترسـبۆرگ (ئەوسـا لینینگـراد) و بـووە بـە قوتابـی ئامـۆژگای ڕۆژهەڵاتناسـی ئەکادیمیـەی زانسـتی لـە بەشـی مێـژوو کۆششـی کـردووە. مـاوەی شـەش سـاڵ لـەو دەسـگا

زانستییە بەرزە خوێندوویەتی. لەو سەردەمەدا زانای ڕۆژهەڵاتناس یووسف ئۆربێلی بەنەژاد ئەرمەن دۆستی کورد بووە، یارمەتی عەرەب و هەموو قوتابییە کوردەکانی دیکەی داوە لەو دەسگایەدا. هەروەها زانای بەناوبانگی زمانەوانی نیکۆلای مار لەو ڕۆژگارەدا کەوتبووە چەندوچوونی زمانەوانییەوە لەگەڵ ستالین. وابوو هەندێ لە قوتابیان و لایەنگرانی تیۆریی مار گیران و ئاوارە کران بۆ ناوچەی دوورەکانی ڕووسیای پان و بەرین. پرووشکی ئەم کارە ناپەسەندە بەر عەرەبیش کەوت نەك تەنیا لەبەرئەوەی لایەنگری تیۆریی مار بوو، بەڵکو زیاتر لەبەرئەوەی کورد بوو. تاوانەکەی ئەوە بوو گۆیا پیوەندی لەگەڵ کوردی دەرەوە هەیە، بەڵگەی ئەمە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی «شڤانی کورد» لە سووریا و هەوڵدان بۆ وەرگێڕانی بۆ زمانی فرەنسی. ئەوەی ئاشکرایە ئەم چیرۆکە لە ساڵی ١٩٣٠ لە یەریڤان بەزمانی کوردی چاپ کرابوو، ئیتر لە دەرەوەی ڕووسیا هەرچی لەگەڵ ئەم بەرهەمە بکرێ خاوەنەکەی بۆ دەبێ بەرپرسیار بێ!

لە ساڵی ١٩٣٧ عەرەب نامەی خوێندنی باڵای تەواو کردبوو، لەسەر بەرگریکردن بوو کە بەر ئەو هێرشە ناڕەوایە کەوت و نێررایە سیبیریا. بێدەنگ و بێسەنگ ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق لە ناو دۆزەخی ئەم ئاوارەیییە مایەوە. لە ساڵی١٩٤٦ کچە ڕووسێکی هێنا و بوو بە خاوەن ماڵ. لەو ژنە سێ کچی هەبوو. لە ساڵی١٩٥٧ لە دوای لێبوردنەکەی پارتی کۆمۆنیست لەوانەی لەوە پێش بەناهەق تاوانبار کرابوون عەرەب لەگەڵ ماڵ و منداڵی گەڕایەوە یەریڤان، ئەو کاتە تەمەنی لە شەست ساڵی تێپەڕی کردبوو. ئیتر بەناوی کادیری پارتی کۆمۆنیست تەقاویت کرا. لەو کاتەوە ژیانێکی هێمن و لەسەرخۆی بردەسەر، تا کۆتایی ژیانی خەریکی داهێنانی ئەدەبی بوو، بەتایبەتی نووسینی ڕۆمان. عەرەبی شەمۆ لە ساڵی ١٩٧٨ لە شاری یەریڤان کۆچی دوایی کرد.

**عەرەبی ڕۆشنبیر**

قۆناغی یەکەمی خوێندەواری عەرەب لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە دەست پێدەکا تا ساڵی ١٩٣٧. لەم ماوەیەدا جگە لە جموجوڵی سیاسی و کاری پارتیبایەتی، عەرەب دەوری گرنگی هەبوو لە دروستکردنی خوێندەوارییێکی تازە لەناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. ئەو یەکەمین کەس بوو لە ڕۆژنامەی «زاریا ڤۆستۆکا» (شەفەقی ڕۆژهەڵات)ی ڕووسی لە شاری تفلیس ئەلفوبێی کوردی لەسەر بنجی لاتینی لە ٢١ی تەمووزی ١٩٢٨ی بڵاو کردەوە. لە پاشانا لەگەڵ کوردناس ماراگوولۆڤ بەناوی هەردووکیانەوە ئەو ئەلفوبێیە بەرەسمی لەلایەن دەسەڵاتەوە دانی پێدانراوە لە ساڵانی ١٩٢٤ ـ ١٩٢٨ لەو ڕۆژنامە ڕووسیەی شاری تفلیس وتار و لێکۆڵینەوەی لە بابەت کوردەوە زۆرە. دیارە لەم وتارانەدا لەبەرئەوەی بەزمانی ڕووسی بوون ڕەچاوی ئەوەی کردووە ئەو جۆرە زانیارییانە بخاتەڕوو کەڵکی ئەوەی هەبێ کورد بە ڕووسی زمان بناسێنێ. جگە لەوە مەبەسی بنچینەیی عەرەب بەرپاکردنی شۆڕشی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بوو لە نێوەندی کوردی قەفقاس. بۆ ئەم مەبەستە بە زمانانی کوردی و ڕووسی و ئەرمەنی وتاری زۆرە لە بابەت کوردەوە، گەلێ لایەنی ڕۆشنبیریی کورد دەگرێتەوە. بەتایبەتی بایەخی زۆری بەچەسپاندنی ئەلفوبێی لاتینی داوە. لە زمانەوانیدا هەوڵی داوە بەراوورد لە نێوان دیالێکتە بچووکەکانی سەر بە دیالێکتی کرمانجیی باکوور بکا. لە بابەت پێوەندیی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیستێمی کۆنی دەرەبەگییەوە نووسینی هەیە، لە ژیانی ئابووری تازەشدا ئاوڕی زۆری لە سیستێمی کۆڵخۆز (کێڵگەی هەرەوەزی) داوەتەوە. لەگەڵ ئەم هەموو جموجۆڵییە و بەرهەمە زۆرییەی عەرەب لە بابەت هەموو لایەنەکانی ژیانی خوێندەواری نەتەوەی کوردەوە هێناویەتییە ناوەوە پیشەی سەرەکی بەرهەمی ئەدەبی بووە و لە ڕۆماندا داهێنەری یەکەمە.

**نووسەری ڕۆمان**

عـەرەب لـە قۆناغـی یەکەمـی ژیانیـدا، کـە لـە سـاڵی ١٩٣٧ کۆتایـی پـێ دێ، لەگـەڵ هەمـوو کۆششـە ڕۆشـنبیرییەکانی چیرۆکنـووس و ڕۆماننـووس بـووە. یەکێکـە لـەو دوو کەسـە، ئـەو و عەلـی عەبدولڕەحـمان مەشـقی شـێعر نووسـینیان نەکـردووە. ئەگـەر بەپێـی نەریتـی ئەورووپاییـان بووایـە دەبـوو ئەوانیـش وەکـو نووسـەرەکانی دیکـەی کـورد و هەمـوو نەتەوەکانـی ڕووسـیا لـە ژێـر کاریگەریـی ئەدەبـی ڕووسـی شـێعر و پەخشـان بـەکار بێنـن لـە بەرهەمـی داهێنـراودا، کەچـی بەرهەمـی ئـەم دووانـە بەهـۆی پەخشـانەوە دروسـت بـووە.

لـە قۆناغـی یەکەمیدا مەشـقی نووسـینی چیـرۆك و ڕۆمـان لەلای عـەرەب پەیدا بـوو. لە ڕووی ڕووخسـارەوە لاسـاییکردنەوەی ئەدەبی ڕووسـی بـووە. چونکە لەوە پێـش هیـچ جـۆرە تاقیکردنەوەیێـك لـە ئەدەبـی کوردیـدا نەبووە لەمـەڕ چیـرۆك و ڕۆمـان نووسـین. بـەم جـۆرە عـەرەب بیـری لـەوە کردۆتـەوە ئـەوەی لـە ئەدەبـی ڕووسـیدا ڕۆمانـی پێدەڵێـن و بـەو زمانـە نووسراوەتـەوە، ئایا شـتێکی واش بە زمانی کـوردی نانووسرێتـەوە!؟ بێگومان شـتی وا بەزمانی کوردیـش دەنووسرێتەوە. لێرەدا عـەرەب لـە نـاوەڕۆك و ڕووداو و خەڵکـی نزیـك خـۆی دەگـەڕێ و چیـرۆك و ڕۆمانیان لێ دروسـت دەکا. لەو سـاڵانەدا ١٩٣٠ ـ ١٩٣٦ مەشـقی نووسـینی ڕۆمانی کـوردی لای عـەرەب دەسـت پێـدەکا. ڕاسـتە دەڵێن بەرهەمـی هونـەری و ئەدەبی بـە کامڵـی لـە دایـك دەبێ، بـەڵام ئـەم جـۆرە بەرهەمە لـە ئەدەبـی کوردیـدا نەبووە، ئـەوەی لـەوەوە نزیـك بوویـێ حیکایەتـی بەرگوێـی ئاگردانـی میللیی نەنـووسراوە، ئەمـە زۆر یارمەتـی عەرەبـی داوە بتوانـێ بەرهەمێـك دابهێنـێ وا لـەو ڕۆمانـە ڕووسـییانە بـکا کـە نووسـەر ئاگاداریانە. لەبـەر ئەوەیـە بەرهەمـە نووسراوەکەی لەو حیکایەتـە نەنووسراوانـەوە نزیکە. جگـە لەوە ئـەو گیروگرفتانەی عـەرەب دەیەوێ بیانخاتـە نـاو ڕۆمانەکانیـەوە لـەو گیروگرفتانـەوە نزیکـن کـە حیکایەتـی بەرگوێـی ئاگـردان دەیانخاتە ڕوو.

ڕۆمانەکانی عەرەب «شڤانی کورد»، «ڕەبەن»،«کوردی ئەلەگەز»، نموونەی یەکەمی هونەری ڕۆمانی کوردین کە لە ساڵانی ١٩٣٠ـ١٩٣٦ لەلایەن عەرەبەوە نووسراونەتەوە. ناوەکانیان ڕەنگدانەوەی دوو دیارەی پێچەوانەی یەکتری کۆمەڵی کوردەواری ئەو وڵاتەن، واتە ژیانی کۆچەری و شوانکارەیی لە لایێك، لەلایێکی دیکەوە ژیانی نیشتەجێیی و کشتوکاڵی. ئەم دیاردەیە تا ئێستاش ماوە. شارۆچکەی ئەلەگەز لە بناری شاخی ئەلەگەزە، خەڵکی ئەوێ و گوند و ئاوەدانییەکانی دەوروبەری تا ئێستاش لە هاویندا دەچنە سەر شاخ و لەوێ هەموو بنەماڵەیێك هەواری تایبەتی خۆی هەیە و زۆزانی پێ دەڵێن. لە پاییزدا دەگەڕێنەوە ناو گوندەکانی خۆیان.

لەو ڕۆمانەدا عەرەب لە ژیانی ئەو خەڵکە دەدوێ لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم. زۆربەی ئەوانە لە ژێر دەسەڵاتی تورکی عوسمانی و تورکیە کەمالییە تازەکان یان قەلاچۆ دەکران یا ئاوار دەبوون. بێگومان ئەمە دەبێتە سەرچاوە بۆ بەراووردکردن لە نێوان ئەو دوو ژیانەدا، ئەوە کۆنەکە تێی دەگا و ئەوە تازەکەش نەفرەت لە کۆنەکە دەکا و دەستخۆشی لەوانە دەکا کە تازەکەیان ڕەخساندووە.

قۆناغی دووەمی ژیانی نووسەر بیست ساڵ ئاوارەیی لە خاکی سیبیریا، ئەدەبی لە بیر نەبردبووەوە. دەیتوانی بنووسێ، بەڵام چۆن و کێ بۆی بڵاو دەکاتەوە، ئەوەی سەیر بێ دەیووت هیچ ڕق و کینێك لە دەروونم درووست نەبوو بوو بەرامبەر بە دەسەڵات. باوەڕی تەواوم بە فەلسەفەی دەسەڵاتەکە هەبوو، ئەو خراپەیەی بە من و بە خەڵکی دیکە کرا، کردەوەی ناهەمواری پیاو خراپان بوو، ئەمە دەستووری بیروڕای عەرەب بوو. هەندێ لە نزیکەکانی لەگەڵی نەبوون، چونکە سەرداری وڵات کە ستالین بوو لە دوایخۆی بەولاوە بە قسەی هیچ کەسێکی نەدەکرد، ئەمەو دەبوو خۆی ڕێگەی ئەو پیاو خراپانەی

نەدابایـە کـردەوەی وایـان لـێ ڕوویـدا.

قۆناغـی دوایـی ژیانـی ئەدەبیـی عـەرەب لـە سـاڵی ١٩٥٧ەوە دەسـت پێـدەکا تـا کۆتایـی ژیانـی. لـەم ماوەیـەدا جەوهـەری ڕاسـتی نووسـەر دەردەکـەوێ وەك نووسـەرێکی بەتوانـا لـە هونـەری ڕۆمانـی کوردیـدا، بەرهەمەکانـی ڕووی ئەوەیان دەبـێ بکرێـن بـە زمانـی ڕووسـی و زمانـی هەندێ لـە میللەتانی قەفقاسـی ڕووسـیا و ئـەو بێگانانـە پێشـوازییێکی باشـی بەرهەمـی عـەرەب بکـەن و وەك داهێنانێکـی ئەدەبیـی بـەرز بکەوێتـە بەرچاویـان.

ناوەرۆکـی ڕۆمانەکانـی ئـەم سـەردەمەی لـە دەوری دوو مەبەسـی سـەرەکی دەسـووڕانەوە. یەکەمیـان بڵاوکردنـەوەی بیـری فەلسـەفی سۆسـیالیزم وەك ئیدیۆلۆجیەتێـك مرۆڤایەتـی لـە چەوسـاندنەوە ڕزگار دەکا. دووەمیـان یەکێتیـی خاکـی کوردسـتان و میللەتـی کـورد و هەوڵـدان بـۆ یەکگرتنـی ئـەو خاکـە پارچـە کـراوە بـۆ ئـەوەی کوردیـش بـە سـەربەرزی وەکـو میللەتانـی دیکـە بـژی. عەرەب دەیویسـت ئـەم ئـارەزووەی بەڕێگـەی ئاشـتی بـەدی بێنـێ.

لـە سـاڵانی ١٩٥٧ ـ ١٩٥٩ ڕۆمانـی «بەربانـگ» و «ژینـا بەختـەوەری» بـڵاو کـردەوە. لـە نـاوی ئـەم کـردەوە ئەدەبییانـەوە هەندێ لـە ناوەرۆکیـان ئاشـکرا دەبێ «بەربانـگ» ڕەمـزی شـەفەقێکی تازەیـە، لە دایکبوونـی کۆمەڵێکی نوێ. ئـەو ڕۆژە تازەیـە تەنیـا بەسـەر کـوردی ئـەوێ هەڵنەهاتـووە، بەڵکو لە ئاسـۆی خاکـی هەموو نەتەوەکانـی ڕووسـیا سـەری دەرهێنـاوە. ئینجـا «ژینا بەختـەوەر». ژیانـی بەختیاری لـە کۆمەڵێکـی سەربەسـتدا، هەمـوو کەسـێکی گرتۆتـەوە، چونکـە ئەگـەر دەوڵەمەندیـش لـەم کۆمەڵـە نەبـێ هەژاریشـی تێـدا نییـە. عـەرەب لـەو کاتـەی لـە بنجـدا ئـەو ڕۆمانانـەی بۆ ئەوەیە باری قورسـی ژیـان بۆ هەموو ئادەمزادێك سـووك بـکا، ئـەو لە کۆمەڵـی کـوردەواری دەدوێ، بە زمانی کوردی قسـەیان بـۆ دەکا. واتە ناسـیۆنالیزم و ئەنتەرناسـیۆنالیزم تێکـەڵ بەیەکـتری دەکا.

لـە سـاڵی ١٩٦١ ڕۆمانێـك بەنـاوی «کـوردی ئەرمەنسـتان» دەنووسـێتەوە. لـە ڕاسـتیدا ئەمـە سـیناریۆ بـووە بـۆ فیلمێکـی سـینەمایی لـە بابـەت ژیانـی کـوردی ئەرمەنستانەوە، بەتایبەتـی لـە ناوچەکانـی شـاخی ئەلەگـەز و ئاوەدانییەکانـی بنـاری شـاخ و دەشـتی ئەلەگـەز. هەمـوو لایەنـی ژیانـی ئـەو کوردانـە لـە ڕووی کۆمەڵایەتـی و ئابـووری و خوێنـدەواری و ئەدەبـی و هونـەری دەگرێتـەوە.

لـە شەسـتەکانی سـەدەی بیسـتەمدا عـەرەب لەسـەر شـێوازی تایبەتـی خـۆی دەمێنێتـەوە، بـەڵام ئـەوە هەیـە لـە ڕووخسـار و ناوەرۆکـەوە هەسـت بـە گۆڕانـی بەرەوچـوون بـۆ پێشـەوە دەکـرێ. تاقیکردنـەوەی زۆری لـە زمانـی کـوردی، ڕسـتە و تەعبیـر و لێکسـیکۆن و وشـە و زاراوە بـەرەو پێشـەوە دەبـا. هەنـدێ لەو کەرەسـتانە لـە زمانانـی ڕووسـیو ئەرمەنـی وەردەگـرێ، چونکـە ناوەرۆکـی ڕۆمانەکانـی ئـەوە دەخـوازێ. ئـەو لـە بنەڕەتـدا هەرچەنـدە پارێـزگاری ژیانـی کـوردی کـردووە لـە کۆمەڵـی کۆچـەری و کشـتوکاڵیدا، بـەڵام مەبەسـی بنچینەیـی ئەوەیـە مەدەنییەتـی پیشەسـازی لـە کۆمەڵـی کوردەواریـدا بخوڵقێنـێ بـۆ ئـەم مەسـەلەیە پێویسـتی بـە زاراوە و لێکسـیکۆنی زمانێکـی بـەرز هەیـە. لـەم لایەنـەوە تاقیکردنـەوەی عـەرەب لـە پێشخسـتنی زمانـی کـوردی زۆرە بـۆ ئـەوەی زمانەکـە پـڕ بەپێسـتی ناوەرۆکـی ڕۆمانەکـە بـێ.

لـە سـاڵی ١٩٦٦ عـەرەب ڕۆمانـی «دمـدم»ی بـڵاو کـردەوە. ئەمە نموونـەی ئەو هەنـگاوە بـوو ناوەرۆکـی ناسـیۆنالی ببێتـە مەبەسـی سـەرەکی لـە نووسـینی ڕۆماندا و ئەنتەرناسـیۆنالی بـە پلـەی دووەم ببێتـە هەوێنی ئـەو بیروڕایانەی نووسـەر دەریان دەبـڕێ. ئـەوەی ئاشـکرایە ئەوەیـە عـەرەب بیرۆکەی ئـەم ڕۆمانەی لـە ڕووداوێکی مێژوویـی وەرگرتـووە. هـەر ئەوەنـدە پارێـزگاری ڕووداوە مێژووییەکانـی کـردووە ئەوەنـدەی کەڵکیـان هەیـە بـۆ ئـەو ڕووداوە نوێیـەی نووسـەر لـە پێنـاوی داهێنانی ئەدەبییـدا دروسـتی دەکا. بـەم جـۆرە ڕۆمانەکـە کارێکـی داهێنانـی ئەدەبییـە، هیچ

پێوەندییەکی بە زانستی مێژووەوە نییە. نووسەر ڕاپەڕین و بەرگریکردنی خانی لەپزێڕین لە قەڵای دمدم دەکا بە ڕەمز بۆ بەرگریکردن لە هەموو کوردستان. قارەمانان لە دانیشتووانی هەموو هەرێمەکانی کوردستانن. ڕووداو و خۆ ئامادەکردن لە هەموو شار و ئاوەدانییەکانی کوردستان بۆ بەرگری لە قەڵا بەرچاو دەکەون. نووسەر بایەخی زۆر بە هاوسێیانی کورد دەدا، بەلایەوە پێوەندی پێیانەوە پێویستە دۆستانە و ئاشتیانە بێ. بایەخدانی بەئەرمەن زیاتر لەوەوە هاتووە خۆیان لە نزیك ئەوانەوە دەژین، ئەگینا پێوەندی و هاوسێیەتی کورد لەگەڵ تورك و فارس و عەرەب لە ئەرمەن زۆر زیاترە. ئەگەر لە ڕۆمانەکەدا هەندێ دیاردە هەبێ لە ڕووی مێژوو و جوگرافیاوە ناڕاست بێ، کارێکی زۆر ئاساییە، چونکە ڕۆمانی مێژوویی بەگشتی وەك داهێنانێکی ئەدەبی تەماشا دەکرێ نەك تیۆرییەکی زانستی مێژوو.

لە سەرەتای حەفتاکان عەرەب خەریکی نووسینەوەی ڕۆمانی «هالاو» بوو لە بابەت خەباتی کورد لە کوردستانی گەورەدا لە پێناوی مافی نەتەوەییەوە. هەر لەو کاتەدا پڕۆژەی نووسینەوەی ڕۆمانێکی دیکەی دانابوو بە ناوی «گوندی ئێمە»ەوە.

عەرەبی شەمۆ لە ڕیزی یەکەمی ئەو ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەرانە دەوەستێ کە دەوری باڵایان هەبوو لە خەملاندنی خوێندەواری و ڕۆشنبیریی کوردی لە وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا لە سەدەی بیستەمدا. یەکەمین نووسەری کوردە لەو وڵاتە و لە هەموو کوردستاندا کە ڕۆمانی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، تەنیا بایەخی بەم هونەرە گرنگە داوە و لە هەموو نووسەرانی دیکە زیاتر بەرهەمی لەم بابەتەی خستۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

عەرەب تەنیا نووسەر نەبوو، کارگەرێکی زانستی و کۆمەڵایەتی بوو، ئەلفوبێی بۆ کورد دانا، زمانی کوردی بژار دەکرد. ئامۆژگاری لاوانی

دەکرد، فێری سۆزی مرۆڤایەتی و گیانی کوردایەتی دەکردن. هانی خوێندنی دەدان، ڕێگەی بۆ خۆش دەکردن بچن لە وڵاتی دوور بخوێنن. لە ئێسگەی شەمەندەفەر بەڕێی دەکردن بۆ ئەو وڵاتانە. دەسەڵاتی داپڵۆسینی ستالینی بیست ساڵ بە دەستبەسەری ئاوارەی سیبیریای کرد. لە پاشانا وتیان ئێمە هەڵە بووین، هەرچۆنێ بێ ئەوان مردن، بەڵام عەرەبی شەمۆ مایەوە.(١٢)

## • وەزیری نادری

وەزیر کوڕی جەبار کوڕی نادر لە ١٠ی مایسی ١٩١١ لە گوندی بۆرالان لە ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایك بووە. بەپێی دەستووری کوردەواری بە وەزیر نادری لەناو خەڵکیدا ناسراوە. باوك و دایکی لە خێزانێکی کوردی کۆچەر بوون. تەمەنی سێ ساڵ بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. بەمە گوزەرانی دارایی ماڵیان تێك دەچێ. نووورای دایکی ژنێکی بەکار بووە لە ماڵە دەوڵەمەندان کاری کردووە بۆ ئەوەی منداڵی پێبگەیەنێ. ساڵح و یووسفی برای شوانکارە بوون، بەڵام شەرۆ بچووك بوو. دایکی وەزیر لە حوجرەی مزگەوت لەبەر خوێندنی دادەنێ، ماوەیێك دەخوێنێ فێری تورکی و فارسی دەبێ. لە خوێندنەدا زیرەك بووە، لە فێرکردن یارمەتی هاوڕێکانی داوە لە شاگردانی حوجرە. وەزیر لە لای مامۆستا خۆشەویست بووە، لێیەوە نزیك بووە. کتێبی ئەدەبی و دیوانی شێعری خستۆتە بەردەستی. لە سەردەمی قوتابیەتییەوە هەوەسی خوێندنەوەی شێعر و لە دواییدا مەشقی نووسینی بووە.

لە ساڵی ١٩٢٥ لە دوای کارەساتەکەی لە سێدارەدرانی شێخ سەعیدی پیران و هاوڕێکانی، قەڵاچۆکردنی کورد لەلایەن کەمالیەکانەو بەردەوام بوو.

لەو ڕۆژگارە شوومەدا لە ساڵی ١٩٢٦ هەزار و حەوسەد ماڵی عەشرەتەکانی برووکی و شاولیك و بەشك و بانۆکی کورد و هی دیکە لە دەست دڕەندەیی تورکە کەمالییەکان ئاوارە بوون و خاکیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە قەفقاسی ڕووسیا و پەنایان بردە بەر دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان. ماڵی وەزیر یەکێك بوو لەو ئاوارانە.

لە ساڵی ١٩٢٨ وەزیر بووە بە قوتابیی قۆناغی ناوەندی لە گوندی سێردەرەك لە ناوچەی نەخچەوان. ئەم ناوچەیە کۆماری ئەفتۆنۆمی بوو سەر بە ئازربێجان و دانیشتووانی بەروری ئازەری و ئەرمەن و کەمێکیش کورد بوون. ساڵێك لەو قوتابخانەیەی خوێندووە و ئەوجا بووە بە مامۆستای قوتابخانەی گوندی شاوڵیك لەو ناوچەیەدا. لەپاشانا لە ساڵی ١٩٣٣ کارگێڕی ئەو قوتابخانەیەی پێسپێرراوە. لەم کارەیدا زۆر نەماوەتەوە لە پاییزی ئەو ساڵەدا ماڵی گواستۆتەوە یەریڤان و بووە بە مامۆستای تێکنیکۆم و وانەی زمانی کوردی وتۆتەوە. هەر لەو کاتەشدا بۆتەوە بە قوتابی. لە ساڵی ١٩٣٥دا لە ئامۆژگای پەروەردەی ئەرمەنی و ئامۆژگای پەروەردەی ڕووسی بۆتەوە بە قوتابی و لە ساڵی ١٩٣٩ دا هەردووکیانی تەواو کردووە.

لە ساڵی ١٩٤٠ لە زانستگای یەریڤان وتنەوەی زمانی فارسی پێ سپێررا. لەو کاتەی مامۆستا بوو لە زانستگا لە بەشی خوێندنی باڵا خۆی ناونووس کرد و بوو بە قوتابی دوکتۆرا.

نامەی خوێندنی باڵای ئامادە کرد، لەسەر بەرگری کردن بوو لە نامەکەی بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا و لە ڕۆژی ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ بەدەستی نەیارانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی و دوژمنانی کوردەوە کوژرا و کورد فرزەندێکی دیکەی گۆڕەپانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە دەست چوو.

وەزیر جگە لە زمانی دایکی زمانانی تورکی (ئازەری) و فارسی و ڕووسی

و ئەرمەنی و گورجی زانیوە. بەشی زۆری ژیانی بە مامۆستای خوێندنی قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەنجی و ئامادەیی و زانستگا بردۆتە سەر. لە کاروباری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری چالاك بووە. لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا کۆمەڵێك وتار و نووسینی هەمەڕەنگی لە ڕۆژنامەی «ریاتازە»ی کوردی لە یەریڤان بە زمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە. وەزیر دەوری گرنگی بووە لە ناساندنی کورد لە هەموو ڕوویێکەوە بە خوێنەری ئازربێجانی و ئەرمەن بۆ ئەم مەبەسە گەلێ وتاری بەزمانی ئەرمەنی لە ڕۆژنامەی «ئەرمەنستانی سۆڤیەت» و بە زمانی ئازربێجانی لە رۆژنامە و کۆوارەکانی ئازربێجان بڵاوکردۆتەوە.

گرنگترین کتێبێکی پەروەردەیی ئەوەیە کە وەزیر بۆ قوتابیانی داناوە و لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی ئەرمەنستانەوە بڕیاری لەسەر دراوە وەك کتێبێکی سەرچاوە بۆ قوتابخانە کوردییەکان. ئەم کتێبە بەم ناوەوە بڵاو کراوەتەوە «زمانێ کورمانجی ـ زماننامە، ڕاستنڤیسار ـ ئاخافتنا خەبەردانێ ژ ئالییێ مینیستیریا ڕۆنایێ ئەرمەنستانێ هاتیە قەبوول کرنێ» لە یەریڤان لە ساڵی ١٩٤٧ لە چاپ دراوە.

وەزیر یادی پیرۆز و پڕ لە سۆزی لەناو دڵ و دەروونی نێوەندی ڕۆشنبیری کوردی قەفقاسی ڕووسیا لە شاعیر و نووسەر و خوێندەواران بەجێ هێشتووە. بەداخەوە بیری دەکەنەوە ونەفرەت لەو پیاوکوژانە دەکەن کە بوونە نەمانی فرزەندێك کورد هێشتا پێویستی پێی بوو.

وەزیر ئەگەر خوێندەوار نەبوایە دیسانەوە دەبوو بە شاعیرێکی میللی نەخوێندەوار، بەڵام کە بوو بە خوێندەوار شێعری میللیی سەرزاری وەرگێڕایە سەر ئەو جۆرە شێعرەی لە دواییدا شێعری کلاسیکی پێ دەڵێن.

لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم وەزیر دوو بەرهەمی ئەدەبی داهێنراوی گرنگی بڵاو کردەوە:

١ـ کۆمەڵە شێعرێك بەناوی «نوویار»ەوە، ئەم بەرهەمە تاقیکردنەوەیێکی

بەکەڵك بوو بۆ دروستبوونی ئەدەبێکی نووسراوی بەرز لە ناو کوردی ئەو وڵاتە کە لەمەوپێش ئەدەبی نووسراویان نەبوو، بەڵکو خاوەن ئەدەبێکی میللیی سەرزاری جوان بوون.

٢ـ بەرهەمێکی دیکەی گرنگی وەزیر لە ساڵی ١٩٣٥ بەم ناوونیشانە بڵاو کراوەتەوە«ڕەڤا ژنێ، پیەسە بۆنا تاترۆنێ کورمانجا ژ چار پەردە». ئەم بەرهەمە درامایێکی شانۆگەرییە بەناوی ڕەدووکەوتن یا بەدووکەوتنی ژن لە چوار پەردە پێکهاتووە. شاعیر هەوڵ دەدا ناشیرینی و ناهەمواری ئەم ڕەوشتە خێڵەکی و دواکەوتووە لە بەرچاوی خەڵکی کورد ڕەش بکا. ئەوی ڕاستی بێ کوردی ئەو وڵاتە لەو ڕۆژگارەی ژیانی تازەیان دەست پێکردبوو گەورەترین ناگزوورییان نەخوێندەواری و بەدووکەوتنی ژن بوو، ئیتر نەك تەنیا وەزیر بەڵکو بەگشتی بزووتنەوە ئەدەبییە تازەکەیان بایەخی زۆری بەم دوو جۆرە گیروگرفتە دەدا و ڕەنگیان لە ئەدەبی کوردی و شانۆ دابووەوە بە شیعر و پەخشانەوە.

چالاکی ئەدەبی وەزیر لە جەنگی دووەمی گیتیی سەدەی بیستەم لە لووتکەدا بوو، شێعری زۆری دژی بیری نازیزم و فاشیزمی هەڵگیرسێنەرانی جەنگ نووسیوە، ستایشی بەرەی سوێندخۆرانی کردووە بەتایبەتی دەسەڵات و سوپای سۆڤیەتی ئەو سەردەمە. نموونەی ئەم ئەدەبە بەرزەی چیرۆکی شێعری «وەتەن و هزکرن» (نیشتمان و دڵداری) یان «نادۆ و گولیزەر»ە، چیرۆکێکی شێعری درێژە. خۆیان «پۆیێم»ی پێ دەڵێن، لە دە بەش پێکهاتووە. بەرهەمێکە گەلێ هەڵوێستی ناسك لە ژیانی تاکی ناو کۆمەڵ و مرۆڤایەتی دەوورووژێنێ.

وەکو لە ناوی بەرهەمەکە دەردەکەوێ قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکە دوو کەسی کورد نادۆ و گولیزەرن. ئیتر شاعیر ڕێگە بە خەیاڵی شێعری خۆی دەدا بەئازادی لە گیتیی داهێنانی ئەدەبی بسووڕێتەوە. دیارە پێش هەموو شتێك نادۆ و گولیزەر دڵدار و دڵبەرن. ئینجا دەبن بە ڕەمزی نیشتمانپەروەری و جەنگاوەری،

مێـژوو شـانازییانە، ئاشـتی و دێموکراتـی نیازیانـە، لـە سـایەی کۆمەڵـی یەکسـانیدا دەتوانـن دەسـت لـە ملی یەکـتر بکـەن و بەئـازادی بژین.

وەزیـر لـەم کارە ئەدەبییـەدا بایەخـی زۆری بـەو ڕووداوانـە داوە کـە لـە مێژووی کـورددا بـوون بـە ڕەمـزی شـانازی. شـەرەف خانـی بدلیسـی و ئەحمـەدی خانـی و خانـی لەبزێڕیـن و مـەلای جزیـری یـاد دەکاتـەوە. بـەلای ئـەوەوە کـورد تەنیـا دێرینەکـە نییـە. ڕۆژی ئەمـڕۆ کـوردی هەمـوو کوردسـتانەکان لـە تورکیـا و ئێـران و عێـراق و سـووریا وڵاتەکـەی خۆیـان، هەموویـان هەڵسـاونەتە سـەرپێ، لەگـەڵ بـەرەی دیموکراتـی و لـە دژی جەنگخـواری فاشسـتەکان.

شـاعیر گێڕانەوەی ڕووداوەکانی بە قسەی نەسـتەق و پەندی پێشینیان و بیروڕای دانایانـە ڕازاندۆتـەوە. ڕەچـاوی ئـەوەی کـردووە زۆرتریـن خەڵکـی کوردزمـان لـە خوێنـدەوار و نەخوێنـدەوار لـە قسـەکانی بگەن و مێشـك و خەیاڵیـان بجووڵێنێ.

وەزیر پێشەکی چیرۆکەکەی بەم دێڕە شێعرانە دەست پێ دەکا:

خولی دنیە بۆنا هەر بەنی ئینسان
هەر تشت ژێیە ئو مرن هەر زەمان
وەلات باڤە نە تەنێ فرۆتن نە کرین
ئازایی ناڤە کولتوور بۆی تاریفا مێزین
دەرب یا دایانە هوون بکن باوەڕی
ناف بۆی گشکانە خۆف کو نەکە سەرکاری
ئەو شێرێ شێر مێرخاسێ پۆ ناڤدار
تاریفێدا حوبرا زێڕین تێ نڤیسار
عوسمان ژ وێ دا نزلە بۆی سەیرانگێ
ب خوونێ خەملاندییە جێی جەنگێ
بنێرە ستوخار ل عەگیتێ منی ب عەمەل

نادۆیێ کوباری بێ خۆفی بێ عەجەل

•••

با دەعوەتە هێسرێ عەورا ژی باران

هەر شایێ شینەك هەیە هەر ئوسان

تم پێشێ ئینسانە حوب و حەز کرن

شین و شایی ژ هەڤنایێن کرن

بەم وێنە شیعرییە جوان و پڕ مانایانە شاعیر ڕێگە خۆش دەکا بۆ باسکردن لە سۆزی دڵداری لای ئەو کور و کیژە کوردەی ناویان نادۆ و گولیەرە و بوون بە ڕەمزی دڵداری و نیشتمان.

وەزیری نادری یەکێك بوو لە ڕۆشنبیرە بەرچاوەکانی کوردی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا. ئاسۆی بیری فراوان بوو، توانای داهێنانی بەهێز بوو، سەری لە سیاسەت و جموجۆڵی نیشتمانپەروەری دەردەچوو، ژیانی کورت بوو بەڵام تاقیکردنەوەی زۆربوو، دایك و باوکی تا پاش لە دایکبوونی ئەویش گوزەرانیان باش بوو. لەدواییدا کەوتنە بەرەی هەژارانەوە. شوێنەواری ژیانی دواکەوتوویی دەسەڵاتی تورکی عوسمانی لە مێشکیدا ماوە. زوڵم و زۆری پیاوکوژە تورکە کەمالییەکانی لە بیر نەچووە. دڵسۆزی ئەو دەسەڵاتەی قەفقاسی ڕووسیا کە لە تیرۆری تورك کەسوکاری ڕزگار کردن، لە پێش چاوە. ئەم هەموو هۆیانە قوتابخانەی بنچینەیی وەزیری نادری بوون. تاقیکردنەوەی ئەم ژیانە تاڵ و تفتە، لەگەڵ خوێندنی بەردەوام و زانینی کۆمەڵێك زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی مامۆستا و نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیرێکی کوردی بەدیمەنی لە وەزیری نادری دروست کرد.[١٣]

• ***مامۆستا وەزیری ئەشۆ***

(نووسەر، ڕۆژنامەوان و مێژووناسی کورد)

مامۆستا وەزیری ئەشۆ، نووسەر و ڕۆژنامەوان و مێژووناسێکی کوردە. ساڵی ١٩٣٤ لە تبلیس لەدایک بووە. ساڵی ١٩٥٣ قۆناخی دواناوەندی لە تبلیس تەواو کردوووە و لە هەمان ساڵدا لە زانکۆی یەریڤان وەرگیراوە و دەستی بە خوێندنی مێژوو کردووە. لە ساڵی ١٩٥٨دا کراوەتە بەڕێوەبەری قوتابخانە. لە ساڵی ١٩٦١ بۆ خوێندنی دکتۆرا لە بواری مێژووی کورددا چووەتە لێنینگراد. هاوشانی پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ و حەجیێ جندی و جەلیلێ جەلیل و زۆر کەسی دیکە، ڕۆڵێکی بەرچاو و کاریگەری هەبووە لەناو کوردانی سۆڤیەتدا. لە ساڵی ١٩٥٥ بۆ ١٩٩٤ نزیک بە ٤٠ ساڵ لە ڕادیوی کوردیی یەریڤان کاری کردووە. هاوکات بەشداریی و هاوکاریی لە ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەوسای سۆڤیەتدا هەبووە. لە ساڵی ١٩٦٣ەوە لە چاپەمەنییەکانی ئەرمینیاش کاری کردووە.

مامۆستا وەزیری ئەشۆ تا ئێستا خاوەنی پێنج کتێبە و یەکەم کتێبی لە ساڵی ١٩٧٦ بەناوی «مزگێنی» بڵاو کراوەتەوە و سەدان وتاری بە زمانەکانی کوردی و ئەرمەنی و ڕووسی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی وڵاتانی سۆڤیەتی پێشوو و ئەورووپا و گۆڤارە ئەدەبییەکانی نووسەرانی ئەرمەنی و ڕووسدا بڵاو کردۆتەوە و کۆمەڵێک کتێبی تری چاپنەکراوی بەڕێگاوەن.

ڕادیۆی کوردیی یەریڤان بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٥٥ دامەزرا و ئەو ساڵە ناوبراو هێشتا خوێندکاری زانکۆی یەریڤان بووە و لە هەمان ساڵدا پەیوەندیی بە ڕادیۆوە کردووە. لەبەر ئەوەی کوردییەکی باشی زانیوە، لەسەر داوای سەرۆکی بەشی کوردی بابەتەکانی ڕادیۆی لە زمانی ئەرمەنییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و ئەوانیش لە ڕادیۆوە دەیانخوێندنەوە و پێشکەشیان دەکرد. هەنگاو بەهەنگاو وتار و شرۆڤەی بۆ ڕادیۆ نووسیوە. هەروەها ئەوساکە شانۆگەریی ڕادیۆیی پێشکەش دەکرا و دوو لەو شانۆگەرییانە لەلایەن بەڕێزیانەوە نووسراون و بێجگە لەوەش هەم وەک ئەکتەر و هەندێک جاریش وەک یاریدەدەری

دەرهێنەر بەشداریی لە شانۆگەریەکاندا کردووە. لە ساڵی ١٩٥٥ تا ساڵی ١٩٩٤ بە گشتیی نزیک بە ٤٠ ساڵ لە ڕادیۆی کوردیی یەریڤان کاری کردووە. لە ساڵی ١٩٨٣ تا ١٩٩٤ ئەندامێکی فەرمیی و یاسایی ڕادیۆ بووە. لە ماوەی ٤٠ ساڵدا بە سەدان وتاری لە ڕادیۆ بڵاو کراوەتەوە.

هاوکاتی کارکردن لە ڕادیۆ، لە ساڵی ١٩٦٣وە لە چاپەمەنییەکانی ئەرمینیا کاری کردووە، جگە لەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامە ئەرمەنی و ڕووسییەکاندا بڵاو کراوەتەوە. یەکەم نۆڤێلی ئەدەبی بە زمانی کوردی لە ساڵی ١٩٥٨ لە ڕۆژنامەی «ڕیا تازە»دا بە ناونیشانی «ئاڵای سوور» بڵاو کردۆتەوە. هەروەها زۆر چیرۆک و وتار و بەرهەمی تری لە ڕیا تازە و گۆڤارە ئەدەبییەکانی نووسەرانی ئەرمەنی و ڕووسدا بڵاو کردۆتەوە. دوای کتێبی «مزگێنی»، لە ساڵی ١٩٨٣ کتێبێکی بە نێوی «دەنگ بێژ کاڵ بوو» بڵاو کردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٨٦یش ڕۆمانێکی بەڵگەداری لەسەر گوندەکەیان نووسیوە. بێجگە لەوە مامۆستا لە ماوەی ژیانیدا چەندین کتێب و نووسراوی بەنرخ و بەپێزی پێشکەش خوێنەرانی کردووە و خزمەتێکی گەورەی بە نەتەوەکەی کردووە.

پەیامی مامۆستا وەزیری ئەشۆ بۆ ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆی کورد لە زمانی خۆیەوە:

لەو دیمانەیەی کە لەگەڵ بەڕێز مامۆستا وەزیری ئەشۆ کراوە، ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نووسەر و کوردناس و ڕۆژنامەوانی کورد:

«بەر لە هەموو شتێک بە کوردی بنووسن و بەر لە هەموو شتێک پێویستە بە زمانی خۆمان ئەدەبیاتەکەمان دەوڵەمەند بکەین. ئەگەر بە زمانی دوژمنەکانمان بنووسن ئەوە بە دەستی خۆمان نەتەوەکەی خۆمان دەتوێنینەوە، ئەوەش واتای ئاوکردنە ئاشی دوژمنانە. دەبێت هەموو کوردێک کوردی بزانێت کاتێک کە تورکەکان دەڵێن زمانی کوردی بوونی نییە، دەبێ لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستەی

تورک تێ بکۆشین و بیسەلمێنین کە زمانی خۆمان هەیە و زمانەکەمان زمانێکی دەوڵەمەندە و بەو زمانە دەتوانین کاری زانیاریی و ئەدەبیات و هەموو کارێک ئەنجام بدەین. ئەوەش گەورەترین ڕەخنەی منە لەو نووسەرە کوردانەی کە بە کوردی نانووسن!

وەک چۆن هەموو نووسەرە کوردەکانی ئەرمینیا بە کوردی دەستیان بە خەبات کردووە و بە کوردییش نووسیویانە، داوایشم لە سەرجەم نووسەرە کوردەکانی باشوور و باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەوەیە بەر لە هەموو شتێک بە زمانی کوردی بنووسن. ئەگەر کوردییەکەیان بەهێز نییە، با کوردییەکەیان بەهێز بکەن و بەرەوپێشی ببەن. وەک چۆن ئەحمەدی خانی دەڵێت: «خۆم خۆمم پێ گەیاندووە». ئەحمەدی خانی گەورەترین دەستکەوتی لە بەکوردی نووسینی «مەم و زین»دا دەبینێت و زۆر دڵی بەوە خۆش بووە کە مەم و زینی بە کوردی نووسیوە. دەبێت هەموومان بە کوردی بنووسین و بە کوردی بیر بکەینەوە و بە کوردی بڵاوی بکەینەوە. دەبێت زمانی هەزاران ساڵەمان لەدەست نەدەین و بەهێزی بکەین و بیکەین بە زمانێکی ستاندارد.[١٤]

(ژیان و بەسەرهاتی مامۆستا، لە دیمانەیەکی دوور و درێژی بەڕێز ڕێناس نەورۆزی لەگەڵ ناوبراو هەڵێنجراوە کە لەژێر سەردێڕی «وەزیرێ ئەشۆ مێژووی کوردەکانی سۆڤیەتی جاران دەگێڕێتەوە» لە ماڵپەڕی دیمانە بڵاو بۆتەوە و بێجگە لەمە زۆر بابەتی گرنگی دیکەشی تێدا باس کراوە)

### • حاجی جندی

(حەجیێ جندی)

حاجی کوڕی جندی جەواری لە ڕۆژی ١٨ی مارتی ١٩٠٨ لە گوندی پەمانچایر لە ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. باوکی لە

بنەماڵەیێکی هەژاری گوندی بووە. لە سەردەمی جەنگی یەکەمی گێتیدا ماڵی باوکی و کەسوکاری لە دەست دڕندەیی تورکی عوسمانی ڕایان کردووە بۆ ئەرمەنستان. لە ماوەی جەنگدا عوسمانییەکان هێرشی جانەوەرانەیان بۆ سەر کوردی ئێزیدی بەهێز بوو. حاجی بە ڕێکوپێکی هەموو قۆناغەکانی خوێندنی بڕیوە، تا ساڵی ١٩٢٦ کۆتایی بە خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هێناوە.لەو ساڵەدا بووە بە قوتابی زانستگای یەریڤان. لە ساڵی ١٩٣٠ باوەڕنامەی کۆلێجی زمان و ئەدەبی وەرگرتووە.

لەم ماوەیەدا بووژانەوە و پەرەسەندنی خوێندەواری لەناو کوردی ئەو وڵاتەدا دەستی پێکردووە. حاجی دەوری گرنگی بووە وەك مامۆستایێك لە مەیدانی وانە وتنەوە و دانانی کتێب بۆ قوتابخانە کوردییەکان. بەهەموو جۆرێك حاجی لە نێوەندی خوێندن و وەرگرتنی زانست و زانیاری دور نەکەوتۆتەوە. هەموو پلەکانی خوێندنی بڕیوە. لە ساڵی ١٩٥٥ بە کارگەری زانستی هەڵدەبژێررێ لە ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستان لە بەشی لێکۆڵینەوەی کوردی دەکەوێتە کار. هەر لەو کاتەدا دەست دەکا بە ئامادەکردنی نامەی دوکتۆرا. لە ساڵی ١٩٦٤ دەبێ بە دوکتۆری پسپۆڕ لە زمان و ئەدەبی کوردیدا. لە دوای ئەوەدا پێوەندی پەیدا دەکاتەوە لە زانستگای یەریڤان و سیمیناری بەشی لێکۆڵینەوەی کوردی بەڕێوە دەبا. لە ساڵی ١٩٦٦ پلەی پرۆفیسۆری پێ دەبەخشرێ و لە زانستگا و ئەکادیمیە جێگەی دیاری دەبێ.

بەهۆی جموجۆڵی زانستی و ڕۆشنبیرییەوە چەند نیشان و میداڵییەیەکی بەرزی وەرگرتووە و لە هەندێ کۆنگرە و کۆنفرانسی زانستی لە ناوەوەی ڕووسیای سۆڤیەت و دەرەوە بەشداری کردووە. کۆمەڵێك وتار و باسی زانستی و ئەدەبی بڵاو کردۆتەوە. پێوەندی بە زانستگا و ئەکادیمیەوە ماوە تا دوایی ژیان لە ڕۆژی ١ی مایسی ساڵی ١٩٩٠ لە یەریڤان کۆچی دوایی کردووە.

حاجی لەگەڵ ئەمینی عەبداڵ و عەرەبی شەمۆ گەورەترین دەوریان لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری هەبووە لەناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. لە قۆناغی یەکەمی مافی خوێندەواری کورد لەو وڵاتەدا (١٩٣٠ ـ ١٩٣٧) حاجی زۆرترین کتێبی قوتابخانەی داناوە. بەشداری هەبووە لەگەڵ مامۆستایانی دیکە و کتێبی بۆ قوتابخانە کوردییەکان نووسیوەتەوە. جگە لەوە بەهاوکاری لەگەڵ دانەرانی دیکە فەرهەنگی ئەرمەنی ـ کوردی (١٩٣٣) بڵاو کردۆتەوە. بایەخی زۆری بە ئەلفوبێی تازەی لاتینی داوە بۆ قوتابیان. هەروەها کتێبی تایبەتی داناوە بۆ خەڵکی بەتەمەن گەورەی بەخوێندەوار.

لە قۆناغی دووەمی مافی خوێندەواری کورد لە ١٩٤٦ەوە تا کۆتایی ژیانی حاجی کۆششی زۆری کردووە بۆ چەسپاندن و بڵاو کردنەوەی ئەلفوبێی کوردی لەسەر بنجی ئەلفوبێی کیریلی کە دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان بۆ نووسینی کوردی دانابوو. زادەی بیری زانستی حاجی لە زانستگا و ئەکادیمیە لە یەریڤان کۆمەڵێك باسی زانستی بوو لە بارەی هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەکان لە گۆڕەپانی کوردناسیدا بەتایبەتی لە فۆلکلۆر. حاجی یەکێ بوو لە گەورەکان لە ڕووی لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە و تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی تێکستی ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) بە شێعر و پەخشانەوە.

حاجی وەکو نووسەر و شاعیرێك ئاگاداری بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی بووە لەو کۆمەڵەدا، وەکو برا گەورە یا ڕیش سپێیێك یاریدەری شاعیر و نووسەرانی داوە، چاودێری کارەکانیانی کردووە، دەوری باڵای بووە لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبیيان. ئەو کتێبە تایبەتیانەی بەرهەمی شاعیر و نووسەرانیان گرتۆتە خۆ. حاجی بەرهەمی خۆی تیایاندا بڵاو کردۆتەوە و سەرپەرشتی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی هەموو شاعیر و نووسەرانی دیکەی کردووە. زۆربەی ئەم کتێبە بەنرخانە لە ساڵانی ١٩٣٥ ـ ١٩٥٩ بڵاو کراونەتەوە. سەرچاوەیەکی

گرنگن بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی لەو وڵاتەدا.

بەرهەمی داهێنراوی حاجی دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١ـپەخشان:بەشی زۆری بەرهەمی بەپەخشان نووسیوە.بۆ ئەمە هونەرە ئاساییەکانی ئەدەبی هەڵبژاردووە، وەکو وتار و چیرۆك و ڕۆمان. بەشێکی ناوەڕۆکی ئەمانە لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگیراون، بەشێکی دیکەی لە داهێنانی خۆیەتی. ئەوەی سەرچاوەکەی دەچێتەوە سەر ئەدەبی میللی، حاجی وەکو خۆی وەری نەگرتووە بەڵکو بەزمانی بەرزی ئەدەبی سەردەم دایڕشتۆتەوە. هەروەها لە هەندێ قارەمانی حیکایەتی میللیی سەرزار ڕووداوی وای دروست کردووە لەگەڵ هەڵسوکەوتی سەردەمدا بگونجێ. بەم جۆرە خوێندەوار لە خوێندنەوەی ئەم جۆرە بەرهەمانەی حاجی دەتوانێ بەپێی ناوەڕۆکیان ئەوانەی ڕەسەن لەئەوانەی وەرگیراو جیا بکاتەوە بۆ بەڵگە لە چیرۆکەکانی حاجی ئەم ناوانە بەرچاو دەکەون: فیریك، دمدم، عەمۆیێ کرمانج و هی دیکە.

گەورەترین ڕۆمانی حاجی بەناوی «هەواری» (بەهاوار گەیشتن) بەیادی پەنجا ساڵەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩٦٧ لە یەریڤان بڵاو کراوەتەوە. نووسەر لەو ڕۆمانەدا لە گرنگی ئەم شۆڕشە دەدوێ نەك تەنیا بۆ نەتەوەکانی وڵاتی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتی. لەناو ئەمانەشدا بەلای نووسەرەوە بۆ کورد گەلێ گرنگ بووە. ئەمە هەر لە ناوی ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێ «بەهاوار گەیشتن» واتە ئەو شۆڕشە بەفریای هاواری کورد گەیشت و ئەو بەشە کوردەی ئەوێ لە چەوساندنەوە ڕزگاری بوو.

٢ـ شێعر: بەرهەمی شێعری کەمە. بەڕوخسار لە بابەتی لیریکە، کێش و قافیەی سیلابی خۆماڵی بەکار هێناوە، زمانی ئاسان و سەردەمانەیە، لە شێعری پەروەردەییەوە نزیکە. لە دەوروبەری ناوەڕۆك و مەبەسی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و نیشتمانی ڕووسیای سۆڤیەتەکان دەسوورێتەوە. لە بەشی کوردایەتییەکەدا سروشتی خاکی

کوردستان سەرچاوەیێکی گرنگە بۆ شاعیر. بەگشتی حاجی لە وەسفدا بەتوانایە. بۆیە وەسفی کەژەکانی ساڵ وەکو زستان و بەهار و هاوین جێگەی تایبەتیان هەیە لە شێعریدا. باسی زۆزان و ژیانی کوردەواری لە گوند و کاری شوانی و ڕەنجبەری و کێڵگە و کشتوکاڵ دەکا. لە بەشی نیشتمانپەروەرییەکەی نیشتمانی سۆسیالیزم لە ڕەمزەکانی دەسەڵاتی ئەو کاتەی دەدوێ. بەشان و باهووی کۆمۆنیزم و کۆڵخۆز و مۆسکۆ و لینین و ئەرمەنستان و گەلێ ڕەمزی دیکەی دەسەڵاتی سۆسیالیزم هەڵدەڵێ.

نموونەیەکی شێعری:

هەی هاڤینێ. جان هاڤینێ
ئەم تێر گەریان ناڤ گولگینێ
مە هەڤرا لیست ل زۆزانێ
ئەم خەبتین ناڤ کۆلخۆزێ

•••

گوورز پەی گورزا مە لۆد کرن
جەە نو گەنم بەرەڤکرن
باغ و بۆستان مە خایکرن
مێرگ و زەڤی ئاڤرەش کرن

•••

حاجی جندی لە ڕۆشنبیرە گەورەکانی کوردی قەفقاسی ڕووسیا بوو، لە زانستگا گەیشتە پلەی پرۆفیسۆری، بوو بە ئەندامی ئەکادیمیەی ئەرمەنستان، مامۆستایێکی سەرکەوتووی قوتابخانە و زانستگا بوو. خاوەنی گەلێ لیکۆڵینەوەی زانستیە لە بابەت کوردناسییەوە. کتێبی قوتابخانە و دەرەوەی قوتابخانەی هەیە. یەکێکە لە زانا دیارەکانی ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر). بەرهەمی ئەدەبی داهێنراوی هەیە لە پەخشان و شێعر. پەخشانی زۆرە لە بابەتی

وتار و چیرۆك و ڕۆمان. بەڵام شیعری کەمە، زۆربەی شیعرەکانی دەچنە خانەی وەسفی سروشت و دیمەنی کۆمەڵی کشتوکاڵی و پیشەسازییەوە.[١٥]

## • جاسمی جەلیل

جاسم کوڕی جەلیل کوڕی ئۆسێ لە گوندی قزل قولی ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بووە. ئەو گوندە و ئاوەدانییەکانی دیکەی دەوروبەری هەموویان کوردی ئێزدی بوون لە عەشیرەتەکانی نوتی و چیلی سەربە عەشرەتی سپیکی. ناوی باوکی جاسم کە جەلیل بوو لەدواییدا بوو بە لەقەب بۆ منداڵانی جاسم و نەوەی ئەوەوە. باوکی جاسم ڕەنجبەر بوو، هەندێ مەڕ و ماڵاتیان هەبوو. ئەگەر سیاسەتی تیرۆری تورك بەرامبەر کورد نەبوایە ئەو خەڵکە لەو ناوچانەدا دەیانتوانی ئاشتییانە و بەئارامی بژین.

لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی گیتی لە ساڵی ١٩١٨ و بەزینی سوپای عوسمانی لە جەنگدا سەربازی قەومی شۆڤێنی تورك هێرشیان بردە سەر ئەو ناوچەیە بۆ ئەوەی شوێنەواری کوردی تێدا نەهێڵێ. هەموو خەڵکی ناوچەکە کەوتنەخۆ لە پێناوی ڕزگارکردنی گیانیان، سەربازی تورك بەدوایانەوە بوو. لەدوای کوشتارێکی زۆر لەو خەڵکە ئەوانەی لەژیاندا مابوون، گەیشتنە ئاوەدانییێك ناوی بۆزبر بوو لە قەراغ ڕووباری ئاوارەش لە نزیك ئەلەگەز.

لە پاشانا خەڵکەکە لە گوندەکانی ناوچەی ئەشتەرەك نیشتەجێ بوون. لەم کارەساتەدا جاسم لە کەسوکاری دابڕا. ئەوەی کوژرا و ئەوەی لە ڕووبارا خنکا، ئێستا و ئەوساش کەسێکی لەوانە نەدۆزییەوە. لەو جێیەدا جاسم وێڵ و سەرگەردان و بێ داڵدە بوو، لە شوێنێك بۆ شوێنێك لە پارووی نان دەگەڕا. لە ساڵی١٩١٩ ڕووی کردە شاری ئەلێکساندرا پۆل لەوێ هەتیوخانەیەکی ئەمەریکی لێ بوو. ئەمە دەسکەوتێکی گرنگ بوو لە ژیانی جاسم. هەر لەو

ساڵەدا دەستی کرد بە خوێندن لە قوتابخانەی هەتیوخانەکەدا. لە ساڵی ١٩٢٣ هەتیوخانەکە گواسترایەوە شاری ستیپانەڤان. لەدوای دوو ساڵ واتە لە ساڵی ١٩٢٥ جاسم پێنج ساڵی سەرەتایی خوێندبوو. لەو ساڵەدا دەسەڵاتی تازەی سۆڤیەتەکان هەتیوخانەکەی لە ئەمەریکاییەکان سەندەوە. لەو ماوەیەدا جاسم ناچار بوو کارێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. بوو بە شاگردی میکانیکی کارەبا. لە ساڵی ١٩٢٦ ڕووی کردە شاری یەریڤان و دەستی بە کارکردن کرد لە پیشەسازی کارەبا. بەهۆی ئەم کارەیەوە وەکو کرێکارێك توانی خۆی لە پارتی کۆمۆنیست نزیك بکاتەوە. لە ساڵی ١٩٢٧ ناردیانە باکۆ بۆ خوێندن لە قوتابخانەی سوپایی پڕوپاگەندەی پارتی کۆمۆنیست تا ساڵی ١٩٣٠ لەوێ مایەوە. بۆ چەند مانگێکیش چووە شاری تفلیس و خوێندنی ئەو قوتابخانەیەی لەوێ تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٣١ گەڕایەوە یەریڤان و بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەی پەروەردەی کوردی پێ سپێردرا، زۆر لەو کارەیدا نەمایەوە. لە ساڵی ١٩٣٢ خەریکی لایەنی تەکنیکی دەرهێنانی چاپەمەنی بوو.

لەو سەردەمەدا دەسەڵات بایەخی بە چاپکردنی کتێبی قوتابخانە و بە گشتی کتێبی کوردی دەدا. جاسم لەگەڵ دەستنووسی کتێب دەژیا. لەڕاست نووسین و هەڵەچنی شارەزا بوو، ئیتر لەگەڵ ئەو دەسنووسە دەبوو تا وەك کتێب دەگەیشتە خوێنەر.

لەساڵی ١٩٣٨ ـ ١٩٤١ بوو بە قوتابی ئامۆژگای مامۆستایان لەیەریڤان. لەگەڵ دەسپێکردنی جەنگی دووەمی گیتی، ئەوان جەنگی گەورەی نیشتمانی پێ دەڵێن، وازی لە خوێندن هێنا. لە ساڵی ١٩٤٢ بوو بە مووچەخۆر لە دادگا، لەو کارەیدا تا ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بوو. لە ساڵی ١٩٥٤ کە بەشی کوردی لە ڕادیۆی ئەرمەنستان کرایەوە، بەشی مۆسیقا و گۆرانی و فۆلکلۆر بە جاسم سپێررا. لەبەر ئەوەی شارەزای مۆسیقای فۆلکلۆری کوردی بوو و بلوێرژەنی چاك بوو لەگەڵ تیپی مۆسیقا بلوێری دەژەنی. تا دوایی شەستەکانی سەدەی بیستەم پێوەندی بەم

دەسگا ڕاگەیاندنەوەیەوە مابوو.

جاسم لە ژیانیدا تەمەنی نەوەد ساڵی بردەسەر، بۆیە ماوەی خانەنشینییەکەی درێژ بوو. لە ساڵی ١٩٩٨ لە شاری یەریڤان کۆچی دوایی کرد.

جاسم ئەگەر خوێندەواریش نەبووایە دەبوو بە شاعیرێکی میللیی سەرزار، وەکو هەموو ئەو بەرهەمە میللییەی سەرزار بەکێکی نەخوێندەوار دایهێناوە. لەپاشانا ناوی خاوەنەکەی ون بووە. جاسم لە منداڵییەوە لە گوند هەستی شاعیری بووە. توانیویەتی شێعر بنووسێ، بەڵام لەبەر ئەوەی خوێندەواری نەبووە یەکەمین شێعری کەوتۆتە ئەو سەردەمەی فێری خوێندن و نووسین بووە ،لەساڵی ١٩٣٢ شێعرەکەی لە ڕۆژنامەی «ڕیاتازە» بڵاو کردۆتەوە. جاسم وەك شاعیرانی دیکەی کوردی قەفقاسی ڕووسیا لیریك و پۆیێمی ڕووسی وەك ژانرێکی شێعری کاریان لە بەرهەمی کردووە.

جاسم شێعری زۆرە، لە کۆمەڵە کتێبێکدا بڵاوکراونەتەوە، لەوانە «ڕۆژی من» (١٩٦٠)، «کەلامێ چیا» (١٩٧٠)، ئۆدا کوردا (١٩٧٥)، کۆفیا دیا مِن (١٩٨٤).

شێعری جاسم لەڕووی ناوەڕۆکەوە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەوارییە لە سەدەی بیستەمدا لە قەفقاسی ڕووسیا، بەتایبەتی ئەرمەنستان. لە ژیانی تازەی کۆمەڵی سوسیالیستی دەدوێ. نەتەوەی ڕووس و ئەرمەن بە ڕزگارکەری کورد دەزانی. ڕەمزەکانی ئەم دوو نەتەوەیە لە پیاوە ناودارەکان، بە گەورەترین کەسانی سەر ڕووی زەمین لەقەڵەم دەدا، وەسفی شار و هەرێمەکانی ڕووسیا و ئەرمەنستان و گورجستان دەکا. سۆز و خۆشەویستی بێپایانە بەرامبەر فیکری سۆسیالیزم.

لەبارەی کوردەوە جاسم خوێنەری کورد بە کورد دەناسێنێ، مەبەس ئەوەیە هەموو شتێکی کە لە بابەت کوردستانە بچووکەکەی خۆیان «ئەلەگەز»ی

وتـووە. زانیارییەکـە بیـر و هۆشـی کـوردی ئـەو وڵاتـە ڕوون دەکاتـەوە. بەتایبەتـی ئـەو شـێعرانەی دەچنـە خانـەی شـێعری پەروەردەییـەوە (دیداکتیکـی)، لـەم جۆرە شـێعرەی یەکجـار زۆرە. بەقسـەی خۆیـان «قیـزی ئـەوێ» واتـە کچی کورد لەسـەر زاری شـاعیر ناکـەوێ. شـاخ و کانـی و ئاو و بەهار و شـوان و خـورت و کۆڵخۆز و زۆزان و زۆری دیکـە شـێعریان داگیـر کـردووە. کورد و کوردسـتان وێنـەی زۆرە لە شـێعری جاسـمدا، ڕەنگـە هەنـدێ لـە ئەرمەنسـتان و ڕووسـیا کەمـتر بـێ.

نموونەی شێعری:

کیژۆڵەییک ئەو کوڕەی خوشی دەوی دەڵێ.

ئەز دەسترێم شەڤـو رۆیێ سەڤاتە

برۆ، بژانگ من کلدانە سەڤاتە

خورتێ نازك! خورتێ توورە زوو وەرە

من پەڤ دۆتیە، شیر کەلاندییە سەڤاتە

تۆ ئو نڤیشك من هلدایە سەڤاتە

دو شەڤە من خەو ل چەعڤا هەرماندییە

خورتێ نازك! خورتێ توورە سەڤاتە

کیژۆڵەیەکـی نازەنینـی سـاکار لـە یەکـێ لـە گوندەکانی بنـاری شـاخی ئەلەگەز ئـەوەی لەنـاو دڵیـدا هەیـە، دەری دەبـڕێ. ئـەم جـۆرە ناوەڕۆکـە لـە ئەدەبـی کـورد دەرەوەی قەفقـاس بەرچـاو ناکـەوێ...

... جاسـمی جەلیل خوێندەوار و شـاعیرێکی بەکاری کوردی وڵاتی قەفقاسـی ڕووسیایە. شـاعیرێکی خۆڕسـکە، بەشـێ لە شـێعری ئەگەر نـاوی بەسـەرەوە نەبێ کـەس نازانـێ ئەو خاوەنیەتی. شـێعری لە هەمـوو ڕووییێکەوە نموونـەی تێکەڵاوی شـێعری میللیـی سـەرزار و شـێعری لیریکـی و پۆیێمی سـەردەمی ئێسـتای هەموو

نەتەوەکانە. ژیانی لە بڵاوکردنەوەی کتێب و چاپەمەنی خەرج کردووە. لە چاپخانەکاندا وەك کارگەری تەکنیکی کاری کردووە. لە هەموو ئەو کۆمەڵە تێکستە فۆلکلۆرییە گرنگانەی لەو وڵاتەدا بڵاو کراونەتەوە بەشداریکردووە. لە کۆکردنەوەی تێکستەکان و دەرهێنانی کتێبەکان لە رووی هونەرییەوە کۆششی ئەو لەبەرچاوە. بەشێك لە سامانی نەتەوەیی ئەو بابەتە شێعرەیە بە شێوازێکی نوێ دایڕشتۆتەوە. بەگشتی جێ پەنجەی جاسم لە پێشخستنی ڕۆشنبیری کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا لە بەرچاوە. [١٦]

## • پرۆفیسۆر ئۆردیخان جەلیل

پرۆفیسۆر ئۆردیخان جەلیل، نووسەر، توێژەر و زانای ناوداری کورد لە بەشی ڕۆژهەڵاتناسی و زمانناسییەو ئێستا سەرۆکی کورسی ڕۆژهەڵاتناسیی زانکۆی سێن پێترزبورگە. ناوبراو زیاتر لە ٦٠ کتێب و دەیان وتاری چاپ و بڵاو بۆتەوە.

ئەو زانا کوردە لە ساڵی ١٩٣٢ لە شاری یەریڤان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. دایك و باوکی لە کرمانجەکانی تورکیا بوون کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٤ تا ١٩١٥ بەرەو ئەرمەنستان کۆچیان کردووە. خوێندنی سەرەتایی لە یەریڤان تەواو کردووە. ساڵی ١٩٥٢ چۆتە زانکۆ و بەهۆی هۆگریی زۆری بە ئەدەبیات، خوێندنی لە ڕشتەی ئەدەبیاتی ئەرمەنیدا درێژە پێداوە.

هەستکردن بە کوردبوونی خۆی و باووباپیرانی و هەبوونی پشتیوانێکی دەوڵەمەندی ئەدەبیاتی زارەکی، ئەو پرسیارە لای ناوبراو دروست دەکا کە بۆچی ناتوانێ لە بەشی کوردیدا درێژە بە خوێندن بدات.ئەوەبوو کە دوای تەواوبوون لە خوێندن لە ساڵی ١٩٥٧ دەسبەجێ دەچێتە زانکۆی سێن پێترزبورگ و لەوێ خوێندنی تا پلەی دۆکتۆرای زمان و ئەدەبیاتی کوردی درێژە پێدەدا.

لە کورسیی ڕۆژهەڵاتناسی سێن پێترزبۆرگ زاناگەلێکی ناودار هەبوون کە

بەڕاستی خزمەتیان بە مێژوو و ئەدەبیاتی کوردی کردووە. پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ، پرۆفیسۆر ڕۆدینکۆ و ... لەو توێژەرە ماندوونەناسانە بوون کە لە بواری کوردەکانی خوراسان توێژینەوەی زۆریان کردووە.

بەڕێز ئۆردیخان، بیجگە لە ئەدەبیات و مێژووی کوردەکان کە تا ئێستا زیاتر لە شەست کتێبی لەم بوارەدا چاپ کردووە، لەبواری مۆسیقای کوردیش توێژینەوەی زۆری کردووە. لە تەمەنی سی و دوو ساڵیدا، واتە لە ساڵی ١٩٦٤ کتێبی شێعرەکانی (شێعرەکانی کوردەکانی ناوچەی خۆیان) چاپ دەکات.[١٧]

### ● حەسەن حاجی سلێمان

حەسەن حاجی سلێمان لە ٢٦ی نوامبەری ساڵی ١٩٥١ی زایینی لە گوندی تایتان (واناشن) لە ناوچەی ئارارات لە کۆماری ئەرمەنستان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ئەو سێیەمین منداڵی بنەماڵەی کورد ـ چاپانە. سەردەمی منداڵیی لەنێو سروشتی دڵگیر و ناوچەی کوێستانیدا بەسەر بردووە. باوکی، گۆرانبێژێکی خۆشەویست و بەناوبانگی ئەو ناوچەیە بوو، بەڵام زۆر زوو کۆچی دوایی کرد و پێنج منداڵی سەروپێچکەی بەجێهێشتن. دەرفەتی ئەوەی نەبوو عەشقی قووڵی بە نەتەوە و کولتووری ڕەسەنی فێری منداڵەکانی بکات.

لەو کاتە بەدواوە، دایکیان فاتیمە، بە تەنیایی منداڵە هەتیوەکانی گەورە کردن. حەسەن ٤ ساڵە بوو. چیرۆك، ئەفسانە و پەندی پێشینانی زۆر جوان لە دایکی فێر بوو. بەم شێوەیە ئەو لەگەڵ فۆلکلۆری کوردی ئاشنا بوو. بێشك ئەم ئاشناییە کاریگەرییەکی زۆری لە شکڵگرتنی ڕوحییەی هەستیار، حەزکردن بە زمانی زگماکی و داهێنانە ئەدەبییەکانی حەسەن هەبوو.

لە ساڵی ١٩٧٥ خوێندنی لە پەیمانگای زمانناسیی دامەزراوەی دەوڵەتیی بارهێنانی مامۆستایان لە ئابوونیای یەریڤان تەواو کرد. بۆ ماوەی چەندین ساڵ

لـە قوتابخانەکانـی ئامادەیـی خەریکـی وتنـەوەی زمـان و ئەدەبیاتـی کـوردی و ئـازەری بوو.

لە سـاڵی ١٩٩٢ حەسـەن حاجی سـلێمان بوو بـە هەواڵنێری ناوچەیـی بڵاوکراوە کوردییەکانـی گۆڤـاری «نۆبـەر» و ڕۆژنامـەی «کوردسـتان» کـە لەنێـو کوردەکانـی وڵاتانـی هاوبەرژەوەنـد و قەزاقسـتاندا بـڵاو دەبـۆوە. شـاعیر وتـار، نامیلکە، شـێعر و کورتەچیرۆکەکانـی لـە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانـی وڵاتانی هاوبەرژەوەند: ئەرمەنسـتان، ئازەربایجـان، ڕووسـیا، کازاخسـتان و هەروەهـا لـە دەرەوە: ئەڵمانیـا و تورکیـا بـڵاو دەکردەوە. ئەو شێعرەکانی شاعیرە دیار و ناودارەکانـی کازاخ وەك: کونانبایف، جامبول جابایف، سـیفولین، ئەلیاس ژاسـنوگوروف و موکاگ عەلی مەکاتاییفـی بۆ سـەر زمانـی کـوردی وەرگێڕا.

حەسـەن حاجـی سـلێمان لـە سـاڵی ١٩٩٤ بـوو بـە ئەندامـی یەکێتیـی ڕۆژنامەنووسـانی کازاخسـتان (قەزاقسـتان) و لـە سـاڵی ٢٠٠٥ بوو بـە ئەندامی یانەی نێونەتەوەیـی قەڵـەم . لـە ١٤ی مـەی ٢٠١٢ لـە دانیشـتنی پلێنۆمـی ئەنجومەنـی نووسـەرانی کازاخسـتان، بابەتـی وەرگرتنی ئەندامـی نوێ لە پێکهاتـەی ئەنجومەن تاوتـوێ کـرا. ٩ بەربژێـر لـە ١٠٠ داواکارەکـە وەرگیـران کـە یەکێك لەوان حەسـەن حاجـی سـلێمان بـوو. بـەم شـێوەیە بـۆ یەکەمجـار، شـاعیرێکی کـورد لە مێـژووی حەفتـا سـاڵەی کوردەکانـی کازاخسـتان بـوو بـە ئەندامـی ئەنجوومەنی نووسـەران.

لـە سـاڵی ١٩٩٥، یەکەمیـن کۆمەڵەشـێعری ناوبـراو بـە نـاوی «دڵـی مـن» بـڵاو کرایـەوە و سـاڵی دواتـر دووەمیـن کۆمەڵەشـێعری «تینـووی وەتـەن» بـڵاو بـۆوە. لـە سـاڵەکانی ٢٠٠٩ کتێبـی واتە«ژیانـی بەنـرخ»، ٢٠١١ چوارەمیـن کتێبـی «ناڵـەی دڵ» بـڵاو کرانـەوە. لـە سـاڵی ١٩٩٨ ەوە حەسـەن حاجـی سـلێمان سەرنووسـەری ڕۆژنامـەی «کوردسـتان» (لـە ئێسـتا «ژیانی کورد»)ـە. لەو کاتـەوە، خوێنـەران نەك تەنیـا وەك شـاعیر، بەڵکـو وەك ڕۆژنامەنووسـێکی بەتوانـا دەیناسـن.

ناوبراو کورتەچیرۆکەکانی «بەدبەختیی گوندنشینێك»، «لە دۆڵی زیلان»، شانۆنامەکانی «شێخ سەعید»، «شێخ مەحمودی بەرزنجی» و هەڵبەستەکانی «دایکی من» و «ژیان لە خەبات دایە»ی نووسیوە.

حەسەن حاجی سلێمان لەنێو کوردەکانی سنووره دوور و نزیکەکان ناوێکی ناسراوە. ناوبراو پێگەیەکی بەنرخ و بەرزی لەنێو شاعیران و نووسەرانی مۆدێرنی کورددا هەیە. ئەو درێژەدەری نەریتەکانی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردەکانە.[18]

حەسەن حاجی سلێمان، شاعیر و نووسەری کورد لە کازاخستان، لە ماڵی خۆیدا کۆمەڵێك

وێنە و کەلوپەلی کۆنی کوردانی کۆ کردۆتەوە کە وەك مۆزەخانەیەکی بچووك دەچێت

(لە تەلەویزیۆنی ڕووداو وەرگیراوە)

- ***قاچاغی مراد***

قاچاغ کوڕی مراد کوڕی شەباب لە ساڵی ١٩١٤ لە شاری قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایك بوو. تەمەنی چوار ساڵان بووە کە سوپای عوسمانی بەزیوی جەنگی یەکەمی گیتی لە ساڵی ١٩١٨ هێرشە دڕندانەکەی بردە سەر کوردی ناوچەی قارس. ماڵی باوکی ڕوویان کردە ئەرمەنستان و لە ناوچەی ئەلەگەز جێگیر بوون. قاچاغی منداڵ بەختی یار بوو، لەو ناوچەیە زۆر نەمانەوە و باریان کرد بۆ شاری تفلیس پایتەختی گورجستان. دە ساڵ خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە قوتابخانەی ڕووسی ژمارە ٤٧ لە تفلیس تەواو کرد. ئینجا بۆ ئەوەی قۆناغەکانی زانستگایی تەواو بکا ڕووی کردە یەریڤان. لە پێشانا سێ ساڵ بوو بە قوتابی لە ئامۆژگای زمان و ئەدەبی ڕووسی لە یەریڤان، ئەوجا ئامۆژگای ئامادەکردنی مامۆستایانی زمانی کوردی لەو شارەدا گەیاندە

ئەنجام. لـە دوای ئەمە دوو سـاڵ مامۆسـتای قوتابخانەی سـەرەتایی بووە لە شـاری لینینـەکان لـە ئەرمەنسـتان.

لـە سـاڵی ١٩٣٩ قاچـاغ لـە ڕێکخـراوی لاوانـی لینینـی بـوو. لەو سـاڵەدا بـوو بە پارتیـزان و دەسـتیکرد بـە مەشـقی جەنگـی پارتیزانـی. لـە سـاڵی ١٩٤١ کـە ئەڵمانیا هێرشـی بـردە سـەر ڕووسـیا لـە توانایـدا بـوو لـە هێڵەکانـی ئـەو جەنگـەدا دەوری باڵای بیـێ. لـە بەشـێکی زۆری خاکـی چیکۆسـلۆڤاگیا لـە ڕیـزی سـوپادا بـوو، لە داگیرکردنـی شـاری بەرلیـن یەکێـك بـوو لـەو سـەربازانەی بەیداغـی سڤاسـتیکای ئەڵمانیای نازییان سەرشۆر کرد. لە دوای جەنگ قاچاغ تا ساڵی ١٩٥٨ لە سوپای سـووری ڕووسـیا مایـەوە. لـەو سـاڵەدا بـۆ مـاوەی سـاڵ و نیوێـك لە بەشـی کوردی ڕادیـۆی یەریڤـان کاری کـرد. لـە سـاڵی ١٩٥٩ گوێزرایەوە بـۆ ڕۆژنامـەی «ڕیاتازە» و بـوو بـە ئەندامـی دەسـتەی نووسـەران. نـاوە نـاوە دەبـوو بـە سەرنووسـەر، چونکە ئەندامانـی دەسـتەی نووسـەرانی ڕۆژنامەکـە یـەك لـەدوای یـەك هەریەکەیـان بـۆ ماوەیێـك دەبـوون بـە سەرنووسـەر بەم جۆرە قاچـاغ لـەو ڕۆژنامەیـەدا کاری کرد تا سـەردەمی خانەنشـینی و کۆتایـی ژیانـی.

قاچـاغ لـە جەنگـدا دووجـار برینـدار بـووە، شـەش میدالیـای وەرگرتـووە بەرزترینیـان میدالیـای «ئەسـتێرەی سـوور». بەهـۆی ئـەوەوە زۆرتریـن مـاوەی ژیانـی خەریکـی کاروبـاری ڕۆژنامەگـەری بـووە، پێوەنـدی بەچـاپ و چاپەمەنـی بەهێـز بـووە. لـە ئامادەکردنـی کتێبـی هاوڕێیانـی بـۆ چـاپ یارمەتیـی زۆری داون بـە پێشـەکی نووسـین و پێداچوونـەوە و بژارکـردن. کۆششـی قاچـاغ لـە هەنـدێ نووسـینی سـەمەندی سیابەندۆڤ و میکایلـی ڕەشـید و حاجیی جنـدی و کارلینی چەچانـی و هـی دیکـە دیـارە. زانینـی کـوردی و ڕووسـی و ئەرمەنـی و گورجـی و ئـازەری بە خوێندن و نووسـین یارمەتـی داوە لە هەموو کاروبارێکـی خوێندەواری سـەرکەوتوو بـێ.

لەدوای ژیانێکی پڕ لە خزمەتی ڕۆشنبیری و داهێنانی ئەدەبی قاچاغ سامانێکی ڕەنگین و بەکەڵکی بۆ نەتەوەی بەجێ هێشت کە لە ساڵی ١٩٩٢ لە شاری یەریڤان کۆچی دوایی کرد.

قاچاغ لە منداڵییەوە هۆگری ئەدەبی میللیی سەرزاری دەوڵەمەندی کوردی بووە. خوێندەواری تازە و بینینی شاری گەورە و زانینی زمانی زۆر زەمینەی بۆ خۆش کردووە دوری گرنگی بیێ لە پێشخستنی ئەدەبی کوردی تازە لەدایکبووی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا. شێعری هەمووی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی کێشە درێژەکانە، کێشە برگە زۆرەکان کەرت دەکا. لە قافیەدا شارەزایە. بەگشتی شێعری لە ڕووی قافیەوە لەسەر دەستووری «شێعری نوێ» دەڕوا، واتە قافیەی زۆری ڕەنگاوڕەنگ. قاچاغ هەوڵی داوە بۆ ڕەوانی ڕیتم و ئاهەنگ شێعری لەسەر بنچی یەکێتی قافیە داناوە. ئەمە لە لای ئەو لە بێگانە وەرنەگیراوە، بەڵکو داهێنانی خۆیەتی.

یەکێ لە ئەدگارە گرنگەکانی شێعری قاچاغ ئەوەیە هەوڵی داوە زمانی شێعر دەوڵەمەند بکا بەوەی گەلێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی پێوەندی بەکۆمەڵی پیشەسازییەوە هەیە هێناویەتیە ناو شێعرییەوە. بەمە هەندێ لەو شێعرە نووسراوە مومتازەی لە شێعری میللیی سەرزار دوور خستۆتەوە و ئەم جۆرە شێعرەی بۆنی مەدەنییەتی لێ دێ. ئەمەو جگە لەوەی زاراوەیێکی تازەی زۆری بەکار هێناوە کە پێوەندییان بەژیانی سۆسیالیزمی ئەو سەردەمە بووە کە کوردی قەفقاس تێیدا دەژیا.

شێعری قاچاغ بەگشتی لە بابەتی لیریك و پۆیێمە. لیریکەکانی لە ڕووی ژمارەی دێڕەوە کورت و درێژیان تێدایە. هەرچی پۆیێمەکانیش درێژن. بەناوەڕۆك هەندێکیان لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگیراون. بەڵام شاعیر هونەری نواندووە و بەرهەمێکی تازەی دروست کردووە. بەشێکی دیکەی ئەو

پۆیێمانە لە داهێنانی شاعیر خۆیەتی و بەزۆری لە ژیانی کوردەواری وەرگیراون.
لە پۆیێمە جوان و ڕەنگینەکانی ناوی ئەمانە دەکەونە بەرچاو: چیرۆکەکانی میرزا مەحموود (١٩٣٦)، لەیلێ (١٩٤٨)، قادرێ نێچیرڤان (١٩٦٠)، کلاما ئیگریداغێ (ئاگری داغ) (١٩٦٢)، گەلیی عەلی بەگێ (١٩٦٥).

لەبارەی ئەو چیرۆکە شێعرییەی بەناوی «گەلی عەلیی بەگ»ەوەیە قاچاغ دەیووت: لە ساڵی ١٩٦١ەوە کە شۆڕشی ئەیلولی کوردستانی عێراق دەستی پێکرد لە پێشانا وەکو کوردێك، ئینجا وەکو ڕۆژنامەنووسێك، ڕوژانە عەودالی ئەوە بووم هەواڵ و ئاگاو ڕووداوی شۆڕشەکە بیستم. لەدوایدا ئەو هەواڵانە بوون بە ئیلهام و ئەم شێعرە لە دایك بوو.

لەڕووی ناوەڕۆکەوە شێعری قاچاغ هەموو لایەنێکی ژیانی کوردی ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە. بەگشتی هەمووی لە هەناسەیەکی گەشبینییەوە هەڵقوڵاوە و لە ڕەشبینییەوە دوورە. پارێزگای نەریت و خوو و ڕەوشتی کوردەواری کردووە. گیرۆدەی جوانی کچی کوردە. سۆزی بەرامبەر بە ئیدیۆلۆجییەتی سۆسیالیزم قووڵە، ڕزگای کوردی لەو بینیوە. قاچاغ یەکێك بوو لە خوێندەوارە دیارەکانی کورد بەمانا ئینتیلیجێنتە ئەوروپاییەکەی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کوردەوارییەکەی ون نەکردبوو.

قاچاغ بۆ کۆچی دوایی نووسەر و شاعیر وەزیری نادری دەڵێ:

بن شووشێدا دانیە شکلێ وی بەر من
خودانەکە سار داکەتیە ل سەر من
ئەو دکەنە ئەز مرووزم سەبا وی
من دپرسە ئەز نادمێ جابا وی
بەرێدا ئەم برا بوون دل حەلال
نۆلی شرکێ ناڤێ ژ کانیا زەلال

ئەز سوند دخۆم ڤرا ل سەر شکلێ تە
ژ حۆری یا چەتر کەنێ هەرو عەقلێ تە
ب ئەڤینتی وەتەن حزکن شڤێتا تە
مبە سەرکن ئەم هەر جارا نێتا تە

کوشتنی شاعیر و نووسەر وەزیری نادری لە ساڵی ١٩٤٦ لەلایەن دوژمنی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان و نەیارانی کوردەوە ڕووداوێکی گرنگ بوو لەناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. کاری گەورەی کردبووە سەر دڵ و دەروونی خەڵکی. قاچاغ هاوڕێی دڵسوزی وەزیر بوو. لەم لیریکە غەمیەدا ئەڤینی برایەتی لە ناخی دەروونیەوە هەڵدەقوڵێ و بۆ وەزیری دەگێڕێتەوە. خۆی لە ژێر گڵدایە، ناچار بووە لەگەڵ وێنەی گفتوگۆ بکا و بۆی بلاوێنێتەوە.

... قاچاغی مراد شاعیرێکی ڕەند و ڕۆشنبیرێکی بەرچاو و ڕۆژنامەنووسێکی بەکار بوو. ماوەیێکی زۆری ژیانی خوێندەواری لە ڕۆژنامەی «ڕیاتازە» بردۆتە سەر. لە شێعردا یەکێکە لەو شاعیرانەی بەشداری کردووە لە دروستکردنی شێعر لە ناو کۆمەڵی کوردەواری قەفقاسی ڕووسیا. لە پێشانا مەشقی شێعری میللی هەبوو، شێعری لە فۆلکلۆر جیا نەدەکرایەوە. بەڵام لە دواییدا شێعری کوردی گەیاندە ئەو پلەیەی لە دواڕۆژدا دەبن بە کلاسیکی، بە مانای شێعری بەرزی چینی خوێندەوار. قاچاغ لە شێعریدا هەموو کێشە خۆماڵییەکانی بەکار هێناوە، لە قافیە دەوڵەمەندە، لە ڕەوانبێژیدا شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، سوودی لە شێعری بەرزی هەموو ئەو نەتەوانەی زمانیانی دەزانی وەرگرتووە.[19]

## • پرۆفیسۆر جەلیلی جەلیل

دوکتۆر جەلیلی جەلیل نووسەر و توێژەر و فۆلکلۆرناسی ناسراوی کورد و لەدایکبووی وڵاتی ئەرمەنستانە و لە ساڵی ١٩٥٧ خوێندنی باڵای لە بواری

کوردۆلۆژی لە زانکۆی سێن پێتێرزبۆرگی ڕووسیا دەست پێکرد و تا ئێستا کۆمەڵێك بەرهەمی بە زمانەکانی ڕووسی، ئینگلیزی، ئەرمەنی و کوردی پێشکەش کردووە و لەم ڕێگایەدا هاوکاریی بیرمەندانی وەك پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ و خراپات خاجۆ لە پشت بووە و هەر بە هاوکاریی یەکتر لە ساڵی ١٩٦٠ ڕادیۆی کوردیی ئیرەوانیان بەڕێوە بردووە. جەلیلی جەلیل زۆر بەرهەمی بەنرخی بە تایبەت لە بواری فۆلکلۆردا بە تەنیا یان لەگەڵ کەسانی دیکە بڵاو کردوونەتەوە. (٢٠)

بێگومان زانایان و نووسەرانی کوردی کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو زۆر لەوە زیاترن و ئەوانەی باسیشیان کرا، هەڵدەگرێ زۆر زیاتریان لەسەر بنووسرێ و وردتر باسیان بکرێ. کەسانێکی وەك خاتوو جەمیلە جەمیل، خاتوو زەرا یوسف، چەرکز خودۆ بەکائیف، زمانناس ماکسیمێ خەمۆ، خالید چەتۆئیف، فاریزۆف، ئەحمەد مرازی، جەدۆی گەنجۆ، نادۆی خدۆ، میرۆیی ئەسەد، سەمەند سیابەندۆڤ، کارلانێ چەچان، عەمەریکی سەردار و زۆر کەسی دیکە هەر کامیان خزمەتی گەورە و گرانیان بە نەتەوەی خۆمان و تەنانەت نەتەوەکانی دیکەش کردووە و بگرە زۆریان لەسەر ئاستی وڵاتانیشدا ناسراو و ناوبەدەرەوەن، بەڵام لێرەدا تەنیا باس لە ژیان و گوزەرانی ئەو چەند کەسایەتییەی سەرەوە کرا، ئەوەش بە مانای کەمتر ناسراوبوونی کەسانی دیکە یان بێبایەخ بوونی کار و خزمەتەکانیان نیە، بەڵکو تەنیا بۆ خۆپاراستن لە درێژبوونەوەی بابەتەکە، وەك نموونە باسی ژیانی ئەو چەند کەسایەتییە کراوە.

## • سەرچاوەکانی بەندی چوارەم

١. عەلی، ئارام، پەیوەندی نێوان کورد و روسیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئیرە، سلێمانی، ١٩٩٩. ل ١٤٤ ـ ١٤٨.

٢. عەلی، ئارام، س.پ. ل ١٤٨ ـ ١٥٦.

٣. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. بەرگی شەشەم، ل ٤٧ ـ ٥٨.

٤. ئەدەبیاتی کوردی لە ئەرمەنستان، ئامادەکردنی: تۆسنی ڕەشید، ماڵپەڕی دەنگەکان، html.١٧٦٧٥/www.dengekan.info/dengekan/liteature، ١٢ی ئەیلولی ٢٠١٠ .

٥. وەزیرێ ئەشۆ مێژووی کوردەکانی سۆڤیەتی جاران دەگێڕێتەوە، سازدانی دیمانە: ڕێناس نەورۆزی، ٢٠٠٦/٢/١٦، وەرگیراو لە ماڵپەڕی دیمانە.)

٦. بورکای، کەمال، کورد و کوردستان، وەرگێڕانی لە یۆنانیەوە: عەلی فەتحی، چاپی یەکەم، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٦٦.

٧. سەرچاوە: www.vokradio.com/content/view/١٦٢٤/١

٨. ساڵح کەوریری، آشنایی با بزرگان کردی کرمانجی (٥)، .http://dibistan. blogfa.com/post/٥٢، Mon ٢ Jul ٢٠١٢.

٩. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، دەزگای

چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. بەرگی حەوتەم، ل ٣٥ـ٤٣.

١٠. شاکرۆ_خدۆ_محۆ =http://welat. ٩q&١= www.kurdipedia.org /lng
html.١٢٢٠٠٧-pukmedia/٠٢/٢٠٠٧/blogspot.com

١١. ١٢٨/http://evinebook.blogfa.com/post و www.kurdlaw.net

١٢. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. ٣٦٣ـ ٣٧٠.

١٣. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. ٢٠١ـ٢٠٦)

١٤. وەزیریێ ئەشۆ مێژووی کوردەکانی سۆڤیەتی جاران دەگێڕێتەوە، سازدانی دیمانە: ڕێناس نەورۆزی، ١٦/٢/٢٠٠٦، وەرگیراو لە ماڵپەڕی دیمانە. .http://www. dimane.com

١٥. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. بەرگی حەوتەم، ل ٩١ـ٩٨.

١٦. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. ١٠١ـ١٠٧)

١٧. (٢٠١٠/١/٢٥، https://kurmanjkurdish.wordpress.com

١٨. آشنایی با بزرگان کردی کرمانجی، .http://kurdist.ru/index
٦=php?option=com_content&task=blogsection&id، Sat ٢٣ Jun ٢٠١٢

١٩. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠. ٢٥٧ـ٢٦٥.

٢٠. Title#٢٤٩١١=http://kurdpress.ir/NSite/FullStory/News/?Id

# بەشی دووەم ٢

کوردەکانی دەرەوەی کوردستان

٣. باسی سێیەم

## کوردەکانی ئۆردن

- چەند زانیارییەك لەبارەی وڵاتی ئۆردن
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ ئۆردن
- شوێنی ژیانی پێشوویان (پێش گەیشتنیان بە ئۆردن)
- شوێن و ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان لە ئۆردن
- کورد لە سەردەمە جیاوازەکانی مێژووی ئۆردندا
- ڕۆڵی کورد لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا
- ناودارانی کورد لە ئۆردن
- سەرچاوەکان

### • چەند زانیارییەك لەبارەی وڵاتی ئۆردن

ناوی فەرمی: ئۆردنی هاشمی (بە عەرەبی: المملكة الاردنية الهاشمية) و ناوی نێونەتەوەیی «ئۆردن»ـە و پایتەختەکەی شاری «عەممان»ـە. وڵاتێکی پاشایەتییە لە لێواری ڕۆژهەڵاتی چۆمی ئۆردن هەڵکەوتووە. حەشیمەتی ئەم وڵاتە ٦,٥ ملیۆن کەسە و ٩٨٪ی خەڵکەکەی عەرەبن.

جۆری حکوومەتەکەی پاشایەتیی مەشرووتەیە و پاشای ئێستای مەلیك عەبدوڵڵای دووەمە. یەکەی دراوەکەی دیناری ئۆردنیە.

خەڵکی نەبەتی لە هەزارەی یەکەم و دووەمی پێش زایین لەم ناوچەیە ژیاون. وڵاتی ئۆردن لە ساڵی ١٩٢١ی زایینی دامەزرا و لە ساڵی ١٩٢٢ وەك وڵاتێکی ژێر پارێزگاریی بەریتانیا بە فەرمی ناسرا و لە ساڵی ١٩٤٦ی زایینی سەربەخۆیی بەدەست هێنا.

لەباری جوگرافییەوە: ئۆردن وڵاتێکە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە لە باکوورەوە لەگەڵ سووریا، لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ عێراق، لە ڕۆژهەڵات و باشوورەوە لەگەڵ عەرەبستانی سعوودیا و لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ ئیسرائیل و لێواری ڕۆژهەڵاتی چۆمی ئۆردن دراوسێیە.

ڕووبەری وڵاتی ئۆردن بە شێوەیەکی گشتی بە سەحرای وشك و بوورە داپۆشراوە. بەڵام لە بەشەکانی ڕۆژئاوای هێندێك بەرزایی هەن. لە هێڵی سنووری ڕۆژئاوای ئۆردن، چۆمی ئۆردن هەیە کە ئەم وڵاتە لە ئیسرائیل جیا دەکاتەوە. بەرزترین شوێنی ئۆردن، لوتکەی «جبل رم» (١٧٣٤ مەتر) و نزمترین شوێنیشی دەریای مردوو (بحر المیت)ـە. نیشتمانی ئێستاکەی ئۆردن بە بەشێك لە لانکەی شارستانییەتی مرۆیی ناسراوە.

دابەشکاریی نێوخۆیی: ئۆردن لەباری ئیداریی و بەڕێوەبەرایەتییەوە بەسەر ١٢ پارێزگادا دابەش کراوە. هەریەك لەو پارێزگایانە لەژێر ڕێنوێنی و ڕێبەرایەتی پارێزگارن کە لەلایەن پاشاوە دیاری دەکرێن.... پارێزگاکانی ئۆردن بەسەر ٥٢ ناحیەدا دابەش دەبن.

باس لە یاسای بنەڕەتی و سیستەمی یاسایی و یاسادانانی ئەو وڵاتە و پاشای ئۆردن و ڕووداوە سیاسییەکانی و هەروەها شوێنە گشتیارییەکانی و کاریگەریی گرژیی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست لەسەر ئۆردن ناکەین و و

لە چەند دێڕێکدا باس لە حەشیمەت و پێکهاتەی حەشیمەتی ئەو وڵاتە دەکەین:

حەشیمەتی ئەم وڵاتە نزیکەی ٦،٥ ملیۆن کەسە. زۆربەی حەشیمەتی ئۆردن لە وەچەی عەرەبە سارانشینەکانن یان پێوەندیی ئیتنی نەژادییان هەیە کە ٤٠٪ی حەشیمەتی ئۆردن پێك دێنن. لەگەڵ ئەمەشدا ٥٥٪ی حەشیمەتی ئۆردن بە ڕەچەڵەك و بنەچە فەلەستینین کە دوای شەڕی عەرەبەکان و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ی زایینی و شەڕی عەرەبەکان و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٦٧ی زایینی لە فەلەستین هەڵاتن و وەك پەنابەر چوونە ئۆردن و بوونە هاووڵاتی ئەو وڵاتە. ٥٪ی دیکەی حەشیمەتی ئۆردن لە کەمایەتییە نژادییە جۆراوجۆرەکان پێك هاتووە کە بریتین لە سوورییەکان، چیچانییەکان، قرقیزستانییەکان، ئاشوورییەکان، ئەرمەنییەکان و کوردەکان... ژمارەی ئەو لوبنانییانەی کە لە سەردەمی تێکهەڵچوونی نێوان ئیسرائیل و لوبنان لە ساڵی ٢٠٠٦ بۆ یەکجاری نیشتەجێی ئۆردن بوون، تۆمار نەکراوە، بەڵام وا بەراورد کراوە کە ژمارەیان زۆر کەمە.

... ئەو شێوەیەی تۆمار کراوە نزیکەی ٣ ملیۆن کەس وەك پەنابەری فەلەستینی و ئاوارە لە ئۆردن نیشتەجێن کە زۆربەیان بوونە هاووڵاتی ئەو وڵاتە. لە ساڵی ٢٠٠٣ەوە ژمارەیەکی زۆر لە عەراقییەکان کە لە ترسی شەڕ هەڵاتوون، لە ئۆردن گیرساونەتەوە کە تا ئێستاکە سەرژمێری نەکراون.

جێگەی ئاماژە پێدانە زمانی فەرمیی ئەم وڵاتە عەرەبییە، بەڵام ئینگلیزییش تا ڕادەیەك لە کاروبارە بازرگانی و حکومییەکان و هەروەها لەنێو خەڵکی خوێندەوار کەڵکی لێ وەردەگیرێ. فێرکردنی زمانی عەرەبی و ئینگلیزی لە قوتابخانە حکوومیی و تایبەتەکان ئیجبارییە. زمانی فەڕنسیش لە هەندێك لە قوتابخانە دەوڵەتییەکان دەخوێندرێ، بەڵام فێرکردنی بە ناچاری نیە.

**• سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ ئۆردن**

سەرەتای پەیدابوونی کورد لە ئۆردن دەگەڕێتەوە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەیووبییەکان لە سەدەی دوازدە، نزیکەی نۆسەد ساڵ پێش. ژێدەرە مێژووییەکان بوونی کورد لە ئۆردن دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی ئەیوبییەکان و مەملوکییەکان و عوسمانییەکان. ئێستا لە ئۆردن نزیکەی سی هەزار کورد هەیە. ئەو ژمارەیە ئەو کوردانەش دەگرێتەوە کە لە پاش چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەهەم و چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم گەیشتوونەتە ئۆردن و هەروەها ئەو کوردانەش دەگرێتەوە کە ناسراون بە کوردەکانی فەلەستین کە لەپاش نەگبەتی ساڵی ١٩٤٨ و نسکۆی ١٩٦٧ەوە کۆچیان کردووە بۆ ئۆردن.

کوردان لە ئۆردن لەدوای خەڵکی خۆیان کۆنترین خەڵکی ناوچەکەن و ڕۆڵێکی بەرچاو و مەزنیان هەبووە لە مێژووی ئۆردن، ئەوە لە خوارەوەش هۆیەکانی گەیشتنیان بە ئۆردن دیاری دەکەین:

١ـ بەدەنگەوەچوونی پاڵەوانی موسڵمان سەلاحەدینی ئەیووبی بۆ جیهادکردن و بەرگری لە هێرشی سەلیبییەکان لەسەر ئەو ناوچەیە، چونکە یەك ئایینی و خزمایەتی و یەك نەژادی هەبوو لەگەڵ ئەیووبییەکان، کوردەکان بەدەنگ بانگەوازەکە هاتن، تیپی سوپای کوردیان دروست کرد لە سوپای سەلاحەدین، لەوانە تیپی سوپای هەکاری کوردی، سەلاحەدینی ئەیووبی ئەو تیپەی لە (سەلت) نیشتەجێ کرد بۆ چاودێری لە غۆر ئۆردن، کە گەڕەکێکی تایبەت بەخۆیان پێکهێنا و هەندێ لە نەوەکانیان لە سەردەمی مەملووکییەکان چوونە قودس.

٢ـ چوونە ناو سوپای مەملووکی و عوسمانی، بە تایبەت لە سەدەی نۆزدە کە عوسمانییەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست لە ڕۆژهەڵاتی ئۆردن، لە زۆربەی

کارەکانیان سوودیان لە ڕەگەزی کوردان وەرگرت بە تایبەتی لە دەزگای بەڕێوەبردن و دارایی و هێزی سوپایی و ... هەندێکیان لەو شوێنە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە هاوسەریان (خێزانداری)یان پێك هێنا و لەدوای نەمانی دەسەڵاتداری تورکەکان مانەوەی خۆیان بە پەسەندتر زانی لە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان.

٣ـ هاتنیان بۆ ئوردن و بە تایبەتی گەڕەکی کوردان لە دیمەشقەوە بە مەبەستی کاری بازرگانی بوو لەگەڵ فەلاح و بەدووەکانی ئەو ناوچەیە.

دکتۆر (هیند ئەبوو شەعر) دەڵێ: کوردەکان لە دیمەشق چالاکیان نیشاندا لە بازرگانیی مەڕومالات لە ئەناژۆل بۆ بازاڕەکانی ئەربد و کردیانە ناوەندێکی زیندوو و چالاك بۆخۆیان، لە ئاکامی سەرکەوتنی بازرگانی و پەرەسەندنی، نیشتەجێی شارەکانی ئوردن بوون و پەرەیان بە بازرگانی دا.

٤ـ هاتنی خاوەن کار و بەرژەوەندییەکان لە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق بۆ زیادکردنی ئیش وکار بوو لەدوای بنیادنانی میرنشینی ئوردن و کردنەوەی دەرفەتی کاری نوێ و پێویست، وەك سالۆنی سەرتاشخانە و دوورومان وگوڵدۆزی و وێنەکاری و خۆشنووسی.

٥ـ پەنابردن بۆ ئوردن بە مەبەستی ئاسایش و بەرگری بوو، هەڵاتن و بەدواکەوتنیان لە ئاکامی ئەو هەموو ناکۆکی و شەڕانە بوو کە عەشیرەتەکانی کورد هەیانبووە یان لە ئاکامی تێکچوونی شۆڕشەکانی کوردی بووە لە کوردستانی تورکیا وەك شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی و بەشداری کوردەکانی سوریا لە شۆڕشی دژ بە داگیرکەرانی فەڕەنسی کە ناچاری کردن پەنا بۆ ئوردن ببەن بە مەبەستی ئاسایش و دووربوونەوەی لە دەستی داگیرکەرانی فەڕەنسی.

• **شوێنی ژیانی پێشوویان (پێش گەیشتنیان بە ئۆردن)**

سەبارەت بە شوێنی ژیانی پێشوویان دەبێ بڵێین ئەوان لە لقە جیاجیاکانی عەشیرەتە بەناوبانگ و ناسراوەکانی کوردن کە لە هێندێك شوێنی کوردستانەوە ڕوویان لە ئۆردن کردووە بۆ نموونە لە (رکن الدین)ی دیمەشق لە گەڕەکی کوردان، لە ناوچەی جزیرەی کوردستانی سوریا، لە کوردستانی تورکیا و بەشێکیشیان لە کوردستانی باشوور. تەنانەت ئەو نازناوەی ئێستاکەش لە ئۆردن بە دوای ناوەکانیانەوەیە، دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو بنەماڵە و عەشیرەت و ناوچەیەی کە لە بنەڕەتدا بۆی دەگەڕێنەوە بۆ نموونە: دیاربەکرلی (دیاربەکر)، سوێرکی (سوێرك)، ئۆرفەلی (ئۆرفە)، ماردینی (ماردین)، وانلی (دەریاچەی وان و دەوروبەری)، قەیمەری (قەیمەر باکووری عێراق)، زێباری (زێبار) و ... و بەشێکیشیان دەگەڕێنەوە سەر بنەمای عەشایری بەناوبانگی خۆیان وەك ئەیوویی و بەرازی و دێرکی و زازا و ...

لێرەدا وەك نموونە ئاماژە بە شوێنی ژیانی پێشووی هێندێك لە خانەوادە و عەشیرەتە کوردەکانی نیشتەجێی ئۆردن دەکەین:

ــ خانەوادەی عەلی حوسێن کورانی: لە بنچینەدا دەگەڕێنەوە سەر عەشیرەتی (دوکان) لە گوندی (لەغرەمی/ لەگرمی) کە دەکەوێتە نێوان دیاربەکر و ئەرغەنی (ئەرگەنی) لە کوردستانی تورکیا .

ــ خانەوادەی ئیبراهیم حەسەن ئیزۆلی: لە کاتی خۆیدا باپیریان نیشتەجێی گەڕەکی کوردان بووە لە دیمەشق.

ــ عەشیرەتی ئال موراد کوردی: لە بنچینەدا دەگەڕێنەوە سەر کوردەکانی جەزیرە و باپیرە گەورەیان ئەفسەر بوو لە سوپای عوسمانی.

ــ خانەوادەی برووسك کوردی: لەدوای کوژانەوەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە تورکیا لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی، برای موجاهید ئەمین

برووسك کوردی هاتە ئۆردن و نیشتەجێی عەممان بوو. ناوبراو سەر بە عەشیرەتی زەرکانی بووە لە ئەرزەرۆمی سەر بە کوردستانی تورکیا .

ــ خانەوادەی وانلی: لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا باپیریان عیسا دەروێش کوردی لە شاری وان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیا گەیشتە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق، لە چاریەکی یەکەمی سەدەی بیستەم کوڕەکانی چوونە عەممان و لێی نیشتەجێ بوون.

ــ خانەوادەی فەیاز کوردی ئیزۆلی: باپیرە گەورەیان فەیاز ئیزۆلی لە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق هاتووتە سەلت لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لە هێزی پاسەوانی ئۆردنی خزمەتی کردووە.

ــ خانەوادەی بەکر زازا: لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی خەلیل بەکر زازا لە گەڕەکی کوردان لە دیمەشقەوە هاتە ئۆردن و گەیشتە سوپای ئۆردنی بە پلەی ئەفسەر... ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (بدوان) لە دیاربەکر سەر بە کوردستانی تورکیا .

ــ خانەوادەی جومعە ئەیوبی: باپیریان جومعەی ئەیوبی لە دیاربەکر دێتە دیمەشق، لەدوایی دەگاتە سوپای عوسمانی و کوڕێکی دەبێت بە ناوی (محەمەد) کە لە قوتابخانەی عەنبەر خەریکی خوێندن دەبێت، هەروەها بە پلەی یاریدەدەری قایمقامی توفێلە و کەرك دەست بەکار دەبێ لە سەردەمی عوسمانیەکان، لە توفێلە نیشتەجێ دەبێت و ئیش لە شارەوانی دەکات. هەروەها ئیش لە فەرمانگەی نافعە دەکات لە عەممان و ئەربد، ئەو کوڕانەی هەبووە: سەعد، مەدحەت، سەعدەدین، محەمەد، سەلاحەدین، شەمسەدین) کوڕەکانی و خانەوادەی نیشتەجێی پایتەختی ئۆردن بوون، وەزیر و دیپلۆماتی بەناوبانگی زۆر لە بنەماڵەکەیان هەڵکەوت.

ــ خانەوادەی کورد عەلی: ئەو بنەماڵەیە لە سەرەتای سییەکانی سەدەی

بیستەم لە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق ڕا گەیشتنە ئۆردن.

ـ عەشیرەتی بەرازی: باپیریان عەلی کوردی لە ڕەچەڵەکی (کیتکان)ـە کە لقێکە لە عەشیرەتی بەرازی سەر بە ئورفە... هەروەها خانەوادەی دەروێش مستەفا کوردیش لە بنەڕەتدا باپیریان لەدایکبووی شاری ئورفەیە.

ـ خانەوادەی حەسەن عیسا نەقشبەندی: بنەچەیان لە شارۆچکەی (شوز)ی سەر بە سەعرەی پارێزگای دیاربەکرە سەر بە عەشیرەتی (بۆتان)ن.

ـ ئال شێخانی: باپیریان شێخ عەلی ئەحمەد شێخانی لە عێراقەوە چوو بۆ گەڕەکی کوردان لە دیمەشق و دوایی بە مەبەستی بازرگانی لە کۆتایی سەدەی نۆزدە گەیشتە ئۆردن...

ـ خانەوادەی ئاشتی: خالیدی ئاشتی لە شاری وان لە کوردستانی تورکیا گەیشتە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق و دواتر چوونە ئۆردن.

ـ خانەوادەی ڕەسووڵ خدر کوردی: باپیریان ڕوسوڵ خدر کوردی لە ماردین گەیشتە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق و لە دوایی کوڕەکانی بەرەو ئۆردن چوون...

...

کەواتە بە کورتی دەتوانین بڵێین زۆربەی کوردەکانی ئۆردن لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە سەر کوردەکانی ناوچەی جزیرە و گەڕەکی کوردانی شاری دیمەشق و شار و ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستانی تورکیا وەك دیاربەکر، ئەرزەڕۆم، ئورفە، وان و ... هەروەها بەشێکیشیان لە بنەڕەتدا لە کوردەکانی کوردستانی ئێراق بوون.

خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ناو و شوێنی ژیانی پێشوو و ئێستای بنەماڵە و عەشیرەتە کوردەکانی نیشتەجێی ئۆردن دەتوانن لاپەڕەکانی ١٣٢ هەتا ١٧١ی کتێبی (کوردە ئۆردنییەکان و ڕۆڵیان لە بنیادنانی

ئوردنی نوێدا) بخوێننەوە کە زانیاریی زۆر وردی سەبارەت بەم بابەتە تێدایە.

● **شوێن و ناوچەکانی جێی نیشتەجێبوونیان لە ئوردن**

لەم بەشەدا وێرای ئاماژەدان بە ناوی خانەوادە و عەشیرەتەکانی کوردی لە ئوردن شوێنی نیشتەجێبوونیشیان دیاری دەکرێ:

١ـ عەممانی پایتەخت و دەوروبەری: ئاغا، ئومەری، ئال ڕەشی، ئیزۆلی، ئاغاکان، ئال موورادی کوردی، ئێبس، ئەیووبی، ئەبوو ڕەسوول، بارافی، برازۆ، بەرازی، بایریدی، بەدرخان، بابان، بەگداش، برووسك، جەلغۆ، زادە، جومعە ئەیووبی، حەمۆ، خدر، دەقووری، ڕەشوانی، دێرکی، دەروێش کوردی، زەرکانی، زێباری، زەرگەلی، سەیدۆ کوردی (کورانی)، سەعدوون، شلاش کوردی، شەمدین، شێخۆ، شکۆ، قەرەشۆلی، قەیمەری، قاووق، کوردییە، کوردی، کوردعەلی، عەلیکۆ، زازا، کیکی، کورد، ماردینی، دیاربەکرلی، مەدفەعی، مامۆ، مەلا، میللی، بەیرووتی، نەقشبەندی، وانلی، زهنی، بایزید، ئەبوو ئاغا، شێخانی، ڕەشید، ئیمام.

- موقابلین: خانەوادەکانی یاسین کوردی، خدر کوردی، سلێمان کوردی.
- ناعوور: ئەبوو ڕەسوول کوردی.
- بیادر وادی سەیر: کوردی، قەیمەری.
- رجیب: خانەوادەی عەبدوڵڵا یاسین کوردی.

٢ـ پارێزگای زەرقا:

- شاری زەرقا: ئەیووبی، ئاشتی، بەرازی، دەقووری، ئاغا، مەتینی، بارافی، بەیرووتی، ئال ئەیووب کوردی، کورد، کوردی، ئاغاکان، بەگداش، قەیمەری، کوردعەلی، سەعدوون، ئال ڕەشی، دەروێش، ئاغا، کیکی، زازا،

کوردییـە، سـوێرکی، شـوبەك، توفێلـە.

ـ شارۆچکەی ڕەسێفە: کوردی، کوردەکانی لە توفێلە، شوبەك.

٣ـ پارێزگای کەرك:

ـ شاری کەرك: کوردی، ئاغاکان، ئەیووبی.

ـ غۆر سافی: کوردی.

٤ـ پارێزگای مەعان:

ـ شاری مەعان: کوردی (بەرازی)، زەرگەلی.

ـ شوبەك: کوردی.

٥ـ پارێزگای توفێلە:

ـ بەسیرا (بصیرا): کوردی.

٦ـ پارێزگای عەقەبە:

ـ شـاری عەقەبـە: کـورد، کـوردی، زازا، بـەرازی، نێـڕۆخ، ئەبوو زەهـرە، ئەبوو غەلیوون.

٧ـ پارێزگای جرش:

ـ شاری جرش: نەقشبەندی، شلاش کوردی، مەلحەم کوردی، شێخۆ.

ـ شارۆچکەی رێموون: شێخانی، کوردی.

٨ـ پارێزگای عەجلوون:

ـ شارۆچکەی عەین جنا: ڕەشوانی (کوردی).

ـ عنجرە: ئەیووبی.

٩ـ پارێزگای مەفرەق:

ـ مەفرەق و ڕۆیشدو و رەوزە بەسمە و ( پغره الجب): کوردی، بەرازی، زازا.

١٠ـ پارێزگای بەلقا:

ـ شاری سەلت: کوردی، ئۆرفەلی، بەرازی، دەقووری، زازا، کوردییە.

ـ شوفەی باشوور: کوردی.

١١ـ پارێزگای ئەربد:

ـ شاری ئەربد: ئاغا، بارافی، ئەبوو ڕەسوول، شێخۆ، سەعدوون، خدر، عەلیکۆ، دێرکی، کوردی، زازا، شێخانی، مەتینی، ئال موراد، کوردی، ئۆمەری، بەگداش، ئیزۆلی، سوێرکی، میکانیکی، ئەیوبی، میللی، ماردینی.

ـ گوندی سال: ئالووسی (کوردی).

ـ حکما: کوردی.

ـ شارۆچکەی سەمەر: سەعدوون، مەتینی، زازا، کوردی.

ـ شارۆچکەی سەحم کەفارات: بەدرخان.

ـ شارۆچکەی حەرسا: کوردی.

ـ دێر ئەبی سەعید: زازا، دەروێش، ئاغا، سوێرکی.

ـ جەنین سەفا: کوردی.

ـ ناوی هەندێ لە گوند و شارەکانی دیکە کە کوردی تێدایە:

ـ تبنە: سوێرکی.

ـ شوفەی باکووری: زازا، شحێمات (باشتووە)، کوردە چێلەوانەکان.

ـ ئیسکان وادی یابس: کوردی.

ـ مشارع: زازا.

ـ وەقاس: بەگداش.

ـ باقوورە: زازا.

ـ کەریمە: زازا.

ـ تیبیەی باکوور: ئەبوو شەریف.

- سەریح (الصریح): ئیزۆلی.
- جەحفیە: ئەبوو رەسوول کوردی.
- ڕەمسا: سەعدوون.
- عەمراوە: یاسین کوردی.
- حوارە: کوردی.

- **کورد لە سەردەمە جیاوازەکانی مێژووی ئۆردندا**

*ج یەکەم: سەردەمی ئەیووبی ١١٧٢ - ١٢٦٠ ی زایینی*

کوردە هەکارییەکان یەکەمین نیشتەجێی شاری سەلت لە ئۆردن دەژمێردرێن لە سەردەمی ئەیووبییەوە تیپێکی سوپایی بوون لە سوپای سەلاحەدینی ئەیووبی. ئەو تیپە لە شەڕەکانی سەلیبیدا ڕۆڵی تایبەت و مەزنیان بینیوە لە کاروباری شەڕ و بەڕێوەبردن و زانست (فێرکردن). مانەوە و نیشتەجێبوونی ئەو تیپە سوپاییە دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی ئەو شوێنە (سەلت) بۆ سەلاحەدینی ئەیووبی ناوەندێکی شەڕ بووە بۆ ئەوەی چاودێری لە جوجۆڵی هێزی سەلیبییەکان بکەن لە غۆر ئۆردن و لەوێ ماونەتەوە.

لەدوای نیشتەجێبوونی کوردە هەکارییەکان لە شاری سەلت، گەڕەکێکی تایبەت بە خۆیان لەو شارە دروست کرد بە ناوی «گەڕەکی کوردان» کە تا ئێستاش هەر بەو ناوە ماوەتەوە. گەڕەکی کوردان دەکەوێتە سەروی باشووری ڕۆژئاوای قەڵای سەلت، کە دکتۆر محەمەد خرێسان بەو شێوەیەی خوارەوە دیاری دەکات:

لە ڕۆژهەڵاتی شارەوە تا سەری دۆڵی کوردان لە ڕۆژئاوا و، لە بڵندایيەکانی سەرەوەی قەڵات لە باکوور تا دەکاتە گەڕەکی دەبابسە لە باشوور، دراوسێ و نزیك بە گەڕەکی (جەدعە) و ئەو گەڕەکە مزگەوتی گەورە و قەسری

حکوومەت لەخۆ دەگرێ و ئەو عەشیرەتانەی لێی نیشتەجێ بوونە بریتین لە: جەزازی، غنێمات، خلێفات، حیاسات، عەرەبییات، نسوور، خرێسات، رەحاحلە، هەزایمە، ریالات، دەبابسە، عەناسووە، حەیارات، رەمامنە.

... گەڕەکی کوردان لە شاری سەلت دەڵێن لە ساڵی ١٥٩٦ی زایینی لە سەردەمی عوسمانییەکان ژمارەی خێزانەکان گەیشتۆتە ١٢ خێزانی موسڵمان و ١٢ خێزانی مەسیحی و سەرجەم دانیشتووانی گەڕەکەکەش نزیکەی ١٦٦ کەس بووە.

هێرشی سەلیبیەکان بۆ ڕۆژهەلات توانی لە ساڵی ١٠٩٩ی زایینی فەلەستین داگیر بکات و حکوومەتێکی لاتینی لە قودس پێك بهێنێ. لەدوایی تەماحیان بەرەو ڕۆژهەڵات چوو و توانیان باشووری ئۆردن داگیر بکەن. گرتنی (کەرك) لە ساڵی ١١١٢ی زایینی و (شوبەك) لە ساڵی ١١١٥ی زایینی و (ئیلە)ی عەقەبە لە ساڵی ١١١٦ی زایینی. بەم شێوەیە بوونە خەتەرێك بۆ شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلامی لە حیجاز و ڕێگای هاتووچۆ و گەیاندنیان لەنێوان دیمەشق و قاهیرە بڕی. ناوچەی باشووری ئۆردن بووە گۆڕەپانی ململانێ و ناکۆکی لەگەڵ سوپای نورەدین زەنگی و لەدوای ئەویش سوپای سەلاحەدینی ئەیووبی.

ئینجا سەلاحەدینی ئەیووبی گەمارۆی (ئیلە)ی دا لە ساڵی ٥٥٦ی کۆچی و هەروەها هەر دوو قەڵاتی کەرك و شوبەك لە ساڵی ٥٦٧ی کۆچی... پاشان سوپای سەلاحەدین خۆیان گەیاندە قەسیر (شونەی باکوور) و لە زێی ئۆردن پەڕینەوە بەرەو قودس و بیسان و قەڵاتی (کوکب الهوا) یان گەمارۆ دا کە زیانێکی یەکجار زۆر بە سەلیبیەکان گەیشت.

... بەم شێوەیە ڕۆژهەڵاتی ئۆردن کەوتەبەر دەسەڵاتی ئەیووبییەکان، مەلیك عادڵ بایەخێکی زۆری دا بە گەڕانەوەی ناوبانگی عەرەبی ئیسلامی

و لەناوبردنی جێ پێی سەلیبییەکان لەسەر زەویەکەیان، مزگەوتێکی زۆری لێ دروست کرد و ئیمامی مزگەوتی بۆ (کەرك) دانا. مەلیك ناسر داوود ئەیووبی میرنشینی «کەرك» ی دامەزراند لە مانگی شەعبانی ساَی ٦٢٦ی کۆچی/ ١٢٢٩ی زایینی، ئەم میرنشینە ماوەی ٨٠ساڵ بەردەوام بوو.

... لەدوای ئەوەی ئەیووبییەکان دەسەڵاتداریی میسر و شامیان گرتەدەست و ناوچەکەیان لەژێر دەستی سەلیبییەکان ئازاد کرد، سەلاحەدینی ئەیووبی پەرەی بە زانست و کردنەوە و دروستکردنی قوتابخانە دا لە گشت وڵاتەکە و زانا و ئەدیبەکانی خەڵات کرد و هەرلەوان جێگر و نوێنەری بۆ خۆی دانا وەك قازی فازل و عیماد ئەسفەهانی و لەدوای ئەویش پاشایانی ئەیووبی پەیرەویی ڕێبازەکەیان کرد. لە سەردەمی ئەوان زانست بە شێوەیەك پێش کەوت کە جێگای سەرسوڕمان و شانازی بوو.

ئۆردن شانسی هێنا لە پێشکەوتن و چالاکیی زانستی لەو سەردەمدا، مەلیك ناسر بڕیاری دا کە زانست لە گشت گوند و شارەکانی ئۆردن بڵاو بکاتەوە و کەرك بووە قیبلەی زانایان و فەقێیان و ئەدیبان. مەلیك ناسر ڕێزی لە زانایان دەگرت و لەگەڵیان دادەنیشت و پرسی پێدەکردن و خەڵاتی ماڵی پسپۆڕەکانی دەکرد.

ئەوکاتە کەرك بزووتنەوەیەکی مەزنی زانست و هۆشی زیرەکانەی بەخۆوە دیت کە بێنموونە بوو، مەلیك ناسر خەزێنەیەکی بۆ کتێب دروست کرد وکەرك بووە بەرزترین و ناودارترین ناوەندی زانست لە وڵاتی شام... هەروەها ئەیووبییەکان بناغەی قوتابخانەی زۆریان لە کەرك، عەجلوون، سەلت و حسبان دانا کە بووە هۆی پێشکەوتنی زانست لە ئۆردن و گەیشتە پلەیەکی بەرز لە پێشکەوتن و بووە هۆی دەرچوونی ژمارەیەکی زۆری پسپۆڕ و زانا و ئەدیب و زانایانی ئایینی و پزیشکی لە شوێنە جیاجیاکانی وڵات.

... کتێبەکانی کە لەو ماوەیەدا نووسرابوون، باسێکی زۆریان لەسەر ئەو زانایانە کردووە کە بە ڕەچەڵەك کوردن و ئۆردنین لە حەسبان و باعوون و عەجلوون و کەرك و شوبەك و بەلقا و عەممان. بۆ نموونە بنەماڵەی باعوونی لەناو مزگەوتی ئەمەوی گومبەزێکیان هەبوو بە ناوی خۆیان (گومبەزی باعوونی) ناودار کرا، کە لەژێر سێبەرەکەی زانایان و فەقێیانی ئەو بنەماڵەیە وانە دەڵێنەوە و قوتابییەکان فێری هەموو جۆرە زانستێك دەکەن. هەر بەو شێوەیە ئەیووبییەکان بوونە هاندەرێك بۆ پێشخستنی زانست و زانیاری لە ئۆردن. مەلیکەکانیش ڕێبازی ئەوانیان گرتەبەر و

- **ئاسەواری ئەیووبییەکان لە ئۆردن**

ئەیووبییەکان ئاسەوارێکی زۆریان لە خانووبەرە و زانستی بیناکردن بۆ ئۆردن بەجێهێشت کە باس لە داستانی خەباتیان دەکات بەرامبەر داگیرکەرانی سەلیبی، هەر بەو مەبەستەش دژ و قەڵاتی زۆریان دروست کرد و بناغەی مزگەوتی زۆریان لەو وڵاتە دانا بە مەبەستی بڵاوبوون و پێشخستنی ئایینێکی ڕاستەقینە لەناو خەڵکدا کە وەك نموونە دەتوانین ئاماژە بکەین بە قەڵاتی عەجلوون، قەڵاتی سەلت، نۆژەنکردنەوەی قەڵای شوبەك، مزگەوتی گەورە لە عەجلوون، مزگەوتی ریمون.

قەڵاتی عەجلوون: لە گەشتێکی سەلاحەدینی ئەیووبی دژ بە سەلیبییەکان لە ناوچەکەدا، فەرمانی دایە سەرکردەی (عەزەدین ئوسامە) کە قەڵاتی عەجلوون (الربض) دروست بکات لەسەر لوتکە چیای عۆف، لەساڵی ٥٨٠ی کۆچی/ ١١٨٤ی زایینی. قەڵات ڕەبەز (الربض) دەکەوێتە سێ کیلۆمەتری ڕۆژئاوای شاری عەجلوون.

قەڵاتی سەلت: قەڵاتی سەلت هەر وەکوو قەڵاتی عەجلوون قەڵاتێکی

دەستکردنی ئەیووبییەکانە/ مەلیك عیسا کوڕی عادڵ ئەیووبی بە چاودێری میری عەجلوون (ئەیبەك کوڕی عەبدوڵڵا عەلائی) لە ساڵی ٦١٦ی کۆچی/ ١٢٢٠ی زایینی دروستی کرد.

مزگەوتی گەورە لە عەجلوون: ئەوکاتەی کە عەجلوون کەوتە ژێر دەسەڵاتی مەلیك ساڵح کوڕی نەجمەدین ئەیووب کوڕی مەلیك کامل ئەیووبی، لە ساڵی ٦٤٥ی کۆچی/ ١٢٤٧ی زایینی فەرمانی دروست کردنی ئەو مزگەوتەی دا.

مزگەوتی ریمون: ئەو مزگەوتە دەکەویتە ناوەندی شاری ریمون لە ناوچەی چیای عەجلوون، دە کیلۆمەتر لە شاری جرش دوورە، دروستکردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەیووبییەکان، هەروەکوو لەسەر تابلۆکەی دیاری کراوە لە مزگەوتەکە لە سەردەمی مەملووکییە (زاهیر بیبەرش) هەندێ شتی دەستکردی بۆ زیاد کراوە.

نۆژەنکردنەوەی قەڵاتی شوبەك: قەڵاتی شوبەك دژێکی کۆنە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئەنبات)ەکان و لە سەردەمی ئەیووبی دا، مەلیك موعەزەم عیسا ئەیووبی بایەخی بەو شوێنە داوە و نۆژەنی کردەوە و دژەکەشی زیاد کرد. هەروەها مەلیك کامل محەمەد ئەیووبی بایەخی پێدا و کردیە عەمبار و پەناگەیەك لە کاتی پێویستدا، نۆژەنی کردەوە و بیناکەشی زێدە کرد. هەروەها مەلیك ساڵح نەجمەدین ئەیووب خاوەنی میسر لە بیناکەی زێدە کرد...

### دووەم: سەردەمی مەملووکی ١٢٦٠ ـ ١٥١٦ی زایینی

بەڵگەنامەکانی مێژوویی ئاماژە بەوە دەکەن کە کوردەکانی هەکاری بەردەوام هەبوونە لە گەڕەکی کوردان لە شاری سەلت. قازی و زانای زۆریان

لێ هەلکەوت وەك شێخ عەبدوڵڵا هەکاری سەلتی و کوڕە زاناکەی محەمەد، کە خەریکی دەرس گوتنەوە بوو لە قوتابخانەی حەسبان و قوتابخانەی سەیفیە لە سەلت کە میر سەیفەدین حیسامی لە ساڵی ٧٢٤ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٣٢٣ی زایینی دایمەزراند، محەمەد کوڕی عەبدوڵڵای هەکاری سەلتی بووە بەناوبانگترین قازی و زانای شافعی لە سەردەمی خۆیدا، قازیاتی (سەلت و دیمەشق و قودس و هەمس) گرتەدەست و لە ساڵی ٧٨٦ی کۆچی/ ١٣٨٤ی زایینی کۆچی دوایی کرد.

هەروەها زانای نایبی کورد شەهابەددین کوڕی سلێمان کوڕی داوودی کورانی، لەدوای گواستنەوەی لە دیمەشق هاتە سەلت و لەوێ نیشتەجێ بوو، هەر لەوێ خەریکی دەرس گوتنەوە بوو تا کۆچی دوایی کرد....

### سێیەم: سەردەمی عوسمانی ١٥١٦ ـ ١٩١٨ی زایینی

سەرچاوە عوسمانییەکان ئاماژە بەوە دەکەن لە بڵاوکراوەکانیان بە بوونی کۆمەڵە کوردێك لە گوند و شوێنە کشتوکاڵییەکانی سەلت، وەك کەشتزاری (سەماح)ی سەر بە غۆر و لەگەڵیان کۆمەڵە عەرەبێکی کەریمیش هەیە.

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گەڕەکێکی کوردان هەبووە لە سەلت ساڵی ١٥٣٨ی زایینی و جارێکی دیکە لە ساڵی ١٥٩٦ی زایینی، کە ئەوەش بەڵگەیەکە بۆ بوونی کوردە هەکارییەکان و کوردی دیکە لە شاری سەلت لە سەردەمی عوسمانیدا کە نزیکەی ١٣ بنەماڵە بوون.

ناوی شێخ توعمە کوڕی عەلی کوردی دیار دەکەوێ کە یەکێك بووە لە ڕێبەرە کوردەکانی پارێزگای عەجلوون لە ساڵی ١٥٣٨ی زایینی، لەو کۆمەڵە کوردە بوونە کە نیشتەجێی پارێزگای عەجلوون و مژیلی کاروباری کشتوکاڵی بوونە.

گەشتوەری سویسری (بیر کلهارت) لە گەشتەکەی بۆ شاری سەلت لە سەرەتای سەدەی ١٩ی زایینی (١٨١٣) باس لەوە دەکات کە دانیشتووانی موسڵمانی ناوچەی شاری سەلت بریتین لە سێ عەشیرەتی (کوردەکان، قتێشات، عەواملە).

هەروەها دکتۆر (جۆرج تەریف) باس لەوە دەکات کە زۆربەی دانیشتووانی شاری سەلت لە موسڵمانەکان پێکهاتووە، کە لەوانە کوردەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا.

شاری سەلت لە سێ گەڕەك پێك هاتبوو. گەڕەکی کوردان، گەڕەکی عەواملە، گەڕەکی قتێشات. لەچاریەکی سەدەی ١٩ی زایینی دەوڵەتی عوسمانی دەستی بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئۆردندا گرت لەوانە ناوچەی بەلقا بوو کە یەکەمین قائمقامیەتی لە شاری سەلت ساڵی ١٨٨٠ی زایینی کردەوە و زۆربەی فەرمانبەرانی ئاسایش و پاسەوانانی لە کوردەکان بوون، لەوانە (عەلی کوران)ی بوو باپیری خانەوادەی عەلی سەیدۆ کوردی لە عەممانی ئێستا...

... لە سەدەی نۆزدەدا عوسمانییەکان دەستیان بەسەر ئۆردندا گرت، ئینجا بنکەی سوپایی و هێزی پۆلیس و سوپایان دامەزراند بۆ ئاسایشی رژێم و وەرگرتنی باج و ... خەڵك بۆ ناو سوپا لە کاتی پێویستدا، زۆربەی فەرمانبەرەکانیان لە ڕەگەزی کورد بوون. سوڵتان عەبدولحەمید هانی کوردەکانی دا بۆ ناو سوپای عوسمانی، تەنانەت بۆ پاسەوانی خۆشی (سوارانی حەمیدیە)ی لێ دامەزراندن و سووی لێ وەرگرتن دژ بەو کەسانەی کە لەژێر فەرمانی دەردەچوون.

... دەوڵەتی عوسمانی ئەو کاتەی کە زیاتر خۆی بەسەر ئۆردندا سەپاند، ڕەشید پاشا بە یارمەتی ڕێبەری کوردەکان لە ساڵحیەی دیمەشق (محەمەد سەعید) لە ساڵی ١٨٦٨ی زایینی سەلتی خستە ژێر فەرمانڕەوایی

عوسمانییەکان، لەدوایی دوو نەفەر لە کوردان بەڕێوەبردنەکەیان گرتە ئەستۆ (قائمقامییەتی سەلت) کە فارس ئاغا قادور لە سالآنی ١٨٦٨ ـ ١٨٧٤ی زایینی و لەدوای ئەو یونس ئاغا قادور لە ساڵی ١٨٧٤ی زایینی، کە لە کوردەکانی دیمەشق بوون.

دکتۆر (جۆرج تەریف)ی توێژەر دەڵێ: لە ماوەی نێوان سالآنی ١٨٦٨ ـ ١٩٢١ی زایینی خانەوادەی بەرچاو هاتنە سەلت وەك خانەوادەی کوردی و ئۆرفەلی.... گەلێك ناوی کوردی لە شاری سەلت دەرکەوت کە لە تۆمارگەی شارەوانی سەلت لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینی تۆمار کرابوو...

لەنێوان سالآنی ١٨٥٠ ـ ١٩٢٨ی زایینی شارۆچکەی ئەربد و گوندەکانی دەوروبەری بازرگانانی زۆری دیمەشقی شامی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و ... لەنێوان ئەوانەی گەیشتنە ئەربد و گوندەکانی خەڵکێکی زۆر لە چاریەکی دوایی سەدەی نۆزدە کورد بوون لە بازرگان و سوپایی و فەرمانبەر، ئەوانە لە گەڕەکی کوردانی ساڵحیەی دیمەشق و لە پارێزگای ئۆرفە و دیاربەکر هاتبوون، ناویان لە تۆمارگای شەرعیی محاکمی ئەربد هەبووە و دیارە و نووسراوە. ئەوانە لە پارێزگای عەجلوون و شارۆچکەی ئەربد و دەوروبەری نیشتەجێ بوون...

گەشتوەری ئەڵمانی (شۆماخێر) دەڵێ: لە ساڵی ١٨٨٧ی زایینی ناوەندی قەزا لە ئەربد (٤٠) پاسەوانی چەکدار و هەندێ ئەفسەری تێدا بوو کە بەشداریان لە کۆکردنەوەی باج و خەراج دەکرد و زۆربەیان لە کوردەکان بوون. دەتوانین بڵێین کوردەکان لە زۆر شوێن و دامودەزگای حکومی ئەو شارەدا فەرمانبەر و کاربەدەست بوون.

•••

خوێنەرانی خۆشەویست زانیاریی زیاتر سەبارەت بە وەزعی کوردەکانی

ئۆردن لە سەردەمی عوسمانییەکاندا دەتوانن لە بەشی سێیەمی کتێبی (کوردە ئۆردنییەکان و ڕۆڵیان لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا) بەدەست بێنن.

- **ڕۆڵی کوردەکان لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا**

***یەکەم: ژیانی سیاسی***

کوردەکانی ئۆردن بەشداریان لە ژیانی سیاسیی ئۆردن کردووە لە خولی پێش دامەزراندنی میرنشینی ئۆردن لە سەردەمی فەیسەڵی سوری هەروەها لە ژیانی سیاسیی پاشایەتیی ئۆردن لە کاتی دامەزراندنی تا ئیمرۆ. زۆر لەوان ناوەندە وزاری و دیبلۆماسی و سوپایی و ئیدارییەکانیان گرتە ئەستۆ و بەشداریان لەو ژیانە سیاسییەدا کرد.

خاوەنی هێز و توانا بوون لە ئیشوکارەکانیان، ڕێژەی باوەڕی سەرکردایەتی هاشمی و لێپرسراوان بە کوردەکان زۆر بوو و جێی متمانەی هەموویان بوون، ئامادەیی و کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر ژیانی سیاسی و ڕێژەیان تێپەڕی کرد لەوانەی دیکە کە ژمارەیان زۆر زیاتر بوو لە کوردەکان و دەگەیشتنە چەند بەرامبەر. ئەوەش خۆبەخۆ بەڵگەیە بۆ ئەوەی یەکسانی هەیە لە هەموو مافەکان و کوردەکانیش جیاوازییان نەبووە لەگەڵ هاووڵاتییە ئۆردنییەکانی دیکە.

ئێستاکەش لەخوارەوە ڕۆڵی سیاسیی کوردەکان بەپێی بەڵگەنامە و سەرچاوەکان دیاری دەکەین:

_ لە سەردەمی فەیسەڵی سوری (١٩١٨_ ١٩٢٠)ی زایینی:

مەلیك فەیسەڵی یەکەم حکومەتی عەرەبی لە ساڵی ١٩١٨ی زایینی لە دیمەشق دامەزراند، ڕۆژهەڵاتی ئۆردن بەشێك بوو لە پێکهاتەی سیاسی ئەو حکومەتە، بۆ ئەو حکومەتە گرفتێکی زۆری سیاسی هاتە پێش کە

بەدەستی فەرەنسییەکان کۆتایی بەو حکومەتە ساوایە هات لەدوای شەڕی «میسلون»ی بەناوبانگ لە ١٩٢٠/٧/٢٤ی زایینی.

ڕێبەر و شێخەکان و خەڵکی ئۆردن لە هەموو رویێکەوە پشتگیری ئەو حکومەتەیان کرد، هەڵوێستێکی نیشتمان پەروەریان هەبوو... بە پیاوماقووڵ و ناودارەکانی ئۆردن سەیدۆ کوردی بوو کە لەو کاتەدا سەری هەڵدا و هەڵوێستی نیشتمانپەروەری دیاری هەبوو کە لە خوارەوە دیاریی دەکەین:

ئەو کاتەی پڕوپاگەندە دەکرا کە سوریا دابەش دەکرێ نیوان فەرەنسا و بەریتانیا، گەلی سوری و ئۆردنی وەك بروسکە لێدراوێك بەو پڕوپاگەندەیە (هەواڵە) سەرسام و نارەحەت بوون، هەستان بە خۆپیشاندان و نارەزایی دەربڕین و پێکهێنانی دەستە و لیژنەی تایبەت و تۆمارکردنی ناوی هاووڵاتیان بە مەبەستی کۆکردنەوەی یارمەتی و بەرگریی لە خاك و نیشتمانی خۆیان.

سەیدۆ کوردی و محەمەد تاهیر جقە و سەعید خێر هەڵسان بە پێکێهانی لیژنەی نیشتمانی لە عەممان و بۆ ئەو مەبەستەش لە بەرواری ١٩١٩/١٢/١٥ی زایینی برووسکەیەکی تایبەتیان ئاراستەی ئەمیر فەیسەڵ لە دیمەشق کرد...

... هەروەها لە سەردەمی فەیسەڵ هەندێ لە کوردەکان کاری ئیداریان لە ئەستۆدا بوو لە ئۆردن، ئیسماعیل ئەفەندی کوردی وەك کاتبێك (نووسەرێك) لە دادگای کەرك لە بەرواری ١٩١٩/١/٢٥ی زایینی کاری دەکرد و محەمەد عەلی کوردی نووسەری یەکانەی دادگای سەرەتایی کەرك بوو و سەعید ئەفەندی کوردی پلەی لێپرسراوێتی نووسەرانی دادگای سەلتی وەرگرت.

ـ لە سەردەمی میرنشینی و پاشایەتی ئۆردن (١٩٢١ ـ ٢٠٠١)ی زایینی:

هەندێ لە کەسایەتیە کوردەکان ڕۆڵێکی سیاسیی تایبەتی و دیاریان

گێڕا لە سەردەمی میرنشینی ئۆردن، بەشداریان کرد لە پارتە سیاسییەکان و ئامادەبوون لە کۆنگرە نیشتمانییەکان و خەباتکردن دژ بە بەیانەکانی بەریتانیا، پشتگیریان لە دۆزی فەلەستینی کرد وەك کۆکردنەوەی هاوکاری و بەشداریی لە خۆپیشاندان و نارەزایی.

بەناوبانگترین ئەو کەسایەتیانەش: سەیدۆ کوردی، عەلی کوردی، یەحیا کوردی، فایز کوردی، سەلیم ئاغا سەعدوون، سەعد جومعە، مەدحەت جومعە، ئەحمەد کوردی بوون.

سەیدۆ کوردی کە لە پیاوە دیارەکانی عەممان بوو، رۆڵێکی سیاسیی مەزنی گێڕا لە سەردەمی میرنشینی ئۆردن، وەك بەشداری کردنی لە پارتە سیاسییەکان و کۆنگرە نیشتمانییەکان و دژایەتی کردنی بەیانەکانی بەریتانیا و پشتگیری لە سیاسەتەکانی عەبدوڵڵا کوڕی حەسەن....

کاتێ کۆنگرەی نیشتمانی یەکەم بە سەرۆکایەتی حوسێن تەراونە لە چایخانەی حەمدان لە عەممان بەسترا، کە ماوەی چوار ڕۆژی خایاند لە ١٩٢٦/٧/٢٥، کۆمەڵە سەرۆك عەشیرەت و شێخێکی زۆری ئۆردنی تیایدا بەشدار بوون، لەوانە دوو کەسایەتی دیاری کورد کە بە نوێنەرایەتی خەڵکی عەممان ئامادە بوون (سەیدۆ کوردی و عەلی کوردی).

پێویستە ئاماژە بە خاڵێك بدەم ئەویش ئەوەیە کە لە کتێبەکەی بەڕێز محەمەدعەلی سویرکی، باس لە گەلێك کار و چالاکیی سیاسیی کوردەکانی ئۆردن لەو سەردەمەدا کراوە و ئێمە بۆ خۆپاراستن لە درێژبوونەوەی باسەکە تەنیا ئاماژە بە کار و چالاکییەکانی هێندێك لەو کەسایەتیانە و یەك لەوان سەیدۆ کوردی دەکەین. خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زیاتر ئاشنابوون بە کار و چالاکیی و هەروەها کەسایەتییەکانی ئەو قۆناغە لە مێژووی ئۆردن، دەتوانن کتێبەکەی بەڕێز سویرکی بخوێننەوە.

بەڵێ! ئەو کاتەی گەنجەکانی ئۆردن لە ساڵی ١٩٣٦ی زایینی لیژنەیەکیان بە ناوی (مشروع القرش الخيري) دامەزراند بە سەرکردایەتی حەمدی منکۆ، ئەندامەکانی ئەو لیژنەیە سەردانی گشت ناوچەکانی ئۆردنیان کرد و پیتاکیان کۆ کردەوە لە هاووڵاتیان. سەلیم ئاغا سەعدوون ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ کۆکردنەوەی پیتاك و هاوکاری لە پارێزگای ئەربد، مەبەست لە کۆکردنەوەی ئەو پیتاکەش هاوکاری گەلی فەلەستینی بوو.

... لە سەردەمی میرنشینی، بەرهەڵستکاری نیشتمانی لە کەسایەتییە دیارەکان دامەزرا، کە لەنێویاندا کوردەکانی ئۆردن هەبوون وەك سەعد جومعە، مەدحەت جومعە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٣٤ـ ١٩٤٨ی زایینی. هەر لەو سەردەمەدا ئەحمەد کوردی و سەیدۆ کوردی وەك نیشتمانپەروەرێك دەستنیشان کران.

کوردەکانی ئۆردن پلەوپایەکی زۆر و بەرزیان لە وەزارەتەکان و ئیدارە و دیبلۆماسییەت و سوپا بەدەست هێنا لە حکومەتی ئۆردن. ئەوەش گشتی دەگەڕێتەوە بۆ هێز و توانا و هەستکردن بە لێپرسراوێتی و خێر و ڕاستیان لە کارە تایبەتییەکان و ڕەوشتیان. ڕەشید مەدفەعی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو لە ساڵی ١٩٢٣ی زایینی و بووە بە وەزیری ناوخۆ و بەرگری لە ساڵی ١٩٣٧ی زایینی. مامۆستا سەعد جومعە بووە وەزیری دەرباری پاشایەتی هاشمی لە ساڵی ١٩٦٥ و دوو جاریش سەرۆك وەزیرانی ئۆردن بووە. دکتۆر یوسف زهنی لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٢ ـ ١٩٧٤ وەزیری تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی و کار بووە. ئەندازیار سەلاح جومعە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٦ـ١٩٧٩ وەزیری کشتوکاڵ و تەموین بووە. دکتۆر ئەشرەف وەزیری تەندروستی (١٩٩٧ـ١٩٩٨). مامۆستا سەعدەدین جومعە وەزیری کاروباری سەۆك وەزیران لە ساڵی (١٩٩٧ـ١٩٩٨). عەمید حەسەن زازا

جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی.

بەڵام لە ئیش وکاری دیبلۆماسیدا، مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی خزمەتێکی بەرچاوی کرد بە سەفارەتەکانی ئۆردنی لە (جەددە، ئەنقەرە، دیمەشق، یەمەن) تا خانەنشین بوو بە پلەی وەزیر. مامۆستا سەعد جومعە سەفیری ئۆردن بوو لە (ئێران، سوریا، ئەمریکا، مەغریب، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، بەریتانیا، تونس، ئەسپانیا) لەنێوان ساڵەکانی (١٩٥٨-١٩٧١)ی زایینی، لیوا عەبدولئیلا کوردی سەفیری ئۆردن بوو لە مالیزیا و ئیسرائیل، مامۆستا مازن مەدحەت جومعە سەفیر بوو لە مالیزیا.

بەڵام لەباری بەڕێوەبردنەوە: ڕەشید مەدفەعی لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٨-١٩٣٠ی زایینی پارێزگاری پارێزگای بەلقا بووە... سەعد جومعە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٤-١٩٥٨ پارێزگاری پایتەخت بوو و خەلیل بەکر زازا لە ساڵی ١٩٣٠ بەڕێوەبەری ناحیەی شوبەك بووە و محەممەد عەلی کوردی لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٥-١٩٢٧ بەڕێوەبەری ناحیەی کەرك بوو و لەساڵی ١٩٣٣ قایمقامی عەجلون بوو و لە ساڵی ١٩٤٨ پارێزگاری پارێزگای بەلقا بوو.

لە بواری ئەنجوومەنی شارەوانییەکان: لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢١-١٩٢٧ی زایینی عەواد کوردی ئەندامی لقی ئەنجوومەنی شارەوانی سەلت بوو. حوسێن سەیدۆ کوردی ئەمینی پایتەخت بوو لە ساڵەکانی ١٩٦١- ١٩٦٢. محەممەد عەلی کوردی یاریدەدەری ئەمینی پایتەخت بوو و حوسێن جابر کوردی و ڕەغد محەممەد عەلی کوردی ئەندامی ئەنجوومەنی ئەمانەتی پایتەخت بوون.

لە بواری شارەوانییەکانەوە لە ساڵی ١٩٩٥ قاسم عەلی کوردی ئەندامەتی شارەوانی ریمون/ جرش بۆ دوو خول بەدەست هێنا. لە ساڵی ١٩٩٥-١٩٩٩ حاتەم عەبد کوردی ئەندامی شارەوانی دێر ئەبی سەعید بوو. لە ساڵی ١٩٩٩ فەندی مووسا کوردی ئەندامی شارەوانی جنین الصفا/ اربد بوو و

ئەندازیـار مـەروان ئەحمـەد عوسـمان کـوردی ئەندامـی شـارەوانی زەرقا بـوو ...

بـەڵام لـە ئەنجوومەنـی نوێنـەران، مامۆسـتا سـەعد جومعـە لـە سـاڵی ١٩٦٧ـ١٩٦٩ و لـە سـاڵی ١٩٧١ـ١٩٧٧ ئەندامەتـی بەدەسـت هێنـا. لـە سـاڵی ١٩٩٣ـ١٩٩٧ی زایینـی دکتـۆر ئـەشرەف کـوردی ئەندامـی ئەنجوومـەن بـوو و مامۆستا سـەعدەدین جومعـە لـە ساڵی ١٩٩٧ی زایینـی تـا ئێسـتا هـەر ئەندامـە. (واتـە تـا کاتـی نووسـینی کتێبەکـە).

*دووەم: بەشداریی ئەدیبە کوردەکان لە بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی*

ئەدیـب و نووسـەرە کـوردەکان بەشـداریان لـە بزووتنـەوەی ئەدەبـی و ڕۆشـنبیری ئوردنـی کـردووە وەك بڵاوکردنـەوە و دانـان و نووسـین و هونـەر و زانسـت و ڕاگەیانـدن، بەشـداریی کـوردەکان بـە شـێوەیەکی زۆر بەرچـاو بـوو لەچـاو ڕێـژەی کـوردەکان و لـە کـۆی دانیشـتووانی ئـوردن، ئەوە لە خـوارەوەش ئـەم جـۆرە بەشـداربوونەتان دەخەینـە بەرچـاو.

لـە سـەرووی هەمـوو ئەدیـب و ئەندیشـمەندەکانی کـوردی ئوردنـی خوالێخۆشـبوو سـەعد جومعـە ئەیووبـی بـووە کـە سـەرۆك وەزیرانـی پێشـووی ئوردنیـش بـووە، جگـە لـە ناوبانگـی لـەڕووی سیاسـەتەوە، ناوبـراو ئەندیشـمەند و ئەدیـب و شـاعیر و ڕۆژنامەنووسـێکی بەناوبانگیـش بـووە، زاڵ بـوو لەسـەر زمانـی عەرەبـی، زۆر حـەزی لـە ئەدەبیـات دەکـرد و شـێعرێکی جوانـی هەیـە، هەروەهـا لـە بـواری نووسـین و وتـار و ڕەخنەگرتـن و شـیکردنەوەدا...

... مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی بەشدارییەکی چاکی هەبووە لە بزووتنەوەی ئەدەبی ئوردنی، ئەو یەکەمین ئوردنی بووە کە دەربارەی گەشتی ئەدەبی ئوردنی نووسیوە لە کتێبەکەی بەناوی (من عمان الی العمادیە) یان (جولە فی کوردستان الجنوبیە) کە لە ساڵی ١٩٣٩ دەرچوو. کە تیایدا دەربارەی گەشتەکەی بۆ

کوردستانی عێراق بە شێوەیەکی ئەدیبانە وەسفێکی جوان باش دەکات... ئەو کاەە کە چووە ناو ئیشوکاری دیبلۆماسیش کتێبێکی دانا بە ناوی (التعلیمات القنصلیه الاردنیه) کە بووە بە سەرچاوە و ڕێبازێکی زۆر گرنگ بۆ فەرمانبەرانی کونسولی ئۆردنی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ. لەڕووی دانانەوە فەرهەنگێکی زمانەوانی دانا بە ناوی (القاموس الکوردی الحدیث) کە نزیکەی ٢٥هەزار وشەی کوردی و بەرامبەرەکەی بە عەرەبی گرتەخۆ، کە یەکێك لە فەرهەنگە چاکەکانی کوردی بوو. لەباری پەروەردەییەوە، مامۆستا و بەڕێوەبەرێکی زۆر چاك بوو لە قوتابخانە بەناوبانگەکانی ناوەندی ئۆردن لە سەردەمی میرنشینی ئۆردن لە شارەکانی سەلت و ئەربد و کەرك... یەکەمین ئۆردنی بوو کە بڕوانامەی زانکۆی وەرگرت لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت لە ساڵی ١٩٢٨ی زایینی و...

مامۆستا عەبدولڕەحمان کوردی دوو کتێبی چاکی خستە بەردەستی جەماوەر بە ناوەکامی (وادی الاردن، امتیازاتە و مشورعاتە) و (الحب بعد الموت کاملا) و ... هەروەها شێخ محەمەد سەعید کوردی کتێبێکی زۆری دانا و بڵاو کردەوە کە زۆربەی لەڕووی سۆفیگەری بووە و لەناو ئۆردن بڵاو کراوەتەوە.. دکتۆر راجح کوردی چەند پەرتووکی سەر بە ئایینی ئیسلامی دانا... و هەروەها سەفیر و دیبلۆمات مەدحەت جومعە کتێبێکی لەسەر سیاسەتی عەرەبی بڵاو کردەوە بە ناوی ( تسقط الدبلوماسیه). خوشکە حەنان عەبدولڕەحمان کوردی دوو کتێبی وەرگێڕا کە پەیوەندی بە شوێنەواری ئۆردن هەیە.. توێژەر و مێژوونووس محەمەد عەلی سوێرکی کوردی نووسەری کتێبی (کوردە ئۆردنییەکان و ڕۆڵیان لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا) چەند کتێبێکی ڕێکخست کە پەیوەندیی بە مێژووی ئۆردن و شۆڕشی گەورەی عەرەبی هەیە لەوانە (الاردن فی اشعار العرب، نوابغ الاردن فی العصر الاسلامی، شرق الاردن و العهد الفیصلی و ...) و ...

ـ عەبدولڕەحمان کوردی یەکەمین شوێنی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە ئۆردن دامەزراند. مێژوونووس سلێمان مووسا دەڵێ: لە ئۆردن شوێنی بڵاوکردنەوە و چاپکردن نەبوو، تا گەنجێکی ڕۆشنبیر خۆی بەخت کرد بۆ ئەو ئەرکە و لێی سەرکەوتوو بوو ئەویش مامۆستا عەبدوولڕەحمان کوردی یە. هۆکارەکەشی تەماحی ڕۆشنبیریی ئەو گەنجە بوو کە هانی دا بۆ ئەوەی یەکەم خانوو بۆ چاپکردن دابمەزرێنێ لە ئۆردن (عەممان) و لەسەر شانی خۆی هەڵسا بە چاپکردنی پەرتووکی چاك وباش و دابەشکردنی لە خزمەت ڕوشنبیری لە ئوردن و گەیاندی بە خوینەر بە ئاسانترین و چاکترین شیوە. ناوی ئەو شوێنە بۆ چاپکردن کە عەبدولڕەحمان کوردی دایمەزراند «الشرکة الطباعة الحدیثة» بووکە ١٣ کتێبی بەناوبانگ و چاکی ئەدیب و نووسەرانی ئۆردنی لێ چاپکرا... ئەو ئەزموونە بۆ ماوەی چوار ساڵ بەردەوام بوو (١٩٥٤ ـ ١٩٥٧).

سەبارەت بە زانستی پزیشکی و توێژینەوە دوکتۆر یوسف زهنی دوو کتێبی بڵاو کردەوە بە ناوەکانی (الفلورايد و میاه الشرب فی الاردن) و (المسح الصحی السنی فی الوطن العربی). دکتۆر ئەشرەف کوردی توێژینەوەی پزیشکی بەرچاوی بڵاو کردەوە کە بڕواپێکراوی نێودەوڵەتی بووە، توێژینەوەی زۆری هەیە دەربارەی نەخۆشی (التصلب اللوبحی المتعدد) بە هاوبەشی و بەشداری ئەنجوومەنی پزیشکیی بەریتانی بۆ توێژینەوە، هەروەها توێژینەوەی لەبارەی مردنی مێشك (موت الدماغ) کردووە و ...

دکتۆرە پوران عەبدولڕەحمان کوردی توێژینەوە و دیراسەتێکی زۆری ئامادەکرد کە زیاتر لە ١٤ بووە لە گۆڤارەکانی زانستی ئەمریکی و بەریتانی بڵاو کرایەوە کە زۆربەیان پەیوەندی بە زانستی ژێن (ژێنێتیك) و ویراسە و خوێن و شێرپەنجە (سەرەتان) هەیە و خەڵاتی ئەنجوومەنی بەریتانی

بۆ توێژینەوە لە ساڵی ١٩٨٦ی زایینی وەرگرت، ئەندامی کارگێڕە لە زۆر لە کۆمەڵە زانستییەکان لە ئەمریکا کە تایبەتە بە شێرپەنجە و ویراسەی بەشەری.

**● لە بواری ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن:**

مامۆستا سەعد جومعە و عەبدولڕەحمان کوردی بە ڕێبەر و پێشەوای ڕۆژنامەوانی لە ئۆردن دەژمێردرێن، سەعد جومعە ڕۆژنامەی (الحق)ی لە عەممان لە ساڵی ١٩٧٤ دەرکرد و بە دەیان وتاری نووسی و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ناوخۆ و عەرەبی بڵاو کرایەوە. عەبدولڕەحمان کوردی گۆڤاری (الاردن الجدید)ی لە عەممان لە ساڵی ١٩٥٠ی زایینی دەرکرد کە گۆڤارێکی حەفتانەی سیاسی، ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بوو لە ئۆردن، ١٦ ژمارەی لێ دەرچوو، ئەو گۆڤارە داوای یەکسانیی کۆمەڵایەتی و دیموکراسی و سەرکەوتنی دۆزی ئافرەتی دەکرد و ...

**● لە بواری فێرکردنی ئەکادیمی و پەروەردەیی:**

لەنێو کوردەکانی ئۆردن کۆمەڵێك کەسایەتی هەڵکەوت کە خزمەتیان بە بزووتنەوەی پەروەردەیی ئایینی کرد لە ئۆردن، لەوان شێخ عەبدولحەمید ئەفەندی کوردی مورشیدی ئایینی بۆ عەرەبەکانی (بەلقا) لە سەردەمی عوسمانیدا لەنێوان ساڵەکانی ١٨٨٥-١٨٩٠ی زایینی. هەروەها شێخ و داعی گەورەی سۆفیگەری محەممەد سەعید کوردی کە وەك ڕێنما و ئیمامێکی ئایینی لە مزگەوتەکانی ئەربد و گوندەکانی کاری دەکرد، مورید و قوتابییەکی زۆری هەبوو ..

مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی وەك مامۆستایەك و بەڕێوەبەرێکی

لێوەشاوە لە قوتابخانە بووە لە ڕۆژهەڵاتی ئۆردن و بێجگە لەویش زۆر مامۆستا و بەڕێوەبەری دیکە خزمەتیان لەم بوارەدا کردووە.

- **لە بواری ڕاگەیاندن (رادیۆ و تەلەفزیۆن):**

لە بواری ڕاگەیاندنی ئۆردنی ڕووخسار و دەنگی کوردیی بەناوبانگ دەرکەوت کە بەشداریان کرد لە گەیاندنی نامەی ئۆردنی بۆ جەماوەری بینەر و گوێگران، سەبارەت بە ڕادیۆ و بێژەریی، عەبدولقادر کوردی یەکێك بوو لەو بێژەرانەی ئۆردنی کە شاعیری عەرەبی محەمەد ناجی عمایرە باسی دەکات و دەڵێ:» لەبیر نەکەین و بەبیر خۆمان بێنینەوە.. دەنگی عەبدولقادر کوردی و ئەوانی دیکە لە یەکەمین ئیزگەدا دەنگی ئۆردنی گەیاندە گوێچکەکان و ئامادەی کرد بۆ خەڵکەکە«. هەروەها بێژەری بەناوبانگ مامۆستا خەلدوون کورد کە لە بەرنامەی ڕاستەوخۆ و بەرنامەکانی دیکە بە دەنگی زولالیان دەرکەوت. هەروەها کەسایەتیی تەلەفزیۆنی بەناوبانگ هەنە لەسەر تەلەویزیۆن، بەرامبەر بە جەماوەری ئۆردنی وەك ئیمان زازا، رانیا کوردی، داما کوردی، حەسەن کوردی کە ئێستا لە خەلیج ئیش دەکات.

باس لە ڕۆڵی کوردەکان لە دامەزراندنی کتێبخانە و بەکرێ گرتنی پەرتووك ناکەین و لە چەند دێڕێکدا باسی ڕۆڵیان لە بواری سینەما و دەرکردنی فیلم دەکەین:

- **لە بواری سینەما و دەرکردنی فیلم:**

ڕۆڵێکی تایبەت و مەزن لەلایەن هەردوو برا ئیسماعیل و ئیبراهیم کوردی بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و هونەر لە چلەکانی سەدەی بیستەم تا ئیستا درا. ئیبراهیم کوردی کۆمپانیایەکی بۆ دەرهێنانی فیلمی سینەمایی بە ناوی

(شرکە الانیا الجدیدە الانتاج الافلام السینمائیە) لە میسر دامەزاند، چوار فیلمی چاکیان دەرهێنا، ئەو کۆمپانیایە لەدوای ئەوەی کە شۆڕشی ئۆکتۆبری میسر، ساڵی ١٩٥٤ی زایینی دەوڵەتی بوونی ئەو کۆمپانیایەی ڕاگەیاند، لە کار وەستا.

ئیسماعیل کوردی کۆمپانیای (دولار فیلم)ی لە میشێل دیفی خاوەنی سینەمای حەمرا لە بەیروت کڕی، چەند فیلمی سینەمایی دەرهێنا... هەروەها بەناوبانگترین سینەمای دروست کرد لە ئوردن لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم وەك سینەمای (دنیا، البترا، زهران) لە عەممان و سینەمای زهران لە ئەربد، تا ئێستاکەش سینەمای زەهران ڕۆڵی تایبەتی خۆی دەبینێ لە عەممان و ئەربد.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە بواری نمایش و دەرهێنانی شانۆ ... چەند کەسێکی ڕۆڵی باشیان گێڕاوە کە بۆ ئەوەی باسەکە زۆر درێژ نەبێتەوە، لە باسکردنیان خۆ دەبوێرین.

**● بەشداریی نووسەر و ئەدیبە کوردەکانی ئوردن لە بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی:**

مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی ڕۆڵێکی مەزن و تایبەتی بینی لە ڕۆشنبیری و مێژوو و زمانی کوردی. لە ساڵی ١٩٣١ی زایینی سەردانی کوردستانی عێراقی کرد و کتێبێکی چاکی خوێندەوە دەربارەی ژیانی کوردەکان لەوێندەرێ. ئەوی لەوێ بینی تۆکاری کرد لە پەرتووکێك بە ناوی (من عمان الی العمادیە أو جولە فی کوردستان الجنوبیە)، کە لە ساڵی ١٩٣٩ لە قاهیرە دەرچوو. لە دوایی ئەو کتێبە بووە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەناوبانگ بۆ خوێندنی مێژوویەکان دەربارەی کوردان لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی

و ڕۆشنبیرییەوە کە تا سێ یەکی لە سەدەی بیستەم خایاند.

نووسەری سوری منزر مووسڵی دەڵێ ناوەڕۆکی کتێبی (من عمان الی العمادیە) مێژوویەکی تەواو و پڕ بوو بۆ کورد و کوردستان، ئەو کتێبە نموونە لە خولی سییەکان و چلەکان لە سەدەی ڕابردوو (بیستەم) چونکە ئاسەوارێکی مێژوویی کەمیابە کە بە زمانی عەرەبی دەربارەی کوردەکان نووسراوە.

هەروەها مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی کتێبێکی دەربارەی کوردەکانی ئێران بە ناونیشانی (اللر و اللرستان) لە گۆڤاری (المجمع العلمی لکوردی العراقی) لە ساڵی ١٩٧٤ی زایینی بڵاو کردەوە. هەروەها زور کتێبی باشی لەبارەی دۆزی کوردان وەرگێڕا وەك (کتاب الاکراد دانانی حەسەن ئەرفەع، رحله بین الشجعان لە دانا شمیس، جمهوریە مهاباد الکوردیە لە ولیام ئیگلتۆن، الاکراد لە تۆماس بوا، مشکله الاقلیم الشرق فی تورکیا لە محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان). بەڵام زەحمەت و هەوڵ و کۆششەکانی بێسوود بوو لەبەر ئەوەی لە چاپ نەدرا و لە گۆشەی مەکتەبەکەی مابووەوە و خەڵکانی دیکە لە بەیرووت وەریانگێڕان و بڵاویان کردنەوە.

هەروەها فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی دانا کە پێکهاتبوو لە ٢٥ هەزار وشەی کوردی و بەرامبەرەکەی لە فۆنۆتیکی عەرەبی کە نزیکەی (٤٠) ساڵی تەواوی پێچوو لە کۆکردنەوەی پێویستییەکانی، لەلایەن کۆمەڵەی سەلاحەدینی ئەیووبی خێرخوازی لە ساڵی ١٩٨٥ لەچاپ درا کە لە ٦٧٠ لاپەڕە پێك هاتبوو.

هەروەها چاکردنەوەی پیتێکی کوردی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەی پسپۆڕی کورد دکتۆر جەلادەت بەدرخان گۆڤاری (هاوار)ی لە دیمەشق دەرکرد، نامەیەکی بۆ نارد و فێری دەکا کە پیتی (Q) بکاتە (K) لەلاتینی کوردی، بە خۆشحاڵییەوە جەلادەت بەدرخان تێبینیەکەی پەسند کرد و

گۆڕانکارییەکەی ئەنجام درا، ئینجا لەو ڕۆژەوە ئەو پیتە بووە جێگری پیتەکەی دیکە لە لاتینی کوردی.

هەروەها توێژەر محەمەد عەلی سوێرکی کۆمەڵە وتارێکی بڵاو کردەوە لەسەر مێژوو و شارستانییەتی کوردان لە ڕۆژنامەی (اللوا الاردنیە) لە ساڵی ١٩٩٧ەوە هەوڵی ناساندنی کوردانی ئۆردنی داوە. لەم بارەیەوە زۆر وتاری بەنرخی بڵاو کردۆتەوە.

... هەروەها مامۆستا (عەدنان عەلی خدر کوردی) باسێکی دوور و درێژی دەربارەی کوردان لە ڕۆژنامەی (الرای الاردنیە) ساڵی ١٩٩٩ لەژێر ناونیشانی (بحث عن الاکراد) بڵاو کردەوە و وتار و باسی زۆری کە پەیوەندیی بە کوردان هەبووە، بڵاو کردەوە. ئەمانە و زۆر هەوڵی دیکەش لە کەسانی دیکە...

### *سێیەم: ڕۆڵی کوردان لە سوپا و ئاسایشی گشتیی ئۆردن*

لەدوای گەیشتنی میر عەبدوڵڵا کوڕی حەسەن بۆ عەممان لە بەرواری ١٩٢٠/١١/١١ی زایینی خەڵك و جەماوەری زۆری ئۆردن و سوری سەردانیان کرد بە مەبەستی پشتگیری بەرامبەر داگیرکەرانی فەرەنسی کە کۆتاییان بە فەرمانڕەوایی مەلیك فەیسەڵ لە سوریا هێنا. لەنێوان شاندەکە دوو ئەفسەری کورد (خەلیل بەکر زازا و نورەدین بەرزنجی) دیار بوو و لە ڕاپۆرتی سەرکردەی سوپای ئۆردنی «فردریك بەگ» لە ساڵی ١٩٢٨ هاتووە کە ژمارەی سەرکردە کوردەکان لەناو سوپای ئۆردن ١٤ سەرکردەیە و ...

ئەوکاتەی میر عەبدوڵڵا گەیشتە عەممان، بڕیاری دا بە بنیادنانی میرنشینی ئۆردن و دامەزراندنی سوپای نوێی ئۆردنی کە کۆمەڵێك ئەفسەری کوردی خاوەن ئەندیشە و شارەزا تێدا بەشدار بوو کە کاکڵەی سوپای عەرەبییان پێك هێنابوو. لە خوارەوەش باس لە هەندێکیان دەکەین:

ـ ئەفسەر خەلیل بەکر زازا، بنچینەی لە کوردەکانی گەڕەکی سالحییەی دیمەشقە، هاتە ناو سوپای ئۆردنی لە ساڵی ۱۹۲۳ی زایینی، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی دەزگای پۆلیس و پاسەوانی ئۆردن، لە ساڵی ۱۹۳۸ شەهید بوو.

ــ ئەفسەر ڕەشید مەدفەعی، لە ڕەچەڵەکی کوردەکانی بەغدایە، بەشداریی لە شەڕەکانی شۆڕشی عەرەبیی مەزن و دەوڵەتی عەرەبی سوری کردووە، لە ساڵی ۱۹۲۳ بووە بە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیی ئۆردن.

ــ ئەفسەر نەزمی خەلیل بەدرخان، کوردێکە سەر بە شارۆچکەی شاکرەك لە سووریا، لە ساڵی ۱۹۲۱ گەیشتە ناو سوپای ئۆردن. بە پلەی (بەرپرس) لە ساڵی ۱۹۳۰ خانەنشین بوو.

ــ عەقید نورەدین میللی، ڕێبەری ئیشوکارەکانی (الضفة الغربية) بوو لە نێوانی ساڵەکانی ۱۹۵۷ـ۱۹۵۸ و ڕێبەر و بەرپرسی چەکی ئەندازیاری کارەبایی و میکانیکی پاشایەتی لە ساڵەکانی ۱۹۵۷ـ۱۹۵۸ بوو.

ــ ئەفسەر مستەفا میللی، یەکێك بوو لە ئەفسەرە سەرەتاییەکانی سوپای ئۆردن و ئاسایشی گشتی و بەرپرسی بەرگریی میللی.

ــ نەقیب محیەددین میللی، لە ئەفسەرەکانی لیوای مەلیك تەلال بوو لە ساڵی ۱۹٤۳ی زایینی.

ــ موقەدەم ڕوکن مەحموود کوردی، پێشەوای کتیبەی جەنگی (مدرسە المرشحین) لە ساڵی ۱۹٦۳ ی زایینی.

ــ ئەفسەر ئەمین دەقوری، ئەفسەری سەرکردایەتی تەموین و گواستنەوەی پاشایەتی.

ــ فەریق ساڵح کوردی، بەرپرس و پێشەوای چەکی هەوایی پاشایەتیی ئۆردن لە ساڵەکانی ۱۹٦۲ـ۱۹۷۱ی زایینی.

... پێویست بە ئاماژەکردنە کە لێرەدا تەنیا باس لە ناو و پلەی هێندێك لەو

کوردانە کرا، ئەگینا لە کتێبەکەی بەڕێز سویرکی وەك زۆربەی بابەتەکانی تر، زیاتر باسی کراوە و کەسانی زیاتر ناویان هاتووە.

### *چوارەم: لە بواری ئابووری*

زۆر لە کوردانی ئوردنی بەشدارییان لە مەیدانی ئابووری ئوردنی کرد لە گشت بوارەکانی پێشکەوتنی بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵی. لە کاتی میرنشینی دا، سەیدۆ کوردی یەکێك بوو لەو ناودارە مەزنانەی بازرگانی و کشتوکاڵی ملکدارەکانی ئوردنی کە سەری هەڵدا لە شاری عەممان.

هەروەها عەلی کوردی وەك بازرگانێك و بەڵێندەرێکی بەناوبانگ سەری هەڵدا، کە میوانخانەی مەلیك غازی و شەقاکی (السعادە) لە عەممان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەڵەپیاوە لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەم، لەو کاتەدا ناوبراو کەسایەتی دیار و هۆی بەیەك گەیشتنی شێخەکان و گەورە پیاوانی ڕۆژهەڵاتی ئوردن بوو.

حوسنی سەیدۆ کوردی ڕۆڵێکی تایبەت و کاریگەری هەبوو لە بواری بازرگانی و کۆمپانیا لە مەیدانی بانکی دا، بەشداریی کرد لە پێشبردنی بانکی ئوردنی، کە بە کۆششی ناوبراو بۆ یەکەمین دەزگای مەسرەفی لە وڵاتدا، ماوەیەك ئەندامی ژووری بازرگانی عەممان و ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی بانکی ناوەندیی ئوردنی بوو.

هەروەها سافی ئەحمەد کوردی ئیشوکاری کردووە لە بواری بەڵێندەرایەتی گشتی و بەرپرسی کارخانەی بزمار بووە و کارخانەی دروستکردنی پلاستیکی ئەغواری دامەزراند و بەشداریی و ئامادەبوونی زۆر هەبوو لە کۆنگرەکانی پیشەسازی و کشتوکاڵی لە ئاستی نیشتمانی عەرەبی.

دکتۆر ئەشرەف کوردی ئەندامەتی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی بانکی

ئۆردنی لە ئەستۆ بووە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٥-١٩٧٧ و ڕۆڵێکی ئایینی هەبوو لە بنیادنانی کۆمپانیاکانی ناوخۆیی.

لە بواری کشتوکاڵی ئاماژە بە ڕۆڵی عەشیرەتی سەعدوون کوردی دەکەین کە نیشتەجێنە لە شارۆچکەی سەمەر/ پارێزگای بەنی کەنانە، لە چاندنی داری زەیتوون و هاندانی جەماوەرەکەی بۆ بڵاوکردنەوەی لە ناوچەکەدا.

هەروەها کۆششی زیادیان کردووە لە گەیاندنی دەزگای تازەی سەردەم بۆ کوشینی زەیتوون لە پارێزگای ئەربد و کارخانەیەکی تایبەتیان دروست کرد بۆ کوشینی زەیتوون و کەرەستەکەی کوشینی....

***پێنجەم: لە بواری چالاکیی کۆمەڵایەتی و خۆبەخت کردن***

ڕۆڵی تایبەت و کاریگەری چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان لەدوای دامەزراندنی کۆمەڵەی خێرخوازیی سەلاحەدینی ئەیووبی لە عەممان دەستی پێکرد لە ساڵی ١٩٧٠ی زایینی، کە کۆمەڵەیەکی خێرخوازی فەرمی کە لەلایەن یەکێتیی گشتیی کۆمەڵە خێرخوازەکانی ئۆردن مۆڵەتی پێدراوە...

ئەو کۆمەڵەیە هەڵساوە بە خزمەتکردنی کەسایەتی کوردی لە ئۆردن لە بواری کۆمەڵایەتی بەپێی توانا مادیەکانی و بەپێی چالاکیە کارگێڕییەکانی یەك لەدوای یەك، خزمەتگوزارییەکانی کۆمەڵە تایبەت بوو بە هاوکاریی هەژاران و نەداران و یارمەتی گەنجەکانی وەرزشکار و هاوکاریی ماددیی قوتابییە هەژارەکان بۆ تەواوکردنی خوێندنیان لە زانکۆ و دانانی شوێنی فێرکردنی دروومان و کردنەوەی شوێنی تایبەت بۆ بەخێوکردنی منداڵان و لێقەوماوان و...

هەروەها لە چالاکیە مەزن و پێشکەوتووەکانی بە مەبەستی پەیوەندی

و پتەوکردنی برایەتیی کورد و عەرەب و کوردەکان خۆبەخۆ و کۆمەڵگەی ئۆردنیش بە گشتی، هەروەها بووە هۆی پێشکەوتنی هەستی نەتەوایەتیی کوردی و ڕۆشنبیریی لەنێوان کوردەکان بە دروستکردنی تیپی سەلاحەدینی فۆلکلۆری و پێشکەشکردنی هەڵپەڕکێ و سەما و گۆرانیی کوردی لە ئاهەنگە ڕەسمیی و نیشتمانییەکانی ئۆردنی و جەژنی نەورۆز و ...

هەروەها چەندین خولی تایبەت بۆ زمانی کوردی کردۆتەوە و گۆڤارێکی بەناونیشانی (بیناهی / الضیاء) دەرکردووە و فەرهەنگی کوردیی نوێی مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی بە چاپ گەیاندووە لە ساڵی ١٩٨٥، هەروەها ساڵنامەیەکی کوردی کە ئاسەواری کوردی و شارستانیەتی تێدا دیارە، بڵاو کردۆتەوە، هەروەها بەشداریان لە جەژن و شادیی و ڕێوڕەسمە نیشتمانییەکاندا کردووە.

هەروەها لەلایەن کوردەکانی ناودار و میواندار و خانەخوێ دیوەخان و میوانخانەی زۆر دروست کراوە وەك دیوەخانی (ال کوردی) لە گەڕەکی شابسوغ لە عەممان لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم... هەروەها دیوەخانی دیکە لە ئەربد و عەممان و دێر ئەبی سەعید و سەمەر و زەرقا دروست کراوە بۆ میوانان و کاری تایبەتی کۆمەڵایەتی، دەبێ ئەوە چاك بزانین دامەزراندنی ئەو میوانخانە و دیوەخانانە چالاکییەکی مەزنە بۆ نزیك بوونەوە و یەکگرتنی کوردەکانی ئۆردن خۆبەخۆ و جەماوەری ئۆردنی بە تێکڕا.

بەڵام سەبارەت بە پەیوەندیی کوردەکان لەگەڵ جەماوەر و کۆمەڵگای ئۆردنی لە گشت تایفە و عەشیرەتەکانی، پەیوەندییەکی پتەوی برایانە و دۆستانە و خۆشەویستیە و هاوسەنگە لەنێوانیان، ئەوان خاوەنی یەك ئایین و ڕێوڕەسمیان نزیکە لە یەکتر، مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە و لەڕووی جوگرافییەوە دراوسێی یەکترن و بیروبۆچوونی وەك یەکیان هەیە....

هەروەها لەنێوان کوردەکان و جەماوەری ئۆردنی ژن هێنان ئاسایی و بێ گرفت بووە، جێگای ئاماژەیە کە نێوان کوردەکان و بنەماڵەی هاشمی پەیوەندی هاوسەری هەیە، وەك دەبینین شەریف رکان کچی سورەیا کوڕی ئەمین عالی بەدرخانی هێناوە کە لە سەردەمی عوسمانییەکان خاوەن جێ و شوێن و پلەوپایەی بەرز بووە. هەروەها شەریف ناسر کوڕی جەمیل کچی شەریف رکانی لە ژنە کوردەکەی هێناوە و مامۆستا وەلید ئیسماعیل کوردی هاوسەریتی لەگەڵ خاوەن شکۆی پاشایەتی ئەمیرە(بەسمە کچی تەلال) گری داوە و مامۆستا زەید سەعدەدین جومعە کوردی گرێبەستی هاوسەرییەتی لەگەڵ خاوەن شکۆی پاشایەتی هاشمی ئەمیرە (عائیشە کچی حوسێن) بەستووە.

هەروەها زۆر لە کەسایەتییە سیاسییەکانی ئۆردن دەبینین کە لە دایك کوردن وەك خوالێخۆشبوو وەسفی تەل و براکەی سەعید تەل، خوالێخۆشبوو حەمەد فەرحان و براکەی مامۆستا محەمەد مەهدی فەرحان و مامۆستا تاهیر حیکمەت.

بەڵام لەڕووی زمانی کوردییەوە، ئەو کوردانەی کە لە یەکەم جار هاتن بۆ ئۆردن لە کۆتایی چارەکە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم بە زمانی کوردی ئاخفتنیان دەکرد، بەڵام نەوەکانیان لەدوای ئەوان لە بیریان کرد، ئێستاکە لەو سەردەمەدا دەبینی هەندێ لە ڕۆشنبیران قسەی پێدەکەن یان ئەوانەی کە لە گەڕەکی کوردانی دیمەشق یان لە جەزیرە دێن، پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێ کە مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی بە ناونیشانی (القاموس الكوردي الحديث ) داناوە.

لەڕووی جل‌وبەرگی کوردییەوە، دەبینین هەندێ لە ڕۆشنبیرانی کورد خاوەنی جل‌وبەرگی کوردیی خۆیانن، هەروەها تیپی سەلاحەدینی ئەیووبی

جل‌وبەرگی کوردی لەبەر دەکەن لە کاتی جەژن و ڕێوڕەسمە نیشتمانی و میللییەکانی ئۆردن و کوردی.

ئێستاکە ناوی کوردی بڵاو بوونەوە و ناوی کوردی لەناو کوردەکان لە پەرەسەندن دایە، بەڵام سەبارەت بە ئایین زۆربەی کوردی ئۆردن شافعین و سەر بە ئایینزای سوننی و لەوێ هەندێك سۆفی هەن و لەناو کوردەکان هەندێ خانەوادەی مەسیحیش بەرچاو دەکەون.

*شەشەم: ڕۆڵی کوردان لە بزووتنەوە و چالاکیی وەرزشی لە ئۆردن*

کوردەکانی ئۆردن بەشداریان کردووە لە بزووتنەوەی وەرزشی لە سەرەتای دەست بەکاربوونییەوە و وەك یاریزان و کارگێڕ و مامۆستا و ئەکادیمی هەندێکیان لەسەر ئاستی وڵات خەڵاتیان وەرگرتووە و لەسەر ئاستی عەرەبی و جیهانی نوێنەرایەتیی یارییەکانیان کردووە.

لەو بارەیەوە دەمانەوێ ناوی سێ بنەماڵەی کورد یاد بکەینەوە کە جێی دەستیان دیارە لە بزووتنەوەی وەرزشی ئۆردنی کە ئەوانەن: عەلی و حوسنی کوردی، سەیدۆ کوردی لە بواری تۆپی پێ و باسکیل و، کوڕەکانی خوالێخۆشبوو دەروێش مستەفا کوردی لە بواری تۆپی سەر مێز و، بنەماڵەی زیای کوردی لە بواری تۆپی سەرمێز و ...

بۆ نموونە هەر دوو برا عەلی و حوسنی کوڕی سەیدۆ کوردی یاری تۆپی پێیان هێنا بۆ ئۆردن لە ساڵی ١٩٢٢ی زایینی یان کوڕەکانی خوالێخۆشبوو دەروێش مستەفا کوردی بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ یاری تۆپی سەرمێزیان لە ئەستۆ گرت و مەشقیان بە خەڵك و جەماوەری ئۆردنی دەکرد...

## • ناودارانی کورد لە ئۆردن

***یەکەم: ناودارانی کورد لە سەردەمی ئەیووبی، مەملووکی و عوسمانیدا***

١ـ مەلیک ناسر داوود کوڕی عیسا کوڕی محەمەد کوڕی ئەیووب کوڕی موعەزەم عیسا. لەدایکبووی دیمەشقە سالّی ٦٠٣ی کۆچی بەرامبەر ١٢٠٦ی زایینی، لە مالّی باوکی دەستی کرد بە ئیشوکاری هەمەجۆری زانستی و هەر لەوێ پێگەییشت، ژیانی وەك زانایان بوو و ڕێزی لی دەگرتن، چووە بەغدا بۆ بەدەسهێنانی زانست و لەوێ زۆر لە زانایان گوێگری بوون.

مەلیك کامل محەمەد ملّکی دیمەشقی لێ ستاندووە و لە شوێنی لە ناوچەی ڕۆژهەلّاتی ئۆردن بۆ قەرەبوو کردۆتەوە. میرنشینی (کەرك)ی ئەیووبی بنیاد کرد لە سالّی ٦٢٦ی کۆچی/ ١٢٢٩ی زایینی، ئینجا بزووتنەوەی ئەدەبی لە ڕۆژهەلّاتی ئۆردن دەستی پێکرد لەو کاتەی کە مەلیك ناسر لێ نیشتەجێ بوو، هەر بۆیەش کەرك بووە قیبلەی زانایان و ئەدیبان، کە زۆر لەو زانایانە دەوریان دا لەوانە ئەدیب فەخرولقوزات ئەبوو فەتح نەسرولّلا ئەلغەفاری کە بەناوبانگە بە ئیبن بساقە، ڕێزمانوانی ئەدیب ئیبراهیم کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاقی ئەمەوی قرشی، ئیبن ئەللەتی، شەمسەدین عەبدولحەمید خسرۆشاهی و سەیفەدین عەلی ئەلئەمەدی، ئەبولحەسەن بن محەمەد ئەلتووسی... مەلیك ناسر خۆی ئەدیب و شاعیرێکی چاك بوو...

... مەلیك ناسر لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە...

٢ـ شادی کوڕی ناسر داوود کوڕی موعەزەم عیسا. ناودار بووە بە مەلیك زاهیر. لە سالّی ٦٢٥ی کۆچی لە دیمەشق لەدایك بووە. لەدوای لەگەڵ باوکی چووە بۆ کەرك (کە بووە میری کەرك)، ئینجا میرنشینی کەرکی ئەیووبی دامەزراند. باوکی غۆر ئۆردنی پێشکەش کرد. لەدوای وەفاتی

باوکی و دەست بەسەرداگرتنی کەرك لەلایەن سالْح نەجمەددین ئەیووب، شادی لە غۆر ئۆردن مایەوە و هەر لەویٚ نیشتەجیٚ بوو هەتا کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ٦٨١ی کۆچی/ ١٢٨٢ی زایینی، تەرمەکەی گواسترایەوە بۆ قودس و هەر لەویٚ بە خاك سپێردرا.

٣ـ محەمەدکوڕی مەلیك ئەشرەف موزەفەرەدین مووسا کوڕی مەلیك ناسر یوسف کوڕی مەلیك مەسعوود سەلاحەدین ئەقش کوڕی کامل محەمەد ئەیووبی.

٤ـ نەجمەدین یوسف کوڕی داوود کوڕی موعەزەم عیسای ئەیووبی. ساڵی ٦٢٨ی کۆچی/ ١٢٣٠ی زایینی لە کەرك لەدایك بووە. لە ناودارانی ئایین و فەزیلەت و پلەوپایەی بەرز بووە. خەریکی وانە گوتنەوە بوو لە کەرك و شوێنی دیکە، یارمەتی هەژار و دەستکورت و نەدارانی دەدا، لە ساڵی ٦٩٨ی کۆچی/ ١٢٩٨ی زایینی لە قودس کۆچی دوایی کرد.

٥ـ غازی کوڕی داوود کوڕی عیسا کوڕی ئەبوبەکر کوڕی ئەیووب کوڕی شادی کوڕی ناسر داوود کوڕی موعەزەم عیسای ئەیووبی. لە قەڵاتی کەرك لەدایك بووە، خاوەنی فەزڵ و پێگە و زاست بووە و لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە.

٦ـعوسمان کوڕی عومەر کوڕی محەمەد کوڕی ئەیووب کوڕی مەلیك موغیس.

٧ـ عەبدولقادر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی موعەزەم عیسا کوڕی عادل کوڕی مەلیك موغیس عوومەر.

٨ـ مەلیك موغەیەسی ئەیووبی.

٩ـ مەلیك ئەمجەد ئەیووبی .

١٠ـ شهابەدین داوود کورانی.

**١١ـ محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا هەکاری.**

**١٢ـ ئەبووبەکر محیەدین سەلتی کوردی. ئەبووبەکر محیەدین کوڕی تەقیەدین سەلتی کوردی ئەیووبییە، بۆیە ناوزەد کراوە بە سەلت بە گومانی ئەوەی لە کوردەکانی هەکارییە کە نیشتەجێی سەلت بوو لە سەردەمی ئەیووبییەکان، بەرهەمی هەیە و ئەوە ناوی هەندێکیان: (ایضـاح المرامي بشرح هداية المرامي ) و ( صبابه المعاني ) و دوو دیوانی شێعری هەیە ( تخاميس السلـطي و ديوان السلـطي ) لە ساڵی ١١٠٤ی کۆچی / ١٦٨٥ی زایینی کۆچی دوایی کرد.**

١٣ـ شێخ محەمەد کوڕی قازی سەلت و کوڕەکانی

***دووەم: ناودارانی کورد لە چەرخی نوێدا***

**لە بواری سیاسیی و دیبلۆماسییەوە:**

**١ـ مامۆستا سەعد جومعە: سەعد محەمەد جومعە ئەیووبی. لەدایکبووی ساڵی ١٩١٥ی زایینیە لە توفێلە لە باشووری ئۆردن، لەساڵی ١٩٤٥ی زایینی لە زانکۆی دیمەشق بڕوانامەی لە کۆلێژی ماف وەرگرت. لە ساڵی ١٩٢٩ی زایینی وەك نووسەرێك لە وەزارەتی کار ئەرکی پێسپێردرا.نووسەر بووە لە بەشی کەرەستە لە وەزارەتی دارایی لە ساڵی ١٩٤٥ی زایینی. ساڵی ١٩٤٨ بەڕێوەبەری گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە بووە و لە ساڵی ١٩٤٩ـ١٩٥٠ بەرپرسی هۆبەی سیاسی لە وەزارەتی دەرەوە بووە. لە ماوەی ١٩٥٠ـ١٩٥٤ سکرتێر بووە لە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران و تا ساڵی ١٩٥٧ جێگری وەزیری ناوخۆ بووە. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٤ ـ ١٩٥٨ی زایینی پارێزگاری پایتەخت بووە و ١٩٥٨ ـ ١٩٥٩ جێگری وەزیری دەرەوە. باڵوێز لە ئێران و سوریا و ئەمریکا لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٨ ـ ١٩٥٩. وەزیری دەرباری پاشایەتی هاشمی ساڵی ١٩٦٥. دوو جار بووە سەرۆك وەزیرانی ئۆردن لە**

ساڵی ١٩٦٧ی زایینی. لەدوای باڵوێز بووە لە بەریتانیا. پاشان چەندین جار بە ئەندامی پەرلەمان دەستنیشان کراوە تا کۆچی دوایی کرد لە بەرواری ١٩٧٩/٨/١٩ی زایینی.

سەعد جومعە یەکێك بوو لەو کەڵە پیاوانەی بێنموونە لە ئۆردن لە بوارەکانی سیاسەت و ئەدەب و هزر و ڕۆژنامەوانی و ئاخافتن. بیرکردنەوە و هزری ئەو کەڵەپیاوە جێگای سەرسوڕمانی خەڵکی ئۆردن و دەرەوەی ئۆردن بوو. زۆر نەترس و دڵسۆز بوو وەك تاکێکی ئەو وڵاتە لە خزمەت میللەت و جەماوەرەکەیدا بوو بە تایبەتی بەرامبەر بە تەختی پاشایەتی دەسەڵاتدار لە ئۆردن.

زۆر لە وتارە سیاسی و ئەدەبییەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆیی و عەرەبییەکان بڵاو کراونەتەوە. هەروەها چەند کتێبێکی داناوە وەك ( الله او الدمار، ابنا الافاعی، الموامره و معرکه المصیر، مجتمع القیم مخطوط ). هەروەها تا کۆچی دوایی بە بەرپرسی فەخریی کۆمەڵەی خێرخوازی سەلاحەدینی ئەیووبی کە تایبەت بوو بە کوردەکانی ئۆردن، مایەوە.

٢ـ دکتۆر ئەشرەف کوردی: ناوبراو ئەشرەف عەلی سەیدۆ کوردییە و ساڵی ١٩٣٧ی زایینی لە عەممان لەدایك بووە و بڕوانامەی لە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.

بەشێك لە کار و چالاکییەکانی ناوبراو: بەدەستهێنانی بڕوانامەی زەمالەی بەریتانی ساڵی ١٩٧٠ ـ ١٩٧٣ی زایینی/ بەدەستهێنانی بەرزترین بڕوانامەی شەرەفی پزیشکی لە ساڵی ١٩٧٤ لە بەریتانیا/ دامەزراندنی یەکەمین یەکێتیی لە نەخۆشییەکانی مێشك و ئەعساب لە ناوەندی خزمەتە پزیشکییەکانی پاشایەتی ئۆردن لەگەڵ دۆستەکانی/ مامۆستایەتی کردووە لە کۆلێژی

پزیشـکی لـە زانکـۆی ئـۆردن/ مامۆسـتای میـوان بـووە لـە زانکـۆی هارڤاردی ئەمریکـی بـۆ مـاوەی شـەش مانـگ لـە سـاڵی ١٩٧٥ی زایینـی.

ئەمینـداری گشـتیی یەکێتیـی پزیشـکانی زانسـتی عەسـەبی عـەرەب بـووە لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٨٤ ـ ١٩٩٣/ یەکەمیـن لێپـرسراوی پزیشـکانی زانسـتی عەسـەبی ئـۆردن بووە لە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٨٣ـ١٩٨٥/ لە سـاڵی ١٩٨٧ ـ ١٩٨٨ ڕاوێـژکاری دەزگای چارەسـەری پزیشـکی بـووە.

لـە زۆربـەی کۆمەڵـە پزیشـکیی و کۆمەڵایەتییـە ناوخۆیـی و جیهانییـەکان ئەنـدام بـووە، سەرنووسـەری دوو گۆڤـاری پزیشـکی زانسـتی بـوو/ بڕوانامـەی ڕێزلێنانـی لـە شـکۆدار مەلیـك حوسـێن کـوڕی تەلال لـە سـاڵی ١٩٧٧ی زایینی وەرگـرت/ بڕوانامـەی شـەرەفی لـە کۆلێـژی پاشـایەتی بەریتانـی بـۆ پزیشـکان (FTCP) وەرگـرت. یەکەمیـن پزیشـکی ئۆردنـی بـووە کە ئـەو جـۆرە بڕوانامەی بەدەسـت هێنـاوە و بوویتـە خـاوەن خەڵاتێکـی زۆری جیهانـی لـە ڕووی پزیشـکییەوە. ئەندامـی ئەنجوومەنـی نوێنـەران بـووە لەنێـوان سـاڵەکانی ١٩٩٣ ـ ١٩٩٧ی زایینـی/ بـووە بـە وەزیـری تەندروسـتی لەنێـوان سـاڵەکانی ١٩٩٧ ـ ١٩٩٨.

دکتـۆر ئـەشرەف کـوردی پزیشـکێکی بەناوبانـگ بوو لـە ئـۆردن و جیهاندا، پزیشـکی تایبەتـی سـەرۆکی فەلەسـتینی یـاسر عەرەفـات بـووە، خێزانێکـی بەختەوەریـان پێکهێنـا لەگـەڵ دکتـۆرە هـودا عەبدولحەمیـد سـەلمان و بوونـە خاوەنـی چـوار کـوڕ: خالیـد، لوئـەی، عوومـەر، تـەلال.

٣ـ ئەندازیـار سـەلاح محەمـەد جومعـە: لـە شـاری توفێلـە لـە ئـۆردن سـاڵی ١٩٢٧ی زایینـی لەدایـك بـووە، بـرای خوالێخۆشـبووان سـەعد جومعـە و سـەعدەدین جومعـە بـووە. بڕوانامـەی بەکالۆریۆسـی کشـتوکاڵیی لـە زانکـۆی

قاهیـرە لـە سـاڵی ١٩٥٣ وەرگرتـووە، ماجێستـەری لـە سـاڵی ١٩٥٦ی زایینـی لـە زانکـۆی لەنـدەن وەرگرتـووە. پلەوپایـەی بـەرزی هەبـووە لـە کار و ئەرکەکانـی، وەزیـری تەمویـن بـووە لـە سـاڵی ١٩٧٦ی زایینـی، وەزیـری کشـتوکاڵ بـووە لـە سـاڵی ١٩٧٦ ـ ١٩٧٩. لـەدوای ئـەوە بـووە بـە بەڕێوەبـەری گشـتی ڕێکخـراوی کشـتوکاڵ و خۆراکـی نێودەوڵەتـی بـۆ کاروبـاری خـاوەری نزیـك، وەك شـارەزایەك لـە کاروبـاری کشـتوکاڵی لە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت کاری کردووە و لـە سـاڵی ١٩٩٨ لـە بنیـادی وام (قـەرز)ی کشـتوکاڵی ئۆردنـی ئەنـدام بـووە.

٤ـ مامۆستا سەعدەدین جومعە: لە شاری توفێلە ساڵی ١٩٢٣ی زایینی لەدایك بووە، خوێندنی ناوەندیی لە قوتابخانەی سەلتی ناوەندی لە ساڵی ١٩٤٤ تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٥٥ی زایینی دیبلۆمی بەڕێوەبردنی لە ئەمریکا وەرگرتووە. فەرمانبەر بووە لە وەزارەتی دارایی و سەرۆکایەتی وەزیران، وەك سکرتێر و یاریدەدەری سکرتێری گشتی. سکرتێری گشتیی ئەنجوومەنی وەزیرانیش بووە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٧ ـ ١٩٩٧ی زایینی. هەروەها دوو جار وەزیری کاروباری ئەنجوومەنی وەزیران بووە و دواتر بۆتە نوێنەر لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئۆردن.

٥ـ دکتـۆر یوسـف مسـتەفا زهنـی: سـاڵی ١٩٢٣ی زایینـی لە عەمـمان لەدایك بـووە، دەرچـووی کۆلێـژی پزیشـکییە لە زانکۆی دیمەشـق، بەشـی پسـپۆریی لە ئەمریـکا و بەریتانیـا تەواو کـردووە. لە شـوێنی جۆراوجۆر کاری کـردووە، پلەی شـارەزایی هەبـووە لـە ڕێکخـراوی تەندرووسـتیی جیهانـی، نەقیبـی پزیشـکانی ئۆردنـی بـووە، هەروەهـا ئەمینـداری گشـتیی مانگی سـووری ئۆردنـی بووە.

لـە سـاڵی ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ی زایینـی بـە وەزیـری کاروبـاری کۆمەڵایەتـی و کار دەستنیشـان کـراوە. بەڕێوەبـەری کۆمپانیـای دروسـتکردنی شووشـە و جێگـری بەرپرسـی ئەنجوومەنـی بەڕێوەبردنـی بانکـی ئـۆردن بـووە.

دکتۆر یوسف لە ئۆردن یەکێك لە پێشەوایانی مەیدانی پزیشکی بووە و چەند بەرهەمی چاپکراوی هەیە وەك: (الفلورايد و مياه الشرب). لە سالی ١٩٨٦ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

٦ـ ڕەشید عەبدوولکەریم مەدفەعی: لە ساڵی ١٨٨٢ی زایینی لە بەغدا لەدایك بووە. بە پلەی ئەفسەری خزمەتی لە سوپای عوسمانی کردووە. بەشداریی لە شەڕی (کوت، عیمارە) کردووە دژ بە داگیرکەرانی ئینگلیز تا ئەو کاتەی بە دیل دەگیرێت لە ساڵی ١٩١٥ی زایینی. لە شۆڕشی عەرەبیدا لە یەکێك لە بەشە سوپاییەکان فەرماندە بووە و لە ڕۆژهەڵاتی ئۆردن بەشداریی لە شەڕەکاندا کردووە... ڕێبەریی تیپی پیادەی یەکەمی دەکرد کە پێك هاتبوو لە دوو لیوا (یەکەم و چوارەم) لە ساڵی ١٩١٨ی زایینی.

لە سەردەمی فەیسەڵی سوری بە فەرماندەی تیپی دووەم لە عەممان دەسنیشان کرا، لە دوایی بە فەرماندەی سوپایی لە ناوچەی عەممان ـ مەعان دەسنیشان کرا. لەدوای بنیادنانی میرنشینی ئۆردن لە بەڕێوەبردنی ناوخۆ بەشداریی کرد و لە ساڵی ١٩٢١ بە فەرمانڕەوای کارگێڕی پارێزگای بەلقا و، لە ساڵی ١٩٢٣ بە پارێزگاری کەرك و لە ساڵی ١٩٢٥ بە پارێزگاری عەجلوون دەستنیشان کرا.

لە ساڵی ١٩٢٣وەك بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی دیاری کراوە و لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٨ ـ ١٩٣٠ وەك پارێزگاری پارێزگای بەلقا و لە ساڵی ١٩٣٨ وەك پارێزگاری پایتەخت دەستنیشان کراوە. لە ساڵی١٩٣٩ ـ ١٩٤٠ بووە بە وەزیری ناوخۆ و بەرگری و لە ڕێکەوتی ١٩٤٦/٢/٢٢ی زایینی لە شاری سەلت کۆچی دوایی کرد دوای ئەوەی وەك کەسێکی ناودار و خاوەن ئیرادە ناسرابوو. هەموو خەڵك ڕێزی تایبەتیان بۆ هەبووە، بە زمانی کوردی قسەی

دەکـرد و ڕێـزی تایبەتیشـی بـۆ جەمـاوەر هەبـووە.

٧ـ مامۆسـتا مەدحـەت محەمـەد جومعـە: لـە سـاڵی ١٩١٨ی زایینـی لـە شـاری سـەڵت لەدایـك بـووە. لـە سـاڵی ١٩٤٥ بڕوانامـەی لیسانسـی ئەدەبیاتـی لـە زانکـۆی قاهیـرە بەدەسـت هێنـاوە. لـە سـاڵی ١٩٤٨ دیبلۆمـی ڕۆژنامەوانـی وەرگرتـووە. لـە سـاڵی ١٩٤٤ لـە قوتابخانـەی سـەلتی ناوەنـدی مامۆسـتای وانـە بـووە... سـکرتێری یەکـەم بـووە لـە باڵیۆزخانـەی ئۆردنـی لـە قاهیـرە لـە سـاڵی ١٩٥٨ ـ ١٩٥٩. ڕاوێـژکار بـووە لـە باڵیۆزخانـەی ئـۆردن لـە قاهیـرە و بەیـروت. هەروەهـا وەزیـری مفەوەزیـش بـووە لـە پاکسـتان لـە سـاڵی ١٩٥٥ی زایینـی.

لە ساڵی ١٩٥٦ی زایینی بە بەرپرسی تەشریفاتی پاشایەتیی ئۆردن دەستنیشان کراوە، جێگری ئێزگە و بڵاوکراوەکان بووە لە وەزارەتی دەرەوە، هەروەها نوێنەریش بووە بۆ کاروباری کۆشکی پاشایەتی لە ساڵی ١٩٥٧ی زایینی.

دەستنیشان کرا بە باڵوێزی ئۆردن لە وڵاتەکانی: ئەمریکا لە ساڵی ١٩٥٨، مەغریب لە ساڵی ١٩٥٩، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە ١٩٦٧، میسر و بەریتانیا لە ساڵی ١٩٦٧ ـ ١٩٦٩، تونس لە ساڵی ١٩٦٩ ـ ١٩٧١ و ئەسپانیا لە ساڵی ١٩٧١ی زایینی.

لـە سـاڵی ١٩٣٦ لـە تەمەنـی لاوی گەیشـتە شۆڕشـی فەلەسـتین و فەرماندەیی زۆربـەی خۆپێشـاندانەکانی لـە عەمـمان کـرد کـە لـە تەمەنـی ١٥ سـاڵیدا بـوو. گشـت ژیانـی ئـەو کەڵـە پیاوە پڕ بـووە لـە خۆبەختکردن لەپێناو شـار و نیشـتمان و دۆزی میللەتەکـەی. کتێبێکـی هەیـە بـە نـاوی (تسـقط الدبلوماسـية) کـە لـە سـاڵی ١٩٧٩ی زایینـی لـە چـاپ دراوە، لـە ڕۆژنامەکانـی ناوخـۆ هەنـدێ وتاری بـڵاو بۆتـەوە. لـە بـەرواری ١٩٩٠/٤/٢٠ی زایینـی کۆچـی دوایـی کرد.

● **لە بواری ڕۆژنامەوانی و نووسین و دانان:**

١ـ مامۆستای مێژوونووس و زمانوان عەلی سەیدۆ کوردی: لە ساڵی ١٩٠٨ی زایینی لە شاری عەممان لەدایک بووە. هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە زانستی سیاسی و ئابووری لە زانکۆی ئەمریکی/ بەیرووت لە ساڵی ١٩٢٨ی زایینی و یەکەمین قوتابی ئۆردنی بووە لە زانکۆ. نزیکەی بیست ساڵ لە مەیدانی فێرکردن کاری کردووە و لە قوتابخانەکانی عەممان و سەلت و کەرك و ئەربد مامۆستا و بەڕێوەبەر بووە. لە ساڵی ١٩٣٤ی زایینی بووەتە سکرتێری ئەنجوومەنی یاسایی ئۆردنی و لە ساڵی ١٩٤٩ قایمقامی جەبەل عەجلوون بووە و دوایی ڕووی کردۆتە ئیش و کاری دیبلۆماسی، خزمەتی زۆری هەبووە لە باڵیۆزخانەی ئۆردنی لە: سعوودیە، سوریا، تورکیا، یەمەن. تا ئەو کاتەی خانەنشین بوو بە پلەی وەزیر لە ساڵی ١٩٦٢ی زایینی.

مامۆستا عەلی سەیدۆ بلێسەیەکی ڕووناك بووە لە ئاسمانی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی، وەرگێڕانی زۆری هەیە لە وتار و کتێب لە مێژوو و زمانی کوردی. کتێبێکی دانا بە ناونیشانی (من عماد الی العمادیە) یان (جولە فی کوردستان الجنوبیە) و لە ساڵی ١٩٣٩ لە قاهیرە لە چاپ درا کە بۆ ماوەیەکی زۆر بووە سەرچاوەیەك لەسەر کوردەکان بە زمانی عەرەبی. هەروەها بووە یەکەمین پەرتووك لە ئەدەبیاتی گەشت لە ئەدەبی ئۆردنی... فەرهەنگێکی زمانەوانی دانا بە ناوی (القاموس الکوردی الحدیث) لە ساڵی ١٩٨٥ی زایینی لە چاپ درا.

مامۆستا عەلی سەیدۆ کوردی کتێبێکی دەربارەی کوردەکانی ئێران بە ناونیشانی (اللر و اللرستان) لە گۆڤاری (المجمع العلمی لکوردی العراقی) لە ساڵی ١٩٧٤ی زایینی بڵاو کردەوە، هەروەها زۆر کتێبی باشی لەبارەی دۆزی کوردان وەرگێڕا وەك (کتاب الاکراد دانانی حەسەن ئەرفەع، رحلە

بین الشجعان لە دانا شمیس، جمهوریە مهاباد الکوردیە لە ولیام ئیگلتۆن، الاکراد لە تۆماس بوا، مشکلە الاقلیم الشرق فی ترکیا لە محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان). هەروەها ئەوانەشی هەیە: ملحق القاموس الکوردی العربی، رحلە فی ربوع الیمن فی اخریات الامام احمد.

بەرپرسی فەخری کۆمەڵەی خێرخوازیی سەلاحەدینی ئەیووبی بووە... خزمەتی زۆری بە مێژوو و زمانی گەلەکەی کردووە و کات و قەڵەمەکەی لە خزمەت میللەتەکەی دانا. هەروەها دڵسۆزانە خزمەتی نیشتمانەکەی ئۆردنی کردووە. ئەو کوڕانەی هەیە: مامۆستا مازن و دکتۆر ئەشرەف کوردی پزیشکی بەناوبانگی کورد. ئەو کچانەشی هەیە: شیرین، نەسرین، نەرمین، هەیام.

٢ـ ڕۆژنامەوان و نووسەر عەبدولڕەحمان کوردی: لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی لە شاری عەممان لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٤٩ لە زانکۆی مەلیك فوئادی یەکەم لە قاهیرە بەکالۆریۆسی ئابووریی وەرگرتووە. بۆ ماوەیەکی کەم لە کەرتی حکوومی کاری کردووە، ئیشوکاری لە کەرتی تایبەت لە بواری بڵاوکردنەوە و بازرگانی و بەڵێندەرایەتی دەست پێکرد، گۆڤاری (الاردن الجدید)ی لە ساڵی ١٩٥٠ بەچاپ گەیاند. یەکەمین چاپخانەی لە ئۆردن دامەزراند لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٤ ـ ١٩٥٧ی زایینی. لە دوایی لە کەرتی بازرگانی و بەڵێندەرایەتی دەست بەکار بوو. مامۆستا عەبدولڕەحمان کوردی نووسەر و ڕۆژنامەوانە، زۆر لە وتارەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ناوخۆ و عەرەبی بڵاو کراوەتەوە. دوو کتێبی چاپ کرا بە ناوەکانی (وادی الاردن و امتیازاتە و مشروعاتە) کە لە قاهیرە لە چاپ دراوە لە ساڵی ١٩٤٩ی زایینی و کتێبی (الحب بعد الموت کاملا) کە لە ساڵی ١٩٨٧ لە چاپ دراوە. هەروەها چەند کتێبێکی دەستنووسیشی هەیە.

٣ـ نووسەر و توێژەر محەمەد عەلی سوێرکی کوردی: لە گوندی (تبنە) قەزای کورە، سەر بە پارێزگای ئەربد لە ساڵی ١٩٦١ی زایینی لەدایك بووە. خانەوادەکەی لە ساڵی ١٩٥٦ی زایینییەوە لە شارۆچکەی ئەبی سەعید نیشتەجێ بوون و ناوبراو لە منداڵی و گەنجێتیدا هەر لەوێ ژیاوە.

خوێندنی ناوەندیی لە قوتابخانەی دێر ئەبی سەعید لە ساڵی ١٩٨٠ی زایینی تەواو کردووە، خاوەنی بڕوانامەی دیبلۆمی کتێبداریی و بەکالۆریۆسی زمانی عەرەبی و ماجستەری شێوەکارییە و، لە ساڵی ١٩٨٢ی زایینی وەك مامۆستایەك لە وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن خەریکی کارە. ئەندامە لە یەکێتیی نووسەرانی ئۆردن، بڕوانامەی ڕێزلێنانی حکومەتی وەرگرتووە لە ساڵی ١٩٩٥ی زایینی. زۆر وتار و لێکۆڵینەوەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆیی و عەرەبییەکان بڵاو کردۆتەوە. ئەو کتێبانەشی داناوە:

١ـ الاردن فی اشعار العرب، عەممان، وەزارەتی ڕۆشنبیری، ١٩٨٨ی زایینی.

٢ـ نوابغ الاردن فی العهد الاسلامی، عەممان، دار عەممار، ١٩٩٠ی زایینی.

٣ـ شرقی الاردن و العهد الفیصلی، عەممان، دار عەممار، ١٩٩٣ی زایینی.

٤ـ مصادر و مراجع عن الثورة العربیە الكبری، عەممان، لیژنەی مێژووی ئۆردن، ١٩٩٦ی زایینی.

٥ـ تاریخ السلط و البلقا، عەممان، وەزارەتی ڕۆشنبیری، ١٩٩٨ی زایینی.

٦ـ عمان تاریخ و حضارة و آثار، عەممان، دار عەممار، ٢٠٠٠ی زایینی.

٧ـ تاریخ الاكراد، بڵاو کرایەوە لە ڕۆژنامەی (اللوا) لە ساڵی ١٩٩٧ی زایینی.

٨ـ مذكرات اسماعیل عرضە، لێکۆڵینەوە، عەممان، ناوەندی ئۆردن بۆ دیراساتی تازە (نوێ)، ئامادەی چاپە، ٢٠٠٤ی زایینی.

٩ـ مصادر و مراجع عن الاردن، عەممان، لیژنەی مێژووی ئۆردن،

٢٠٠٣ی زایینــی .

١٠ـ الأكـراد الاردنیـون و دورهـم فـی بنـا الاردن الحدیث، عەمـمان، ٢٠٠٤ی زایینـی./ ئـەو كتێبـەی كـە سـەرچاوەی سـەرەكیی ئـەم باسـەی ئێمەیـە و لـە ژێر ناونیشـانی «كـوردە ئۆردنییـەكان و ڕۆڵیـان لـە بنیادنانـی ئۆردنـی نوێـدا» لەلایەن بەڕێـز حەمیـد گـەردی وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمانـی كـوردی.

٤ـ توێـژەر حەنـان عەبدولڕەحـمان كـوردی: لەدایكبـووی سـاڵی ١٩٤٩ی زایینـی لـە عەمـمان. بڕوانامـەی بەكالۆریۆسـی شـوێنەواری هەیـە لـە زانكـۆی ئـۆردن، هەروەهـا ماجسـتەری شوێنەواریشـی لـە سـاڵی ١٩٩٩ لـە وڵاتـی كەنەدا وەرگرتـووە.

لـە وەزارەتـی گەشـتوگوزار و شـوێنەواری ئـۆردن وەك فەرمانبەرێـك كاری كـردووە. هەنـدێ كتێبـی كـە لەسـەر شـوێنەواری وڵاتـی ئـۆردن نووسرابـوون، وەرگێـڕاوە كـە ئەوانـەی خـوارەوە بـوون:

ـ القلاع الاثریة فی الاردن، لە ساڵی ١٩٧٤ی زایینی.

ـ جرش دلیل المدینە الاثریة ، بەترا ١٩٨٨ی زایینی.

٥ـ دكتـۆرە پـوران كـوردی حەیـدەر: لەدایكبـووی عەمـمان سـاڵی ٩٥٥ی زایینـی/ ماجسـتەر و بەكالۆریۆسـی لـە گیانەوەرناسـی وەرگرتـووە، دكتـۆرای چارەسـەرە سەرەكیەكانیشـی لـە زانكـۆی ئەمریـكا لـە بەیـروت لەنێـوان ساڵەكانی ١٩٧٦ـ ١٩٨١ی زایینـی وەرگرتـووە.

وەك دۆسـتێكی توێژینـەوە لـە قوتابخانـەی پزیشـكی پاشـایەتی لـە لەندەن لە سـاڵی ١٩٨٧ كاری كـردووە، هەروەهـا وەك فەرمانبەرێـك لـە هەمـان قوتابخانـە لـە سـاڵی ١٩٩٠ی زایینی/ توێژینـەوە لە كیمیا لـە ناوەندی ژێنێتیك لـە كالیفۆرنیا لـە سـاڵی ١٩٩٠ ـ ١٩٩٣./ یاریـدەدەری توێژینـەوەر لە ناوەندی پێشـوو لە ١٩٩٣

ـ ١٩٩٤/ یاریدەدەری پسپۆڕی پرۆژەکان لە ناوەندی بۆکسد بۆ شێرپەنجە لە ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٤ی زایینی تا ئێستا بەردەوامە.

زیاتر لە ١٤ توێژینەوەی هەیە کە لە گۆڤارەکانی زانستی بەریتانی و ئەمریکی لەسەر شێرپەنجە و خوێن و ژێنێتیك و ... بڵاو کراونەتەوە.

خەڵاتی ئەنجوومەنی بەریتانی بۆ توێژینەوەی لە ساڵی ١٩٨٦ی زایینی وەرگرتووە و تا ئێستاکەش ئەندامی کارگێڕە لە زۆر لە دەزگا و کۆمەڵە زانستییەکانی ئەمریکی.

٦ـ نەجیمە حیکمەت: بەڕێز نەجیمە جەمیل میللی خێزانی ئەفسەری سوپایی مستەفا حیکمەتە کە یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی سوپای ئۆردنی، ساڵی ١٩٢١ی زایینی لە دیمەش لەدایك بووە، باوکی ئەفسەرێکی سوپای عوسمانی بووە لە دیمەشق، لەدوایی هاتە ئۆردن لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم، ناوبراو لە کاکڵەی ئەفسەرەکانی سوپای ئۆردنی بووە.

ئەو بەڕێزە چوویتە گشت شوێنەکانی ئەو نیشتمانە و یاداشتەکانی خۆی لە کتێبێك تۆمار کردووە کە پڕ بووە لەو ڕووداوانەی کە پەیوەندی بە مێژووی ئۆردنەوە بووە بە ناونیشانی (رحلتي مع الزمن، خمسە و ستون عاما من حیاه امراه اردنیه)، عەممان، ١٩٨٦ی زایینی. ..

٧ـ دکتۆر عیسمەت کوردی: هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە پەروەردەی وەرزشی لەزانکۆی قاهیرە ساڵی ١٩٨٦ی زایینی. هەروەها بڕوانامەی ماجستەر و بەکالۆریۆس لە خودی زانکۆی ناوبراو. مامۆستا بووە لە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی لە زانکۆی ئۆردن. یاریدەدەری ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی بووە. بەڕێوەبەری چالاکیی قوتابیانی وەرزشی و

ئێستاکەش مامۆستایە لە زانکۆی ئوردن.

ئەندام و لێپرسراوەتی زۆر لە کۆمەڵە و یەکێتییەکانی وەرزشی کردووە، ئەندامە لە یەکێتیی عەرەبی بۆ تۆپی سەرمێز کە ناوەندەکەی لە قاهیرەیە. ئەمینداری گشتی لیژنەی ئۆلۆمپی ئوردنی بووە لە ساڵی ١٩٩٧ـ٢٠٠١ی زایینی. بەرپرسی ئەنجوومەنی کارگێڕیی یەکێتی تۆپی سەر مێزی ئوردنی و شاندنی ئوردنی ئوردنی لە خولی حوسێن لە ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی.

دکتۆر عیسمەت یاریزانێکی پیشەگەرە، پاڵەوانەتی ئوردنی بۆ تۆپی سەرمێز لە شەستەکان و حەفتاکان لە سەدەی بیستەمدا بەدەست هێناوە. یاریزانێکی پیشەگەر بووە لە تۆپی پێ لەسەر ئاستی پاشایەتیی ئوردن، وەك یاریزانێك و فێرکەر و کارگێڕێك لە بواری تۆپی سەرمێز و پێ کاری کردووە.

٨ـ دکتۆر زیاد کوردی: لەدایکبووی شاری عەممان، بڕوانامەی لە بواری میکانیکی ژیان لە زانکۆی لیدز لە بەریتانیا ساڵی ١٩٨٧ی زایینی وەرگرتووە. مامۆستا بووە لە زانکۆی یەرمووك. یاریدەدەری توێژینەوە و وانەگوتنەوە لە بەشی فیزیا/ کۆلێژی زانست لە ١٩٧٩ ـ ١٩٨٣ی زایینی. یاریدەدەری مامۆستا بووە لە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی لە ١٩٨٧ ـ ١٩٩٠ی زایینی. بەرپرسی بەشی پەروەردەی وەرزشی بووە لە ساڵی ١٩٩١ ـ ١٩٩٢ی زایینی. جێگری ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی بووە لە ساڵی ١٩٩٣ ـ ١٩٩٤ی زایینی. بەڕێوەبەری ناوەندی ڕاوێژکاری و خزمەتکردنی کۆمەڵگا بووە لە ١٩٩٤ ـ ١٩٩٦ی زایینی. ڕاگری کاروباری قوتابیان و جێگری بەرپرسی زانکۆی فیلادلفیا بووە لە ١٩٩٦ ـ ١٩٩٨ی زایینی. ئێستاکەش ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی کۆلێژی (یەرمووك)ـە.

دکتۆر زیاد یاریزانێکی پیشەگەرە لە تۆپی سەرمێز و پەڵەوانەتی

پاشایەتی وەرگرتووە لەو یارییە، بەشداریی کردووە لە هەڵبژاردەی نیشتمانی بۆ پاڵەوانەتی جیهانی لە چین ساڵی ١٩٧٣ی زایینی و لە کۆیا لە ١٩٧٩ی زایینی. فێرکەر بووە لە یانەی جەزیرە ساڵی ١٩٨٨ی زایینی و فێرکەر بووە لە زانکۆی یەرمووك لە ١٩٨٨ ـ ١٩٩٢ی زایینی. ئەندامی کارگێڕ بووە لە زۆر لە زانکۆکانی ناوخۆیی یەکێتی وەرزشی و عەرەبی بە تایبەت لە تۆپی سەرمێز، بەشداری کردووە لە دانانی کتێبی (المهارات الاساسیه لکره السله) ساڵی ١٩٨٩ی زایینی...

٩ـ عەمیدی خانەنشین فەوزی زیاء: لەدایکبووی ئەربەدە ساڵی ١٩٢١ی زایینی. نیشتەجێی عەممانە لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینییەوە. خوێندنی ناوەندی لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی لە سەلت تەواو کردووە، لە بەشی زانیاری ئیشی کردووە و لەدوایی گەیشتۆتە هێزی سوپایی لە ساڵی ١٩٤٠ز. پێ بە پێ پلەی وەردەگرت بۆ سەرەوە هەتا ئەو کاتەی بە پلەی عەمید خانەنشین بوو لە ساڵی ١٩٧١ی زایینی. لەدوایی لە کەرتی مەدەنی (شارستانی) ئیشی کرد، بەڵام سەرەتا وەرزشییەکەی لە گۆڕەپانی قوتابخانەکانی عەممان و سەلت بووە لە ساڵی ١٩٣٠ی زایینی. لە ساڵی ١٩٣٦ی زایینی بەشداریی کردووە لەگەڵ تیپی وانەی سەلتی وەرزشی بۆ تۆپی پێ، لەدوایی گەیشتە یانەی فەیسەڵی و یاری کرد لەگەڵ تیپی تۆپی پێ تا سەرەتای ساڵی ١٩٤٧ی زایینی. یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی یانەی جەزیرە و لە تیپی تۆپی پێ چەند ساڵ یاری کردووە تا ئەو کاتەی گەیشتە ئیشوکاری بەڕێوەبردن (کارگێڕی). لە ساڵی ١٩٥٦ی زایینی سەرپەرشتی شاندی ئۆردنی بۆ بەشداری لە پاڵەوانەتی عەرەبیی دووەم بۆ تۆپی سەرمێز کرد لە ئەسکەندەرییە. لە دامەزراندنی یەکێتیی عەرەبی بۆ تۆپی سەرمێز بەشداریی کردووە و لە ئەنجوومەنی

یەکەمین ئیدارەکەیدا ئەندام بووە.

چەند جاران لێپرسراوەتی یەکێتی ئۆردنی بۆ تۆپی سەرمێزی لە ئەستۆ گرتووە، کە دواجار لە ساڵی ١٩٧٧ ـ ١٩٨٠ی زایینی بووە. بەر لەوەش یەکێك بووە لەو ئەستێرانەی ئۆردنی لە تۆپی سەرمێز و یاری کردووە لە یانەی جەزیرە و لە چەند ڕووبەڕووبوونەوەیەك بەشداری کردووە لە پاڵەوانەتی ئۆردن بۆ تۆپی پێ وەك یاریزانێکی پیشەگەر.

١٠ـ دکتۆر راجح عەبدوولحەمید کوردی: هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە زانکۆی ئەزهەر ساڵی ١٩٧٩ی زایینی. مامۆستا بووە لە کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی ئۆردن، سەرۆکی کۆلێژی (الدعوه و اصول الدين) بووە لە عەممان، مامۆستا بووە لە وڵاتەکانی کەنداوی عەرەب. ئیمامی جومعە و ڕێنیشاندەر و ئەندیشمەندی ئیسلامی بەناوبانگ بووە. هێندێك لە بەرهەمەکانی:

١) علاقه صفات الله تعالى بذاته، عەممان ساڵی ١٩٨٠ی زایینی.

٢) الاتجاه السفلي بين الاصاله و المعاصره، عەممان، ١٩٨٩ی زایینی.

٣) شعاع من السيره النبويه في العهد الملكي، ١٩٨٥ی زایینی.

٤) نظريه المعرفه بين القران و السنه، بۆ دکتۆرا لە ساڵی ١٩٧٩ی زایینی.

٥) اكتساح السحر و الشعوذ و الكهانه و التنجيم و الضرب و الرمل، عەممان، دار الفرقان، ١٩٩٠ی زایینی.

● **لە بواری ئابووری و کارگێڕی و کارکردن:**

١ـ حوسنی سەیدۆ کوردی: لە عەممان ساڵی ١٩٠٦ی زایینی لەدایك بووە. هەڵگری بڕوانامەی ناوەندییە لە قوتابخانەی سەهیۆن لە قودس. لە بواری کشتوکاڵی دەستی بە کار کردووە. لە دوایی لە بواری بازرگانی و

بەڵێنـدەری کۆمپانیـاکان و خزمەتگوزاریـی گشتی و بانکـەکان. ئەنـدام بـووە لـە ژووری بازرگانیی عەمـمان لـە ١٩٤٨ ـ ١٩٥٨ی زایینـی. ئەنـدام بـووە لـە ئەمانەتـی پایتەخـت، دوایـی بـووە ئەمینـدار لـە سـاڵی ١٩٦٠ ـ ١٩٦٢ی زایینـی. ئەنـدام لـە ئەنجوومەنـی بەڕێوەبردنـی بانکـی ناوەندیـی ئـۆردن و سـەرۆکی ئەنجوومەنـی بەڕێوەبردنـی بانکـی ئـۆردن و بەڕێوەبـەری هەمـان بانـك لـە سـاڵی ١٩٨١ ـ ١٩٨٧ی زایینـی.

لـەو بیسـت سـاڵەی دوایـی خـۆی تەرخـان کرد بـۆ دامەزرانـدن و پشـتگیری لـە بانکـی ئـۆردن کە بە کۆشـش و هـەوڵ و تەقەلای ئـەو بـووە گرنگترین بانکی ناوخۆی لـە ئۆردن.

خوالێخۆشـبوو حوسـنی سـەیدۆ لە پیاوانی پلە یەك بووە لە کەرتی کشـتوکاڵ و بازرگانـی و داراییەکانـی بانـك، چەنـد خەڵاتـی ئـۆردن و جیهانـی وەرگرتووە. لـە بـەرواری ١٩٨٧/١/٢٤ی زایینی لـە عەممان کۆچـی دوایی کردووە.

٢ـ سـافی ئەحمـەد کـوردی: لـە سـاڵی ١٩٤١ی زایینـی لـە دیمەشـق لەدایـك بـووە، ناسـنامەی ئۆردنـی هەیـە، بڕوانامـەی ئەندازیاریـی بیناسـازی وەرگرتـووە، لـە بـواری بەڵێندەرایەتی گشـتی و قۆنتەرات ئیشـی کـردووە، زۆرجاران بەشـدار بـووە لـە کۆنگرەکانـی کشـتوکاڵی و پیشەسـازی لـە ئاسـتی نیشـتمانی عەرەب.

٣ـ خوالێخۆشـبوو محەمـەد عەلـی کورانـی: لـە سـەرەتای ژیانـەوە وەك نووسـەرێك لـە دادگای کـەرك لـە سـەردەمی فەیسـەل لـە ڕۆژهەڵاتـی ئـۆردن لە سـاڵی ١٩١٧ ـ ١٩٣٠ی زایینـی ئیشـی کـردووە و لە سـەردەمی میرنشـینی ئۆردنی لـە بـواری بەڕێوەبـردن کاری کـردووە. بەڕێوەبـەری ناحیـەی (کـورە) بـووە لـە سـاڵی ١٩٢٥ ـ ١٩٢٧ی زایینی. قایمقامی شـارۆچکەی عەجلوون بووە لە سـاڵی

١٩٣٣ی زایینی و پارێزگاری بەلقا بووە لە ساڵی ١٩٤٨ی زایینی و بەڕێوەبەری گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە بووە و یاریدەدەری ئەمینداری پایتەختیش بووە و لە ساڵی ١٩٨٥ی زایینی لە عەممان کۆچی دوایی کردووە.

٤ـ خوالێخۆشبوو محەمەد لوتفی بایزیدی: لە ساڵی ١٨٨٥ی زایینی لە دیمەشق لەدایك بووە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانی جامچی بووە لە ڕۆژهەڵاتی ئوردن، لەدوای پێکهێنانی حکومەتی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی بووە بە پشکنەری جامچییەکان لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینی لەژێر چاودێری دارایی.

لەدوایی بووە ژمێریاری خەزێنە لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینی لە حکومەتی ڕۆژهەڵاتی ئوردن تا بووە ژمێریار لە وەزارەتی دارایی و ئابووری، لە ساڵی ١٩٥١ی زایینی کۆچی دوایی کرد.

● **لە بواری هێزی چەکداری و ئاسایشی گشتی:**

١ـ شەهید موقەدەم روکنی فرۆکەوان بەدرەدین ئەحمەد بەکر زازا: لە سەلت ساڵی ١٩٤٠.ز. لەدایك بووە... لە بەرواری ١٩٥٩/١/١٥ی زایینی بە پلەی قوتابیی پاڵێوراو لە فەرماندەی پۆلیسی سوپای پاشایەتی گەیشتە ئەو هێزە و لە ١٩٥٩/٩/٢٤ شەهید گەیشتە هێزی چەکداری ئاسمانی پاشایەتی ئوردن وەك فرۆکەوانێکی شەڕکەر.

لە ماوەی ساڵانی خزمەتیدا لە هێزی چەکداری ئاسمانی پاشایەتی ئوردن ئەو ئەرکانەی دیت:

فرۆکەوانی شەڕکەر، فەرماندەی (رەف) بە وەکالەت، فرۆکەوانی گەیاندن، هاوڕێی پاشایەتی ئوردن لە بەرواری ١٩٧٠/١١/٢٥ی زایینی، فەرماندەی

(ڕەف)ی پاشایەتی ئۆردن جگە لەوەی کە هاوڕێی پاشا بوو، شەهید لە ڕاپۆرتەکانی ساڵانەی دیاری دەکات کە ئامادەیە و دەتوانێ هەر فەرمانێك ئەنجام بدات... وەك ئەفسەرێکی نموونە، خەڵاتی زۆری بەدەست هێنا. خاوەنی ژنێك و سێ منداڵ بووە و لە ڕووداوێکی فڕۆکە لەگەڵ شکۆدار مەلیکە عولیا، لە بەرواری ١٩٧٧/٢/٩ی زایینی شەهید بوو... بە بۆنەی یادی ئەو نەمرە ناوی یەکێك لە شەقامەکانی عەممان بە ناوی ئەو شەهیدە نراوە.

٢ـ سەرکردە حەلیل بەکر رازا، لەدایکبووی گەڕەکی ساڵحییەی دیمەشقە.
دەرچووی قوتابخانەی ڕەشیدیەی سوپاییە لە سوریا لە ساڵی ١٩١٨ی زایینی. لە سەردەمی فەیسەڵ وەك ئەفسەرێك خزمەتی خزمەتی بە سوپای سووری کردووە. ئەفسەری هەواڵگری دەربار بووە و هەروەها لە حەمس و حەما فەرماندەی (سریە الخیالە) بووە. لەدوای کۆتایی هاتن بە فەرمانڕەوایی فەیسەڵ ساڵی ١٩٣٠ گەیشتە عەممان و خزمەتی خۆی پێشکەش بە ئەمیر عەبدوڵڵا کوڕی حوسێن کرد. لەدوای ئەوەی کە ئەمیر عەبدوڵڵا دەستی کرد بە دامەزراندنی میرنشینی، یەکێك بووە لەو کەسانەی لەگەڵ دامەزراندنی سوپای ئۆردنی هاتە ناو ڕیزەکانی سوپا لە ساڵی ١٩٢٣ی زایینی. لە دامەزراندنی سوپایی و پاسەوانی بەشداری کرد و فەرماندەی سەرکردەیی پاسەوانی بووە لە ساڵی ١٩٢٢ لە کەرك، لە ساڵی ١٩٢٣ لە جرش و توفیلە، لە ساڵی ١٩٣٨ لە سەلت، لە ساڵی ١٩٣٨ لە مەلکا. بەڕێوەبەری ناحیەی شوبەك لە ساڵی ١٩٣٠ و فەرماندەی ناوچەی عەجلوون.

لە ڕووداوێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد لە بەرواری ١٩٣٨/١٢/٨، لە دوای ئەوەی کە بە کارگێڕی لێوەشاوە و توانا و دڵسۆز لە ئیشوکار و خزمەت بە نیشتمان ناسرا. ڕێزی ئەمیر عەبدوڵڵا کوڕی حوسێنی بەدەست هێنا و بە

یەکەمین دامەزرێنەرانی دەزگای ئاسایشی گشتیی ئۆردن دەژمێردرێت.

٣ـ شەهیدی فڕۆکەوان عامر ئەحمەد بەکر زازا: لە ١٩٣٧/٢/٢٢ی زایینی لە (دێرعەلا) لەدایك بووە، خوێندنی ناوەندی لە ساڵی ١٩٥٧ قوتابخانەی سەلتی ناوەندی تەواو کردووە، گەیشتە هێزی ئاسمانی ئۆردن وەك پاڵێوراوێکی فڕۆکەوانی، خوێندنی لە بەریتانیا تەواو کرد، بۆ ئەوەی لە دوایی بە پلەی مولازمی دووەم بگەڕێتەوە، لە ڕووداوێکی فڕۆکەیەکی مەشق لە ١٩٦٤/٧/٢٨ی زایینی لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی ڕۆژانەی شەهید بوو

٤ـ فەریق ساڵح کوردی: لە ساڵی ١٩٣٤ی زایینی لە مەئادبا لەدایك بووە. بڕوانامەی ناوەندیی گشتی لە ساڵی ١٩٥٠ بەدەست هێنا، گەیشتە سوپای ئۆردنی لە ساڵی ١٩٥٠. پێبەپێ چووە سەرەوە لە سوپای ئۆردن تا بووە فەرماندەی چەکی ئاسمانی پاشایەتی ئۆردن لە ١٩٦٣ـ١٩٧١. هەروەها یاریدەدەری فەرماندەی گشتی هێزی چەکداری ئۆردن بووە تا ئەو کاتەی خانەنشین کرا لە ساڵی ١٩٧١ی زایینی.

٥ـ زەعیم کامل عەبدوولقادر ماردینی: لە ساڵی ١٩٠٣ی زایینی لە کەرك لەدایك بووە. ئەو کاتەی کە باوکی لەوێ خەریکی خزمەتکردن بوو لە سوپای عوسمانی، گەیشتە سوپای ئۆردن لە ساڵی ١٩٢٣ی.ز. لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی بەشەکان و پێکهاتەی سوپا کاری کردووە وەك سریەی فورسان لە بەلقا، سریەی پیادە، سریەی ئاسایش، فەرماندەی ( سریة الانظباط ) بووە و هەروەها فەرماندەی پۆلیس. زنجیرە پلەی جۆراوجۆری وەرگرت، دواجاریش لە کاتی خانەنشین بوونی لە ساڵی ١٩٦٦ی زایینی بە پلەی زەعیم (عەمید) بووە... لە بەرواری ١٩٧٠/٩/٩ی زایینی کۆچی دوایی

کرد و لە ئەربد شاردرایەوە، کەسی لەدوا بەجێ نەما.

٦ـ لیوا سلێمان پاشا کوردی: لەدایکبووی ١٩٣٦ی زایینی لە سەلت، خزمەتی لە دەزگای ئاسایشی گشتی بووە لە ساڵی ١٩٥٩ی زایینی. هەروەها لە هەواڵگریی گشتی کاری کردووە و دواجار بەڕێوەبەری هەواڵگریی پایتەخت بووە. بە پلەی لیوای گشتی لە ساڵی ١٩٨٢ی زایینی خانەنشین بووە. بۆ ماوەیەکی کەم بەڕێوەبەری گشتی دەزگای (رعایە الشباب) بووە لە ساڵی ١٩٨٣ی زایینی.

٧ـ خوالێخۆشبوو عەمید حەسەن زازا: گەیشتە دەزگای ئاسایشی گشتی ئۆردن لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی بە پلەی ئەفسەر تا گەیشتە پلەی عەمید. یاریدەدەری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بۆ سەرۆکایەتی لیژنەی کارگێڕی کۆمەڵەی سەلاحەدینی ئەیووبی نێوان دوو خول لە ئەستۆ گرتووە. ناسراوە بە خزمەتکردنی بە ڕۆڵەکانی کورد.

نیشانەی یادی شەڕی ساڵی ١٩٣٩ ـ ١٩٤٢ی زایینی وەرگرت، هەروەها مەدالیای بەرگریی بەریتانی و مەدالیای شەرەف لە پلەی ئەفسەری کاری مرۆڤایەتی کە لە فەرەنسا دەرچوو و مەدالیای خزمەتە دوور و درێژەکەی ساڵی ١٩٦٨ی زایینی و مەدالیای سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٧١ی زایینی و دواجار یەکێتیی وەرزشی جیهانی بڕوانامەی ڕێزلێنانی بۆ ئەو کار و کۆششەی لە چالاکی وەرزشی یەکێتیی عەرەبی بۆ پۆلیس پێدا.

- **لە بواری کۆمەلایەتیدا:**

١ـ سەیدۆ عەلی کوردی: ئەبوو عەلی لە ساڵی ١٨٨٠ی زایینی لە سەلت

لەدایك بووە ئەو کاتەی کە باوکی پاسەوان بووە لە هێزی ئاسایش لە سەردەمی عوسمانیدا.

سەرەتای ژیانی کارکردنی لە بازرگانی دەستی پێکرد و بووە یەکێك لە گەورە بازرگانان و ملّکدار و فەلاحانی عەممان، ئەوەش لە سایەی ئەو هەموو زەحمەت و کۆشش و هەوڵدانەی بووە.

لە پیاوە نیشتمانپەروەر و ناسراوەکانی عەممان بوو، بەشداری کرد لە ئامادەکردنی کۆنگرەی سوری گشتی لەسەر داوای مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە سالّی ١٩٢ ی.ز وەك چاوەدێرێك و ... لە سەردەمی حکوومەتەکانی ناوخۆیی سالّی ١٩٢٠ بە ئەندامی ئەنجوومەنی شورای حکوومەتی سەلتی ناوخۆیی (بە نوێنەری شاری عەممان) دەستنیشان کرا.

لە سەردەمی میرنشینی ئۆردن، ئامادە بوو لە کۆنگرەی نیشتمانیی یەکەم کە لە سالّی ١٩٢٨ لە عەممان بەسترا. لە زۆربەی کۆنگرەکانی دیکەی نیشتمانی کە پاشان بەستران، ئەندام بوو لە حزبی گەلی ئۆردن لە سالّی ١٩٣٧ ـ ١٩٣٠ و ئەندامی لیژنەی دامەزرێنەری (حزب التضامن الاردنی) بووە لە سالّی ١٩٣٣ی زایینی.

لە سالّی ١٩٦٢ی زایینی کۆچی دوایی کردووە لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا. پیاوێکی چاك و دڵسۆز و بەناوبانگ بوو، گیانی لێبوردەیی هەبووە، ڕێزی لە دۆستایەتی دەگرت و لە پێناوی خۆی بەخت دەکرد و لەو گەورە پیاوە بەناوبانگانەی عەممان (لەنێوان نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم) دەژمێردرا.

٢ـ خوالێخۆشبوو ئیسماعیل کوردی: ئیسماعیل نەجمەدین کوردی دەگەڕێتەوە سەر عەشیرەتی (ئۆمەری) لە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق، لە خزمە بەناوبانگەکانی لەوێ کوڕی مامی شێخ ئەحمەد کەفتارو موفتی کۆماری

سوریایە ئێستا.

ئیسماعیل و براکەی ئیبراهیم لە سەرەتای سەدەی بیستەم هاتنە ئۆردن، بۆ ماوەیەکی کەم نیشتەجێی شارۆچکەی سەمەر بوون، لە نیوەی سییەکان هاتنە عەممان و لە کاخی پاشایەتی لەلای خوالێخۆشبوو مەلیك عەبدوڵلا کوڕی حەسەن کاریان کرد، لەدوای ئەوە ئیسماعیل کوردی هەڵسا بە سەرمایەدانان و دامەزراندنی پرۆژەی بازرگانی، وەك دامەزراندنی چاپخانە بۆ چاپی کتێب و بەرەو کۆمپانیای دۆلار فیلم چوو لە بەیروت و چەند فیلمی بۆ دەرهێنان، لە سەرەتای پەنجاکاندا و تا ئێستا هەلساوە بە دروست کردنی چەند هۆلی سینەما لە عەممان و ئەربد، وەك سینەما و ستۆدیۆ زەهران لە عەممان و ئەربد و سینەما (البترا).

بە خۆش ئەخلاقیی و دەست بڵاوی (هاوکاری) هەژاران ناسرا بوو و خۆشەویستی تاکەکانی میللەتەکەی بوو، لە کوردەکانی ئۆردن ئەوەی بیناسیبووایە ، خۆشی دەویست. سێ کوڕی هەبوو: مامۆستا وەلید کوردی، مامۆستا محەمەد عەلی کوردی، خوالێخۆشبوو ئەندازیار ئیبراهیم کوردی.

٣ـ حاجی عەلی کوردی: لەدایکبووی ئۆرفەیە لە کوردستانی تورکیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەی زایینی. سەر بە لقی (کیتکان)ە لە عەشیرەتی بەرازی لەو ناوچەیەدا.

لە ساڵی ١٨٨٧ی زایینی لە عەممان نیشتەجێ بووە و لە بواری بازرگانی و بەڵێندەرایەتی کاری کردووە تا بووە بە یەکێك لە گەورە بازرگانە دیارەکانی عەممان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم.

لە سەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابردوو هۆتێلی مەلیك غازی دروست کرد لە شەقامی (السعادە) لە عەممان، یەکێك بووە لە ئامادەبووانی کۆنگرەی

نیشتمانی یەکەم کە لە ساڵی ١٩٥٨ی زایینی لە عەممان بەسترا، ئەندامی لیژنەی دامەزراندنی (حزب اللجنة التنفيذية للموءتمر الوطني ١٩٢٩) بووە. لە بەرواری ١٩٦٠/٥/١ زایینی لە شاری عەممان کۆچی دوایی کردووە.

٤ـ ئەمین بروسك کوردی: لە ساڵی ١٨٩٦ی زایینی لە خانەوادەیەکی دیندار سەر بە عەشیرەتی (زەرکان)ی کوردی لە شاری (ئەرزەرۆم)ی کوردستانی تورکیا لەدایك بووە. خوێندنی سوپایی خۆی لە ئەستەنبوڵ تەواو کردووە، بە ئەفسەر لە سوپای تورکی دامەزرا، ئەفسەری پەیوەندار بوو لەنێوان قەسری پاشایەتی و ڕێبەرانی کورد و پاسەوانی تایبەتی لەوان دامەزراند بۆ سوڵتانی عوسمانی. بەشداریی شەڕەکانی حکومەتی کرد لە جەنگی جیهانیی یەکەم و پاڵەوانەتی نواند، هەر بۆیەش ناودار کرا بە (برووسك)، بەڕێوەبەری نووسینگەی هەواڵگری ڕۆژهەڵاتی خواروو بوو لە تاران.

لەدوای هەڵاتنی تورکیا لە جەنگی ساڵی ١٩١٨ی زایینی، کوردەکان لەگەڵ مستەفا کەمال بەشداریی شەڕی ئازادییان کرد دژ بە داگیرکەران بۆ کەناری تورکیا و لەسەر دەستی ئەوان تورکیا ئازاد کرا. بەڵام دوایی مستەفا کەمال پەشیمان بووەوە لە بەخشینی حوکمی زاتی (ئۆتۆنۆمی)، ئینجا کوردان دەستیان بە هەڵگیرساندنی شۆڕشێك بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی لە ناوچەی دیاربەکر کرد.

ئەمین بروسك گەیشتە ئەو شۆڕشە، لەدوای کۆتایی هاتن بەو شۆڕشە سەرکردەکان بڵاو بوونەوە بۆ وڵاتانی دراوسێ، ئەمین بروسك زۆر لە وڵاتان گەڕا، دوا شوێنی ئۆردن بوو لە ساڵی ١٩٣٢ی زایینی، لەوێ نیشتەجێ بوو، پەیوەندیی گەرمی لەگەڵ کوردەکانی ئۆردن پەیدا کرد و لە بەرواری ١٩٧٤/٢/٢٨ی زایینی کۆچی دوایی کرد.

٥ـ خوالێخۆشبوو محەمەد حوسێن زازا: لەدایکبووی ساڵی ١٨٨٨ی زایینی لە شارۆچکەی جەبین سەر بە کوردستانی تورکیا. بە پلەی ئەفسەر لە کۆلێژی جەنگ لەبەیرووت ساڵی ١٩٠٨ی زایینی دەرچوو. گەیشتە سوپای عوسمانی و بەشداریی کرد لە شەڕەکانی دەوڵەت لە جەنگی یەکەمی جیهانی. بەرپرسی پاسەوانانی تایبەت بە جەمال پاشای بچووك بوو لە ئۆردن. لەدوای هەڵاتنی تورکیا لەشەڕ چووە بیسان و لەوێ نیشتەجێ بوو. ئەندام بوو لە (لجنة انقاذ فلسطين)، ئەندامی شارەوانی بیسان بوو، لەدوای کارەساتی فەلەستین لە ١٩٤٨ لەگەڵ بنەماڵەکەی کۆچی کرد بۆ ئەربد و لەوێ نیشتەجێ بوو تا کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ١٩٧٥ی زایینی و لە شارۆچکەی مەعاز (معاذ) نزیك شوفەی باکوور بەخاك سپێردرا.

٦ـ محەمەد تاهێربەگ بەدرخان: زۆر لە شوێنە ئیدارییەکان لە سەردەمی عوسمانی دەگەڕێننەوە سەر ئەو کەڵەپیاوە، بوویتە قایمقامی هەر یەکە لە (قونەیتەرە، درعا، ئەربد، سەلت) لەنێوان ساڵەکانی ١٨٨٠ ـ ١٨٨٩ی زایینی. سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی کارگێڕیی قەزای سەلتی کردووە لە ساڵەکانی ١٨٨٠ ـ ١٨٨٢ی زایینی.

بەڕێز ساڵح مستەفا ئەلتەل لە یاداشتەکانی باسی کردووە و دەڵێ: تاهیر بەگ بەدرخان قایمقامی قەزای عەجلوون لە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی/ ١٨٨٢ی زایینی لە ئەستۆدا بووە، ژمارەیەك لە کارە ئاوەدان کردنەوەییەکانی کردووە لە قەزای عەجلوون لەوانە: نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی گەورەی ڕۆژئاوا لە ئەربد، دروستکردنی قوتابخانەیەکی سەرەتایی و کتێبخانەیە کە پێك هاتووە لە چوار ژوور کە شوێنی نزیکەی سەد و پەنجا قوتابی دەبێت... لەدوایی تاهێر بەدرخان دەستی کرد بە نۆژەنکردنەوە و چاك کردنەوەی حەوزی ئەربد و داوای هاوکاری

کرد لە خەڵکی ئەربد کە خۆڵەکەی ناوی هەڵگرن و بە بەرد دروستی کرد.

لەدوای مردنی، بنەماڵەکەی لە گوندی (سحم الکفارات) لەپارێزگای ئەربدی ئێستایی نیشتەجێ بوون کە زەویی زۆریان لەوێ هەبوو...

٧ـ خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید سەعدوون ئاغا: لە ساڵی ١٨٨٠ لەدایك بووە. لە سەردەمی عوسمانی لە گوندی سەمەر ناحیە بنی کەنانە نیشتەجێ بوو. لە کەرتی بازرگانی و کشتوکاڵ کاری کرد، گرنگیی زۆری بە چاندنی داری زەیتوون دا لەو ناوچەیە. گەورەی عەشیرەتی سەعدوون بوو. شارەزایی لە زمانی ئینگلیزی هەبوو، لە ساڵی ١٩٦٧ی زایینی کۆچی دوایی کرد و لە سەمەر بەخاك سپێردرا.

٨ـ خوالیخۆشبوو محەمەد زوهێر عەلی کوردی: لە ئەربد ساڵی ١٩٣٨ی زایینی لەدایك بووە، باوکی سەر بە کوردەکانی بارافییە لە دیمەشق، لە هێزی سنووری و سوپای ئوردن بۆ ماوەی سی ساڵ خزمەتی کردووە تا خانەنشینی لە ساڵی ١٩٨٨ی ز. موختاری کوردەکانی شاری زەرقا بووە لە ساڵی ١٩٨٨ تا کاتی وەفاتی لە بەرواری ٢٠٠٠/٣/٣١ی زایینی، ژیانی لە خزمەتکردنی میللەتەکەی سەرف کرد. هەوڵی چاکردنەوەی ئەو کەسانەی دا کە لایان داوە، هەوڵی داوە بۆ نزیکبوونەوە و خۆشەویستیی نێوان کوردەکان و کۆمەڵگەی ئوردن لەلایەکی دیکە.

٩ـ خوالێخۆشبوو فەیاز ئەحمەد کوردی: وەرزشوانێکی کۆنی تۆپی پێیە، لە دەزگای ئاسایشی گشتی خزمەتی کردووە، سەرۆکی لیژنەی کارگێڕیی کۆمەڵەی سەلاحەدینی ئەیووبی بووە و یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە. لە ساڵی ١٩٩٨ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

١٠ـ پارێزەر عەبدوولمونعیم عەلی کوردی: لە شاری جرش ساڵی ١٩٤٣ی زایینی لەدایك بووە، خاوەنی دیپلۆمی زانستی نیشتەجێبوونە لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٦٧ی زایینی و هەروەها لیسانسی هەیە لە زانکۆی دیمەشق لە ساڵی ١٩٧٠ی زایینی.

لە فەرمانگەی ئاماری گشتی لە وەزارەتی پیشەسازی و بازرگانی لە ساڵی ١٩٦٤ ـ ١٩٧٠ کاری کردووە. ڕاوێژکاری ئابووری بووە لە سەفارەتی ئۆردن لە بەغدا، لە کاری حکوومی خانەنشین بووە لە ساڵی ١٩٨٦ی زایینی، ئێستا کاری پارێزەری ئەنجام دەدات لە عەممان. سەروکایەتی کۆمەڵەی سەلاحەدینی ئەیووبی بۆ ماوەی سێ خولی یەك لەدوای یەك لە ساڵەکانی ١٩٩٢ ـ ١٩٩٨ی زایینی لە ئەستۆ بووە. کۆششێکی زۆری هەبووە لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەی کوردی لەو کاتەی کە بەڕێوەبردنی کۆمەڵەی سەلاحەدینی (بۆ کاری خێرخوازی) لەدەستدا بووە، بە یەکێك لە گەورە ڕۆشنبیرانی کورد لە ئۆردن دەژمێردرێ.

١١ـ پارێزەر عەبدوولقادر ماردینی: لە ساڵی ١٩١٠ی زایینی لە کەرك لەدایك بووە، لەگەڵ براکانی نیشتەجێی ئەربد بوونە و خوێندنی ناوەندی لە سوریا تەواو کردووە، لە پەیمانگای قەزایی دیمەشق لە ساڵی ١٩٣٠ی زایینی دەرچووە، مۆڵەتی پارێزەریی لە ساڵ ١٩٣٦ وەرگرتووە، ئیشوکاری پارێزەری کردووە تا نەوەدەکانی سەدەی بیستەم لە ئەربد و لە پارێزەرە پێشکەوتووەکانی ئۆردن بووە.

١٢ـ موختار محەمەد فەهمی عیسا کوردی: لەدایکبووی شارۆچکەی سەمەر / ئەربدە لە ساڵی ١٩١٩ی زایینی. هەندێ لە ژیانی لە گەڕەکی کوردان لە دیمەشق بووە تا ساڵی ١٩٤٠ی زایینی. لەدوایی هاتە عەممان و گەیشتە دەزگای ئاسایشی گشتی لە ١٩٤٣ تا ساڵی ١٩٤٤ی زایینی. لەدوایی سالۆنێکی سەرتاشخانەی کردەوە و بەناوبانگترین سەرتاشخانەی بوو لە عەممان لەڕووی پاك و خاوێنی

و ڕێکوپێکی. لە ساڵی ١٩٥٩ی زایینی پیشەی سەرتاشی بەجێهێشت و شوێنێکی جلوبەرگ فرۆشی کردەوە تا ساڵی ١٩٧٥ی زایینی. لەدوایی یەکێك لە کوڕەکانی شوێنەکەی گرتە دەست، لە ساڵی ١٩٧٠ بە موختاری کوردان لە عەممان دەستنیشان کرا ... یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی سەلاحەدینی ئەیوویی لە عەممان، ناوبراو کەسایەتییەکی عەشایریی بەناوبانگە.

- **لە بواری بانگەواز و ئایینی ئیسلامی:**

١- شێخ محەمەد سەعید کوردی: شێخ محەمەد سەعید کوڕی عەحاج کوڕی عەلی ئیزۆلیی کوردییە. ساڵی ١٨٩٨ی زایینی لە عەجلوون لەدایك بووە، باوکی سەر بە عەشیرەتی ئیزۆلییە لە دەوروبەری ماردین لە کوردستانی تورکیا.

ژیانی منداڵی لەگەڵ باوکی بووە لە دیمەشق، لەدوای وەفاتی باوکی لەگەڵ دایکی کۆچی کرد بۆ شارۆچکەی (صخرە) لە عەجلوون، لای خاڵەکانی خۆی و دایکی ژیا. لەدوایی چووە دیمەشق و خەریکی خوێندن بوو لای شێخەکانیان و تەریقەی سۆفیگەری شازلی لێ وەرگرتن بە تایبەتی لە شێخ هاشمی شاغووری، گەڕاوە ئوردن و بووە ئیمام و خەتیب لە بارحە و (صریح) و شەجەرە و عەبین و ئەیدون و صەخرە و ئەربد، گۆشە و مزگەوتی بنیاد کرد بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینزای شازلی و، مورید و قوتابی هەبووە. لە بەرواری ١٩٧٢/٧/٧ی زایینی کۆچی دوایی کرد و لە شارۆچکەی سەریح (صریح) ڕۆژهەڵاتی ئەربد بە خاك سپێردرا...

شێخ محەمەد سەعید مورشد و داعییەکی مەزن بوو، تا ئێستاکەش خەڵکی ئەربد باس لە ڕێبازە درووستەکەی دەکەن ڕێزیان بۆی هەیە. دامەزرێنەری ڕێبازی تەریقەی سۆفیگەری (شازلی)یە لە ئوردن، پشتیوانیی ئایینزاکەی کرد بە چاپکردن و دانانی هەندێ کتێب، لەوانە:

١- التعرف بحقائق التصوف، ١٩٦١ی.ز.

٢ـ الـگریقه الشاژلیه.

٣ـ الجنید (الدر الفرید)، دیمەشق، ١٩٤٨ی زایینی.

٤ـ فوائد الاذکار و محبه العزیز الجبار، ئەربد، دار العوده، ١٩٦٤ی زایینی.

٥ـ مولد الروح النبویه خیر الخلائق الکلیه.

٦ـ القصائد الروحیه فی الاسرار الـذاتیه.

٧ـ عصمه الانبیا التی خفیت عن الاغنیا، ئەربد، دارالعوده، ١٩٧١ی زایینی.

٨ـ رساله فی التوحید لمن اراد الدخول الی المقام الفرید.

٩ـ کتاب الاذکار.

١٠ـ دوحه الامداد فی ذکر بعض کرامات اولیا الاکراد.

١١ـ نشر الاعطار المحمدیه فی الدیار الاسلامیه، عەممان، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ١٩٧١ی زایینی.

١٢ـ فی لبس المراه المسلمه.

هەروەها ئەو کتێبانەی کۆڵییەوە و چاپی کردن:

١ـ البحر المدید فی تفسیر القران المجید (دوو بەرگ)، شێخ ئیبن عەجیبە حەسەنی، چاپخانەی ئیسماعیل کوردی، ١٩٦٦ ـ ١٩٦٨ی زایینی.

٢ـ رد معانی الایات المتشابهات الی معانی الایات الحکیمه، شێخ محیەدین کوڕی عەرەبی، عەممان، چاپخانەی (النهظه) ١٩٧١ی زایینی.

٣ـ شرح حزب البحر، شێخ ئەحمەد زەروق.

٤ـ الشجره النعمانیه الساحقه للطائفه الیهودیه، محیەدین کوڕی عەرەبی.

**● لە بواری هونەر و شانۆگەریدا:**

١ـ شانۆگەر و ئەکتەر ئیبراهیم خەلیل کوردی: ئیبراهیم خەلیل کوردی هەڵساوە بە دانان و دەرهێنانی زۆری شانۆگەری لە شانۆکانی ئۆردن لە نێوان

ساڵەکانی ١٩٦٣ ـ ١٩٨٢ی زایینی و، بزووتنەوەی شانۆی دەوڵەمەند کرد لە ئەربد بە تایبەتی و لە ئۆردن بە گشتی. شانۆکانی پێشکەش کرا لە شانۆخانەی عەممان و زانکۆی یەرمووك و (راس فرقه عرار المسرحيه) لە ئەربد و بەشداری کردووە لە هەندێ زنجیرەی ناوخۆی شانۆ و ئەو شانۆیانەی داناوە و دەرهێناوە:

١ـ ايام ابونواس، ١٩٦٦ی زایینی.

٢ـ طبيب من الارياف.

٣ـ مصانع الرجال، ١٩٦٣ی.ز.

٤ـ بلدنا والصيف، ١٩٦٥ی.ز.

٥ـ ام سعيد بثلاث عجال، ١٩٧٩ی.ز.

٦ـ عريس من الخليج، ١٩٧٨ی.ز.

٧ـ متى ينتهي الرواح، ١٩٧٧ی.ز.

٨ـ بنت بلدنا بدها عريس، ١٩٨٠ی.ز.

٩ـ عوده الهابيل الثلاثه.

١٠ـ معلمون في الارياف، ١٩٧٧ی.ز.

١١ـ من القاتل، ١٩٧٨ی.ز.

١٢ـ اسكتش الزبالين.

١٣ـ المشعوذ، ١٩٨٢ی.ز.

٢ـ هونەرمەند ڕانیا کوردی: ڕانیا کوردی هونەرمەندێکی خاوەن پیشە و شارەزایە لە بواری گۆرانی و ئامێری موسیقا و ئەکتەری، بەشداری لە دوو کورتە فیلمی (الزجاجه و الحظ السابع) کردووە و لە کەناڵی دووەمی تەلەفزیۆنی ئۆردنی بەرنامەی (دردشات) و بەرنامەی (رانیا شو) و بەرنامەی گوشتوگوزاری تایبەت بە کەناڵی ئەبوزەبی بەناونیشانی (صيف ٢٠٠٠) لە ٦٠ بەش پێکهاتبوو و

ڤیدیۆ کلیپ بە ناونیشانی (لیله من العمر) و بەرنامەیەکی تایبەت لەسەر منداڵان کە بە تایبەتی وێنە کراوە بۆ ڕێکخراوی یونیسێف و زۆر لە کردەوەکانی شانۆ بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

گۆانیبێژە و توانای هەیە بە زمانی ئینگلیزی گۆرانی بڵێ، ئاواز و نووسینی وشەکانی گۆرانی دادەنێت، بەشداریی کردووە لە ئاهەنگی گۆرانی و موسیقی مەزن بە مەبەستی ئاشتی لە (موسسه اطفال عالمنا) لە ئەمریکا. چەند کاسێتێکی دەرکردووە و لە بەریتانیا هونەری گۆرانی و موسیقا و سەما و ئەکتەریی خوێندووە و

٣ـ گۆرانیبێژی لاو سەمیر کوردی: لە پەیمانگای مۆسیقا لە قاهیرە خوێندوویەتی، شەش ساڵ لە کوێت خەریکی گۆرانی گوتن بووە و گۆرانی زۆری لە ئۆردن تۆمار کردووە لەوانە: ( هجرونی، یا محلاکی یا بنیه، حبیتك و بحبك دوم، سمره ام الغره).

• **سەرچاوەکان:**

١. سویرکی کوردی، محەمەدعەلی. کوردە ئۆردنییەکان و ڕۆڵیان لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا، وەرگێڕانی: حەمید گەردی، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٧.

٢. ناوخۆش، سەلام، مافی مێژوویی غەیرە کورد بەسەر کوردستان، چاپی یەکەم، کوردستان، ٢٠٠٤.

( جێگەی ئاماژە پێکردنە کە بابەتەکەی بەڕێز سەلام ناوخۆشیش هەر لەلایەن ڕێزدار محمد علی الصویری الکوردی نووسراوە و لە ژمارە ١٤ی گۆڤاری ڤەژین بە عەرەبی بڵاوکراوەتەوە و لەلایەن بەڕێز سەلام ناوخۆش بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕدراوە و لە ژمارە ٢٩٨١ی ڕۆژی ١٩٩٩/١٢/١ی ڕۆژنامەی برایەتی بڵاو بۆتەوە و دواتر لە لاپەڕەکانی ١٩-٢٧ی کتێبی «مافی مێژوویی غەیرە کورد بەسەر کوردستان»دا بۆ جارێکی دیکە چاپ و بڵاو کراوەتەوە.).

٣. ماڵپەڕی ویکیپدیای فارسی بۆ زانیاری سەبارەت بە وڵاتی ئۆردن.

(پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە سەرجەم بابەتەکانی ئەم بەشە بێجگە لە چەند دێڕە زانیاریی سەبارەت بە وڵاتی ئۆردن، لە کتێبەکەی ڕێزدار محەمەدعەلی سویرکی کوردی وەرگیراون).




٤. باسی چوارەم

## کوردەکانی پاکستان

- چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی پاکستان
- کوردی پاکستان لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکاندا
- ڕاوبۆچوونی هەندێ لە کوردەکانی پاکستان
- کوردەکانی کووەیتە و دەوروپشتی
- ژمارەی کوردەکان
- کوردە ناودارەکانی پاکستان
- پەیوەندیی نێوان کورد و بەلووچ لە پاکستاندا
- زمانی ئاخافتن و خوێندن و، ڕادەی ڕۆشنبیریی و خوێندەواری
- داب ونەریتی کوردەکانی پاکستان
- ئایین و مەزهەب
- سەرچاوەکان

• **چەند زانیارییەك سەبارەت بە وڵاتی پاکستان**

پاکستان وڵاتێکە لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا هەڵکەوتووە و پایتەختەکەی ئیسلام ئابادە. ئەم وڵاتە لە باشوور، سنووری ئاویی هەزار کیلۆمیتری لەگەڵ دەریای عەممان هەیە و لە ڕۆژئاوا لەگەڵ ئێران، لە باکوورەوە لەگەڵ ئەفغانستان، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ هیندوستان و لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ کۆماری گەلی چین هاوسنوورە. ناوچەی کشمیر شوێنی ئیددیعای هەر دوو وڵاتی پاکستان و هیندوستانە ئەم دوو وڵاتە هەر کامیان چەند بەشێکی ئەم ناوچەیەیان لەژێر دەست دایە و ئەم ناوچانە بەهۆی هێڵی کۆنترۆڵەوە لێك جیا کراونەتەوە.

ئایینی فەرمیی پاکستان، ئیسلامە و لەباری ژمارەی موسوڵمانانەوە لەنێو وڵاتانی ئیسلامیدا، بە دووەمین وڵات لەقەڵەم دەدرێت. ئەم وڵاتە لەساڵی ١٩٤٧ وەك دەوڵەت و وڵاتێکی نوێ سەربەخۆیی خۆی لە هیند ڕاگەیاند. لە ساڵی ١٩٧١ شەڕی نێوخۆیی بوو بەهۆی جیابوونەوەی پاکستانی ڕۆژهەڵات (بەنگلادێش) لەم وڵاتە. لە سەردەمی سەربەخۆییەوە، پاکستان قۆناغگەلی گەشەی سەربازیی و ئابووری و هەروەها ناسەقامگیریی هاوکات لەگەڵ جیابوونەوەی بەنگلادێشی بەسەردا تێپەڕیوە و ئەزموونی کردووە. پاکستان لەباری هێزە چەکدارەکانەوە لە جیهاندا پلەی حەوتەمی هەیە و تەنیا وڵاتی ئیسلامییە کە خاوەن چەکی ناوکییە.

پاکستان بەپێی خەمڵاندنی ساڵی ٢٠١٢ بە زیاتر لە ١٨٠ ملیۆن کەس حەشیمەت، یەکێك لە وڵاتە پڕحەشیمەتەکانی دنیایە. ئەم وڵاتە هەم لەباری زمانیی و هەم لەباری جوگرافیایی وڵاتێکی فرەچەشنە. ئۆردوو و ئینگلیزی زمانە فەرمییەکانی ئەم وڵاتە و، ئیسلام ئاباد پایتەخت و کەراچی گەورەترین شاری

پاکستانە. هەروەها لەباری ئایینیشەوە ئەم وڵاتە پێك هاتووە لە: ٩٦٪ موسوڵمان (٧٧٪ سوونە و ١٩٪ شیعە)، ١٫٨٥٪ هیندو، ١٫٦٪ مەسیحی، ٠٫٠٤٪ سیك.

ناوی پاکستان (پاك + ستان) بە زمانەکانی ئۆردوو و فارسی واتە نیشتمانی پاکی. ئەم ناوە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٣٣ی زایینی لەلایەن چودهاری ڕەحمەت عەلی کە لە بڵاوکی «امروز» یان «هرگز»دا بڵاوی کردەوە، بەکار هاتووە... بە شێوەیەکی ڕەسمی وڵاتی ئێستای پاکستان لە ساڵی ١٩٤٧ دامەزراوە و لە ساڵی ١٩٥٧ بۆ «کۆماری ئیسلامیی پاکستان» گۆڕا...

دابەشکاریی نێوخۆیی. پاکستان لە پێنج ئەیالەت. ناوچەیەکی خودموختاری قەبیلەیی، ناوچەی فیدراڵی پایتەخت (ئیسلام ئاباد) و دوو ناوچەی سەر بە جامو و کشمیر پێك هاتووە. لە شارە سەرەکییەکانی دەتوانین ئاماژە بکەین بە: کراچی، لاهور، فەیسەڵ ئاباد، راوڵپەندی، مولتان، حەیدەر ئاباد، پیشاور، کووەیتە، سەرگودها، سیالکوت، جەهەنگ، مەردان، گجرات، لارکانە و ...[1]

## ● کوردی پاکستان لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکاندا

سەرەتا پێم خۆشە ئاماژە بە نووسینی هێندێك لە سەرچاوەکان بکەم کە لە چەند دێڕێکدا باسیان لە کوردەکانی پاکستان و زۆرجاریش باسی کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان و تەنانەت هیندوستانیشیان پێکەوە کردووە. لەبەر ئەوەی زانیاریی لەسەر کوردی هێندێك لە وڵاتان زۆر کەمە، هەربۆیە زۆربەی نووسەرەکانیش لە چەند دێڕێکدا ئاماژەیان پێداوە و تەنیا وەك یادکردنەوەیەك کە بزانرێ لەم وڵاتانەشدا کورد هەیە، باسیان لێ کردوون. ئامادەکاری ئەم بەرهەمەش تەنیا کتێبێك کە وەك سەرچاوەی سەرەکی بۆ ئامادەکردنی ئەم بەشە لە بەرهەمەکەی دەستی کەوتووە، کتێبی «کوردەکانی پاکستان» لە نووسینی بەڕێز «بەختیار غەفوور هەڵەبجەیی»ـە کە زۆربەی زۆری بابەتەکانی

ئەم بەشە لەو کتێبە وەرگیراون. بەڵام پێم باش بوو لە سەرەتادا کەڵك لە بابەتی هێندێك لەو نووسەرانە وەربگرم کە لە چەند دێڕێك لە بەرهەمەکانیاندا باسیان لەم کوردانە کردووە، چ ئەوانەی بە تایبەتی لەسەر کوردی پاکستانیان نووسیوە و چ ئەوانەی کە بە گشتی باسیان لە کوردەکانی پاکستان و ئەفغانستان و هیندوستان بەسەرێکەوە کردووە.

لە لاپەڕە ٢٢٠ی کتێبی «تراژیدیای کورد»دا بەم شێوەیە باس لە کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان کراوە:

«سەرەتای مێژووی کورد لە ئەفغانستان و پاکستان دەگەرێتەوە بۆ ساڵەکانی ١٥٠٠ کە کوردەکان لەلایەن شا عەباسی سەفەوییەوە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە دوور خرانەوە بۆ ئەوەی سنوورەکانی ئێران لە بەرامبەر هێرشی نەتەوەکانی دیکە بەتایبەت ئۆزبەکەکان بپارێزن. گەلێ لەم کوردە دوورخراوانە سەرەنجام ڕێیان کەوتە ئەفغانستان و پاکستان و بە تایبەت لە شاری هیرات (لە ئەفغانستان) و ناوچەی بەلووچستان و پیشاوەر و مولتان (لە پاکستان) نیشتەجێ بوون.

نفووسی کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان دیار نییە، چونکە ئێستا ئەم کوردانە بە تەواوی لەناو گەلانی دەوروبەری خۆیاندا تاویاونەتەوە و زمانی باوباپیرانی خۆیان لەبیر کردووە، بەڵام بۆخۆیان دەزانن کە بە ڕەچەڵەك کوردن. گەلێ لە کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان توانیویانە پۆستی باڵا لە ناوچەی خۆیان بەدەست بهێنن وەك «عەلی مەردان خان» کە لە ساڵی ١٦٤١ کراوە بە حاکمی «کابول»ی پایتەختی ئەفغانستان و پاشان «قەندهار» بەڵام پاشان بەهۆی ئەوەی لەلایەن «شاتەهماسب»ی سەفەوییەوە لەسەر پۆستەکەی لابراوە، دژی دەسەڵاتی سەفەوییەکان ڕاپەڕیوە و ساڵی ١٦٤٣ ناوچەی قەندهار تا سنووری موغولستانی گرتووە، بەڵام سەرنەکەوتووە و پەنای بۆ دیهلی (دیلهی) بردووە.

شاهی جیهان ٤لاخی (ناوچە)ی بەخشیوە بە خۆی و براکەی و کراوە بە حاکمی شاری لاهور و کیشمێر (لە پاکستانی ئەمڕۆدا)...»[٢]

هەروەها لە لاپەڕە ٨٦ی لە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی»دا بە شێوەی خوارەوە باسی کوردەکانی بەلووچستان (پاکستان)، هیندستان و ئەفغانستان کراوە:

کوردی بەلووچستان (٣٠٠,٠٠٠) کەسێك ئەبێ، لە هیندستانیش لە ناوچەی «سند» لە عەشرەتی براخۆی ـ کە دوور نییە لە براخۆیەکانی بەلووچستان بن و چووبێتنە ئەوێ ـ (٤٨,١٠٨) کەس هەیە. «مورگنستیرن»ی ڕۆژهەڵاتی ناسیش وەکوو «دائرە المعارف اسلامی» قسە لە کوردی ئەفغانەوە ئەکات، بەڵام هیچیان ژمارە نادەن بە دەستەوە.[٣]

لە لاپەڕە ٣١ی کتێبی «خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان»یش بەم شێوەیە باس لە کوردی بەلووچستان (پاکستان)، هیندستان و ئەفغانستان کراوە:

لە بلوجستاندا، عەشائیری (براخوی) هەمووی، یان بەشێکی زۆری بە کورد دانراوە. ئەم عەشیرەتە زۆرە بەشی گەورەی لە بلوجستاندایە، مەرکەزەکەی شاری (ئیغ)ە. حدودی شیمالی (کەتتا)یە و بەسەر (کلات)دا تا (لاس ـ بەلا) ئەچێ و بەم تەرحە درێژایی مەنتیقەکەی نزیك ٢٥٠ میلە. ئەساسەن دوو بەش و پێنج فیرقەیە: بەشێکی (سراوان ـ براخوی سەروو) و ئەوی تری (جەهلاوان ـ براخوی خواروو)ە. فیرقەکانی (کامبەرانی، میروانی، گۆرکەناوی، شومالانی، قەلەندەرانی)یە.

ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام، جلد ١. ل٦٣٠، بەعزێ ئیزاحاتی دەرحەق بەم عەشیرەتە ئەدا و ئەڵێ براخوی وەکو (بلەج)، ریوایەت ئەکرێ، کە لە تەرەف حەلەبەوە هاتوە. واقیعەن ڕەنگە لە غەربەوە هاتبنە ئەم وڵاتە و ڕەنگە ئەمانە ئەسڵی (کۆچ) بن، کە لە پێش هاتنی بلوجەکانا لە (کرمان)ەوە هاتوون بۆ

(ماکـران) و لەگەڵیانـا تێکـەڵ بووبـن. تەعبیـری (کـۆچ) بـە مەعنـای گەڕۆکـە، و ئیدریسـی ئیدیعـا ئەکا کـە ئەمانەش نەوعـە کوردێکـن. واقیعەن ئەبیـنرێ کە ناوی مەشـهووری هەمـوو (براخـوی) لـە (لاس ـ بـەلا)دا کوردگەلـی یـە و بـە گوێـرەی ئەکـە مومکینـە ئینسـان بڵـێ کـە ئەسـڵی ئـەم عەشـائیرە، کـوردی غەربـی ئێرانن و لەوێـوە بۆ بلوجسـتان هاتـوون. میقداری براخوی بلوجسـتان نزیك ۳۰۰۰۰ کەسـە.

لـە هیندسـتان لـە وڵاتـی (سـەند) لـە عەشیرەتی براخـوی ٤٨١٠٨ کەسـێ هەیە (ئینسـقلۆپەدیای ئیسـلام). موسـتەشریق (تێـد سـیۆ )، لـە بەینـی قەومـی بلـوج و کوردیشـدا بەعـزێ موناسـەبەت و رەوابیتـی کەشـف کـردوە (ئینسـیکلۆپیدیای ئیسـلام، جلد۲).

بـە گوێـرەی شـەرەفنامە لـە ئەفغانسـتانەوە بەعـزێ عەشـائیری زەنگەنـە بـۆ بلوجسـتان هاتـوە. بـە گوێـرەی ئەمـە، ئەبـێ لـە ئەفغانستانیشـدا کـورد بیـێ. زاتـەن (مۆرغەنسـتیرن)یش ئەڵـێ موحتەمەلـە لـە تەرەفـی غەربـی (هـەرات)دا بەعـزێ ئەهالـی کوردزمـان بیـێ.

هـەر لـە لاپەڕە ۲۷۱ی ئـەم کتێبەدا جارێکی تر بەم شـێوەیە باس لـە کوردەکانی ئـەو ناوچانە کراوە:

عەشـیرەتی براخـوی، هـەرە بەقوەتـی عەشـایری کـوردی ئێـرەن. مەرکـەزی کەسـافەتیان (نیشـتەجێبوونیان) لـەدەوری (کلات)ە. لـە (کەتـا)وە تـا (لاس بەللا) نزیـك ۲۲۰ میـل، مەنتیقـەی ئەم عەشـیرەتەیە. لـە (بلـوج) کەمترن، بـەڵام بە حوکم و نفوزتـرن. حاکمیەتـی مەرکـەزی بلوجسـتان، کـە (کلات)ە، بەدەسـت ڕەئیسـی ئـەم عەشـیرەتەوەیە کـە لـە فیرقـەی (کامیەرانی)یـە. دوو بەشـی گەورەیـە: سراوان (براخـوی سـەروو) و جاهلـەوان (براخـوی خـواروو). دەرحەق بە مەنسـوبیەتی ئەم عەشـیرەتە بـە قەومـی کـورد، بەعـزێ شـوبهە نوێـنراوە، بـەڵام لام وایە ئەم شـوبهانە زەعیفـە چونکـە ناوەکەیـان دەلیلێکـی بەقوەتـە.

بێجگە لەمەش عەشیرەتێکی کوردی گەورە و خالصیشیان لەناودایە کە بە «کوردگەلی» مەشهوورە و ئەساسی (براخوی) تەشکیل ئەکەن. ڕەنگە لە غەربی ئێرانەوە بۆ ئێرە هاتبن. زاتەن عەشیرەتی (براخوی)یش ئەبێ لەوێوە هیجرەتی کردبێ.

میقداری نفوسی ئەم عەشیرەتە براخۆیە، ۳۰۰,۰۰۰ کەسێکە (ئینسیقلۆپەدیای ئیسلام). لە هندستانیشا، بەعزێ لەم عەشایرە هەیە و لە وڵاتی (سند)دا ساکنن، نفوسیان ٤٨,١٨٠ کەسێکە.

ئەم عەشیرەتە براخویە، هەموو سوینی مەزهەبن و زمانەکەیان بەعزێ کەلیمەی بلوجی و ئێرانی تێکەوتووە و لەهجەکەیان نزیك لەهجەی هندی مەرکەزی_دراویدە. بە تەبیەت ئەم حاڵە نەتیجەی ئیختیلات و دراوسێیەتیەن صەرف و نەحویش تەقریبەن عەینی صەرف و نەحوی بلوجیە.

بێجگە لە عەشیرەتی (براخوی) لەناو عەشایری بلوجدا دوو عەشیرەتی تری کوردیش هەیە کە بە (مامەسەنی ـ مام حەسەنی) مەشهوورن و ئەمانەش دیسانەوە ئەبێ لە غەربی ئێرانەوە هاتبن (ئینسیقلۆپەدیای ئیسلام).

بە گوێرەی شەرەفنامە، لە ئەفغانستاندا، بەعزێ عەشایری (زەنگەنە) هەیە کە ڕەنگە لە بلوجستانەوە هاتبن. موستەشریق (مۆرغەن ستەرن)یش ئەڵێ ڕەنگە بەعزێ عەشایری کورد لە ئەفغانندا بێ. بەڵام بۆی تەحقیق نەکراوە[4]

شێخ محەمەد مەردۆخی کوردستانی لە «مێژووی کورد و کوردستان»دا باس لەم هۆزە کوردانەی پاکستان دەکات:

١ـ براخۆیی: پانتایی خاکی براخۆییەکان ٢٢٠ میل دەبێت، ژمارەیان زیاتر لە ٣٠٠ هەزار کەسە و لە ناوچەی کەلات دا بوون، ئەمانە فەرمانڕەوای دەوڵەتی بەلوچستانیان کردووە و برێك لە بنەماڵەیان لە هندستان جێگیر و سونی مەزهەبن.

٢ـ زەنگەنە: لە هند و ئەفغانستانیش هەن جگە لەوانەی لە بەلوچستانن، ئەمانە هۆزێکی بەدەستەڵات و بڵاون. شوێنی سەرەکیان کوردستانی ئێران و عێراقە.

٣ـ کامێرانی: بەشێکن لە هۆزی براخۆیی (کامبەرانی) لە زۆر شوێندا جگە لەوەی بە هۆزێکی کورد ناو براون، بە تیپێك لە هۆزی براخۆییش باس کراون.

٤ـ کوردگەلی: ئەم هۆزە لە ڕۆژئاوای ئێرانەوە بەرەو بلوچستان و هندستان کۆچیان کردووە، براخۆییەکان لەم هۆزەن و...

٥ـ بەشێکن لە هۆزی لوڕی گەورە. لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلام باسی دوو تیرە کراوە لە بلوچستان نیشتەجێن

پانتایی خاکی براخۆییەکان ٢٢٠ ـ ٢٥٠ میل دەبێ لە ناوچەی کەلات بوون. تا سەردەمی قاجار زۆر بەهێز بوون. لەنێوان ساڵانی ١١١٢ ـ١٢٨٨ی کۆچیدا حکومەتێکیان لە سیستان و بلوچستان هەبووە. هەندێ جار پایتەختیان (ئیغ) بووە بەڵام زۆربەی کاتەکان (کەلات) بووە.(٥)

لە کتێبی «کوردستان و کورد»ی دوکتۆر قاسملووشدا لە یەك دوو شوێن باسی کوردەکانی پاکستان و ئەفغانستان کراوە و ئاماژە بەوە کراوە دووسەد هەزار کەس لە کوردەکان لە ئەفغانستان و پاکستان دەژین. لە لاپەڕە ٢٤دا باس لەوە کراوە کە« ٢٠٠٠٠٠ لە ئەفغانستان لە مەڵبەندی گوریان و ناوچەی هیرات و نیزیك سنووری ئێران و ئەفغانستان و هەروەها بەلووچستان لە ناوچەی سەرحەد» دەژین. (٦)

خوێنەرانی خۆشەویست ئەوەی لە خوارەوە سەبارەت بە کوردی پاکستان دەیخوێننەوە، سەرجەمی لە (کتێبی «کوردەکانی پاکستان» لە نووسینی بەڕێز «بەختیار غەفوور هەڵەبجەیی» ) وەگیراوە.

**• ڕاوبۆچوونی هەندێ لە خەڵکانی کوردی پاکستان**

ئێستا ئەم کوردانە هەندێکیان خۆیان بە نەتەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی دەزانن، هەندێ کەسی تر دەڵێن لە سەردەمی شا عەباسی سەفەوی لە وڵاتی کوردەواری لوڕ و کەلهوڕ ڕاگوێزراون بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران. بەڵام ئەم بیروڕایە لای هەندێ نووسەر بەدوور دەزانرێت.

دەڵێن ئەگەر ئەو کوردانە لە سەردەمی سەفەویدا ڕۆیشتن بۆ بەلوچستان دەبوایە وا بە ئاسانی زمانی کوردیان لەبیر نەچووایەتەوە. هەروەکو چۆن ئێستا کوردەکانی خوراسانی زمانی خۆیان بەتەواوی پاراستووە.

یان هەندێك لەو کوردانە دەڵێن: پێش ٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر ئێمە لە کوردە بەدەستەڵاتەکانی عێراق و سوریا بووین و لە ئەنجامی لەشکرکێشیەکی زۆر تا ئێرە هاتووین بە خاکی ئێرانەوە بۆ فراوانکردنی دەستەڵات هاوکات لەم لەشکرکێشیەدا دەستەڵاتی عێراق و سوریامان گوایا تێك شکێنراوە و ئێمەی کوردیش لە بەلوچستان گیرساینەوە و بەپێی ڕۆژ تیکەڵ بە برا بلوچەکان بووین.

بەڵام لیاقەت سەردار دینارخانی کورد، کە لە شاری کوەیتەی پایتەختی بلوچستان دادەنیشیت و هۆزی براخۆییە، دەڵێت لەبارەی کۆچکردنی کورد بۆ پاکستان هیچ سەرچاوەیەکی ڕوونی مێژوویی بەڕوونی لەبەردەستدانیە، گەرچی پیرەکانی خۆمان دەڵێن ٦٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا کورد هاتووەتە ئێرە، بەڵام من نازانم کەی؟ بۆچی؟ هاتبوینە ئێرە. ئەم پرسیارە لە مێژوونووسێکی تایبەت بپرسین: بێگومان وەڵامی ڕاست و دروست لای مێژوونووسانە.

هەندێك کەسی دیکەیان دەڵێن: ئێمە لە شاری کەرکوکی عێراقەوە پێش ٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر کۆچیان پێکردوون بۆ بەلوچستان. یان زۆرجار خۆیان بە ئێرانی دەدەنە قەڵەم و دەڵێن ملایەرین.

## • کوردەکانی کوەیتە و دەوروپشتی

پاکستان وڵاتێکی فراوان و فرەنەتەوەیە لەڕووی بەڕێوەبردنەوە پێك هاتووە لە ٥ ویلایەت،هەر ویلایەتەی پایتەختی خۆی هەیە.یەکێك لەو ویلایەتانە (بەلوچستان)ـە کە ناوەندەکەی ئێستا شاری کوەیتەیە.بەر لە چەند سەدە پایتەختی بەلوچستان لە توران بووە کە شارەکەی ئێستا بە کەلات بەناوبانگە.شاری کوەیتە ژماری دانیشتووانی زیاد لە ٢,٥ ملیۆن کەس دەبێت. بە زمانی بەلووچی دەدوێن. ئەم نەتەوەیە لەڕووی زمان و دابونەریت و کەلەپوور و باری کۆمەڵایەتییەوە لە نەتەوەکانی دیکە جیاوازن. بەڵام لەو ڕووانەوە لەگەڵ چەند خێڵێکی ئەو ناوچەیە لەیەکدەچن،ئەم خێڵانەش بە «کورد»ناوبانگیان هەیە.

جگە لە شاری کوەیتەی بەلوچستان، لە شوێنانی دیکەی پاکستان کورد هەیە وەك لاهور، ئیسلام ئاباد، پیشاوەر، سند، ئازاد کشمیر. بەڵام ئەو زانیارییەی لەبارەی کوردەکانی کوەیتە هەیە، لەڕووی سەرچاوە و بەڵگەی باوەڕپێکراوەوە ڕوونترن تاوەکو کوردەکانی شار و شوێنەکانی دیکەی ئەم وڵاتە.

کوردەکان بە ژمارە زۆرن و چەندین گوند لە بەلوچستاندا کوردن و دەرامەت و ژیانیان بەگشتی بەندە بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداری، زۆریشیان دەوڵەمەند بوون و ڕوویان کردۆتە شارەکان و لەوێ خەریکی کاری وەك بازرگانی، دوکانداری، دەستفرۆشین یان فەرمانبەر و کارگوزاری دەوڵەتن لەو گوندانەدا. هەروەها خەڵکی بەدەسەڵات و خاوەن زەوی هەیە کە دەوری سەرۆك هۆز دەبینن و ڕەنجبەر و وەرزێرێکی زۆر لێیان کۆ بوونەتەوەو کاریان بۆ دەکەن کە کوردن و زیاتر لە گوندەکانی دەوروبەرەوە هاتوون.

ئەم خێڵ و هۆزە کوردانە تەنها ئەوەندە دەزانن کوردن، ئیتر وشەی کورد وەك نازناو و ناوبانگی لێهاتووە. خەڵکی گوندەکانیش کە بە ئاژەڵداریی و

کشتوکاڵەوە خەریکن، دەڵێن: ئێمە سەر بە فلان کوردین، بۆ نموونە: میر عەبدولڕەحمان کورد، یان ئەسکەندەرخان، یان حاجی ئیسماعیل خان (ئەم ناوبراوانە چەند کوردێکی دیار و ناسراون)

لەتەك ئەو دانیشتووانەدا، هەن زمانی بلوچییان هەیە و ڕەنجبەری کوردێکی خاوەن زەوی و زارن و زۆریشیان (بەلوچەکان) خۆیان بە کورد دەزانن، کورد لە بلوچستانی پاکستاندا جگە لە شاری کوەیتە لە دەوروبەری کوەیتە و لەسەر ڕێگای «سریاب» و ناوچەی «دادەر» کە دەکەوێتە ١٤٠ کیلۆمیتری شاری کوەیتە، نیشتەجێن و لە شارەکانی «کەلپوور» و «مەچ» و دەوروبەری ئەم شارە دەیان گوندی کوردی تێدایە و زۆر ڕەوشت و خووی کوردانەیان لەنێودا هەیە، وەکو میوانداری، دڵنەرمی، وەفاداری و حەز لە چەك هەڵگرتن.

## ● ژمارەی کوردەکان

وەك زۆر شوێنی دیکە، لەوێش کورد سەرژمێریی تەواو نەکراوە، ئەگەرچی ناسنامەشیان کوردییە، تەنانەت لە زۆر شوێن و دوکان و گەڕەك و دەزگا بازرگانییەکانیش ناوی فلان کوردی پێوەیە.

تا ئێستا دەربارەی ژمارەی کوردەکان هیچ دەزگایەکی ئامار لەلایەن دەوڵەتەوە سەرژمێریی ڕەسمی بەدەستەوە نەداوە. لیاقەت سەدارخان دەڵێت: ئێمڕۆ ٣٥ هەزار کورد زیاتر لە کوەیتە و گوندەکانی دەوروپشتیدا هەیە، ئەمە ئاماری ئەو کوردانەیە کە لە کوەیتە دەژین دەنا لە شوێنانی دیکەی وەك سەند، لاهوور، ئیسلام ئاباد، ئازاد کشمیر کورد زۆرن.

هەندێك سەرچاوە ژمارەی کوردەکان بە زیاتر لە نیو ملیۆن کەسیان دادەنێن و سەرچاوەیەکیش بە چل هەزار کەس مەزەندەیان دەکات.

ئەسکەندەرخان کوردێکی پاکستانییە، دەڵێت: لە پاکستاندا زیاتر لە ٧٠,٠٠٠

کـورد هەیـە، هەرچەنـدە ئامـار باوەڕپێکـراو نیـە. ڕایەکـی دیکـە وای دەگەیەنێـت کە لـەو ژمارەیـە زۆر زیاترە.

## • کوردە ناودارەکانی پاکستان

### یەکەم: لیاقەت سەردارخانی کورد

لیاقـەت کـوڕی سـەردار دینـار خانـی کـوردە. سـەردارخان یەکێکـە لە سـەرۆك هۆزەکانـی براخۆیـی و لـە شـاری کوەیتـەی بەلوچسـتان دادەنیشـێت. خاوەنـی دەسـەڵات و پایەیەکـی زۆر بەنفووسـە. تـا کاتی ئەم نووسـینە هەر لـە ژیاندانە (واتە ئەوکاتـەی گۆڤاری پیشـەنگ، ژمـارە ٢١ سـاڵی نۆیـەم ١٩٩١، چاوپێکەوتن لەگەڵ لیاقەتخـان سـازکردوە) لیاقـەت کـە ئێسـتا جێگـری باوکێتـی، ئەویـش بـە زیرەکی و لێهاتوویـی خـۆی توانیویەتـی لەنێـوان دڵـی جەمـاوەری ناوچەکـەدا بـە کـوڕ و کـچ و پەنابـەرەوە جێـی خـۆی بکاتـەوە. ئاوارەکانـی هەڵەبجـە لـەدوای ڕاپەڕینـی جەمـاوەری کوردسـتانی ئێـراق و پـاش گەڕانەوەیـان لـە ژیانـی پەنابەرێتـی ئێـران و پاکسـتان، لەبـارەی لیاقەتـەوە دەگێڕنـەوە کـە ئێجـگار خەمـی ژیانـی پەنابـەرە کوردەکانـی خـواردووە و هەسـتی دڵسـۆزی و نـان بدەیـی و پاکیـی کوردانـەی شـتێکی سروشـتیی بـووە لـە دەروونـی لیاقـەت و هەنـدێ لـە کوردەکانی ئـەوێ...

### میر عەبدولڕەحمانی کورد

میـر عەبدولڕەحمانـی کورد سـکرتێری یەکێك لە حیزبـە چەپەکانی پاکسـتانە. حیزبەکـەی نـاوی (پارتـی گەلـی نیشـتمان ـ پارتـی ناشـناڵ عـەوام)ی پاکسـتانە. میـر عەبدولڕەحمانـی کـورد گەرچـی مولولەیەکـی باریکـی خوێـن لـە لەشـیدا کوردانەیـە، کەچـی هەسـتی کوردانـەی کڵپەی سـەندووە لـە ناخیدا بڵێسـە دەدات. ئەوەتـا لە سـاتی یادکردنـەوی کیمیابارانـی هەڵەبجـەدا بەوپەڕی تواناوە بەشـداریی

ئەو یادە دڵتەزێنە دەکات لەگەڵ برا پەنابەرە کوردەکانی کوەیتە و ...

میر عەبدولڕەحمان لە مانگی خەرمانانی ١٩٩٢ سەردانی شاری لەندەنی کرد، لەلایەن مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کورد ـ لەندەن، ویڕای ڕێزلێگرتن و بەخێرهاتنی ئەم برا کوردە پاکستانییە، مەڵبەند بە هەلی زانی کۆڕێکی فراوانیشی بۆ ببەستێت تا چاوی بە کۆمەڵگەی کورد بکەوێت لە لەندەن و ئەو خەڵکەش گوێ لە دەنگ و باسی کوردی پاکستان بگرن و لە نزیکیشەوە ئاگاداری بن. کۆبوونەوەکە ڕۆژی ١٩٩٢/٦/٢٧ لە هۆڵی کوردستان لە لەندەن بەسترا. پاش گەڕانەوەی بۆ پاکستان برا کوردە پاکستانییەکانی ئاگادار کردۆتەوە و باسی هەڵوێستی کوردانەی مەڵبەندەکەی بۆ کردوون و بە کاسێتێکی ڤیدیۆی تۆمارکراوی لەندەن باسەکەی نیشان داون.

میر عەبدولڕەحمان خۆی و حیزبەکەی هەمیشە لە بەرەی گەلدا بوون و هەر حزبەکەی ئەم و حیزبەکەی میر غولام ڕەسووڵ و میر عەبدولعەزیز بوو توانیان سەرتاسەری بەلوچستان لە ساڵی ١٩٢٠ لەدەست ئینگلیز دەربهێنن و ڕزگاری بکەن. لە سەردەمی زولفەقار عەلی بۆتۆ کاتێك دژ بە کورد و بەلوچەکان شەڕی نایەوە میر عەبدولڕەحمان و میر ئەحمەد عەلی کورد و میر عەبدولعەزیز دژی وەستان و بەرەنگاری بوونەوە و شۆڕشێکی سەرتاسەری بەرپا بوو لە حەفتاکاندا زیاتر بەلوچستانی گرتەوە و ٤٠ هەزار کەسی تێدا کوژرا.

ئەم بەڕێزە جگەلە چالاکیی سیاسی، لەڕووی ڕۆشنبیرییەوە دەستێکی باڵای هەبووە و بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستەش بەم دوو وتارەی کە لە گۆڤاری کلاوڕۆژنەدا بۆ کوردەکانی نووسیوە بەناونیشانی (کوردەکان کێن؟) ڕوونی دەکاتەوە کە لە دووریشەوە چەند دڵسۆز بە خاك و گەلەکەیەتی.

ناوبراو لەم وتارەدا پشتیوانیی خۆی لە کوردەکان دەردەبڕێ و سەرزنشتی موسوڵمانانیش دەکات کە زۆرجار لە ئاست ئەو کارەساتانەی بەسەر برا کوردە

موسوڵمانەکانیان ێت، بێدەنگ و بێهەڵوێستن.

خوێنەرانی خۆشەویست دەتوانن دەقی نامەکە لە لاپەڕەکانی ٥٤ ـ ٥٧ ی کتێبی کوردەکانی پاکستان لە نووسینی بەڕێز بەختیار غەفوور هەڵەبجەیی بخوێننەوە.

### میر عەبدولعەزیز کورد و میر غوڵام ڕەسووڵی کورد

میر عەبدولعەزیز و خزمانی دەسەڵاتدارێکی ناسراو بوون لە بەلوچستاندا. ڕاپەڕینێکی گەورەی دژی ئینگلیزەکان بەرپا کرد و بۆ ماوەیەك هەموو بەلوچستانی ڕزگار کرد.

بۆ یەکەمجار ساڵی ۱۹۲۰ لەلایەن سەرکردەیەکی کوردەوە بە ناوی میر عەبدولعەزیزی کورد، کورد چووە ناو سیاسەت لە بەلوچستان، کاتێك میر عەبدولعەزیز و برا و کوردەکانی باسی سیاسەتیان دەکرد و پێیان دادەگرت لەسەر ڕزگاریی چەوساوانی دنیا، کەس نەبوو بتوانێ وەك ئەو بەرەنگاری داگیرکەران ببێتەوە. میر دەسەڵاتێکی ناسراو بوو لە بەلوچستاندا و ڕاپەڕینێکی گەورەی بەرپا کرد. بۆ ماوەیەك هەموو بەلوچستانی ڕزگار کرد بەر لەوەی پاکستان ببێتە وڵاتێکی سەربەخۆ، میر عەبدولعەزیز هەندێ جار سەرکردەی هیندی جەوهیر لالی نەهرۆ و چەندەها کەسانی پایەبەرزی دیکەی دیبوو.

لەسەردەمی دەسەڵاتی بەریتانیا کاتێك میر عەبدولعەزیز و میر غوڵام ڕەسوڵی برای قوتابی بوون، حاکمی ئینگلیزی ئەو کاتە سەردانی قوتابخانە دەکات و نەوازشی خوێندکاران دەکات و دەڵێت: ئەم دوو خوێندکارە کوردە کە خوێندن تەواو دەکەن ئاگرێك لەبەلوچستان بەر دەدەن دژ بە ئینگلیز ڕادەپەڕن. هەرواش بوو، پاش شۆڕشی ۱۹۲۰ کوڕەزا و خزمانی میر عەبدولعەزیز توانیان لە ساڵانی ۱۹۷۳ـ۱۹۷۸ شۆڕشێك بەرپا بکەن دژ بە دەسەڵاتی ناوەند و بۆ ماوەیەك هەموو بەلوچستان ڕزگاری بوو.

٤٠ هەزار کوژراوی تێدابوو. ئەم کوشتارەشزیاتر لەنێوان کوردە بەلوچیەکان بە سەرکردایەتی میر مەحمود عەزیز، کوڕی میر عەبدولعەزیز و میر عەلی ئەحمەد و میر عەبدولڕەحمان کورد بوو و بە دژی ڕژێمی زولفەقار عەلی بۆتو.

### ئەسکەندەرخانی کورد

ئەسکەندەرخان، ساڵی ۱۹۵۷ی زایینی لە شاری کوەیتەی پاکستان لەدایك بووە. هەر لەو شارەدا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە، پلەی کۆتایی پێهێنانی (پەیمانگای لێکۆڵینەوەی سیاسی) بەدەست هێناوە

ساڵی ۱۹۷۳ ـ ۱۹۷۸ی زایینی ئەندامێکی چالاکی ڕاپەڕینەکانی بەلوچستان بووە کە ئامانجی ئەو ڕاپەڕینە سەربەخۆیی بووە و چل هەزار شەهیدی لەو پێناوە داوە. دو جار لەسەر سیاسەت زیندانی کراوە. یەکەم لە ساڵی ۱۹۷٦ لە زیندانی کەراچی و دووەم ساڵی ۱۹۷۸ لە زیندانی کوەیتە و ئازاری زۆری چەشتووە.

زیائولحەق سەرۆکی پێشووی پاکستان ئەسکەندەرخانی بە دوژمنێکی ترسناك زانیوە بۆ سەر ڕژێمەکەی. دوای ئەوەی لە دەستەڵات لادرا و دەست بەسەر کۆشکەکەیدا گیرا و بەڵگەنامەیەکی نهێنی بە ئیمزای خۆی لە دژی ئەو سەرکردە کوردە دۆزراوەتەوە، پاشان ئەو بەڵگەنامەیە لە (اخبار العالم)ی پاکستانیدا ژمارە ۳۲، ساڵی ۱۹۷۷ بڵاو کراوەتەوە.

ئەسکەندەرخان، ژنی هێناوە و دوو کوڕ و دوو کچی هەیە و ئێستا (واتە کاتی نووسینی ژیاننامەکەی) بنکەیەکی بازرگانیی بارکردن و گواستنەوەی هەیە.

ئەسکەندەرخان دەڵێت:

منداڵ بووم، باوکم پێی وتم: کوڕم ئەوە بزانە کە تۆ کوردیت و بەلووچ نیت و لە هیچ گەلێکی تر نیت و، نیشتمانی تۆش پاکستان نییە، بەڵکو کوردستانە.

باوکم نەخوێندەوار بوو بەڵام لە سەرەتای لاویمدا ئەو ڕاستیانەی فێر کردم و بە کورد و کوردستانی ئاشنا کردم.

لە ساڵی ١٩٦٨ی زایینی هەواڵی شۆڕشم بیست لە کوردستانی خواروو، بۆم ڕوون بۆوە کە لەوێ هەندێ شت و هەندێ ڕاستی هەن من نەمزانیوە. دوای ئەوە ئیتر شوێن هەواڵی کوردستان کەوتم و هیوام ئەوەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان لەناو ڕۆڵەکانی گەلەکەمدا خۆم ببینمەوە. لە ساڵی ١٩٨٩ ساڵی دوای کیمیابارانی هەڵەبجە، لە پاکستان هەندێ لە برا کوردەکانمان ناسی و زیاتر بە زمان و کەلەپوور و نەریتی کۆمەڵایەتی کورد ئاشنا بووم و بە باشی بۆم دەرکەوت ئێمە گەلێکی سەربەخۆ و جیاوازین لە گەلانی تر، بەڵام بەداخەوە ئێمە لە پاکستاندا بە درێژایی مێژوو لەناو کۆمەڵگای پاکستاندا تواوینەوە، زمان و هەموو نەریت و کەلەپوورێکی خۆمان بیر چۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر کوردین و دڵمان لای گەلی کوردمانە.

جگە لە لیاقەت خان و میر عەبدولڕەحمان خان و میر عەبدولعەزیز و میرمحەمەدخانی کوڕی و میر ئەحمەد خان و ئەو ناوانەی کە باسمان لێوە کرد، چەندەها کەسایەتی ناوداری دیکەی وەك حاجی ئیسماعیل خان کە زاوای سەردار دینار خانە و (عبدالصمد) خانی کورد کە خزمێکی نزیکی سەردارخانن، ئەمانە و هەروەها لە سەردەمی حوکمدارێتی ئەیوب خاندا وەزیری پەروەردە کورد بووە، دوکتۆر عەبدولحەکیم کوردیش لە سەردەمی زولفەقار عەلی بۆتۆدا وەزیری تەندروستی بووە، تا ئێستاش یەکێکە لە پیاوە ناسراوە دیارەکانی ئەو و سکرتێری یەکێك لە حیزبە بەرهەڵستکارەکانی (ئۆپۆزیسیۆن)ی پاکستانە. جەماوەرێکی زۆر کورد و بەلووچەکانی لەگەڵدایە و حیزبەکەش بە ناوی (pso). جگە لەم پارتەی دوکتۆر عەبدولحەکیم و حیزبە کوردەکانی تر،

خەڵکانێکی زۆریش لە کورد لە دەوری حیزبە سیاسییە کانی دیکە کۆ بوونەوە و کار دەکەن، بەتایبەت حیزبەکەی بەنازیر بۆتۆ بە ناوی (ppp)ی پارتی گەلی پاکستان.

● پەیوەندیی نێوان کورد و بەلووچ لە پاکستاندا

پەیوەندیی نێوان کوردی بەلوچستان لەگەڵ گەلانی پاکستان زۆر باشە و تا ڕادەیەکی وەها لە بازاڕ و شارەکاندا هیچ جیاوازییەکی دیار و زەق لەنێوان کورد و بەلووچدا بەدی ناکرێت. هەست بەوە ناکرێت کە ئەمە دوو گەلی جیاوازن و لە مەڵبەندێکدا کۆ بوونەتەوە. هۆیەکەی گونجاندنە لە هەموو ڕوویەکی مەزهەبی و چینایەتی و دابونەریتی کۆمەڵایەتی و هەستی مرۆڤایەتی بەرامبەر یەکتر.

لیاقەت خان دەربارەی کوردی ئەوێ و گەلانی تری پاکستان دەڵێت: پەیوەندیمان لەگەڵ گەلانی پاکستان باشە، بەتایبەتی لەگەڵ گەلی بەلووچدا چوونکە هەردوو لامان هاودەردین و تاکو ئێستا لەسەر نەخشەی زەویدا وڵاتێك نییە بەناوی بەلووچستان یاخود کوردستان.

ئەسکەندەرخانیش لەم پێوەندییەدا دەڵێ: جۆری پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ گەلی بەلووچدا زۆر باشە و هاوکاریمان لە نێواندا هەیە، لەگەڵ زۆر لە خۆشی و ناخۆشیەکانیاندان و هەڵوێستی هاوبەشمان هەیە.

هەروەها ئەسکەندەرخان کوردی سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ پارچەکانی دیکەی کوردستانی داگیرکراو و بەتایبەت لایەنە سیاسییەکان دەڵێت: «پێمان خۆشە کە هاوکاریی گەلی کورد بکەین لە هەر گۆشەیەکی کوردستاندا بن، دەشیان ناسین بەتایبەت حیزبە کوردستانییەکان، ئەمەش بەبێ لەبەرچاوگرتنی بیروڕایان، بەتایبەتی هاوکاری لەگەڵ ئەو حیزبانە دەکەین کە بە دڵسۆزییەوە بەرگری لە مافی نەتەوایەتی

گەلی کورد دەکەن.»

هەروەها هەڵسوکەوتی کوردەکانی پاکستان لەگەڵ کوردە پەنابەرەکان (ئەو پەنابەرە کوردانەی لە ساڵانی ١٩٨٨ و ١٩٨٩ لە کوردستانی عێراقەوە گەیشتبوونە پاکستان) زۆر باش و بەهێز بوو و لە هەموو بۆنە خۆش و ناخۆشەکان بەشدارییان لەگەڵ دەکردن. لە یادی هەڵەبجەدا هەموو ئاوارە کوردەکان یادی ئەو ڕۆژەیان دەکردەوە و بانگهێشتی کوردە پاکستانییەکان دەکرا... لەبەر زۆر هۆکاریش پەنابەرەکان هەمیشە هەوڵیان دەدا کوردەکانی ئەوێ بکەن بە دۆست و هاوڕێی خۆیان. چەند ناسراوێك لەوان بۆ خۆیان پەیدا بکەن بۆ سوودوەرگرتن و ڕێنمایی کاتی تەنگانە..

.. سەرەڕای ئەوەش ناساندنیان بە بارەگای (un) لە کوەیتە و خەڵکانی دیکەی بەدەسەڵاتی وڵات.. تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کوردە پەنابەرەکان و ئەوان پێکەوە ڕاو و گەشتوگوزار بکەن و بچنە سەیران، بۆ کات بردنەسەر بە خۆشگوزەرانی...

### ● زمانی ئاخافتن و خوێندن و، ڕادەی ڕۆشنبیریی و خوێندەواری

برۆهی یان براوی زمانێکی تایبەتی کوردانی بەلووچە کە تەنها خۆیان قسەی پێدەکەن. ئەم زمانە زۆر جیاوازە لە زاراوەکانی کوردی چ کرمانجی ژووروو یان خواروو و یان گۆران و لوڕی . گەر کوردێکی عێراقی بیەوێت لەگەڵ کوردێکی بەلوچستانی قسە بکەن بۆ ئەوەی لێك نزیك ببنەوە وا باشە بە فارسی قسە بکەن تا لێك تێبگەن. کوردێکی بەلووچی بە ئاسانی لە سۆرانی یان بادینانی یان هەورامی تێناگات یان بەپێچەوانەوە...

لیاقەت دەڵێت: ئەو زمانەی ئێمە قسەی پێدەکەین پێی دەڵێن برۆهی یان براوی، کە بەتەنها ئێمەی کورد قسەی پێدەکەین، بەڵام بەداخەوە خوێندن و نووسین بەم زمانە نییە.

زمانی (ئۆردوویی) زمانی ڕەسمی خوێندن و نووسینە، ئەوەش وایکردووە وردەوردە ئەم زمانە بەرەو پەراوێز بڕوات و بایەخی ئەوتۆی نەمێنێت. زمانی ڕەسمیی هەموو پاکستان بە کوردیشەوە، بە ئۆردوویی دەخوێنن، ئەمە زمانی ڕەسمی دەوڵەتە تەنیا بەو زمانەش لە یەکتر دەگەن، چونکە پاکستان خاکێکی فراوانی هەیە و ژمارەی دانیشتووانی زۆرە و چەندەها نەتەوەی گەورە و بچووکی تێدا دەژین. هەر ویلایەتەی زمانی تایبەتی خۆی هەیە، بەلوچستانیش کە پایتەختەکەی شاری کوەیتەیە، یەکێکە لە ویلایەتە گەورەکان، ئەم میللەتەش لەڕێی زمانی خوێندنیانەوە کە ئۆردوویی بە دەتوانن لە زمانی هەرێمەکانی وەك لاهوور، سەند، پیشاوەر و ئازادکشمیر تێبگەن.

لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی ئەم کوردانە ئێستا زمانی کوردی (براهۆیی) خۆیان لەبیر چۆتەوە و بە زمانی بەلووچی و ئۆردوویی داخێون، بەڵام لە ناسنامە و بەڵگەنامە ڕەسمییەکان و پاساپۆرتەکانیاندا وشەی «کورد» وەکو شۆرەت و ناوبانگ بەکار دێنن. هەروەها لەسەر دامودەزگا بازرگانیی و زانستییەکانیش وشەی کورد بە شانازییەوە بەکار دێنن...

دەتوانین ڕادەی ڕۆشنبیریی و خوێندەواری لەناو کوردەکانی بەلووچستاندا بکەین بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** ڕێژەی زۆری دانیشتووانن کە لە هەموو بارێکی ژیانەوە دواکەوتوون. ئەنجام و هۆکەشی نەبوونیی و کەم دەستییە. ئەمە ئەو جۆرە کەسانەن کە لە گوندەکاندا دەژین و خەریکی بەرهەم هێنانن لەسەر زەوی و زاری دەوڵەمەند و سەۆك هۆزەکان، کە ڕێژەیەکی کەمیان خوێندەوارن. تا بە زگێك تێرن بە دە برسین. نزیکەی ٥٪یان خوێندەوارن. جگە لە گوندەکان، شاری کووەیتەش لەم هەژار و نەخوێندەوارانەی لێیە.

**بەشــی دووەم:** ڕێـژەی کەمـی دانیشـتووە کوردەکانـن و زۆربەیان لە شـارەکاندا دەژیـن و هەمـوو جۆرە پێداویسـتی و کەرەسـتەیەکی ژیـان بـە پوختەیـی و ئامادەکـراوی لەبەردەسـتیاندا ئامـادە کـراوە بەبۆنـەی ئـەو ڕێـژە زۆرە بێدەرەتانـەی کـە بەیانـی تـا ئێـوارە ڕەنـج دەدەن بـۆ ئـەم دەوڵەمەندانـە، دەتوانیـن بڵێیـن ١٠٠٪ خوێنـدەوارن.

دەربارەی ڕێژەی خوێندەواری لەناو کوردەکانی پاکستاندا لیاقەت خان دەڵێت:

«بـۆ ئـەم ڕێـژەی خوێندەوارییـە ناتوانـم ژمارەیەکـی دروسـت بڵێـم، بـەڵام پێـم وایـە ڕێـژەی خوێندەواری بەگشـتی لە شـاران لـە ٢٥٪ تێپـەڕ ناکات، کـە بەداخەوە نەخوێنـدەواری دەردێکـی کوشـندەیە لەناومانـدا».

ئەسـکەندەرخان دەڵێـت: لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی کـوردەکان بـە کشـتوکاڵ و ئاژەڵداریـی و بازرگانییـەوە خەریکـن، نەیانپەرژاوەتـە سـەر خوێنـدن، لەگـەڵ ئەوەشـدا قوتابخانەمـان کەمـە، بـەڵام ڕێژەی خوێنـدەواری کورد لە بەلـووچ فرەترە.

- **دابونەریتی کوردەکانی پاکستان**

کـوردی خەڵکـی ئـەو وڵاتـە زۆر بـاش و بەدەسـەڵاتن. نموونـە خێڵـی سـەردار دینارخـان کـوردی دەچنەوەسـەر براخۆییەکانـی ئـەوێ، خاوەنـی پلەوپایەکـی باشـن لەنـاو دەوڵەتـدا و بـاری کۆمەڵایەتیـان زۆر گونجـاو و باشـە، جگـە لـەوەی دەسـەڵاتدارن زۆر بەدەرمـاڵ و بەئەمـەگ و، بەبەزەیـی و دڵنەرمـن. حـەز لـە چەکدارییـش دەکـەن و بـەزۆری بـە سـەیران و ڕاودا چـەك بـەکار دێنـن، پێویسـتە ئـەوەش بزانیـن کـە کـوردە دەوڵەمەندەکان لـە کوەیتـەدا هێنـدەی لێپرسراوانی لای خۆمـان لە شـوێنی خۆیانـدا بەدەسـەڵاتن. زۆریان لە ئاغا و شـێخەکانی سـەردەمی دەرەبەگایەتـی لای خۆمـان دەچـن، لـە ڕاوێـژ و وتووێـژدا لێزانن، بـەڵام لەگەڵ ئەم هەمـوو دەسـەڵاتەوە ئاژاوەگێـڕ و شـەڕەنگێز نیـن.

چونکە هەر لادانێك لە یاسا و نەریتیش دەبێتە هۆیەکی سەرەکی بۆ ئاسانبوونی لەدەستدانی سەرۆك خێڵی و دەسەڵاتیان، هەر ئەمانە زۆرجار یارمەتی و داڵدەی ئاوارە و پەناهەندە دەدەن چ لەڕووی مادییەوە و چ لەڕووی جێبەجێکردنی کاروباری دەوڵەت، هیچ ئەندامێکی ئەم هۆزە کوردانە بەبێ مۆڵەتی یەکێك لە سەرۆك هۆزەکانی خۆیان ناتوانن هیچ جۆرە ڕەفتارێکی نەگونجاو و نەشیاو لەگەڵ دابونەریت بنوێنن یان لادانێك لە یاسا لە ئەستۆی سەرۆك هۆ بۆ پاساودان یان ڕاستکردنەوە، هەر بۆیە ئەوانەی لە لادێکاندا دەژین، لەبەر ئەوەی ژیانیان بەندە بە زەوی و ئاژەڵیانەوە، حاوەبی ڕاستەقینەی هەمووو ئەم مولکانەش سەرۆك هۆزەکانن، هەر لەبەر ئەمانە وادەخوازێت جوتیارەکان پابەند بن بەم نەریتانەوە. ئەمە لەڕووی عەشایریەوە، بەلام لەبەر سیاسییەوە، هەر کەسە ئازادە لە دیاریکردنی حزبی خۆی بە تاك یان کۆمەڵ. ئەمانەش زیاتر لە شارەکاندا بەتایبەت شاری کووەیتە.

دابونەریتی کوردەکان و بەلوچەکان وەها تێکەڵ بووە بەهیچ شێوەیەك لەیەکتر جیا ناکرێتەوە و زۆریش نزیکە لە دابونەریتی کۆنی کوردەواری خۆمان لەڕووی میوانداری و ڕێزگرتن لە لێقەوماوان و داڵدەدان و نان بدەیی و بەدەرماڵی، یان پیاوەتی کردن و حەزکردن لە تفەنگ و زۆر شتی دیکە کە وایان لێ تێدەگەین کە عەشائیری کۆنی خۆمانن و هیچ جیاوازیەك بەدی ناکەین.

یەکێك لە دابونەریتە تەرك نەکراوەکان کە بەلوچیش هەمان خوی پێوە گرتووە و پاراستویەتی (خەنەبەندان)ـە لە ژن هێنان و شایی و کچ بەشوودان، ئەمە دەستوورێك بوو لە کوردەواری کۆندا، هەندێ شیرینی و قاپێکی بچووك خەنەی گیراوە دەدرا بە بەشدارانی ئەو زەماوەندە و شیرینیەکە دەخۆن و بە خەنەکەش خەنەبەندان دەکەن، بە شێوەیەکی گشتی لە شاییدا لەلای ئەوان ئێستاش هەر باویەتی چ لای کورد و چ لای بەلوچ... یان لە شاییدا تەقەیەکی

زۆر دەکەن بە ئاسماندا.

نەریتێك کە زۆر بە ڕاشکاوی و زەقی هەستی پێدەکەیت، ئەوەیە هەتا زۆر تێکەڵیان بیت یا کەم، هەر تاك بۆ تاك دەتوانیت بیانناسیت بە کورتی، خانووەکانیان وا هەڵکەوتووە ژووری میوان دەرگای تایبەتی هەیە لەسەر کۆڵان، دەرگایەکی تری هەیە لەسەر حەوشەیماڵەوە، ئەم دەرگای سەر حەوشەیە تەنها خاوەن ماڵ هاتووچۆی لێوە دەکات بۆ ناو ژووری میوان و حەوشە و خزمەتکردن، بۆ هێنانی پێویستی میوانە چ خواردن یا جێگەوبان.. گەر کەسێك بیەوێت بچێتە میوانداریی کوردێکی بەلوچی تەنها ئەو ژوورە دەبینێت ئیتر پێویست ناکات میوان ئەندامی تری ئەو خێزانە ببینێت، بەتایبەت ژن یا کچیان! هەر بۆیە لەم ژوورەدا شوێنی دەست شۆر و دەست بەئاو گەیاندن هەیە.

● ئایین و مەزهەب

تێکڕای کوردەکانی بەلووچستان ئیسلامن لەسەر مەزهەبی حەنەفین، هەستی ئایینی و بڕوای تەواویان ئێجگار بەهێزە بە ئایین و مەزهەبی خۆیان و هەروەها بەلووچەکانیش بەهەمان شێوە هەندێك لەو دابونەریتانە تێکەڵ بە ژیانیان بووە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی مەزهەبەکە.

مێژووی بەئیسلامبوونی ئەم هەرێمە لە ساڵی ٧١١ی زایینی دەست پێدەکات لەسەر دەستی محەمەدی کوڕی قاسم پاش شەڕ و بەرەنگارییەکی زۆر کۆنترین کۆمەڵگەی بەشەریی ئەم هەرێمی بەلوچستانە کە براخۆییە، ئیسلامیان پەسەند کرد، لەگەڵ برا بەلووچەکانیاندا، بەڵام لەڕووی ئیدارییەوە پەیوەست بوون بە ویلایەتی سەندەوە، هەتا سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمەوی و عەباسی، بەڵام لە سەدەی یازدەهەم بەدواوە نیمچە سەربەخۆییەك و پاشان بوونە بەشێك لە ئیمپراتۆریی مەغۆل و هەر لەسەر دینی خۆیان کە ئیسلامە، بەردەوام بوون هەتا ئێستا... [٧]

## سەرچاوەکان:

١. ویکیپیدیای فارسی
٢. شالیان، ژێرار، تراژیدیای کورد، وەرگێرانی: وریا ڕەحمانی، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، هەولێر، ل ٢٢٠.
٣. سەجادی، علاالدین، مێژووی ئەدەبی کوردی ،بڵاوکردنەوەی کوردستان، چاپی یەکەم، ١٣٩١، سنە، ل ٨٦.
٤. زەکی، محەمەد ئەمین، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٠، سلێمانی، ل٣١ و ٢٧١ ـ ٢٧١.
٥. هەڵەبجەیی، بەختیار غفوور، کوردەکانی پاکستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی پیرەمێرد، ٢٠٠٤، هەڵەبجەی شەهید، ل٤.
٦. قاسملوو، عبدالرحمن، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦.ل ٢٤.
٧. هەڵەبجەیی، بەختیار غفوور، کوردەکانی پاکستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی پیرەمێرد، ٢٠٠٤، هەڵەبجەی شەهید.

## بەشی دووەم ٢
کوردەکانی دەرەوەی کوردستان

٥. باسی پێنجەم

# کوردەکانی ئیسرائیل

- چەند زانیارییەك لەسەر وڵاتی ئیسرائیل
- هاتنی جوولەکە بۆ کوردستان
- سەردەم و هۆکارەکانی کۆچکردن و گەڕانەوەی کوردە جوولەکەکان بۆ ئیسرائیل
- شوێنی ژیانی پێشویان (پێش کۆچکردنیان)
- ڕەوشی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووریی کوردە جووەکان لە کوردستان
- شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە ئیسرائیل
- ژمارەی کورد لە ئیسرائیل
- ژیانی کوردە جووەکان لە ئیسرائیل
- زمان و داب،نەریتی کوردەکانی ئیسرائیل
- گەشتێك بۆ گوندە کوردنشینەکانی ئیسرائیل
- سەرچاوەکان

**● چەند زانیارییەك لەسەر وڵاتی ئیسرائیل**

ئیسرائیـل وڵاتێکـه لـه ڕۆژئـاوای ئاسـیا و لـه ناوچـەی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاست هەڵکەوتـووە. لـه باکـوورەوە لەگـەڵ لوبنـان، لـه باکـووری ڕۆژهەڵاتـەوە لەگـەڵ سـووریه، لـه ڕۆژهەڵاتـەوە لەگـەڵ ئـۆردن و لـه باشـووری ڕۆژئاواشـەوە لەگـەڵ میسر سـنووری وشـکانیی هەیـه. لەگەڵ ئـەوەی ڕووبەرەکـەی ٢٢,١٤٥ کیلۆمەتری چوارگۆشـەیە، بـەڵام خاوەنـی تایبەتمەندیگەلـی جوگرافیایـی فرەچەشـنە.

پایتەختەکـەی شـاری ئورشـەلیمە و تـل ئەفیـف پێتەختـی پێشـووی ئـەم وڵاتە هـەروا ناوەندیـی دارایـی ئیسرائیـل و شـوێنی جێگیربوونـی باڵوێزخانـه بیانییەکانە. لـه شـەش پارێـزگا (باکـوور، حەیفـا، ناوەنـد، تـل ئەویـو، ئورشـەلیم و باشـوور) پێـك هاتـووە. تەنیـا وڵاتێکـه لـه دنیـادا کـه دەتوانیـن بڵێیـن هەمـوو یـان بەشـی هـەرەزۆری جوولەکـەن. بەپێـی بـەراوردی سـاڵی ٢٠١٣ی ڕێکخـراوی ناوەندیـی ئامـاری ئیسرائیـل، ئـەم وڵاتـه نزیکەی هەشـت ملیـۆن و پەنجاویەك هەزار کەسـی حەشـیمەت هەبـووە کـه ٦,٠٤٥,٩٠٠ کـەس جوولەکـە و ١,٦٦٣,٤٠٠ کەسـیان عەڕەبـی ئیسرائیلیـن. زۆربـەی عەرەبـه ئیسـلامییەکان موسـوڵمان و گرووپێکیـش مەسـیحی و دەرووزیـن. مارۆنییـەکان، سـامرییەکان، ئەرمەنی و چەرکەسـییەکان لە کەمایەتییـه قەومییەکانـی دیکـەی نیشـتەجێی ئـەم وڵاتەن. عیـبری و عەرەبـی دوو زمانـی فەرمـی و سـەرەکیی ئـەم وڵاتـەن و چەنـد زمانێکـی تـری وەك ئینگلیـزی و رووسـی و ...کەڵکیـان پێدەکـرێ.

وڵاتـی کۆنـی ئیسرائیـل ناوچەیەکـی حەیاتیـی لـه پاشـایەتیی ئیسرائیـل و پاشـایەتیی یەهـوودا بـووە. بـه شـکڵگرتنی بزووتنـەوەی سیاسـیی سـەهیۆنیزم (زایۆنیـزم) لـه سـاڵی ١٨٩٧ی زایینـی و ڕاگەیانـدراوی بالفـۆر لـه سـاڵی ١٩١٧ی زایینـی، کۆمەڵـی نەتـەوەکان لـه کۆتایـی شـەڕی یەکەمـی جیهانـی و دوای

ڕووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانی، سەرپەرشتیی فەلەستینی بە بریتانیا بەخشی بەو ئامانجە کە بەم کارە، بەربواری دڵخوازی سیاسی، ئابووری و ئەمنیەتی بۆ دامەزرانیماڵی نەتەوەیی جوولەکەکان بە ئەستۆوە بگرێ و هەروەها بۆ پاراستنی مافە مەدەنی و ئایینیەکانی هەموو دانیشتووانی وڵاتی فەلەستین، بە لەبەرچاونەگرتنی نەژاد و ئایین، تێبکۆشێ.

لە ٢٩ی نۆڤەمبەری ١٩٤٧ی زایینی، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پلانی دابەشکردنی فەلەستینی بۆ دوو وڵاتی ئیسرائیل و فەلەستین و بەڕێوەبردنی شاری ئورشەلیمی بە شێوەی نێونەتەوەیی پەسند کرد. ئەم پرۆژەیە هاوڕایی کاربەدەستانی سەهیۆنیستی لەگەڵدا بوو بەڵام دەوڵەتە عەرەبییەکانی ناوچە، زوو ڕەتیان کردەوە. لە ئاکامدا لە ڕێکەوتی ٣٠ نۆڤەمبەری ١٩٤٧ هەتا ١٤ی مای ١٩٤٨ شەڕ و تێکهەڵچوونی خوێناوی لەنێوان چەکدارانی فەلەستینی و یەهوودی ڕووی دا. سەرەنجام لە ١٤ی مای ١٩٤٨ هاوکات لەگەڵ کۆتایی هاتنی سەپەرشتیی بریتانیا بەسەر فەلەستیندا، دەوڵەتی ئیسرائیل بە دەرکردنی بەیاننامەیەك سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند.

ڕۆژێك دوای ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، تەواوی دراوسێ عەرەبەکان هاوکات هێرشیان کردە سەر ئیسرائیل کە شکستیان خوارد. لەدوای ئەمەوە، کۆمەڵێك تێکهەڵچوونی سەربازیی لەنێوان هێزەکانی ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەب هاتنە کایەوە کە شەڕی ١٩٤٨، شەڕی ١٩٥٦، شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧ و شەڕی «یوم کیپور» لە ١٩٧٣ لە گرنگترینی ئەو شەڕانە بوون.

ئیسرائیل ئەندامی فەرمیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە و لە ئێستادا پێوەندیی دیپلۆماتیکی لەگەل زیاتر لە ١٥٧ وڵاتی دنیا هەیە. ئەم وڵاتە شوێنە پیرۆزەکانی سێ ئایینی ئیبراهیمی واتە یەهوودییەت، مەسیحیەت و ئیسلام و هەروەها شوێنە پیرۆزەکانی ئایینی بەهائی تێدا هەڵکەوتووە.

ئیسرائیل وڵاتێکی گەشەسەندوویە و جۆری حکومەتەکەی، کۆماریی پەرلەمانییە. ئەم وڵاتە خاوەنی سیستەمی پەرلەمانی و مافی دەنگدانی گشتییە. لەم وڵاتەدا، سەرۆك کۆمار پۆستێکی تەشریفاتییە و سەرۆك وەزیران وەك سەرۆکی دەوڵەت و کینسێت (پەرلەمانی ئیسرائیل) وەك لقی یاسادانەر کار دەکا. لە ئیسرائیلدا هەر حیزبێك کە مەوجوودییەتی دەوڵەتی یەهوود بە فەرمی بناسێ مافی چالاکیی سیاسی هەیە و هەر حیزبێك زیاتر لە نیوەی کینسێت بەدەستەوە بگرێ، کابینە پێك دێنێ و لە غەیری ئەمەدا بە هاوپەیمانیی لەگەڵ حیزبەکانی دیکە کابینە پێك دەهێنرێ و سەرۆك وەزیر بە دەنگی ڕاستەوخۆی خەڵك هەڵدەبژێردرێ. لە حیزبە سەرەکییەکانی ئیسرائیل دەتوانین ئاماژە بە حیزبی کرێکار، حیزبی لیکود، حیزبی میفداڵ، حیزبی ئاگودات ئیسرائیل، حیزبی شاس و حیزبی مێرتز و حیزبی کادیما بکەین. هەروەها ٣ حیزبی عەرەبییش چالاکیی دەکەن کە بەپێی ڕێژەی لایەنگرانیان، چەند نوێنەرێك بۆ کینسێت (پەرلەمان) دەنێرن. ..[1]

بێگومان چەند دێڕ زانیاری لەسەر وڵاتێك زۆر کەمە بەڵام لێرەدا مەبەست تەنیا ئەوەیە خوێنەری خۆشەویست زانیارییەکی سەرەتایی لەسەر ئەو وڵاتە هەبێ کە بەشێك هاونەتەوەییەکانی لەوێ نیشتەجێن، ئەگینا لەسەر هەریەك لەو وڵاتانەی کوردییان تێدا هەیە، دەکرێ بە دەیان کتێب و وتار بنووسرێ کە بەخۆشییەوە لەم سەردەمەی ئێمەشدا زانیاریی زۆر و هەمەلایەن لەسەر هەریەك لەم وڵاتانە بەشێوەی جۆراوجۆر هەیە.

### ● هاتنی جوولەکە بۆ کوردستان

سەبارەت بە کاتی هاتنی جوولەکەکان بۆ کوردستان ڕا و بۆچوونی جیاواز هەیە و نووسەران و مێژوونووسان هەر یەکێکیان بە چەشنێك باسیان کردووە

و مێـژووی جۆراوجۆریشـیان دیـاری کـردووە. هـەوڵ دەدەیـن لەنێـو گشـت ئەم ڕا و بۆچوونـە جیاوازانـە ئامـاژە بـە چەنـد دانەیەکیـان بکەیـن کـە تـا ڕادەیەکـی زۆر لەیـەك نزیکن:

«بـۆ ڕوونکردنـەوەی کاتـی هاتنـی جوولەکـە بـۆ کوردسـتان دابەشـی دەکەیـن بـۆ سـێ سـەردەم، بۆ ئەوەی شـەپۆلەکانی هاتنـی جوولەکە بـۆ کوردسـتان و عێراق جیا بکەینـەوە:-

١-بەدیل هێنانی جوولەکە بۆ ئاشوور (٧٢١-٦٢٦ پ.ز)

٢-بەدیل هێنانی جوولەکە بۆ بابل (٥٩٧-٥٨٦ پ.ز)

أ-قۆناغی یەکەم ب-قۆناغی دووەم

٣-دەست بەسەرکردنی جوولەکە لەلایەن ڕۆمانیەکان.

... زۆربـەی مێژوونووسـان دەڵێـن ڕیشـەی جوولەکەکانـی کوردسـتان و عێراق دەگەڕێتـەوە بـۆ کۆتایـی سـەدەی (٨) و سـەرەتای سـەدەی (٧)ی پ.ز و، ئـەم سـەدەیەش هاوتایـە لەگـەڵ مێـژووی بەدیـل گرتنـی جوولەکـە و هێنانیـان بـۆ کوردسـتان.

بـەڵام هێندێـك سـەرچاوەی تـر بـاس دەکـەن کـە مێـژووی هاتنـی جوولەکە بۆ کوردسـتان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی (٨)ی پ.ز . ئـەم ماوەیـەش ئاشـوورییەکان فەمانڕەوایەتییـان کـردووە.

ئەوەی یارمەتی پاشـاکانی ئاشـووریدا بۆ دەسـت بەسـەراگرتنیان، ئەو ناکۆکی و لێـك جیابوونەوەیـە بـوو لە دەوڵەتـی ئیسرائیل ڕوویـدا... لەم کاتەدا شـەلمانئەسری ئاشـووری (٨٥٩-٨٢٢ پ.ز) هەسـتایە هێـرش کردنـە سـەر ئیسـرائیـل و توانـی ٢٥ هـەزار جوولەکەیـان لـێ بەدیل بگـرێ و بیانهێنی بۆ کوردسـتان.

دوای ئەویـش سـەرجۆنی دووەم (٧٢٢-٧٠٥) هێرشـێکی کـردە سـەریان و ژمارەیەکـی تـری هێنا بۆ ناوچە شـاخاوییەکانی کوردسـتان. لەدوای ئەم هێرشـەس

پاشا سەنحاریب (۷۰۵ ـ ٦٨١ پ.ز) سەرکردایەتی هێرشێکی گەورە دەکات بۆ سەر مەملەکەتی (ئیسرائیل و یهوژا) توانی لەم هێرشەدا کۆتایی بە پاشانشینی ئیسرائیل بێنێ و ژمارەیەکی زۆریان لە هەردوو مەملەکەتی ئیسرائیل و یهوژا بەدیل بهێنن بۆ ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان ...

... سەبارەت بە شەپۆلی دووەمی هاتنی جولەکە لەلایەن کلدانییەکان بوو لەدوای ڕووخانی ئاشوورییەکان بەدەست ئیمپراتۆرییەتی کلدانی لە ساڵی (٦١٢ ـ ٦١٠). لە ماوەیەکی کورتدا پاشا ئەبوخەدنسر ساڵی (٦٠٥ ـ ٥٦٢) کە بەناوبانگترین پاشای کلدانی بوو دەسەلات وەردەگرێت. ئەبوخەدنسر لە ماوەی دەسەڵاتیدا سەرکردایەتی دوو هێرش دەکات یەکەمیان لە ساڵی ٥٩٧پ.ز کە بە قۆناغی یەکەم دادەنرێت توانی هەموو جولەکەکانی ئورشەلیم بە پیاوەگەورەکان و کەسایەتیە تاوانبارەکان و خاوەن پیشە و شارەزاکانی هێنا بۆ بابل. تەنانەت (یهویاکلین)ی پاشایانی بەدیل هێنا بۆ بابل و هەموو ئەو خەڵکەی مابوونەوە سەرانەیان لێ وەردەگرتن بەڵام پاش ماوەیەك هەڵدەگەڕێنەوە ئەمەش بووە هۆی توورەبوونی (ئەبو خۆ نسر/ئەبوخەدنسر) بۆیە لە ساڵی (٥٨٦ پ. ز) سەرکردایەتی هێزێك دەکات بۆ سەر مەملەکەتی یهوژا و توانی بە تەواوی دەست بەسەر ئەم پاشانشینەدا بگرێت. کۆتایی بە دەسەڵاتیان بهێنێت وشاری ئورشەلیم برووخێنێت و دەست بکات بە کوشتن و بڕین و تاڵانکردنی شارەکە و زۆربەی دانیشتووانی هێنا بۆ بابل کە نزیکەی (٥٠) هەزار کەس دەبوون.

... سێیەم شەپۆلی کۆچکردنی جولەکەکان بەدەست ڕۆمەکان، کاتێك لە ساڵی ٥٣٩ی پ.ز ئیمپراتۆریەتی بابل بەدەستی پاشای فارس (کورشی یەکەم) کۆتایی هات. لە ساڵی داهاتوو کورش هەستا بە هێنانی ژنێکی جولەکە ئیتر کورش ڕێگای دا بەوان واتە جولەکەکان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان یان لە

عێراقدا بمێننەوە، بە سەربەستی و سەربەخۆیی وەکو حوکمی زاتی.

دیارە ئەم یارمەتیدانەی کورش بۆ جوولەکەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو یارمەتی و هاوکارییەی کە جوولەکەکان دایان لەگەڵ کورش بۆ گرتنی بابل. لەلایەکی ترەوە دەگەڕێتەوە بۆ هاندانی خێزانی کورش کە جوولەکە بوو.

لەو کاتەی کە ژمارەیەکی زۆر گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، لەم کاتەدا ڕۆمەکان بەسەرکردایەتی (تیتۆ) هەستان بە داگیرکردنی فەلەستین، لەم کاتەشدا ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان هەڵهاتن بۆ ژێر دەسەڵاتی ئەخمینەکان چونکە ناوچەیەکی بێترس بوو ئەمە لەلایەک. لەلایەکی ترەوە میرنشینی حدیاب، کە پایتەختەکەی شاری هەولێر بوو، هەستا بە پەنادانی جوولەکەکان کە هەڵهاتبوون لەژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکان چونکە ئەم میرنشینە پاشاکەی جوولەکە بوو. ئەمەش شەپۆلی سێیەمی هاتنی جوولەکە بوو بۆ کوردستان.[٢]

جووەکان لە تاراوگەدا زێتر خەریکی پاراستن و قایم کردنی کۆمەڵەکەی خۆیان بوون نەك بڵاوکردنەوەی ئایین و دۆگماکانیان لەناو میللەتانی ئەوێدا ئەوەش ڕەنگە لەبەر دوو هۆ، یەکەم: ئایینەکەیان نەتەوەیی «ئێتنیکی» بوو و مرۆی جوو دەبوایە لە دایك و باوکەوە جوو بێت. دووەم: جووەکان لەم بارەدا نەبوون نە لەلایانی ژمارە و هێزیانەوە و ڕەنگە لەڕووی دۆگما و لۆژیکی ئایینیانەوە، کە ململانێ و زۆرانبازیی لەگەڵ کۆمەڵە ئایینیەکانی تردا بکەن ـ زەردەشتی، مەسیحی و دواتر موسوڵمانەکان ـ جا بۆیە ئامانجی سەرەکیی ئەمان پاراستنی «پاکی و خاوێنی»ی ئایین و ڕەگەزەکەیان بوو. مەزەبناسی عەرەبی سەدەی یازدە (الشهرستاني) بەم بۆنەیەوە نووسیویەتی: «پروپاگەندەی بەنوئیسرائیل لە سووریا و مەغریب بەهێز و لە وڵاتی فارسدا لاواز بوو.»

جووەکان وەکو کەمینەیەکی ئایینی، بە شێوەی گرووپی بچووك بچووك لەم ناوچانەدا و لە هەمان کاتدا لە کوردستانیش نیشتەجێ بووبوون و لەگەڵ

ژێردەستی و گۆشەگیری و باری سەختیشیاندا گوزەرانیان دەکرد. دوای هاتنی ئایینی ئیسلامیش جووەکان نەك هەرلە شوێنەکانی خۆیاندا مانەوە، بەڵکوو لە دەوری عەبباسیدا جۆرە ئۆتۆنۆمیەکیشیان پێدرا.

هەموو ئەوەی دەربارەی ڕەوشی جووەکان لە ئاسیای بچووك و ئێران و نێوان دوو زێ دا گوترا، ئەمانەی کوردستانیش دەگرێتەوە بە حسێب کوردستان هەمیشە لە قەوارەی ئەم وڵاتانەدا بووە ـ کەواتە لە ناوچە و شارەکانی ئەوێشدا گرووپی ئایینی ـ ئێتنیکیی جووەکان هەبوون و لە هەندێ شوێنیدا ئێستاش هەر ماون. کاتێك دەوڵەتی ئیسرائیل ساڵی ١٩٤٨ دامەزرا نزیکەی هەموو جووەکانی کوردستان، بەشێکی کەمیان نەبێ، بۆ ئەوێ کۆچیان کرد یان ڕاونران»...[٣]

جووەکان بە گشتی بە زمانی کوردی باش دەدوان. لەناو خۆشیاندا بۆ نوێژ و دوعا و بەڕێوەبردنی سەریمۆنیای ئایینی زمانی «ئارامی»یان بەکار دەبرد... لەگەڵ گۆشەگیری و دوورەپەرێزیشیاندا بای ئەوەندە تێکەڵ بە کوردەواری بووبوون کە بکەونە ژێر کارتێکردنی هەندێ لایەنی کولتووری گیانی و مەتریاڵیی کوردانەوە، ناوی کورد پێیانەوە نووساوە و خۆیان بە کورد دەزانن ـ ئێستاش لە ئیسرائیل کە لە جووێکی کوردستانی دەپرسن دەڵێ «من کوردم» و ناوی «ئەنا کوردی»بۆیان وەکو بڵێی بووە بە ئێتنۆنیم، هەروەها لە جلوبەرگ و خواردن و هونەر و ژیانی ڕۆژانەیاندا شەقڵ و سیما و مۆرکی کوردانەیان پێوە دیارە.[٤]

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە باسی هۆکار و سەردەمی هاتنی جوولەکەکان بۆ کوردستان کراوە:

«مێژوی بڵاوبونەوەی ئایینی جولەکە لە کوردوستان دەگەڕێتەوە بۆ ٢٨٠٠ سال پێش ئێستا کاتێك ئاشوریەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش زایینـدا کۆمەڵێگ دیلی جەنگی جولەکەیان لە ناوچەکانی کوردوستانی خواروی ئێستا نیشتەجێ کرد. میللەتی کورد دیارە ئەم کاتەش وەکو ئێستا دل فراوان بوە هەربۆیە ئەم

دیلە جولەکانە توانیان لە ماوەیەکی کورتدا تێکەلی کۆمەلگای کوردی بىن جگە لەوەش کەوا کوردەکان خۆیان کێشەیان هەبوو لەگەل ئاشورییەکان. دیلە جولەکەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە وە بەپێی ڕێنمایی ڕێبەرە ئایینیەکانیان دەستیان بە هەولدان کرد بۆ بلاوکردنەوەی ئایینی جولەکە لە کوردوستان بەلام سەرکەوتنەکانیان زۆر سنورداربون تاکو سەدەی یەکی پێش زایین کەوا توانیان شا ئازادی شانشینی ئادیابان (حدیاب)ی کوردی کە پایتەختەکەی هەولێر بوو، بۆ ئایینی جولەکە وەرگێڕن. جا لەم سەردەمانەدا خەلك دەچونە سەر ئایینی سەرکردەکانیان بویە بەشێکی زۆری هاولاتیانی شانشینی ئادیابان ئایینی جولەکەیان وەرگرت. پەیوەندییەکانی شانشینی ئادیابان بە شانشینی جولەکەکان لە قودس پەیوەندییەکی بە هێز بووە شا ئازاد کوڕ و براکەی خۆی یەزدان و مۆنۆباز ی ناردە قودس بۆ خوێندن. ئەم پەیوەندیانە پەرەیان سەند تاکو لایەنی سەربازی و ئابورییشیان گرتەوە بە تایبەتی کە لە سالانی ٦٨-٦٧ پێش زایین ڕۆمەکان گەمارۆی قودسیاندا شا مۆنوباز کەوا دەسەلاتی لە براکەیەوە بۆ مابوەوە لە شکرێك و یارمەتی نارد بۆ قودس بۆ ڕزگارکردنی جولەکەکان. لە ڕاستیشدا ئەمە تەنها یارمەتییەك بو کەوا جولەکەکان لە دەرەوە بۆیان هات...

شانشینی ئادیابان بە شێوەیەکی گشتی لەسەر ئایینی جولەکە مایەوە تاکو سەدەی ٤-٥ زایین ئەو کاتە بە شێك لە کوردە جولەکەکان ئایینی مەسیحیەتیان وەرگرت. کوردوستان بەم شێوەیە مایەوە واتە، جولەکە، مەسیحی، یەزیدی تاکو هاتنی ئایینی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا بۆ کوردوستان. لە گەل هاتنی ئیسلام زۆرینەی کوردە مەسیحیەکان بونە ئیسلام بەلام ژمارەیەکی کەمیان لە سەر ئایینی مەسیحی مانەوە. ئەم کوردە مەسیحیانە ئێستا ژمارەیەکی کەمیان لە کوردوستان ماوە بە تایبەتی لە گوندی هەرمۆتە وە ئەمانە جیان لە

ئاشوری و کلدانی یەکان کەوا دوو میللەتی سەربەخۆن وە مەسیحیشن.

جولەکە کوردەکان لە گەل هاتنی ئیسلام بونە سێ بەش: بەشی یەکەمیان بە تەواوەتی ئایینی ئیسلامی وەرگرت وە ئەمانە زۆرینەن، بەشی دووەمی هەروەکو کورد لە سەر ئایینی جولەکە مایەوە وە ئەمانە ئێستاش تاکە تاك لە کوردوستان ماون وە نزیکەی ۲۰۰۰۰۰ یان ئێستا لە ئیسرائیل دەژین وە تا ئێستاش هەروەکو کوردی ئاری سەیر دەکرێن وە جیاوازیان بەرامبەر دەکرێت. ئەو جولەکانەی ئیسرائیل دەزانن کەوا بە ڕەچەلەك کوردن، ئایینی جولەکەیان وەرگرتوە و بۆیە جیا لە جولەکە بە ئەسل سامییەکان لە گەڕەکی تایبەت بە خۆیان دەژین و کولتور و دەستوری کوردی لە خەنەوەو بگرە تا دەهۆڵ و زوڕنا لە ناویان بەربڵاوە، بەشی سێیەمیان ڕێگایەکی تری گرتە بەر ئەمیش بە سەرزارەکی بون بە ئیسلام تاکو خۆیان لە دەست چەوساندنەوە ڕزگار بکەن بەڵام لە ناخەوە واتە بە نهێنی لە سەر ئایینی جولەکە مانەوە. ئەمانە ژمارەیان زۆر کەمە و پەیوەندییەکانی خۆیان لە ناوخۆیاندا بەوپەڕی نهێنی دەپارێزن. لە ساڵانی ۹۰ کان بەشێکیان ئایینی خۆیان دیسان ئاشکرا کردەوە وە کۆچیان کردەوە بۆ ئیسرائیل. دەبێ ئاماژە بۆ ئەمە بکرێ کەوا ئەم گروپەش کوردن و شانازی بە ڕەچەڵەکی کوردی خۆیان دەکەن بەڵام بە ئایین جولەکەن هەروەکو چۆن کوردی ئیسلام و یەزیدی و مەسیحی هەیە ئاواش کوردی جولەکە هەیە کەوا بە ڕوخسار لە هیچ کوردێکی تر جیا ناکرێنەوە بە پێچەوانەی جولەکە بە ئەسل سامییەکان.

...ئەم گرووپە هەتا ئەگەر بە ئاشکراش لە سەر ئایینی جولەکە بمابایەوە لە کوردوستان توشی گیروگرفتێکی وا نەدەبون چونکە جولەکەکان لە هەمو مێژوی بونیان لە کوردوستان توشی ڕاوەدونان و چەوساندنەوە نەبونەتەوە وەکو ئەوروپا و شوێنی تر هەر بۆیەشە ژیانی ڕەوشەنبیری جولەکە لە کوردوستان توانیبووی بەم جۆرە پەرە بستێنێ لە کوردستان. بۆ نمونە ئەم کوردانەی کەوا لە سەر ئایینی جولەکە مانەوە پاش هاتنی ئیسلامیش توانیان زۆر بە ئازادانە ئایینەکەی خۆیان

پەروەردە بکەن وە زانای زۆر بە ناوبانگیان لە کوردوستان لێ هەڵکەوت لەمانە زانایەکی ئافرەت کەوا لە مێژوی هەمو جولەکەی سەفاردیم واتە جولەکەکانی رۆژهەلات تەنها ئافرەت بوە کەوا بتوانێ ببێتە رابی ئەمیش ئایشەناش بارزانی بوە کچی گەورەرابی جولەکە کوردەکان سامویل بارزانی. ئەم ئافرەتە زانایە نەك هەر زانایەکی ئایینی بوە بەڵکو کتابێکیشی نوسیوە لە سەر پەندی کوردی وە دەها قوتابخانەو هەڵقەی فێربونی کردۆتەوە لە کوردوستان. پرۆفیسۆری بە رەچەلك کورد یۆنا سابیر لە زانکۆی عیبری لە قودس دەڵێت کەوا ئەم بنەماڵەیە تەنها لە بەر ئەم هۆیە بە بارزانی ناو دەبرین چونکە لە ناوچەی بارزان ژیاون بەلام هیچ پەیوندییەکی تیرەییان لە گەڵ عەشیرەتێکی تری لە ژێر ئەم ناوە لە کوردوستان نیە. نەوەکانی ئایشەناش بارزانی تا ساڵی پەنجاکان هەمویان کۆچیان کرد بۆ ئیسرائیل بەلام لەوێش کوردایەتی خۆیان هەر پاراست و کەسایەتی بە ناوبانگیان لە ئیسرائیل لێ دەرچوە لەوانە گەورە ئەفسەرانی پێشوی ئیسرائیلی مۆشێ بارزانی کەوا لە تەنیشت گۆری میناحیم بێگن سەرۆك وەزیرانی پێشوی ئیسرائیل لە سەر گردی زەیتون لە قودس نێژراوە. بە پێی گۆڤاری ئیسرائیل ئینڤێسمێنت نیوس یەکێك لە خێزانە سەرمایەدارە گەورەکانی ئیسرائیلی سەر بەم بنەماڵەن و لە ساڵی ١٩٩٣ وە گروپی Shamrock Group; Real Estate عەقاریان داناوە وە گۆڤارەکە بە خێزانی بارزانی ناویان دەبات (Volume IV، NO٤ ،٢٠٠٠ ،Israel Investment News). ئەم کورتە مێژوییە دەتوانێ بیسەلمێنێ کەوا جولەکەکانی کوردوستان و جولەکەکانی ئیسرائیلیش بە رەگەز کوردی ئارین تەنها ئایینی جولەکەیان وەرگرتوە. زانکۆی عیبری لە قودس تاقیکرنەوەیەکی زانستی کردوە لە سەر جینی وراسی جولەکەکانی سیفاردیم وە میللەتانی تری رۆژهەلاتی ناوەراست و، دەرئەنجامەکان بە دیاریان خستوە کەوا جولەکەکانی سیفاردیم بە جینی وراسی لە گەڵ کوردەکانی

کوردوستانی عێراق هیچ جیاوازیەکیان نییە و جینەکانیان لە کوردەکان نزیکترن لەوەی لە جولەکەکانی ئەشکەناز واتە جولەکەکانی ئەورووپا. کەواتە ئەگەر وابێ دەبێ ئەسڵی جولەکەکانی سیفاردیم کورد بن نەك ئەسلی کورد جولەکە بن چونکە مێژو دیاری دەخا کەوا جولەکەکان بە دیلی هێنراون بۆ لای ئێمە و زۆر لە کوردەکان ئایینی جولەکەیان وەرگرتوە لە بەر ئەوەی ئێمە میللەتێکی ئارین و جولەکەکان میللەتێکی سامین و دەبێ جینیان زیاتر لە عەرەبەکان و ئەسیوپیەکان نزیك بێت نەك لە کورد.[٥]

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە باس لە هاتنی جوولەکەکان بۆ کوردستان دەکرێ:

لە سەردەمی شەلمانسەری سێیەمی پاشای ئاشوورییەکان، لەنێوان ساڵانی ( ٨٥٩ـ ٨٢٤ پ.ز) هێرشی کردە سەر پاشانشینی (یهودا) دەوڵەتەکەی تێکشکاند و میرێکی سەربەخۆی دانا و زۆربەی خەڵکەکەی گواستەوە بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری، کوردستانیش یەکێك لەو شوێنانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکاندا بوو، ناوچەیەکی شاخاوی و سەخت بوو. بەجێهێشتنی ئاسان نەبوو. لەدوای ئەو (بلاشر) سێیەمی ئاشوورییەکان لە ساڵی (٧٤٥ پ.ز) هێرشی کردە سەر پاشانشینی ئیسرائیل و داگیری کرد و زۆربەی خەڵکەکەی گواستەوە بۆ کوردستان.

دوای ئەوانیش کۆمەڵێك پاشای ئاشووری هاتن، لەوانیش (سەرجۆن) ی دووەم و (سەنحاریب) بوون، ئەوانیش هەمان سیاسەتی بڵاوەپێکردنی جولەکەکانیان گرتەبەر بۆ ئەوەی ئەو شوێنە کە بە موقەدەساتی خۆیانیان دەزانی، چۆڵ بێت لە دوژمنی سەرسەختی خۆیان کە جوولەکەکان بوون.

لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب (٦٣٦ ـ ٦٤٤ز) هیچ دەسەڵاتێکیان نەما. ئیسلامە عەرەبەکانیش دەستیان کرد بە دەرکردنی جوولەکە لە ئیسرائیل

و زۆریشیان بە دیل گرتن و ڕەوانەی سوریا و وڵاتی میزۆپۆتامیا (کوردستان)یان کردن. بەمەش بەشی سێیەمی ڕاگواستنی جوولەکەکان بۆ کوردستان کۆتایی پێهات. خەونی گەڕانەوەی جوولەکانیان زڕاند و بوون بە میللەتێکی ئاوارە و چەندین سەدە بەم شێوەیە مانەوە.[٦]

هەروەها لە کتێبی «جوولەکەکانی کوردستان» یشدا بەم شێوەیە باس لە سەردەمی هاتنی جوولەکەکان بۆ عێراق و کوردستان کراوە:

«ئەو جوولەکانەی کەوتبوونە وڵاتی عێراق و کوردستانەوە، بەزۆری پاشماوەی ئەو جوولەکە دەسبەسەرانە بوون کە لە قۆناغی یەکەمدا ئاشوورییەکان لە سدەی حەوتەمی پێش زایینیدا لە فەلەستینەوە هێنابوونیانە چیاکانی کوردستان و شەپۆلی دووەمیان ئەوانە بوون کە بە دوو کاتی جیاواز لەلایەن شای کلدانی (بابل)ی (نبوخز نەسر)ی دووەمەوە لە ساڵەکانی ٥٩٧ پ.ز و ٥٨٦ی پ.ز بە دەسبەسەری هێنابوونیە باشووری عێراقەوە. بەڵام شەپۆلی سێیەمیان بەزۆری لەو برە جوولەکە بوون کە لە دوورگەی عەرەبی و لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتابدا هاتبوونە عێراقەوە و لە ناوچەی فوراتی ناوەند نیشتەجێ بوون»[٧]

لەگەڵ ئەوەی هێندێك لە مێژوونووسان لەسەر ئەو ڕایەن کە جوولەکە هەر لە مێژەوە لەگەڵ دانیشتوان و نەتەوە و ئاینەکانی تری ڕۆژهەڵاتا تێکەڵاویی تەواویان هەبووە و بەڵگەشیان ئەوەیە کە: ئەگەر جوولەکەانی باشوری عێراق و وڵاتی عێراق هەموویان لە نەوەی ئەو جوولەکانەن کە (نبوخز نەسر) بە دەسبەسەری هێناونییە ئەم هەرێمە، ئەی ئەو جوولەکانەی تری وڵاتانی ڕۆژهەڵات و دەوروبەری، مەڵبەندی سەرەکی نیشتەجێبوونیان کوێ بووە و لە کوێوە هاتوون؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دکتۆر ئەحمەد نەسیم سوسە (١٩٠٠ - ١٩٨٢) وای بۆ دەچێ کە: «کۆنترین بوونی جوولەکە لە باکووری عێراقدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری کە نزیکەی ٣٠٠ ساڵ

درێـژەی هەبـووە لەنێـوان سـاڵانی ٩١١ و ٦٣٦ی پ.ز، ئەمـەش کارلێکـی خـۆی هەبـووە بـۆ سـەر گۆڕانـی ڕۆژهـەڵات لـەو دەمانـەدا و لـەم ماوەیەشـدا ١٥ شـا دەسـەڵاتیان گرتۆتـە دەس، ئـەم ئیمپراتۆرییـەش لە سـەردەمی هەندێ لە شـاکانیدا گەیشـتۆتە ئەوپـەڕی پلـەی گـەورەیـی و بەرفراوانـی کـە ناوچەکانـی (هیلالـی خەسـیب) و میـسری گرتۆتـەوە و ڕۆڵێکـی گرنگیشـیان هەبـووە لەو سـەرکەوتنەی کـە بـۆ سـەر شانشـینی ئیسرائیـل بەدەسـتیان هێنـا. هـەر لـە داڕمانـی شانشـینی یەهوداشـەوە دانیشـتووە جوولەکەکەشیان دەسبەسـەر کـردووە و بـەرەو شـوێنە شـاخاوییەکانی وڵاتانـی ئاشـوور (ناوچەی کوردسـتان لـە عیراق و ئیران و تورکیا) و ئـەو شـوێنانەش کـە ئاشـوریەکان جوولەکـە دەسەبەسـەرەکانیان بـۆ گوێزاوەتەوە ناوچـەی کوردسـتانی بەرفراوانـە.»

«هەروەهـا ژمارەیەکیـش لـە مێژوونووسـان و تـۆژەران لـە زمانی ئـەم جوولەکانە خۆیانـەوە دەگێڕنـەوە کـە گوایـە ئەمانە لـە نەوەی ئـەو جوولەکانەن کـە کاتی خـۆی ئاشـوورییەکان هێناویانـن بۆ ناوچە کوردنشـینەکانی کوردسـتان. تەنانـەت (بنیامین تەتیلـی) کـە بۆ خـۆی یەکێك بـووە لـەو جوولەکانەی کە لـە سـەدەی دوازدەیەمی زایینیـدا هاتۆتـە ناوچەکـە و لەو گەشـتەیدا کە سـەردانی شـاری ئامێدی کـردووە و لـەو دەمانـەدا نزیکـەی (٢٥) هـەزار جوولەکەی تیا بـووە و لە ١٠٠ ناوچـەدا دابەش بـوون لە چیـای خەفتیان یـان حەبتـون (هەفتون) لـە چیاکانی کوردسـتان».[٨]

## • سـەردەم و هۆکارەکانـی کۆچکـردن و گەڕانـەوەی کـوردە جوولەکـەکان بـۆ ئیسرائیل

سـەبارەت بـە کاتـی گەڕانـەوە و نیشـتەجێبوونی کـورد لـە ئیسرائیـل بەشـێکی بەرچـاو لـە سـەرچاوەکان سـەردەمی دوای دروسـتبوونی دەوڵەتـی ئیسرائیـل واتـە دوای سـاڵی ١٩٤٨ بـە سـەردەمی گەڕانـەوە و کۆچکردنـی بەشـێکی زۆر لـە کوردە

جـووەکان بۆ ئـەو وڵاتـە دەزانن:

«لـە سـاڵانی دوایـیدا و دوابـەدوای گـرژی و ئاڵۆزییەکانی کوردسـتانی عێراق و چەنـد دەیـە پێش ئەوەش، خەڵکێکـی زۆر لـە کوردەکانی ئێران، عێـراق، تورکیا و یەکێتیـی سـۆڤیەتی پێشـوو بەرەو ئیسرائیـل کۆچیان کـرد. ئەوانە ئـەو کوردانە بوون کـە ئایینـی یەهودییان قبوڵ کـردووە و لە ناوچـە جۆراوجۆرەکانەوە بـەرەو ئیسرائیل چوون». [٩]

ئەگـەر تێبینـی بکەیـن لـە مـاوەی سـەدەی (١٩ ـ ٢٠) کۆچکردنـی جوولەکە بە شێوەیەکی زۆر کـەم بـوو... بـەڵام لێرە بـەدواوە بە هۆی بەسـتنی کۆنگرەی جیهانی زایۆنیـزم لـە شـاری (بـاڵ) لە سـویسرا لـە ٣١ی ئابی ١٨٩٧ بە سـەرۆکایەتی روحی زایۆنـی (تیـۆدۆر هرتزل) لە پێنـاو کۆکردنەوەی جووەکانی جیهان و دروسـتکردنی نیشـتمانێك بۆ ئیسرائیل.

ئیـتر لێـرەوە بزووتنـەوەی زایۆنـی لـەو وڵاتانـەی جیهـان دەسـتیان کـرد بـە پروپاگەندەکـردن بـۆ بزووتنـەوەی زایۆنیـزم، هەر بۆ ئەم مەبەسـتەش هرتـزل (١٨٦٠ ـ ١٩٠٤) داوای لـە سـوڵتانی عوسـمانی عەبدولحەمیـد (١٨٧٦ ـ ١٩٠٩) کـرد کـە دەرگا بکاتـەوە لەبـەردەم جووەکانـی عێـراق و کوردسـتان بـۆ ئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆ ئیسرائیـل، بـەڵام سـوڵتان عەبدولحەمیـد ڕازی نەبـوو. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بزووتنـەوەی زایۆنـی بـەردەوام بوون لـە پروپاگەندە کـردن، لە ناوچەکانـی عێراق و کوردسـتان بـۆ هاندانی جـووەکان بۆ ئەوەی بگەڕێنـەوە بۆ ئیسرائیل، بـەڵام لەنێوان سـاڵی (١٩١٤ ـ ١٩١٩) دەتوانیـن بڵێیـن پروپاگەنـدەی زایۆنـی لـە سـنوورێکی تەسـکدا بـوو، چونکـە دەبینیـن لـەم ماوەیـەدا تەنیـا (٧٩٨٨) خێزانـی جوولەکە، کە زۆربەیـان خەڵکـی کوردسـتان بـوو، گەڕانـەوە ئیسرائیـل.

بـەڵام بزووتنـەوەی زایۆنـی لـەدوای سـاڵی ١٩٢١ەوە دەورێکـی باشـی بینـی لـە هاندانـی جـووەکان. ئەمـەش بەهـۆی دامەزراندنـی لقێـك لـە ئاژانسـی زایۆنـی

لەلایەن کەسایەتییەك بە ناوی (هارون ساسۆن معلم) کە کاری دەکرد بەپێی ئەو پیلانانەی کە سەرۆك سەرکردەی جیهانی دایناوبوو. ئەم کەسایەتیە توانی زۆربەی جووەکانی عێراق و کوردستان بەدوای خۆیدا ڕابکێشێ.

لێرەدا گرنگترین هۆکارەکانی کۆچکردنی جووەکان لەم چەند خاڵەدا ڕوونی دەکەینەوە:

١- ڕۆڵی بزووتنەوەی زایۆنی، بە تایبەتی دوای دامەزراندنی چەند لقێکی نهێنی لە عێراق و ناوچەکانی کوردستان. پڕوپاگەندەیان لەنێوان جولەکەکانی عێراق و کوردستاندا دەکرد کە جولەکەکان هەقی خۆیانە کۆچ بکەن بۆ ئیسرائیل، چونکە عێراق زوڵم و ستەم و توندوتیژی تێدایە و هەر لەدوای ساڵی ١٩٤١ پڕوپاگەندەی بزووتنەوەی زایۆنی بە شێوازی نهێنی زۆر بەهێز بوو...

٢- هۆکاری ئابووری. نیۆرك تایمز تەئکید لەوە دەکاتەوە و دەڵێت هۆکاری ئابووری دەورێکی زۆری هەبوو لە کۆچ کردنی ژمارەیەکی زۆر لە جووەکان بۆ ئیسرائیل لە ئەنجامی هەژاری و کەم دەرامەتی و بێکاری.

٣- گەڕانەوەی هەندێ لە جووەکان تەنها هۆکاری سۆزی دینی و نەتەوەیی پاڵی پێوەنان بۆ گەڕانەوەیان بۆ ئیسرائیل.

٤- بەکارهێنانی هۆکاری ترس و تۆقاندن، وەك کاری تەقینەوە کە لەلایەن بزووتنەوەی زایۆنی ئەنجام دەدرا بۆ نموونە لە ٨ی ٤ی ١٩٥٠ نارنجۆکێکی دەستی لەسەر شارع ئەبوونەواس لە نزیك گازینۆی بیچاو تەقیەوە و بووە هۆی برینداربوونی جولەکەیەکی زۆر. هەروەها تەقینەوەیەکی تر لە ١٤ی ای ١٩٥١ لە نزیك کەنیسەی مەسعود شەمعون تەقیەوە کە بنکەی سەفیری جولەکە بوو....

٥- .. پاش دەرچوونی یاسای عێراقی بووە هۆی ئەوەی جووەکان بە شێوەیەکی ڕەسمی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان (ئیسرائیل).

٦ـ هەروەها ئەو ڕاوەدوونان و دەربەدەریەی جووەکان چێشتیان لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە، لە ساڵی ١٩٤٨ بەولاوە، ئەمەش هۆکارێکی تر بوو چونکە ئەوە بووە هۆی نەمانی متمانە و بڕوا، لەلای جووەکان بە خەڵکی عێراق و حکومەت.

سەبارەت بە چۆنیەتی کۆچکردنی جولەکەکان، بە دوو شەپۆلی گەورە بوو یەکەمیان لە ناوەڕاستی سیەکاندا بوو، دووەمیان لە ساڵانی ١٩٥٠ ـ ١٩٥١ دا بوو. کاتێك حکومەتی عێراقی بەڕەسمی ڕێگەیدا بە جووەکان بۆ وڵاتی خۆیان کۆچ بکەن. هەروەها بڕیاری دەرکرد ئەو جولەکانەی عێراق بەجێ دەهێڵن بۆیان نیە هیچ شتێك لە ماڵ و سامان لەگەڵ خۆیان بەرن. [10]

... لەنێوان ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٢٦دا، گەلێ لە جووەکانی کوردستان بەرەو فەلەستین کۆچیان کرد وێڕای مەترسییەکی زۆر لەسەر ڕێگایان بە هۆی ڕووخانی فەرمانڕەوایی تورك و تەواوی سیستمی ئانارکی (فەوزەوی) کە لە ناوچەکەدا زاڵ بوو، هەندێ لە جووەکان وەك ئەوانەی گوندی کۆنی بارەش، تەواوی دانیشتوان بەکۆمەڵ کۆچیان کرد. لەبەر هەستی بەهێزیان بۆ قودس، زۆربەیان لە گەڕەکەی نوێیەکانی شاردا نیشتەجێ بوون بە تایبەتی لە گەڕەکی ئەلۆری لە نزیك حەیفا، دوای ئەوەی دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا، جووەکانی کوردستان بە عەمەلی کۆچیان کرد ( لەماوەی ساڵانی ١٩٥٠ و ١٩٥١) و لە قودس و چەندان ناوچەی لادێیی نیشتەجێ بوون لە سەرانسەری وڵاتدا. دوای کۆچیان بۆ ئیسرائیل هێندێ لە جووەکانی کوردستان وەك جاران بەردەوام بوون لە کارەکانی وەك جووتیاری و لە ناوچە شاخاوییەکان و دەوروبەری قودس و شوێنەکانی تردا گوندیان دروست کرد... [11]

... حکومەتی عێراق ئاگاداری دەرکرد کە حکومەتی ئیسرائیل دامەزراوە و هەموو جولەکانی بەغدا تا دوورترین گوند لە کوردستانی عێراق

ڕێگەپێدراون بۆ كۆچكردن بۆ ئیسرائیل.. خەڵك دەوڵەمەند و فەقیر هەموو شتێكیان بەجێهێشت لە چركەیەكدا بیریان لە ئارەزووە بەهێزەكە بۆ عاردی پیرۆز كردەوە كە بۆ دوو هەزار ساڵ بوو دوعایان بۆ دەكرد داوایان دەكرد كە دەرگای ئۆرشەلیمیان بۆ بكرێتەوە بۆ ئەو جوانەی دەبن بە غەوارە وا خەریكەی بێتەدی. لە هەمان كاتدا حكومەتی عێراق هەموو شتێكی كە هەیان بوو دەستی بەسەردا گرت و خۆماڵی كرد... كۆچ لە یەكەم جار لە گوندە دوورەكان دەستی پێكرد، هەموو هاتنە شارە گەورەكان كە بە خۆشی و شادی كۆ كرانەوە لە خانووی كۆمەڵگەكە هەندێك مابوون بۆ یەك ساڵ هەر لە چاوەڕوانی دا بوون. هەندێك بۆ ماوەی شەش مانگ بە گوێرەی تۆماریان كۆمەڵ بە كۆمەڵ گوێزرانەوە بە گوێرەی ژمارە و تەمەن بۆ شاری بەغدای پایتەخت و لەوێوە بۆ فرۆكەخانە بۆ ئیسرائیل. [١٢]

لێرەدا یەكێكی وەكو ساسۆن كە لە كوردستان بووە گەڕایەوە بۆ فەلەستین باس دەكات: كاتێك لە ساڵی ١٩٥٠ لەلایەن ئینگلیزەوە پێمان ڕاگەیەنرا كە خۆمان ئامادە كەین بۆ گەڕانەوە، ئەوە بوو كۆمەڵ كۆمەڵ بۆ گەراجی شارەكان بەڕێ كەوتین بۆ ئەوەی بچین بۆ بەغداد، لە شار و گوندەكانەوە كوردەكان هاتبوون بۆ خواحافیزی لێمان و تەواو خەڵكی كوردستان بە پەرۆش بوون بۆمان. پێش ئەوەی سواری ئۆتۆمبێل بین لەلایەن پۆلیسی تایبەتەوە، چ پارە و پول و زێرمان پێبوو لێیان سەندین، دەیان وت ماڵی دەوڵەتە، نابێ بیبەن. لەپاش ئەوەی گەیشتینە فرۆكەخانەی بەغداد، پێش سواربوونمان دووبارە پۆلیس دەیپشكنین هەرچیەكمان پێبوو، لێیان سەندین... [١٣]

بەپێی قسەی ئەو پیرەپیاوانەش كە ئێستا نیشتەجێی وڵاتی ئیسرائیلن، دەردەكەوێ زۆربەیان لە ساڵی ١٩٤٨ و دوای ئەوە گەڕاونەتەوە ئیسرائیل. لە ڕاپۆرتێكی ماڵپەڕی ئاوێنەنیوزدا هێندێك لەو پیرەپیاوانە باسی سەردەمی

چوونیان بۆ ئیسرائیل دەکەن بۆ نموونە: «خالّە ئەنوەر» تەمەن ٨٠ ساڵ، یەکێکە لەو کوردانەی کە ٦٥ ساڵ لەمەوبەر لە گوندێکی شارۆچکەی قوشتەپەوە ڕووی کردۆتە ئیسرائیل یان ئیسحاق پیرەمێردێکی ٩٠ ساڵەی دانیشتووی گوندی «مۆشاف میتاف»ـە، ئەو کاتی خۆی ماڵیان لە گەڕەکی سابونکەرانی سلێمانی بووە و تەمەنی ٢٥ ساڵ بووە کە لەگەڵ دایک و بابی بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە. لە وتەکانی ئەم دوو کەسە دەردەکەوێ کە ئەوانیش ساڵی ١٩٤٨ بەرەو ئیسرائیل گەڕاونەتەوە.(١٤)

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا بەم شێوەیە ئاماژە بە سەردەمی گەڕانەوەی کوردە جوولەکەکان بۆ ئیسرائیل کراوە: «کاتێک دەوڵەتی ئیسرائیل ساڵی ١٩٤٨ دامەزرا نزیکەی هەموو جووەکانی کوردستان، بەشێکی کەمیان نەبێ، بۆ ئەوێ کۆچیان کرد یان ڕاونران»... (١٥)

لە کتێبی «جوولەکەکانی کوردستان»دا بەم شێوەیە باسی سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی جوولەکەکان، بە جوولەکانی کوردستانیشەوە بۆ ئیسرائیل کراوە:

« ... ئینتمای نەتەوەیی و هاوسۆزیان بۆ نیشتەجێبوون لە وڵاتێکی سەربەخۆدا وای لێ کردوون بگەڕێنەوە بۆ شوێن و زێد و بۆ وڵاتێک کە لەلایەن وڵاتە گەورەکانەوە بە تایبەتی بەریتانیا و ڕێکخراوە سیاسی و ڕووناکبیرییەکانی جوولەکە خۆیانەوە ڕەنگیان بۆ ئەڕشت و هەموو ئاسانکاریەکی پێویستیان لەوبارەوە بۆ دەستەبەر ئەکرد. بە تایبەتی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا کە یەکەم کتێب بەناوی (دەوڵەتی جوولەکە)وە لە جیهاندا بڵاو کرایەوە و لەلایەن دکتۆرێکی دانیشتووی ڤیەننای پایتەختی نەمساوە کە ناوی تیۆدۆر هێرتزل بوو، هەروەها لەو ساڵانەشدا یەکەمین کۆنگرەی جیهانیی جوولەکەکان لە (بازل) لە ساڵی ١٨٩٧ دا بەسترا و هرتزل خۆی سەرۆکایەتی کارەکانی کرد. ئەمەش زیاتر هەلی بۆ دیاردەی کۆچکردنی جوولەکە بەرەو وڵاتی فەلەستین

ڕەخساند و هانی بەردەوامی دەدان. . لێرە بەدواوە ڕێگا خۆش بوو بۆ ئەوەی دەیان کۆمەڵە و ڕێکخراوی سیاسی جوولەکە لە سەرتاسەری دونیادا دروست ببێ و بە مەبەستی ئاسان کردن و پاڵپشتی کردنی کۆچ کردنی جوولەکەکانی جیهان بەرەو وڵاتی فەلەستین و ئەو وڵاتەی کە ئەمڕۆ لە نێوەندی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بە (ئیسرائیل) ناسراوە.

وێڕای ئەوانە لایەنێکی تر لەو هۆکارانەی کە ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە پاڵپشتی کردنی جوولەکانی جیهاندا بۆ نیشتەجێبوونیان لە وڵاتی فەلەستین ئەو هەوڵە بەردەوامەی (حایم وایزمەن)ی بە ڕەگەز جوولەکەی ڕووسی بوو، لای کەسایەتیيە ناسراوەکانی وڵاتانی جیهان بە تایبەتی بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ بنیادنانی نیشتمانێکی نەتەوەیی سەربەخۆ بۆ جوولەکە لە وڵاتی فەلەستیندا کە لە ئەنجامدا بەڵێنی ئارسەر جیمس بلفۆری وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لێ کەوتەوە سەبارەت بە پێکهێنانی وڵاتی ناوبراو و بە بەردەوامی دەسگرۆیی کردنی بە شێوازێکی وا کە ژمارەی کۆچکردووان لە نێوانی سالانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٣ گەیشتبوە ٩ نۆ هەزار کۆچکەر لە ماوەی یەك ساڵدا...»

... بەلام سەبارەت بە گەڕانەوەی جوولەکانی عێراق و کوردستان دەتوانین بڵێین:» تەنها ئەوانەیان نەبێ کە لە سەردەمی کۆرشی دووەمی فارسیدا و لە ساڵی ٥٣٩ پ.ز کە بابل و ناوچەکانی باشووری عێراقی داگیرکرد و کۆرشیش ساڵێك دوای گرتنی بابل ڕێگای بە جوولەکەکان دا تا بگەڕێنەوە ئیسرائیل، بەو پێیە نزیکەی ٤٠ هەزار جوولەکە گەڕاونەتەوە شاری ئۆرشەلیم. ئیدی لەم کاتەبەدواوە مەسەلەی کۆچکردنی جوولەکە بەرەو فەلەستین لە وڵاتگەلێکی وەك عێراق و کوردستانەوە بە شێوازێکی دیاریکراو (محدد) بووە. واتە تا ئەو کاتەی کە بۆ جاری یەکەم بانگەشەی دەوڵەتی ئیسرائیل لە ساڵی

١٩٤٨ دا بڵاو کراوەتەوە و زۆربەی وڵاتە گەورەکانی دوای جەنگی جیهانی دووەم دانیان بەو دەسەڵات و قەڵەمڕەوەی جولەکەدا ناوە لە وڵاتی (ئیسرائیل) دا. جا بۆیە دەکرێ لێرە بەدواوە بە دیارترین ماوە و قۆناغێك دەستنیشان بکرێ سەبارەت بە چڕی شەپۆلی دیاردەی کۆچکردنی جولەکەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهان بە (عێراق و کوردستان)یشەوە بەرەو وڵاتی ئیسرائیل. [١٦]

- **شوێنی ژیانی پێشوویان**

کوردەکانی ئیسرائیل ئەو کوردە جولەکانەن کە لە هەموو بەشەکانی کوردستانەوە بە تایبەتی لە باشوور (شارەکانی سلێمانیە، زاخۆ، هەولێر و ...) و ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە (سەقز، بانە، بۆکان، کامیاران، کرماشان و ...) بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە.

ڕۆژنامەنووس دینۆ دانیال لە هەڤپەیڤینێکدا لەگەڵ بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا دەڵێت: «کوردەکانی ئیسرائیل بە زۆری دوو جۆرن، ئەوانەی لە کوردستانی ئێرانەوە هاتوون کە کوردەکانی ڕۆژهەڵاتن و ئەوانەی لە کوردستانی عێراقەوە هاتوون کە کوردەکانی باشوورن.» [١٧]

لە ڕاپۆرتێکی ماڵپەڕی ئاوێنەنیوزدا هێندێك لەو پیرەپیاوانە باسی شوێنی ژیانی پێش کۆچکردنیان بۆ ئیسرائیل دەکەن بۆ نموونە: «خاڵە ئەنوەر» تەمەن ٨٠ ساڵ، یەکێکە لەو کوردانەی کە ٦٥ ساڵ لەمەوبەر لە گوندێکی شارۆچکەی قوشتەپەوە رووی کردۆتە ئیسرائیل یان ئیسحاق پیرەمێردێکی ٩٠ ساڵی دانیشتووی گوندی «مۆشاف میتاف»ـە، ئەو کاتی خۆی ماڵیان لە گەڕەکی سابونکەرانی سلێمانی بووە و تەمەنی ٢٥ ساڵ بووە کە لەگەڵ دایك و بابی بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە. [١٨]

لە ڕاپۆرتێکی ماڵپەڕی (بی بی سی) دا دەردەکەوێ کە بەشێکی زۆر لە

کـوردە جولەکەکانـی ئیسرائیـل خەڵکـی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتانن. بـۆ نموونـە: ئەلیاهـو غەریـب پـوور باس لـەوە دەکا کە ٦٠ سـاڵ لەمەوبەر شـوێنی لەدایکبوونی واتـە شـاری «سـەقز»ی جێهێشـتووە. یـان کەسـێك بە ناوی موشـە توکلـی خۆی بە «سـنەیی» (خەڵکی شـاری سـنە) دەناسـێنێ. یان خاتوو یوخی نیسـان، دانیشـتووی (کفـار یونـا) دەڵـێ: دایـك و باوکـی خەڵکی سـەقز و بانـەن.[١٩]

هەداسـا یشـوورون کچـە گۆرانـی بێژێکـە بـە ڕەچەڵـەك لـە کـوردە جولەکەکانی شـاری ورمێیـە لە سـاڵی ١٩٦١ لـە ئیسرائیل لەدایك بـووە. ناوبراو دەڵێـت: «ئێمە لە ئیسرائیل سـی هەزار کەسـین کە لە شـارە جیاجیاکانی کوردسـتانەوە هاتووین وەك سـەقز، مەهابـاد، بـۆکان و ورمـێ. هەموومـان بـە پەرۆشـین بـۆ هەواڵی کوردسـتان، کاتێـك پێشـکەوتنێك دەبینین لە کوردسـتان، دڵخۆش دەبیـن.»[٢٠]

ئـۆ. ڤیلچێڤسـکی سـاڵی ١٩٥٨ ئامـاژە بـە جووەکانی کوردسـتانی ئێـران دەکا و بـەم جـۆرە باسـیان دەکا: «جووەکان ١٠ ـ ١٣ هەزار کـەس دەبن، لە هەندێ گوندی بانـە و بـۆکان دا دەژیـن بـە زمانـی کـوردی دەدوێـن» هەروەهـا ئاقـە ئیشـارەتێك بـۆ جووەکانـی کوردسـتانی عێـراق نـاوی گەڕەکەکانیانـە لـە شـارەکان ـ گەڕەکـی جوولـەکان ـ کـە ئێسـتاش جارجـارە بـەکاردێ، یـان بـە بۆنـەی ئـەو کەسـانەی بـە بنەماڵـە جـوو بـوون و ئێسـتاش موسـڵمان پێیـان دەڵێن: «بن جـوو»[٢١]

جوولەکەکانـی کوردسـتان زۆر بـاش گونجابـوون لەگـەڵ کۆمەڵـگای کـوردی لـە زۆربـەی شـار و لادێکانـی کوردسـتان بـڵاو ببوونـەوە. هەندێکیـان لەگـەڵ کـوردە موسـوڵمانەکان لـە یـەك گـەڕەك دەژیانز هەندێکیـان لە گەڕەکـی تایبەت بە جوولەکـەکان دەژیـان وەك «گەڕەکـی تەعجیـل لـە هەولێـر، گەڕەکی جولـەکان لە سـلێمانی، مەحـلا جوهیا لە زاخۆ، مەحلـت جوا لە ئامێدی، مەحەلەی موسـایەکان لـە لـە سـنە، گەڕەکـی جولەکە لە شـنۆ، مەحلـت جویا لـە دیاربەکـر». لە شـارەکانی دیکـەی وەك (ورمـێ، کرمانشـا، بـۆکان، ماردیـن، ئورفـە، نسـیبین، کۆیـە، ڕواندز و

هەڵەبجە) لە هەندێك گەڕەكدا جولەكە و دیان (مەسیحی) و موسوڵمان و دینەکانی تریش بەیەکەوە دەژیان بەبێ ئەوەی کێشە و گرفتیان هەبێ.

ژمارە جوولەکانی کوردستان لە گۆڕاندا بووە بەپێی ڕۆژگار گۆڕاوە لە هەندێك كاتدا ڕووی لە زیادی کردووە لە کاتێکی تردا کەمی کردووە. بەپێی سەرچاوەکانی بریتانی پاش ئەوەی هاتنە عێراق و باشووری کوردستان، تەنها لە باشووری کوردستان بەم شێوەیە بوو: لە ساڵی ١٩٢٠ لە شاری هەولێر ژمارەیان ٤,٨٠٠ و لە سلێمانی ١٠٠٠ و لە کەرکوك ١٤٠٠ و لە موسڵ ٧٦٣٩ کەس بووە. لە ساڵی ١٩٤٧ ژمارەکان لە هەولێر بووەتە ٣١٠٩ و لە سلێمانی ٢٢٧١ و لە کەرکوك ٢٠٤٨ و لە موسڵ ١٠,٣٤٥. لە ساڵی ١٩٥٤ ئەو ژمارەیە ڕووی لە نەمان کردووە، لە هەولێر هیچ نەماوە، لە سلێمانی ٦ کەس و لە کەرکوك ٥ کەس و لە موسڵ ١٣ کەس.[٢٢]

بێگومان باسکردن و ناوهێنانی هەموو ئەو گوند و شارۆچکانەی کوردستان کە شوێنی ژیانی پێشووی کوردە جوولەکەکان بوون، کارێکی زەحمەتە و کات و توانایی زۆریشی دەوێ، بەڵام وەك نموونە زۆر بە کورتی تەنیا باس لە هێندێك لە ناوەندە سەرەکییەکانی جوولەکە لە گوند و شارەکانی کوردستانی ئێراق (کوردستانی عێراق) دەکەین کە کوردەکان جوولەکەکان پێش کۆچکردنیان بەرەو ئیسرائیل تێیاندا ژیاون:

- ***جووەکانی ئاکرێ:*** سەبارەت بە جووەکانی ئاکرێ مامۆستا خالد ئاکرێی و حاجی نوح ئاکرەیی دەڵێن لە شاری ئاکرێ نزیکەی ١٠٠ بۆ ١٢٠ ماڵی جوولەکە هەبوون. گەڕەکی تایبەت بە خۆیان هەبووە بە ناوی جۆسلی واتە شاری جوولەکە. هەندێکی تریان لە گەڕەکی حەزینگا دەژیانن هەروەها کەنیسە و گۆڕستانی تایبەت بە خۆیان هەبوو تاکو ئێستا هەرماون. ئەو جوولەکانە بە کاری جۆراوجۆرەوە خەریك بوون وەك: بازرگانی، زێڕینگەری،

کاری دەستی و .. بە گشتی جووەکانی ئاکرێ زۆر دەوڵەمەند بوون و پارەیان زۆر بوو.

ــ ***جووەکانی دیانا:*** سەبارەت بە جووەکانی دیانا هەروەك حاجی حسێن پاشا مسگفی دیانەیی لەدایك بوونی ساڵی ١٩٢٤ لە دیمانەیەکدا وتوویەتی: جووەکان لە دێهاتەکانی بادینان، دیانە، مجیبە و ڕەواندوز دا هەبوون. خۆم لە گوندی بادلیان لەگەڵیان ژیاوم و ژمارەیان نزیکەی ١٠ ماڵ بوو، لەگەڵ موسوڵمانەکان تێکەڵاوبوون لە هەڵسوکەوتیان. هەروەها ماڵەکانیان بە تەنیشت یەکترییەوە بوون. لە نێوان خۆیاندا بە زمانی عیبری قسەیان دەکرد، بەڵام هەموویان بە کوردی لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان قسەیان دەکرد.

سەبارەت بە جووەکانی (ڕۆست) هەروەك هێندێك لە ڕیش سپییەکانی ئەو شوێنە ئاماژەی پێدەکەن، نزیکەی ١١٠ ـ ١٤٠ هاووڵاتی جوولەکە واتە نزیکەی ١٧ ـ ٢٠ ماڵ لەو شوێنە ژیاون. ئەوانیش دابونەریتەکانی خۆیانیان بەڕێوەبردووە و خاوەن گۆڕستانی تایبەت بە خۆیان بوون و بە هۆی ئەوەی کاری ڕانکوچۆخە دروستکردن و جاجم و ڕەنگ کردنی جلوبەرگیان کردووە، و زۆریش شارەزا بوونن زۆر دەوڵەمەند بوون.

ـ ***جووەکانی هەولێر:*** جووەکانی شاری هەولێر لەناو جەرگەی شاری هەولێر نیشتەجێ بوون، ژمارەیان زۆر بوو. بەپێی هەندێك لە سەرچاوەکان گەڕەکێکی بچووك هەبوو لە خوارووی هەولێر جوولەکەی لێ بوو کە نزیکەی هەزار کەس دەبوون و ساڵی ١٩٥٠ ـ ١٩٥١ هەولێریان بەجێهێشت. لەلایەکی ترەوە بەپێی سەرژمێریی حکومەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٠ نزیکەی ٤٨٠٠ جوولەکە لە شاری هەولێر نیشتەجێ بوون. لە سەرژمێرییەکی دیکە کە حکومەتی عێراقی دەریکرد ساڵی ١٩٤٥ نزیکەی ٣١٠٩ جوولەکە لە شاری هەولێر هەبوون. لە گەڕەکی تەعجیل ژمارەیەکی زۆر لە جووەکان دەژیان

دەتوانین بڵێین دانیشتووانی ئەم گەڕەکە زۆربەیان جولەکە بوون. .. سەبارەت بە کار و پیشەی جووەکانی هەولێر: بە گشتی خەریکی کاری بازرگانی و دووکانداری و سبوخچێتی و زەرەنگەری بوون. هەروەها زۆربەیان دەوڵەمەند بوون بۆیە هەندێکیان لە دەوری بازاڕ کۆ دەبوونەوە...

- ***جووەکانی کۆیە:*** هەروەها لە شارێکی وەکو کۆیە وەك تاهیر حەوێزی لە (مێژووی کۆیە)دا نووسیویەتی: نزیکەی (٦٠ - ٧٠) ماڵ جوو هەبوون. لەپێشدا بەزۆری لە کۆنە قەڵای گەڕەکی (هەداوان) بوون و کەنیشتەکەیان لەوێ هەبوو. پاشان ماڵیان گواستەوە بۆ گەڕەکی بەفریقەندی لە دەوروپشتی مزگەوتی حەتك. بەوێیان دەووت: گەڕەکی جولەکە... جووەکان لەم شارەدا گۆڕستانی تایبەت بە خۆیان هەبوو و مردوویان لێ ئەناشت لەسەر گردێك پێی دەوترا (گردی جووان).

- ***جووەکانی جووەکانی سلێمانی:*** سەبارەت بە جووەکانی سلێمانی، هەر لە زووەوە ژمارەیەکی زۆر جولەکە لە گوندەکانی دەوروپشتی سلێمانیدا ژیاون. (مامۆستا جەمال بابان) لەبارەی ئەم جووانەوە دەڵێت کە گوایە پێشتر لە دەوروبەری قەڵاچوالان بوون و دوایی هاتوونەتە ناو شاری سلێمانی.

ڕیچ، مێجەرسۆن، لیك لاما و مستەر هارت و چەندانی تر لە نووسینەکانیاندا باسیان لە جووەکانی شاری سلێمانی کردووەو هەر یەکێکیشان بە جۆرێك باسی ژمارەی جولەکانی ئەم شارەیان کردووە.

سەبارەت بە کار و پیشەیان لە سلێمانیدا پیشەی هەرە گرینگیان زەرەنگەری، بەزازی، عەتاری، بازرگانی، دوکانداری بووە و لەچاو ژمارەی کەمیانەوە بەشێکی زۆری بازاڕیان بەدەستەوە بووە... لە ڕووی دابونەریتیانەوە زۆر باس بوون لەگەڵ یەکتریدا و لەناوخۆیاندا ژن و ژنخوازییان کردووە و ڕێزێکی زۆریشیان لە ژن گرتووە... سەبارەت بە ڕۆژی شەممە و جەژنەکانی (کەپرەشینە، مەقیرە، هامان)

لایـان زۆر پیـرۆز بـووە. جگـە لـەوەی گەڕەكێكـی تایبەتیـان هەبـووە، گۆرسـتانی تایبەتیشیان هەبـووە كـە موسـوڵمانەكانی پێیـان وتـووە گۆڕسـتانی جـووەكان. لـە كەسـاتیەتیە ناودارەكانیشـیان دەتوانیـن ئامـاژە بكەیـن بە: خواجە سـعید ئیسـحاق، عیدالله بنـورش، حەمـەی داود، شـەمعون شـاولی، میخائیـل یانەیـەی، حاخـام خواجەمیـرە ئەفەنـدی، خواجـە سـاڵح بنـورش، خواجـە یعقـوب حەسـەنە جـوو، خواجـە ئیسـحاق پێنجوێنـی، ڕفایل كـە بەناوبانگتریـن زێڕەنگەر بـووە.[٢٣]

هەروەهـا بێجگـە لـەو شـارانەی باسـیان كـرا، جـووەكان لـە زۆر شـاری تـری وەك چەمچەمـاڵ، پێنجوێـن، هەڵەبجـە، كفـری، كـەلار، شـەقڵاوە و زیاییان بەسـەر دەبـرد كـە بـۆ ئەوەی باسـەكە لـەوە زیاتـر درێـژ نەبێتەوە، لـە باسـكردنیان بە تێروتەسـەلی خـۆ دەبوێریـن.

### • ڕەوشـی ئابـووری، كۆمەڵایەتـی و كولتووریـی كـوردە جـووەكان لـە كوردسـتان

لـەم بەشـەدا لـە سـەرەتا بـە كورتـی باس لـە ڕەوشـی ئابووری كـوردە جـووەكان لـە كوردسـتان دەكەیـن هەرچەنـد لـە میانەی باسـكردنی شـوێنی ژیانی پێشـوویان لـە هێندێـك شـوێندا بـاس لـە كار و پیشـەیان (بازرگانـی، زێڕینگـەری، كاری دەسـتی كاری، ڕانكوچۆخـە دروسـتكردن و جاجـم و ڕەنـگ كردنـی جلوبـەرگ، دووكانـداری و سـبوخچێتی) كـراوە. دواتـر بـاس لـە هەندێـك لایەنـی ژیانـی كۆمەڵایەتـی و كولتووریـی ئـەوان دەكەیـن چونكـە وەك سـەرچاوەكان ئامـاژەی پێـدەدەن ئێسـتاش هێندێـك لـە كـوردە جـووەكان دوای چەندیـن سـاڵ لـە گەڕانەوەیـان بـۆ ئیسرائیـل پارێزگاریـی لـە هێندێـك لـە دابونەریتەكانیـان دەكـەن. بۆیە پێویسـتە شـارەزای هێندێك لە لایەنەكانـی ژیانی كۆمەڵایەتیـی و كولتووریی ئـەوان پێـش كۆچكردنیـان بـۆ ئیسرائیـل بكەیـن:

«گەلێ لە جووەکانی کوردستان جووتیار، شوان، بەلەمەوان و داربڕ بوونە. هیچ یەکێ لەم کارانە ئاشنا نەبوونە بە جووەکان لە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا... لە ناوەندە گەورەترەکاندا، جووەکان بازرگانییان دەکرد بە دانەوێڵە، لۆکە، سووف، مەڕومالآت، بنێشت و بنێشتەتاڵ و مێوژ و تووتن. گەلێکیان باخچە و ڕەزیان هەبووە. ئەوانی تر ئەم پیشانەیان هەبووە: چنین، خومچی، پێڵاودروستکەر، و هەندێکیش ئاسنگەر و زێڕنگر بوونە. لە سەدەی بیستدا، لەبەر هۆکاری تەناهی (ئەمنی) و باشتربوونی گواستنەوە بە هۆی بەکارهێنانی ئوتومبیل، گەلێ جوو (هەورەها کورد و ئاشوورییەکانیش) پێداپێدا گوند و زەحمەتیی کێڵانیان بەجێهێشت و چوونە شارەکان بۆ ژیانێکی ساناتر و بوون بە دووکاندار، بازرگان و قەساب. شارۆکەکان، کۆڕ و مەراسیمی ئایینیان زۆر تێدا ئەنجام دەدرا، شیاوتر بوون بۆ ژیانی جووان و بارێکی تەناهیی باشتریان بۆیان دابین دەکرد لە دژی هێرشی تیرە کۆچەرییەکان و تاقمەکان. هەروەها بەدووریش بوون لە کارەسانی سروشتی و ناوچە سەختەکان.

گرووپێك لەناو چینە هەژارەکە لە شارە گەورەکان، وەك زاخۆ، ڕێبوار بوون کەوا دوو یان سێ سێ گەشتیان دەکرد. یان ئەوەتا بە کەر و ماین دەگەڕان و شتیان دەفرۆشت وەك شەکر، چا، دەرزی، دەمبووز، قوێچە و دەرزی و داو. ئەم کارە زۆر مەترسیدار بوو چونکە زۆرجار ڕێگر دەهاتنە سەر ڕێیان، زۆریشیان لێ کوژران لەلایەن تاقمی کوردەکانەوە...

پیشەیەکی تر کە دانسقە و جێ سەرنج بووە بە تایبەتی لەناو جووەکانی زاخۆ، بەلەمەوان یان داربڕینەوە بووە. زاخۆ ڕووباری خابووری پێدا دەڕوات و ناوچەیەکی گرینگی بار بوو لەبەر ئەوەی ڕێگەی سەرەکیی گواستنەوەی کاڵا بوو لە کوردستانی ناوەڕاستەوە بۆ سەر ڕووباری دیجلە. بەلەمەکان چوار گۆشە یان لاکێشەیی بوون، لە دار دروست کرابوون هەروا یان بە هۆی پێستەی

مەڕەوە پێك دەبەسترانەوە.

کارە گشتیەکانی تری جوزان دەزی و داو بووە (کە ئافرەتان زۆر ئەو کارەیان دەکرد) دروستکردنی جل لە سووف و چنینی فەرشی بچووك و خومچییاتی. چنین هەم لە گوند و هەم لە شارەکانیشدا باو بوو. زۆر جووتیار کاری چنینیان دەکرد بە تایبەتی لە زستاناندا، ئەو دەمەی کشتوکاڵ دەوەستا. لە شارۆکەکاندا، تەنانەت هەندێ لە ڕابییەکانیش لە ماڵەوە کاری چنینیان دەکرد بۆ ئەوەی داهاتێکی زیاتریان دەست بکەوێت. بەڕای بێنجامینی دووەم، فەرش لە سووف دروستکراوەکان کە لەلایەن جووانی کوردستان دروست دەکران بەوەندە باش و جوان بوون دەنێردرانە دەرەوە.

بە گشتی، پیشەی جووەکانی کوردستان تایبەت بوون بە ناوچە لادێییەکان و شارۆکە بچووکەکان. بۆیە کەمتر بازرگان و پارەداریان تێدا بوو. بە گشتی پارە کەم بوو لە کوردستاندا، هەروەها کەرەستەی ژیانی خۆشیش کەم بوو. بازرگانی لە ڕێی ئاڵوگۆڕکردنی شتەوە دەکرا. بۆ نموونە، پێڵاو بە مریشك دەگۆڕدرایەوە، فەرشێك بەرامبەر کەمێك دانەوێڵە بوو، یان دانەوێڵە بە هێلکە، شیر، هەنگوین، میوە، تووتن، ئامیری تر بە گەنم و تاد. لە هەندێ حاڵەتی تردا بازرگانیی نیوەی بە پارە هیشکە بوو و نیوەشی بە شت.[٢٤]

جووەکانی کوردستان بە هۆی پیشەی کشتوکاڵییەوە لە ڕەوەندە جووەکانی تری ناوچەکانی تر جیا دەکرانەوە. گەلێکیان زەوییان هەبوو دەیانکێڵا، بەم شێوەیە جیاواز بوون لەوانی تر. هەندێ خێزانی جوو هەبوو خاوەنی تەواوی لادێیەك بوو، خەڵك لەسەر زەویی ئەوان ڕەشماڵی هەڵدەدا و دەژیا...

گەلێ لە جووەکان خەریك بوون بە مامەڵەی دار و کەڵەکیان لێ دروست دەکرد، بە تایبەتی لە شارۆکەی زاخۆ کە دەکەوێتە سەر یەکێك لە زێیەکانی ڕووباری دیجلە... ئەوەی ئەوانەی مامەڵەی داریان دەکرد بەردەوام لەگەڵ

باوکیانـدا بـوون، بۆیـه ئه‌وانیش فێـری ئـه‌و بازرگانییه ده‌بـوون...

گه‌لـی لـه جووله‌کـه‌ی گـه‌ڕۆك بـه گونده‌کانـدا ده‌گـه‌ڕان و هـه‌ر گه‌شتێکیان هه‌فته‌یه‌کـی ده‌بـرد و هه‌نـدێ جـار لـه کاتـی لافـاودا چه‌نـدان مانگیـان پێده‌چـوو، وێـڕای مه‌ترسـیی کاره‌سـاته سرووشـتییه‌کان، چه‌نـدان مه‌ترسـی تریـان هه‌بـوو له‌سـه‌ر ڕێگـه‌دا... کاڵاکانیـان له‌نـاو گونیـه له‌سـه‌ر پشـتی که‌ڕێـدا داده‌نـا و لـه شـارۆکه گه‌وره‌کانـدا ده‌یانفرۆشـتنه‌وه. کاڵاکان ئه‌مانـه بـوون: کووتـاڵ، جگـه‌ره، تووتـن، سـابوون، ئاوێنـه، بۆیه خه‌نه، کلدان ئه‌نگوسـتیله، بـازن و گـواره، ته‌زبیحی ڕه‌نگاوڕه‌نـگ، شـتی چـنراو، قومـاش و چـا و شـه‌کر...

پێـڵاو دروسـتکردن کارێکـی بـاو بـوو له‌نـاو جووه‌کانـدا، بـه ته‌نیـا له زاخـۆ، ٢٠ پێـڵاو دروسـتکه‌ری جووله‌کـه هه‌بـوو پێـش ئـه‌وه‌ی کـۆچ بکـه‌ن بـۆ ئیسرائیـل... پێـڵاو دروسـتکه‌ره‌کان زیاتـر له‌بـازاڕه‌کان کاریـان ده‌کـرد، بـه‌ڵام هه‌نـدێ پێـڵاو دروسـتکه‌ری تـر هه‌بـوون بـه گونده‌کاندا ده‌گـه‌ڕان... جۆره باوه‌کانی پێـڵاو ئه‌مانه بـوون: یه‌مه‌نـی، فـلات، پێـڵاوی پێسـته‌ی بێقه‌یتـان، پێـڵاوی بـن بڵنـدی ئافره‌تـان (قاپقاپـه)، پێـڵاوی پلاسـتیکی لـه تایه‌ی سـه‌یاره دروسـت ده‌کـرا....

کاری دارتاشـی له‌نـاو جووه‌کانی زاخـۆدا بەربڵاو بوو که نزیکـه‌ی ١٤ دووکانی دارتاشـی لـێ بـوو. له‌بـه‌ر ده‌سـت ڕه‌نگینیـان، هه‌ندێ جـار له‌باتی موسـڵمانه‌کان به جووه‌کانیـان ده‌گـوت شـا دروسـت بکـه‌ن بـۆ مزگه‌وتـه‌کان... ئـه‌و که‌لوپه‌لانـه‌ی بـۆ نـاو ماڵ دروسـت ده‌کران سـاده و دانسـقه بـوون: سـندووق بۆ هه‌ڵگرتنـی کاڵا، ته‌ختـه، لانـك، که‌لوپه‌لـی تـر، قیمه‌کێـش، چه‌نـدان شـتی جۆربه‌جـۆری تـر بـۆ مه‌به‌سـتی بیناکردن بـه‌کار ده‌هێنرا. که‌رسـته خاوه‌کان بـاره‌داره‌کان بـوون و له‌لایه‌ن پیاوانـی به‌له‌مـه‌وه ده‌هێـنران... [٢٥]

به‌ڵام سه‌باره‌ت به ژیانی کۆمه‌ڵایه‌تی و کولتوورییان ئه‌گه‌ر به وردی و به ته‌واوه‌تیی باسی بکه‌ین، بێگومان خۆی کتێبێکی تایبه‌تی ده‌وێ، هه‌ر بۆیه لێره‌دا

تەنیا باس لە چەند لایەنێکی گرنگی ژیانی جووەکانی کوردستان دەکەین:

« پێشوازیکردن لە میوانان سیفەتێکی تایبەتی جووەکانی کوردستان بوو. کاتێکی باشیان تەرخان دەکرد لەگەڵ چەندان جۆرە خواردن تا پێشوازی لە میوانی ناوەخت بکەن. مێزەکانیان هەرگیز بەتاڵ نەبوو و هەردەم ڕازابووەوە. میوان خزمەت دەکرا لەڕێگەی دانانی چەندەها جۆر میوە، چا و نان و کێك...ماڵباتی جوو و موسوڵمان سەردانی یەکتریان دەکرد. زۆر سوودیان لەم ئاشنایەتی و میوانداری و پێوەندییەوە دەبینی.

لە بۆنەکاندا وەك بۆنەی ئایینی، بووك و سونەتکردندا، ئافرەتان کاری ڕۆژانەیان بەجێ دەهێشت و لە ماڵی خاوەن بۆنەکە کۆ دەبوونەوە و یارمەتیان دەدا لە ئامادەکردنی شتەکاندا. خواردنێکی زۆر ئامادە دەکرا، هەروەها قاپوقاچاخی تایبەتی بەکار دەهێنران کە زۆرجار شتی زۆر بەهادار بوون.

«دهۆڵ و زوڕنا باوترین ئامێری موزیك بوون. دۆڵەکەی بەملیەوە دەکرا و دوو پارچە داریش لە هەردوولای پێستییەکەی دەدرا. زۆر کەس هەوڵیاندا فێری زوڕنا بن، بەڵام کەمێکیان سەرکەوتن لەبەر ئەوەی وێڕای گوێچکەیەکی باش چەشەی موزیکی هەناسەی درێژ و سیی باشی دەویست. چونکە سیفەتی موزیکەکە ئەمەی دەویست. جووەکانی کوردستان شاییان دەکرد، هەندێ جار پیاو و ئافرەت بەجیا، هەندێ جاریش ڕەشبەڵەك بوو، هەر شاییەك ناوێکی تایبەتی هەبوو و جووڵەی تایبەت بە خۆی هەبوو، شایی بە دۆڵ و زوڕنا دەگێڕدرا و خۆش دەکرا.»

نەریتێکی تری کوردە جووەکان یاریکردن بوو. یاریی منداڵان زیاتر لە دەرەوە دەکرا بەڵام « یاریی گەورەکان عادەتەن لە ژوورەوەدا ئەنجام دەدران. بۆ نموونە، سینی سینیانێ. یارییەکی تر پێی دەگوترا چوارقاپە: کە پێنج شەش پیاو یارییان دەکرد، کە هەوڵیان دەدا بازنێك بدەن بەهۆی گوشینی یەك لە

کۆتاییەکان. دۆڕاو دەبوایە هێلکە، گوێز و خورما بدات. هەلی یاریکردن لە هەموو ماڵێك و لە هەموو کۆبوونەوەیەکدا هەبوو. ئەمانە یاریی دوو کەسیش بوون، وەك دۆمینە، تاوڵە، کە هەم لە ماڵ و یان چایەخانەدا دەکران. زۆرجار بەرد و دار بەکار دەهات بۆ ژماردنی ئەنجامی یارییەکان.» [٢٦]

بێگومان ئاگاداربوون لە ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریی کوردە جووەکان لەماوەی ساڵانێکی دوور و درێژی مانەوەیان لە کوردستان پێویستی بە نووسینی دەیان وتار و کتێبی جۆراوجۆر هەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی مەبەستی باسەکەی ئێمە زیاتر ئاگاداربوون لە ڕەوشی هەمەلایەنەی ئەو کوردە جوولەکانەیە کە هەنووکە لە ئیسرائیل دەژین، بۆیە زۆر بە کورتی باسی ژیان و گوزەرانی ئەوانمان پێش چوونەوە بۆ ئیسرائیل کردووە. خوێنەرانی بەڕێز بۆ ئاگادار بوون لە ڕەوش و گوزەرانی کوردە جووەکان لە کاتی ژیان و مانەوەیان لە کوردستان دەتوانن کتێبی «جووەکانی کوردستان» لە ئامادەکردنی «ئۆرا شۆرتس بێیری» و وەرگێڕانی گۆران سەباح بخوێننەوە کە لەلایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە ئاراس بڵاو کراوەتەوە. ئەو کتێبە سەرچاوەیەکی گەلێك گرنگە لەم بوارەدا، چونکە ئامادەکار بە شێوەیەکی مەیدانی و لە میانەی چەندین ساڵ خۆ ماندووکردن و گەڕان بەدوای سەرچاوە ماددی و نامادديیەکاندا ئەم بەرهەمەی ئامادە کردووە کە بێجگە لە نووسین، دەیان وێنەی جۆراوجۆر و دەگمەنی تێدا دانراوە کە بەڕاستی دەستخستنیان هێندە کارێکی سووك و ئاسان نیە و کورد گوتەنی: کاری هەموو کەس نیە.

● **شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە ئیسرائیل**

گوندەکانی «مۆشاف میتاف، پەرەزۆن، ئەفیتاڵ مۆشاف» کە دەکەونە باکووری ئیسرائیلەوە، هەموو دانیشتوانەکانیان بە بنەچە کوردن و لە سەرەتای دروستبوونیانەوە ئەو کوردانەیان تێدا نیشتەجێ بوون کە لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە. پیاوان و ژنانی بەتەمەنیان تا ئێستاش بە کوردی دەپەیڤن و هەر گوندەیان نزیکەی ٤٠ تا ٥٠ خێزانی تێدا دەژی. زۆر گوندی دیکەش هەن کە کوردیان تێدا دەژی بەڵام هەموو دانیشتوانەکانیان کورد نین. کورد لە ئیسرائیل بە گشتی نزیکەی نیو ملیۆن کەس دەبن، بەڵام لە ناوچەکانی ئیسرائیلدا پەرت و بڵاو بوون، هەرچەندە زۆربەیان لە ئورشەلیم و باکووری ئیسرائیلدا نیشتەجێن.[٣٧]

کوردەکان لە ئیسرائیل بە گشتی لە باکووری ئەو وڵاتە نیشتەجێن. شاری ئورشەلیم یان (بیت القدس) و بەندەری ئەشدود (لە باشوور) لەو شوێنە گرینگانەن کە کوردەکانی لێ نیشتەجێ بوون.[٣٨]

بەڵام لە سەرچاوەیەکی دیکەدا وێڕای ئاماژەدان بە ژمارەی کوردەکان، بەم شێوەیە باش لە ناوەندە سەرەکییەکانی نیشتەجێبوونی کوردە جولەکەکان لە ئیسرائیل دەکرێ: «لە ساڵی ١٩٣٠دا ژمارەی کوردە جووەکان لە قودسدا گەیشتۆتە (٤٣٦٩) کەس. لەناو ٨٠،٨٥٠ کەسی جولەکەی دانیشتووی قودسدا، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٩ (٤٠ ـ ٥٠) هەزار کورد لە قودسدا دەژیان. بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٢ (٣٠،٠٠٠) کەس لە پایتەختدا دەژیان. لە شاری (الرأی) کە لە ساڵی ١٩٣٥ لەلایەن جووە کۆچکردووەکانی کوردستانەوە دامەزراوە، ژمارەیان لەم شارەدا لە ساڵی ١٩٨١ گەیشتۆتە (٥٦١). لەشاری (کفاریروحام) ئەمەش ناوەندێکی تری نیشتەجێبوونی جووەکانی کوردستانە، لە ساڵی ١٩٥١ ئەم شارە دامەزراوە، ژمارەی کوردە جووەکانی کوردستان لەنێوان ساڵانی (١٩٦١

ـ١٩٦٥) گەیشتۆتە ( ١٣٠٠ ـ ٤٥٠٠ ) کەس و، لە شاری (مفقام)دا ژمارەیەکی زۆر لە جووە کوردەکانی لێ دەژین. هەروەها لە شاری (نحس هاریم) دا ژمارەیەکی تری جووی کوردستانی لێ دەژین کە لە ساڵی ١٩٥١ بۆیان دامەزراوە.

هەروەها لە شاری (نعوز زیون کاستەل)ی نزیك قودس یەکێکی دیکەیە لەو کۆمۆنانەی بە زۆری کوردی تێدا دەژی. بێجگە لەم شوێنانە ژمارەیەکی زۆری کوردە جووەکان بۆ مەبەستی کشت و کاڵی لە ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەری (حەیفا) لە دۆڵی ئوردن و لە ناوچەی (نەقەب) لە خوارووی وڵات نیشتەجێ بوونە. هەروەها ژمارەیەکی زۆری کوردە جووەکان لە ناوچەی (کۆنیم، کاتۆمونیم) کە ناوەندێکی سەرەکی تریانە، لێ نیشتەجێ بوون.[٢٩]

لە کتێبی «جوولەکانی کوردستان»یشدا بەم شێوەیە باس لە ناوەندە سەرەکییەکانی نیشتەجێبوونی کوردە جوولەکەکان لە ئیسرائیل کراوە:

سەبارەت بەو شوێن و جێنشینگانەی کە ئەمڕۆ لە وڵاتی ئیسرائیلدا کوردە جوولەکانی تیا گیرساونەتەوە بەزۆری دەتوانین شێواز و ساڵی نیشتەجێبوونیان بەپێی ئەم ناوەندە سەرەکیانە دەستنیشان بکەین:

١ـ الرێ: ئەم ناوەندە لە ساڵی (١٩٣٥)ـەوە جوولەکە کۆچکردووەکانی وڵاتی کوردستان دایان مەزراندووە و ئەکەوێتە ناوچەی (یزراعیل)ەوە لەسەر چیای (شیخ بریك) ژمارەی ئەو کۆ چکردووانەش کە تیایدا نیشتەجێ بوون لە ساڵی ١٩٦٥دا سەرژمێریان خۆی داوە لە نزیکەی (٥٦١) کەس.

٢ـ کفاریروحام: ئەم جێنشینگەیە ناوەکەی بە واتای (تل رحمە) دێ و لە ساڵی ١٩٥١ ـەوە کراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٦١دا سەرژمێری دانیشتووانەکەی خۆی داوە لە (١٣٠٠) کەس، لە ساڵی ١٩٦٥ەوە ئەو ژمارەیە زیادی کردووە بۆ ٤٥٠٠ کەس و جوولەکە نیشتەجێ بووەکانیشی لەوانەن کە بەزۆری لە وڵاتی ڕۆمانیا و کوردستانەوە ڕوویان تێکردووە، کە دەکەوێتە ناوچەی (بئرالسیع)ەوە لە باشووری

شارەکەدا، شوێنەکەشی بە بەرزایی ١٨٤٠ پێ لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە.

٣ـ ناوەندی مزتاحم: ئەمەش هەر لە ساڵی ١٩٥١ەوە بۆ ئەو جوولەکانە کراوەتەوە کە لە وڵاتی کوردستانەوە کۆچیان بۆ کردووە و، ئەم شوێنە سەرەکیەش، دەکەوێتە ناوچەی (بئر السبع)ەوە، لە (نەقەب)ی خۆرئاوا و ڕۆژهەڵاتی (ڕەفەح) کە دەکەوێتە نزیکی غەزەوە.

٤ـ ناوەندی نسهاریم: لە ساڵی ١٩٥٠ەوە دامەزراوە زۆربەی دانیشتوانەکەی ئەو جوولەکە کۆچ کردووانەن کە لە وڵاتی کوردستانەوە ڕوویان تێکردووە.

نزیك بە شارۆچکەی (دیر الهوا)یە لە ناوچەی (قدس)ی پایتەختدا.

٥ـ نعوز زیون کاستەل: ناوەندێکی نزیکە لە شاری (قدس)ەوە و، ئەمەش یەکێکە لەو کۆمۆنانەی کە بە زۆری کوردە جوولەکانی تێدا دەژین.

لەگەڵ ئەمانەشدا کۆمەڵێکی تر لە کوردە جوولەکانی کوردستان بە پەرش و بڵاوی لە زۆر ناوچە و هەرێمی تری وڵاتی ئیسرائیل دا نیشتەجێ بوون. لەوانە هەر دوو کۆمۆنی کاتامونیم و کاستیل. لەگەڵ چەندێکی دیکە لەو کۆمۆنانەی ئەو ناوچەیە گیانی کوردایەتی بەهێز و ئاشکرایە. هەر لەبەر ئەوەی زۆربەی دانیشتووانەکانیان لە کوردە جوولەکانن..[٣٠]

کەواتە بە سەرنجدان بە هەموو ئەو سەرچاوانەی ئاماژەیان بە شوێنی نیشتەجێ بوونی کوردە جووەکان لە ئیسرائیلدا کردووە، دەتوانین بڵێین ئەوان بە زۆری لە شاری قودس (ئورشەلیم)، شاری (الرأی)، شاری (کفاریروحام)، شاری (نعوز زیون کاستەل)ی نزیك قودس، ناوەندی نسهاریم (نحسهاریم)، ناوەندی مزتاحم، گوندەکانی «مۆشاف میتاف، پەرەزۆن، ئەفیتاڵ مۆشاف» کە دەکەونە باکووری ئیسرائیلەوە و ناوچە شاخاوییەکانی دەورووبەری (حەیفا) و ناوچەی (نەقەب) لە خوارووی وڵات و لە ناوچەی (کۆنیم، کاتۆمونیم) و لەگەڵ ئەمانەشدا کۆمەڵێکی تر لە کوردە جوولەکانی کوردستان بە پەرش و بڵاوی لە

زۆر گوند و ناوچە و هەرێمی تری وڵاتی ئیسرائیل دا نیشتەجێ بوون.

● **ژمارەی کورد لە ئیسرائیل**

هەرچەندە زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن لە ئێستادا نزیکەی ١٥٠ هەزار کەس لە کوردەکان لە ئیسرائیلدا درێژە بە ژیان دەدەن و دەڵێن ئەمڕۆکە حەشیمەتی کوردە جولەکەکان لە ئیسرائیل زیاتر لە ١٥٠ هەزار کەس دەبن. [٣١]

ژمارەی ئەو جوولەکانەی لە کوردستانەوە گەیشتنە ئیسرائیل بە ( ١٥٠,٠٠٠ تا ٢٠٠,٠٠٠ ) لەقەڵەم دەدرێ کە ( ١٠٠,٠٠٠ ) لە ئورشەلیم نیشتەجێ بوون. [٣٢]

بەڵام چەند سەرچاوە و ڕاپۆرتێکیش هەن کە باس لە ژمارەی زیاتر لەوە دەکەن و تەنانەت تا نزیکەی نیو ملیۆن کەس مەزەندەیان دەکەن. بۆ نموونە لە ڕاپۆرتێکی ماڵپەڕی ئاوێتەنیوز کە لەلایەن بەڕێز دینۆ دانیال لەژێر سەردێڕی «گەشتێك بۆ گوندە کوردنشینەکانی ئیسرائیل» ئامادە کراوە، باس لەوە دەکرێ کە کورد لە ئیسرائیل نزیکەی نیو ملیۆن کەس دەبن بەڵام لە ناوچەکانی ئیسرائیلدا پەرت و بڵاون.

هەروەها ڕۆژنامەنووس دینۆ دانیال لە هەڤپەیڤینێکدا لەگەڵ بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا دەڵێت: «هەرچەند ئامارێکی فەرمی وردی لەبەردەستدا نیە، بەڵام ژمارەی کوردەکانی ئیسرائیل نزیکەی ٢٥٠ هەزار کەسە کە زۆربەیان لە باکووری ئیسرائیل دەژین.» [٣٣]

ژمارەی ئەو کوردە جولەکانەی لە ئێرانەوە بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە، لەنێوان ٢٠ هەزار بۆ ٥٠ هەزار کەس مەزەندە دەکرێن. [٣٤]

بەڵام لە سەرچاوەیەکی دیکەدا وێڕای ئاماژەدان بە هێندێك لە ناوەندەکانی نیشتەجێبوونی کوردە جووەکان، بەم شێوەیە باس لە ژمارەی کوردە جولەکەکان لە ئیسرائیل دەکرێ: «لە ساڵی ١٩٣٠دا ژمارەی کوردە جووەکان لە قودسدا

گەیشتۆتە (٤٣٦٩) کەس. لەناو ٨٠٫٨٥٠ کەسی جولەکەی دانیشتووی قودسدا، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٩ (٤٠ ـ ٥٠) هەزار کورد لە قودسدا دەژیان. بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٢ (٣٠,٠٠٠) کەس لە پایتەختدا دەژیان. لە شاری (الرأی) کە لە ساڵی ١٩٣٥ لەلایەن جووە کۆچکردووەکانی کوردستانەوە دامەزراوە، ژمارەیان لەم شارەدا لە ساڵی ١٩٨١ گەیشتۆتە (٥٦١). لەشاری (کفاریروحام) ئەمەش ناوەندێکی تری نیشتەجێبوونی جووەکانی کوردستانە، لە ساڵی ١٩٥١ ئەم شارە دامەزراوە، ژمارەی کوردە جووەکانی کوردستان لەنێوان ساڵانی (١٩٦١ ـ ١٩٦٥) گەیشتوتە ( ١٣٠٠ ـ ٤٥٠٠ ) کەس و، لە شاری (مفقام)دا ژمارەیەکی زۆر لە جووە کوردەکانی لێ دەژین. هەروەها لە شاری (نحس هاریم) دا ژمارەیەکی تری جووی کوردستانی لێ دەژین کە لە ساڵی ١٩٥١ بۆیان دامەزراوە.[٣٥]

بەڵام هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد، زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن لە ئێستادا نزیکەی ١٥٠ هەزار کەس لە کوردەکان لە ئیسرائیلدا درێژە بە ژیان دەدەن و دەڵێن ئەمڕۆکە حەشیمەتی کوردە جولەکەکان لە ئیسرائیل ١٥٠ هەزار کەس (شتێك زیاتر یان کەمتر) دەبن.

- **ژیانی کوردە جووەکان لە ئیسرائیل**

سەبارەت بە ژیان و گوزەرانی کوردە جووەکان لە ئیسرائیل دەبێ بڵێین لەگەڵ ئەوەی تا ئێستاش زۆربەی دابونەریتەکانی کوردستانیان لەبیر ماوە و ساڵانە یادیان دەکەنەوە، بەڵام بەشی زۆریان لە ژیان و گوزەرانێکی لەباردا ناژین. لەبارەی ژیانی دوای گەرانەوە و سەرەتای گەیشتنەوەیان بە خاکی ئیسرائیل ئاماژە بە وتەکانی چەند کەسێك دەکەین کە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەم ژیانە بوون و تەنانەت خۆیان لەو کەسانە بوون کە بەشداری ئەم ژیانە بوون:

... ساسۆن کە کوردێکی جولەکە بووە و گەڕاوەتە ئیسرائیل، بە شێوەیە

باس لە ژیانی دوای گەڕانەوەی بۆ ئیسرائیل دەکات: « دوای ئەوەی گەیشتینە خاکی ئیسرائیل، بەرەو ئۆردوگایان بردین، گوزەرانمان زۆر خراپ بوو، تەنانەت ئاوی خواردنەوەمان دەست نەدەکەوت و هیچ پارە و پولێکمان پێنەبوو بۆ ئەوەی خۆمانی پێبژێنین، بەڵام جوولەکەکانی وڵاتانی تر گوزەرانیان زۆر باش بوو و زۆر ڕێزیان لێ دەگیرا، دیار بوو ئەمە پیلانێك بوو بۆ ئێمە بۆ ئەوەی وەکو کۆیلە بەکارمان بێنن چ کارێك سەخت و گرانە ئەوەمان پێبکەن.

دانی ڕۆنشتاین کە ڕۆژنامەنووسێکی خەڵکی قودسە، دەڵێت: لە پەنجاکاندا ئەو خانوانەی لەناویاندا دەژیاین، هاوینان لەژێر گڕەی گەرمادا سوور دەبووینەوە و هەڵ دەقرچاین و لە زستاندا لە سەرمادا هەڵدەلەرزین. ئیتر لە ئەنجامی سەرمای زستان و ناخۆشی ژیان و برسێتی و نەبوونی داودەرمان و پزیشك، ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ و پیرەکانمان مردوون.

تەنانەت ساسۆن دەڵێت لە پێناوی نانی ڕۆژانەماندا چ کارێك گران بووایە دەمان کرد. هێشتا بەشی نانەسکەی نەدەکردین، ئێمە دەمانکرد و جوولەکە ئەورووپیەکان دەیان خوارد. هەرچەندە هەردوولامان جوولەکە بووین، بەڵام جیاوازی ئەرز و ئاسمانمان لەنێواندا دەکرا. [٣٦]

ژنە جوولەکەیەك لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت: « ئەو ژیانە سەختەی سەرۆکی خێزانەکان دووچاری بوون بۆ بەخێوکردنی خێزان و پەروەردەکردنی منداڵەکان، چیرۆکەکەی پەیوەندیدارە بە سەدان خێزان کە کۆچیان کرد بۆ ئیسرائیل و کۆمەڵگەی هەرەوەزییان دروست کرد .. تەنیا بە بەکارهێنانی ورە و خۆویست توانیمان ڕەگ و ڕیشەی عارد دەربێنین و دەست بکەین بە کێڵان، هەرچەندە عارد و شاخ بەرداوی بوو و شارەزایی و ئەزموونمان نەبوو. هەروەها زانیاری تەواو و ئامێری گونجاویشمان لەدەستدا نەبوو. [٣٧]

خوێنەرانی خۆشەویست بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە ڕەوش و گوزەرانی

جوولەکـەکان دوای گەڕانەوەیـان بـۆ ئیسرائیـل کتێبـی (ژیانـی ژنـە جوولەکەیـەك لـە کۆیـە و ئیسرائیل، یافا و موردەخابێن میناشـێ، سـەنتەری لێکۆڵینەوە و پەخشـی کۆیـە، ٢٠١٠، کۆیـە) بخوێننـەوە کـە لـە میانـەی گێڕانـەوەی بیرەرییەکانـی ژنـە جوولەکەیـەك بـە دوور و درێـژی بـاس لـە بارودۆخـی کـوردە جوولەکـەکان دوای گەڕانەوەیـان بـۆ ئیسرائیـل دەکات.

«... زۆربـەی جـووەکان لـە کوردسـتان بـە کاری ( شـوانکاری، جوتیـاری، کشـتوکاڵ، باخەوانـی، بەخێوکردنـی مـەڕو مـاڵات، هەنـدێ پیشـەی دەسـتی و بازرگانـی خەریـك بوون. بۆیە کاتێك گەیشـتنە ئیسرائیـل، ژیانی لادییـان هەڵبژارد و ڕوویـان کـردە کشـتوکاڵ، بۆیـە لـە ئیسرائیـل لـە ١٠٪ ئـەو کەسـانەی خەریکـی کشـتوکاڵ و پیشـەی دەسـتین، خەڵکـی کوردسـتانن.

بـەڵام لەڕاسـتیدا هەروەکـو کـوردە جـووەکان خۆیـان لـە ئیسرائیل باسـی ژیانی خۆیـان دەکـەن، لـە هەمـوو بارێکـی ژیـان بێبەشـن لەچـاو جووەکانـی وڵاتانـی ئەورووپـا، بەجۆرێـك کام کارەی گرانـە و ماندووبوونـی زۆری دەوێـت کـوردە جـووەکان دەیکـەن. لەپێنـاو بەدەسـتهێنانی خۆراکـی ڕۆژانەیـان وەکـو کاری کرێـکاری و جـادە دروسـتکردن و ئاژەڵـداری و ڕوواندنـی دار و درەخـت و چەندەهـا کاری تـر. هەروەهـا کـوردەکان بە هـۆی کارکردنەوە هیـچ کاتێك توانای ئەوەیـان نەبـووە بخوێنـن و ...

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لە کاتـی هەڵبـژاردن و پەرلەماندا تۆزێك ڕێزیـان دەگرن و خۆیـان لـێ نزیـك دەکەنـەوە، بـۆ ئـەوەی کـوردەکان دەنگیـان بدەنـێ، هـەر بـۆ ئـەم مەبەسـتە، ئاهەنگیـان بۆ دەگێـڕن و دەهـۆڵ و زوڕنایان بـۆ لێـدەدەن. هەروەکو (گوڵدامایـر) سـەرۆك شـاڵیاری ئیسرائیـل بـۆ ئاهەنگـی دامەزراندنـی (کۆمەڵـەی کـورد)ی جـووەکان لـە سـاڵی ١٩٧٣ سـەردانی کـردن و بەشـداری لـە ئاهەنگەکەدا کـرد یـا خـود بـۆ هـەر بۆنەیەکی تر بـێ، ئەمەش پێـش دوو مانـگ لە هەڵبـژاردن و

پەرلەمان، بەڵام دوای تەواوبوونی هەڵبژاردن پشتگوێیان دەخەن.[٣٨]

● **زمان و داب‌ونەریتی کوردەکانی ئیسرائیل**

لەبارەی زمانی قسەکردنی کوردەکانی نیشەجێی ئیسرائیل دەتوانین بڵێین تا ئێستاش بەشێکی زۆریان بە تایبەت لە بەتەمەنەکانیان بە زمانی کوردی دەدوێن، بەڵام کەسانێکی زۆریش هەن کە ئەو زمانەیان لەبیر چۆتەوە و لە جیاتی ئەوە، زمانی عیبری و ئینگلیزی بەکار دێنن.

... ئەم کوردانە هەرچەندە بە ئایین جولەکەن، بەڵام بە دابونەریت و زمان کوردن، تاکو ئێستاش ئەوانەیان کە بەتەمەنن هەر بە زمانی کوردی قسە دەکەن، زۆرجاریش دەیانبینی کە بیانەوێت نهێنییەکی خۆیان بۆ کەسی دەوروبەریان نەدرکێنن، لەبەینی یەکدا بە کوردی دەدوێن.

وێڕای ئەوەش لە زۆربەی ئاهەنگ و شاییەکاندا دەهۆڵ و زوڕنا بەکار دەهێنن و گۆرانی کوردی دەچڕن، ئێستاش کوردە بەتەمەنەکانی ئیسرائیل بە گۆرانیبێژە کۆچکردووەکانی وەك محەمەد عارف و گوڵبەهار و حەسەن زیرەك و تایەر تۆفیق و عەلی مەردان سەرسامن کە کاتێ ئەوان لە کوردستان بوون، ئەمانە باو و ناسراو بوون.

هۆیەکی تری ئاشنابوون بە هونەر و مۆسیقای کوردی، کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکانە کە زۆربەی زۆری کوردەکانی ئیسرائیل لەماڵەوە سەیری ئەو کەناڵانە دەکەن کە زیاتر گۆرانی کوردی بەخش دەکەن. هەرچەندە کوردە جولەکەکان زیاتر لە شەست ساڵە لە کوردستان دابڕاون، بەڵام نەگۆڕاون و تاکو ئێستاش هەر بە کورد خۆیان ناو دەبەن.[٣٩]

... پێویستە ئاماژە بەوە بکەین تاکوو ئێستا کوردە جووەکان لە ئیسرائیل دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکانی کوردستانیان لەبیر نەکردووە، بەڵکو هەموو ساڵێك

یادی ئەو ڕۆژانە دەکەنەوە کە لە کوردستان بوون. .. تەنانەت ئەو جووانەی کە لە کوردستان زمانی ئارامیی نوێیان بەکار دەهێنا ئێستاش لە ئیسرائیل لە کۆلان و بۆنەکانی ئەم کۆمۆنانە ئەو زمانە دەبیسترێت، هەر دەڵێی هێشتا لە کوردستانن. ئەگەر کەسێکی کورد ڕێی بکەوێتە ئەوێ، سەری سوڕ دەمێنێ کاتێ پیرەپیاوی جووە کوردی بەرچاو دەکەوێ، بە بەرگی کورد و جامانە بەسەرەوە، دێنە دەرەوە. هەروەها بەجۆرێك دەستیان بە بۆنە کوردییە فۆلکلۆرییە کوردەکانەوە گرتووە، لە کاتی ئەم بۆنانەدا منداڵان و گەنجە کوردەکان زۆر بە گەرمی بەرەو پیری ئەم بونەبەوە دەچن، جل وبەرگی کوردی لەبەردەکەن و گۆرانی کوردی دەڵێن. یەکێك لە داب و نەریتەکانی تری کورد کە لەیادیان نەچووە، ئەوەیە ئێستا لەوی هاوسێ و هاودەمی یەکن,لە خۆشی و ناخۆشی و یارمەتی یەکتری دەدەن.

... یەکێکی دیکە لە دابونەریتەکانیان ئەوەیە کە ئێستاش لەناو ماڵ و خێزاندا ئاواز و مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی لێدەدرێ و گۆرانی کوردی گوێ لێدەگرن. هەروەها یەکێك لە دابونەریتەکانی کوردە موسوڵمانەکانی خۆمان کە بیریان نەچووە، لە ڕۆژانی (شەممە) کە ڕۆژی پشوودانە زۆربەیان بۆ ئەو ڕۆژە خواردنی فولکلۆری کورد لێ دەنێن، وەکو (دۆڵمە، ساوەر، کفتە، برنج و شلە و ...) کە وەکو خواردنێکی فۆلکلۆری لەنێوانیاندا ماوەتەوە.

هەروەها سەبارەت بە جەژنی (کەپرە شینە) کە لە کوردستاندا هەموو ساڵێك لە سەرەتای پاییزدا دەکرا، ئێستاش لە ئیسرائیل لە جەژنی کەپرەشینە دوو ڕۆژی تایبەت بە کوردەکان، کە لەپارکێکی گەورەدا ئاهەنگ دەگێڕن، سەرەتای ئاهەنگەکە بە گفتوگۆی پیاوە سیاسییەکان کە باس لە مێژووی کورد و کوردستان دەکەن، ئەوجا ئاهەنگەکە دەست پێدەکات و دەست دەکەن بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی کوردی.(٤٠)

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە جەژنی کەپرەشینە، جەژنێکی تایبەتی کوردە جووەکان بوو کە لە کۆتایی پایزدا بەڕێوەیان دەبرد. کۆمەڵە جوویەك کەپرێکیان دروست دەکرد، قوماشی رەنگاوڕەنگیان پێهەڵدەواسی و جۆرەها میوەیان پێوە دەکرد. لەو رۆژەدا ئاگریان نەدەکردەوە و خواردنیان دروست نەدەکرد و دەستیان لە هەموو ئیش و کارێك هەڵدەگرت و...

بەڵێ!، ئێستەش یەکێك دەتوانێ پاشماوەی رێگەی ژیانی کوردستان ببینێت. بۆ نموونە جگە لە کەلوپەل و ئامێری مۆدێرن لە ناندینەکاندا وەك بەفرگر و سۆبەی کارەبایی، ئێستە پرێمز ماوە لە هەندێ ماڵدا کە شێوی نەریتیانەی پێ لێ دەنێن بە هەمان ئەو رێگەیەی لە کوردستان بەکاریان دێنا. شان بە شانی هەندێ ناوچەی لادێیی، ئێستەش یەکێك بگەڕێ پیاو و ئافرەتی پیر بە جلوبەرگی کۆنەوە دەبینێت کە جلەکان لە ئیسرائیل دووروراون. ماڵ هەیە لە ئیسرائیل زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی میوانان دەکەن تەنانەت ئەگەر میوانەکە کتوپڕیش بێت. میوانەکە خواردنی پێ نەخورێت قاپەکەی هەر بۆ پڕ دەکەن بۆ ئەوەی دڵنیا بن لەوەی میوانەکە تێر دەخوات.[٤١]

ئۆرا شۆرتش بیێری، بەڕێوەبەری ئیتنۆگرافیای جووان و نووسەری کتێبی «جووەکانی کوردستان» لە سەردانێکی مەیدانیی بۆ لای کوردە جووەکانی ئیسرائیل بەم شێوەیە باسی هەندێ لە داب‌ونەریتیەکانیان دەکات: «جووەکانی کوردستان بە شێوازی خۆیان هەوڵیان دا رێچکەی نەریتیانەی ژیانیان بپارێزن و هەروەك خۆیان بژین لە ئیسرائیل، لە کاتی سەردان یەکەمم بۆ ماڵەکانیان، چەندان دیاردەم بینی کە جار دوای جار دووبارە دەبوونەوە. بۆ نموونە، دروستکردنی خانووی بچووك لە گوندەکان سەرەڕای پێوەرەکانی حکوومەت بۆ دروستکردنی خانوو بۆیان، ژوورەکان هەمان ئەو ژوورانەن کە کاتی خۆی لە کوردستاندا تێیاندا خڕ دەبوونەوە. لە گەڵێ حەوشەی ماڵەکاندا گەڵای مەیلە

و پەمبەم دەبینی کە پێی دەڵێن: ڕێحان. ڕێحان گوڵێکی بۆنخۆش و ناسکە. کورد بەکاری دێنن و لەنێو دۆڵاب، یان بە جلەکانەوەی دەکەن یانیش پیاوان دەیخەنە ژێر چاکەتەکانیان بۆ بۆنخۆشی. ئەم گوڵە لای ئەوان دەسەڵاتێکی نەریتیی پڕبەهای هەیە. پێیان وایە ئەم گوڵە دەیانپارێزێت لە خراپە و ڕوحی شەڕانگێزی، هەروەها وەکوو چاوەزاریش بەکاری دێنن. زۆر چالاکیی تر لەم ڕووەوە ڕوو دەدەن وەك بژارکردنی برنج و وشککردنەوەی تۆو و بیبەری تیژ، نانکردن و تەشیکردن و ... [٤٢]

هەداسا یشوورون کچە گۆرانیبێژێکە بە ڕەچەڵەك لە کوردە جولەکەکانی شاری ورمێیە لە ساڵی ١٩٦١ لە ئیسرائیل لەدایك بووە، بەڵام هەست و سۆزی ئەم خێزانە پابەندە بە ڕابردووەوە، بۆیە ئێستاش لە ئاهەنگ و بۆنەکانی ئیسرائیل بە جلی کوردییەوە دەچێتە شانۆ و گۆرانی بە هەر دوو زمانی ئارامی و کوردی دەچڕێ.

هەداسا دەڵێت: «ئەگەرچی من کوردی نازانم، بەڵام بەردەوام دەبم لەسەر وتنەوەی گۆرانی کوردی و من تەواوی کەلتووری کوردم بەدڵە، هەر لە ئاواز و گۆرانی و هەڵپەڕکێ تا دەگاتە جلوبەرگ».

هەداسا دەڵێت: «ئێمە لە ئیسرائیل سی هەزار کەسین کە لە شارە جیاجیاکانی کوردستانەوە هاتووین وەك سەقز، مەهاباد، بۆکان و ورمێ. هەموومان بە پەرۆشین بۆ هەواڵی کوردستان، کاتێك پێشکەوتنێك دەبینین لە کوردستان، دڵخۆش دەبین.»[٤٣]

سەحەرانە یان سەیرانە یەکێك لەو دوو جەژنە گەورانەیە کە هەموو ساڵێك کوردە جولەکە بە ڕەگەز ئێرانییەکان لە دەوری یەك کۆ دەکاتەوە. ئەم ڕێوڕەسمە بۆ کەسانێك کە چەندین ساڵە لە زێدی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە دەرفەتێکە بۆ ئەوەی چاویان بە دۆست و ناسیاوانیان بکەوێ و بە کەباب خواردن و شای و

هەڵپەرکێی کوردی جەژنەکەیان برازێننەوە.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە سەحەرانە وەك نەریتێکی ساڵانەی کوردە جووەکان « لە کۆتایی وەرزی بەفرباریندا ساز دەکرا. ئاماژەیەك بوو بۆ سەرەتای بەهار. لە گۆڕەپانێکدا عادەتەن لە قەراخ رووبار لە دووری چەند کیلۆمەترێکەوە لە گوند یان شارۆکەدا ڕەشماڵ هەڵدەدران بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ تێیاندا دەمانەوە.

ئاهەنگی مارەبڕین عادەتەن لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا ساز دەکرا. هەرچەند ماڵە و ئەرکێکی تایبەتی پێدەسپێردرا، بۆ نموونە داوەتکردنی گۆرانبێژ و موزیکژەن، خواردن ئامادەکردن، جلوبەرگ و ڕەشماڵ هەڵدان. بەشدارانی بۆنەکە بە پێ یان بە ئێستر دەگەیشتنە جێ و بەدەم گۆرانی گوتن و سەماوە ڕەشماڵیان هەڵدەدا. شەوان ئاگرێکی گەورەیان دەکردەوە. خێزانەکان سەردانی یەکتریان دەکرد تا تامی خواردن و دەستاوی یەکتر بکەن و پیاوەکانیش دەچوونە کن یەك و ئارەق و شەڕابیان نۆش دەکرد. بەیانییان بە دەنگی دۆڵ و زورنا بەخەبەر دەهاتن و دەستیان دەکرد بە چالاکییەکانیان: چێشت لێنان، یاریکردن، شت کڕین لە شارۆکەی نزیك یان لەو موسوڵمانە شت فرۆشە گەڕۆکانەی بەتایبەت دەهاتنە ئەوێ بۆ شت فرۆشتن. ناوچەکە لەلایەن هێزی پۆلیسەوە دەپارێزرا. لە کۆتایی هەفتەکەدا بەشداران ڕەشماڵەکانیان خڕ دەکردەوە و بەرەو ماڵ دەکەوتنە ڕێ. بۆنەی لەم شێوەیە لە شافۆت و سەکوت ڕوویان دەدا کە دوو وەرزی حەجاجی کۆنی پەرستگەی قودس بوون.[٤٤]

ئەوان ئەم جەژنەیان لە ساڵی ٢٠١٢ لە یەکێك لە پارکەکانی شاری (کفار یونا) هەڵکەوتوو لە باکووری (تل ئەویو) بەڕێوە برد کە لێرەدا چەند وێنەیەکی ئەو ڕێوڕەسمە دادەنێین کە لە ماڵپەڕی (بی بی سی) فارسی وەرگیراون.[٤٥]

خوێنەری خۆشەویست بۆ ئەوەی جوانتر لە دیمەنی ئەو جەژنە و هێندێك

لە دابونەریتەکانی کوردە جولەکەکانی ئیسرائیل و چەند بابەتێکی دیکەش ئاگادار بی، بە باشم زانی کورتەیەك لە ڕاپۆرتی ماڵپەڕی (رادیو فردا) لەژێر سەردێڕی (از کردهای اسرائیل چه میدانید) لێرە دابنێم کە باس لە ڕێوڕەسم و دابونەریتی کوردەکان بە تایبەت لەو جەژنەدا دەکا:

بەڵێ! لە دەشت و داوێنی سروشتێکی جوان و ڕازاوە و لە سەرەتای بەهارێکی دڵبزوێندا، ئاهەنگی مۆسیقای شاد و خۆشی کوردی دڵی مرۆڤ وەجۆش دێنێ و کور و کیژی لاو و تازەلاو و تەنانەت منداڵەکانیش سەرچۆپی دەکێشن و بە دڵێکی خۆش و گەرموگوڕییەکی زۆرەوە لە هەڵپەڕکێیەکی جوانی کوردیدا پێ بە زەوی دادەن. خۆشی لە چاوەکانیاندا و بز و پێکەنین لەسەر لێوەکانیان بەدی دەکەیت.

لە هەر گۆشە و کەنارێکەوە بۆنی کەباب و گۆشتی برژاوی سەر ئاگر هەست پێدەکرێ و بۆنی ئەو خواردەمەنییە قەدیمییانەی کە لەسەر مێزەکان دانراون و هەروەها «کەلانە» و «شلکێنە» سەرنجی هەر کەسێك ڕادەکێشن و ئاو لە دەم و زاران دێنن.

گەر بە باشی گوێ ڕادێری، دەنگی مۆسیقای کوردی دەبیستی، تێکەڵاوێك لە ئاهەنگی خۆش و شادی مۆسیقا لە هەموو کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. گەر بە جوانی سەیر بکەی، دەبینی خواردەمەنییەکان هەموویان کوردیی و ئێرانین.

گەر بە وردی گوێ لە قسە و باسوخواسی خەڵکی ئامادەبوو لەم سەیرانە خۆش و چێژبەخشتە بگری، دەبیستی کە هەندێك لە بەتەمەنەکان بە زمان «ئارامی» قسە دەکەن هەرچەند وشەگەلی عیبریشی زۆر تێکەڵاو دەکەن.

کەم نین لەنێو بەتەمەنەکانی ئەم کۆڕە بەشکۆیەدا کە جل و بەرگی جوانی کوردانە(ژنانە و پیاوانە)یان لەبەر کردووە و خاتوونەکانیان دەسماڵی تەسك و ناسکی ڕازاوە بە گوڵ و مورویان بەسەر زولفەکانیان داداوە و پیاوەکانیان

دەسرەیـان لەسـەر نـاوە. بـە چاولێکردنیان بـۆت دەردەکـەوێ زۆر لـەو جلوبەرگانە نـوێ نیـن، بـەڵام ئـەو کەسـانە وەك پارچەیـەك لە ئاڵتـون و کلی چـاوان، بـە جوانی پاراسـتوویانن، ئاخـر ئەوانـە یـادگاری نیشـتمانی باووباپیرانیانن.

بـەڵام چەنـدە جوانـە کـە دەبینـی تەنیـا بەتەمەنـەکان نیـن کـە ئـەم جلوبەرگـە ڕەنگاوڕەنگانەیـان پۆشـیوەن، لاوانیـش دەبینـی کـە ئـەم جلوبەرگەیـان لەبـەر کـردووە و بـە جوانـی هەنـگاو دەنێـن و هەڵدەپەڕن و هێنـدەی تریـش داوێنی ئەو سروشـتە ڕازاوەیـان جوانـتر کـردووە.

ئەگـەر نەتزانیبایـە ئێرە ئیسـرائیلـە. دەتتوانـی چاوەکانت پێکەوەنێی و بە ئاسـانی هەسـت بکـەی کە لەنـاو دڵ و داوێنی کێوەکانی سروشـتی جوانی ئاوایەری شـاری سنەی کوردستانی ئێرانی.

ئێـرە ئیسرائیلە، هـەزاران ئیسرائیلی کـە بەبێ هیچ ڕاڕایی و گومانێك دەسـبەجێ خۆیـان بـە «کـورد» دەناسـێنن. وەك هەر سـاڵێکی دیکە ئەمسـاڵیش لـە ڕۆژێك لە میانـەی جەژنـی فەتیـر کـە جەژنی بەهـار و ئازادیـی جوولەکەکان و بیرهێنـەرەوەی ڕاپەڕینـی قەومـی یەهـوود لـە بەرامبـەر سـەرەرۆییەکانی فیرعەونـی میسـرە، لـە پارکـی شـارۆچکەی «کفـار یونـا» (گونـدی کۆتـر) لـە دەورویـەری شـاری جوانی ناتانیـا لـە لێـواری دەریـای مەدیترانە کـۆ بوونەتەوە بۆ ئەوەی هاونشـینیی سـاڵانەی خۆیـان بەڕێـوە بەرن.

ئـەم ئامادەبوونـەی لاو و تازەلاوانـی لەدایکبـوو لـە ئیسرائیـل لەنێـو کـۆڕی پـڕ لـە خۆشەویسـتی دایـك و بـاوك و باپیـر و دایەگەورەکانیـان سەرنجڕاکێشـە، بـەڵام لـە هـەر شـوێنێکی دیکـە و لە هـەر سـەردەمێکی تر لە وەچـەی لاوی ئـەم خەڵکە بپرسـی کـە ڕیشـە و ڕەچەڵەکتان کامەیە، دەسـبەجێ دەبیسـتی: «ئەنخنـو کوردیم» (بـە زمانی عیـبری: ئێمـە کوردین).

ئەگـەر بپرسـی کـوردی کـوێ؟ وەڵامـەکان کەمێـك جیاوازیـان دەبـێ وەك

ئەوەکە ئەگەر باوکی باوەگەورەم خەڵکی سەقز بووە منیش سەقزییم. (بەڵێ کەوایە ئەمن سەقزییەکی ئیسرائیلیم). ئەوەی تر دەڵێ: ئەنك (دایەگەورە) و باپیر (بابەگەورە)ی بە منالّی لە گەڕەکی جوولەکەکانی شاری سنە لە شەقامی سیروس ژیاون و دواتر چوونەتە تاران و لە فلان سالّی دەیەی پەنجا یان شەستی سەدەی بیستەم گەیشتوونە ئیسرائیل. یەکێکی دیکە دەڵێ: کوردی کامیارانە. بەڵێ تەنانەت لە شارۆچکەی کامیارانی نزیك سنە ژمارەیەك کوردی جوولەکە ژیاون کە هەندێکیان مامۆستا و دەرمان ساز و دوکتۆر بوون و کار و پیشەی وەك خەڵکی دیکەی ناو کۆمەڵگەیان هەبووە.

دواتر زۆر لەو کوردە جوولەکانە لە پارێزگای کوردستان، لە پارێزگای کرماشان یان ناوچەکانی تری باکووری ڕۆژئاوای ئێران کە زۆریان بە زمانی ئارامی قسەیان دەکرد، بە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی کوردە جوولەکەکان لەم ناوچانە، زیاتر بەرەو تاران چوون و هەندێکیشیان لە یەکەمین ساڵەکانی دوای سەربەخۆیی ئیسرائیل چوونە ئەم ولاتە تازە دامەزراوە. بەلام ژمارەیەك لە کوردەکانی ئێران و ناوچەکەش هەن کە تەنانەت پێش سەربەخۆیی ئیسرائیل چووبوونە ئەم ولاتە.

ئەو کوردانەی کە لە چەند دەیە پێشتر گەیشتوونە ئیسرائیل، لە هەندێك لە گوندەکانی باکووری ئیسرائیل یان ئەشدود لە باشوور ژیان بەسەر دەبەن. ڕێستۆرانێکی کوردی کە دایەپیرەیەکی کورد لە نزیك سنووری ئیسرائیل لەگەڵ لوبنان دایناوە، بۆ ماوەیەکی زۆر گەڕیدە و گەشتیاری بۆ لای خۆی ڕادەکێشان.

لە گۆشە و کەناری تر زۆرجار ڕێستۆران و هوتێلی وا بەرچاو دەکەون کە تابلۆی «میسعادا کوردیت» (بە عیبری: ڕێستۆرانتی کوردی) لەسەر نووسراوە.

بەڵام لە سەروبەندی گۆڕانکارییەکانی ئێران کە بە«شۆڕش» ناو نرا و ماوەیەك دوای ئەوە، زۆر لە کوردە جوولەکەکانی ئێران کە وڵاتەکەیان جێهێشت، وەك زۆربەی جوولەکە ئێرانییەکان بەرەو ئەمریکا چوون، بە شێوەیەك ئێستاکە کۆڕ و کۆمەڵی خۆیان هەیە و وەك دەڵێن ئەنجوومەنی کوردە جوولەکە ئێرانییەکان لە کالیفۆرنیا پێنج هەزار ئەندامی چالاکی هەیە کە بە تایبەت بۆ پاراستنی زمانی «ئارامی» هەوڵ دەدەن.

لە ئیسرائیلیش ژمارەیەك لە چالاکانی کوردی جولەکە بۆ پاراستنی ئەم زمانە تێدەکۆشن، شێعر و گۆرانی پێدەڵێن و دەخوێننەوە و بە تازەییش ڕادیۆیەکی لۆکاڵی بە پێداویستیی سادە بە زمانی «ئارامی» لە ئیسرائیل وەکار کەوتووە کە دەیەوێ بە شێوەی بەرنامەی تەلەویزیۆنیش وەکار بکەوێ بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر ئەو وەچەیەی کە قسە بەم زمانە ناکەن و تەنیا لێی حاڵی دەبن، بتوانن زیاتر شارەزای ئەم زمانە کەونارا و چەند هەزار ساڵەیەی باوباپیرانیان بن.

زۆر لە کوردە جوولەکەکان لە ئیسرائیل تەنیا کاتێك بابەگەورە و دایەگەورەیان بەم زمانە قسە دەکەن، تا ڕادەیەك تێدەگەن، ئەم زمانە تا ڕادەیەك وەك زمانی مەحرەمانەی نێوان بابەگەورە و دایەگەورەکان بۆ ئەو کاتانە بووە کە نەیانویستووە ئەو بابەتانەی باسیان دەکەن، کوڕ و کچ و نەوەکانیان لێی ئاگادار بن.

بەڵام هەر ئەم ئاستە لە زانیاری لەم زمانە بەسە بۆ ئەوەی بە ئاهەنگی ئەو گۆرانییانەی کە گۆرانیبێژە کوردەکانی ئەم تایفە بەم زمانە دەیانڵێن، وەجۆش کەون و هەڵپەڕن و بە بیستنی دەنگی حەزینی ئەم گۆرانیانە، غەمی دڵتەنگی لە چاوانی گەورەکانی خۆیاندا ببینن...

بەڵام ئەمانە تەنیا کوردەکانی دانیشتووی ئیسرائیل نین، ژمارەیەکی زۆریش لە کوردەکان بنج و ڕەچەڵەکی عێراقیی خۆیان بە شانازی دەزانن و تەنانەت بۆ چوون بە نیشتمانی باب و باپیرانیان بە مەبەستی گەڕان و سەیران هەوڵ دەدەن. لە

یەکەمین ساڵەکانی ڕووخانی حکومەتی سەددام حوسێن لە عێراق، ژمارەیەك لەو کوردانە لەڕێگەی تورکیاوە گەیشتنە عێراق و هێندێك لەو سەفەرانەش لە ڕاگەیەنەکانی ئیسرائیلیدا ڕەنگی دایەوە...

زۆر لە کەسانی لەدایکبووی ئیسرائیل کاتێك دەپرسی بنج و بناوانیان بۆ کوێ دەگەڕێتەوە، ئەوان دەسبەجێ دەڵێن ئێمە کوردی زاخۆین. وەك بڵێی هەر کەسێك لە دنیادا دەبێ بزانی زاخۆ کوێیە. ئەوان بە دڵێکی سادە و دڵخۆشیی زۆر، زاخۆ و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی ئێراق کە ڕۆژگارێك شوێنی ژیان زۆر کەسی جوولەکە بووە، بە شوێنی سروشتی ئاخێزگە و لەدایکبوونی خۆیان و باوباپیرانیان دەزانن.... [٤٦]

● گەشتێك بۆ گوندە کوردنشینەکانی ئیسرائیل

*ئا: دینۆ دانیال*

گوندەکانی «مۆشاف میتاف، پەرەزۆن، ئەفیتاڵ مۆشاف» کە دەکەونە باکووری ئیسرائیلەوە، بە گوندە کوردنشینەکانی ئەو وڵاتە دادەنرێن، کە تا ئێستاش بە کوردی قسەیان تێدا دەکرێ و خەڵکیش بەشێکی کاتیان بەدیار سەیرکردنی کەناڵە ئاسمانییە کوردەکانەوە بەسەر دەبەن. (مۆشاف : کۆمەڵگەی هەرەوەزی)

«خاڵە ئەنوەر» تەمەن ٨٠ ساڵ، یەکێکە لەو کوردانەی کە ٦٥ ساڵ لەمەوبەر لە گوندێکی شارۆچکەی قوشتەپەوە ڕووی کردۆتە ئیسرائیل، ئەو دوای ئەوەی باس لەوە دەکات کە لە ساڵی ١٩٥٥دا گوندی ئەفیتاڵ مۆشاف ئاوەدان دەکەنەوە و تا ئێستاش لەوێدان، ئەو کە هێشتا زمانی کوردی لەبیر ماوە، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوەندە بە حەسرەتی بینینی ئەو شوێنەوە بوە کە زێدی باو و باپیران و شوێنی لەدایکبوونی بوە و ڕۆژانی منداڵی و مێردمنداڵی خۆی تێدا

بەسەر بردووە، چوار ساڵ لەمەوبەر سەردانی کوردستانی کردووە و چووەتە بۆ گوندی قولتەپەی نزیك قوشتەپە، بەڵام وەك خۆی دەڵێت جگە لە «وێرانیی» و «داروپەردوی ڕوخاو» هیچی دیکەی تێدا نەبینیوە. ئەو وتی:» زۆر بەداخ بووم کە بیستم کاتی خۆی سەدام گوندەکەی کاول کردووە و خەڵکەکەشی ڕاپێچی ئۆردوگا زۆرەملێکان کردووە».

کوردەکانی ئیسرائیل، ئەو جولەکانەن کە لە هەموو بەشەکانی کوردستانەوە هاتون بە تایبەتی لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە، ئەم کوردانە هەرچەندە بە ئایین جولەکەن، بەڵام بە دابونەریت و زمان کوردن. تاکو ئێستاش ئەوانەیان کە بەتەمەنن هەر بە زمانی کوردی قسە دەکەن، زۆرجاریش دەیانبینی کە بیانەوێت نهێنیەکی خۆیان بۆ کەسی دەوروبەریان نەدرکێنن، لەبەینی یەکدا بە کوردی دەدوێن.

وێڕای ئەوەش لە زۆربەی ئاهەنگ و شاییەکاندا دەهۆڵ و زوڕنا بەکار دەهێنن و گۆرانی کوردی دەچڕن، ئێستاش کوردە بەتەمەنەکانی ئیسرائیل بە گۆرانیبێژە کۆچکردووەکانی وەك محەمەد عارف و گوڵبەهار و حەسەن زیرەك و تایەر تۆفیق و عەلی مەردان سەرسامن کە کاتێ ئەوان لە کوردستان بوون، ئەمانە باو و ناسراو بوون. لەم ساڵانەی دواییشدا هونەرمەندانی وەکو ناسر ڕەزازی و هاوسەرە کۆچکردووەکەی «مەرزییە» ناسران، چونکە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ دا هاتنە ئیسرائیل و کۆنسێرتیان بۆ ساز کرا.

هۆیەکی تری ئاشنابوون بە هونەر و مۆسیقای کوردی، کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکانە کە زۆربەی زۆری کوردەکانی ئیسرائیل لەماڵەوە سەیری ئەو کەناڵانە دەکەن کە زیاتر گۆرانی کوردی بەخش دەکەن. هەرچەندە کوردە جولەکەکان زیاتر لە شەست ساڵە لە کوردستان دابڕاون، بەڵام نەگۆڕاون و تاکو ئێستاش هەر بە کورد خۆیان ناو دەبەن.

ئیسحاق پیرەمێردێکی ٩٠ ساڵی دانیشتووی گوندی «مۆشاف میتاف»ـە، ئەو کاتی خۆیماڵیان لە گەڕەکی سابونکەرانی سلێمانی بووە و تەمەنی ٢٥ ساڵ بووە کە لەگەڵ دایك و بابی بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە، بەپێی گێڕانەوەی خۆی کاتی لە هەڕەتی لاوێتیدا لە گەڕەکەکانی سلێمانی شتی وردەواڵەی فرشتووە و کۆڵان بە کۆڵان گەڕاوە و وەك خۆی دەڵێت:» یادگاری زۆرە لەگەڵ خەڵکی سلێمانی، کە نموونەی جوامێریی و ژیاندۆستی بوون.» ئێستاش ئەو خەریکی ئەو ئیشەی خۆیەتی کە چۆن لە کوردستان کردوویەتی، لە ئیسرائیلیش نزیکەی ٥٠ ساڵ دەبێت ئەو ئیشە دەکات و دوکانی وردەواڵە فرۆشتنی هەیە، بەڵام هێز و گوڕی جارانی نەماوە و منداڵەکانی یارمەتی دەدەن، ڕۆژانە ماوەی ٣ تا ٤ کاتژمێر دوکان دەکاتەوە و ئەگەر ڕۆژێك سەرما بێت، هەر نایکاتەوە و بۆخۆی لە ماڵەوە دەبێت.

گوندەکانی «مۆشاف میتاف، پەرەزۆن، ئەفیتاڵ مۆشاف» کە دەکەونە باکووری ئیسرائیلەوە، هەموو دانیشتوانەکانیان بە بنەچە کوردن و لە سەرەتای دروستبوونیانەوە ئەو کوردانەی تێدا نیشتەجێ بووە کە لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردووە. پیاوان و ژنانی بەتەمەنیان تا ئێستاش بە کوردی دەپەیڤن و هەر گوندەیان نزیکەی ٤٠ تا ٥٠ خێزانی تێدا دەژی. زۆر گوندی دیکەش هەن کە کوردیان تێدا دەژی بەڵام هەموو دانیشتوانەکانیان کورد نین، کورد لە ئیسرائیل بە گشتی نزیکەی نیو ملیۆن کەس دەبن، بەڵام لە ناوچەکانی ئیسرائیلدا پەرت و بڵاو بوون، هەرچەندە زۆربەیان لە ئورشەلیم و باکووری ئیسرائیلدا نیشتەجێن.

بە تایبەتی لەو لادێیانەدا وەك شارەدێ وان، هەموو جۆرە خزمەتگوزارییەکیان تێدایە، وەکو قوتابخانە و باخچەی ساوایان و پارك و بنکەی تەندروستی و گۆڕەپانی فوتبۆڵ بە شێوەی مۆدێرن، شەقام و شوستە و هێڵی تەلەفوون

و هەموو ماڵێك هێڵی گواستنەوەی کەناڵەکانی تەلەفیزیۆن و ئینتەرنێت و سوپەرمارکێت و بنکەی پۆلیس و بەشی بانك و گەلێك دامودەزگای تر، زۆربەی زۆری دانیشتوانەکانیان بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات و کشتوکاڵەوە خەریکن، بەڵام بە شێوە نوێ کە نەوەك کوردستان کە ئاژەڵداری و مەڕ و ماڵات بەخێو دەکەن، بەڵکوو هەر جوتیارە و شوێنی تایبەتی دروست کردووە بۆ ئاژەڵەکانی، هەروەها کشتوکاڵ کردن لەم گوندانەی ئیسرائیلدا بە شێوەی دڵۆپاندنە کە هەموو جوتیارێك بۆ سەر زەوییەکەی خۆی ئاوی بە بۆڕی بۆچووە و پیوەری و دانراوە کە بزانن چەند ئاو سەرف دەکات، بەڵام ئەو ئاوەی کە بۆ کشتوکاڵ بەکار دێ ئاوی قورسە لەدوای پاڵاوتنی بۆ کشتوکاڵ بەکاری دەهێنن و بۆ خواردنەوە دەست نادات.

کوردانی ئیسرائیل بە گشتی هەموویان بە پەرۆشەوە حەز دەکەن سەردانی وڵاتی باب و باپیرانیان بکەن، هەموویان کورد و کوردستانیان خۆش دەوێ و ... «نیشان موردەخای» پیاوێکی تەمەن ٧٥ ساڵە و لە ناوچەی کەڵەك و بەردەڕەش لەدایك بووە، تاکو ئێستاش بە بەردەوامی کارەکانی خۆی ڕادەپەڕێنێ و ئۆتۆمبێلەکەی خۆی لێدەخوڕێ، ئەویش لەم ساڵانەدا سەردانی کوردستانی کردووە، ناوبراو وتی: «من زۆر حەزم لەوەیە لە کوردستان بژیم تاکوو دەمرم، بەڵام بە مەرجێك کە مەترسی نەبێت لەسەر ژیانم، من ئامادەم لە کوردستان بژیم تاکو دەمرم هەر لەسەر خاکی باب و باپیرانم بمێنژن، چونکە من وا هەست دەکەم کوردستان بەهەشتی سەرزەمینە.» (٤٧)

**• سەرچاوەکان:**

١. http://fa.wikipedia.org

٢. قورەیشی، د.فەزلولڵا، ئێران ـ ئیسرائیل، دوو جەمسەرە گەرمەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێرانی: عەلی حاجی زەڵمی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی هەژار موکریانی، ۲۰۱۳، هەڵەبجەی شەهید ،ل ٢٤٣ ـ٢٤٦.

٣. میران، د.ڕەشاد، ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپی دووەم، سەنتەری برایەتی، ۲۰۰۰. ل ۲۹ـ۳۰.

٤. س.پ.ل ۳۱

5. http://www.kurdistannet.org/arshif/net/8-2004/faili.htm نووسینێکی د.کمال سید قادر.

٦. http://alisidiq.blogspot.com/۲۰۱۱/۱۱/blog-post_۷۳۱۸.html

۷. باوەڕ، ئەحمەد، جوولەکەکانی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ۲۰۰۰، کوردستان، ل۱۰۳ و ۱۰٤.

۸. س.پ. ل ۱۱ـ۱٤.

۹. محمدی (کلهر)، أیت، سیری در تاریخ کرد و کردهای قم، چاپ اول، انتشارات پرسمان، سال ۱۳۸۲، ص ۳۰.

۱۰. سەرچاوەی ژمارە ۲ ، ل ۲۸۳ ـ ۲۸۵.

١١. بیێری، ئۆرا شۆرتس، جووەکانی کوردستان، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە: گۆران سەباح، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٣٥.

١٢. ژیانی ژنە جوولەکەیەك لە کۆیە و ئیسرائیل، یافا و موردەخابێن میناشێ، سەنتەری لێکۆڵینەوە و پەخشی کۆیە، ٢٠١٠، کۆیە. ل ٧٩ ـ ٨٠.

١٣. سەرچاوەی ژمارە ٢، ل ٢٨٥ ـ ٢٨٦.

١٤. http://awene.com/dossier/٢٠١٣/٠٣/٢٥/٢٠٣٥٦

١٥ سەرچاوەی ژمارە ٣ لاپەرە ٣٠

١٦. سەرچاوەی ژمارە ٧، ل ٩٨و١٠٤.

17. http://www.dengiamerika.com/content/dino-danil-20mar11-118333094/967574.html

١٨. سەرچاوەی ژمارە ١٣.

19. http://www.bbc.co.uk/persian/world/2012/04/120411_l10_u01_israeli_kurds.shtml

٢٠. سەرچاوەی ژمارە ٦.

٢١. سەرچاوەی ژمارە ٢ لاپەرە ٣٠

٢٢. سەرچاوەی ژمارە ٦.

٢٣. سەرچاوەی ژمارە ٢ ،ل٢٦٩ ـ ٢٨٢.

٢٤. سەرچاوەی ژمارە ١٠، ل ٣٠ ـ ٣١.

٢٥. سەرچاوەی ژمارە ١٠، ل ٥٨ ـ ٦١.

٢٦. سەرچاوەی ژمارە ١٠، ل ٦٣ ـ ٦٤.

٢٧. سەرچاوەی ژمارە١٣.

٢٨. سەرچاوەی ژمارە ١٨.

۲۹. سەرچاوەی ژمارە ۲ ، ل ۲۸۸.

۳۰. سەرچاوەی ژمارە ۷، ل ۱۱۵ و ۱۱٦.

http://en.wikipedia.org/wiki/Israeli%E2%80%93Kurdish_relations .31

۳۲. سەرچاوەی ژمارە٦.

۳۳. سەرچاوەی ژمارە ۱٦.

۳٤. سەرچاوەی ژمارە ۱۸.

۳۵. سەرچاوەی ژمارە ۲، ل ۲۸۸.

۳٦. سەرچاوەی ژمارە ۲ ، ل ۲۸٦

۳۷. سەرچاوەی ژمارە۱۱. ل ۹.

۳۸. سەرچاوەی ژمارە ۲ ، ل ۲۸۹ ـ ۲۹۰.

۳۹. سەرچاوەی ژمارە ۱۳.

٤۰. سەرچاوەی ژمارە ۲ ، ل ۲۹۰ ـ ۲۹۱.

٤۱. سەرچاوەی ژمارە ۱۰، ل ۱۸.

٤۲. سەرچاوەی ژمارە ۱۰، ل ۲۱.

٤۳. سەرچاوەی ژمارە ٦.

٤٤. سەرچاوەی ژمارە ۱۰ ل ۵۸.

٤۵. سەرچاوەی ژمارە ۱۸.

http://www.radiofarda.com/content/f3_kurds_in_israel/24547128. .46
html

٤۷. سەرچاوەی ژمارە ۱۳.

# ٢ بەشی دووەم
کوردەکانی دەرەوەی کوردستان

۵. باسی شەشەم

## کوردەکانی لوبنان

- چەند زانیارییەك لەسەر وڵاتی لوبنان
- سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ لوبنان
- شوێن و ناوچەکانی جێی نیشتەجێبوونیان
- ژمارەی کوردەکان لە لوبنان
- بنەماڵە و کەسایەتییە ناودارەکانی کورد لە لوبنان
- ئایینی کوردەکانی لوبنان
- ڕەوشی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی کوردەکانی لوبنان
- ڕەوشی سیاسیی کوردەکانی لوبنان
- ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانی کوردەکان
- چالاکییە ڕۆشنبیرییەکان و ئاستی خوێندن لای کوردەکانی لوبنان
- هۆکارەکانی کۆچکردنی کوردەکان لە لوبنانەوە
- سەرچاوەکان

**● چەند زانیارییەك لەسەر وڵاتی لوبنان**

لوبنـان وڵاتێکـی بچـووك و کوێسـتانیی لـە ڕۆژئـاوای ئاسـیا و ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت و لـە لێوارەکانـی ڕۆژهەڵاتـی دەریـای مەدیترانەیـە کـە پایتەختەکـەی شـاری «بەیروت»ـە. لوبنـان لـە باکـوور و ڕۆژهەڵاتـەوە لەگـەڵ وڵاتـی سـووریا، لـە باشـوورەوە لەگـەڵ وڵاتـی ئیسرائیـل و لـە ڕۆژئـاواوە لەگـەڵ دەریـای مەدیترانـە هاوسـنوورە.

هەتـا پێـش شـەڕی نێوخۆیـی ١٩٧٥ ـ ١٩٩٠ لوبنـان وڵاتێکـی دەوڵەمەنـد لـە ناوچەکـە و پایتەختـی بانکداریـی جیهانـی عـەرەب دەهاتـە ئەژمـار و ژمارەیەکـی زۆر لـە گەشـتیارەکانی دنیـای بۆ لای خۆی ڕادەکێشـا تا ئەو ئاسـتەی کـە بەیروتیان وەك پاریسـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت دەناسـی و، هەروەهـا بە هۆی توانـای دارایی زۆری لوبنان وەك سـویسرای ڕۆژهەڵاتی ناڤین ناوبانگی کردبوو. دەسـبەجێ دوای کۆتاییهاتنی شـەڕ هەوڵی زۆر درا بۆ ئەوەی ڕەوشـە ئابوورییەکەی باشـتر بکرێتەوە و ژێرخانـی داتەپیـوی سـەرلەنوێ وەگەڕ بکەوێتـەوە کە دەرئەنجامـە ئەرێنییەکانی لـەم سـاڵانەی دواییـدا ئاشـکرا بـووە. هەتـا پێـش سـاڵی ٢٠٠٦، سـەقامگیریی و بونیادنانـەوەی لوبنـان کۆتایـی پێهـات و ژمارەیەکـی زۆر لـە گەشـتیارەکان ڕوویان لـە شـوێنە گەشـتیارییەکانی لوبنـان کـرد. بـەڵام لەگـەڵ دەسـپێکردنی شـەڕی ئیسرائیـل ـ لوبنـان لـە ١٢ی ژوئیـەی ٢٠٠٦ ژمارەیەکـی زۆر لـە کەسـانی سـەربازی و مەدەنـی تووشـی خەسـار بـوون و زیانـی زۆریـش بـە ژێرخانـی وڵات کـەوت و حەشـیمەتێکی زۆریـش ماڵوێـران بـوون. لـە سـێپتەمبەری ٢٠٠٦ـەوە دەوڵەتـی لوبنـان بەرنامـەی پێڕاگەیشـتن بـە شـوێنە کاول بووەکانـی بەیـرووت و ئاواییەکانـی هەڵکەوتـوو لـە باشـووری لوبنانـی دەسـت پێکردۆتەوە.

لەبـەر ئـەوەی خەڵکـی لوبنـان لـە ٦٠ سـاڵی ڕابـردوودا ڕوویـان لـە شارنشـینی کـردووە، زۆربـەی حەشـیمەتی ئـەم وڵاتـە لـە شـارەکان بـە تایبـەت لـە بەیرووتـی

پایتەخت و دەوروبەریدا نیشەجێن و زیاتر لە نیوەی لوبنانیەکان لە بەیرووت ژیان بەسەر دەبەن.

لوبنان لە شەش پارێزگا (المحافظه) پێك هاتووە کە بریتین لە: ١-پارێزگای بەیرووت ٢- پارێزگای «جبل لبنان» ٣- پارێزگای باکووریی لوبنان ٤- پارێزگای بەقاع ٥-پارێزگای نەبتیە ٦-پارێزگای باشووری لوبنان. کە هەریەك لەم پارێزگایانەش چەند شارێکیان لەخۆگرتووە.

خەڵکی لوبنان لە گرووپی نەژادی و قەومی جۆراوجۆر پێك هاتووە کە دەتوانین ئاماژە بکەین بە: عەرەب، ئاشووری، سریان، ئەرمەنی، کورد و جوولەکەکان. زمانی فەرمی لوبنان «عەرەبی»یە، بەڵام هەریەك لە کەمایەتییە نەژادییەکان بە زمانی خۆیان قسە دەکەن. زمانی فەڕەنسیش کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

لەباری ئایینیشەوە لە لوبناندا چەند ئایین و مەزهەبێکی وەك ئیسلام بە شیعە و سوننەوە، مەسیحیەت بە مارونی و کاسۆلیك و ئۆرتۆدۆکسەوە، دەروزی و ... هەن. دامەزراوەی نێونەتەوەیی توێژینەوەیی ئەمریکا لە توێژینەوەیەکدا نیشانی داوە لوبنان لەسەرەوەی ئەو وڵاتانەیە کە سنورداریێتیی و بەرتەسك کردنەوەیەك لە بواری ئایینی لەسەر ئازادیی هاووڵاتیانی پیادە ناکات.

لەباری کولتوور و هونەرەوە کە ئەمڕۆکە لە بەرهەمە موسیقیەکانیدا خۆی دەردەخا کاریگەریی لەسەر نەتەوە عەرەبەکانی دیکەش داناوە. گۆرانیبێژە ناودارەکانی دنیای عەرەب زیاتر لوبنانین: ئەلیسا، نەوال ئەلزوغبی، هەیفا وەهبی، نانسی عەجرەم، وائیل کفوری، راغیب عەلامە.

لوبنان بۆ ماوەی هەزاران ساڵ شوێنی تێپەڕینی شارستانیەتە جۆراوجۆرەکان بووە. کەوایە جێی سەرسوڕمان نیە ئەم وڵاتە بچووکە خاوەنی فەرهەنگێکی زۆر دەوڵەمەند و زیندوو بێ. هەبوونی قەوم و ئایینی جۆراوجۆر یارمەتی

زۆری داب و نەریتەکانی وەك موسیقی، چێشت لێنان و جەژنەکانی لوبنانی داوە. بە تایبەت لە بەیروت کە ڕێورەسم و شەوئاهەنگ و کۆنسێرتی زۆر خۆش بەڕێوە دەچن. کۆمەڵگەی لوبنان مۆدێرن، خوێندەوار و لەوانەیە شیاوی بەراوردکردن لەگەڵ کۆمەڵگە ئەوروپیەکانی مەدیترانە بێ. زۆربەی لوبنانیەکان دوو زمان دەزانن و بە عەرەبی و لوبنانی قسە دەکەن. بەم هۆیەوە لوبنان ئەندامی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی وڵاتانی فەرەنسی زمانە. بەم حاڵەشەوە زمانی ئینگلیزی بەتایبەت لەنێو خوێندکارانی لوبنانی پەرەی سەندووە. ئەم وڵاتە نە تەنیا شوێنی بەریەککەوتنی مەسیحیەت و ئیسلام بەڵکوو دەروازەی پێکەوەبەستنی دنیای عەرەب و ئەوروپایە.

لوبنان هەروەها خانەخوێی زانکۆ بەناوبانگەکانی وەك زانکۆی لوبنان، زانکۆی ئەمریکیی بەیروت، زانکۆی سێنت جۆزف و زانکۆی ئەمریکایی لوبنانە. فستیواڵی نێونەتەوەیی جۆراوجۆر لە لوبنان بەڕێوە دەچن کە هونەرمەندە ناودارەکانی جیهان و خەڵکی زۆر لە لوبنان و وڵاتانی دیکە بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. لە گرنگترینی ئەو فستیواڵانە دەتوانین ئاماژە بکەین بە فستیواڵە هاوینییەکان لە بەعلبەك، بیت الدین، بیبلوس.

لەباری مێژوویییەوە دەتوانین بڵێین یەکەمین دانیشتووانی ناسراوی لوبنان، کەنعانییەکان، خەڵکێك لە نەژادی سامی بوون کە بە ئەگەری زۆر بازرگانیان لەگەڵ یۆنانیەکان کردووە و، یۆنانییەکانیان بە «فینیقی» ناو بردوون. فینیقیەکان قەومێکی دەریانەوەرد و بازرگان بوون و هەرێمەکەیان دەوڵەت شارە سەربەخۆکانی ڕۆژهەڵاتی مەدیترانە و کۆچبەرنشینەکانی لێوارەکانی مەدیترانە بوون. کوروشی گەورە فینیقیەی گرت و بۆ ماوەی دوو سەدە هەخامەنشیەکان فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیە بوون. دوای ئەمە ئەسکەندەری مەکدۆنی، شاری «صور» (پێتەختی فینیقیە)ی گرت.

دەوڵەت و ئیمپراتۆریی جۆراوجۆر فەرمانڕەواییان بەسەر لوبناندا کردووە، بۆ وێنە شاکانی هەخامەنشی، ساسانی، یۆنانیەکان، ئیمپراتۆریەکانی ڕۆما و بیزانس، خەلیفەکانی موسوڵمانان، سەلیبیەکان و خەلیفەکانی عوسمانی.

(شەڕی نێوخۆیی: لە مانگی ئاوریلی ۱۹۷۵ی زایینی چەند چەکدارێك لە ڕۆژهەڵاتی بەیرووت تەقەیان لە کلیسایەك کرد بۆ ئەوەی پیر جەمیل دامەزرێنەری حیزبی فالانژی لوبنان تیرۆر بکەن. دیارە ئەو ڕزگاری بوو بەڵام ئەم کارە بوو بە هۆی کۆمەڵێك لە دژکردەوە کە لە کۆتاییدا شەڕێکی ۱۵ ساڵەی نێوخۆیی لە لوبنان لێکەوتەوە.)[1]

● سەردەم و هۆکاری کۆچکردنی کوردان بۆ لوبنان

مێژووی کورد لە لوبنان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ۱۲ ی زایینی واتا کاتێ ئەیوبییەکان گەیشتنە ئەوێ. چەند سەدە دواتر چەند بنەماڵە یان عەشیرەتی کوردی دیکە لەلایەن هێزە جۆراوجۆرەکان (بۆ نموونە عوسمانییەکان) نێردران بۆ لوبنان تا سەقامگیری ناوچەکە بپارێزن. کوردەکانی دیکە بە هۆی هەژاری و توندوتیژی لە کوردستان بۆ لوبنان کۆچیان کرد. ئەم گرووپە کوردانە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە گەلێ لە ناوچەکانی لوبنان نیشتەجێ بوون و دەسەڵاتدارییان کرد، بۆ نموونە میرەکانی سەیفە لە ترپیولی، بنەماڵەی میربی لە ئاکار، جونبەلاتەکان و عیمادەکانی چیای لوبنان و بنەماڵەی حەمیە لە بەعەلبەك. ئەم بنەماڵە کوردانە کە ساڵەهای ساڵ لە زێدی خۆیان دوور بوون، بە تەواوی خۆیان لەگەڵ پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لوبناندا ڕێك خستبوو و هەتا کۆتایی سەدەی ۱۹، بە تەواوی بوون بە عەرەب.

کۆمەڵگەی هەنووکەی کورد لە لوبنان بەرهەمی چەند شەپۆلی کۆچبەرییە. یەکەم شەپۆلی گرینگ دوو دەیە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی ڕوویدا، واتا کاتێك

کە هەزاران کورد لە دەستی توندوتیژیی و هەژاری کە لەو ساڵانەدا باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، هەڵاتن. زۆربەی ئەم کوردانە خەڵکی گوندەکانی ماردین و تورعابدین بوون. دووەم شەپۆلی گرینگی کۆچ لە سەردەمی نێوان شەڕی دووەمی جیهان و ساڵەکانی سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ ڕوویدا. بەشێکی مەزنی ئەم کۆچبەرە نوێیانە لە تورکیاوە چوون. بەشێکی زۆری ئەم کۆچبەرانە لە سوریاوە گەیشتنە ئەوێ و لە دەستی سەرکوتی کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری و سیاسیی سوریا کە لە ساڵی ١٩٥٨ لەوێ دەستی پێکرد، هەڵاتبوون. باشتربوونی ڕێژەیی ڕەوشی ژیانی کوردەکان لە لوبنان و نزیك بوونی ئەم وڵاتە بە کوردستان، دەورێکی گرینگی بینی لە هاندانی ئەم کۆچبەرە نوێیانە بۆ هەڵبژاردنی لوبنان وەك نیشتمانی نوێی خۆیان یان وەك شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی.[٢]

بەڵێ «لە کۆمەڵگەی لوبنانیشدا توێژێك خێزانی کورد هەن کە توانیویانە ڕۆڵێکی گرنگ لە دروستکردنی مێژووی لوبناندا ببینن، ئەم خێزانانە لە سەردەمی جیاواز و بۆ مەبەست و ئامانجی جیاواز کۆچیان کردووە بۆ لوبنان، هەندێکیان لە سەردەمی داگیرکاری خاچپەرستەکاندا بۆ پاراستنی کەلێنەکان چووبوون نموونەی ئەیوبییەکان، هەندێکی تریان لە سەرەتای سەدەی چوارەمدا هاتوون کاتێك کە چەند خێزانێکی کورد لە ناوچەی تەرابلوس جێنشین بوون بە تایبەت لە (عەکار و چنیە) بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی مەمالیك لەسەر وڵاتی شام. کۆمەڵێکی تریان لە سەدەی حەڤدەیەمدا پاش شۆڕشەکەی عەلی پاشا جانبولات لە ناوچەی (حەلەب ـ سیواس) ساڵی ١٦٠٦ لە دەستی (صدر الاعظم) موراد پاشا و والی شام سلێمان پاشا رایان کردووە.[٣]

لە بەرایی سەدەی بیستەمدا چەند شەپۆلێکی ڕەوی نوێی کورد بۆ ناوچەکانی لوبنان ڕوویدا، بەڵام هۆکارەکانی بە تەواوی جیاوازن لە هۆکاری ڕەوە سەرەتاییەکانی کورد. هۆکار و قۆناغەکانی ڕەوی نوێی کوردەکان بۆ لوبنان

ئەمانـەن:

ـــ لـە سـەرەتای بیسـتەکانی سـەدەی بیسـتەمدا، یەکەمیـن کۆمەڵـی کـورد کـە ژمارەیـان چەنـد سـەد کەسـێك دەبـوو، بـە هـۆی ناهەمـواری و نەهامەتـی ژیـان لـە زێـدی خۆیـان لەلایـەك، ترسـان لـە داپڵۆسـینی تورکـەکان کـە لـە جوڵانـەوەی سیاسـی کـورد لـە سەرانسـەری کوردسـتاندا زندەقیـان چوبـوو لەلایەکـی دیکـە، ڕوویـان کـردە لوبنـان. زۆربەیـان لـە کوردسـتان و لـە (ماردیـن و تورعابدین)ـەوە چـوون و کۆچکردنەکانیـان بـۆ چەنـد قۆناغێکـی دواتـر بـەردەوام بـوو.

ـ پاش شۆڕشـی شـێخ سـەعید سـاڵی ١٩٢٥ کە دژ بە کۆچپێکردنـی بەکۆمەڵی کوردەکانـی دیاربەکـر هەڵگیرسـا و بـە شـێوەیەکی زۆر دڕندانـە و وەحشـیانە، لـە سـەردەمی مسـتەفا کەمـال ئەتاتورکـدا، سـەرکوت کـرا.

ـــ لـە چلەکانـی سـەدەی بیسـتەمدا، بەپێـی گێڕانـەوەی یەکێـك لـە هاووڵاتیـان ( حاجـی ئەحمـەد ئەلعومـەری کـە کوردێکـی ناوچـەی (برج البراجنە)ـەیە، (٨٠٪)ی کـوردە کۆچبەرەکانـی لوبنـان، نێـوان سـاڵانی ١٩٢٤ و ١٩٤٠ بـە هۆی ئەم فاکتەرانـەی لای خـوارەوە ڕوویـان کردۆتـە لوبنـان:

١ـ بارودۆخـی گرانـی و ناڕەحەتـی ژیـان کـە کـوردەکان پێیـدا تێپەڕبـوون لـە تورکیـا و هەواڵـی خۆشـی و سـەرفرازی ژیـان لە لوبنان کـە لەلایـەن خزمەکانیانەوە پێیان دەگات.

٢ـ ئیعدامکردنـی سـەدان کورد لـە ئێران پاش ڕووخانی کۆمـاری مهاباد لەلایەن دەسـەڵاتی شـاوە، ئـەم مەسـەلەیە ڕەنگدانـەوەی خراپـی لەسـەر ورەی کـوردی تەرکیـا هەبـوو لەلایـەك و دەترسـان لـە دووبارەبوونـەوەی هەمـان کوشـتن و بڕیـن لایـەن دەسـەڵاتدارانی تورکیـاوە لەلایەکـی تـر.

ـــ دواتریـن شـەپۆلی ڕەوی کـورەکان سـاڵی ١٩٨٠ بـوو پـاش کودەتـا سـەربازییەکەی جەنـەڕاڵ (کەنعـان ئەفریـن) لـە تورکیـا، ئەفریـن زۆر بـە

توندوتیژی مامەڵەی لەگەڵ کورددا دەکرد، ئەم سیاسەتەی ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ شەپۆلێکی دیکەی ڕەوی کوردەکان، بەڵام تەنها چەند سەد کەسێکیان بە شێوەیەکی ناسایی گەیشتنە لوبنان.

بێجێ نییە ئەگەر باسێك لە ڕێڕەوی کۆچبەرە کوردەکان بۆ لوبنان بکرێ، لەبەر ئەوەی زۆرترین ڕێژەی ڕەوی کوردەکان بۆ لوبنان لە تورکیاوە سەرچاوەی گرتووە، دەبێ بە وردی ئەو ڕێگایە بگرین کە پێیدا ڕەویان کردووە، بەم شێوەیە: لە ویلایەتەکانی دیکەی تورکیاوە ڕوویان کردوەتە ماردین، پاشان دەچوونە شاری (نسەیبین) لەوێشەوە سنووری سوریایان دەبڕی تا دەگەیشتنە شاری قامیشلی دواتر بۆ حەسەکە پاشان (دیر الزور) ئەمجار شاری حەلەب، لەوێشەوە ڕوویان دەکردە (حەمس و حەما) و لەوێوە سنووری لوبنانیان دەبڕی تا دەگەیشتنە شاری تەرابلوس، کە بەشێك لە کۆچبەرەکانی شاری (منیزل) و دەوروبەری لەوێندەر سەقامگیر بوون. لە تەرابلوسەوە بۆ بەیروت گەشتەکە کۆتایی دێت.

جێی بەبیرهێنانەوەیە لەو ناوچانەی کە کاروانی کۆچبەرە کوردەکانی پێدا تێدەپەڕی، لە هەر ناوچەیەك و چەند کەسێکیان نیشتەجێ دەبوون، نموونەی ئەوانەی کە لە شاری قامیشلی و گەڕەکی کوردەکان لە دیمەشق و هەروەها چیای (السیدە) و دەوروبەری حەلەب، نیشتەجێ بوون.[٤]

هەندێك کەسیش لەسەر ئەو ڕایەن کە «لەوانەیە کوردەکان یەکەم جار لە کاتی لشکرکێشییەکانی هەخامەنشییەکان گەیشتبنە لێوارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای مەدیترانە، بەڵام ئەوەیکە بە دڵنیاییەوە لەمەڕ هەبونی کوردەکان لە خاکی لوبنان تۆمار کراوە، بۆ سەدەی دوازدەیەمی زایینی (شەشەمی کۆچی) دەگەڕێتەوە کاتێك سەلاحەددینی ئەیوبی، حکومەتی فاتمیانی لە میسر و شام ڕووخاند و دەوڵەتی ئەیوبیانی پێك هێنا و هێندێك لە بنەماڵە کوردەکانی وەك

حاکم بۆ ناوچە جیاجیاکانی ئەویێ نارد.

مەملوکییەکانیش کە دوای ئەیوبییەکان بەسەر ئەو ناوچانەدا زاڵ بوون، بۆ پاراستنی سنوورەکانیان کەڵکیان لە هۆزە کوردەکان وەرگرت و بەم شێوەیە ژمارەیەك لە کوردەکان لە باکووری لوبنان نیشتەجێ بوون. لە سەردەمی ئیمپراتۆریی عوسمانیش هێندێك لەو دەسەڵاتدارانەی بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە جیاوازەکان دادمەزرێندران، کورد بوون. هەروەها دۆڵ و کوێستانە سەخت و هەڵەمووتەکانی لوبنان حەشارگە و پەناگەی ئەو کوردانە بوون کە شۆڕشیان بە دژی عوسمانییەکان و حاکمە خۆجێییەکان دەکرد و ڕایان دەکرد. بەناوبانگترینیان بنەماڵەی جونبوڵات بوون کە چوارسەد ساڵ پێش ئێستا هەڵاتن بۆ دەڕەی شوف و چوونەسەر مەزهەبی دەروزی و نەوەکانیان ئێستا بە بنەماڵەی ناوداری جونبوڵات ناسراون. زۆر لە نەوە و میراتگرەکانی ئەو بنەماڵە کوردانەی کە ئەو سەردەم کۆچیان کردووە بۆ لوبنان، هەنووکەش ئاگاداری ڕەچەڵەکی کوردیی خۆیانن بەڵام شوێنەوارێك لە زمان و کولتووریی کوردی لەنێویاندا بەدی ناکرێت ...»[٥]

لە سەرچاوەیەکی دیکەشدا بەم شێوەیە باس لە بوونی کورد لە لوبنان دەکرێت:

«هەر لە کۆنەوە کوردان لە چیای لوبنان هەبوونە، بەڵام لە سەردەمی ئەیوویی و مەملووکی و عوسمانییەکان زیاتر بوون، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا چەند بنەماڵەیەکی دەرەبەگ و سیاسی لە ناویان سەری هەڵدا و بۆ ماوەیەکی زۆر فەمانڕەوایی چیای لوبنانیان کرد، کە مێژووی لوبنان بەوان پەیوەندە و هەر بەوانەوەش بەستراوە.

ئەیوبییەکان لە ساڵی ١١٣٩ی زایینی بەرەو لوبنان چوون (لە کاتی شەڕی سەلیبییەکان) بۆهاوکاری و بەرگری لە ئیسلام و موسوڵمانان، تا ئێستاکەش

نەوەکانیـان هـەر ماونەتـەوە و لەگونـدی (راس نحـاش) لـە قـەزای (بـترون) لـە باکـووری لوبنـان.

کـوردەکان لـە دوای شـەڕی سـەلیبیەکان گەیشـتنە لوبنـان و دەسـەڵاتداری و فەرمانڕەواییـان لـە هەرێمـی (شـوف) گرتـە دەسـت، لـە نێـوان سـەدەی شـازدە و حەڤـدەدا کـە لـە دوایـی هەمـوو لوبنـان کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتیان و دروزییەکانیش پێشـوازیان لێکـردن و چوونـە سـەر ئایینـزای ئـەوان کە بە بنەچـە دەگەڕێنەوە سـەر (معـەن ئەیوبـی کـوردی)...»[٦]

پێویسـتە بگوتـرێ سـەرچاوەی سـەرەکی کۆچـی کـوردەکان بـۆ لوبنـان لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا هـەر دوو ویلایەتـی ماردیـن و توورعابدیـن لـە کوردسـتانی ژێـر دەسـەڵاتی تورکیـاوە بـووە. گرنگتریـن ئـەو ناوچانـەی سـەر بـە قەزاکانـی ویلایەتـی ماردینـن و سـەرچاوەی سـەرەکی کۆچـی کوردەکانـن، ئەمانـەن: راشـدیة، راجذیـة، محلمیـة، معسرتي، مخاشـنیة، منیـزل، مەرجـە، متینـا، کنداریـب، جـب الکـراو.

**• شـوێن و ناوچەکانـی جێـی نیشتەجێبوونیان(دابەشـبوونی جوگرافیـی کوردەکانـی لوبنـان)**

زۆربـەی ئـەو کوردانـەی کـە گەیشـتوونەتە لوبنـان، لـە ناوچـە کەمداهاتەکانـی بێـروت وەك عەینەلمەراسـیە، ئەلبەسـتا، بورجـەل بەراجنـە، بورجـی حەمـود و گەڕەکـە خوارەکانـی شـار وەك فـورن ئەلشـوباك، رەملـە زەریـف و زەقەلبـلاد نیشـتەجێن. ئەوانـی دیکـە، بـە تایبـەت ئەوانـەی کـە لـە سـوریاوە چوون لە شـوێنە هـەژارەکان وەك ئەلقەرەنتینـە ئەلمەسـلەخ نیشـتەجێن. جگـە لـە بێـروت، زۆربـەی کـوردەکان لـە سـیدۆن، تریپولـی و بوقـاع لـە نزیکـی سـنووری سـوریا دادەنیشـن. ڕەوشـی نیشـتەجێبونی کـوردەکان لـە پلـەی یەکەمـدا ڕەنگدانـەوەی ڕێکخـراوە

عەشیرەتییەکانیانە کە هەرکام بە گوێرەی رەگ و بنەچەی خۆیان پێکهاتوون.

هەروەك هاوخوێنەکانیان لە شوێنەکانی دیکە، گەلێ لە کوردەکانی لوبنان شێوازە جۆراوجۆرەکانی نیشتەجێبوونی زۆرەملییان تەجرووبە کردووە. بۆ نموونە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦، زۆربەی ئەو کوردانە کە لە کۆمەڵکوژی مەسیحییە مارۆنییەکان لە ئەلقەرنتینە ئەلمەسلەخ ڕزگاریان ببوو، بۆ ڕۆژئاوای بێروت، خەلدە، ئەلجناح و شوێنەکانی تری «کەرتی بەدبەختی» کە شوێنی نیشتەجێبوونی هاووڵاتیە کەمداهاتەکان بوو، گوێزرانەوە. (کەرتی بەدبەختی: هەژارترین گەڕەکەکانی دەوروبەری بێروت، پایتەختی لوبنانە. بە تایبەت لای ڕۆژهەڵات و باشووری بێروت)

هەتا ساڵی ١٩٧٨ سەرجەم کوردەکانی دانیشتووی بەشە کەمداهاتەکانی بێروت وەك فورن ئەلشوباك و بورج حەمود لەلایەن مارۆنییەکانەوە ناچار کران بڕۆن بۆ «کەرتی بەدبەختی» و ئەو شوێنانەی کە پێشتر زۆرتر کوردنشین بوون[٧]

وەك لە باسی ئەو ناوچانەی کۆچبەرە کوردەکان ڕەویان لێوە کردووە (ویلایەتی ماردین)، باس کرا، لە چەند خانوبەرەکی نزیك لە یەکتر کۆبوونەوە. بە پارێزگاری و پاراستنی هەموو ئەو دابو نەریتە خێڵەکیانە کە لە دەوری نزیك بوونەوە لە یەکتر و دراوسێیەتی دەخولێنەوە. وەك لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی دا دەرکەوتووە (مەبەست کتێبی کورد، گەلی مەینەتییەکان)ـە، کۆچبەرەکانی ناوچەی (راشدیە و گوندەکانی دەوروبەری) لە زقاق البلاط دابەش بوون کە خانوبەرەکی کۆنی تێدایە جێگەی ١٥ ماڵی تێدا دەبێتەوە بە خانەی ئەبو ئیبراهیم ناوزەد دەکرێت، و کۆچە سەرەتاییەکانی کوردەکانی لەخۆ گرتووە و وەکو ناوکێکە (ناوەندێکە) کە کوردەکانی ناوچە (زقاق البلاط) و ناوچەی (ریاض الصلح) هەروەها ناوچەکانی (کرنتینا و مسلخ)، لە دەوری کۆبوونەتەوە. .. پاش ئەو کوشتارەی خێزانە نیشتەجێبوەکانی (کرنتینا و مسلخ) بە تایبەتی

خێزانی (الزین) لە ساڵی ١٩٧٦ تووشی بوون، شەپۆلێکی ڕەوی فراوان لەو ناوچانەوە دەستی پێکرد و چەند خێزانێکیان لە ناوچەی (الجناح) لە شالیهاتی سان سیمون و سان میشال سەقامگیر بوون، تاوەکوو ساڵی ١٩٩٦ کاتێ کە پرۆژەی (الیسار) بۆ ئاوەدانکردنەوەی باشووری خۆرئاوای بەیروت دەستی پێکرد و بەرامبەر بە چۆلکردنی خانووەکانی ئەو ناوچانە، قەرەبوویان بەو خەڵکە دەدا.

هەندێکی تریان لە ناوچەی (وادی ابوجمیل) سەقامگیر بوون، لە ساڵی ١٩٩٦ پروسەی ڕووخاندن لەو ناوچانەیە دەستی پێکرد. بۆ پراکتیزەکردنی پرۆژەی (سولیدیر) (ئاوەدانکردنەوەی ناوەندی کۆچبەرەکان)، بەم شێوەیە (سندووقی نیشتمانی کۆچبەرەکان) خاوەن خانووەکان و کرێچییەکان لە کۆمپانیای (سولیدیر)ەوە قەرەبوویان وەرگرت.

بەڵام کۆچبەرەکانی ناوچەی (معسرتی) و گوندەکانی دەوروبەری لە ناوچەی (برج البراجنە) لە گەڕەکی (السباعی) سەقامگیر بوون و بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی دەرکەوتووە کە زۆربەیان لە بنەماڵەی (العمری)ن، بەڵام سەبارەت بە ژمارەیان، بەپێی گۆڤاری (الوهج، ژمارە ٢، کانوونی دووەم ١٩٩٥، ل ٣٣، بەیروت) زیاتر لە (١٠٠) خێزان لە (برج البراجنە)، یەکێك لە ناوچەکانی دەروازەی باشووری شاری بەیروت جێگیر بوون، هەروەها هەندێکی تر لە (معسرەتییەکان) لە ناوچەی (الباشوورە) لە بەیروت سەقامگیر بوون.

بەڵام سەبارەت بە خەڵکی (منیزل) لە شاری تەرابلوس و لە گەڕەکەکانی (تربیعە، الزاهریە، صهر المغر و القبە) سەقامگیر بوون.

هەروەها خەڵکی (المخاشنە) لە گەڕەکانی (الدرکە) و ناوچەی (ریاض الصلح و حزن الشباك) سەقامگیر بوون، بەڵام لە کاتی شەڕی ناوخۆی ساڵی ١٩٧٥، بەشێکیان ئەو ناوچانەیان بەجێهێشت و لە گوندەکانی (الخیارە، الفرزل،

کفـر زبـدی) ناوچـەی بیقاع جێگیـر بوون.

لـە کۆتاییـدا، کوردەکانی ناوچـەی (مرجـە) کـە لـە ناوچەکانـی (البسـطا، عین المریسـە، وادی ابوجمیـل) نیشـتەجێ بـوون، پاشـان لەبـەر ئـەو هۆکارانەی پێشـتر بـاس کـرا ئـەو ناوچانەیـان بەجێهێشـت.[٨]

### ژمارەی کوردەکان لە لوبنان

ئەمـڕۆ ٢٠ گرووپـی جۆراوجـۆری ئایینـی و ئیتنیکـی لـە لوبنـان دەژیـن. ئـەم گرووپانە بریتین لە موسـڵمانە سـوننەکان، شـیعە دوازدە ئیمامییەکان، دەروزییەکان، ئیسـماعیلییەکان، عەلەوییـەکان، مارۆنـە مەسـیحییەکان، کاتولیکـە یۆنانییـەکان، کاتولیکـە رۆمیـەکان، ئۆرتۆدۆکسـە یۆنانیـەکان، پرۆتسـتانەکان، یەهودییـەکان، ئاشـوورییەکان ( یـان نەسـتوورییەکان)، کاتولیکـە کەلدانییـەکان، کۆپتـەکان، ئەرمەنییـە ئۆرتۆدۆکـس یـان گریگۆرییەکان، ئەرمەنییـە کاتۆلیکەکان، کـوردەکان، سیرکاسـییەکان، بەهاییـەکان و تورکمەنـەکان.

لەنێـو ئـەم گرووپانـەدا، کـورد دووەمیـن گرووپـی مەزنـی غەیـرە عەرەبـن کـە تەنهـا ژمـارەی ئەرمەنیـەکان لـەوان زۆرتـرە. بەهەرحـاڵ هیـچ ئامارێکـی ڕەسـمی یـان هەڵسـەنگاندنێکی ڕێژەیـی لەمـەڕ حەشـیمەتی کـورد بوونـی نییـە. هـۆکاری ئـەم مەسـەلەیە دوو شـتە: یەکـەم لەبـەر ئـەوەی کـە لـە سـاڵی ١٩٣٢ بەمـلاوە هیـچ سـەرژمێرییەکی ڕەسـمی لـە لوبنـان ئەنجـام نـەدراوە و دووەم لەبـەر ئـەوەی کـوردەکان ناسـنامەی ئیتنیکی خۆیـان لە گرووپەکانـی دیکەی لوبنان دەشـارنەوە.

حەشـیمەتی کـوردەکان پێـش سـاڵی ١٩٥٨، لـە نێوان ٦٠ هـەزار هەتـا ٩٠ هەزار کـەس بـووە، بـەڵام بـە لەبەرچاوگرتنـی ئەوە کـە هـەزاران بنەماڵەی کورد لـە میانەی شـەڕی ناوخـۆ لـە وڵاتـی لوبنـان هەڵاتـن، بیـروڕا ئەوەیـە کـە ئەمـڕۆ حەشـیمەتیان لەنێـوان ٧٥ هەتـا ١٠٠ هـەزار کـەس دەبێـت.[٩]

دەربارەی ژمارەی کوردەکانی لوبنان ڕای جیاواز و ژمارەی جیاواز دەردەبڕدرێت، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك گرنگترینیان نەبوونی ئامارێکی ڕەسمی گشتگیرە ( سەبارەت بەوانەی ڕەگەزنامەیان پێدراوە و ئەوانەی پێیان نەدراوە) هەروەها ئاماژەنەکردن بە ئینتیمای نەتەوەیی لە کارتی ناسنامەکەدا (سەبارەت بەوانەی ڕەگەزنامەیان پێدراوە)، ئەمە جگە لە نەبوونی چاودێرییەکی ناوچەیی یان نێودەوڵەتی، بۆ کاروباری ئەم کۆمەڵە بەشەرییە (واتە کورد)، وەك ئەوەی ئاژانسی (الانروا) بۆ داڵدەدانی پەنابەرە فەلەستینییەکان.

بۆیە دەبێت پشت بە چەند مەزەندەکردنێك و چەند داتایەکی ئاماریی (کە ورد نییە) ببەستین، بۆ دیاریکردنی ژمارەی کوردەکانی لوبنان، بۆ نموونە (جەمیل مەحۆ) دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان ( پارتی)، ژمارەی کوردەکان بە نزیکەی (٧٠) هەزار کەس مەزەندە دەکات (ڕۆژنامەی السفیر، ١٩٧/١٢/٢٨). بەڵام محەمەد جەمیل محۆ کە لە پارتەکەی باوکی جیابۆوە، لە نامیلکەیەکدا بە ناونیشانی (تێروانینێکی نوێ بۆ دۆزی کورد) کە لە ساڵی ١٩٧٧ بڵاوی کردۆتەوە، پێی وایە ژمارەی کوردەکانی لوبنان نێوان ( ٧٥-١٠٠) هەزار کەس دەبێت.

هەروەها گۆڤاری (المارونی) ئاماژە بەوە دەکات کە ژمارەی کوردەکانی لوبنان (٩٠) هەزار کەسن، بەڵام ڕۆژنامەی الانوار بە نزیکەی ٣٥ هەزار کەس مەزەندەیان دەکات.

لەڕاستیدا هەموو ئەم ژمارانەی باس کران، ئاماژەیە بە ژمارەی کوردەکان پێش ئەو شەپۆلە بەرفراوانەی کۆچکردن(لە بەشێکی تایبەتدا باس دەکرێت) کە تیایدا زیاتر لە (٥٠٪)ی کوردەکان لوبنانیان بەجێهێشت...

لە پاشکۆی ڕۆژنامەی (النهار، ژمارەی ڕۆژی ١٩٩٣/١٠/٢) بڵاو بۆتەوە کە:
« ژمارەی کوردەکانی لوبنان پێش شەڕ خۆی لە (٢٠٠) هەزار کەس دەدا،

بەڵام ئێستا پاش کۆچکردنی زۆربەیان بۆ ئەڵمانیا و سوید و وڵاتانی دیکەی ئەورووپا، تەنها (١٥) هەزار کەسیان ماونەتەوە. [١٠]

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا هاتووە: ژمارەی کوردەکانی لوبنان نزیکەی (١٥٠ ـ ٢٠٠) هەزار خێزانە و زیاتر لە ٧٠٪ ناسنامەی کاتییان هەیە، کە ساڵانە نوێی دەکەنەوە، هەروەها زۆریشیان چوونە وڵاتەکانی ئەمریکا و ئورووپا لە کاتی شەڕی ناوخۆی لوبنان.[١١]

هەروەك ئاماژەی پێدرا، دەربارەی ژمارەی کوردەکان لە لوبنان ڕای جیاواز و ژمارەی جیاواز هەیە. ئەوەش لەبەر کۆمەڵێك هۆکار کە نەتوانراوە ئامارێکی ڕەسمیی گشتگیر سەبارەت بەم کوردانە بخرێتەڕوو. بەڵام ئەوەی نکۆڵی لێ ناکرێ و دەبێ وەك ڕاستییەکی مێژوویی سەیری بکرێ ئەوەیە کە، ژمارەیەکی زۆری کورد لە لوبنان هەن کە لە قۆناغە جیاجیاکاندا ڕوویان لەو وڵاتە کردووە و لەگەڵ هەموو کەندوکۆسپ و کۆچکردنەکان، ئێستاش هەروا لەو وڵاتە ماونەتەوە و کوردایەتیی و کوردبوونی خۆشیان لەبیر نەچۆتەوە.

**● بنەماڵە و کەسایەتییە ناودارەکانی کورد لە لوبنان**

هەروەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا ئاماژەی پێکرا، لە لوبناندا چەند بنەماڵە و کەسایەتییەك هەن کە بە ڕەگەز کوردن و خزمەتێکی زۆریشیان بەم وڵاتە کردووە. لێرەدا تەنیا بە کورتی باس لە گرنگترینی ئەو بنەماڵە و کەسایەتییانە دەکەین ئەگینا بێجگە لەم چەند بنەماڵەیە، زۆر بنەماڵەی تری وەك بنەماڵەی شەها، بنەماڵەی خدرئاغا، بنەماڵەی عبود، بنەماڵەی فەزڵ و مەعنییەکان و .... هەیە. هەر بۆیە دەتوانین بڵێین گرنگترین بنەماڵە کوردەکانی لوبنان بریتین لە:

**١ ـ ئەیووبییەکان *(الایوبیون)***

لە تکریتەوە کۆچیان کرد بۆ موسڵ، لەوێشەوە لە ساڵ ١١٣٩گەیشتنە

لوبنان بە تایبەت شاری بەعەلبەك، پاشان زنکی ئەیوبی کوڕی شازی باوکی سەلاحەددینی ئەیوبی بە والی شاری بەعەلبەك دامەزرا.

ئەوەی کوردێتی بنەماڵەی ئەیووبییەکان دەسەلمێنی ئەو نووسینەی ( کەمال الصلیبی)یە کە دەڵێ: ( پادشای سەرکەوتوو سەلاحەدین یوسف کوڕی ئەیوب کوڕی شازی، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر، ئەیوبی کوڕی شازی و شێرکۆی برای لە کوردەکانی تکریت بوون لە عێراق) (کمال الصلیبی، منطق تأریخ لبنان، موسسه نوفل، گ ٢، بەیروت ١٩٩٢، ل ١٠٧) ئەوەی کە دووپاتی ئەو ڕایە دەکاتەوە، ئەو وتەیەی میژوونووس «طنوس الشدیاق» لە کتێبی (اخبار الاعیان فی جبل لبنان، منشورات الجامعه اللبنانیه، بیروت ١٩٧٠، ج ١، ل ١٩٠)ـە کە لە کاتی باسکردنی بنەماڵە لوبنانیەکاندا دووپاتی کردۆتەوە کە ئەیوبییەکان چەند میرێکی کوردن لە ناوچەی (الکوره) نیشتەجێبوون. هەروەها (کمال الصلیبی) کە ئاماژە بە بوونی ئەیووبییەکان لە ناوچەی باکووری لوبنان دەکات پێی وایە:« لە سەردەمی ئەیووبییەکاندا، یەکێك لە میرەکانیان قەڵایەکی هەبوو کە (مسیلحه) کە دەکەوێتە یەکێك لە دۆڵەکانی باکووری لوبنان و لەسەرووی شارۆچکەی (بەترۆن)ـەوەیە.. تا ئێستاش شورا جوانەکانی ماوەتەوە...)( کمال الصلیبی، بیت بمنازل کثیره، الکیان اللبنانی بین التصور و الواقع، ــ ٢، موسسه نوفل، بیروت ١٩٩١، ل١٨٢) ئەمە لە کاتی باسکردنی ڕەوشی سیاسی لوبنان لە سەردەمی فاتمیەکاندا، بەشی باشووری چیاکانی لوبنان کەوتە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی فاتمیەکان، بەڵام عەرەبە موراداسیەکانی دەسەڵاتدارانی حەلەب فەرمانڕەوایی باکووریان دەکرد، لەو سەردەمەدا چەند سەربازێکی کورد نیشتەجێ کران لەو ناوچانە، لەوانە ئەیووبییەکان، کە نەوەکانیان تا ئێستا لە گوندێکی سەر بە قەزای بەترۆن لە باکووری لوبنان کە پێی دەوترێ (رأس نحاش) ماونەتەوە، هەرچەندە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و ئابووریان کز بووە، بەڵام هەوڵ دەدەن پارێزگاری لە نازناو و مەکانەتی میرنشینەکەیان بکەن.

**٢ـ بنەماڵەی سەیفا**

ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکیان لە ژیانی سیاسیی لوبنان و لەسەر شانۆی ڕووداوەکاندا بینیوە، بە تایبەت لە سەردەمی عوسمانییەکاندا و لە ململانێیان لەگەڵ بەرپرساندا، ڕای (ئیبراهیم بەگ ئەلئەسوەد) باشترین پشتگیرییە بۆ کوردێتی خێڵی سەیفا کە دەڵێ: «چەند میرێکی کوردن نێوان ساڵانی ١٥٢٨ و ١٥٧٩ی زایینی، توانیان حوکمڕانی میرنشینەکەیان بکەن، کاتێ کە میریوسف سەیفا گەیشتە پلەی وەزیر و ساڵی ١٥٧٩ بە والی تەرابلوس دامەزرا.» هەروەها دکتور (فیلیپ حتی) لە کتێبی (تأریخ لبنان منذ اقدم العصور التأریخیه الی عصرنا الحاصر) بەم شێوەیە ئەم مەسەلەیەی ڕوون کردۆتەوە «پاش ئەوەی عەساف، ڕکابەرەکانیان (ئەوەی سەیفا) لە عەکار دەسەڵاتیان گرتە دەست، کە بە ڕەگەز و ڕەچەڵەك کوردن و تەرابلۆسیان بە بارەگای سەرەکی خۆیان دانا».

بەڵام چەند ڕایەکی جیاوازیش هەیە کە خێڵی سەیفا بە تورکمان دەزانن، ئەوەتا دکتۆر عەبدولڕەحیم ئەبو حوسێن دەڵێ:«پاش ئەوەی ماوەیەکی دووروردرێژە وا دەزانرێ کە خێڵی سەیفا کوردن، ئێستا دەرکەوتووە کە سەیفییەکان تورکمانن...»

**٣ـ مەراعیبەکان (المرابعه)**

بە ڕەچەڵەك کوردن و لە خێزانە دێرینەکانی لوبنانن، ئەوەی کە پشتگیری کوردێتی ئەم بنەماڵەیە دەکات، ڕای ئەحمەد محەمەد ئەحمەدە لە نووسراوەی (اکراد لبنان و تنظیمهم الاجتماعی و السیاسی، مکتبه فقیه،گ:١ بیروت ١٩٩٥): «..چەند میرێکن دەگەڕێنەوە سەر باپیرەگەورەیان (مرعب) کە یەکێکە لە ئاغا (بەگ)ـە کوردەکانی ناوچەی هەکاری..». هەروەها ئەوەی لە ڕۆژنامەی (ئەلحەیات)دا هاتووە (بنەماڵە کوردەکانی لوبنان چەند مەزهەبێکی ئیسلامی

جیاوازیـان هەیـە.. لەوانـە خێڵـی (مرعـب) سـوننە مەزهەبن..(ڕۆژنامـەی (الحیـاه، ٢٨ی ئابـی ١٩٩٣). ئـەم نووسـینە خـۆی لـە خۆیـدا ئامـاژە کردنێکـە بـە ئینتیـمای مەراعییـەکان بـۆ ڕەگـەزی کورد.

شـایانی ئامـاژە پێکردنـە ئـەم خێڵـە تاوەکـوو سـەردەمانێکی نزیـك موڵکداری قـەزای عـەکار بـوون و پشـتگیرییەکی جەماوەرییـان لـەو قەزایـە هەیـەو یەکێك لە نەوەکانـی ئـەم بنەماڵەیـە بە نـاوی (طلال المرعبی) سـاڵی ١٩٧٢ جێگری کورسـی سـوونەکان بـووە لـە پەرلەمـان لەقـەزای عـەکار، تاوەکوو سـاڵی ١٩٩٢ دووبـارە بۆ هەمـان پۆسـت هەڵبژێردرایـەوە. دیسـانەوە سـاڵی ١٩٩٦ هەمان منمانـەی بۆ هەمان پۆسـت بەدەسهێنا.

#### ٤ـ جەنبوڵاتیەکان ( *الجنبلاطیون* )

چەنـد بەڵگەنامەیـەك لەبـەر دەسـتایە کـە کوردێتـی ئـەم خێڵـە دەسـەلمێنێ بـە تایبەت گەر بگەڕێینەوە سـەر ڕەگ و ریشـەی وشـەکە، (جان) واتە جەسـتە (گیان) و (بـولاژ) واتـە (پـۆڵا)، کەواتـە ئـەم نـاوە مانـای (گیـان پۆڵاییـن) یـان (جەسـتەی پۆڵاییـن) دەگەیەنێـت، ئـەو ڕاوبۆچوونانـەی کـە بـاس لـە ڕەچەڵەکـی خێڵـی جەنبـوڵات دەکـەن ئەمانەن: دکتۆر (کـمال الصلیبی) لە کتێبی (بیـت بمنازل کثیره، الکیـان اللبنانـی بیـن التصـور و الواقع، ـ: ٢، موسسـە نوفـل، بیـروت ١٩٩١، ل١٩٦) دەڵێـت:» .. خێزانێـك لە خێزانە کوردەکانی باکووری شـام کـە خێزانی (جانبوڵاتە) لـە سـاڵی ١٥٩١ دەسـەڵاتدارێتی ئەیالەتـی حەلەبـی گرتەدەسـت..» هـەر لـەم بارەیـەوە دکتـۆر (فیلیـپ حتـی) ڕای وایـە «.. عەلـی جانبـولات کە سـەرکردەیەکی کـوردە ویلایەتـی حەلەبـی بۆ خـۆی دابڕیبـوو، بۆ ئـەم مەبەسـتەش هاوپەیمانێتیان لەگـەڵ میـر فەخرەدیـن هەبـوو..» هەروەهـا دکتـۆر عومـەر عەبدولعەزیـز عومـەر لـە لاپـەڕە ١٦٦ی کتێبـی ( تأریـخ المـشرق العربیـی ١٥١٦ ـ ١٩٢٢، دار النهضـة

العربیـە، بیـروت ١٩٨٤) هەمـان ڕای هەیە:«میـر فەخرەدیـن لەگـەڵ میـری کـوردی عەلـی پاشـای جانبولاتـدا هاوپەیمانێتـی هەبـوو..» سـەرەڕای هەمـوو ئەمانـەش (ئەنسـکلۆپیدیای ئیسـلامی) بەم شـێوەیە باسـی بنەماڵـەی جەنبولاتی کـردووە:» .. خێزانێکـن لـە میـرەکان بـە ئینتیـما کـوردن و بـە مەزهـەب (دەروزیـن)، لـە لوبناندا جێگیـر بـوون و تـا ئـەم ڕۆژانـەش (حزبـی جەنبولاتی چالاك)یـان پێکهێنابـوو..».

### ٥ـ ئامێدییەکان ( العمادیون)

دەگەڕێنەوە سەر باپیرە گەورەیان (عیماد). لە شاری ئامێدی نزیك شاری موسل لە عێراق، ئەوەی پشتگیری ئینتیمایان بۆ کورد دەکات ڕای دکتۆر (سلیم الهشی) یە:«..بە خزمایەتی دەگەنە عیمادی دەوڵەتی (دەیلەمی) کوردی کە حوکمڕانی ناوچەی ئامێدییان دەکرد..«ئەم خێڵە ڕۆڵێکی گرنگیان لە مێژووی لوبنان بە گشتی و (دروز) بە تایبەتی بینیوە، ئەویش بە سەرکردایەتی کردنی حزبی یەزبەکی، ئەمە بەپێی گێڕانەوەی دکتۆر عومەر عەبدولعەزیز عومەر «...قەیسییەکان لە نێوان خۆیاندا دابەشبوون بەسەر دوو حیزبی سەرەکی .. جەنبولاتی و یەزبەکی (یەزبەکیەکان بە نەسەب دەگەڕێنەوە سەر سەرکردەیەك لە خێڵی (عیماد ـ ئامێد) کە ناوی شێخ عەبدولسەلامی ئامێدیە... شوێنکەوتووەکانی بە یەزبەکی بانگ دەکران، چونکە باپیرەگەورەیان (شێخ ئامێد) یەزبەکی بوو...»

لـە کۆتاییـدا پێویسـتە باس لەوە بکەین کـە نەوەی حەمییە (حمیـە) بنەماڵەیەکی کـوردی شـیعە مەزهەبـن لـە شـارۆچکەی (بەتاریـا)ی ناوچـەی بیقاع حاڵـی حازر نیشـتەجێن، ئـەم بنەماڵەیـە لەگـەڵ باپیـرە گەورەیان ( حمـۆی کوردی) لـە عێراقەوە ڕوویان کردۆتـە لوبنان. [١٢]

### ● ئایینی کوردەکانی لوبنان

ڕێـژەی (٩٩,٦٪)ی کوردەکانـی لوبنان موسـوڵمانی سـوننەن و لەسـەر مەزهەبی ئیمامی (شـافیعی)ن، ئەم ئینتیمایـە عەرەب و کوردەکانی ماردیـن دەگرێتەوە، بەڵام ئـەم ڕێـژە زاڵەی موسـوڵمانان، ڕێگر نەبـوو لە بوونـی ڕێـژەی (٠,٤٪)ی خێزانەکان کە پابەنـدی ئایینـی یەزیدین...

لەلایەکـی تـرەوە مزگەوتێکی تایبـەت بە کـوردەکان لە ناوچەی -برج البراجنە- (دەروازەی باشـووری شـاری بەیـروت) هەیـە، کـە خوالێخۆشـبوو حاجـی (عمـر العمـری) سـاڵی ١٩٦٣ دروسـتی کـردووە. بـە شـێوەیەکی گشـتی دەتوانیـن بڵێیـن کوردەکانـی لوبنـان ئەرکە ئایینییەکانی وەکـوو ڕۆژوو و نوێژ و حـەج بەجێدێنن.[١٣]

### ● ڕەوشی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی کوردەکانی لوبنان

ڕەوشـی کۆمەڵایەتیـی: لـەم بەشـەدا هـەوڵ دەدرێ بـە کورتـی بـاس لـە چەنـد بابەتێکـی پێوەندیـدار بـە ژیانـی کۆمەڵایەتیـی کـوردەکان لـە لوبنـان و هەنـدێ لە کێشـەکانیان بکرێ:

#### *ـ هاوسەرگیری و ژیانی هاوبەش*

بەرزبوونـەوەی ڕێـژەی ژنخـوازەکان و شـووکردەوەکان (هاوسـەرێتی) بەسـەر ئەوانـەی لـە قۆناغـی سـەڵتی دان، مەسـەلەیەکی بـاو و بـڵاوە لـە کۆمەڵگـە هەژارەکانـدا بـە گشـتی، کوردەکانـی لوبنانیـش لـەم ڕێسـایە بـەدەر نیـن. هـەر لەگـەڵ گەیشـتنی گەنـج بـە تەمەنـی بالقبـوون، لـە کۆمەڵگـەی کوردیـدا بیرۆکەی هاوسـەرێتی لا دروسـت دەکرێـت، ئەمـە بـە فاکتـەری سـەرەکی دابەزینـی ڕێژەی سـەڵتی مێینـەی کـورد بەرامبـەر بەرێـژەی سـەڵتی مێینـەی لوبنـان بـە گشـتی دادەنرێـت، ئەگەرچـی لـە سـێ قۆناغـی یەکەمـی تەمەنـدا بـەم شـێوەیە نەبـوو،

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانە:

**یەکەم:** ئەو داب و نەریتە خێڵەکیانەی کە لە باو و باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە، کە هانی زاوزوێ و منداڵبوون دەدات، بۆ ئەوەی ژمارەی ئەندامانی لە خێڵەکانی دیکە زیاتر بێت، لەلایەکی ترەوە بە عەیبە سەیرکردنی ئەو گەنجانەی (نێر و مێ) کە تەمەنی تەقلیدی هاوسەرێتیان بڕیوە، وەك چۆن ئەم حاڵەتە لە سەرجەم کۆمەڵگە کلاسیکیەکاندا باوە.

**دووەم:** بە هۆی گرنگی نەدان بە خوێندنی منداڵان (بە تایبەت مێینە) لاوان وا لی دەکات بیر لە هاوسەرێتی بکەنەوە بێئەوەی حیساب بۆ ڕەنگدانەوەکانی لەسەر ئایندەیان بکەن، لەلایەکی ترەوە ئامانج لە بیرۆکەی هاندانی هاوسەرێتی پێشوەخت باشکردنی باری ئابوورییە، چونکە هەندێکیان باوەڕیان وایە زۆری منداڵبوون زۆریی هێزی کاری لێ دەکەوێتەوە، کە دەبێتە هۆی زیاترکردنی بەرهەم چ لەلایەنی کشتوکاڵیەوە بێ (کە چالاکی ئابووری سەرەکی کوردەکان بوو پێش ڕەوکردنیان بۆ لوبنان) یان بازرگانی یان پیشە و ئیش و کارەکانی تر.

**سێیەم:** گرنگی نەدان بە بەردەوامی خوێندن لە باو و باپیرانەوە بۆ نەوەکانیان ماوەتەوە، لەم حاڵەتەدا قورسایی و ناهەمواری زۆر ناکەوێتە سەر زۆری منداڵبوون، چونکە منداڵەکان گرانی دانی قیستی خوێندنگە یان کتێب و پەڕاوگە، ناخەنە سەر کەس و کاریان.

**چوارەم:** هەرکە مێینە دەگاتە تەمەنی باڵقبوون، بیرۆکەی «ناموس پارێزی» دێتە ئاراوە، بۆیە پەلە ئەکەن لە بەشوودانیان، ئەم حاڵەتە لە زۆربەی کۆمەڵگا کۆنەکاندا باو بووە و تا ئێستاش لە هەندێك لەو کۆمەڵگایانە بەربڵاوە. ئەمە سەرەڕای ئەو عەقڵیەتە کۆنە (کە ئێستا تا ڕادەیەك نەماوە) کە پاڵی بە پیاوانەوە دەنا کچە تازە پێگەیشتووەکان بە باشتر بزانن بۆ هاوسەرێتی، ئەمە وەکوو ڕێسایەك خۆبەخۆیی ماوەتەوە.

**پێنجەم:** بەو پێیەی کە کوردەکان کەمینەیەکی نەتەوەیین (ئەگەرچی بە شێوەیەکی ڕێژەیی تێکەڵ بوون بە کۆمەڵی لوبنانی) بۆتە پاڵپێوەنەرێك بۆ هاندانیان لەسەر ژن خواستن بۆ فراوانکردنی نفووزی بەشەرییان لەنێوان ئەو زۆرینەیەی تێیدا دەژین، ئەم ڕایە پیاوە بەتەمەنەکان لەسەری کۆك بوون.

**شەشەم:** لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵێکی موحافیزکار و دیندارن، تاکە چارەسەری بۆ پڕکردنەوەی ئارەزووە فسیۆلۆجیەکان، هاوسەرێتیە. بۆیە ڕادەی سەڵتیی نێرینە و مێینە دادەبەزێ.

بەڵام بەپێی توێژینەوەیەکی مەیدانی کە لەنێو کوردەکانی لوبنان کراوە، دەرکەوتووە کە دیاردەی هاوسەرێتیی پێشوەخت لەلای هەردوو ڕەگەزی نێرینە و مێینە لە پاشگەزبوونەوە دایە. دیارە ئەمەش چەند هۆکارێکی لە پشتە کە لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە دەتوانین ئاماژە بکەین بە:

ـ دابەزینی ڕێژەی نەخوێندەواری(نێر و مێ) بووە هۆی بەرزبونەوەی ئاستی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و لە ئەنجامدا دواکەوتنی تەمەنی هاوسەرێتی. لەلایەکی ترەوە گەشەکردنی ئارەزوو و ئامادەیی باوکان بۆ بەردەوامی دان بە خوێندنی منداڵەکانیان (بەتایبەت مێینە) بە ڕێژەیەکی زۆر باش یارمەتیدەر بوو بۆ بەگەڕ خستنی چالاکیی فیکری مێینە تازە پێگەیشتووەکان لە خوێندنگە، لە بری ئەوەی پێشوەخت بە شوو بدرێن.

ـ دابەزینی ئاستی بژێوی لە لوبنان بە گشتی، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هاوبەش بوو لە دواکەوتنی تەمەنی هاوسەرێتی نێوان زۆربەی توێژەکانی کۆمەڵی لوبنانی، بۆیە ئەم ڕەوشە لەسەر گەنجە کوردەکان (نێر و مێ) پراکتیزە دەبێ، کە پێیان وابوو هاوسەرێتی لە سایەی ئەم بارودۆخە نالەبارەی ژیان کارێکی گرانە، بۆیە وای لێ کردن وەستانێکی کاتی نائاسایی بکەن پێش ئەوەی دەست بە پرۆژەی لەو جۆرە بکەن، لەئەنجامدا تەمەنی هاوسەرێتی

لای هەردوو ڕەگەزەکە دوا دەکەوێ.

ـــ هەروەها ئەو ڕەوشە ئاڵۆز و خەتەرناکەی لە ساڵانی شەڕی ناوخۆدا کەوتەوە باری ناسەقامگیری، کە لوبنانیەکان بە گشتی تێیدا دەژیان، لاوانی دوودڵ و ڕاڕا کرد و خستیانیە داوی ئایندەیەکی نادیارەوە، بە تایبەت ئەو کوردانەی کە لە ساڵانی شەڕی ناوخۆدا (بە تایبەت شەری ساڵانی ١٩٧٥ و ١٩٧٦) دووچاری زنجیرەیەك کوشتار و کۆچ پێکردن بوون لە ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان لە لوبنان وەکوو: برج محمود، الکرنتینا، المسلخ، تل الزعتر... و ئەوانیتر. بێگومان ئەم حاڵەتە هاندەر نیە بۆپرۆسەی هاوسەرێتی و گەشەکردن لە سایەی ترس و ڕاڕایی بەردەوام، کە دەبێتە هۆی دواکەوتنی تەمەنی هاوسەرێتی.

ـــ جێگیربوونیان لە شارەکان، بە تایبەت شاری بەیرووت، شێوازێکی نوێ و دیدێکی جیاوازی بۆ ژیان پێبەخشین، لەوانە بیرۆکەی دواخستنی تەمەنی هاوسەرێتی لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە لەلایەك و لەبەر هۆشیاریان بۆ خەتەرناکی هاوسەرێتی پێشوەخت و ڕەنگدانەوە نێگەتیفیەکانی لەسەر ژیانی هاوسەرەکان لەلایەکی ترەوە، کە بۆ ئەوەی ئایندەش دەمێنێتەوە و زۆربەیان درکیان بەو کێشانە کردووە کە لە ئەنجامی تێنەگەیشتنی هاوسەرەکان لەیەکتری پێش هاوسەرێتیان دەکەوێتەوە کە زۆرجار لە حاڵەتی هاوسەرێتی پێشوەختدا ڕوو دەدات، چونکە هاوسەرەکان لەتەمەنێکدان یارمەتیدەر نیە بۆ تێگەیشتنیان لە ژیان و کێشەکانی.

باس لە تێکرای تەلاق و هۆکارەکانی و هەروەها دیاردەی فرەژنی لەنێو کوردەکانی نیشتەجێی لوبنان ناکەین و داوا لە خوێنەران دەکەین بۆ ئاگادار بوون لەم بابەتانە لاپەڕەکانی ١١٧ هەتا ١٢٧ی کتێبی (کورد، گەلی مەینەتییەکان) بخوێننەوە. بەڵام لێرەدا بە کەڵك وەرگرتن لە هەمان سەرچاوە، باس لە بابەتێکی گرنگ دەکەین کە ئەویش کێشە کۆمەڵایەتییەکانی کوردەکان لەو وڵاتە دایە.

### أ. پزیشککاری و چاکبوونەوە (چارەسەر وەرگرتن)

ئەو کوردانەی ئیش و کاری سەربەست دەکەن یان لە کەرتی تایبەتدا کار دەکەن، بەدەست کێشەی چاك بوونەوەوە دەناڵێنن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بێبەشبوونیان لە ڕەگەزنامەی لوبنانی و کاریگەریی لەسەر قەیرانە کۆمەڵایەتییەکان، کە گرنکترینیان لایەنی تەندروستیە. هەرچەندە کۆمەڵەی خێرخوازی کوردی لوبنانی توانی لە ساڵی ١٩٦٧ بنکەیەکی تەندروستی دابمەزرێنێت (کە ساڵی ١٩٦٨ خرایە سەر بوژانەوەی کۆمەڵایەتی)، هەروەها ساڵی ١٩٧١ یادداشتنامەیەکیان بە وەزیری تەندروستی گشتی دەرکرد. تییدا مۆڵەت دەدا بە کوردە بێڕەگەزنامەکان، چارەسەر لە سەرجەم دامەزراوەکانی وەزارەتی تەندروستی وەربگرن بەرامبەر بە پشتگیریەکی ـــ ناساندنێکی ـــ کۆمەڵە بۆیان، لەلایەکی ترەوە نەخۆشخانەکانی سەر بە کۆمەڵە جیاجیاکانی کوردەکان لە تواناییاندا نەبووە بە تەواوی پێداویستییەکانی نەخۆشەکان دابین بکەن لەم بارەیەوە پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی کۆمەڵەی ـــ الارز ـ بکەین، لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان کە ئەگەرچی هەموو جۆرە پسپۆرییەکیان ناگرێتەوە، بەڵام بەرامبەر وەرگرتنەکەی شتێکی ڕەمزیە و تەنها بۆ دابینکردنی کرێی ماندووبوونی ئەو پزیشکانەیە کە لەوێ کار دەکەن (دیارە ئەم بابەتە ساڵی ١٩٩٩ نووسراوە و سروشتیە تا ئێستا هێندێك گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێ).

### ب. نیشتەجێبوون

دیارترین کێشە کە ڕووبەڕووی کوردەکان بۆتەوە تا ئێستا بەردەوامە، کێشەی نیشتەجێبوونە. بە تایبەت پاش ئەوەی وەزارەتی کاروباری کۆچبەرەکان دەستی کرد بە دانی قەرەبوو بەرامبەر بە چۆلکردنی خانووبەرە داگیرکراوەکان. ئەم

قەرەبووکردنەوەیە بەشی دابینکردنی خانووبەرەی دیکەی نەدەکرد تەنانەت لە دەرەوەی پایتەختیشدا، بۆیە زۆربەی ئەو خێزانانەی کە خانووبەرەکانیان چۆڵ کرد پاشان خانوویان بە کرێ گرتووە، کێشەکە دوا خرا تاوەکوو بڕە پارەکە خەرج کرا.

لەلایەکی ترەوە کێشەی نیشتەجێبوون تەنها تایبەت نییە بەو خێزانانەی کە دەرکراون و ئەو خانوانەی کە داگیریان کرووە و چۆڵ کراوە. بەڵکوو خاوەنداره کۆنەکانی خانوبەرە لە بەیروت پاش پرۆسەی هاوسەرێتی نەوەکانیان دووچاری ئەم کێشەیە دەبەوە، و لە دەرەوەی پایتەخت بەدوای خانووبەرەدا دەگەڕێن ( لەبەر کەمی تێچوونەکەی بە بەراورد لەگەڵ پایتەختدا) هەروەها ڕێگا چارەیەکی تر هەیە لەپێش هەموویانەوە، ئەوەیە کە کۆچبەرەکان بۆ دەرەوەی وڵات خانووبەرەکانیان بە شێوەیەکی کاتی دەدەنە ئەو خێزانانە تاوەکوو خانووبەرەیەکی هەمیشەیی دابین بکەن...

### ج. بەدەستهێنانی ڕەگەزنامەی لوبنانی

لە سەردەمی ڕەوکردنیانەوە بۆ لوبنان لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، کوردەکان کێشەی ڕەگەزنامەیان هەیە، کە بە شێوەیەکی نەگەتیڤانە لەسەر ڕەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووریان ڕەنگی داوەتەوە.

بەڵام سەبارەت بە هۆکارەکانی بێبەشبوونیان لە ڕەگەزنامە، کۆچبەرە سەرەتاییەکان بن یان نەوەکانیان کە لە لوبنان لەدایك بوون، دەتوانرێ لە پارێزگاریکردن لە هاوسەنگی تایەفەگەریدا کە شێوازی بەڵێننامەی ١٩٤٣ بڕیاری لێدا کورت بکرێتەوە، وەکو چەند کەمینەیەکی دیکە لەوانە عەرەبەکانی وادی خالد ئەگەرچی نزیکەی ٧٠٠ ساڵە لەو ناوچەیەدا بوونیان هەیە، خەڵکی ـ القری السبعه ـ کە لە سێی شوباتی ١٩٢٢ پاش ڕێکەوتنی (

بولیـد ـ نیـو کامـپ) نێـوان مەندووبـی بەریتانـی و فەرەنسـا لـە دەوڵەتـی لوبنانـی گـەورە جیـا کرایـەوە و لـە ٣٠ی ئابی ١٩٢٤ خرایە سـەر خاکی فەڵەسـتین، هەروەها عەلەوییەکانـی شـاری تەرابلـووس و قـەزای عـەکار. هەروەها بەپێـی توێژینەوەکی مەیدانـی دەرکەوتـووە تاوەکـو سـاڵی ١٩٤٤ تەنهـا ٢٩,٧٪ی کوردەکانـی لوبنـان ڕەگەزنامـەی لوبنانیـان وەگرتبـوو.

ئەم ڕێژەیە ڕەگەزنامەی لوبنانیان بەپێی ئەم مەرسوومانە بەدەست هێناوە:

ـ مەرسـومی ژمـارە ٨٨٢٧ کە لە ڕێکەوتی (١٩٣٢/١/١٥) لە سـەردەمی سـەرۆك (شـارل دبـاس) دا دەرچـووە و نزیکـەی ٣٥ خێزانـی کـوردی لوبنـان ڕەگەزنامـەی لوبنانـی بەپێـی ئـەم مەرسـوومە وەرگرتووە.

ـ سـاڵی ١٩٤٨ و لـە سـەردەمی سـەرۆك (بشـاره الخـوری) دا نزیکـەی ٨٥ خێزانـی کـورد ڕەگەزنامـەی لوبنانیـان بەدەسـتهێنا، بـە پشـتگیری بەهێـزی سـەرۆك (سـامی الصلـح) لـە نـاوەوەی ئەنجوومەنـی پەرلەمـان و لـە دەرەوەی بەپێـی چەنـد حوکمێکـی قەزائـی کـە پشـت بـە مـاددەی یەکەمـی بڕیـاری ٢٨٢٥ی ڕێککەوتنامـەی لـۆزان دەبەسـتێت کـە لـە دەقێکدا هاتـووە: هەموو ئەو کەسـانەی پـاش مێـژووی ٣٠ ئابـی ١٩٢٤ لەسـەر خاکی لوبنان بوون و پێشـتر سـەر بـە تورکیا بـوون، بـە هێـزی یاسـا بـە لوبنانـی لەقەڵـەم دەدرێـن.

ـ بـەڵام سـەبارەت بـە ڕێـژەی زۆری ڕەگەزنامـە پێـدراوە کـوردەکان لـە سـاڵی ١٩٥٦ بـوو کاتێـك کە نزیکـەی ٢٠٠ خێزانی کورد ڕەگەزنامـەی لوبنانیان پێبەخشرا بەپێـی مەرسـومێکی کۆماری لە سـەردەمی سـەرۆك (کامیل شـمعون) و سـەرۆکی حکومـەت ـ عبداللـه اليافـی ـ دا دەرچووە.

ـ لـە سـاڵی ١٩٩٤ مەرسـومێك بـە ژمـارە ٥٢٧٤ لـە مێـژووی ٢٠ی حوزەیـران دەرچـوو، بەپێی ئەم مەرسـوومە نزیکـەی (١٠) هەزار کـوردی لوبنانی ڕەگەزنامەی لوبنانیـان پێبەخشرا.

بەڵام ئەو کوردانەی تا ئێستا ڕەگەزنامەیان پێنەبەخشراوە، ڕێژەکەیان ٦،٦٪ی کۆی گشتی کوردەکانی لوبنان تێناپەڕێ، بەم شێوەیە دابەش دەبن: زۆربەیان ڕەگەزنامەی (لەژێر لێکۆڵینەوە دایە) هەڵدەگرن وباقیەکەیان ـ تۆمارکردنەکەیان ـ یان فەوتاوە یان لەناوچووە، یان ڕەگەزنامەی تورکی یان سووری هەڵدەگرن.

سەبارەت بە ڕەگەزنامەی (لەژێر لێکۆڵینەوە دایە ـ قید الدرس ـ) بۆ ئەوە بڵاو کرایەوە ژمارەیەکی زۆر لە منداڵانی کوردەکان مافی وەرگرتنی ڕەگەزنامەی لوبنانیان بفەوتێ. لە ڕێکەوتی ١٩٦١/١١/٤، پاش گفتوگۆ کردن و ڕاوبۆچوون گۆڕینەوە لەگەڵ سەرۆکی حکومەت خوالێخۆشبوو (ڕەشید کرامی)، وەزیری ناوخۆ کارتێکی ئیقامەی بەردەوامی لە ئاسایشی گشتیەوە بەخشی بە کوردەکان کە بە کارتی دیاری نەکراو ـ غیر معینە ـ ناوزەد دەکرێ، هەڵگرانی ئەم کارتە دەتوانن ڕەگەزنامەی لوبنانی بۆ منداڵەکانیان وەربگرن بەپێی ماددەیەك لە یاسای ڕەگەزنامەی لوبنانی کە لە دەقەکەیدا هاتووە: «هەموو ئەو کەسانەی لەسەر خاکی لوبنان لەدایك و باوکێکی ڕەگەزنامەی دیاری نەکراو لەدایك دەبن، بە لوبنانی لەقەڵەم دەدرێن». پاش ئەوەی کە زۆر لە کوردەکان سوودیان لەم بڕیارە وەرگرت و بەپێی ئەحکامە قەزائیەکان، ڕەگەزنامەیان بۆ منداڵەکانیان بەدەست هێنا، بەبێ ئاگای خۆیان ئەو کارتانەیان لێسەندرایەوە و کارتی ـ لەژێر لێکۆڵینەوەدایە ـ یان پێدرا.

جێی باسە ڕێژەی ٩٠،١٪ی کوردەکان لە لوبنان لەدایك بوون، تاوەکوو بەساڵاچووانیش ئەوانەی تەمەنیان نێوان (٦٠ ـ ٦٩) ساڵە، ڕێژەی ئەوانەیان کە لە دەرەوەی لوبنان لەدایك بوون لە نیوە تێناپەڕێ، هەموو ئەم ساڵانە و تاوەکوو ١٩٩٤ بەبێ ڕەگەزنامە مانەوە، بۆیە هەندێ لە کوردەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە پەنایان بردۆتە بەر گۆڕینی مەزهەبەکەیان و بەم کارە توانیویانە ڕەگەزنامەی لوبنانی بەدەست بێنن، بۆ نموونە کەسێك دەبینیت بە ناوێکەوە کە

بەڵگەی ئینتیمایەتی بۆ ئایینێك، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبینین مەزهەبەکەی لەسەر ناسنامەکەی بە تەواوی جیاوازە، ئەمە بەڕاستی لە یەکی شوباتی ١٩٥٦ ڕوویدا کاتێك کە ١٧ لاوی کورد لەگەڵ خێزانەکانیاندا ڕەگەزنامەی لوبنانیان پێبەخشرا، پاش ئەوەی لەسەر ئایینی ئیسلام مەزهەبی سووننە خۆیان گۆڕی بۆ تایەفەی مارۆنی (ڕۆژنامەی النهار ـ بەیروت ـ ژمارە، ئازاری ١٩٥٦).

**● تێکەڵبوونی کوردەکان بە کۆمەڵگەی لوبنانی**

*ئا ـ ئینتیمای لوبنانی*

کاتی باسکردن لە ڕەوشی کۆمەڵایەتی کوردەکان دەبێ هەڵوێستەیەك لەسەر بیرۆکەی وەرگرتن ـ تەقەبول ـ و تێکەڵبوون بە کۆمەڵی لوبنانی بە هەموو چین و توێژەکانەوە بکرێ، لەم بارەیەوە بیروڕای جیاواز لەنێو کوردەکانی نیشتەجێی لوبناندا هەیە. بەشێك لەو کوردانە پێیان باشە لە لوبنان سەقامگیر و نیشتەجێ بن و گەڕانەوە بۆ کوردستان بە باشتر نازانن. لە بەرامبەریشدا بەشێکیان بە تایبەت ئەوانەی ڕەگەزنامەی لوبنانی هەڵناگرن، پێیان باشە بگەڕێنەوە بۆ کوردستان.

لە سەروبەندی باسکردن لە ئینتیمای نیشتمانی کوردەکانی لوبنان دەبێ جەخت لەسەر مەحاڵیی سڕینەوەی ئینتیمایان بۆ نەتەوەی کورد لەلایەك و بۆ ئیسلام لەلایەکی دیکە بکرێ. ڕێژەیەکی زۆر لە کوردەکان لە کاتی خۆناساندنیاندا هەروا خۆیان بە کورد دەزانن، واتە بەشێکیان خۆیان بە کوردی لوبنانی و بەشێکیشیان خۆیان تەنها بە کورد دەزانن. لە بەرامبەریشدا ڕێژەیەکی کەم خۆیان بە (لوبنانیی بە ڕەچەڵەك کورد) دەناسێنن. لەڕاستیدا ئەمە بەڵگە و نیشانەی پابەندبوونی کوردەکانە بە ڕەچەڵەکی خۆیانەوە، بێئەوەی ئەم حاڵەتە دژوار بێت لەگەڵ ئینتیمایان بۆ لوبنان.

***ب ـ تێکەڵاویی نیشتەجێبوون***

سەبارەت بە نیشتەجێبوون، ڕێژەیەکی زۆر لە کوردەکان پێیان باشە لە ناوچەیەکی تێکەڵ لە کوردەکان و لوبنانیەکان نیشتەجێ بن. لە بەرامبەریشدا بەشێکیان پێیان خۆشە لە ناوچەیەکی تایبەت بە کوردەکان نیشتەجێ بن.

... کوردەکان وای دەبینن ڕێژەی ئەو لوبنانیانەی وەکو لوبنانی سەیری کوردەکان دەکەن، زۆر زۆر کەمە. بەڵام ڕێژەی ئەوانەی وەکوو غەریب (نامۆ) تەماشای کوردەکان دەکەن، زۆر زۆر زیاترە...

### ج- هاوسەرێتی لەگەڵ تایەفەکانی تر

لە سەروبەندی باسکردن لە تێکەڵبوون بە کۆمەڵی لوبنانی، دەبێ بیرۆکەی هاوسەرێتی لەگەڵ تایەفەکانی تر بخرێتەڕوو، بۆ دەرخستنی ڕادەی تەقەبولی کوردەکان بۆ بیرۆکەی توانەوە لە کۆمەڵی لوبنانیدا بە هەموو تایەفە و مەزهەبەکانیەوە. لەم بارەوە دەرکەوتووە کە کوردەکان کۆمەڵێکی کراوەن بەرامبەر بە زۆربەی تایەفەکان بە تایبەت موسوڵمانەکان، بەپێچەوانەی ئەو بیروباوەڕەوە کەوا باو بوو کوردەکان کۆمەڵێکی داخراون بە تایبەت لە حاڵەتەکانی هاوسەرێتیدا. بەپێی توێژینەوەیەك دەرکەوتووە کە ٦٢٪ی کوردەکان بیرۆکەی هاوسەرێتی لە تایەفەی سوننی قبووڵ دەکەن، بەرامبەر بە ٢٤٪ کە ڕەتی دەکەنەوە و ٣٨٪ی کوردەکان هاوسەرێتی لە تایفەی شیعە قایل دەبن و ٤٠٪ ڕەتی دەکەنەوە. هەروەها پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کەوا ڕێژەی ١٠٪ی کوردەکان بە هاوسەرێتی لە مەسیحی (بە نێر و مێ)وە قایل دەبن...

### د- داب ونەریتەکان

سەبارەت بە تێکەڵبوون لە گۆشەنیگای دابونەریتەکانەوە، جیاوازیەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا کەم بوونەتەوە بە تایبەت لەنێوان نەوەی گەنجەکاندا، بۆ نموونە لەبارەی جلوبەرگ، پیاوان تۆزێك جیاواز بوون (بەلای کۆنیدا)،

بەڵام جیاوازی ڕوون و ئاشکرا لە جلوبەرگی ژناندا بەدەر دەکەوێ، کە زیاتر ئارەزوویان لە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگە، کە ڕەنگە زەقەکانی تێدا زۆرە. هەروەها ژنی کورد جۆرێك مێزەر دەبەستێت بەسەریەوە، کە ڕەنگەکەی سپییە و کوتاڵەکەی نەرمە. هەروەها ئەو کچە کوردانەی کە حیجاب ناپۆشن، لەڕووی جل وبەرگەوە، لەگەڵ باقی کچەکانی لوبناندا هیچ جیاوازییەکیان نییە، تا ڕادەیەك ناتوانرێ جیا بکرێنەوە. بەڵام ئەوانەی پابەندن بە ئایینەوە، سەرپۆشێك دەپۆشن هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو سەرپۆشەی کچێکی لوبنانی پابەند بە ئایینەوە دەیپۆشێ. هەروەها ڕێژەی ئەو کوردانەی پابەندی دابونەریتی کوردی و عەرەبین (پێکەوە) زیاترە لە ڕێژەی ئەوانەی دابونەریتە کوردییەکان پیاد دەکەن، کە ئەمەش بەڵگەی پلەیەکی باشی پێشکەوتنە لە تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتیدا.(١٤)

● **ڕەوشی ئابووری کوردەکانی لوبنان:**

ئەم بەشە باس لە تێکڕای چالاکیە ئابوورییەکان و دابەشبوونی هێزی کار بەسەر بەشەکانی چالاکیەکاندا، هەروەها ئامادەباشی هێزی کاری کوردی بۆ پیشە وەرگرتن دەکات و تیشك دەخاتە سەر ئیشکردنی مێینە، هەروەها توێژینەوە لە کێشەی بێکاری و بارودۆخی دروستبوونی و کارکردن لە دەرەوەی تەمەنی کارکردن، دەکات.

***ـ تێکڕای چالاکیی ئابووری***

سەبارەت بە چالاکی ئابووری، ڕووکردنێکی تێبینیکراو بۆ ئیشکردن لە بواری فەرمانبەریتی و پیشە دەستیەکاندا هەیە.

***ـ دابەشبوونی هێزی کاری کوردی بەسەر بەشەکانی چالاکیدا***

هێـزی کاری کـوردی بەسـەر سێ بەشـە سـەرەکیەکەی چالاکیـدا بەم شـێوەیە دابـەش دەبێـت: کەرتـی بازرگانـی و خزمەتگـوزاری، کەرتـی پیشەسـازی و پیشـەوەریەکان و کەرتـی کشـتوکاڵی و ڕاوکـردن. بەشـێکی زۆری پیاوانـی کارکەر بازرگانـی سـەوزەن (بەکـۆ) کـە ڕۆڵێکـی گرنگیـان هەیـە لـە کڕیـن و فرۆشـتنی (هەنـاردە و هـاوردە)ی سـەوزە و میوەدا، هەروەها کاریگەریان لەسـەر پرۆسـەکانی داوا و خسـتنەڕوو لـە بازاڕەکانـی سـەوزە و میـوەدا ناشـاردرێتەوە. مەسـەلەی سـەرنجڕاکێش لەوەدایـە کە ئـەم پیاوانە لە بازرگانـی گەڕۆکەوە دەسـتیان پێکردووە تـا گەیشـتوونەتە ئەم حاڵەتەی ئێسـتا پێی گەیشـتوون لـە هێزی ئابـووری، هەروەها چەنـد پیـاوی کارسـاز ـ رجال اعـمال ـ یێك هـەن کە کۆمپانیـای بازرگانیـان هەیە...

دەبـێ ئامـاژە بـەوە بکـرێ کـە هـەردوو پیشـەی دەلاکـی (سەرتاشـی) و بەرگدروویـی تایبەتـە بە لاوەکانـەوە. بەپێـی توێژینەوەیەکی مەیدانـی دەرکەوتووە کـە ڕێـژەی ٨٥،٦٪ی بەرگـدرووەکان تەمەنیـان لـە ٢٤ سـاڵ تێناپـەڕێ و ڕێـژەی ١٠٠٪ی سەرتاشـەکان تەمەنیـان لـە ٢٩ سـاڵ کەمـترە. ئـەم دیاردەیـە دەمانگەیەنێتە ئـەو دەرئەنجامـەی کـە ئەم دوو پیشـەیە نوێن بـە نیسـبەت کوردەکانەوە بە بـەراورد لەگـەڵ پیشـەی سـەوزەفرۆشـی (لەسـەر عەرەبانـە) کـە ڕێژەکـەی لـە دەسـتە تەمەن بچووکەکانـدا دادەبـەزێ بـۆ ١٣،٣٪ لـە دەسـتەی تەمەنـی (١٥ ـ ١٩ سـاڵ) و لـە گرووپـی تەمەنـی (٥٥ ـ ٥٩) سـاڵی دەگاتـە زۆرتریـن ڕێـژە کـە (١٨،٦٪)ـە...

بەڵام سـەبارەت بە پیشـەی دارتاشـی کە زیاتر لە دەروازەکانی شـاری بەیرووتدا، کـە ڕێژەیەکـی بەرچـاو کـوردی تێـدا نیشـتەجێیە، بـڵاو دەبێتـەوە، بـە تایبـەت لە ـ الجنـاح و گەڕەکـی السـباعی لـە بـرج البراجنـە ـ ئەوانەی لـەم پیشـەیەدا کار دەکەن نزیکـەی ٢٥،٤٪ی کـۆی گشـتی هێـزی کاری نێرینـە لـە ناوچـەی بـرج البراجنـە پێکدێنن....

### ـ گۆشکراوەیی پیشەیی هێزی کاری کوردی

زیاتر لە سێ لەسەر چواری هێزی کاری کوردی لە لوبنان لەڕووی زانستی و تەکنیکیەوە گۆشکراو نین بۆ کارکردن. بەپێی توێژینەوەیەکی مەیدانی دەرکەوتووە کەوا کوردەکان لەو بوارە پسپۆڕیانە کار دەکەن کە کەمترین ئاستی زانستی گەرەکە؛ ژمێریار، بەسەر فرۆشگەکانەوە، کاتب (نووسەر)، ئەمینداری کۆگا، دەرچووانی زانکۆش لە بانکەکان و سەنتەرە ئیداریەکان و چەند کۆمپانیایەك کار دەکەن...

### ـ چالاکیی ئابووری مێینە

سەبارەت بە مێینە، ڕەوش و چالاکییەکانیان تا ڕادەیەك لێکدەچێ لەگەڵ نێرینەدا، بەڵام ژمارەی مێینە کارکەرەکان کەمترە لە هی نێرینە. بەڵام سەبارەت بە چالاکیی ئابووریی مێینە، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە ئاستی ڕۆشنبیری و زانستییەوە. بەپێی توێژینەوەیەکی مەیدانی دەرکەوتووە ڕێژەیەکی زۆری مێینە لە ئیش و کاری لاوەکی (کرێکاری) دا کار دەکەن، وەك ئاشکرایە ئەم پیشە دەستیە هیچ زانیاری و شارەزاییەکی تەکنیکی یان زانستی گەرەك نیە، بەڵکوو زۆربەی ئەوانەی لەم بوارەدا کار دەکەن لە نەخوێندەوارانن یان لەوانەن کە قۆناغی سەرەتاییان نەبڕیوە، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ڕێژەی کرێکاران لەگەڵ پێشکەوتنی ئاستی زانستیدا کەم دەکات.

سەبارەت بە فەرمانبەران کە ڕێژەیەکی کەم لە کۆی گشتی هێزی کاری مێینە پێك دێنن، ڕێژەیان بە گەورەبوونی تەمەن دادەبەزێ، واتە ئەم دیاردەیە پێچەوانەی دیاردەی ئەو مێیانەیە کە هەڵدەسن بە ئیش و کاری لاوەکی.

لەلایەکی دیکەشەوە (وەك ئەم حاڵەتە لای نێرینەش وابوو)، چەند پیشەیەك هەیە نوێیە سەبارەت بە مێینە، بۆ نموونە: بەرگدروویی و فەرمانبەرێتی بە

هەموو جۆرەکانیەوە. ..

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە بابەتی ڕەوشی ئابووریدا پێویست بوو زۆر بابەتی وەك تێکڕای داهاتی تاکەکەس، هۆکارەکانی دابەزینی تێکڕای ئەم داهاتە، ناوەندی داهاتی تاکەکەس، ناوەندی داهاتی خێزان، ئەوانەی لە دەرەوەی تەمەنی کارکردن کار دەکەن، کارکردنی منداڵان و چەند بابەتی تری پێوەندیدار بە ڕەوشی ئابووری بکرێ بەڵام بۆ خۆپاراستن لە درێژبوونەوەی باسەکە واز لەم بابەتانە دێنین و خوێنەرانی خۆشەویست دەتوانن بۆ زانیاری زیاتر کتێبی (کورد گەلی مەینەتییەکان) کە لە بەشی سەرچاوەکاندا بە تەواوی ئاماژەی پێدەکرێ، بخوێننەوە.

**● ڕەوشی سیاسیی کوردەکانی لوبنان**

سەبارەت بە چالاکیە سیاسیەکان، هەروەکو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان ئەویش پێش شەستەکانی سەدەی پێشوو بەدەر نەکەوتووە و تەنها ئەوە نەبێ کە دۆزی کورد لەڕێگەی چەند ئامرازێکی ڕاگەیاندنەوە دەخرایەڕوو، بۆ نموونە دەرکردنی گۆڤاری (هاوار) لەسەر دەستی میر جەلادەت بەدرخان لە ساڵی ١٩٢٣ ، کە بە زمانی کوردی زاری کرمانجی و بە بەکارهێنانی ڕێنووسی لاتینی بڵاو دەکرایەوە. ئامانجی ئەم گۆڤارە زیندووکردنەوەی زمان و کەلتووری کوردی بوو، هەروەها میر کامەران بەدرخان لە ساڵی ١٩٤٣ گۆڤارێکی بە ناوی «ڕۆژا نۆ ـ ڕۆژی نوێ» وە دەردەکرد و نزیکەی ٧٣ ژمارەی لێ دەرچوو و لە ساڵی ١٩٤٦ لە دەرکردن وەستا، هەروەها ئەو گۆڤارەش بە زمانی کوردی و زاری کرمانجی و بە ڕێنووسی لاتینی بڵاو دەکرایەوە، وەکو (هاوار) هەوڵی بزواندنی هەستی نەتەوەیی کوردی دەدا، لە ڕێگەی جەختکردن لەسەر کلتوور و مێژوو و ئەدەب.

لەلایەکی ترەوە، چالاکی سیاسیی کوردەکان لە هاوبەشیکردنی نەهامەتی لوبنانیەکاندا بەدی دەکرێ، ڕۆڵی خۆیان هەبوو، ئەگەر بە شێوەیەکی لاوەکیش لە شەڕی سەربەخۆیی و لە بەرەنگاربوونەوەی سەربازە سینگالی یەکان، کاتێ کە یەکێك لە پیاوە کوردەکان بە ناوی (عبدالكريم عتريس)ـەوە سەرکەوت بەسەر بینای پەرلەمان و ئاڵای فەرەنسای داگرت و ئاڵای لوبنانی بەرز کردەوە، وەك دەوترێ ئەو یەکەم کەس بوو ئاڵای فەرەنسای داگرت.

لە ئەنجامدا پاش ئەوەی بەشێکی زۆری کوردەکان ڕەگەزنامەی لوبنانییان بەدەست هێنا، لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداریان کرد، پشتی سەرۆکی کۆچکردوو ( سامي الصلح )یان گرت وەکو وەفایەك بۆ پشتگیریکردنی ڕاستەوخۆی کوردەکان لە ساڵی ١٩٤٨ بۆ بەدەستهێنانی ژمارەیەك ڕەگەزنامەی لوبنانی بۆ خێزانە کوردەکان، بەڵام پاش ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٥٨ و بە هۆی جیاوازی هەڵوێستە سیاسییەکانی نێوان کوردەکان و سەرۆك (سامي الصلح)، کە ئەوکات ئۆپۆزیسیۆنی سەرۆك کمیل شمعون نەبوو، پشتیان تێکرد و زۆربەیان بوون بە لایەنگری سەرۆك (صائب سلام) و بەڕێز عدنان الحكيم (سەرۆکی پێشووی حيزبی النجادە)، لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی خولی ١٩٦٤، ١٩٦٨ و ١٩٧٢.

لەلایەکی ترەوە، بەشداریکردنی کوردەکان تەنها ئەوە نەبوو وەکو دەنگدەرێك دەنگەکانیان بدەن، بەڵکوو لەنێوانیاندا پاڵێوراوی خۆیان هەبوو و لە چەندین خولدا بەشداریان کرد، ئەگەرچی سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. لە ساڵی ١٩٦٨ بەڕێز جميل محو (سەرۆکی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان) لە بازنەی دووەمی بەیروت بۆ کورسی سوننییەکان لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکاندا خۆی کاندید کرد، ساڵی ١٩٩٢ بەڕێز (وهاج الشيخ موسى) بۆ کورسی سونیەکان لە بازنەی بەیروت، دووبارە لە خولی ساڵی ١٩٩٦دا خۆی کاندید کردەوە، بەڵام بەخت یاوەری نەبوو، هەروەها لە هەمان خولدا

و بۆ کورسی سونیەکان لە بەیروت شێخ احمد العمری خۆی کاندید کرد، بەڵام ئەمیش بەخت یاوەری نەبوو. شایانی وتنە لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گەڕەکەکاندا سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنا، ئەویش بە هەڵبژاردنی (غازی الشریف) بە ئەنجومەنی گەڕەکی (زقاق البلاط) لە ساڵی ١٩٦٢.

بەڵام سەبارەت بە چالاکیی سیاسیی کوردەکان لە لوبنان، لەڕێگەی دامودەزگای ڕێکخستنی تایبەت بە خۆیان، لەسەرەتای شەستەکاندا و لەگەڵ دامەزراندنی (ڕێکخراوی لاوانی کوردستان) و (پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان) دەستی پێکردووە. لەو کاتەدا بەشداریکردنی ڕاستەوخۆ کوردەکان لە ژیانی سیاسی لوبناندا دەستی پێکرد، بەدەرکردنی بڵاوکراوەی دەوری و بەیاننامە بۆ ڕوونکردنەوەی وەزعی جالیەی کوردی هەروەها پابەندبوون بە هەڵوێستە سیاسییەکانەوە، لەم ڕێکخراوانەی تایبەت بە لاوانە ئیش و کاری سیاسی برەوی سەند و گەشەی کرد و گەیشتە قۆناغی کامڵبوون، لەگەڵ دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردی لە لوبنان (پارتی) لە ساڵی ١٩٧٠ دا، کاتێ کە خوالێخۆشبوو کمال جەنبوولات وەزیری ناوخۆ بوو، لە سەرەتادا (جمیل محۆ) سەرۆکایەتی پارتی دەکرد و ڕۆژنامەیەکی بە ناوی «دەنگی کورد» ەوە دەردەکرد، بەڵام دیارترین هەڵوێست و ئاڕاستەکانی حیزب لەسەر ئاستی لوبنان، کارکردن بوو بۆ باشکردنی ئاستی لۆبی کوردی و پشتگیریکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی لوبنانی، لەسەر ئاستی کوردستان و عەرەب، لایەنگری ئەو ئۆتۆمیەیان دەکرد کە ئەوکات حکومەتی عێراق بە کوردستانی عێراقی دابوو، هەروەها پشتگیری گەلی فەلەستینیان دەکرد بۆ بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش، حیزب هاوسۆز بوو لەگەڵ بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی جیهان دژ بە هێزەکانی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیەت.

لە ساڵی ١٩٧٧، کوڕی سکرتێری گشتیی حیزب (محمد جمیل محۆ) کە

پلەکەی جێگری سکرتێری گشتی بوو، لە حیزب جیا بووەوە و بە هۆی ئەوەی پشتگیری شۆڕشی کوردی، بە سەرۆکایەتی (جەلال تاڵەبانی) سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەکرد و دژایەتی دەسەڵاتدارانی عێراقی دەکرد و ئەو ئۆتۆنۆمیەی کە ئەم دەسەڵاتدارێتیە بە کوردی عێراقی بەخشیبوو، ڕەتی دەکردەوە. حیزبەکەی (محمد جمیل محۆ) بە ناوی ـ حیزبی دیموکراتی کوردی لە لوبنان ـ (قیادە موئەقەتە)وە بوو، ئەم سەرکردایەتییە کاتییە بەردەوام بوو لە چالاکییەکانی تاوەکو کوشتنی سکرتێری گشتی، خوالێخۆشبوو محمد جمیل محو، لە ساڵی ١٩٨٢ لە ناوچەی ـ وادی أبو جمیل ـ کاتێ کە هەوڵی گەمارۆدانی ئیشکالێکی ئەمنی دەدا.

هەروەها نێوان ئەو حیزبە کوردیانەی لوبنان کە ناوبانگیان هەیە (حیزبی ڕزگاری کوردی لوبنانی) کە ساڵی ١٩٧٥ لەسەر دەستی فیصل فخرو (کە سەرۆکایەتی حیزبەکەی دەکرد)، عزالدین فتاح، حسن ملا، سلعت فخر دامەزرا، لەگەڵ دامەزراندنیشدا بڵاوکراوەیەك بە ناوی (خەبات)وە دەردەکرد.

حیزبی ڕزگاری بێلایەن بوو، بەلای هیچ کام لە هێزەکانی ململانێی گۆڕەپانی لوبناندا نەدەشکایەوە، تاکە حیزبە تاوەکو ئێستا بەردەوامی بە چالاکیەکانی دەدات. لە ئامانجەکانی ئەم حیزبە، هەوڵدان و ئیشکردن بۆ باشکردنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردەکانی لوبنان و داخوازی ڕەگەزنامەی لوبنانی، بەڵام لەسەر ئاستی کوردستان، «ڕزگاری» پشتگیری حوکمی زاتی کوردەکانی عێراقی کرد، کە بووە هۆی دابەشبوونی حیزب (وەك ئەوەی پارتی و بە هەمان هۆکارەوە) باڵی ـ عبدالکریم ابراهیم ـ دەرکەوت کە حوکمی زاتی ڕەت کردەوە، چونکە لەگەڵ ڕێککەوتنی حکومەتی عێراق لەلایەك و نوێنەرانی شۆرشی ئەیلوول لەلایەکی ترەوە، یەك ناگرێتەوە وپێچەوانەی یەکترە. لەگەڵ داگیرکاریی ئیسرائیل ساڵی ١٩٨٢، ڕۆڵی باڵەکەی عبدالکریم ابراهیم کۆتایی پێهات.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە چالاکیی سیاسیی کوردەکان تایبەت نەبوو تەنها بە حیزبە کوردییەکانی لوبنانەوە، بەڵکوو لە زۆر حیزبی نیشتمانی و ئیسلامیدا، درێژەیان بە چالاکیەکانیان دەدا، بۆ نموونە (پارتی پێشکەوتنخوازی سۆسیالیستی) و (الجماعە الاسلامیە). بەڵام پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆی لوبنان ڕەوشی سیاسی کوردەکان گۆڕا و وای لێ هات نزیکەی ٩٤٪ی کوردەکان باوەڕیان وایە کە بزووتنەوە سیاسییەکانی لوبنان، کوردیان پشتگوێ خستووە و هیواخوازن چینێکی سیاسی نوێ بێتە ئاراوە و هەوڵ بدات بۆ دەرکردنیان لە ەهامەتی و بێبەشبوونیان لە زۆر لایەنەوە.[..]

بابەتێکی دیکە کە پێویستە جەختی لەسەر بکرێتەوە ئەوەیە «بە زیادبوونی ژمارەی ئەو کوردانەی کە مافی هاووڵاتیبوونیان بەدەستهێنا، کاندیداکانی هەڵبژاردن دەستیان کرد بە پێوەندیگرتن لەگەڵ کوردەکان بۆ ئەوەی کە دەنگیان پێبدەن. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم کار و کردەوانە، هیچ یارمەتییەکی بە کۆمەڵگەی کورد نەدا. هۆیەکەی ئەوە بوو کە کورد یەکگرتوو نەبوون و پشتیوانیان لە پتر لە یەك کەسایەتی یان بلۆکی سیاسی دەکرد. لە ئاکامدا کورد هێزی چڕبووی خۆی ـ کە دەیتوانی بە شێوازێکی کارامە بۆ گوشار خستنە سەر زەعیە مەحەلییەکان بۆ سەندنی بەرژەوەندی لەوان، بەکار ببردرێت ـ لەدەستدا.

ئەمڕۆ ڕەوشەکە لە بەراورد لەگەڵ سەردەمی نێوان ناوەڕاستی دەیەی ١٩٤٠ و ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ زۆر نەگۆڕاوە. هەڵبژاردنە پەرلمانییەکانی ساڵی ١٩٩٢ و ١٩٩٦ نیشانی دا کە کوردەکان لە چاو جارانی پێشوو، باشتر بە ڕێکخستن کراون، بەڵام هێشتا لەنێوان خۆیاندا دابەشبوونە و بێ هیچ بەرامبەرێك یان بەرامبەرێکی کەم لە هێزی دەنگدانیان کەڵک وەردەگیرێت، تەنانەت هەوڵە جۆراوجۆرەکانیان بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلماندا هەرەسی هێناوە. بۆ نموونە تەنها کاندیدای کورد کە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ دا بەشداری

کـرد، تەنهـا ٥ هـەزار دەنگی بەدەسـتهێنا، لە حاڵێکـدا کە بۆ ئەندامبـوون لە پارلمان ١٠ هـەزار دەنـگ پێویسـت بوو. لـە هەڵبژاردنەکانی سـاڵی ١٩٩٦، ناکامەکە باشـتر نەبـوو و دەنگـی کـوردەکان پتر لـە جاران بـڵاو بوو.

هێـزی هەڵبژاردنـی کـوردەکان بـەردەوام لـە حاڵـی گەشەسـەندن دایـە، بـەڵام بەهەرحـاڵ بـە هـۆی نەبوونـی سـەرچاوە و ڕێبەرایەتی، ئـەم هێزە لەلایەن کەسـانی دیکـەوە کەڵکـی لێوەردەگیردرێـت.[١٦]

*- کورد لە میانەی شەڕی ناوخۆ ( ١٩٧٥ـ١٩٩١ ) و پاش ئەوە*

بـە گشـتی کـوردەکان هیـچ بیانوویەکیـان بـۆ بەشـداری لـە شـەڕی ناوخـۆدا نەبـوو، بـەڵام لـەدوای پاکتاوکردنـی کـوردەکان لە ڕۆژهەڵاتـی بێروت و بـە تایبەت لـە ناوچـەی ئەلقەرەنتینـا ـ ئەلمەسـلەخ لـە کانوونـی دووەمـی ١٩٧٦ بـە دەسـتی هێزەکانـی فالانـژی مەسـیحی مارۆنـی، بارودۆخەکـە گـۆڕا. دانیشـتووانی ناوچـەی ئەلمەسـلەخ کـە زۆرتـر کورد و فەلەسـتینی بـوون، ئەگـەر نێرینە بـان دەکەوتنە بەر دەسـترێژی گوللـە و ئەگـەر مێیینـە بـان، دەکەوتنـە بـەر دەسـتدرێژی و دەردەکران و شـوێنی نیشـتەجێبوونیان خاپـوور دەکـرا. تەنهـا ژمارەیەکـی کـەم توانیـان خۆیـان ڕزگار بکـەن. جانسـۆن بـە وەسـفکردنی کۆمەڵکوژییەکانـی ئەلقەرەنتینـا ئەلمەسـلەخ دەنووسـێت: «ڕاپـۆرت، فیلـم و وێنەکانی ئـەم کۆمەڵکوژییە ترسـناك بـوون. خانـووەکان هەرچەنـد کـە بایەخـی کەمیـان هەبـوو، تالانکرابـوون. تەرمـی پیـاوان و ژنـان لـە نـاو شـەقامەکاندا کەوتبـوە سـەریەك و یەکێـك لـە دانیشـتووانی گەڕەکـە پیسـەکانی شـار کچەکانـی خـۆی دایـە بـەر دەسـترێژی گوللـە تـا نەبـن بە قوربانـی دەسـتدرێژی. لـە کۆتاییـدا خانووەکانی گەڕەکـی ئەلقەرەنتینـا بەبولدوزەر ڕووخـان و مـردووەکان بـە کۆمـەڵ کرانـە ژێر خاکـەوە».

لـەدوای ئـەم کۆمەڵکوژییـە و کـردەوە بێبەزەییانەکانـی دیکـە کـە پێـش و پاش

کۆمەڵکوژی ئەنجامدرا، هەندێك لە کوردەکان بڕیاریان دا لە دژی بەرەی لوبنانی ژێر ڕکێفی مەسیحییەکان (الجبهه اللبنانیه) چەك هەڵبگرن. کوردەکان یان وەك ئەندامی حیزبە سیاسییەکانی خۆیان چەکیان هەڵگرت یان چوونە ڕیزی حیزبی شیوعیی لوبنان، بزووتنەوەی سوننەی ناسرییە سەربەخۆکان (المرابتون) و پاشان حیزبی سۆسیالیستی پێشکەوتنخوازی دەروزییەکان (الحزب التقدمیه الاشتراکی). هەروەها گەلێ لە کوردەکان چوونە نێو ڕیزی ڕێکخراوە فەلەستینییەکان بە تایبەت «بەرەی ئازادی خەڵکی فەلەستین» و «بەرەی دیموکراتیك بۆ ئازادی فەلەستین». کوردەکان ئامانجی هاوبەشیان لەگەڵ ئەم حیزبە پێشکەوتنخواز و فەلەستینیانە هەبوو، بە تایبەت لەبەر ئەوە کەوا بیریان دەکردەوە کە سەرکەوتنی ئەم هێزانە، ئەوان لە نەهامەتییە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان کە مارۆنییەکان بە سەریاندا سەپاندبوویان، ڕزگار دەکا.

لە ساڵەکانی سەرەتایی شەڕدا، ئەو کوردانەی کە لە شەڕدا بەشداریان کرد زۆتر لەگەڵ میلیشیا مەسیحییەکان لە ڕۆژهەڵاتی بێروت شەڕیان دەکرد، کەوابوو لە دوای داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٨٢، ئەو کوردانە کە لە خلدە و ناوچەکانی دەوروبەری ڕۆژئاوای بێروت دەژیان، هەم بە دەستی ئیسرائیلییەکان و هەم بە دەستی هاوپەیمانە مەسیحییە لوبنانییەکانیان دەرکران و دەستگیر کران. زۆربەی ئەو کوردانەی کە توانیبوویان پێش لە گەیشتنی ئیسرائیلییەکان هەڵبێن، چوون بۆ بێروت و ناوچەی بیقاع. پاشان لە دوای ئەوە کە ئیسرائیل پەیمانی خۆی خستە ژێر پێ و لە ئەیلولی ١٩٨٢ هاتە نێو ڕۆژئاوای بێروت و دەوڵەتێکی فالانژی لایەنگری ئیسرائیل و ئامریکا بە سەرۆکایەتی «امین جومەیل»ی دامەزراند، هێزە دەوڵەتییە مەسیحییەکان دەستیان کرد بە قەلاچۆ کردنی خەڵکە سەرپارەکانی لوبنان کە زۆرتر کورد و فەلەستینی بوون. ئەمانە کۆکرانەوە و ئەوانەی کە بەڵگەیان نەبوو گیران یان

دەرکران. لە ئاکامدا دەیان هەزار کورد و کەسانی دیکە ناچار بوون بۆ ئەورووپا کۆچ بکەن. نزیکەی یەك ساڵ دواتر هێزە میلیشیاکانی دەروزی، شیعە و سوننە کە لە لایەن سوریاوە پشتیوانیان لێدەکرا، هێزەکانی ئیسرائیلیان لە ناوچە زۆرتر موسڵمان نشینەکان کردە دەرەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣، بزووتنەوەی «ئەمەل» واتا هێزی سەرەکی میلیشیا شیعەکان دەستی کرد بە پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی بەو مەبەستە کە بە نوێنەرایەتیی سوریا لە باشوور و ڕۆژئاوای بێروت بێ بە باڵادەست. هەرچەند کە مەبەستی سەرەکیی ئەمەل سەرکوتکردنی حەشیمەتەکانی کەمپەکانی فەلەستینییەکان لە زنجیرەیەك گەمارۆدانی ترسناکدا بوو، بەڵام بە شوێن میلیشیا سوننەکانیشدا بوو و بە خێرایی لەناوی بردن. دەروزی و کوردەکان کە لە زاڵبوونی شیعەکان بەسەر ڕۆژئاوای بێروت (کە لەژێر دەسەڵاتی سوننەکاندا بوو) بێزار بوون، چوونە ڕیزی ئەو هێزانە کە لەگەڵ پێشڕەوی «ئەمەل» بەرەو ناوچە گرینگەکانی ڕۆژئاوای بێروت بەرەنگایان دەکرد. ئەم بەرەنگاربوونەوەی ئەوان بە شێوازێکی سەرسوڕهێنەر سەرکەوتوو بوو. میلیشیا کوردەکان لە ناوچەکانی خۆیاندا زۆر بەهێزتر بوون و لە هەر شەڕێکدا کە بەشداریان دەکرد، شیعەکانیان گەمارۆ دەدا.

شەڕ هەتا ساڵی ١٩٨٧ درێژەی هەبوو واتا هەتا کاتێك کە دەوڵەتی سوریا و گرووپە شەڕکەرەکانی دیکە لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە سەرجەم میلیشیاکان لە بێروت پاشەکشە بکەن و ئەرکی دەستەبەرکردنی نەزم و ئاسایش ڕادەستی هێزەکانی سوریا بکەنەوە. بە داوای کاربەدەستانی سوریا، حیزبی سۆسیالیستی پێشکەوتنخوازی دەروزی (psp) بۆ بنکەکانی خۆی لە چیاکانی شوف پاشەکشەیان کرد. بەهەرحاڵ هێزە شیعەکان لە بێروت مانەوە، ئەوان هێشتا پێویستییان بەوە بوو کە کۆنترۆڵی خۆیان بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری

کەمپەکانی فەلەستینیەکان ڕابگرن. ئەم کردەوەیە کوردەکانی لەگەڵ چاودێری سوریا و تۆڵەسەندنەوەی شیعەکان بەرەوڕوو کردەوە. سەدان کورد بە تایبەت ئەوانەی کە ئەندامی (psp) و ڕێکخراوە فەلەستینیەکان و ڕێکخراوە کوردە دژە سورياییەکان بوون بە دەستی هێزەکانی سوریا و شیعەکان کوژران یان زیندانی کران. هەزاران کەسی دیکە هەڵاتن بۆ ئەوروپا یان چوون بۆ ناوچەی بیقاع و چیاکانی دەروزی.

ئاکام و لێکەوتەکانی بەشداریکردنی کوردەکان لە شەڕدا نەتەنیا بووە هۆی ئەوە کە ئەوان ژیانی خۆیان لەدەست بدەن و ئاوارە بین، بەڵکو کوردەکانی پتر لە جاران لەگەڵ هەڵاواردن لە لوبنان ڕووبەڕوو کردەوە. بۆ نموونە لە کاتێکدا کە سوننەکان لە نیوەی دەیەی ١٩٧٠ لەگەڵ مەسیحییەکاندا شەڕیان دەکرد، کوردەکان بە شێوازی خۆویستانە یارمەتی میلیشیا سوننەکانی «مرابتون»یان دا، بەڵام لە کاتی دابەشکردنی یارمەتییەکانی ئەرووپا و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کورد پشتگوێ خران. یارمەتییەکان تەنها لەنێوان مارۆنییەکان، دەروزییەکان، شیعەکان و سوننەکاندا دابەشکرا. ئەرمەنییەکان بە حوکمی ئەوە کە مەسیحی بوون، بەشی خۆیان لە مارۆنییەکان وەرگرت و کوردیش بە حوکمی ئەوە کە سوننە بوون، دەبوایە بەشی خۆیان لە هاوئاینە سوونەکانیان وەربگرتبایە، بەڵام بە بیروبۆچوونی «مرابتون»، کورد تەنها کورد بوون و هیچی دیکە.

بە کورتی، کورد لەو خەڵکانەن کە زۆرترین بەدبەختی و نەهامەتییان لە میانەی شەڕی ناوخۆدا بەسەرا هات. کورد لە کۆمەڵگەی لوبنان پەرتەوازە کرابوون و بە دەستی ئازار و ئەزیەت و نادادپەروەریی سیستماتیك کە حاشای لە مافی مرۆڤی ئەوان وەك هاوولاتی دەکرد، گیرۆدە بوون. کورد بە هیوای ئەوە کە ڕەوشیان دەگۆڕدرێت، بە هەڵە بەشداریان لە شەڕی ناوخۆدا کرد وئەم هۆکارە ئەوانی پتر لە جاران بڵاو و هیلاك کرد. تەنانەت ئەمڕۆ کورد لە لوبنان

هێشتا هەتا ڕادەیەك هەست بەوە دەکەن کە هیچ دۆستێکیان نییە. کورد دۆستی کەمیان لە لوبنان دۆزیوەتەوە کە بیەوێ لایەنی کورد بگرێ یان پشتیوانی لەبەرژەوەندییەکانیان بکات.

بە گوێرەی ئەنجامی توێژینەوەکەی ساڵی ١٩٩٥، کورد لە دەستی هەموو گرووپە سەرەکییەکانی لوبنان نەهامەتیان بینیوە. مارۆنییە مەسیحییەکان، حاشا لە هاووڵاتیبوونی کورد دەکەن لەبەر ئەوە کە ئەگەر کورد ببن بە هاووڵاتی، هاوسەنگی نێوان گرووپەکان بە قازانجی موسڵمانەکان تێکدەدرێت. سوونەکان کە لەژێر کاریگەریی ئایدۆلۆژییە رکابەرە عەرەبییە جۆراوجۆرەکانیدان (بۆ نموونە ئایدۆلۆژیای ناسریزم و بەعسیزم) حەزیان لە کورد نییە، کەوابوو زۆر هەوڵ نادەن بۆ ئەوەی کە کورد ببن بە هاووڵاتی. بە بیروبۆچوونی شیعەکان، کورد تەنها خەباتکاری سوونەکانن و هاوپەیمانی دەروزییەکانن و هیچی دیکە. بۆ دەرووزییەکان، کورد شەڕکەرانێکی باشن. دەروزییەکان و سونەکان دەیانەوێت کورد شەڕیان بۆ بکەن، بەڵام کاتێك کە کاریان بە کورد نەما، پشتگوێیان دەخەن و بێجێیان دەکەن. هەتا ئەو جێگایەی کە پەیوەندی بە ڕێبەرە خۆجێییەکانەوە هەیە، کوردەکان (جگە لە چەند ناوێزایەك) متمانەیان بە سەرجەم بژاردە سیاسییەکانی لوبنان نییە و بێکەڵك سەیریان دەکەن و بەوە تۆمەتباریان دەکەن کە هەڵپەرەستن. ( ناوێزا سەرەکییەکانی ئەم بابەتە بریتین لە سامی الصلح، سەرۆك وەزیری سوننەی دەیەی ١٩٥٠ و ١٩٦٠، کەماڵ جونبەلات سەرۆکی دەروزییەکان و ڕێبەری هێزە ناسیۆنالیستە عەرەبە چەپەکان لە سەردەمی شەڕی ناخۆ کە ساڵی ١٩٧٧ بە دەستی سوریا کوژرا، سالم الهوس سەرۆك وەزیری سوننە لە دەیەی ١٩٧٠، ١٩٨٠، ١٩٩٠ و ڕەفیق الحریری سەرۆك وەزیری سوننە لە دەیەی ١٩٩٠ بوو).[١٧]

**● ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانی کوردەکان**

پێش کۆتایی دەیەی ١٩٥٠، کوردەکانی لوبنان لەڕاستیدا لە هیچ چالاکییەکی بەرچاوی سیاسی یان کۆمەڵایەتیدا بەشداریان نەدەکرد و تەنها لەدوای ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٥٨ و پاش ئەوە بوو کە کورد کەوتنە بیری ئەوە کە لەم چالاکییانەدا بەشداری بکەن. یەکەم هۆکاری ئەم مەسەلەیە ئەوە بوو کە لە دوای شەڕی ناوخۆی لوبنان لە ساڵی ١٩٥٨، وڵاتی لوبنان کۆچی بەرفراوانی گوندنشینان بۆ شارەکانی بەخۆیەوە بینی، بە شێوەیەك کە تەنها لە دەیەی ١٩٦٠، نزیکەی یەك لە ٥ی حەشیمەتی گوندنشینی لوبنان بۆ شارەکان (زۆرتر بیروت و دەوروبەری بێروت) کۆچیان کرد. ئەم کۆچبەرانە لە بێروت ژیانی کوردەکانیان ئاستەمتر کرد لەبەر ئەوە کە بە شوێن هەمان کارانەدا بوون کە کورد بە شوێنیاندا بوون و لە هەمان ناوچانەدا نیشتەجێبوون کە کورد تێیاندا دەژیان. بەهەرحاڵ، بەپێچەوانەی ڕکابەرە نوێیەکانیان، کوردەکان هیچ مافێکی هاووڵاتییانیان نەبوو. لە ئەنجامدا کورد تووشی زەرەر و زیانی ئابووری توند بوون، کەوابوو دەنگی نارەزایەتی خۆیان لەمەڕ مەسەلەی هاووڵاتیبوون بەرز کردەوە.

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی نارەزایەتی ئەم مەسەلەیە ئەوە بوو، کە لە ساڵی ١٩٥٨، یەکێتییەك لەنێوان سوریا و میسر پێکهات کە کاریگەریی نەرێنی گرینگی زۆری لەسەر ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردەکان لە سوریا کرد. ئەنجامی کۆتایی ئەم یەکێتییە لە لوبنان هەستی پێکرا. ئەم یەکێتییە یەکەم کردەوەی سەرکوتکەرانەی خۆی لە دژی کوردەکان لەسوریا ئەنجام دا. هەزاران کوردی سوریا کە زۆربەیان خوێندکارە سیاسییەکان، کرێکار و ئاوارە و پەنابەرەکان بوون، هەڵاتن بۆ لوبنان. ئەم کەسانە سەرەڕای ئەوە کە بە شێوازی کاتی لە لوبنان دەژیان، توانیان کوردەکانی لوبنان لەمەڕ گرینگیی چالاکیی کۆمەڵایەتی و سیاسی هۆشیار بکەنەوە. ئەوان تەنانەت یارمەتییان بە پێکهێنانی

ڕێكخراوە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكانی كوردەكان، بە تایبەت لە كۆتایی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ دا و بەشداریان لە چالاكییەكان كرد.

دوایین و لەوانەیە گرینگترین هۆكاری دەستكردنی كوردەكان بە چالاكی سیاسی و كۆمەڵایەتی، ڕووخانی حكومەتی پاشایەتیی عێراق لە ساڵی ١٩٥٨ بوو كە سەرەنجام بوو بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ١٩٦١-١٩٧٥. مەلامستەفا بارزانی پێویستی بە چوارچێوەیەكی جەماوەری بۆ شەڕ بوو، هەربۆیە توانی چوارچێوەیەك لە شاری بێروت دروست بكات كە هەزاران كوردی تێدا دەژیان. لە ئەنجامدا، گەلێ لە كوردەكانی لوبنان بە هۆی ئەم شەڕە، هۆشیاریی نەتەوەییان پێشكەوت و هەستیان بە ڕەوشی خەراپی خۆیان كرد و بیریان لە میتۆدگەلێك كرد تا ئەم ڕەوشە بگۆڕن. یەكێك لەم میتۆدانە دامەزراندنی ڕێكخراوە كۆمەڵایەتی و سیاسییەكان بوو.

لە درێژەدا كورتەیەك لە وردەكارییەكانی شێوازی پێكهاتن و پێشكەوتنی هەر ڕێكخراوێك دەخەینە بەرباس:

- **ڕێكخراوە كۆمەڵایەتییەكان**

ـــ الجمعیة الخیریة الكوردیة اللبنانیة (ئەنجوومەنی خێرخوازیی كوردی لوبنان)

ئەمە یەكەم ڕێكخراوی یاسایی كوردی بوو كە لە لوبنان لە ١٩ی ئەیلوولی ١٩٦٣ دامەزرا واتا لەكاتێكدا كە كەمال جونبەلات وەزیری ناوخۆ بوو. یەكێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی ئەم ڕێكخراوەیە پتەوتركردنی پەیوەندە دۆستانەكانی نێوان جوانە كوردەكانی لوبنان، پەرەپێدانی خزمەتگوزارییە كۆمەڵایەتی و گشتییەكان و پەرەپێدانی خوێندەواری و زانست لەنێو كوردەكان بوو. چالاكیی سەرەكی ئەم ڕێكخراوەیە، دامەزراندنی بنكەیەكی تەندروستی لە تشرینی

یەکەمی ١٩٦٧ و دابەشکردنی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان بوو.

ئەم ڕێکخراوەیە هێشتا تەنها ڕێکخراوی یاسایی و فەرمیە کە زۆربەی ئەندامەکانی کوردە کرمانجەکانن و ئەم ڕاستیە دەربڕی دابەشبوونی ڕێکخراوە کوردییەکان بە گوێرەی هێڵە زمانی و کۆمەڵایەتیەکانە. ئەم ڕێکخراوەیە هەرچەند کە زۆر چالاك نیە و چالاکیەکانی زۆرتر لەپێناو دابینکردنی خزمەتگوزاریی ڕاستەوخۆ بە ئەندامەکانییەتی، بەڵام هێشتا بە شوێن گۆڕینی ڕەوشی کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری و یاسایی کوردەکانی لوبنانە. بۆ نموونە هەروەك هەموو ڕێکخراوەکانی دیکە، وەك نیگەرانی یەکەمی خۆی بە شوێن کێشەی هاوولاتیبووندا دەچێت.

ـ جمعیة الارز الریاضیة الثقافیة (ئەلئەرز ـ کۆمەڵە وەرزشیە کولتورییەکان)

ئەم ڕێکخراوەیە لە ١٨ی ئاداری ١٩٧٩ لەژێر ناوی «جمعیة الارز الریاضیة» بە مەبەستی پەرەپێدانی چالاکیە وەرزشیەکانی کوردەکان دامەزرا و ٣ ساڵ دواتر داوێنەی چالاکیەکانی بۆ چالاکیی کولتووری پەرە پێدا، هەر بۆیە ناوی تەواوی بوو بە «جمعیة الارز الریاضیة الثقافیة». دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوەیە پەی بەوە برد کە پێویستی سەرەتایی گرووپێکی نەخوێندەوار و بە ڕێکخستن نەکراوی وەك کورد، ناوەندێکی کولتووری وەك کۆمەڵەی «ئەلئەرز»ە.

ئەندامانی ئەم ڕێکخراوەیە، تەنها کوردە ماردینی زمانەکان بوون و یەکێك لە کەسایەتیە سەرەکیەکانی فەیسەڵ فەخرۆ بوو کە «حیزبی ڕزگاری» دامەزراند. یەکێك لە چالاکیە بەرچاوەکانی ئەم ڕێکخراوەیە دامەزراندنی یانەیەکی تۆپی پێ بوو کە لە پلە دووی لوبناندا یاری دەکات.

ـ اتحاد الطلبة ا الأکراد في لوبنان (یەکێتی خوێندکارانی کورد لە لوبنان)

ئەم ڕێکخستنە لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٧٠ لەلایەن گرووپێك لە خوێندکاران دامەزرا، کە لە کەشوهەوای قۆناخی وەزارەتی ناوخۆی کەمال جونبولات کەڵکیان وەرگرت. ئامانجی ئەم یەکێتییە، پەرەپێدانی ڕەوشی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خوێندکارانی کورد لە لوبنان و دابین کردنی خزمەتگوزاریی پەروەردەیی بۆ ئەو کوردانە کە نەیاندەتوانی بچنە زانکۆکانی لوبنان و پتەوکردنی پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ یەکێتیی خوێندکارانی لوبنان و یەکێتییە خوێندکارییەکانی دیکە بوو. بەهەرحاڵ چالاکییەکانی یەکێتیی زۆر لاواز بوو .لەبەر ئەوە کە ژمارەی خوێندکارانی کورد لە لوبنان کەم بوو. لەمە زیاتر، ناکۆکییە ناوخۆییەکانی ناو یەکێتی کە لە ساڵی ١٩٧٤ لەسەر شێوازی ڕێبەرایەتی، لەنێو ئەندامانی ڕێبەرایەتیدا هاتە ئاراوە، چالاکییەکانی زۆر کەم کردەوە. کەوابوو نەیتوانی بگات بە ئامانجەکانی و بە دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆیی لوبنان، هەڵوەشایەوە.

ـ الجمعیة الکردیة الثقافیة الأجتماعیة ( کۆمەڵەی کۆمەڵایەتی کولتوری کورد )

ئەم ڕێکخراوەیە لە ٣ی گوڵانی ١٩٧٥ بە دەستی ڕێکخراوی «منضمات البارتی الکوردیە الیساریە فی لبنان»، بە مەبەستی پەرەپێدانی خوێندەواری و کاروکردەوە لەگەڵ ڕێکخراوە کولتورییە کوردییەکانی دیکە و پتەوکردنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی و کولتووریی کوردەکان لە لوبنان، دامەزرا. بەهەرحاڵ، چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوەیە کە بەرنامەی خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی بۆڵتۆنێك بەناوی «ڕێبەر» و هەروەها کۆمەڵێك نامیلکە لەبارەی ئەدەبیاتی کوردی لەخۆدەگرت. پاش چەند مانگ لە داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٨٢ کۆتایی پێهات. ئەم ڕێکخراوەیە بە هۆی پەیوەندییە

نزیکەکانی لەگەڵ ڕێکخراوە جۆراوجۆرە فەلەستینییەکان بەناوبانگ بوو، هەر بەم هۆیەوە گەلێك لە بەڕێوەبەرانی پێش لە گەیشتنی هێزە ئیسرائیلیەکان، لوبنانیان بەجێهێشت. ئەم ڕێکخراوەیە، کۆمەڵێکی مەزن کتێبی نایابی دەربارەی کوردەکان بە زمانە جۆراوجۆرەکان بوو، کە لەنێوان خەڵکدا دابەشکرا یان فرۆشرا بە خەڵك. ناکۆکییە ناوخۆییەکانی نێوان ئەندامەکانی ڕێکخستن، کۆتایی بە ژیانی ئەم ڕێکخراوەیە لە کانوونی دووەمی ١٩٨٣دا هێنا.

- مجلس الأعيان الكرد اللبنانية الأعلى ( ئەنجوومەنی باڵای کوردە ئەعیانەکانی لوبنان)

ئەم ڕێکخراوەیە لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ دامەزرا و ئامانجی سەرەکیی بایەخدان بە چالاکییە کۆمەڵایەتی، کولتووری، پەروەردەیی و گەشەسەندنەکان بە مەبەستی باشترکردنی بارودۆخی کوردەکان لە لوبنان و یەکگرتنی هەموو گرووپ، بنەماڵە، حیزبە سیاسییەکان، کلوپ و کۆڕ و کۆمەڵە کوردییەکانی لوبنان بوو. (دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوەیە، وەهاج ئەلشێخ موسا بوو کە سەر بە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی کورد بوو کە خۆی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی ساڵی ١٩٩٢ کاندیدا کرد، بەڵام سەرنەکەوت)، بەهەرحاڵ، شێوازی تاکەکەسی پێکهاتە و ڕێبەرایەتی ئەم ڕێکخراوەیە، نەیهێشت کە خەڵك پشتیوانی لێ بکەن و ڕێکخراوە کوردییەکانی دیکەی لوبنان هاوکاریی بکەن. لەڕاستیدا ناوی ئەم ڕێکخراوەیە، ڕەنگدانەوەی جۆری ئەندامەکانی بوو، واتا دەوڵەمەندەکان کە خەڵکی بەساڵاچوویان کە پارەیان هەیە، بەڵام خوێندەواری یان میکانیزمی پێویستیان بۆ باشترکردنی ڕەوشی گشتیی کۆمەڵگەی کورد نییە.

بە کورتی دەکرێ وەك دەرەنجام بگوترێت کە ڕێکخراوە غەیرە سیاسییەکانی کورد نەیانتوانی ڕەوشی کۆمەڵایەتی ـ ئابووریی کوردەکان بگۆڕن و بە هۆی

هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لەساڵی ١٩٧٥ ڕەوشیان خراپتر بوو و لەوە لاوازتر بوون کە بتوانن تەنانەت ڕەوشی ئەندامەکانی خۆیان بگۆڕن، چ بگات بە ڕەوشی کوردەکان بە گشتی. بۆ نموونە بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە کاتی دامەزراندنیاندا ڕایاندەگەیاند، نەیانتوانی تەنها قوتابخانەیەك یان نەخۆشخانەیەك دروست بکەن یان پلانێکی کۆمەڵایەتی بە ئامانج دابڕێژن. لەمە زیاتر، ڕێکخراوەکان نەیانتوانی کادری ڕێبەرایەتی نوێ ــ کە تێڕوانینێکی دیکەی بە نیسبەت کێشەکان هەبێ و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی هان بدات ــ پەروەردە بکەن. ڕێکخراوەکان زۆر لاواز بوون و نەیانتوانی گوشار بخەنەسەر دەسەڵاتدارانی لوبنان و نەیانتوانی کوردەکان بەرەولای کۆمەڵگەی لوبنان ڕابکێشن. ئەم ئاکامانە، گەلێ لە کوردەکانی شێلگیر کرد تا یەکێتیە بنەماڵەییەکان دابمەزرێنن (کە لە میانەی دەیەی ١٩٧٠ بە شێوازی گرووپە بنەماڵەییەکان دامەزران) و خزمەتی خۆیان بکەن. پێکهاتەی ئەم یەکێتیانە کاردانەوەیەك لە بەرامبەر نارەزایەتی ئەوان یان ناسازگاری لەگەڵ ڕێکخراوە کوردییەکان بوو. لەگەڵ ئەمەشدا، ئامانج و چالاکیی ئەم یەکێتیانە جیاوازی لەگەڵ ئامانج و چالاکیەکانی ڕێکخراوە غەیرە سیاسییەکان نەبوو و لەوان باشتر نەبوون. بەداخەوە ئاکام و ئەنجامی ئەم ڕێکخراوانە، بڵاوبوونی زۆرتری کۆمەڵگەی کورد بوو.

**● حزبە سیاسییەکان**

**ــ الحزب الدیقراطی الکوردی فی لبنان ــ البارتی (حزبی دیموکراتی کوردی لوبنان ــ بە «ئەلپارتی» ناسراوە)**

ئەمە یەکەم حیزبی یاسایی کوردیی بوو، کە لە ساڵی ١٩٧٠ لە لوبنان بە دەستی جەمیل محۆ کە بۆیاخچی ماڵان بوو، دامەزرا. حیزب چالاکیی خۆی بە شێوازی نهێنی لە تەمموزی ١٩٧٠ لەژێر ناوی المنضمات الشباب الکوردیە

فی لبنان (ڕێکخراوی جوانانی دیموکراتی کورد لە لوبنان) دەستی پێکرد. ئەم ڕێکخراوەیە لەلایەن دەستەیەك لە لاوانی کوردی سوریا و لوبنان بە یارمەتی و هاندانی حزبی دێموکراتی کورد لە سوریا (PDKS) پێك هات. (دروشمەکانی گرووپ بریتی بوون لە «هاووڵاتیبوون یەکێك لە مافەکانی یەکێك لە مافەکانی کوردانە» و «یەکبگرن، پاشان داوای مافی خۆتان بکەن»).

لە سەرەتادا، چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوەیە بریتی بوون لە پێوەندیگرتن لەگەڵ کوردەکانی خۆوڵاتی، بڵاوکردنەوەی بەیاننامە لەمەڕ ڕەوشی کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسیی کۆمەڵگەی کورد و میتۆدەکانی باشترکردنی ئەم ڕەوشە بە پێداگرتنی تایبەت لەسەر پرسی هاووڵاتیبوون. هەتا ساڵی ١٩٧١ و بە مۆچیاری PDKS ، ئەم ڕێکخراوەیە یارمەتی بە نوێنەرانی مەلامستەفا بارزانی دا کە ناردرابوون بۆ لوبنان تا بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عێراق پروپاگەندە بکەن.

چالاکییە سیاسییەکانی گرووپ هەتا ساڵی ١٩٧٠ نهێنی بوو، واتا هەتا کاتێك کە محۆ لە کۆنگرە هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK) کە لە ئابی ١٩٧٠ لە عێراق بەڕێوەچوو، بەشداریی کرد. لەم کۆنگرەیەدا بارزانی لەمەڕ گرینگیی بەڕێکخستن کردنی چالاکییە سیاسییەکانی کوردەکان لە چوارچێوەیەکی یاساییدا کە هەم خزمەتی کوردەکانی لوبنان و هەم خزمەتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بکات، ئاگاداری دا بە محۆ. بارزانی دەیزانی کە محۆ لەگەڵ کۆمەڵێك گیروگرفت لەلایەن سەلاح بەدرەدین (ڕێبەری پێشووی حیزبی دیموکراتی کوردی سوریا کە لەلایەن بارزانییەوە تەریك خرابۆوە، بەڵام لایەنگری زۆری لە لوبنان هەبوو) ڕووبەڕوویە. هەربۆیە نامەیەکی دا بە محۆ و لەم نامەیەدا بۆ کوردەکانی لوبنانی نووسی کە محۆی بۆ ڕێبەرایەتی کوردەکانی لوبنان هەڵبژاردووە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە کوردەکانی لوبنان وەك قارەمانی

ئامانجی کورد سەیری بارزانییان دەکرد، کەوابوو هەرچی کە بارزانی بیگوتبایە، بە گیان و دڵ قەبووڵ دەکرا.

هەڵبژاردنی محۆ وەك نوێنەری بارزانی، خۆشەویستیی ئەوی لە لوبنان زیاد کرد. ئەم ڕاستییە سەلاح بەدرەدین ـی تووڕە کرد و محۆی تاوانبار کرد کە دەستێوەردانی نامەکەی بارزانی کردووە. بەهەرحاڵ، محۆ پاش ئەوە کە لە عێراق گەڕایەوە، توانی گەلێ لە کوردەکان لە پشتی حیزبەکەی تەیار بکات و داوای لە دەوڵەتی لوبنان کرد کە وەك حیزبێکی یاسایی قەبووڵی بکات. لە ٢٤ی ئەیلوولی ١٩٧٠، حیزب بوو بە یاسایی و «حیزبی دیموکراتی کورد لە لوبنان» کە بە «ئەلپارتی» ناسراوە، لەدایك بوو. بەهەرحاڵ، بەدرەدین تەسلیمی ئەم کەندوکۆسپە نەبوو و پاش ماوەیەکی کەم دەستیکرد بە خەبات دژی محۆ و بەوە تاوانباری کرد کە بە هۆی ماددی، بەرەولای دەوڵەتی عێراق ڕاکێشراوە. هەربۆیە خۆشەویستی محۆ بە شێوازێکی سەرسوڕهێنەر کەمی کرد، لەبەر ئەوە کە نەیتوانی پێچەوانەی بانگەشەکانی بەدرەدین بسەلمێنێت. محۆ پاشان بە خزم پەرەستیش تاوانبار کرا. سەرەنجام بارزانی بانگی محۆی کرد و بۆ ماوەی سێ ساڵ ـ لە ساڵی ١٩٧١ هەتا ١٩٧٤ ـ لە کوردستانی عێراق ڕایگرت.

پاش گەڕانەوەی بۆ لوبنان، محۆ بەردەوام لە ڕۆژنامەکەی خۆی بە ناوی «صوت الاکراد» (دەنگی کورد) کەڵکی وەرگرت تا نەیارێتیی خۆی لەگەڵ بارزانی و پشتیوانیکردن لە بەرنامەی خودموختاریی دەوڵەتی بەغداد بۆ کوردەکان ڕابگەیەنێت. ئەم کارە بووە هۆی لەتبوونی ناوخۆیی زۆرتری کۆمەڵگەی کورد لە لوبنان و لەتبوونی «ئەلپارتی» و لاوازبوونی پێگەی محۆ وەك ڕێبەری کۆمەڵگە. «ئەلپارتی» لە ئاستی مەحەلیدا هەتا ساڵی ١٩٧٦ لە چوارچێوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبناندا کاری دەکرد، بەڵام لەم ساڵەدا بە بیانووی ئەوە کە ئیدی لە لایەن پارتی شیوعی لوبنان (LCP) پێشوازی

لێ ناکرێ، لە بزووتنەوە کێشایەوە. (LCP) لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە منضمات البارتی الکوردیە الیساریە فی لبنان (ڕێکخستنەکانی حیزبی چەپی کورد لە لوبنان) شوێنی «ئەلپارتی بگرێتەوە.

محۆ دەستگیر کرا و هەتا ساڵی ١٩٧٧ لەلایەن کاربەدەستانی سوریاوە زیندانی کرا. چالاکیەکانی «ئەلپارتی» پاش مەرگی محۆ لە ساڵی ١٩٨٢ کۆتایی پێهات و لە ساڵی ١٩٩١ لەسەر داواکاریی کاربەدەستانی سووریا، ڕەوشی یاسایی خۆی لەدەست دا.

ـ القیادة المرکزیة للپارتی (ڕێبەرایەتیی ناوەندیی ئەلپارتی)

پاش ئاشکرابوونی لایەنگریکردنی محۆ لە دەوڵەتی عێراق، چەند ئەندامی ئەلپارتی لە ساڵی ١٩٧١ ریزەکانی حیزبیان بەجێهێشت بە مەبەستی پێکهێنانی «حیزبی دێموکراتی کوردی لوبنان ـ ڕێبەرایەتی ناوەندی»، تەڤلی ئەو دۆستانە بوون کە داواکاریی ئەندامێتییان پێشتر لەلایەن «محۆ» وە ڕەتکرابۆوە. تایبەتمەندیی ئەم گرووپە ئەوە بوو کە بە تەواوی هاوکاری بارزانی دەکرد و وەفاداری بارزانی بوو. هەر ئەم ڕاستییەش بووە هۆی ئەوە کە خۆشەویستی حیزب لەناو دڵی گەلێ لە کوردەکانی لوبنان و سوریا زۆرتر بێ. ئەم حیزبە، بۆڵتۆنێکی بە ناوی «ئەلپارتی» بڵاو دەکردەوە و گەلێ جار داوای مۆڵەتی لە دەوڵەتی لوبنان کرد، بەڵام بێ ئاکام بوو. چالاکییە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە کۆکردنەوەی یارمەتی بۆبزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عێراق و بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی ئەم بزووتنەوەیە لە لوبنان و دەوروبەری لوبنان. پاش هەڵوەشانەوەی بزووتنەوەی کورد لە ئاداری ١٩٧٥، چالاکییەکانی حیزب هێدی هێدی کەمی کردەوە و بە کوشتنی سکرتێری گشتیی حیزب، قازی فەرەح لە تەمموزی ١٩٧٨، کۆتایی پێهات و هەوڵەکان بۆ زیندووکردنەوەی چالاکییەکانی لە دەیەی ١٩٨٠ بە تەواوی هەرەسیان هێنا.

**ـ ڕزگاری (حیزبی کوردی لوبنان)**

فەیسەڵ فەخرۆ لە سێ هۆکار کەڵکی وەرگرت تا لە ٣ی نیسانی ١٩٧٥ ئەم حیزبە دابمەزرێنێت: ١ـ سەرنەکەوتنی «ئەلپارتی» لە ڕاکێشانی کوردە غەیرە کرمانجەکان ٢ـ پشتیوانیکردنی محۆ لە بەرنامەی ڕێژیمی عێراق بۆ خودموختاری کوردەکان. ٣ـ پێکهاتەی ڕێبەرایەتی «ئەلپارتی» کە ببووە ڕێکخراوی بنەماڵەی محۆ نە نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەی کورد بە گشتی.

ڕزگاری ماوەیەکی کورت پاش دامەزران، لەڕێگای بۆڵتەنی خۆی بە ناوی «خەبات» پشتیوانی خۆی لە دەوڵەتی لوبنان و بێلایەنی بە نیسبەت گرووپەکانی بەشدار لە شەڕی ناوخۆدا ڕاگەیاند. هەروەها لە بەرەی «جبهه الاحزاب و القوی القومیه و الوطنیة فی لبنان»بەشداری کرد کە نە لایەنگریی لە سیاسەتەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنانیی ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان دەکرد و نە لایەنگریی بەرەی لوبنانی ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکان.

لە کردەوەیەکی سەرسوڕهێنەردا لە ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٦، محۆ و فەخرۆ ناکۆکی و هێرشە زمانییەکانیان خستەلاوە و پێکهاتنی «الجبهة الوطنیة الکوردیة الاریدا» (بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد)یان ڕاگەیاند کە ئامانجە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە یەکخستنی چالاکیی سیاسیی کورد لە لوبنان، گارانتی کردنی یەکێتیی کۆمەڵگەی کورد لە لوبنان، باشترکردنی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کوردەکان، داکۆکی لە مافی هاووڵاتیبوون و دامەزران لە ئیدارە دەوڵەتییەکاندا. حیزب هەروەها پشتیوانیی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان دەکرد لە هەمانکاتدا پێشوازی لە دەستێوەردانی هێزە ڕێگرە عەرەبییەکان بە ڕێبەرایەتی سوریا وەك باشترین چارەسەری بۆ کۆتایی پێهاتنی شەڕ دەکرد. بەهەرحاڵ پاش کەمتر لە ساڵێك لە دوای زیندانی کرانی محۆ لەلایەن کاربەدەستانی سوریاوە، چالاکییەکانی حیزب بەرەبەرە ڕاوەستا. ڕزگاری لە

ساڵی ١٩٧٧ەوە زۆر لە گۆڕەپانی لوبناندا لاواز بووە، بەڵام هەتا ئەمرۆ درێژە بە ژیان دەدات.

ــ ڕزگاریی دووەم (حیزبی کوردی لوبنان)

لەدوای پێکهاتنی بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد لەنێوان «ئەلپارتی» و «ڕزگاری»، تاقمێك لە ڕزگاری جیا بوونەوە و سکرتێری گشتیی حیزب، فەخرۆیان بە ئاشتی کردنەوە لەگەڵ محۆ و گەڕانەوە بۆ عەشیرەگەرایی کوردی، تۆمەتبار کرد. ئەم تاقمە نوێیە کە لەلایەن عەبدی ئیبراهیمەوە ڕێبەرایەتی دەکرا، لە باڵادەستیی محۆ بەسەر بەرەدا ناڕازی بوو و فەخرۆی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە بە شوێن نموونەی محۆدا دەچێ و ناهێڵێ گرووپە کوردییە جۆراوجۆرەکان بەشداریی تێدا بکەن. لەمە زیاتر، فەخرۆ بە پشتیوانیکردن لە بەرنامەی دەوڵەتی عێراق بۆ خودموختاریی کوردستانی تۆمەتبار کرا.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ ئیبراهیم ڕایگەیاند کە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی حیزب دەپارێزێ و دامەزرانی «بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد»ی شەرمەزار کرد. لە ئەنجامدا، ئیبراهیم پێکهاتنی حیزبێکی نوێی بە ناوی حیزبی کوردی لوبنان (یان ڕزگاریی دووەم) ڕاگەیاندکە شوێنی حیزبی ڕزگاریی لە «جبهە الاحزاب و القوی القومیە و الوطنیة فی لبنان»دا گرتەوە.

«ڕزگاریی دووەم» هەتا کاتی داگیرکرانی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٨٢ درێژەی بە چالاکی دا، بەڵام لەو کاتە بەدواوە، واتا لەدوای ئەوە کە سکرتێری گشتیی حیزب، لوبنانی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆ سوریا، ژیانی حیزب کۆتایی پێهات و هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی حیزب کە سێ ساڵ دواتر ئەنجام درا تووشی هەرەسهێنان بوو. لەڕاستیدا، ماوەیەکی کورت پاش ئەوە کە ئیبراهیم لوبنانی بەجێهێشت، جەمیل حەسەن، یەکێك لە ئەندامانی ڕێبەرایەتی حیزب لە تشرینی

دووەمی هەمان ساڵ لە حیزب جیا بووەوە و «حیزبی ڕزگاریی سۆسیالیستی لوبنان»ی دامەزراند. جەمیل حەسەن پاش ئەوە کە بوو بە هاوپەیمانی محۆ و دوابەدوای یەکگرتنەوەی حیزبی سۆسیالیست و «ڕزگاری» لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ لە گرووپی نوێ جیا بووەوە. حیزبی سۆسیالیست تووشی لەتبوونی زۆرتر بوو و لە ساڵی ١٩٨٥ ژیانی کۆتایی پێهات.

ـــ منضمات البارتیة الکوردیة الیساریة في لبنان (ڕێکخراوی حزبی چەپی کورد لە لوبنان)

ئەم حیزبە مارکسیست لنینیستە (ڕێکخراوی حیزب) یەکێ لە گرووپەجیابووەکانی الحزب الدیمقراتیە الکوردیە الیساری (LKPD) بوو. (LKPD) لە ٥ی ئابی ١٩٦٥ بە دەستی سەلاح بەدرەدین پاش ئەوە کە لە حیزبی دیموکراتی کوردی سوریا (PDKS) جیابووە، دامەزرا. سەرەتای چالاکیەکانی «ڕێکخراوی حیزب» دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ واتا کاتێ کە ژمارەیەك لە کۆچبەرانی کوردی سوریا بوون بە ئەندامی حزب و لەگەڵ «منضمات الشباب الکوردیە» هاوکارییان دەکرد. ئەم هاوکارییە هەتا ساڵی ١٩٦٩ درێژەی هەبوو. لەم ساڵەدا، پێوەندیەکانی نێوان سەلاح بەدرەدین و بارزانی خراپ بوو، لەبەر ئەوە کە بارزانی بە ڕاشکاویی پشتیوانی لە(PDKS) دەکرد. لە ئەنجامدا، بەدرەدین بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ لوبنان. لەوێش تووشی گیروگرفتی زۆربوو، لەبەر ئەوە کە زۆربەی کوردەکانی لوبنان وەفادار بە بارزانی بوون.

« ڕێکخراوی حیزب» چالاکیەکانی خۆی بە ڕەسمی لە ساڵی ١٩٧٠ دەست پێکرد و لە میانەی نیوەی یەکەمی دەیەی ١٩٧٠ زۆرتر کاری بۆ ئەوە دەکرد کە کوردەکانی لوبنان بکا بە ئەندامی حیزب، لەبەر ئەوە کە زۆربەی ئەندامەکانی کوردی سوریا بوون. ئەم کارە لە چەند ڕێگاوە ئەنجام درا، بۆ

نموونە بە ڕاشکاوی ڕەخنەی لە جەمیل محۆ بە هۆی لایەنگری کردن لە عێراقییەکان و سورییایەکان و دوورکەوتنەوە لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان (کە بووە هۆی ئەوە کە ژمارەیەك لە ئەندامەکانی ئەلپارتی بچنە ڕیزی ڕێکخراوی حیزب) دەگرت. محۆ بە توندی، شیوعیەکانی (کە «ڕێکخراوی حیزب» پێوەندیی باشی لەگەڵیاندا هەبوو) بەوە تۆمەتبار کرد کە ناکۆکی دەخاتە نێو بزووتنەوە، لە ئەنجامدا «ئەلپارتی» لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان کێشایەوە و «ڕێکخراوی حیزب» شوێنی گرتەوە. لە کردەوەدا «ڕێکخراوی حیزب» کە پاشان ناوی خۆی گۆڕی بۆ «الاتحاد الشعبیه الکرد فی لبنان» (یەکێتی گەلی کورد لە لوبنان)، لەکاتێکدا کە سکرتێری گشتیی حیزب، بەدرەدین پاش داگیرکاریی ئیسرائیل، هەڵات بۆ قوبرس، ژیانی کۆتایی پێهات. بەر لەوەش «ڕێکخراوی حیزب» تووشی کۆمەڵێك ناکۆکیی ناوخۆیی بووە کە سەرەنجام پێکهاتنی گرووپێکی لادەر بە ناوی «منضمات البارتی الکوردیە الیساری فی لبنان - الحرکە التصحیحیە» (ڕێکخراوی حیزبی چەپی کوردی لوبنان - بزووتنەوەی ساخکەرەوە)ی لێکەوتەوە. ئەم ڕێکخراوەش بە داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل ژیانی کۆتایی پێهات.

ـــ منظمات التقدمية الأكراد في لبنان (ڕێکخراوی پێشکەوتنخوازی کوردی لوبنان)

ئەم حیزبە یەکێکە لە گرووپە لادەرەکانی ڕێکخراوی حیزب بوو، کە لەلایەن ئەحمەد جمهوور و مستەفا سۆفییەوە ڕێبەرایەتی دەکرا. لادەرەکان، بەدرەدین ـ یان بە هۆی پێوەندییەکانی لەگەڵ ڕێژیمی عێراق لەساڵی ١٩٧٥، بە خیانەت تۆمەتبار کرد. پاشان لە حوزەیرانی ١٩٧٦ جمهوور و سۆفی بەیاننامەیەکیان لەژێر ناوی «القیادە الشرعیە المنظمە» (ڕێبەرایەتی یاسایی ڕێکخراوی حیزب) بڵاو کردەوە و لە نیوەی ساڵی ١٩٧٨ دا ناوی حیزبەکەیان کرد بە «ڕێکخراوی

پێشکەوتنخوازی کورد لە لوبنان». چالاکییەکانی حیزب بریتی بوون لە دامەزراندنی (یەکێتی ڕۆشنبیران بۆ پێشکەوتن)، بەڕێوەبردنی فستیواڵ و سمینار و بڵاوکردنەوەی چەند نامیلکەیەك. لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی ئەم ڕێکخراوەیە زۆر کورت بوو و بە داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٨٢، هەڵوەشایەوە.

ـــ الحزب الديموقراطية الكوردية في لبنان ــ البارتي/القيادة الموقتة (حزبی دیموکراتی کوردی لوبنان ــ ئەلپارتی/ڕێبەرایەتیی کاتی)

پاش پێکهاتنی «بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد» لە ساڵی ١٩٧٦ لەنێوان ئەلپارتی و ڕزگاری، موحەممەد محۆی کوڕی جەمیل محۆ، لە حیزبەکەی باوکی جیا بووەوە و حزبێکی لە گوڵانی ١٩٧٧ دامەزراند. موحەممەد لەڕێگای بڵاڤۆکەکەیەوە بە ناوی «صوت الشباب الكورديه» (دەنگی جوانانی کورد) بە ڕاشکاوی دەستی کرد بە ململانێ لەگەڵ باوکی و بە هۆی پشتیوانی لە سیاسەتی ڕژێمی عێراق لە دژی بارزانی و چوونە دەرەوە لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان، ڕەخنە لە باوکی گرت. بەهەرحاڵ هەم موحەممەد و هەم باوکی یەك بیروبۆچوونیان دەربارەی کوردە غەیرە کرمانج زمانەکان هەبوو و ئەم ڕاستییە کاریگەریی نەرێنی کردە سەر «ئەلپارتی -ڕێبەرایەتیی کاتی». موحەممەد لە پێکداداانێکدا لەگەڵ بزووتنەوەی شیعەی «ئەمەل» لە ١٦ی نیسانی ١٩٨٢ کوژرا و ژیانی حیزبەکەیشی کۆتای پێهات.

ڕێکخراوە کوردییەکانی لوبنان (چ سیاسی و چ غەیرە سیاسی) نەیانتوانی بگەن بە ئامانجە خوازراوەکانیان، چونکە کوردەکان بەشداریی کەمیان لە چالاکییەکاندا دەکرد. چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوانە هیچ پێوەندییەکی بە

پێداویستییە سەرەکییەکانی کوردەکان واتا کار و خواردن و دەوا و دەرمانەوە نەبوو. یەکێك لە هۆکارەکانی دیکە، کەمتەرخەمی و گرینگی نەدانی کوردەکان بە چالاکیی سیاسی باش و بەرێکخستنکراو بوو. لەمە گرینگتر، ڕێکخراوەکان بە تایبەت پارتە سیاسییەکان لە هۆشیاری و ئاگایی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردەکانی لوبنان هەڵنەقوولا بوون و بە هۆکارە دەرەکییەکان هان دەدران و بە ناکاو وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر ناڕەزایەتی لە حزبەکان دامەزران.

لەمە زیاتر، ڕێبەران یان مەزنەکانی کوردەکان لە لوبنان نەتەنیا بەسەر دامودەزگای دەسەڵاتداریی ڕێکخراوەکان زاڵ نەبوون، بەڵکوسەرچاوەی ڕێکخراوەکانیان بۆ بەرژەوەندیی تاکەکەسی بەکار دەهێنا و گەلێ لە کوردەکانیان لە ئەندامبوون لەم ڕێکخراوانە بێبەش دەکرد.

لەپاڵ ئەمانەشدا، ڕێبەرایەتی ڕێکخراوەکان خوێندەواری وشارەزایی سیاسییان نەبوو کە پێویستیی سەرەتایی هەموو ڕێکخراوێکی ڕاستەقینەیە. حیزبەکان بە دەستی ناکۆکی ناوخۆییەوە هیلاك ببوون و بە توندی تاقم تاقم ببوون. لەمە زیاتر، لەکاتێکدا کە زۆربەی ڕێکخراوەکان تەنانەت نەیاندەتوانی لەڕووی ماددییەوە خۆیان بەخێو بکەن، بەڵێنیی دروستکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانەیان بە خەڵك دەدا. ئەم کردەوانە، پتر لە جاران ڕێکخراوەکانیان لە چاوی خەڵکی کورددا بێزار کرد.

دوو هۆکاری گرینگی دیکەی هەرەسهێنانی ڕێکخراوە کوردییەکان و سەرنەکەوتن لە باشترکردنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردەکان ئەوە بوو کە: ١ـ گەلێ جاران کێشە نەتەوەییەکان (واتا ڕووداوەکانی کوردستان) بەسەر کێشە مەحەلییەکاندا زاڵ بوون و دەستێوەردانی چالاکیە سەرەکییەکانی ڕێکخراوەکانیان دەکرد. ئەم ڕاستیە بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی و کێشە لەنێوان ڕێکخراوەکاندا. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ڕێکخراوەکان لە هەوڵدان بۆ باشترکردنی ڕەوشی

گشتیی کۆمەڵگەی کورد لە لوبنان، غافڵ بن. ٢ـزۆربەی کوردەکان لە هاووڵاتیبوونی لوبنان بێبەش بوون و ئەمە بووە هۆی ئەوە کە گەلێ لە خەڵك لە بەشداریکردنی چالاك لە ڕێکخراوەکاندا بێهێوا بن.

لێرە دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە بۆ دامەزراندنی هەموو ڕێکخراوەیەك لە لوبنان پێویستە ٢ لە ٣ی بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوەکە هاووڵاتی لوبنان بن، بەڵام لەبەر ئەوە کە تەنها ژمارەیەکی کەم لەکوردەکان هاووڵاتی لوبنان بوون، ڕێکخراوەکان پشتیان بە هەر کەسێك کە هاووڵاتی لوبنان بایە دەبەست، بێئەوەی ڕادەی لێهاتووی ئەو کەسە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی ڕەچاو بکەن.

بە کورتی کارنامەی پارتە سیاسییە کوردییەکان هیوابەخش نەبوون. ئەوان ئەوەندە لاواز بوون کە نەیاندەتوانی پشتیوانیی کۆمەڵێك خەڵك بۆ لای خۆیان ڕابکێشن و لەڕاستیدا نە تەنها لە پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵك بێبەش بوو، بەڵکو پەرەیان بە چوارچێوەیەکی بەڕێکخستنکراو و جێگیریش نەدا تا پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵك بەرەولای خۆیان ڕابکێشن و سەلمێندرا کە چیەتی ئەدەبیاتی سیاسی و هێزی خەباتیان بەلاڕێدا بردووە. تەنانەت گەلێ لە پارتەکان هەوڵیان دا تا ڕوانگە تەسکەکانی خۆیان لەگەڵ لەخۆباییەکانیاندا ڕێك بخەن تا پێگەی ئەندامیەتی خۆیان قایم بکەن.

لەمە زیاتر، حیزبەکان لەوە لاوازتر بوون کە بتوانن پێکەوە هەڵکردنێکی ڕاستەقینە لەخۆیان نیشان بدەن، بە تایبەت لەبەر ئەوە کە زۆربەیان لەلایەن دامەزرێنەرەکانیانەوە ڕێبەرایەتی دەکران و کاتێك کە ئەم ڕێبەرانە نەدەمان (بە هۆی مردن یان هەڵاتن) حیزب هەڵدەوەشایەوە. زۆربەی پارتەکان بە شێوازی نایاسایی کاریان دەکرد و ماوەیەکی کورت پاش دامەزرانی دەوڵەتی لایەنگری ئیسرائیل لە لوبنان لە ساڵی ١٩٨٢، هەڵوەشانەوە.

ئەوەی کە ئەمڕۆ لە هەمووی ئەم حیزبە سیاسییە کوردییانە ماوەتەوە، حیزبی

«ڕزگاری»یە کە ئەویش هەنووکە پشتیوانییەکی زۆر کەمی لەلایەن خەڵکەوە لێ دەکرێ. لەناو ڕێکخراوە غەیرە سیاسییەکانیشدا «ڕێکخراوی خێرخوازیی کوردی لوبنان» و «ڕێکخراوی کولتووری و وەرزشیی ئەلئەرز» درێژە بە کاری خۆیان دەدەن.(١٨)

**● چالاکییە ڕۆشنبیرییەکان و ئاستی خوێندن لای کوردەکانی لوبنان**

*أ. چالاکیە ڕۆشنبیری و هونەرییەکان*

وەك پێشتر ئامارەی پێکرا، چالاکی کۆمەڵایەتیی کوردەکان بە شێوەیەکی ڕەسمی و بە دانپێدانێکی دەوڵەتی لوبنان لە سەرەتای شەستەکانەوە دەستی پێکردووە بە تایبەت لە ساڵی ١٩٦٣، کاتێ کە یەکەم کۆمەڵەی کوردی لە لوبنان بە ناوی (کۆمەڵەی خێرخوازی کوردی لوبنان)ـەوە دامەزرا و لە ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەیە، پتەوکردنی پەیوەندییەکانی هاوڕێیەتی (برادەری) نێوان لاوە کوردەکان و بڵاوکردنەوەی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتی و گشتییەکان و بڵاوکردنەوەی زانست و ڕۆشنبیریی نێوان کوردەکان هەروەها پارێزگاریکردن لە ڕۆشنبیری و کلتوری کوردی بە یادکردنەوەی جەژنە نیشتمانیە کوردییەکان نموونەی جەژنی نەورۆز.

لە ساڵی ١٩٦٩، بەڕێز فەیسەڵ فەخرو، فایر محەمەد کوردی و محەمەد خزر عەلوش (کۆمەڵەی ـ الارز ـ ی وەرزشی)یان دامەزراند، کە ساڵی ١٩٧٢ ناوەکەی ڕێك کرایەوە و گۆڕا بۆ (کۆمەڵەی ـ الارز ـ ی وەرزشی و ڕۆشنبیری)، بارەگاکەی لە شوقەیەکی تایبەتە لە ناوچەی ـ زقاق البلاط ـ. ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەیە پتەوکردنی چالاکیە ڕۆشنبیریەکان و یاریکردنی نوێی باڵە و تۆپی پێ و یارییەکانی هیز. کۆمەڵەی ـ الارز ـ ڕۆڵێکی گرنگی لە بواری ڕۆشنبیریدا بینی، بۆ نموونە کارکردنیان و هەوڵدانیان بۆنەهێشتنی نەخوێندەواری و فێرکردنی

زمانـەکان و وتنـەوەی موحـازەرات و کـۆڕ و سـمیناری پەروەردەیـی و ڕۆشـنبیری و، دەرکردنـی گۆڤـاری (ڕاسـتی) لەلایـەن بنکـەی ڕۆشـنبیریەوە، هەروەهـا لەسـەر ئاسـتی ڕاگەیانـدن، شانبەشـانی دەرکردنی گۆڤاری (ڕاسـتی) دڵسـۆزانی کۆمەڵەکە ئیزگەیەکیـان دامەزرانـد کـە لەسـەر شـەپۆلی کورتـی (F.M) بەنـاوی کۆمەڵەکـەوە (کۆمەڵـەی الارز) پەخـش دەکات، لـە سـاڵی ١٩٩٥ ـەوە تاوەکـو سـاڵی ١٩٩٦ بـە هـەوڵ و ماندووبوونـی دەسـتەی بەڕێوەبردنـی کۆمەڵەکـە بـەردەوام بـوو و بەڕێوەچوو.

بـەڵام لەسـەر ئاسـتی هونـەری، کۆمەڵـەی الارز تیپێکـی فۆلکلـۆری بـە نـاوی (تیپـی الارزی کوردەکانـی لوبنانـی بـۆ نوانـدن و هونـەرە میللییـەکان) دامەزرانـد. گرنگتریـن کارەکانـی ئـەم تیپـە یادکردنـەوەی ئێوارانـی (جەژنی نـەورۆز)، بە ئیش و کاری شـانۆیی و سـەما میللییـەکان (مەبەسـت شـایی و هەڵپەڕکێیـە) هەروەهـا ژەنینـی مۆسـیقا و گۆرانـی نیشـتمانی و میللی.

سـەبارەت بـە چالاکییـە وەرزشـییەکان، کۆمەڵـەی ـ الارز ـ چەندیـن چالاکیـی ئەنجـام داوە، دیارترینیـان بردنـەوەی تیپـی ـ الارز ـ بـوو لە پاڵەوانێتـی تۆپی پێی پلە سێ لە بەیـرووت، بۆیە یەکێتیی تۆپی پێـی لوبنانی بڕیاری دا تیپەکـە بەرز بکاتەوە بـۆ ڕیـزی تیپـە پلـە دووەکان. شانبەشـانی تۆپـی پـێ، کۆمەڵـەی الارز چەندیـن پاڵەوانێتـی دیکـەی بردۆتـەوە لـە بوارەکانـی (یاریەکانـی هێـز، بەرزکردنـەوەی قورسـایی و زۆرانبـازی) کـە تیایـدا یەکێـك لـە ئەندامانـی یانەکـە (محمـود اسـماعیلات) دەرکـەوت و چەندیـن پاڵەوانێتـی ناوچەیـی و نێودەوڵەتـی بـردەوە.

جگـە لـەم دوو کۆمەڵەیـە چەنـد کۆمەڵەیەکـی تـر و ڕابیتـەی خێزانـی دیکـە دامـەزران لەوانـە: کۆمەڵـەی (یەکێتـی خوێندکارانـی کـورد لـە لوبنـان) کـە سـەرەڕای کەمـی توانـا مادییەکانی، چەنـد ئەندامێکـی توانیـان گۆڤارێکی فیکری کۆمەڵایەتـی خوێندکاریـی کـە گۆڤـاری (بەربانگ)ـە، دەربکەن.(احمـد محمـد

احمـد، اکـراد لبنـان، ل ١١٦) بـەڵام ئـەم کۆمەڵەیـە حاڵـی حـازر چالاکیـەکـی ئەوتـۆی نیـە کـە شـایانی بـاس بێ.

هەروەهـا سـاڵی ١٩٧٥ (کۆمەڵـەی ڕۆشـنبیری کۆمەڵایەتـی کـوردی لوبنانـی) دامـەزرا، کـە وەکـو کۆمەڵەکانـی تر، ئامانجـی بەرەوپێشـچوون و باشـکردنی باری گوزەرانـی ـ لۆبـی کوردی ـ یە لە لوبنـان لە هەموو بوارەکانـدا. دیارترین کاریگەریە ڕۆشـنبیری و ئەدەبییەکانـی ئـەم کۆمەڵەیـە دەرکردنـی گۆڤارێکـی دەوری بە ناوی «ڕێبـەر» ەوە بـوو، هەروەهـا دەرکردنـی چەنـد کتێبێـك لەوانـە «فێربوونـی زمانـی کـوردی بەبێ مامۆسـتا» و داسـتانی کـوردی «بائـع السـلال ـ بازنەفـرۆش» بـەڵام بە هـۆی چەنـد هۆکارێکـەوە کـە هەندێـك بـە سیاسـی ڕوونـی دەکەنـەوە، لـە سـاڵی ١٩٨٣ کۆمەڵەکـە داخـرا و هەڵوەشـێنرایەوە.

### *ب. ئاستی خوێندن (فێربوون) لای کوردەکانی لوبنان*

لـە سـەرەتادا کوردەکانـی لوبنـان زۆر گرنگیـان بـە خوێنـدن و فێربـوون نـەدەدا و لایەنـی پەروەردەیـی منداڵەکانیـان پشـتگوێ خسـتبوو، کـە بـووە بـە یەکێـك لـە پێویسـتیەکانی پێشـکەوتنی کۆمەڵایەتـی، سـەرەتای هاتنیـان، خوێندنیـان تەنهـا لـە لەبەرکردنـی چەنـد سـوورەتێکی قورئانـی پیـرۆزدا بەرتەسـك کردبـۆوە. بـەڵام لەگـەڵ پێویسـتیەکانی سـەردەم، لەپـاڵ فێربوونـی خوێندنـی ئاینـی هەسـتیان بـە پێویسـتی وەرگرتنـی زانسـت و زانیـاری کـرد و منداڵەکانیـان دەنـاردە خوێندنگـەی شـێخ (علـی بـری) لە ناوچـەی (البسـطـا التحتا) لـە بەیـروت. هەروەهـا ڕۆشـنبیری کـورد (کامـەران بەدرخـان) کەئـەوکات قونسـێلی فەڕەنسـا بوو لـە لوبنان و سـوریا، ڕۆڵێکـی کارای هەبـوو لە کردنـەوەی خوێندنگـەی (اللاییك) بـۆ فێربوونی زمانی کـوردی لـە بەیـروت (بـە یارمەتـی فەڕەنسـیەکان).

سـەبارەت بـە ڕەوشـی ئێسـتای خوێنـدن لەچـاو سـەردەمەکانی پێشـوو زۆر

باشترە، بەڵام پێشکەوتنی زانستی و رۆشنبیریان ناچێتە ریزی تایفەکانی دیکەی لوبنانەوە، لەبەر ئەوەی رەوشی خوێندن لە لوبنان بە گشتی و بەیروت بە تایبەتی کەوتە ژێر کاریگەریی رووداوەکانی شەڕی ناوخۆوە، کە لە ساڵی ١٩٧٥ تاوەکو ١٩٩٠ بەردەوام بوو، ئەم حاڵەتە رەنگدانەوەی خۆی لەسەر کوردەکانی لوبنان هەبوو.(ل٦٢، کورد گەلی مەینەتییەکان)

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ دوو فاکتەر وەك هۆکارەکانی نزمبوونی ئاستی خوێندن لەنێو کوردەکان لە لوبنان سەیر بکرێن:

یەکەمیان: شەڕی ناوخۆیی و دەرهاویشتەکانی: کاریگەری ئەو شەڕەی ناوخۆیەی کە ئاماژەی پێدرا، بوو بە هۆی ئەوەی ئەوانەشی کە نەچوونە ریزی میلیشیاکانی شەڕەوە، بەلانی کەمەوە کەشی شەڕەکە کاریگەریی هەبووە لەسەریان.

هەروەها رەوکردن وەکوو دیاردەیەك لە دەرهاویشتەکانی شەڕ، رۆڵێکی بنچینەیی هەبووە لە دابەزینی ئاستی خوێندەواری و بەرزبوونەوەی رێژەی نەخوێندەواری.

دووەم: هەروەها فاکتەری دیکە نەبوونی رەگەزنامەیە، وەك ئاشکرایە ئەوەی رەگەزنامەی لوبنانی نەبێت گرانە لەسەری ئەگەر مەحاڵ نەبێت منداڵەکەی لە خوێندنگەی رەسمیدا تۆمار بکات. بۆیە ئەوانەی فۆڕمی (لەژێر لێکۆڵینەوەدایە) (قید الدرس) هەلدەگرن یان هیتر، (مەبەست لەو کەسانەیە کە رەگەزنامەی لوبنانیان پێنەبەخشراوە) دەبێت منداڵەکانیان لە خوێندنگەی تایبەتیدا بخەنە بەرخوێندن و دەبێت قورسی و گرانی تێچوونی قیستی خوێندنگەکان هەڵگرن، لێرەدا کێشەی دابڕان لە بەدواداچوون و بەردەوام بوونی خوێندن دەست پێدەکات، ئەم دیاردەیە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی رێژەی ئەوانەی لە خوێندن دائەبڕێن.

پاش باسکردن دەربارەی شەڕی ناوخۆ و دەرهاویشتەکانی و کێشەی (ڕەگەزنامە) و ڕەنگدانەوەیان وەکوو دوو فاکتەری بنچینەیی بۆ دابەزینی ئاستی خوێندن، دەبێ هەندێك پرسیار بخرێتە ئەستۆی کوردەکان خۆیان کە بوەتە هۆی گەیشتنیان بەم حاڵەتە. لەم بارەیەوە بە ئاشکرا کاریگەری عەقڵیەتی کۆنی کوردەکان دەردەکەوێ کە زۆر هەوڵی تەواوکردنی خوێندن و بەدەسهێنانی پلەی زانستی نادەن بۆ تایبەت بۆ مێینە.

لەلایەکی ترەوە، پێویستە باس لەو گۆڕانکارییە ڕێژەییەی ئەم سەردەمە بکەین کە پاش تێکەڵبوونی خێزانە کوردەکان بە کۆمەڵگەی مەدەنی بە بیر و داب و نەریتەکانیەوە، کرانەوە و ڕووکردنیان لە بەدەسهێنانی پلەی زانستی و ڕۆشنبیری، زیادی کردووە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش لەڕاستیدا ژمارەیەکی زۆری کوردەکان تا ئێستا پابەندن بە چەند داب و نەریتێکەوە کە ناوەڕۆکەکەی ئاراستەکردنی گەنجەکانە لە تەمەنێکی لاویدا بۆ ئیشکردن نەك هەر تەنها بۆ ئەوەی یارمەتی خێزانەکانیان بدەن لە بەرەنگاربوونەوەی نەهامەتییەکانی ژیان، بەڵکوو بۆ ئەوەی خێزانێکی نوێ دابمەزرێنن بە ژنهێنانێکی پێشوەخت، هەروەها سەبارەت بە کچان کە هەر گەیشتنە تەمەنی باڵقبوون، ئاراستە دەکرێت بۆ بیرۆکەی شووکردن کە دەبێتە هۆی دابڕانیان لە خوێندن. کەواتە پێویستە گفتوگۆ لەسەر ئەم بیرۆکە و داب‌ونەریتانە و ڕادەی کاریگەریان لەسەر ئاستی خوێندن بکرێ.[١٩]

**● هۆکارەکانی کۆچکردنی کوردەکان لە لوبنانەوە**

هەروەك پێشتریش کەم و زۆر ئاماژەی پێدرا، لە قۆناغگەلی جیاوازدا ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە کوردەکان لە لوبنانەوە بەرەو وڵاتانی دیکە کۆچیان کردووە. ئەم کۆچکردنەش کۆمەڵە هۆکارێکی لە پشتەوە بووە زۆر لە

سەرچاوەکان سێ هۆکاری داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٨٢، ئەزیەت و ئازاری کوردەکان لەلایەن هێزە دەوڵەتیەکانی ژێر رکێفی مەسیحییەکان لە ساڵەکانی ١٩٨٢ ـ ١٩٨٣ و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی کوردەکان لەگەڵ شیعەکانی لوبنان بە هۆکارە سەرەکییەکانی کۆچی کوردان لە لوبنانەوە دەزانن بەڵام لە کتێبی « کورد، گەلی مەینەتییەکان»دا بە شێوەیەکی وردتر باس لە سێ هۆکاری سەرەکی کراوە کەوای لە کوردەکانی لوبنان کردووە کۆچ بکەن، بە شێوەیەکی نزیکەیی هاوشێوە لەگەڵ ئەو هۆکارانەی کەوای لە لوبنانیەکان (بە گشتی) کردووە. لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا نیشتمانەکەیان بەجێبهێڵن. هۆکارەکانیش ئەمانەن:

***یەکەم ـ هۆکارە ئەمنییەکان:***

بە یەکێك لە هۆکارە جەوهەرییەکان دادەنرێت، کەوای لە لوبنانیەکان کردووە لە ساڵی ١٩٧٥ـەوە نیشتمانەکەیان بەجێ بهێڵن، تاوەکوو ساڵی ١٩٨٤ شەپۆلی ساڵانەی کۆچبەرە لوبنانییەکان نزیکەی ٤٠ هەزار کۆچبەر بووە (ساڵانە) واتە نزیکەی ٤٠٠ هەزار کۆچبە. بەڵام سەبارەت بە کۆچکردنی کوردەکان لە ساڵی ١٩٧٧ـەوە دەستی پێکرد بۆ ئەڵمانیا، پاش ئەوەی کە ئاسانکاری بۆ کردن وەك پاداشتێك بۆ ئەو خزمەتەی، کە لە کاتی شەڕی جیهانی یەکەمدا کوردەکان پێشکەش بە سەربازە ئەڵمانیەکانیان کردبوو، ئەویش بە کردنەوەی ڕێگا و بانەکان بۆیان بۆ ئەوەی بگەنە نێو ئەنادۆڵ.

لە میانەی توێژینەوەیەك کە لەم پێوەندییەدا کراوە، دەرکەوتووە کۆچی کوردەکان لە لوبنانەوە بۆ دەرەوە، لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا زیادی کردووە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئەوەیە کە هۆکارەکانی زیاتر ئەمنین بە تایبەت ماوەی پێش ساڵی ١٩٨٤، کاتێ کە پاش داگیرکارییەکەی ئیسرائیل دانیشتوانی

کورد تووشی کردەوەکانی دەستگیرکردن و کوشتن و بڕین بوون، حاڵی ئەو بەشە زۆرەی خەڵکی لوبنان کە هاوسۆزی دۆزی فەلەستین بوون، هەروەها ئەو حاڵەتەی کە دروست بوو و بووە هۆی هەڵگیرسانی شەری ـ الجبل ـ و شەڕی ـ الفاجیە و بیروت ـ میلیشیاکان گەڕانەوە بەشی خۆرئاوای پایتەخت، لەو کاتەوە (١٩٨٤) تاوەکو (١٩٨٧) کوردەکان باجی داگیرکاری میلیشیاکان لەسەر پایتەخت دەدەنەوە. جارێك دەبنە قوربانی پێکدادانەکان و جارێکیش دەبنە قوربانی هێرشە لەناکاوەکان، بۆیە گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە کۆچکردن چارەسەری ئەو نەهامەتیەیە. تاوەکو ساڵی ١٩٨٧ هێزەکانی سوپا گەڕایەوە پایتەخت و ڕێژەی کۆچبەرە کوردەکان کەمی کرد. لەگەڵ چوونەوە نێو ساڵی ١٩٨٩ دووبارە شەڕی ناخۆ لە ١٤ی ئازار هەڵگیرسایەوە، لە میانەیدا (١٤ی ئازار ـ ١٥ی ئاب ١٩٨٩) نزیکەی ١٠٠ هەزار کەس لوبنانیان بەجێهێشت. ناوچە و گەڕەکە کوردەکان بە ڕێژەیەکی گەورە چۆڵ بوون لە دانیشتوانەکەی، لە کۆی گشتی ئەوانەی لەو ماوەیەدا کۆچیان کرد.

***دووەم ـ هۆکارە ئابوورییەکان:***

لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا و بە تایبەتی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٤ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٥، ئابووری لوبنان، بە شێوەیەکی کوت و پڕ دووچاری حاڵەتێکی تێکچوون و پەرتەوازەیی بوو، بە ڕادەیەك کە هاوشێوەی نەبوو لە ساڵانی پێشووی شەڕدا، دیارترین و گرنگترین دەرکەوتەکانی ئەم تێکچوون و پەرتەوازەییە لە دابەزینی بەها دراوی نیشتمانی بەرامبەر بە دراوە بیانییەکان خۆی دەبینێتەوە، هەروەها بەرزبوونەوەی سەرنجڕاکێشی نرخی شمەکە خۆراکی و بەکاربەر و خزمەتگوزارییەکان وەکوو (کرێ خانوو و ئەوانی تر...). لێرەدا دەبێ هۆکارە ئابوورییەکان بە هۆکارە ئەمنییەکان ببەستیرێنەوە، چونکە چەندین

دامـودەزگای بازرگانـی و کۆمپانیـاکان دەرگایان داخسـت و ڕوویان کـردە دەرەوە، بـۆ ئـەوەی دووبـارە لـە دەرەوەی پایتەخـت دەسـت بـە چالاکییەکانیـان بکـەن، لـە ئەنجامـدا دیـاردەی بێکاری بـڵاو بۆوە کە چەندیـن کوردی لوبنانی لەکار خسـت.

### سێیەم- بەدەست نەهێنانی ڕەگەزنامەی لوبنانی

وەك لە بەشەکانی پێشوودا ئەم کێشەیە لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و ئەو نەهامەتیەی کە دووچاری کوردەکان بووە لە ئەنجامیدا، خرایەڕوو، کە دەتوانرێ لەم خالانەی خوارەوە کورت بکرێتەوە. بێبەش بوونیان لە چارەسەرکردنی بێبەرامبەر و خزمەتگوزاری سندوقی نیشتمانی بۆ بیمەی کۆمەڵایەتی و هەروەها پیشە گشتیەکان و ئەوەی لێی دەکەوێتەوە وەکو بیمەی تەندروستی و پیر و پەککەوتەیی....، سەرەڕای هەموو ئەمانەش بێبەش بوونی منداڵەکانیان لە خوێندنی بەخۆڕایی کە زۆربوونی ڕێژەی نەخوێندەواری لێکەوتەوە. کەواتە هەموو ئەم گیروگرفتانە دەچنە خانەی کۆچکردنەوە و پاڵیان بە کوردەکانەوە ناوە کە بە ژمارەیەکی زۆر (زۆربەیان لە بێڕەگەزنامەکانن) وڵات بەجێ بهێڵن و ڕووبکەنە تورکیا یان ئەوروپای ڕۆژئاوا بە تایبەت ئەڵمانیا.

### ● دابەشبوونی جوگرافی کوردەکان لە دەرەوەی وڵات

بە شێوەیەکی سەرەکی، کوردەکانی لوبنان لە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بڵاو بوونەوە. هۆی هەڵبژاردنی ئەڵمانیا، سوید و دانیمارك لەلایەن کوردەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاسانکاریانەی کە ئەم وڵاتانە پێشکەش بە پەنابەرانی سیاسیان دەکرد بەتایبەت لوبنانی و فەلەستینیەکان، کۆچبەرە کوردەکانی ئەم وڵاتانە، زۆربەیان بە شێوەیەکی کاتی کۆچیان کردوە، بۆیە نەیانتوانیوە ڕەگەزنامە وەربگرن و نیشتەجێ بن لە وڵاتانی دەرەوە، تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بیانیەکی مارە کردووە. ئەمانە دەتوانن

کۆچکردنەکەیان بە بەردەوام دابنێن لەبەر دوو هۆ: یان بە هۆی بەدەسهێنانی ڕەگەزنامەوە یان بە هۆی بەدەسهێنانی منداڵەکانیان ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتە، لە ئەنجامدا پاش ماوەیەك دەتوانن داوای مافی ڕەگەزنامە وەرگرتن بکەن...

بەڵام سەبارەت بە دابەشبوونی کوردەکان بەسەر شارە ئەوروپاییەکاندا بەم شێوەیەیە: لە ئەڵمانیا، ئایسن (٢٥٪ی کۆچبەرەکان)، بەرلین (٢٥٪ی کۆچبەرەکان)، بریمن، شتۆتگارت، ساربروکن، هامبۆرگ.

لە سوید بە شێوەیەکی بەربڵاو لە هەر دوو شاری (مالمۆ) و (ئۆپسالا) نیشتەجێن. ئەمە جگە لە گۆتبۆرگ و ستۆکهۆلمی پایتەخت.

**● ڕۆڵی کۆچبەرە کوردەکان لە بوژاندنەوە و یارمەتیدانی کەس و کاریان**

پێویستە بە ئاماژەکردنە کە کۆچبەرە کوردەکان لە وڵاتانی ئەوروپاوە بە شێوەی جۆراوجۆر یارمەتیی کەس ءکاریان لە لوبنان دەکەن، لێرەدا باس لە دوو شێوە لەو یارمەتیدانانە دەکەین:

ـ یارمەتیە داراییەکان: بریتیە لەو پارانەی کە لە بانکەکانی دەرەوە حەواڵەی بانکەکانی لوبنان دەکرێ، لە هەندێ حاڵەتدا بە دراوی نەختینەیی لەلایەن ئەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ لوبنان، دەنێردرێتەوە بۆماڵەوە. دیارە ئەو یارمەتییەش بەپێی باری دارایی ئەو کەسانەی نیشتەجێی دەرەوەن جیاوازی هەیە...

ـ یارمەتیە شمەکیەکان: بریتیە لەو کەرەستە و شمەکانەی کە کۆچبەر بۆ برا یان یەکێك لە کەس ءکاری دەینێرێتەوە، بۆ ئەوەی بیفرۆشن و سوود لە پارەکەی وەربگرن، ئەو شمەکانەش زۆرجار ئۆتۆمبێلی بەکارهێنراو یان جل ءبەرگی بەکار هێنراون. بەڵام وا باوە کە ئۆتۆمبێلی بەکارهێنراو بنێردرێتەوە بە تایبەت لە ئەڵمانیاوە. چەندین کۆچبەری کورد هەن کە هاوبەشی دەکەن لە جوڵاندنی ڕەوڕەوەی ئابووری لە بازاڕەکانی لوبناندا، ئەمەش لەڕێگەی کردنەوەی

پیشانگای ئۆتۆمبیلە بەکارهێنراوەکان و ئیش و کاریان مسۆگەر دەکەن لەلایەك و، لەلایەکی تریشەوە بازاڕێکی نوێ بۆ فرۆشتنی ئۆتۆمبێلەکانیان مسۆگەر دەکەن، بێگومان ئەمە سوودی بۆ بەکاریەری لوبنانیش دەبێت...

## ● چالاکیی ئابووری کوردەکان لە وڵاتانی دەرەوە

چالاکی ئابووریی کوردەکان دابەش دەبێت بەسەر دوو گرووپدا، گرووپێکی کارگەر و گرووپێکی کارنەکەر.

*ئا ـ گرووپی کارگەران*

دابەش دەبێت بەسەر ئەم بەشانەی چالاکیدا:

ـ کەرتی بازرگانی و خزمەتگوزاری کە گەورە بازرگانەکان و بەڵێندەرەکان، هەروەها بازرگانە مامناوەند و بچووکەکان، وەك خاوەن دووکانەکان و بازرگانی ئۆتۆمبێلەکان دەگرێتەوە. خزمەتگوزارییەکانی ئەم بەشانە دەگرێتەوە (ئەمینداری، چاودێرین بازاڕکردن، ژمێریار، وانەوتنەوە، پزیشکی، خزمەتگوزاری ئوتێلکاری وەکو چێشتخانەکان و خزمەتگوزاری شارەوانی)

ـ کەرتی پیشەسازی و پیشەوەرییەکان کە تەکنیکاران و پسپۆڕان لە بوارەکانی میکانیك و کارەبایی دەگرێتەوە، هەروەها خاوەن فڕنەکان و دروستکردنی شیرینی دەگرێتەوە (ئەم جۆرە ئیش و کارە نێوان کۆچبەرانی سوید بە زۆری بڵاو دەبێتەوە) ئەم کەرتە کرێکارانی پیشەسازیە قورسەکان و ئاسن و ئەلەمنیۆم، ئەمە جگە لە کرێکارانی بیناسازی دەگرێتەوە.

ـ کەرتی کشتوکاڵی کە جوتیاران و کشتیاران دەگرێتەوە...

***ب ـ گرووپی کارنەکەران***

هەموو کۆچبەرێك کە بارودۆخی گونجاوی کارکردنی بۆ نەڕەخسێ، وەزعی بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت:

ئەگەر ئاماژە چوونە ژوورەوەکەی (فیزەکەی) بۆ ئەو وڵاتەی کە بۆی چووە، وەکو پەنابەری سیاسی وەرگیرابێت، مانگانە مووچە لە حکومەت وەردەگرێت، لێرەدا پێویستە ئەو زانیاریانەی کە یەکێك لە بەرپرسانی لۆبی کوردی لوبنانی لە ئەڵمانیا، دەربارەی وشەی (azyle ئەزیل) کە مانای پەنابەری سیاسیە بە زمانی ئەڵمانی، بەهای ئەو مووچەیەی وەریدەگرن دەگاتە نێوان ٤١٥ مارکی ئەڵمانی، ئەگەر کەسەکە سەڵت بوو، و ٤٦٠ مارکی ئەڵمانی بۆ یەك کەس لە تەمەنی (١٨ ـ ٨٠) ساڵ ئەگەر خاوەن خێزان بوو، بەڵام هاوسەرەکەی (لە هەمان گرووپی تەمەنی باسکراو) ٤٠٠ مارکی ئەڵمانی وەردەگرێت، منداڵەکانیشیان لە تەمەنی (١٤ـ١٨) ساڵ ٣٥٠ مارك وەردەگرن و لە تەمەنی (٨ـ١٤) ساڵ ٢٦٠ مارك و لە تەمەنی ٨ ساڵ کەمتر نزیکەی ١٦٥ مارك وەردەگرن. بەڵام سەبارەت بەو منداڵەی لەنێو خاکی ئەڵمانیادا لەدایك دەبێت کەس و کارەکەی ٦٠٠ مارك وەردەگرن تا ماوەی دوو ساڵ، ئەمە سەرەڕای دیارییەك کە بە نزیکەی ١٠ هەزار مارك مەزەندە دەکرێت و حکومەتی ئەڵمانی پێشکەش بە کۆرپەکەی دەکات.

ئەگەر ئاماژەی چوونەژوورەکەی، بۆ ئەو وڵاتەی کۆچی بۆ کردووە، وەکو (کۆچبەر) بێت، دەوڵەتی ئەڵمانی وەك هاووڵاتیەك مامەڵەی لەگەڵ دەکات، بەڕێوەبەرایەتی کار کە سەر بە وەزارەتی کارە، نیوەی ئەو مووچەیەی دەداتێ کە لە کاتی کارکردنیدا وەریدەگرت. ئەمە بە مەرجێك کە شەش مانگ و یەك ڕۆژ بەسەر ئیشکردنەکەیدا بڕوات و بەردەوام بێت لەبەخشینی ئەم بڕە پارەیە تا وەك پیشەیەکی تری بۆ دەدۆزرێتەوە.

هەروەها بەڕێوەبەرایەتی کاروباری کۆمەڵایەتی، کە سەر بە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیە، یارمەتیەك پێشکەش بە پەنابەران و هاوڵاتیان دەکات کە بڕە پارەیەکە دەگاتە نێوان (١٥٠ ـ ٢١٠) مارکی ئەڵمانی هەموو شەش مانگ جارێك بۆ کڕینی جلءبەرگ...[٢٠]

**● سەرچاوەکانی ئەم بەشە:**

١. ماڵپەڕی ویکیپیدیای فارسی. fa.wikipedia.org.

٢. ڕەحمانی، وریا، کوردستان و کورد لە ڕوانگەی نەخشەوانیەوە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، هەولێر ،٢٠٠٩، ل ٥٣ ـ ٥٥.

٣. ابوشقرا، صلاح عصام، کورد گەلی مەینەتییەکان ( ڕەوشی دیمۆگرافی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردەکانی لوبنان)، وەرگێڕانی جاسم محەمەد محەمەد عەلی، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێران، چاپی یەکەم، ل٤٣ و ٤٤.

٤. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ٥٣ـ٥٥.

٥. ماڵپەڕی بی بی سی فارسی (www.bbc.co.uk/persian///: lebanon_kurd.shtml_l٤٤_١١٠٤٠٢/٠٤/٢٠١١/world

٦. الصویرکی، محمد علی، کوردە ئۆردنیەکان و ڕۆڵیان لە بنیادنانی ئۆردنی نوێدا، وەرگێڕانی حەمید گەردی، ل ٦٥.

٧. ڕەحمانی، وریا، س.پ.ل ٥٧ ـ ٥٩.

٨. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ٥٦ و ٥٧.

٩. ڕەحمانی، وریا، س.پ.ل ٥٧.

١٠. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ٥٩ ـ ٦١.

١١. الصویرکی، محمد علی، س.پ.ل ٦٧.

١٢. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ٤٤ و ٤٨.

١٣. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ٦١ ـ ٦٢.

١٤. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ١٠٧ ـ ١٤٤.

١٥. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل١٤٤ هەتا ١٥٢.

١٦. شالیان، ژیرار، تراژیدیای کورد، وەرگێڕانی: وریا ڕەحمانی، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ١٦٣ ـ ١٦٤.

١٧. شالیان، ژیرار، س.پ.ل ١٦٤ ـ ١٦٧.

١٨. شالیان، ژیرار، س.پ.ل ١٦٨ـ ١٨٠.

١٩. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ٦٣ـ٦٩.

٢٠. ابوشقرا، صلاح عصام، س.پ.ل ١٥٤ ـ ١٦٨.

# ٣ بەشی سێیەم

## ئەنجام و پێشنیار و ڕاسپاردەکان

**● یەکەم: ئەنجامەکانی توێژینەوە**

دوای کۆکردنــەوەی کۆمەڵێــك وتــار و زانیاریــی لــە ســەرچاوە جۆراوجــۆرەکان و کۆتایــی هاتنــی کاری ئامادەکردنــی ئــەم بەرهەمــە بــە کۆمەڵێــك دەرەنجــام گەیشــتم کــە هێندێکیــان بریتیــن لــە:

١ـ ســەرەڕای کۆمەڵێــك ئاســتەنگ و گیروگرفــت توانیومــە زانیارییەکــی هەرچەنــد کەمیــش بــێ، بخەمــە بەرچــاوی خوێنــەران و هاوزمانانــم کــە دەتوانــن کەڵکیــان لــێ وەرگــرن و لــە هەمــان کاتــدا بیانکەنــە هەوێنــی کاری زیاتــر و بەرهەمــی بەپێزتــر.

٢ـ بەخۆشــییەوە دەتوانیــن بڵێیــن بەشــێکی زۆری هاونەتەوەییەکانمــان لــە ناوچــە جیاجیاکانــی دنیــادا تــا ئێســتاش توانیویانــە پارێزگاریــی لــە کولتــوور و شوناســی خۆیــان بکــەن و بــە کــوردی قســە بکــەن و هەســتی نەتەوایەتیشــیان هــەر بمێنــێ ئەگەرچــی دەبــێ دان بــەوەش دابنێیــن کــە ژمارەیــەك لــە کــوردەکان لــە هێندێــك لــە شــار و ناوچەکانــدا، بــە هــۆی تێپەڕینــی ڕۆژگار و دووریــی زۆر، لــە کوردایەتــی تەنیــا ناوەکەیــان بــۆ ماوەتــەوە و تەنیــا ئەوەنــدە دەزانــن کــە کــوردن و تــەواو.

٣ـ سەبارەت بە کوردەکانی دەرەوەی کوردستانی ئێران لە ئێران، ڕەوشەکە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە. بۆنموونە کوردەکانی خوراسان لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە چوار سەدەیە لە زێدی باووباپیرانیان دوور کەوتوونەتەوە و لەو ماوەیەشدا لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە تووشی گەلێك کەند و کۆسپی جۆراوجۆر بوونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام نارەزایەتی خۆیان لە بەرانبەر سیستەمی دەسەڵاتداریی ناوەندی دەربڕیوە و داکۆکیان لە مافەکانیان کردۆتەوە و سەرەڕای هەموو گووشارەکان. کوردەکانی خوراسان دەستبەرداری شوناس و کولتوور و زمانی خۆیان نەبوون. بەتایبەت لەم ساڵانەی دواییدا بەهۆی پێشکەوتن لەبواری ڕاگەیاندندا، سەرەڕای هەموو ئاستەنگییەکان، توانیویانە پەرە بە چالاکیە جۆراوجۆرەکان بدەن. یان ژمارەیەك لە کوردەکانی باکووری ئێران بەتایبەت کوردەکانی کەلاردەشت و چوارقەلعەی عەبدولمەلەکی لە پارێزگای مازەندەران تا ئێستاش کولتوور و زمان و ئایینی خۆیان پاراستوە و هەستی نەتەوەییان هەروا بەهێزە.

بەڵام لەبەرامبەریشدا دەبینین کوردەکان لە هێندێك لە ناوچەکانی پارێزگای فارس و پارێزگای سیستان و بەلووچستان تا ڕادەیەکی زۆر زمان و دابونەریتی کوردییان لەبیر چۆتەوە و تەنیا ئەوەندە دەزانن کە بە ڕەگەز کوردن.

٤ـ لەبارەی کورد لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەبێ بڵێین بارودۆخی کورد لە هەرکام لەو وڵاتانەدا، لەوەی دیکەیان جیاوازە. دیارە ئەمەش بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتەکانی ئەو دەوڵەتانە و هەڵوێستیان سەبارەت بە کەمینەی نەتەوەیی کورد لە وڵاتەکەیاندا. بۆ نموونە کوردەکانی ئەرمەنستان هەر لە سەرەتاوە بواری زیاتریان

بـۆ ڕەخسـا و لەلایـەن دەسـەڵاتەوە کەمـتر ڕێگریـان لـێ کـرا، هـەر بۆیـە توانیویانـە بەتایبـەت لەبـواری ڕۆشـنبیریی و کولتوورییـەوە هەنـگاوی گـەورە بنێـن و زۆر دەسـکەوتی مـەزن وەدەسـت بێنـن و زۆر مرۆڤـی گەورەشـیان لەنێـودا هەڵکەوتـوون. بـەڵام لـە ئازەربایجانـی دراوسـێی، ئـەم بـوارە بـۆ کـورد نەڕەخسـاوە و تەنانـەت کـورد بەنێـو پرۆسـەی ئاسیمیلەبوونیشـدا تێپەڕیـوە و...

٥ـ سـەبارەت بـە کوردەکانـی ئـۆردن، هـەروەك خۆیشـیان دەڵێـن: کوردەکانـی ئـۆردن بـە دڵـی خۆیـان چوونەتـە ئـۆردن. مانەوەیـان لـە ئـۆردن بـۆ خۆیـان هەڵبـژاردووە. بـە نیشـتمانی خۆیـان دانـا و بـە هـزر و بینینـی ئـەوان ئـەو نیشـتمانەیە کـە یەکسـانی و ئاسـایش و ئـازادی بۆیـان تێـدا ڕەخسـاندووە. ئـەوان بوونـە بەشـێك لـە پێکهاتـەی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ئابـووری ئـەو وڵاتـە و لـە هەمـوو ئـەو بوارانەشـدا مرۆڤـی زۆر گەورەیـان لـێ هەڵکەوتـووە و شانبەشـانی بـرا ئۆردنییەکانیـان خزمەتیـان بـەو وڵاتـە کـردووە، بـەڵام مانـای ئـەوە نییـە کـە کـوردەکان، لەبـەر ئـەوەی ئۆردنیـان بـە نیشـتمانی هەمیشـەیی بـۆ خـۆ هەڵبـژاردووە ئیـتر وازیـان لـە نەتـەوە و کوردایەتـی خۆیـان هێنـاوە، بەڵکـوو ئـەوان بەپێـی یاسـا و مۆڵەتەکانـی ئـۆردن ئاسـایش و هێمنـی وڵات لەبەرچـاو دەگـرن و لەگـەڵ ئەوەشـدا هەرگیـز حاشـا لـە کوردبوونـی خۆیـان ناکـەن . واتـە وەك ئـەوەی خۆیـان دەڵێـن: « ئێمـە کوردیـن و ئۆردنیـن ».

٦ـ لەبـارەی کوردەکانـی پاکسـتانیش لەگـەڵ ئـەوەی بـە ژمـارە زۆرن و چەندیـن گونـد لـە بەلووچسـتاندا کـوردن، بـەڵام تەنهـا ئەوەنـدە دەزانـن کـوردن و ئیـتر وشـەی کـورد وەك نازنـاو و ناوبانگـی لـێ هاتـووە. وەك ئەسـکەندەرخان، کەسـایەتیی کـوردی پاکسـتان، دەڵـێ: « «منـداڵ بـووم، باوکـم پێـی وتـم: کـوڕم ئـەوە بزانـە کـە تـۆ کوردیـت و بەلـووچ نیـت و لـە

هیچ گەلێکی تر نیت و، نیشتمانی تۆش پاکستان نییە، بەڵکو کوردستانە.»
و دەزانین «ئێمە گەلێکی سەربەخۆ و جیاوازین لە گەلانی تر، بەڵام بەداخەوە لە پاکستاندا بە درێژایی مێژوو لەناو کۆمەڵگای پاکستاندا تواوینەوە، زمان و هەموو نەریت و کەلەپوورێکی خۆمان بیر چۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر کوردین و دڵمان لای گەلی کوردمانە.»

٧- سەبارەت بە کوردەکانی ئیسرائیل، لەم توێژینەوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو جووانەی لە وڵاتی کوردستاندا نیشتەجێ بوونە، لە بەچەدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جووانەی کە لە کۆتایی سەدەی هەشت و سەرەتای سەدەی حەوت لەلایەن پاشاکانی ئاشووری بە دەستبەسەری هێنران بۆ ناوچە شاخاوییە سەختەکانی کوردستان. پاشان ئەبوخەدنسری کلدانی لە ساڵانی ٥٩٧ - ٥٨٦ی پ.ز لە دوو کاتی جیاوازدا ژمارەیەکی زۆریانی لێ بەدیل هێنا بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی.

بەهاتنی دەسەڵاتی ئەخمینییەکان لەلایەن پاشا (کورش) سەربەستی و ئازادی بە جووەکان بەخشی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا، ئیتر لەم کاتەوە جووەکان دەستیان کرد بە بڵاوبوونەوە بە ناو گوند و شارۆچکەکانی کوردستاندا، تێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا. پاشان بۆ بەدەست هێنانی خۆراکی ڕۆژانەی خۆیان چاویان لە کوردەکان کرد لە ئیش و کاری وەکو (شوانکاری، بەخێوکردنی مەر و ماڵات، کشتوکاڵ، هەندێ پیشەی دەستی سەرەتایی).

لە بواری ئابووریدا ژمارەیەکی زۆر لە جووەکان خەریکی ئاڵوگۆڕی بازرگانی بوون لەنێوان ناوچەکانی عێراق و ئێران، تەنانەت لەدوای کرانەوەی ڕێگەی هاتووچۆ، لەنێوان عێراق و وڵاتانی ئەورووپا و نزیک بوونەوەی عێراق لە بازاڕی جیهانی، لەم کاتەوە جوولەکە بە شێوەیەکی

تەدریجی توانیان دەست بەسەر ئەو بازاڕەدا بگرن، ئەمەش بەهۆی زۆری شارەزاییان لە بواری بازرگانی و لێزانیان لە چۆنیەتی کڕین و فرۆشتن.

لەڕووی زمانەوە جووەکان بە زمانی ئارامی نوێ قسەیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لە ژیانی ڕۆژانەیان و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کوردەکان بە کوردییەکی زۆرباش دەدوان. لەڕووی پەیوەندییەوە کوردەکان ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرتن، هەرچەندە ئەوان خۆیان بە نامۆ و غەریب دەزانی و تا رادەیەك بە گۆشەگیری دەژیان و پەیڕەوی هەموو دابونەریتەکانی خۆیان دەکرد.

سەبارەت بە بارودۆخی جووەکان لە ئیسرائیل هەروەك (ساسۆن) کە کوردێکی جولەکە بوو لە کوردستان باس دەکات کە بارودۆخیان باش نیە و لەوپەڕی باری سەختی ژیاندا گوزەران دەکەن و زۆربەیان بە کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و دووکانداریەوە خەریکن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا داب‌ونەریتە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستانیان بیر نەچۆتەوە و هەموو ساڵێك بە خۆشی و شادییەوە یادیان دەکەنەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: کوردەکانی دەرەوی ناوچە کە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبن:

ـ بەشێکیان لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە چەندین سەدەیە لە زێدی باوباپیرانیان دوور کەوتوونەتەوە و لەو ماوەیەشدا لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە تووشی گەلێك کەند و کۆسپی جۆراوجۆر بوونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا داکۆکیان لە مافەکانیان کردۆتەوە و سەرەڕای هەموو گووشارەکان، دەستبەرداری شوناس و کولتوور و زمانی خۆیان نەبوون و تا ئێستاش پاراستوویانە و هەستی نەتەوەییان هەروا بەهێزە،

کــە بەخۆشــییەوە ئــەم بەشــە لــە کــوردەکان زۆرینــەن.

ــ بەشــێکی دیکەیــان لەگــەڵ ئــەوەی دەزانــن گەلێکــی ســەربەخۆ و جیــاوازن ، بــەڵام بەداخــەوە بــە درێژایــی مێــژوو لەنــاو کۆمەڵــگا باڵادەســتەکاندا تواونەتــەوە و زمــان و هەمــوو نەریــت و کەلەپوورێکــی خۆیــان بیــر چۆتــەوە، لەگــەڵ ئەوەشــدا بــاش دەزانــن هــەر کــوردن و هەرگیــز حاشــا لــە کوردبوونــی خۆیــان ناکــەن و هەســت بــە خۆشــی و ناخۆشــییەکانی هاونەتەوەییەکانیــان دەکــەن.

ــ بەشــێکی دیکــە لــە کوردەکانــی دەرەوەی ناوچــە کــە، بــە تەواویــی لەگــەڵ شــوناس و کولتــووری خۆیــان نامــۆ بــوون و بــە تێپەڕینــی ڕۆژگار و کۆمەڵــە هۆکارێکــی جۆراوجــۆر لــە کوردبــوون دوور کەوتوونــەوە و خۆیشــیان قــەت بیریــان لــە ڕەچەڵــەك و زێــدی ســەرەکیی خۆیــان نەکردۆتــەوە و لــە شــوێنە جۆراوجۆرەکانــی دنیــادا بــڵاو بوونەتــەوە.

● **دووەم: پێشنیار و ڕاسپاردەکانی توێژینەوە**

پێشــنیارەکان: پێشــنیارم بــۆ نووســەران و توێــژەران ئەوەیــە زیاتــر گرنگیــی بــە ژیــان و بەســەرهاتی کوردەکانــی دەرەوەی ناوچــە کــە بــدەن، بــە تایبەتــی ئــەو شــوێنانەی کــە مــن لەبیــرم کــردوون یــان کەمــم لەســەر نووســیون، ئــەوان زیاتریــان لەســەر بنووســن و ئەگــەر بکــرێ بــە ســەردانی مەیدانیــی بــۆ ئــەو شــوێنانەی کــە کوردیــان لــێ دەژی، زیاتــر ئــاوڕ لــە ژیانیــان بدەنــەوە و وردەکاریــی زیاتــر لەمــەڕ ژیــان و گوزەرانیــان بخەنــە بەرچــاو. بێگومــان لــەم نێوەشــدا ئــەو کەســانەی کــە شــارەزای زمانــە بیانییەکانــن دەتوانــن زیاتــر لــەم مەیدانــەدا هەنــگاو بنێــن و خزمەتــی گەورەتــر پێشــکەش بــە نەتەوەکەیــان بکــەن.

پێویسـتە چالاکـە سیاسـیی و کۆمەڵایەتیـی و فەرهەنگییەکانـی هـەر بەشـێك لـە بەشـەکانی کوردسـتان یـان چالاکانـی سـەر بـە کوردەکانـی دەرەوەی چـوار پارچەکـە، گرنگیـی بـە ناسـاندنی کوردەکانـی دەوروبـەری خۆیـان بـدەن و ئەگـەر کەسـێك یـان کۆمەڵەیەکیـش بـۆی نەکـرێ زانیاریـی لەسـەر کوردەکانـی هەمـوو ناوچـەکان کـۆ بکاتـەوە، ئـەوا بـە هەمـوان دەتوانـرێ دنیایـەك زانیاریـی لەسـەر کـورد بـە گشـتی کـۆ بکرێتـەوە و خـۆ ئەگـەر هەمـوو زانیارییـەکان لەسـەر ماڵپەڕێـك یـان ... دابنـرێ، «ئـەوا هـەر قیمەتـی تـەواو نابـێ».

ڕاسـپاردەکان: داوا لـە بەرپرسـان و دامـودەزگا حکومییەکانـی هەرێمـی کوردسـتان دەکـەم بـە شـێوەیەکی جیددیـی ئـاوڕ لـە ژیانـی کوردانـی ناوچـە کـە و دەرەوەی چـوار پارچەکـە بدەنـەوە و هـەم سـەردانیان بکـەن بـۆ ئـەوەی ئـەوان هەسـت بـە شـادیی و پشـتیوانیی بکـەن و هـەم بانگهێشـتی هەرێمـی کوردسـتانیان بکـەن بـۆ ئـەوەی لـە نزیکـەوە پێوەندیـی توندوتـۆڵ لەگـەڵ هاونەتەوەییەکانیـان لـەم بەشـە لـە کوردسـتان ببەسـتن.

پێویسـتە کەناڵەکانـی ڕاگەیانـدن زیاتـر سـەردانی ناوچـە جیاجیاکانـی شـوێنی نیشـتەجێ بوونـی کـوردان بکـەن و بەسـەریان بکەنـەوە و زۆر لایەنـی کۆمەڵایەتـی و ئابـووری و کولتووریـی و ... ئـەم کوردانـە پێشـانی کوردەکانـی بەشـەکانی دیکـەی کوردسـتان بـدەن. بێگومـان ئـەوان بـۆ ئەنجامدانـی ئـەم کارە توانایـی و دەرفەتـی باشـتریان لـە تاکەکەسـەکان لەبەردەسـت دایـە و دەتوانـن کاری گرنگـتر و گەورەتـر بکـەن.

● **ئاگاداری:**

**خوێنەرانی خۆشەویست! بە پشتیوانیی خوای گەورە بەنیازم لە داهاتوودا بەرگی دووەمی «کوردەکانی دەرەوەی ناوچەی کوردنشینەکان»تان پێشکەش کەم کە تێیدا باس لە کوردەکانی میسر، سوودان، فەلەستین، چەند شار و ناوچەیەکی دیکەی ئێران (دەرەوەی کوردستانی ئیران ) و ... دەکرێ و هەروەها هەر تێبینی و پێوەزیادکردنێکیش لەسەر کوردەکانی باسکراو لە بەرگی یەکەمدا هەبێ، لە دووتوێی بەرگی دووەمدا** دەخرێنەڕوو.

• لیستی سەرچاوەکان

**کتێبەکان:**

١. ئەحمەد، بژار عوسمان، بارودۆخی سیاسی کوردستانی سوریا لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٠ـ١٩٧٠، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠١٢.
٢. ئەنوەر، د.کەیوان ئازاد، چەردەیەك لە مێژووی کورد، چاپی حەوتەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٢.
٣. ئیبراهیمی، عەبدوڵڵا، لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی مێژوویی لەسەر کورد و کوردستان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢.
٤. ابوشقرا، صلاح عصام، کورد گەلی مەینەتیەکان (ڕەوشی دیمۆگرافی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردەکانی لوبنان)، وەرگێڕانی جاسم محەمەد محەمەد عەلی، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان.
٥. باوەڕ، ئەحمەد، جوولەکەکانی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، کوردستان، ٢٠٠٠.
٦. بدلیسی، میرشەرەفخان، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، چاپی سێهەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.
٧. برونەسن، مارتین فان، ئاغا، شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: کوردۆ،

چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩. (بەرگی یەكەم)
٨. بوركای، كەمال، كورد و كوردستان، وەرگێڕانی لە یۆنانیەوە: عەلی فەتحی، چاپی یەكە، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٨.
٩. بیێری، ئۆرا شۆرتس، جووەكانی كوردستان، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە: گۆران سەباح، چاپی یەكەم، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٣.
١٠. توحدی، كلیم‌الله، حركت تاریخی كرد به خراسان، جلد اول، چاپ دوم.
١١. حەمەڕەش، سۆران، كورد كێیە؟ چاپی یەكەم، لەندەن، ٢٠١٣.
١٢. خەزنەدار، د.مارف، كوردی توركمانستان (مێژوو، ئەتنۆگرافیا، ئەدەب) چاپی یەكەم، لە بڵاوكراوەكانی كۆڕی زانیاریی كوردستان، هەولێر، ٢٠٠٣.
١٣. خەزنەدار، د.مارف، كوردی توركمانستان، چاپی یەكەم، لە بڵاوكراوەكانی كۆڕی زانیاری كوردستان، هەولێر، ٢٠٠٣.
١٤. خەزنەدار، دوكتۆر مارف، مێژووی ئەدەبی كوردی، (بەرگی یەكەم، شەشەم، حەوتەم)، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.
١٥. خورشید، فوئاد حەمە، كورد (كورتە لێكۆڵینەوەیەكی زانستیە)، وەرگێڕانی: ساڵح سەعید دەلۆیی، چاپی یەكەم، ئۆفسێتی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٠.
١٦. ژیانی ژنە جوولەكەیەك لە كۆیە و ئیسرائیل، یافا و موردەخاێن میناشێ، سەنتەری لێكۆڵینەوە و پەخشی كۆیە، كۆیە ، ٢٠١٠.
١٧. ڕۆژبەیانی، مەلاجەمیل، چوار دەوڵەتی كورد (چوار دەوڵەتی فەرامۆشكراوی نەناسراو دونبولی، شاهێنی، شوانكارە، مینەتشاهی)، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٠.
١٨. رۆژبەیانی، مەلاجەمیل، وڵاتەكەت باشتر بناسە، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، چاپی یەكەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
١٩. ڕەحمانی، وریا، كوردستان و كورد لە ڕوانگەی نەخشەوانیەوە، چاپی یەكەم،

چاپخانـەی ڕۆژهـەڵات، هەولێـر، ٢٠٠٩.

٢٠. رنـدل، جاناتـان، بـا ایـن رسـوایی چـه بخشایشـی، نـشر پانیـذ، چـاپ دوم، تهـران، ١٣٨٠.

٢١. زەکـی، محەمـەد ئەمیـن، خوڵاصەیەکـی تاریخـی کـورد و کوردسـتان ، دەزگای چـاپ و پەخشـی سـەردەم، ٢٠٠٠، سلێمانی.

٢٢. زەند، کەریم، کورتە جوگرافیای کوردستان، چاپخانەی ئەزمەڕ، سلێمانی ٢٠٠٠.

٢٣. سـاڵح، عومـەر هەمـزە، ڕاگواسـتن، چاپـی یەکـەم، دەزگای توێژینـەوە و بڵاوکردنـەوەی موکریانـی، هەولێـر، ٢٠٠٩.

٢٤. سـەجادی، علاالدیـن، مێـژووی ئەدەبـی کـوردی ، بڵاوکردنـەوەی کوردسـتان، چاپـی یەکـەم، سـنە، ١٣٩١.

٢٥. سـەداقەت کیـش، د.جەمشـید، کوردەکانـی فـارس و کرمـان، وەرگێڕانـی لـە فارسـییەوە: کامـەران حەسـەن، چاپـی یەکـەم، دەزگای توێژینـەوە و بڵاوکردنـەوەی موکریانـی، هەولێـر، ٢٠١٠.

٢٦. سەردەشـتی، د.یاسـین، کوردسـتانی ئێـران، چاپـی دووەم، چاپخانـەی سـیما، سـلێمانی ٢٠١١.

٢٧. سـمایل، عوسـمان عەبدولڕەحـمان، کـورد لـە سـوریا ١٩٢٠-١٩٤٦، چاپـی یەکەم، دەزگای توێژینـەوە و بڵاوکردنـەوەی موکریانـی، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢٨. سـوێرکی کـوردی، محەمەدعەلـی، کـوردە ئۆردنییـەکان و ڕۆڵیـان لـە بنیادنانـی ئۆردنـی نوێـدا، وەرگێڕانـی: حەمیـد گـەردی، بەڕێوەبەرایەتـی چاپخانەی ڕۆشـنبیری، هەولێـر ٢٠٠٧.

٢٩. شـالیان، ژێـرار، تراژیدیای کورد، وەرگێرانی: وریا ڕەحمانـی، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنـەوەی موکریانـی، چاپی یەکەم، هەولێـر، ٢٠١٠.

٣٠. عەلـی، ئـارام، پەیوەنـدی نێـوان کـورد و روسـیا، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی لیـرە،

سلێمانی، ١٩٩٩.
٣١. غەفوور، عەبدوڵڵا، جوگرافیای کوردستان، چاپی چوارەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٥.
٣٢. فیلیپ کرینبروك و کریستیەن ئالیسۆن، کولتور و ناسنامەی کورد، وەرگێرانی وریا ڕەحمانی، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.
٣٣. قاسملوو، عبدالرحمن، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٤. قەرەداغی، عەبدوڵڵا (مەلاعەلی)، کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، چاپی یەکەم، چاپەمەنی کارۆخ، سلێمانی، ٢٠٠٨.
٣٥. قوڕەیشی، د.فەزلوڵڵا، ئێران ـ ئیسرائیل، دوو جەمسەرە گەرمەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕانی: عەلی حاجی زەڵمی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی هەژار موکریانی، هەڵەبجەی شەهید،٢٠١٣ .
٣٦. کۆمەڵێك نووسەر، گەلێکی پەژموردە و نیشتمانی پەرت، وەرگێڕانی لە عەرەبی و فارسییەوە: م. گۆمەیی، سوێد، ٢٠٠٠.
٣٧. لازاریف، م.س، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵڵا سەنگاوی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨.
٣٨. مۆنتگومری، هێریەت، کوردی سوریا بوونێکی نکوڵی لێکراو، وەرگێڕانی: مینە و پێشەوا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٩.
٣٩. مەدەنی، حوسێن، کوردستان و ئیستراتیژیی دەوڵەتان(بەرگی یەکەم)، چاپی یەکەم، ١٣٧٩ی هەتاوی
٤٠. محەمەد، د.نیشتمان بەشیر، کورد و سەلجوقییەکان، وەرگێڕانی: ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٦.

٤١. محمدی (کلهر)، أیت، سیری در تاریخ کرد و کردهای قم، چاپ اوّل، انتشـارات پرسمان، سال ١٣٨٢.
٤٢. میـران، د.ڕەشـاد، ڕەوشـی ئایینـی و نەتەوەیـی لـە کوردسـتاندا، چاپـی دووەم، سـەنتەری برایەتـی، ٢٠٠٠.
٤٣. میرنیـا، سیدعلی، ایلهـا و تایفەهـای عشـایری کـرد ایـران، موسسـه انتشـاراتی و أموزشـی نسـل دانـش، تهـران، ١٣٦٨.
٤٤. مینۆرسـکی، کـورد، وەرگێڕانـی لـە عەرەبییەوە: حەمەسـەعید حەمەکەریـم، چاپی یەکـەم، چاپخانـەی زانکۆی سـەلاحەددین، هەولێـر، ١٩٨٣.
٤٥. ناوخـۆش، سـەلام، مافـی مێژوویـی غەیرە کورد بەسـەر کوردسـتان، چاپـی یەکەم، کوردستان، ٢٠٠٤.
٤٦. نیکیتیـن، واسـیلی، کـورد و کوردوسـتان، وەرگێڕانـی: خالیدی حیسـامی (هێدی)، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی زانکـۆی سـەلاحەدین، هەولێـر،١٩٩٧.
٤٧. هەڵەبجەیـی، بەختیـار غفـوور، کوردەکانـی پاکسـتان، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی پیرەمێـرد، هەڵەبجـەی شـەهید، ٢٠٠٤.
٤٨. هەورامـی، د.ئەفراسـیاو، کوردسـتانی پشـت قەفقـاس، چاپـی یەکـەم، لـە بڵاوکراوەکانـی بنکـەی ژیـن، سـلێمانی ٢٠٠٥.
٤٩. همایـەر، م.شـترۆ و هێکـمان، ل. یاڵچیـن، کـورد لـە سـووریا و ئازەربایجـان و ئەرمەنسـتان، وەرگێڕانـی لـە ئەڵمانییـەوە: ڕێبـوار تۆفیـق بەنگینـە، چاپـی یەکـەم، ئەکادیمیـای هۆشـیاری و پێگەیاندنـی کادیـران، سـلێمانی، ٢٠١١.
٥٠. یەڵـدز، کەریـم، کـورد لـە سـوریا گەلێکـی لەبیرکـراو، وەرگێڕانـی شـاهۆ قـادر خانـزادە، چاپـی یەکـەم، دەزگای چـاپ و پەخشـی سـەردەم ، سـلێمانی، ٢٠٠٩.

**گۆڤار و تی وی:**

١ـهفتەنامە سیروان

٢ـگۆڤاری هەژێن

٣ـگۆڤاری مەهاباد

٤ـتەلەویزیۆنی ڕووداو

**سەرچاوەئەلیکترۆنییەکان:**

www. fa.wikipedia.org
www.akhbar-rooz.com
www.alisidiq.blogspot.com
www.awene.com
www.bbc.co.uk
www.civilnews.org
www.darbandijhour.blogfa.com
www.dengekan.info
www.dengiamerika.com
www.dimane.com
www.en.wikipedia.org
www.faceiraq.com
www.govarihejen.blogfa.com
www.hamshahrionline.ir
blogfa.com.www.hiva٥٠
www.ileabdolmaleki.blogfa.com
www.jamalnajari.wordpress.com

